نرخەکەی داشکێنراوە ٦٧٥٠

# فیقهی ئاسان

## لە ژێر ڕۆشنایی سوننەت و قورئان



# الفقه الميسر

## في ضوء الكتاب والسنة

دانانی

دەستەبژێرێک لە زانایان

وەرگێڕان و لەسەر نوسینی

ماموستا علی خان

کتێبخانەی ئامۆژگاری
بۆ چاپ و بلاوکردنەوە

چاپی سێیەم

چاپێکی پوخت و بۆ زیادکراوە

# فیقهی ئاسان

## لە ژێر ڕۆشنایی سوننەت و قورئان

دانانی:

**دەستە بژێرێک لە زانایان**

وەر گێڕان ولە سەر نوسین وبەراورد کردن وڕاست کردنەوەی:

**علی خان**

**کتێبخانەی ئامۆژگاری**

**چاپی سێیەم**

**هەڵەچنی کراوە**

ناوی کتێب بە عەرەبی: الفقه الميسر في ضوء الكتاب والسنة
ناوی کتێب بە کوردی : فیقهی ئاسان لە ژێر ڕۆشنایی قورئان وفەرمودەکان
نوسـەر: دەستەیەك لە زانایان
پیداچـونەوەی: شێخ سالّەح.
وەرگێڕانـی: علی خان
نوسـینەوەی: ژیلوان علی
دیـزاینی نـاوەوە: سایتی: www.ali-xan.com
بـەرگ: کارزان
بڵاوکردنـەوەی: کتێبخانەی ئامۆژگاری، سلێمانی.
نـۆرە وسالّی چـاپ: سێیەم ١٤٤١ - ٢٠٢٠
تـیراژ: ١٠٠٠ دانە
ژمـارەی سـپاردن: (٤٤٥) ساڵی ٢٠١٩ کتێبخانە گشتیەکانی پێ دراوە.

بەرهەمی سایتی
www.ali-xan.com

لە چاپ دان وبڵاو کردنەوەی
کتێبخانەی ئامۆژگاری
سلێمانی، دارە سوتاوەکە، بەرامبەر کەشتی نوح

ktebxanayamozhgary
makrabaaimasiha
07701499711

# پێشەکی وەرگێڕ

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على رسول الله، وآله وصحبه، أما بعد:

خوێنــەری بــەڕێز: ئەمــە وەرگێڕانــی کتــێبی: «الفِقْهُ المُيَسَّر فِيْ ضَوْءِ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ»یە، کە لەلایەن کۆمەڵێك پسپۆڕ وپرۆفیسۆری بواری فیقهــەوە نوســراوەتەوە. ئاسانی ئوسلوبەکەی، وپشت بە ستنی بــە بەڵگــە دروســتەکان، وگشــت گــیری بــۆ بابەتەکان، ومام ناوەند بون وبە ئینساف بونی لە حوکم دان وپەسەند کردنی بۆچــونە فیقهیەکان، وناوەند گرتن لە کورت بڕی ناڕون، ودرێژدا دڕی بێزار کەر، وبەســتنەوەی بە بابەتە فیقهیە نوێ وسەردەمیەکان، وهەروەها ئەوەی کە کــاری دەســتە جەمعیــە وهی یەك کەس نیە... وهتد، وای کردوە ئەم کتێبە ببێتە یەکێك لە کتێبە هەرە بــە ناو بانگ ترینەکانی جیهانی ئیسلامی.

وا لە خوارەوەش هەر بە کورتی -بە ویستی خوا- هەندێك تێبینی دەخەینــە ڕو، لەگەڵ ئەو ڕێبازەی لەم وەر گێڕانەماندا گرتومانەتە بەر:

١. پشت بە ستراوە بە چاپی دوەمی ئەم کتێبە، کە لە لایەن خــودی «مُجَمَّع»ەوە لە چاپ دراوە ودواترین چاپیشێتی، وجیاوازیشی هەیە لەگەڵ چاپە بە ناو بانگەکانی نێو بازاڕ.

٢. کتێبەکە ئاستێکی زانستی بەرز وبە نرخی هەیە، جا هەوڵ دراوە پارێز گــاری لەو پایەیەی بکرێت.

٣. هەروەها بە زمانێکی ئاسان وڕەوان وەرگێڕدراوە، بەو شێوازەی خەڵك قســەی پێ دەکەن.

٤. بۆ لێك دانەوەی ئایەت وفەرمودەکان پشت بە کتێبەکانی ئەو بوارە بەستراوە، بــە تایبــەت: «التفسـير الميسـر» و«الفـتح البـاري»، و«عـون المعبـود» و«تحفـة

الأحوذي» و«مختار الصحاح» و«النهاية» و«معجم مقاييس اللغة» و«المعجم الوسيط»، زۆر ترین گەڕانەوە بۆ ئەمانە بوە.

٥. هەر تێبینی وسەرنج وزیادەیەك بە زەرور وپێویست زانرا بێت، ئەوا لە پەراوێز یان لە سەرەوە ئاماژەی پیَ کراوە، ولە نێوان ئەم دو کەوانەدا [ ] دانراوە، بۆ ئەوەی تێکەڵ نەبێت.

٦. هەندێك جۆراو جۆری وهونەر کاری کراوە لە وەر گێڕانەکەدا، بۆ ورد بین ڕون دەبێتەوە، هەر وەکو چۆن بایەخ دراوە بە ڕێساکانی ڕێنوسی، بۆ ئاسان تێگەیشتن.

٧. ئەو وتە ووشانەی کتێبەکە کە نا ڕون بوە، لە پەراوێز ڕون کراوەتەوە.

٨. هەمو فەرمودەکان بە پێی توانا بە حەرەکات وسەکەنات (سەرە وبۆرە...)ەوە دانراوە، کە لە عەرەبیەکەدا وا نیە.

٩. لە پاش هەر دەقێك یەك سەر لە کەوانەیەکی ئاوهادا «» وەرگێڕانی بۆ کراوە.

١٠. دەقە دو بارەکان فەرمایشت بن یان فەرمودە، وەرگێڕانەکەی دو بارە نەکراوەتەوە.

١١. ئامرازی پەیوەندی واو، دراوەتە پاڵ وشەکەی دوای خۆی، بۆ نمونە بەم شێوازە: «بە بەڵگەی قورئان، وفەرمودە، وکۆ دەنگی».

١٢. ئەم جۆرە فاریزەیە کە خاڵێك لە ژێریەتی « ؛ »، واتە: ئەوەی دوای خۆی، ڕونکردنەوەی پێش خۆیەتی.

١٣. کاری سەرەکی من وەرگێڕانە، بۆیە لە کتێبەکەدا بۆچونێك لە یەکێکی تر بە پەسەند تر زانرا بێت، تەعقیب نەکراون وقسەی لە سەر نەکراوە، بە تایبەت تر مەسەلە فیقهیەکان زۆرێکی فراوانی تێدایە.

١٤. بۆ ورد بین ڕون دەبێتەوە تەخریجەکەیان یەك دەست نیە، وبواریشیان بۆ وردە کار هێشتۆتەوە، جا ئەمە چارەسەر کراوە، بۆ نمونە: دەقەکە بەو شێوازە نەبو بێت،

یان ژمارەکە هی ئەو دەقە نەبو بێت وهتد...، وشەیەکیشی بۆ زیـاد کـرا بێـت لـە نێوان دوو کەوانەدا دامناوە، چونکە بە لامەوە گرنگ بوە کتێبـە عەرەبیەکـە وەکـو خۆی بمێنێتەوە بێ دەست کاری کردن. هەر لەم جۆرەش: ئەو تەخریجـە زۆرانەیـە کـە دوبارە بۆتەوە زۆر جار بە جیاوازیشەوە، جا لێرەدا تـێ هـەڵکێش کـراوە ولـە یـەك شوێندا دانراوە، کە دوبارە بویەوە، دەنوسرێت: [پێشو] یا [پێشتر].

١٥. هەر لەم جۆرە: تەخریج کردنی ئەو شوێنانەیە، کە تەخریج نەکراوە.

١٦. کە لە خوارەوە بەم شێوازە نوسیم: [هذا لفظە= ئەمە لەفزەکەیـەتی]، واتـا: لەو کتێبەی ئەوان پشتیان پێ بەستوە، وئەو شوێنەی ئـەوان ئاماژەیـان بـۆ کـردوە، دەقەکەمان لەو شوێنەدا وبەو شێوازەی ئەوان بەر چاو نەکـەوتوە، هـەڵیش دەگرێـت ئەوەی ئەوانیش لە نوسخەی تردا وا بێت، بەڵام من گومانم بۆ ئێوە کردوە بـە یـەقین ودەقی فەرمودەکەم لە سەر چاوەکەوە نوسیوەتەوە، ئەگەریش زیاد وکەمێکیان کـرد بێت لە نێوان دو کەوانە دامناوە، بە ڕادەیەك ترست نەبێت لە بەری بکە ووا بزانە لە کتێبەکانی فەرمودەوە لە بەرت کردوە والحمد لله تعالی.

١٧. کە نوسیمان: «فەرمودە» واتا: حەدیس، «فەرمایشت»یش: ئایەت.

١٨. ئەم وشە وڕستانە ئاوها وەرگێڕدراوە:

«لا یجوز»: دروست نیە. بەڵام «لا یصح»: دروست نابێت.

«ینبغي»: ئەبێت. بەڵام «یجب»: پێویستە.

١٩. ئەم ڕەمز وسیمبولە بە کار هاتوانەش بەم واتایانە دێن:

- ﷻ «عَزَّ وَجَلّ»، واتە: توانا ودەسەڵات ومەزنی وشکۆ بۆ خوا.
- ﷻ «جل وعلا»، واتە: شکۆ داری وبەرزی بۆ خوا.
- ﷻ «تبارك وتعالی»: واتە: پیرۆزی وفەڕ وبەرەکەت وبەرزی بۆ خوا.
- ﷻ «سبحانە وتعالی»: واتە: پاکی وبێ عەیبی وکورتی وبەرزی بۆ خوا.

- ﷺ «صَلَى الله عَلَيْهِ وَسَلَّم»، واته: سه‌ڵات وسه‌لامی خوای لێبێت.
- ﷛ «رَضِيَ الله عَنْه»، واته: خوای لیّ ڕازی بیّت.
- ﵂ «رَضِيَ الله عَنْهَا»، واته: خوای لیّ ڕازی بیّت «بۆ مێینه».
- ﵄ «رَضِيَ الله عَنْهما»، واته: خوا له هه‌ر دوكیان ڕازی بیّت.
- ﵃ «رَضِيَ الله عَنْهَم»، واته: خوا له هه‌مویان ڕازی بیّت.
- رَحِمَهُ‌ٱللَّهُ، واته: ڕه‌حمه‌تی خوای لیّ بیّت.
- «سه‌حیحه‌ین»: واته: هه‌ر دو تاكه كتێبه سه‌حیحه‌كه، كه صه‌حیحی بوخاری وصه‌حیحی موسلمن.
- «شه‌یخه‌ین»: واته: هه‌ر دو شێخه‌كه، كه شێخی بوخاری وشێخی موسلمن.
- «متفق علیه»: واته: «كۆكن له سه‌ر گێڕانه‌وه‌ی»، یانی: بوخاری وموسلم.
- «خاوه‌ن سونه‌نه‌كان»: بریتین له نه‌سائی، وتورمزی، وئه‌بو داود، وئیبن ماجه.
- «به‌رزی ده‌كاته‌وه»: واته: ئه‌یداته پاڵ په‌یامبه‌ر ﷺ.

٢٠. له كۆتـایی كتێبه‌كـه‌دا -بـه حـه‌ول وقـوه‌تی خـوا- پێڕسـتێكی ورد ودور ودرێژمان كردوه بۆ سه‌رجه‌م بابه‌ته‌كان، كه ده‌گاته «٣٠» سی لاپه‌ڕه، والحمد لله.

په‌روه‌ردگارا! هه‌وڵم دا هه‌ندێك هۆكار بگرمه به‌ر بۆ به‌ره‌كه‌ت داری ئه‌م كتێبه، سا لێت ده‌پاڕێمه‌وه به فه‌زڵی خۆت، به‌ره‌كه‌ت وفه‌ڕ وپیرۆزی به سه‌ر كتێبه‌كه وخوێنه‌رانی دا برێژه، وبیكه مایه‌ی سود بۆ سه‌رجه‌م موسڵمانانی كورد زوبان، وبیكه مایه‌ی لـیّ خۆشبون. له كه‌م وكورتیشم ببوره به لیّ بورده‌یی وبه‌خشنده‌یی خۆت.

به‌نده‌ی خوا

علی خان

٠٧٧٠١٢٣٤١٥٧

info@ali-xan.com




بسم الله الرحمن الرحيم

# ڕێبازی کار لەم کتێبەدا[1]

ڕێبازی کار لەمانەی خوارەوەدا کورت هەڵ دەهێنین:

**یەکەم:** دابەش کردنی بابەتەکان بۆ چەند بەش (کِتَاب)ێکی سەرەکی، وهەر بەشێکیش دابەش کراوە بۆ چەند دەروازەیەك، وهەر دەروازەیەك چەند پرسێکی لە ژێردایە، ئەمەش بۆ نزیکردنەوە وئاسان کردنەوەی باسەکان بۆ خوێنەر.

**دوەم:** لە هەر بابەتێکدا تەنها مەسەلە گرنگەکان هێنراوە کە پێویستی ئەیخوازێت، وباسی وردە چڵ وئەو مەسەلانەمان نەکردوە کە خەڵك کەم پێویستیان پێ دەکەوێت.

**سێیەم:** کورت بڕی وهەڵبژاردنی لەفز ودەستەواژە ئاسان وڕونەکان بە پێی توانا.

**چوارەم:** لە هەر پرسێکدا تەنها بەڵگە پشت پێ بەستراوەکانمان هێناوە.

**پێنجەم:** لەو پرسانەی ڕا جیاوازی تێدایە، تەنها وتەی پەسەند باس کراوە کە پشت قایمە بە بەڵگە، بێ پەنا بردن بۆ باس کردنی ڕا وبۆچون ووتەکان لە پرسەکەدا.

**شەشەم:** ئایەتەکان دراوەتە پاڵ شوێنەکەیەوە؛ بە باس کردنی ناوی سورەت وژمارەی ئایەت، ئەمەش لە تەنیشت ئایەتەکەدا.

**حەوتەم:** تەخریج کردنی فەرمودەکانی پەیامبەر ﷺ؛ بە دانە پاڵی سەرچاوە باوەڕ پێ کراوەکانی؛ ئەگەر لە سەحیحەین یان یەکێکیان هەبێت ئەوە بەسە،

---

(١) [پێش ئەم ناونیشانە، خشتەی کار هەبو، جا لەبەر ئەوەی ڕێك بریتی بو لە پێڕستی ئەم کتێبە لابرا].

ئەگەریش لەوێ نەبێت، لە سەرچاوە بە ناو بانگەکانی ترەوە تەخریجمان کردوە، وچوار سونەنەکەمان خستۆتە پێش ئەوانی ترەوە، هەروەها حوکم دراوە بە سەر فەرمودەکان وئاستەکەی ڕون کراوەتەوە جگە لە فەرمودەکانی سەحیحەین، ئەمەش بە باس کردنی وتەی پێشبەوایانی ئەم بوارە -بە کۆن وتازەیانەوە- لەم بارەوە.

**هەشتەم:** وشە وزاراوە نامۆکان کە پێویستی بە ڕۆشن کردنەوە هەیە ڕون کراوەتەوە، جا ئەو وشە وزاراوانە ئەگەر لە میانەی شەرح دا بێت لە پەراوێز باس کراوە، ئەگەریش لە زاراوە سەرەکیەکانی ئەم لێ کۆڵینەوەیە بن ئەوا هەر لە ناوەڕۆکەکەیدا لە سەرەتای هەمو دەروازە وپرسێك باس کراوە.

**نۆیەم:** سود بینین لە هەندێك کتێبی فیقهی سەردەم لە گرنگترینیان:

«الشرح الممتع» هی مامۆستای بەڕێز شێخ موحەممەد بن عوسەیمین رحمه الله.

و«الملخص الفقهي» هی مامۆستای بەڕێز شێخ ساڵح ئەلفەوزان خوا بیپارێزێت.

ئەمە جگە لە سەرچاوە سەرەکیەکانی هەر چوار مەزهەبەکە وجگە لەوانیش.

**دەیەم:** باس کردنی هەندێك لەو شتانەی کەوا زۆرێکی خەڵك بە پێچەوانەی قورئان وسوننەتی صەحیحەوە ئەنجامی دەدەن، وڕون کردنەوەی ڕاست وهەقەکە لەو بارەوە، ئەمەش لەو شوێنانەی پێمان وابوە پێویستی دەیخوازێت.

**یانزەهەم:** لە کۆتایی کتێبەکەدا پێڕستێکی وردمان داناوە بۆ بابەت وپرسەکانی کتێبەکە، ئەمەش تا ئاسان بێت بۆ کەسی خوێنەر.

# ڕێ خۆشکار

لەم خاڵانەی خوارەوەدا پێك هاتوە:

- پێناسەی فیقھ لە زمان وزاراوەدا.

- سەرچاوەکانی.

- بابەتەکانی.

- بەر وبومەکانی.

- فەزڵەکانی.

● **واتای فیقھ لە زمان وزاراوەدا:**

**فیقھ**: فیقھ لە زماندا: تێگەیشتنە، وەك فەرمایشتەکەی خوای بالا لە بارەی گەلی شوعەیبەوە: ﴿...مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِمَّا تَقُولُ...﴾ [هود:٩١] «ئێمە تێناگەین لە زۆرێکی ئەو شتانەی تۆ ئەیلێی». هەروەها ئەفەرموێ: ﴿...وَلَكِنْ لَا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ [الإسراء:٤٤] «بەلام ئێوە لە تەسبیحاتیان تێ ناگەن»..

بەلام فیقھ لە زاراوەدا: بونی زانستە بە حوکمە شەرعیە کردەوەییە بە دەست هاتوەکان لە بەلگە وردەکاریەکانەوە، هەروەها فیقھ بە خودی حوکمەکانیش دەوترێت.

**سەرچاوە سەرەکیەکانی فیقھ:**

١- قورئانی پیرۆز.

٢- سوننەتی پاك.

٣- کۆ دەنگی.

٤- قیاس.

## بابەکانی فیقھ:

بابەتی فیقھ بریتیە لە کردەوەی بەندە تەکلیف لیّ کراوەکان بە شێوەیەکی گشتی وگشت گیر، جا فیقھ پەیوەندی مرۆڤ لـە خـۆ دەگـریّ لەگـەڵ پـەروەردگار، وخـۆی، وکۆمەڵگاکەشی.

هەروەها حوکمە کردەییەکان، وئەوەی لە تەکلیف لیّ کراوان دەوەشێتەوە لـە وتـە وکردەوە، وگریّ بەست وهەڵس وکەوت= دەگرێتەوە. ئەمەش دو جۆرە:

**یەکەم**: حوکمی پەرستنەکان: لە نوێژ وڕۆژو وحەج وهاوشێوەکانی.

**دوەم**: حوکمی مامەڵەکان: لە گریّ بەست، وهەڵس وکەوت (تصرفات)، وسـزاکان (عقوبات)، وتاوانەکان (جنایات)، زەمانەت وجگە لە مانـەش کـە مەبەسـت لێـی ڕێکخستنی مامەڵەیە لە نێوان خەڵك دا.

**ئەم حوکمانەش دەکرێت لەمانەی خوارەوەدا کورت هەڵ بهێنرێت:**

١- حوکمە خێزانیەکان لە سەرەتای پێکەوەنانیەوە تا کۆتـایی هـاتنی. ئەمـەش حوکمـەکانی هاوسـەر گـیری وتـەڵاق وڕەچـەڵەك، وخـەرجی کێشـان، ومـیرات وهاوشێوەکانی دەگرێتەوە.

٢- حوکمی مامەڵە داراییەکان (مەدەنیەکان): ئەو حوکمانەیە کە پەیوەسـتە بـە مامەڵەی تاکەکان وئاڵوگۆڕیانەوە، لە کـڕین وفرۆشـتن وکـریّ دان وشـەریکی وهـاو شێوەکانی.

٣- حـوکمی تاوانـەکان: کـە پەیوەسـتە بـەو شـتانەی لـە تـەکلیف لـیّ کـراو دەوەشێتەوە لە تاوان ودەست درێژیەکان، هەروەها شایستەی چ سزایەکە.

٤- حوکمی موڕافەعات[1] ودادوەری: کە تایبەتە بە بڕیاردان لە کێشە وناکۆکی وبانگەشەکان وڕێگای سەلماندنی وهاوشێوەکانی.

٥- حوکمە نێو دەوڵەتیەکان: ئەو حوکمانەیە کە پەیوەستە بە ڕێك خستنی پەیوەندی دەوڵەتی ئیسلام لەگەڵ ئەوانی تردا لە دەوڵەتانی ئاشتی وشەڕ خوازەکان، هەروەها پەیوەندی هاو ولاتیە ناموسڵمانەکان لەگەڵ دەوڵەت دا. وە تێکۆشان وپەیماننامەکانیش دەگرێتەوە.

## بەر وبومی زانستی فیقه:

شارەزا بون لە فیقه وئیش پێ کردنی ئەبێتە مایەی چاك بونی بەندە، ودروست بونی پەرستنەکانی، وڕێك بونی ئاکارەکانی. کەیش بەندە چاك بو کۆمەڵگە چاك دەبێت، بەر وبومی ئەمەش کامەرانی وخۆشی ژیانی دونیایە، لەگەڵ ڕەزامەندی وبەهەشتەکەی خوا لە دوا ڕۆژدا.

## فەزڵی شارەزا بون لە دین وهاندان بۆ فێرخوازی وزانست وەرگرتن:

شارەزا بون لە دین، لە باشترین کردەوەکان وپاك ترین خەسڵەتەکانە. دەقەکانیش لە قورئان وفەرمودە بەڵگەن لە سەر گەورەیی فەزڵی وهاندان بۆ لای. لەوانە: فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنْفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنْذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾ [التوبة:١٢٢] «وناگونجێت وناشبێت ئیمانداران هەر هەمویان دەر بچن بۆ تێکۆشان وجەنگ کردن لەگەڵ دوژمنەکەیان، بۆ ئەوەی ئەگەر دوژمن سەرکەوت بن بڕ نەبن، وەکو چۆن

---

(١) «المرافعات» کۆی «المرافعة»یە، کۆمەڵێك ڕێ وشوێنی دیاری کراوە دەگیرێتە بەر بۆ ڕاست کردنەوەی بانگەشە وخستنە ڕوی. بڕوانە: «المعجم الوسيط» (رفع). وەرگێڕ.

ناشبێت وناگونجێت هەموتان دابنیشن، ئەی كۆمەڵێك بۆ ناچن بۆ جیهاد كە بەس بێت ومەبەست بپێكێت، وكۆمەڵێكی تر نامێننەوە لەگەڵ پەیامبەردا ؟! ئەمەش بۆ ئەوەی فێری دین ببن لێوەی». هەروەها پەیامبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ: «مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ» «خوا ویستی خێری بۆ هەر كەسێك بوێت لە دین شارەزای دەكات وتێی دەگەیەنێت»[1]. دەبینی پەیامبەر ﷺ هەمو خێرێك دەبەستێتەوە بە شارەزا بون لە دین ولێ تێگەیشتنی، ئەمەش بەڵگەیە لە سەر گرنگیەكەی ومەزنی پایەكەی وبەرزی پلەكەی. هەروەها پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: «النَّاسُ مَعَادِنُ، خِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الْإِسْلَامِ إِذَا فَقُهُوا» «خەڵك وەك كانزان (بە بنەچە وڕیشەی خۆیانن)، باشترینەكەیان لە نەفامی باشترینەكەیانە لە ئیسلامەتی دا، ئەگەر لە دین شارەزا بن ولێی تێ بگەن»[2].

جا تێگەیشتن لە دین پایەكەی لە ئیسلامدا زۆر مەزنە، وپلەكەشی لە پاداشتدا زۆر گەورەیە، چونكە موسڵمان كە لە كاروباری دینەكەی شارەزا بو وتێگەیشت وزانی چ مافێكی هەیە وچ ئەرك واجبێكی لە سەرە؟ ئەوسا بە بەر چاو ڕۆشنیەوە پەرستنش بۆ خوا دەكات، وسەركەوتو دەبێت بۆ خێر وكامەرانی لە دونیا ودوا ڕۆژدا.

---

(١) أخرجه البخاري (٧١) واللفظ له، ومسلم (١٩٣٧).

(٢) أخرجه البخاري (٣٣٨٣) واللفظ له، ومسلم (٢٦٣٨).

# یەكەم: بەشی پاك وخاوێنی.

وله ده دەروازه پێك دێت:

دەروازەی یەكـــەم: له بارەی حوكمی پاك وخاوێنی وئاوەوه.

دەروازەی دوەم: له بارەی قاپ وقاچاخەوه.

دەروازەی سـێیەم: له بارەی دەست بە ئاو گەیاندن وئادابەكانیەوه.

دەروازەی چـوارەم: له بارەی سیواك وسوننەتەكانی فیترەتەوه.

دەروازەی پێنجەم: له بارەی ئیعتیكافەوه.

دەروازەی شەشەم: له بارەی مەسحی خوف ومێزەر ولەفافەوه.

دەروازەی حەوتەم: له بارەی غوسلەوه.

دەروازەی هەشتەم: له بارەی تەیەمومـەوه.

دەروازەی نۆیـــەم: له بارەی پیسیەكان وچۆنیەتی پاك كردنەوەیان.

دەروازەی دەیـــەم: له بارەی سوڕی مانگانه وزەیستانیەوه.

# دەروازەی یەکەم

## لە بارەی ئەحکامەکانی پاك وخاوێنی ( الطهارة ) وئاوەکانەوە.

**ولە چەندین مەسەلە «پرس» پێك هاتوە:**

**پرسی یەکەم: پێناسەی پاك وخاوێنی ورِون کردنەوەی گرنگیەکەی، وبەشەکانی:**

**١. گرنگی پاك وخاوێنی وبەشەکانی:**

پاك وخاوێنی کلیلی نوێژە، ویەکێکە لە مەرجە تەئکید لە سەر کراو (الْمُؤَکَّد)ـەکانی[1]، ومەرجیش، ئەبێ لە پێشی «مەرج بۆ گیراو» بێت[2].

**پاك وخاوێنیش دو بەشە:**

**بەشی یەکەم:** پاك وخاوێنیەکی مەعنەویە، کە بریتیە لە پاك وخاوێنی دڵ لە شیرك وسەرپێچیەکان وهەمو ئەو شتانەی پەردە ئەهێنن بە سەری دا، ئەم جۆرەش گرنگ ترە لە پاك وخاوێنی لاشە، وهەرگیز ناکرێت پاك وخاوێنی لاشە بە دی بێت لەگەڵ بونی پیسی شیرك دا، وەك پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ﴾ [التوبة:٢٨]. **واتە: «بەڕاستی هاوبەش دانەران پیسن».**

**بەشی دوەم:** بریتیە لە پاك وخاوێنی بەر جەستەیی، وا لەم چەند دێڕەی خوارەوەش بە وردی رِونی دەکەینەوە.

**٢. پێناسەکەی:**

لە زمانەوانیدا: بریتیە لە خاوێنی، وپاکبون لە پیسی.

---

(١) واتە: جەختی زۆری لە سەر کراوەتەوە، سوننەتی موئەککەدەیش هەمان واتای هەیە، ئەو سوننەتەیە پەیامبەر  ئەنجامی دابێت وبەردەوام بو بێت لە سەری. «وەرگێڕ»

(٢) ئەوەش جیاوازی نێوان مەرج ورِوکنە؛ رِوکن لە ناوەوەی دایە؛ وەك: سوژدە لە نوێژدا، بەڵام مەرج لە دەرەوەیە؛ وەك: دەست نوێژ بۆ نوێژ. دوایش دێت «وەرگێڕ»

**وله زاراوەش دا:** بریتیه له نەهێشتنی حەدەس (الحَدَث)، ولا بردنی پیسی (الخَبَث)[1].

**مەبەستیش له نەهێشتنی حەدەس:** لابردنی ئەو وەصفەیە کە بوەتە ڕێ گر له نوێژکردن، ئەمەش بە بەکارهێنانی ئاو لە هەمو لاشەدا ئەگەر حەدەسەکە گەورە بو، ئەگەر حەدەسەکەش بچوك بو تەنها ئاو دەهێنی بە سەر ئەندامەکانی دەست نوێژدا بە نیەتەوە، ئەگەر ئاویش نەبو یان نەکرا بەکار بهێنرێ، ئەوا جێ گرەکەی بە کار ئەهێنێت، کە بریتیە لە خۆڵ، بەو شێوازەی شەرع فەرمانی پێ کردوە، و-بە ویستی خوا- لە دەروازەی تەیەمومدا باس ئەکرێت.

**مەبەستیش له لابردنی پیسی:** واتە: لابردنی پیسی لە سەر لاشە وجل وبەرگ وشوێن.

**کەواتە** پاك وخاوێنی بەر جەستە (الحسي)ی دو جۆر بو: پاك وخاوێنی «حەدەس» کە تایبەتە بە جەستەوە، وپاك وخاوێنی «پیسی» کە تایبەتە بە لاشە وجل وبەرگ وشوێنەوە.

---

(١) حەدەس: بریتیە لە وەصفێکی لاشە، ڕێ گرە لە نوێژ وهاو شێوەکانی لەو شتانەی کە دەست نوێژی بۆ بە مەرج گیراوە. **ئەشبێتە دو جۆرەوە:**
**حەدەسی بچوك**، کە لە ئەندامەکانی دەست نوێژدا هەیە، وەك ئەو شتانەی لە هەر دو ڕێگاکەوە دێتە دەرەوە لە میز وپیسی [وبا]، وئەم حەدەسەش بە دەست نوێژ نامێنێت.
**وحەدەسی گەورە**، کە لە هەمو لاشەدا وەستاوە، وەك: لەش گرانی، ئەمەش بە خۆ شۆردن (الغُسْل) لا دەچێت، کەوابو؛ پاك کردنەوەی حەدەسی گەورە: بە غوسلە، وبچوکیش: بە دەست نوێژە، وبە جێگرەوەی ئەم دوانەیە لە کاتی نەکرانیاندا کە ئەویش: تەیەمومە. بڕوانە: «شرح الممتع» (١٩/١)، «الفقه الإسلامي وأدلته» (٢٣٨/١). و«الخبث»یش واتە: پیشی. دواجار زیاتر ڕونی دەکەینەوە.

وحەدەسیش دو جۆر بو: حەدەسی بچوك، کـه دەسـت نوێـژ پێویسـت دەکـات، وحەدەسی گەورە، که غوسل پێویست ئەکات.

بەڵام پیسی ئەبێتـه سـێ جـۆرەوە: پیسـیەك پێویسـته بشـۆردرێت، وپیسـیەك پێویسته ئاو پرژێن بکرێت، وپیسیەك پێویسته بسڕدرێت.

## پرسی دوەم: ئەو ئاوەی پاك وخاوێنی پیٚ بەدی دێت:

پاك کردنەوە پێویستی بە شتێك هەیە پێی پاك بکرێتەوە، پیسی پیٚ لا بـبرێ وحەدەسی پیٚ هەڵ بگیرێت، ئەمەش بریتیە لە ئاو، وئەو ئاوەشی پـاك وخـاوێنی پیٚ بەدی دێت ئاوی پاکە؛ ئەو ئاوەی چۆن دروست کراوە ئا بەو شێوازە مابێتەوە، ئیتر لە ئاسمانەوە دابەزیبێت: وەك باران وبەفرە تواوەکـان وتـەرزە، یـا بـە سـەر زەویـدا بـڕوات، وەکـو: ئـاوی ڕوبـار وکانیـاو وبـیر ودەریاکـان. بـە بەڵگـەی فەرمایشتەکەی خـوا ﷻ: ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ﴾ [الأنفال:١١] «ولـە هەورەکانەوە ئاوێکتان بۆ دادەبارێنیٚ تا ئێوەی پیٚ پاك بکاتـەوە». هـەروەها ﷻ ئەفـەرمویٚ: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾﴾ [الفرقان:٤٨]، «وئێمـە لـە هەورەکانـەوە ئاوێکی پاکمان بۆ دا باراندون». هـەروەها لـە بـەر فەرمودەکـەی پەیامبـەر ﷺ ئەفەرمویٚ: «اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ» «خوایـە! بمشـۆ لـە تاوانەکانم بە ئاو وبـەفر وتـەرزە»[1]. هـەروەها پەیامبـەر ﷺ لـە بـارەی ئـاوی دەریـاوە ئەفـەرمویٚ: «هُـو الطَّهُـورُ مـاؤُهُ، الحِـلُّ مَيْتَتُـه» «ئاوەکـەی پاکـە، ومردارەوەبوەکەشی پاکە»[2]. ئەم ئاوەش خۆی پاکە وپاك کەرەوەی شتی تریشە.

(١) أخرجه البخاري (٧٤٤)، ومسلم (٥٩٨).
(٢) أخرجه أبـو داود (٨٣)، والترمـذي (٦٩)، والنسـائي (٥٩)، وابـن ماجـه (٣٢٤٦)، قـال الترمـذي: «حديث حسن صحيح». وصححه الألباني «صحيح سنن النسائي» ٥٨».

پاك بونەوەش لە حەدەس هەرگیز بە شلەکانی تری جگە لە ئـاو بـە دی نایـەت، وەك: سرکە وبەنزین وشـەربەت ولیمـۆ وهاوشـێوەکانیان، لـە بـەر فەرمایشـتەکەی پـەروەردگار: ﴿فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا﴾ [المائدة:٦]. واتـە: «ئەگـەر ئاوتـان دەست نەکەوت، ئەوا بە خۆڵێکی پاك تەیەموم بکەن». جا ئەگەر پاك وخـاوێنی بـە شلەیەکی تری جگە لە ئاو بەدی بهاتبا، ئەگەر ئاوی دەست نەکەوتبایە ڕێنمایی بـۆ لا دەکرا، نەك بۆ لای خۆڵ.

بەڵام سەبارەت بە لا بردنی پیسی، ئەوا هەر شلەیەك بەس لایبدات، پێی بـە دی دێت وەك ئەو شلە تازانەی لەم سەردەمە دروست کراون.

## پرسی سێیەم: ئاو ئەگەر پیسی تێکەڵ بو:

ئاو -کەم بێت یا زۆر- ئەگەر پیسیەکی تێکەڵ بو، ویەکێك لە سـێ سـیفەتەکەی گۆڕی -بۆنی، یا تامی، یا ڕەنگی- ئەوا بە کۆ دەنگی پیسە ونابێ بەکار بهێنرێـت، نە حەدەس ونە پیسی لا نادات.

بەڵام ئەگەر پیسیەکی تێکەڵ بو یەکێك لەم سێ سیفەتەی نەگۆڕی:

- ئەگەر زۆر بو، ئەوا پیس نابێ وپاك وخاوێنی پێ بە دی دێت.
- ئەگەریش کەم بو ئەوا پیس ئەبێ وپاك وخاوێنی پێ بە دی نایەت.

**پێناسەی ئاوی زۆریش ئەوەیە:** بگاتە دو قوللـە (قُلَّة)[1] یـا زیـاتر، کـەمیش ئەوەیە لەمە کەم تر بێت. بەڵگـەش لـە سـەری: فەرمودەکـەی ئـەبو سـەعیدی خودریـە ﷺ، کـە پەیامبـەری خـوا ﷺ ئەفـەرمێ: «إِنَّ المَاءَ طَهُورٌ لَا يُنَجِّسُه

---

(١) «القلة» بریتیە لە گۆزەی گەورە، بە «قُلل» و«قلال» کۆ دەکرێتەوە. دەکاتە نزیکەی ٩٣,٠٧٥ مەن کە بەرامبەری ١٦٠,٥ لیتری ئاوە، ودو قوللە دەکاتە نزیکەی پێنج مەشکە.

شَيءٌ» «ئاو پاکە، هیچ پیسی ناکات»[1]. وفەرمودەکەی ئیبن عومەرە رضي الله عنهما کە پەیامبەری خوا ﷺ ئەفەرمێ: «إِذَا بَلَغَ الماءُ قُلَّتَيْنِ لَم يَحْمَل الخَبَثَ» «ئەگەر ئاو بگاتە دو قوللە ئەوا پیسی هەڵ ناگرێت»[2].

## پرسی چوارەم: ئەگەر ئاو شتێکی پاکی تێکەڵ بو:

ئەگەر ئاو ماددەیەکی پاکی تێکەڵ بو، وەکو گەڵای دار یا سابون یا ئوشنان[3] یا نەبك ومادە پاکەکانی تر، وئەم ماددەیەی تێکەڵی بوە زاڵ تر نەبێت، ئەوا وتەی ڕاست ئەوەیە پاکە ودەتوانێت خۆی پێ پاك بکاتەوە لە حەدەس وپیسی، چونکە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ﴾ [النساء:٤٣] «ئەگەر نەخۆش بون یا لە سەفەر بون یا کەسێکتان لە سەر ئاوەوە هات، یا لەگەڵ خێزانتان دا جوت بون، وئاوتان دەست نەکەوت، ئەوە تەیەموم بکەن بە خۆڵێکی پاك ودەست بسڕن بە دەم وچاو ودەستەکانتاندا». جا وشەی «ئاو» لە ئایەتەکەدا نەناسراو (نکرة)یە لە چوارچێوەی نەرێ دا هاتوە[4]، بۆیە هەمو ئاوێك دەگرێتەوە، وجیاوازیش نیە لە نێوان ئاوی پەتی وتێکەڵاو.

هەروەها پەیامبەر ﷺ بەو ئافرەتانەی فەرموە کە خەریکی شۆردنەوەی کچەکەی بون: «اغْسِلْنَهَا ثَلَاثًا، أَوْ خَمْسًا، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ

---

(١) أخرجه أحمد (١٥/٣)، وأبو داود (٦١)، والنسائي (٢٧٧)، والترمذي (٦٦) وقال: «حديث حسن». وصححه الألباني في «الإرواء» (٤٥/١).

(٢) أخرجه أحمد (٢٧/٢)، وأبو داود (٦٣)، والترمذي (٦٧)، والنسائي (٥٢)، وابن ماجه (٥١٧) ولفظه: «إذا كان الماء قلتين لم ينجسه شيء»، وصححه الألباني في «الإرواء» (٤٥/١).

(٣) «الأُشنان» بریتیە لە ترشەیەك دەستی پێ ئەشۆردرێت، بە عەرەبیش پێی ئەوترێ: حورد. وبە کەسرەی ئەلیفەکە –«إشنان»–یش دەخوێنرێتەوە.

(٤) مەبەستی ئەو بنچینەی ئوصولی فیقهە کە ئەڵێ: «النَّكِرَةُ فِي سِيَاقِ النَّفْيِ». «وەرگێڕ»

فِي الْآخِرَةِ كَافُورًا، أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ» «بیشۆرنەوە سێ جار یا پێنج جار یا زیاتر لەوە ئەگەر بینیتان پێویست ئەكات، بە ئاو ونەبك، لە كۆتایشدا بە كافور، یا هەندێ كافوری تێكەڵ بكەن»[1].

## پرسی پێنجەم: حوكمی ئاوی بە كار هێنراو لە پاك وخاوێنی دا:

ئاوی بە كار هێنراو لە پاك وخاوێنی دا، بۆ نمونە: وەك ئەو ئاوەی لە ئەندامەكانی دەست نوێژ گر یا غوسڵ كەر جیا بوەتەوە= ئاوێكی پاكە وپاك كەرەوەیە لە سەر ڕای دروست، وحەدەس وپیسی لا دەبات، مادام هیچ كام لە سێ سیفەتەكەی نەگۆڕاوە: كە بۆن وتام ورەنگە. وبەڵگەی پاكیتیشی ئەوەیە: «پەیامبەری خوا ﷺ ئەگەر دەست نوێژی بگرتبایە وەخت بو لە سەر ئاوەكەی بكەنە شەڕ»[2]. هەروەها ئەو كاتەی جابر نەخۆش بو، پەیامبەر ﷺ لە ئاوی دەست نوێژەكەی خۆی كرد بە سەر جابر دا[3]. خۆ ئەگەر پیس بوایە دروست نەبو كاری وا بكات.

هەروەها پەیامبەری خوا ﷺ وهاوەڵ وخێزانەكانیشی لە پەرداخ وجام (القَدَح) ودەوری وقاپلەمە (التَّوْر) دەست نوێژیان گرتوە، ولە مەنجەڵ وتەشت (الجِفَان) دا غوسڵیان كردوە، شتی ئاوهاش بە كار هێنەرەكەی لە پرش كەوتنە ناو ئاوەكە سەلامەت نابێت.

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٢٥٣، ١٢٥٨، ١٢٥٩، وغيرها)، ومسلم (٩٣٩).
(٢) أخرجه البخاري (١٨٩).
(٣) أخرجه البخاري (٥٦٥١)، ومسلم (١٦١٦).

هەروەها پەیامبەری خوا ﷺ بە ئەبو هورەیرەی فەرمو[1] -ئەو کاتەی لەش گران بو-: «إِنَّ المُؤْمِنَ لا يَنْجُسُ» «ئیماندار پیس نابێت». دە کەوابو ئاو بە بەرکەوتنی لاشە -بەرکەوتنێکی پەتی- پاکێتی خۆی لە دەست نادات.

سەبارەت بە پاشماوەی ئاو؛ دروستە ئافرەت بە ئاوی پاش ماوەی پیاو خۆی پاك بکاتەوە، وپیاویش بۆی دروستە بە ئاوی پاش ماوەی ئافرەت خۆی پاك بکاتەوە، چونکە پەیامبەر ﷺ بە پاش ماوەی مەیمونە غوسلی کردوە[2].

## پرسی شەشەم: شوێن دەمە (السُّؤْر)ی ئادەمیزاد ومەڕ ومانگا ووشتر:

شوێن دەمە «السؤر»: بریتیە لەوەی دوای لێ خواردن لە قاپدا دەمێنێتەوە، جا ئادەمیزاد پاکە، شوێن دەمیشی پاکە، موسڵمان بێت یا نا، لەش گران بێت یا ئافرەت بێت لە سوڕی مانگانەدا، لە پەیامبەریشەوە ﷺ چەسپاوە فەرمویەتی [وەك باس کرا]: «ئیماندار پیس نابێت». ولە عائیشەوە ﵂ هاتوە[3]: لە سوڕی مانگانە بوە لە پەرداخ دا خواردنەوەی خواردۆتەوە، پەیامبەری خواش ﷺ لەو شوێنەی پەرداخەکەوە خواردویەتیەوە کە عائیشە لێی خواردۆتەوە.

وزانایان کۆکن لە سەر پاکێتی شوێن دەمی ئەو ئاژەڵانەی گۆشتیان ئەخورێت لە مەڕ ومانگا وشتر وجگە لەمانەش.

بەڵام ئەوانەی گۆشتیان ناخورێت وەك: دڕندەکان وگوێدرێژەکان وجگە لەمانە، شوێن دەمیان پاکە وکاریگەری ناکاتە سەر ئاوەکە، هەروەها شوێن دەمی

(١) أخرجه مسلم (٣٧١).
(٢) أخرجه مسلم في صحيحه (٣٢٣).
(٣) أخرجه مسلم (٣٠٠).

پشیلە، چونکە کاتێك پشیلەیەك لە دەفرێکی خواردەوە، پەیامبەر ﷺ فەرمویەتی: «إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجِسٍ، إِنَّهَا مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ وَالطَّوَّافَاتِ» «پیس نیە، چونکە پشیلە لەو ئاژەڵانەیە زۆر لە دەور دەست تانن ودێن ودەڕۆن»[1]. هەروەها لە بەر ئەوەی زۆر جار قورسە خۆ پارێزی لێ بکرێت، جا ئەگەر بڵێین شوێن دەمیان پیسە وپێویستە قاپەکە بشۆردرێت، ئەوا ناڕەحەتی تێدایە، ناڕەحەتیش لە سەر ئەم ئومەتە هەڵ گیراوە.

**شوێن دەمی سەگیش: پیسە، هەروەها بەرازیش.**

**سەگ:** لە بەر ئەوەی لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ هاتوە، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «طُهُورُ إِنَاءِ أَحَدِكُمْ إِذَا وَلَغَ[2] فِيهِ الْكَلْبُ أَنْ يَغْسِلَهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ، أُولاهُنَّ بِالتُّرَابِ» «پاکبونەوەی قاپی هەرکەسێکتان ئەگەر سەگ زمانی تێخست، ئەوەیە: حەوت جار بیشوات یەکەمیشیان بە خۆڵ بێت»[3].

**سەبارەت بە بەرازیش:** چونکە پیس وچەپەڵ وقیزەونە، وەك پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ﴾ [الأنعام:١٤٥] «ولەوەی حەرامان کردوە، گۆشتی بەرازە، چونکە پیسە».

---

(١) أخرجه أحمد (٥/٢٩٦) وأبو داود (٧٥)، والترمذي (٩٢) وقال: «حديث حسن صحيح»، وصححه الألباني «الإرواء» (٢٣).

(٢) «وَلَغَ»: بە زمانی لێی خوارد.

(٣) أخرجه البخاري (١٧٢)، ومسلم (٢٧٩) - ٩١، واللفظ لمسلم.

# دەروازەی دووەم

## لە بارەی قاپ وقاچاخەکانەوە «الآنيَة».

«الآنِيَة»: ئەو قاپ وقاچاخانەیە کە ئاو وشتەکانی تری تێدا دەپارێزرێت، ئیتر لە ئاسن بێت یا نا، وەکو بنەماش حەلاڵە، لە بەر فەرمایشتی پەروەردگار: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ [البقرة:٢٩] «ئەو پەروەردگارەیە کە هەرچی لە زەویدایە بۆ ئێوە دروستی کردوە».

ئەم دەروازەیەش لە چەند پرسێك پێك هاتوە:

### پرسی یەکەم: بە کار هێنانی قاپ وقاچاخی زێڕ وزیو وهی تریش لە پاك وخاوێنی دا[1]:

بەکار هێنانی سەرجەم قاپ وقاچاخەکان لە خواردن وخواردنەوەدا دروستە، ئەگەر پاك وحەلاڵ بێت، چونکە لە سەر بنەماکەی خۆیان کە حەلاڵێتیە ماونەتەوە، جگە لە قاپ وقاچاخی ئاڵتون وزیو نەبێ، خواردن وخواردنەوە تێیاندا حەرامە، چونکە پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: «وَلَا تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَلَا تَأْكُلُوا فِي صِحَافِهَا، فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَكُمْ فِي الْآخِرَةِ» «لە قاپ وقاچاخی زێڕ وزیودا مەخۆنەوە، لە دەفرەکانیشیاندا مەخۆن، چونکە لە دونیادا بۆ ئەوانە، ولە دوا ڕۆژیشدا بۆ ئێوە»[2].

---

(١) واتە: بۆ نمونە: دەتوانێت دەست نوێژی تێدا بگرێت. ئەمە مەبەستە. «وەرگێڕ»

(٢) أخرجه البخاري (٥٤٢٦)، ومسلم (٢٠٦٧).

هەروەها پەیامبەری خوا ﷺ ئەفـەرمێ[1]: «الَّذِي يَشْرَبُ فِي آنِيَةِ الْفِضَّةِ، إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ» «ئەوەی كە لە دەفری زیو دەخواتەوە، ئاگری دۆزەخ لـە ناو سكیدا قوڵپە قوڵپی دێت». ئەمانـەش دەقـن[2] لـە سـەر حـەرامێتی خـواردن وخواردنەوە تێیاندا، ورێگری كردنەكـەش گشـتیە؛ قـاپێكی زێـڕ وزیـوی پـەتی یـا ڕوپۆش كراو بە زێڕ وزیو یا ئـەوەی هەنـدێك ئـاڵتون وزیـوی تێـدا بێـت، هـەموی دەگرێتەوە.

## پرسی دوەم: حوكمی بەكار هێنانی دەفری چاك كراو بە ئاڵتون وزیو:

ئەگەر هاتو لەحیمەكە (الضَّبة)[3] لە ئاڵتون بو، حەرامە دەفرەكە بەكار بهێنریـت بە هەر شێوەیەك بێت (مطلقًا)، چونكە ئەڕواتە ژێـر گشـتیەتی دەقەكانـەوە، بـەڵام ئەگەر لە زیـو بـو، كـەمیش بـو، دروسـتە دەفرەكـە بـە كـار بهێنرێـت، لـە بـەر فەرمودەكـەی ئەنـەس ﷺ: «أَنَّ قَدَحَ النَّبِيِّ ﷺ انْكَسَرَ، فَاتَّخَذَ مَكَانَ الشَّعْبِ سِلْسِلَةً مِنْ فِضَّةٍ»، «پەرداخەكەی پەیامبەری خوا ﷺ شكا، لـە شـوێنی شـكانەكە زیوی بەكار هێنا»[4].

## پرسی سێیەم: قاپ وقاچاخی بێ باوەڕان:

بنەما لە قاپ وقاچاخی بێ باوەڕان دا حەڵاڵیەتیە، مەگەر بزانرێـت پیسـە، ئـەو كاتە دروست نیە بە كار بهێنرێت مەگەر دوای شۆردنی، لە بەر فەرمودەكـەی ئـەبو سەعلەبەی خوشەنی ﷺ ئەڵێ: وتم ئەی پەیامبەری خوا! ﷺ ئێمە لـە ناوچـەیەكین

---

(١) أخرجه البخاري (٥٦٣٤)، ومسلم (٢٠٦٥).

(٢) دەق «النص» لە لایان ئەوەیە: واتاكەی ڕون ودیارە وواتای تر هەڵ ناگرێت. «وەرگێڕ»

(٣) «الْمُضَبَّب»: بریتیە لە چاك كردنەوەی دەفری شكاو بە ئاسن وهتد... [واتە: لەحیم كردن].

(٤) أخرجه البخاري (٣١٠٩).

خاوەن كتێبەكانی تێدایە، ئایا لە قاپ وقاچاخیان بخۆینەوە؟ فەرموی: «لَا تَأْكُلُوا فِيهَا، وَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَاغْسِلُوهَا ثُمَّ كُلُوا فِيهَا» «تێیدا مەخۆنەوە مەگەر هیچتان دەست نەكەوێت، ئەو كاتە بیشۆن پاشان شتی تێدا بخۆن»[1].

بەڵام ئەگەر نەزانرا پیسە، ئەوە دروستە بەكار بهێنرێت، چونكە چەسپاوە پەیامبەر ﷺ وهاوەڵەكانی ئاویان لە كونەی ئافرەتێكی موشریك بردوە بۆ دەست نوێژ[2]، هەروەها خوا سبحانە خواردەمەنی خاوەن كتێبەكانی بۆ حەڵاڵ كردوین، كە لە دەفرەكانی خۆیاندا پێشكەشی ئێمەی ئەكەن، وەك چۆن منداڵە یەهودیەكە بانگ هێشتی پەیامبەری خوای ﷺ كرد بۆ نانی جۆ وچەوری وزەیت (إهالة)یێك كە بۆنی گۆڕابو (سَنِخَة)، ئەویش لێی خوارد[3].

## پرسی چوارەم: حوكمی پێستەی مردارەوە بو:

پێستەی مردارەوە بو ئەگەر خۆشە ودەباغ كرا پاك ئەبێتەوە ودروستە بەكار بهێنرێت، لە بەر فەرمایشتەكەی پەیامبەر ﷺ: «أَيُّمَا إِهابٍ دُبغ فقدْ طَهُرَ» «هەر پێستەیەك خۆشە بكرێ ئەوە بێگومان پاك بوەتەوە»[4]. هەروەها ﷺ بەلای شەكێكی مردارەوە بو دا تێ پەڕ بو، فەرموی[5]: «هَلَّا أَخَذُوا إِهَابَها فَدَبَغُوه فَانْتَفَعُوا بِه» «ئەی بۆ پێستەكەیان نەبرد خۆشەی بكەن وكەڵكی لێ وەر بگرن!؟»، وتیان: ئەوە مردارەوە بوە! فەرموی: «فإنما حَرُمَ أكلُهَا» «تەنها خواردنی حەرام

---

(١) أخرجه البخاري (٥٤٧٨)، ومسلم (١٩٣٠) [هذا لفظه].

(٢) أخرجه البخاري (٣٤٤) ومسلم (٦٨٢).

(٣) أخرجه أحمد (٣/٢١٠). وصححه الألباني «الإرواء» (٧١/١)، والإهالة: چەوری وزەیتە. والسنخة: بۆنی گۆڕاوە.

(٤) أخرجه الترمذي (١٦٥٠)،ومسلم (٣٦٦) بلفظ: «إذا دبغ الإهاب فقد طهر» من حديث ابن عباس.

(٥) أخرجه مسلم (٣٦٣)، وابن ماجه (٣٦١٠).

کراوە)). ئەمە ئەگەر هاتو ئاژەڵەکە بە سەر بڕین حەڵاڵ دەبو، ئەگەرنا نەخێر، [جا ئەبێت: ئاژەڵەکە گۆشتی بخورێت، ئەگەرنا پاکەوە نابێت].

خُری[(١)] (مو)ەکەشی پاکە، یانی: خوری مردارەوە بوی گۆشت حەلاڵ کە زیندو بێت، بەڵام گۆشت وئێسك ودەمارەکانی پیسە وخواردنیشی حەرامە، لە بەر ئایەتی: ﴿إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ﴾ [الأنعام:١٤٥]. واتە: ((خواردنەکان حەلاڵن بۆم مەگەر مردارەوە بو یا خوێنی ڕژێنراو (چۆڕاو) یا گۆشتی بەراز، چونکە پیسە)).

خۆشەکردنیش بە خاوێن کردنەوەی پیسی قەد پێستەکە بەدی دێت، لە ڕێگەی هەندێك مادەوە تێکەڵی ئاو دەکرێ وەك خوێ وهتد، یا بە ڕوەکێکی ناسراو بەو بوارە وەکو هەورس ((العرعر))[(٢)] و((القَرَظ))[(٣)] وهاوشێوەکانیان.

ئەو ئاژەڵانەشی کە سەر بڕینی شەرعیان بە سەردا نایەت، پێستەکەی پاك نابێتەوە، کەواتە: پێستەی پشیلە ولەو بچوکتریش بە خۆشەکردنی پاك نابنەوە، با بە زیندویش پاك بێت.

**بە پوختی**: هەر ئاژەڵێك مردارەوە بێت وگۆشتی حەلاڵ بێت، ئەوە پێستەکەی بە خۆشەکردن پاك دەبێتەوە، بەڵام هەر ئاژەڵێك مردارەوە بێت وگۆشتی نەخورێت، پێستەکەی بە خۆشە کردنیش پاك نابێتەوە.

(١) زۆرێك دەنوسن: ((خوری))، بەڵام لەوانەیە بەو شێوازەی نوسراوە ورد (دقیق) تر بێت، وەك کۆمەڵێك لە نوسەران وشارەزایانی زمانی کوردی ئەم شێوازەیان بە کار هێناوە. ((وەرگێڕ))

(٢) درەختی عەرعەر، لە سنۆبەر دەچێت. ((وەرگێڕ))

(٣) [گەڵای دار ((سەلەم))ە، وەك دار گوێز وایە، بۆ خۆشە ودەباغ کردن بە کار دێت. وترا‌ویشە گەڵای دار نەبکە].

# دەروازەی سێیەم

## دەربارەی دەست بە ئاو گەیاندن وئادابەکانی [( تارات گرتن )]

وچەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

### پرسی یەکەم: «الإِسْتِنْجَاء» و«الإِسْتِجْمَار» وشوێن گرتنەوەیان بۆ یەکتر:

«الإِسْتِنْجَاء» بە ئاو لابردنی ئەو شتەیە کە لە هەردو دەرەچەکەوە دێتە دەرەوە. «الإِسْتِجْمَار»یش: بریتیە لەوەی بیسڕیت بە شتێکی پاکی حەلاڵی پاك کەرەوە (لابەر)، وەك: بەرد وهاو شێوەکانی، وهەر یەکەیان جێگەی ئەوی تریان دەگرنەوە، چونکە ئەمە لە پەیامبەری خواوە ﷺ چەسپاوە، ئەوەتا ئەنەس ئەڵێ: «پەیامبەری خوا ﷺ ئەڕۆشتە عەدەب خانە، من ومنداڵێکی هاو تەمەنی خۆم کونەیەکی بچوکی ئاو لەگەڵ ڕمێکی بچوك (العَنَزة)یەکمان هەڵ دەگرت، ئەویش خۆی بە ئاوەکە پاك دەکردەوە»[1]. هەروەها لە عائیشەوە رضي الله عنها ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «إِذَا ذَهَبَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْغَائِطِ، فَلْيَذْهَبْ مَعَهُ بِثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ يَسْتَطِيبُ بِهِنَّ، فَإِنَّهُنَّ تُجْزِئُ عَنْهُ» «کەسێکتان چو بۆ ئاودەس، با بە سێ بەرد خۆی پاك بکاتەوە، ئەوە بەسیەتی»[2]. بەڵام کۆ کردنەوەی هەر دو کیشیان باشترە.

«الإِسْتِجْمَار»یش بە بەرد وهاو شێوەکانی لە شتە پاکە لابەر (مُنْق)یە حەلاڵەکان بە دی دێت، وەکو کلینیسك ودار وهاو شێوەکانیان، چونکە پەیامبەر ﷺ بە بەرد خۆی پاك کردۆتەوە، کەواتە هەر شتێك هاو شێوەی بێت لە لابردن وپاك کردنەوە

(١) أخرجه مسلم (٢٧١)، والإداوة: إناء صغير من جلد.

(٢) أخرجه أحمد (٦/١٠٨) [هذا لفظه]، والدارقطني (١٤٤) وقال: «إسناد صحيح»، [وأخرجه أبو داود (٤٠)، والنسائي (٤٤) وهما أولى بالعزو من الثاني].

دەخرێتە پاڵی، وخۆ پاکردنەوەش بە کەم تر لە سێ سڕین بە دی نایەت، لە بەر فەرمودەکەی سەلمان ﷺ ئەفەرموێ: «نَهَانَا -يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ- أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِاليَمِينِ، وأن نستنجي بأقل من ثلاثة أحجار، وأن نستنجي برجيع أو عظم» «پەیامبەری خوا ﷺ نەهی لێ کردوین بە دەستی ڕاست کارات بگرین، یا کەمتر لە سێ بەرد بەکار بهێنین، هەروەها بە پیسایی ئاژەڵ (رَجيع)[1] یا ئێسك خۆمان پاك بکەینەوە»[2].

## پرسی دووەم: ڕو کردن وپشت کردنە قیبلە لە کاتی دەست بە ئاو گەیاندن دا:

دروست نیە لە کاتی دەست بە ئاو گەیاندن لە دەشتێك دا کە هیچی لە بەردەم نەبێت، ڕو یا پشت بکرێتە قیبلە، لە بەر فەرمودەکەی ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «إِذَا أَتَيْتُم الغَائِطَ فَلَا تَسْتَقْبِلُوا القِبْلَة، ولا تَسْتَدْبِرُوهَا، وَلَكِنْ شَرِّقوا أَوْ غَرِّبُوا» «ئەگەر چون بۆ ئاو دەس، نە ڕو بکەنە قیبلە نە پشتی لێبکەن، بەڵکو ڕو بکەنە ڕۆژ هەڵات یان ڕۆژ ئاوا». ئەبو ئەیوب ئەڵێ: ئەوەبو ڕۆیشتینە شام، تەماشا ئەکەین عەدەب خانەکانیان ڕو بەرەو کەعبە بونیاد نراوە، ئێمەش ڕومان وەر دەگێڕا وداوای لێ بوردنمان لە خوا دەکرد»[3].

بەڵام ئەگەر لە ناو ماڵاندا بو، یا بەینی ئاو دەستەکە وقیبلە داپۆشەرێك هەبو، ئەوە دروستە، لە بەر حەدیسەکەی ئیبن عومەر ﷺ کە: «پەیامبەری خوای ﷺ بینیوە لە ماڵی خۆیاندا ڕوەو شام وپشت بە کەعبە میزی کردوە»[4]. وفەرمودەکەی

---

(١) بریتیە لە پاشەڕۆی ئاژەڵی سمدار، واتە: تەپاڵە وتەرس وپشقل و... دەگرێتەوە، ئەمە وەکو زمانەوانی، بەڵام لە شەرعدا پیسایی هەمو ئاژەڵێك دەگرێتەوە. «وەرگێڕ»

(٢) أخرجه مسلم (٢٦٢)، والرجيع: العَذِرَةُ والروْثُ.

(٣) أخرجه البخاري في كتاب الوضوء (١٤٤)، ومسلم (٢٦٤).

(٤) أخرجه البخاري (١٤٨)، ومسلم (٢٦٦).

مەڕوانی ئەصفەر ئەڵێ: «ئیبن عومەر ﷺ ئاژەڵەكەی ڕو بەرەو قیبلە یەخ دا، پاشان دانیشت وبەو ئاراستە میزی كرد، وتم: ئەی باوكی عەبدولڕەحمان، ئەی نەهی نەكراوە لەمە؟ وتی: بۆ نە، نەهی لەمە كراوە ئەگەر لە دەشت بیت، بەڵام ئەگەر لە نێوان تۆ وقیبلە شتێك هەبو دەبوە بەر بەست، ئەوە هیچی تێدا نیە»[1]. باشتریش وایە لە ناو ماڵانیشدا نەكرێ. خواش زاناترە.

## پرسی سێیەم: سوننەتەكانی كاتی چونە عەدەب خانە:

ئەو كەسەی ئەڕواتە سەر ئاو، سوننەتە بڵێ: «بِسْمِ الله، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِن الخُبُثِ والخَبَائِثِ» «بِسْمِ الله، خوایە پەنات پێ دەگرم لە جنۆكەی نێرینە ومێینە». ولە كاتی تەواو بون ودەرچوندا ئەڵێ: «غُفْرَانَكَ» «خوایە داوای لێ خۆش بونت لێ دەكەم». لە چونە ژورەوەشدا قاچی چەپی پێش دەخات، لە هاتنە دەرەوەشدا قاچی ڕاستی. كەل وپەلەكەشی هەڵ ناكات عەورەتی دەر بكەوێت تا لە زەوی نزیك دەبێتەوە.

ئەگەریش هاتو لە دەشت دا بو، سوننەتە دور بكەوێتەوە ولە بەر چاو نەمێنێت، بەڵگەی هەمو ئەمانە: فەرمودەكەی جابرە ﷺ ئەڵێ: «خَرَجْنَا معَ رَسول الله ﷺ فِي سَفَرٍ، وَكَان رَسولُ الله ﷺ لَا يَأْتي البَرَازَ حتَّى يَتَغَيَّب فلا يُرى» «دەرچوین بۆ سەفەرێك لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ، جا پەیامبەر ﷺ دەستی بە ئاو نەدەگەیاند تا تەواو لە بەر چاو ون دەبو ونە دەبینرا»[2]. هەروەها فەرمودەكەی عەلیە ﷺ ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «سَتْرُ مَا بَيْنَ الجِنِّ وَعَوراتِ بَنِي آدَم إِذَا دَخَل

(١) أخرجه أبو داود (١١)، والدارقطني (١٥٨)، والحاكم (١/١٥٤). وصححه الدارقطني، والحاكم وافقه الذهبي، وحَسنه الحافظ ابن حجر، والحازمي، والألباني، انظر: «الإرواء» (٦١).

(٢) أخرجه أبو داود (٢)، وابن ماجه (٣٣٥)، واللفظ له، وإسناده صحيح. انظر: «صحيح ابن ماجه» (١/٦٠).

الخَلَاءِ، أَنْ يقولَ: بِسْمِ اللهِ» «پەردەی نێوان جنۆکە وعەورەتی ئادەمیزاد ئەوەیە ڕۆیشتە ئاو دەست بڵێت: بِسْمِ اللهِ»[1]. هەروەها فەرمودەکەی ئەنەسە ﷺ ئەڵێ: «پەیامبەری خوا ﷺ ئەگەر بڕوایەتە سەر ئاو، ئەیفەرمو: «بە ناوی خوا، خوایە! پەنات پێ دەگرم لە جنۆکەی نێرینە ومێینە»[2]. هەروەها فەرمودەکەی عائیشەیە ﷺ کە ئەڵێ: «پەیامبەری خوا ﷺ لە سەر ئاو دەر بچوایە ئەیفەرمو: «خوایە! داوای لێ خۆش بونت لێ دەکەم»[3]. هەروەها فەرمودەکەی ئیبن عومەرە ﷺ ئەڵێ: «پەیامبەری خوا ﷺ ئەگەر بیویستایە بڕواتە سەر ئاو، جل وبەرگەکەی بەرز نەدەکردەوە تا لە زەوی نزیك دەبویەوە»[4].

## پرسی چوارەم: ئەو شتانەی لە کاتی دەست بە ئاو گەیاندندا حەرامە:

١. حەرامە میز بکرێتە ئاوی وەستاوەوە، لە بەر فەرمودەکەی جابر ﷺ، کە پەیامبەری خوا ﷺ: «نَهَى عَنْ البَوْلِ فِي المَاءِ الرَّاكِدِ» «نەهی کردوە لە میز کردنە ناو ئاوی وەستاو»[5].

٢. هەروەها لە کاتی میز کردن دا بە دەستی ڕاستی عەورەتی ناگرێت، یا خۆی پێ پاك ناکاتەوە، لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «إِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَأْخُذَنَّ

(١) أخرجه ابن ماجه (٢٩٧)، والترمذي (٦٠٦) وحسنه أحمد شاكر في حاشية الترمذي، وصححه الألباني. صحيح الجامع الصغير (٣٦١١).
(٢) أخرجه البخاري (١٤٢)، ومسلم (٣٧٥).
(٣) أخرجه أبو داود (١٧)، والترمذي (٧)، وقال: «حسن غريب». وحسنه الألباني «صحيح الجامع» ٤٧٠٧).
(٤) أخرجه أبو داود (١٤)، والترمذي (١٤) وصححه الألباني، انظر: «صحيح الجامع » (٤٦٥٢).
(٥) أخرجه مسلم (٢٨١)، ونحوه عند البخاري (٢٣٩). و«الراكد»: هو الساكن الذي لا يجري.

ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَلَا يَسْتَنْجِي بِيَمِينِهِ» «ئەگەر کەسێکتان میزی کرد، با بە دەستی ڕاستی عەورەتی نەگرێت، وخۆی پێ پاك نەکاتەوە»[1].

٣. هەروەها حەرامە میز یا پیسی بکات لە سەر ڕێگا یا لە سێبەر یا لە باخچەی گشتی یا لە ژێر داری بەربوم دار یا لە سەر کانی وچاوگەکان دا، لە بەر فەرمودەکەی موعاز ﷺ ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «اتَّقُوا الْمَلَاعِنَ الثَّلَاثَ[ـةَ]: الْبَرَازَ فِي الْمَوَارِدِ، وَقَارِعَةِ الطَّرِيقِ، وَالظِّلِّ» «خۆتان لەو سێ شتە بپارێزن ئەبێتە مایەی لەعنەت لێ کردن: دەست بە ئاو گەیاندن لە سەر کانیاو، ولە سەر ڕێگا، ولە سێبەرەکان»[2]. وفەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «اتَّقُوا اللَّاعِنَيْنِ» «خۆتان لەو دو شتە بپارێزن کە مایەی لەعنەت لێ کردنە» وتیان: ئەی پەیامبەری خوا! کامانەن؟ فەرموی: «الذي يَتَخَلَّى في طَرِيقِ الناسِ أو في ظِلِّهِم» «ئەوەی کە لە سەر ڕێگا یا سێبەری خەڵك دەست بە ئاو دەگەیەنێت»[3].

٤. هەروەها حەرامە بە پیسایی ئاژەڵ یا ئێسك یا خواردنێکی ڕێز لێ گیراو خۆی پاك بکاتەوە، لە بەر فەرمودەکەی جابر ﷺ: «نَهَى النَّبِي ﷺ أَنْ يَتَمَسَّحَ بِعَظْمٍ أَو بِبَعْرٍ» «پەیامبەر ﷺ نەهی کردوە بە ئێسك یا پیسایی ئاژەڵ، خۆ پاك بکرێتەوە»[4].

٥. هەروەها دەست بە ئاو ناگەیەنێت لە ناو گۆڕستانی موسڵمانان، چونکە پەیامبەر ﷺ فەرموی: «وَمَا أُبَالِي أَوَسَطَ الْقُبُورِ قَضَيْتُ حَاجَتِي، أَوْ وَسَطَ السُّوقِ»

(١) أخرجه البخاري (١٥٤) واللفظ له، ومسلم (٢٦٧).
(٢) أخرجه أبو داود (٢٦)، وابن ماجه (٣٢٨). وإسناده حسن انظر: «إرواء الغليل» (١/١٠٠).
(٣) أخرجه مسلم (٢٦٩).
(٤) أخرجه مسلم (٢٦٣).

«هەر دوکیان وەکو یەکە بە لامەوە: ئەگەر دەس بە ئاو بگەیەنیٚ لە ناو قەبرستان یا لە ناو بازاڕ دا!»[١].

## پرسی پێنجەم: ئەو شتانەی کەڕاهەتی هەیە لە کاتی دەست بە ئاو گەیاندن دا بکرێت:

١. کەڕاهەتی هەیە لە کاتی دەست بە ئاو گەیاندن دا میز بە ئاراستەی هەڵ کردنی با دا بکرێت بە بیٚ بەر بەست، بۆ ئەوەی میزەکە نەگەڕێتەوە بۆ کەسەکە خۆی.

٢. هەروەها قسە کردن وهاو شێوەکانیشی، چونکە لە کاتی میز کردنی پەیامبەری خوادا ﷺ کابرایەك تیٚ پەڕ بو بە لایدا وسەلامی لیٚ کرد، وەلامی سەلامەکەی نەدایەوە[٢].

٣. هەروەها کەڕاهەتی هەیە میز بکاتە نێو کون وهاو شێوەکانی، لە بەر فەرمودەکەی قەتادە: کە عەبدوڵای کوڕی سەرجیس ﷺ ئەڵیٚ: «پەیامبەری خوا ﷺ ڕیٚ گری کردوە لە میز کردنە ناو کون»، وتیان ئەی قەتادە بۆ چی؟! وتی: لە بەر ئەوەی شوێنی جنۆکەکانە»[٣]. هەروەها نازانرێت لەوانەیە ئاژەڵێکی تێدا بێت زیانی پیٚ بگەیەنێت، یا شوێنی نیشتەجێی جنۆکە بێت ئەو کاتە ئازاری دەدەن، [هەروەها ئەشبێتە مایەی ئازار دانی ئەو ئاژەڵانە ولانەیان لیٚ تێك دەدات].

(١) أخرجه ابن ماجه (١٥٦٧) وصححه الألباني في «إرواء الغليل» (١٠٢/١).

(٢) أخرجه مسلم (٣٧٠).

(٣) أخرجه أبو داود (٢٩)، والنسائي (٣٤). ونقل الحافظ ابن حجر في التلخيص (١٠٦/١) تصحيحه عن ابن خزيمة وابن السكن. وقال ابن عثيمين: «أقل أحواله أن يكون حسنًا» «الشرح الممتع» (٩٥/١-٩٦).

٤. هەروەها کەڕاهەتی هەیە بە شتێکەوە بڕواتە سەر ئاوەوە کە ناوی خوای تێدا بێت مەگەر پێویست بکات، چونکە «كَانَ ﷺ إِذَا دَخَلَ الخَلاءَ وَضَعَ خَاتِمَه»[1] «پەیامبەری خوا ﷺ ئەگەر بڕوایەتە سەر ئاوەوە ئەنگوستیلەکەی دادەنا [چونکە کلوانکەکەی لە سەری نوسرا بو: «محمد رسول الله»]». بەڵام لە کاتی پێویستی وزەرورەتدا دروستە، وەك ئەوەی پێویستی بخوازێت بەو دراوانەی کە ناوی خوای تێدایە بڕواتە سەر ئاوەوە، چونکە ئەگەر لە دەرەوە جێی بهێڵێت لەوانەیە ببرێت یا لە بیری بڕواتەوە.

سەبارەت بە قورئانیش: حەرامە ببرێتە ئاو دەستەوە، چونکە قسەی خوایە، کە بەڕێز ترین فەرمایشتە، وبردنە سەر ئاوی، جۆرێك بێ ڕێزی تێدایە مەگەر لە زەرەر ومەفسەدەیەکی گەورە تر بترسێت.

---

(١) أخرجه أبو داود (١٩)، والترمذي (١٧٤٦)، والنسائي (٥٢٢٨)، وابن ماجه (٣٠٣)، وقال أبو داود بعد إخراجه: «هذا حديث منكر». وقال الترمذي: «هذا حديث حسن غريب». وضعفه الألباني.

ئەگەریش وترا فەرمودەکە لاوازە وبۆ ئەوە ناشێت بکرێتە بەڵگە لەم پرسەدا، ئەوا هەر لە پێشترە وچاك ترە شتێك نەباتە عەدەب خانەوە ناوی خوای تێدا بێت مەگەر زەرور بێت، ئەمەش وەکو ڕێزێك وگەورە ڕاگرتنێك بۆ ناوی خوا.

# دەروازەی چوارەم

## لە بارەی سیواك وسوننەتەکانی فیترەتەوە

**سیواك:** بریتیە لە بەکارهێنانی دار یا هاو شێوەکانی بۆ دەم وددان؛ بە مەبەستی لادانی ئەو شتانەی پێیانەوە نوساوە لە خواردن وبۆنەکان[(١)].

لە چەند پرسێك پێك هاتوە:

### پرسی یەکەم: حوکمی سیواك:

سیواك سوننەتە لە هەمو کاتێك دا، تەنانەت ڕۆژوانیش هیچی تێدا نیە لە کاتی ڕۆژوەکەی دا سیواك بکات، ئیتر سەرەتای ڕۆژ بێت یا کۆتاییەکەی، چونکە پەیامبەر ﷺ لە هەمو کات وحاڵێك دا هانی داوین بۆ سیواك کردن، وتایبەتی نەکردوە بە کاتێکەوە، وەك ﷺ دەفەرموێ: «السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ، مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ» «سیواك پاك کەرەوەی دەمە، ومایەی ڕەزامەندی پەروەردگاریشە»[(٢)]. وەهەروەها ﷺ ئەفەرموێ: «لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي، لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ» «لە بەر ئەوە نەبوایە قورسی بکەم لە سەر ئومەتەکەم، فەرمانم پێ ئەکردن سیواك بکەن لە کاتی هەمو نوێژێکدا»[(٣)].

---

(١) [ئەگەر وا بێت؛ سیواك گشتیە وتایبەت نیە بەو دار سیواکەوە کە پێی ئەوترێ: «داری ئەراك»، بەڵکو فڵچەی ددانیش حوکمی سیواك وئەجرەکەی هەیە. لە پرسی: «بە چی سیواك دەکرێت؟» ڕون تر دەبێتەوە].

(٢) أخرجه البخاري (٤٠/٢) معلقًا بصيغة الجزم، وأخرجه أحمد (٤٧/٦)، والنسائي (١٠/١). وصححه الألباني «الإرواء» (١٠٥/١).

(٣) متفق عليه: البخاري (٨٨٧)، ومسلم (٢٥٢).

## پرسی دووەم: کەی زیاتر سوننەتەتێکی تەئکید لەسەر کراوە ئەنجام بدرێت؟

سوننەتێکی موەککەدەیە لە کاتی دەست نوێژ، ولە خەو هەستان، وگۆڕینی بۆنی دەم، وقورئان خوێندن، ونوێژکردن دا، هەروەها لە کاتی چونە نێو مزگەوت ومالّ، لە بەر فەرمودەکەی میقدامی کوڕی شورەیح، لە باوکیەوە ئەلّێ: پرسیارم کرد لە عائیشە ﵂ وتم: پەیامبەری خوا ﷺ کە دەهاتە مالّەوە یەکەم جار بە چی دەستی پێ ئەکرد، وتی: بە سیواک[1]. هەروەها زیاتر سوننەتە لە کاتی بێ دەنگی زۆر وزەرد بونەوەی ددانەکان، لە بەر فەرمودەکانی پێشو. هەروەها پەیامبەر ﷺ کە شەوان هەستایە بۆ شەو نوێژ ددانەکانی بە سیواک دەساوی[2]. هەروەها لە کاتی عیبادەت ونزیك بونەوە لە خوا موسڵمان فەرمانی پێکراوە لە باشترین حالّ وشێوازدا بێت لە خاوێنی وپاکێتی دا.

## پرسی سێیەم: سیواك بە چی دەکرێت؟

سوننەتە سیواك کردن بە دارێکی تەڕ بێت، لەت[3] نەبێت، دەم بریندار نەکات، چونکە پەیامبەر ﷺ بە داری ئەڕاك[4] سیواکی دەکرد. ودەتوانێت بە دەستی ڕاستی یا چەپی سیواك بکات، لەم بارەوە فراوانی هەیە. ئەگەریش لە کاتی دەست نوێژ دا دارێکی پێ نەبو سیواکی پێ بکات ئەتوانێت بە پەنجەکانی سیواك بکات، وەکو لە عەلی کوڕی ئەبو تالّبەوە ﵁ هاتوە لە چۆنیەتی دەست نوێژی پەیامبەردا ﷺ[5].

(١) أخرجه مسلم (٢٥٣).
(٢) أخرجه البخاري (٢٤٥)، ومسلم (٢٥٥).
(٣) واتە: ورد و شی نەبو بێتەوە. «وەرگێڕ»
(٤) الأَرَاك: شجر من الحمض يستاك بقضبانه، واسمه «الكَبَاث».
(٥) أخرجه أحمد في المسند (١/١٥٨)، وصححه ابن حجر في «التلخيص الحبير» (١/٧٠).

## پرسی چوارەم: سودەکانی سیواك:

لە گرنگترینی ئەوەیە کە لە فەرمودەکەی پێشودا هاتوە، کە پاك کەرەوەی دەمە لە دونیا، ومایەی ڕەزامەندی پەروەردگارە لە دوا ڕۆژدا. بۆیە ئەبێت موسڵمان پابەند بێت بەم سونەتەوە ووازی لێ نەهێنێت لە بەر ئەو سودە زۆرانەی تێیدایە، بەڕاستی هەندێك لە موسڵمانان لەوانەیە کاتێکی زۆر وەك مانگ ودو مانگی بە سەردا تێ پەڕ بێت کەچی هێشتا سیواکی نەکردبێت، ئیتر لە تەمبەڵی بێت یا لە نەزانیەوە، ئەمانەش پاداشتێکی گەورە وسودێکی زۆریان لە کیس خۆیان داوە، بە هۆی وازهێنانیان لەم سونەتەی کە پەیامبەر ﷺ پارێزگاری لێ کردوە، کە وەخت بوە فەرمان بکات بە ئوممەتەکەی فەرمانی واجب کردن، ئەگەر ترسی بار گرانی نەبوایە. هەروەها کۆمەڵێ سودی تری سیواك باس کراوە، لەوانە: ددانەکان بە هێز ئەکات، وپوك توند دەکات، ودەنگ ساف دەکات، ومرۆڤ چالاك دەکات.

## پرسی پێنجەم: سوننەتەکانی فیترەت وسروشت:

هەروەها پێی دەوترێ: سیفەتەکانی فیترەت، چونکە بکەرەکەی ئەو سیفەتانەی لە خۆیدا بە دی هێناوە کە خوا سبحانە خەڵکی لە سەر دروست کردوە، وبۆی بە چاك زانیون، تا لە سەر باشترین وتەواوترین شێواز دا بن. لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ ئەڵێ پەیامبەر ﷺ فەرمویەتی: «خَمْسٌ مِنَ الْفِطْرَةِ ؛ الِاسْتِحْدَادُ، وَالْخِتَانُ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَنَتْفُ الْإِبْطِ، وَتَقْلِيمُ الْأَظْفَارِ» «پێنج شت لە سروشت وفیترەتە: تاشینی مو بەر وخەتەنە کردن وکورت کردنەوەی شوارب وهەڵ کەندنی مۆی بن باڵ وگرتنی نینۆك»[1].

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٥٨٨٩)، ومسلم (٢٥٧).

**١. تاشینی موی پێشەوە (الإِسْتِحْدَاد):** بریتیە لە لابردنی مو بەر، ئەو موەی لە دەور وبەری عەورەت دایە، بەمەش ناو نراوە چونکە «ئاسن (حَدِید)»ی تێدا بەکار ئەهێنرێت کە موسە. جا ئەم تاشینە سیفەتێکە لە سیفەتەکانی فیترەت کە پەیامبەری خوا ﷺ خەڵکی بۆ لا هان داوە، وسوننەتە، وئەبێت مرۆڤ بەردەوام بێت لە سەری. لە لابردنیشی جوانی وخاوێنییەکی گەورەی تێدایە. دەشکرێت لا ببرێت بە بێ تاشین وەك لابەرە تازە دروست کراوەکان.

**٢. خەتەنە کردن:** لا بردنی ئەو پێستەیەیە کە سەر عەورەت (الحَشَفَة)ی گرتوە، تا سەر عەورەت دەر بکەوێت، ئەمە دەرحەق بە نێرینە. بەڵام مێینە: بڕینی گۆشتێکی زیادەیە ها لە سەر شوێنی چونە ژورەوەی زەکەر، وتراوە: لە پۆپکەی کەڵە شێر دەچێت. حوکمیشی: واجبە دەرهەق بە پیاوان، وسوننەتە دەرحەق بە ئافرەتان. حیکمەتیش لە خەتەنە کردنی پیاوان: پاك کردنەوەی زەکەرە لەو پیسەی لە پێستەکەی سەری کۆ بۆتەوە. سودەکانیشی زۆرن. سەبارەت بە ئافرەتانیش: لە توندی شەهوەتیان کەم دەکاتەوە [وهتد].

سوننەتیشە لە ڕۆژی حەوتەم بۆ کۆرپەلە ئەنجام بدرێت، چونکە پەیامبەر ﷺ حەسەن وحوسەینی لە ڕۆژی حەوتەم دا خەتەنە کرد[١]، هەروەها خێرا تریش چاك دەبێتەوە، وبا منداڵ لە سەر باشترین حاڵەت گەورە ببێت.

**٣. بڕینی شوارب وزۆر کورت کردنەوەی (قَصُّهُ وإِحْفَاؤُه):** ئەمەش موبالەغە کردنە لە بڕینی شوارب، چونکە لەمەدا خۆ جوان کردن وخاوێن کردنەوە وپێچەوانە کردنی بێ باوەڕانی تێدایە. چەندین فەرمودەی صەحیحیش هاتوە لە بارەی هاندان

(١) لەم بارەوە دو حەدیس هاتون یەکتری بەهێز دەکەن، وەك شێخ ئەلبانی ئەڵێ لە «تمام المنة» ل٦٧.

بۆ بڕینی، وهێشتنەوە وبەردانەوەی ڕیش وڕێز لێ گرتنی، لەمەشدا جوانی ودیمەنی پیاوەتی تێدایە، بەڵام زۆرێك لە خەڵکی ئەمەیان پێچەوانە کردوەتەوە، شواربیان دەهێڵنەوە وڕیشیان دەتاشن یا کورتی دەکەنەوە. ئەمانەش هەموی پێچەوانەی سوننەت وئەو فەرمانانەیە کە هاتوە لە بارەی واجبێتی هێشتنەوەی ڕیش؛ لەوانە: فەرمودەکەی ئەبو هورەیرەیە ﷺ ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «جُزُّوا الشَّوَارِبَ، وَأَرْخُوا اللِّحَى، خَالِفُوا الْمَجُوسَ» «شواربتان ببڕن، وڕیشتان بهێڵنەوە، پێچەوانەی ئاگر پەرستەکان بکەن»(١). وفەرمودەکەی ئیبن عومەرە ﷺ کە پەیامبەر ﷺ فەرموی: «خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ: وَفِّرُوا اللِّحَى وَأَحْفُوا الشَّوَارِبَ»(٢)، واتە: «پێچەوانەی موشریکەکان بکەن، ڕیشتان بهێڵنەوە، وشواربتان لا بدەن». جا لە سەر موسڵمانە پابەندی ئەم ئاکارەی پەیامبەر ﷺ بێت، وپێچەوانەی دوژمنان بکات، وخۆی جیا بکاتەوە لە خۆ شوبهاندن بە ئافرەتان.

**٤. گرتنی نینۆکەکان:** گرتنیەتی بە ڕادەیەك نەهێڵێت درێژ ببێت، ئەم گرتنەش جوانی دەکاتەوە، وپیسی وچڵکە کەڵەکە بوەکانی ژێری لا دەدات، وکۆمەڵێك لە موسڵمانان پێچەوانەی ئەم فیترەتە موحەممەدیەیان کردوە، دەڕۆن نینۆکیان درێژ دەکەن یا نینۆکی پەنجەیەکی دیاری کراویان درێژ ئەکەن، هەمو ئەمانەش لە ڕازاندنەوەی شەیتان وچاو لێ کەری دوژمنانی خوایە.

**٥. هەڵکەندنی موی بن باڵ:** یانی: لا بردنی ئەو موەی تێیدا شین دەبێت، جا سوننەتە لا ببرێت بە هەڵ کەندن یا تاشین یا جگە لەم دوانە بێت، چونکە لا دانی پاك وخاوێنیە ونەهێشتنی ئەو بۆنە ناخۆشەیە کە بە هۆی کۆبونەوەی ئەو موەوە لەو

---

(١) أخرجه مسلم (٢٦٠).

(٢) أخرجه البخاري (٥٨٩٢)، ومسلم (٢٥٨). واللفظ للبخاري.

شوێنە دا دروست ئەبێت، ئەمە دینی پاك وخاوێنی ئێمەیە، فەرمانی پێ کردوین بەم سیفەتانە، چونکە جوانی وپاکی وخاوێنی تێدایە، وبۆ ئەوەی موسڵمان باشترین شێوازی هەبێت، ودور بێت لە چاو لێ کەری بێ باوەڕان ونەزانان، شانازی بکات بە دینی خۆیەوە، وگوێڕایەڵی کاری پەروەردگارەکەی، وشوێن کەوتوی سوننەتی پەیامبەرەکەی بێت ﷺ.

چەند سیفەتێکی تریش زیاد دەکرێت بۆ ئەم پێنجە، ئەویش: سیواك کردنە، وئاو دانە بە دەم ولوت دا، وشۆردنی ئەو گرێیانەی سەر پەنجەکان (البَرَاجِم)ە کە چڵکی تێدا کۆ دەبێتەوە، وتارات گرتنە، ئەمەش لە بەر فەرمودەکەی عائیشە ﵂، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَاسْتِنْشَاقُ الْمَاءِ، وَقَصُّ الْأَظْفَارِ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ، وَنَتْفُ الْإِبْطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ -يَعْنِي: الِاسْتِنْجَاءَ-»... قَالَ مُصْعَبٌ: وَنَسِيتُ الْعَاشِرَةَ إِلَّا أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ...»[1]، واتە: «دە شت لە فیترەتە: بڕینی شوارب، وهێشتنەوەی ڕیش، وسیواك کردن، وئاو دانە لوت، وبڕینی نینۆك، وشۆردنی گرێکانی سەر پەنجە، وهەڵ کەندنی موی بن باڵ، وتاشینی موی بەر، هەروەها تارات گرتن». موصعەبی کوڕی شەیبە -یەکێکە لە ڕاویەکان- ئەڵێ: «ودەیەمم لە بیر چوە، ئەگەر ئاو دانە دەم نەبێ».

## پرسی شەشەم: [کاتی لابردنی ئەو شتانەی لا بردنیان لە فیترەتە]

کات دیاری کردن بۆ تاشینی موی بەر وبڕینی شوارب وگرتنی نینۆك وهەڵ کەندنی موی بن باڵ: پەیوەست کراوە بە درێژی ئەم شتانە وپێویستی کەسەکە بە لا

(١) أخرجه مسلم (٢٦١) [هذا لفظه].

بردنی، بەڵام ئەگەر دوای خست، نابێت لە چل ڕۆژ زیاتر درێـژە بکێشـێت، لـە بـەر فەرمودەکەی ئەنەس ﷺ ئەڵێ: «ئەو کاتەی بۆمان دیاری کراوە لە بـڕینی شـوارب وگرتنی ناخون «نینۆك» وهەڵ کەندنی موی بن بـاڵ وتاشـینی مـوی بـەر، ئەوەیـە نابێت لە چل شەو زیاتر بێت»[1].

(١) أخرجه مسلم (٢٥٨).

# دەروازەی پێنجەم

# لە بارەی دەست نوێژەوە

**چەند پرسێکی تێدایە:**

## پرسی یەکەم: پێناسەی دەست نوێژ وحوکمەکەی:

«الوُضُوء= دەست نوێژ» لە زمانەوانیدا لە «الوَضَاءَة»ەوە هەڵهێنجراوە کە جوانی وخاوێنیە.

**لە شەرعیشدا:** بریتیە لە بەکارهێنانی ئاو لە سەر چوار ئەندامەکە -کە دەم وچاو وهەر دو دەست وسەر وهەر دو پێ یە- بە شێوەیەکی دیاریکراوی شەرعی وەکو عیبادەت بۆ خوا ﷻ.

**حوکمەکەشی:** واجبە لە سەر دەست نوێژ شکاو «مُحْدِث» ئەگەر هەستا بۆ نوێژ یا هەستا بۆ ئەو شتانەی حوکمی نوێژی هەیە وەك تەواف کردن یان دەست دان لە قورئان.

## پرسی دوەم: بەڵگە لە سەر واجب بونی، هەروەها لە سەر کێ واجبە، هەروەها کەی واجب دەبێت؟

بەڵگە لە سەر واجب بونی: ئەم ئایەتەیە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ مِنْهُ مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ وَلَكِنْ يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ [المائدة:٦] «ئەی ئەوانەی ئیمان دارن ئەگەر دەست نوێژتان نەبو وویستتان هەستن بۆ نوێژ، ئەوا: دەم وچاو، ودەستەکانتان بشۆن

تا قوڕانیسك (ئەنیشکـ)ـەکانتان، وسەرتان بسڕن، وپێکانتان لەگەڵ قولە پێکانتاندا بشۆن، وئەگەریش لەش گران بون ئەوا خۆتان بشـۆن پـێش نوێـژ کـردن، ئەگـەریش نەخۆش بون یا لە سەر سـەفەرێك بـون یـا کەسـێکتان لـە سـەر ئـاوەوە هـات یـا جیماعتان کرد، وە ئاوتان دەست نەکەوت ئەوە هەر دو دەستتان بدەن بـە ڕوی زەوی دا لـە خۆڵـە پاکـەکانی سـەری، مەسـحی دەم وچـاو ودەسـتەکانتانی پـێ بکـەن، پەروەردگاریش نایەوێت لە پرسی پاك وخاوێنی دا هیچ بار گرانیتان لە سەر دابنێت، بەڵکو ڕێگەی داون بە تەیەموم تا فراوانی وڕەحمەت بێت بۆتان، بۆیە کردویـەتی بـە جێگرەوەی ئاو لە پاك وخاوێنی دا، سا خـوا دەیـەوێت پاکتـان بکاتـەوە وبـەم کـار ئاسانیە وشتەکانی تریش ئەیەوێت نیعمەتی خۆیتان بە سەردا بڕژێت بە تـەواوەتی، ئەمەش مایەی شوکرانە بـژێری کردنـی خوایـە». هـەروەها پەیامبـەری خـوا ﷺ ئەفەرموێ: «لَا يَقْبَلُ اللهُ صَلَاةً بِغَيْرِ طُهُورٍ، وَلَا صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ» «خـوا سـبحانە نوێژێك وەرناگرێت بە بێ دەست نوێژ، بەخشینیش وەرناگرێت ئەگەر هی دزێنی بێت لە دەست کەوتی جـەنگ وشـتی تـر»[1]. هـەروەها ئەفـەرموێ ﷺ: «لَا يَقْبَلُ اللهُ صَلَاةَ مَنْ أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ» «کەسێك دەست نوێژی بشکێت خوا ﷻ نوێژی لـێ وەر ناگرێت هەتا دەست نوێژ نەگرێت»[2]. وهـیچ زانایـەکی موسـڵمان نـەبووە لـەم بارەوە ڕا جیاواز بوو بێت.

بەمەش شەرعیەتی دەست نوێژ سەلما بە قورئان وسوننەت وکۆ دەنگی.

**لە سەر کێ واجبە؟** لە سەر موسڵمانی پێگەیشتوی ژیر، ئەگەر ویستی نوێـژ یـا هاو حوکمەکانی نوێژ بکات پێویست ئەبێت.

(١) أخرجه مسلم (٢٢٤). والغلول: السرقة من أموال الغنيمة وغيرها.
(٢) أخرجه مسلم (٢٢٣).

**ئەی کەی واجبە؟** ئەگەر کاتی نوێژ هات یا مرۆڤ ویستی ئەو کارە بکات کە دەست نوێژی بۆ بە مەرج گیراوە، با پەیوەستیش نەبێت بە کاتێکەوە، وەك تەواف کردن ودەست دان لە قورئان.

## پرسی سێیەم: لە بارەی مەرجەکانی دەست نوێژەوە:

ئەمانەی خوارەوە مەرجن بۆ دروستێتی دەست نوێژ:

١- **ئیسلامەتی، وژیری، وجیا کردنەوە** (التَّمْيِيز): جا نا موسڵمان وشێت بیکات دروست نیە، ومنداڵی خوار تەمەنی جیا کردنەوەش حیسابی بۆ ناکرێت[1].

٢- نیەت: لە بەر فەرمودەی: «إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، [وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى]» «کار وکردەوەکان بە نیەتە، وبۆ هەر بەندەیەك هەیە لە پاداشت وسزا بە گوێرەی نیەتی»[2]، ودروستیش نیە بە دەم بهێنرێت؛ چونکە لە پەیامبەرەوە ﷺ نە چەسپاوە.

٣- ئاوی پاك: وەك پێشتر لە «ئاوەکان»دا باس کرا، جا ئاوی پیس دروست نیە دەست نوێژی پێ بگیرێت.

٤- لابردنی ئەو شتانەی رێگرن لە گەیشتنی ئاو بە پێست، وەکو مۆم وهەویر وهاو شێوەکانیان: وەك بان ناخون (بۆیەی نینۆك)ی نێو ئافرەتانی ئەمڕۆ.

٥- تارات گرتن، ئەگەر هۆکارەکانی هەبون.

٦- بە دوای یەکتردا بکرێت (الموالاة).

---

(١) [«تەمەنی جیاکردنەوە» (سنّ التّمييز): مەبەست ئەو تەمەنە یا قۆناغەیە کە منداڵ پێی گەیشت لە قسە تێ دەگات وبە باشی وەڵام دەداتەوە وزەرەر وقازانجی خۆی دەزانیت وشتەکان لێك جیا دەکاتەوە، وتایبەتیش نیە بە تەمەنێکی دیاریکراوەوە، بەڵام زۆرجار حەوت ساڵانە].

(٢) أخرجه البخاري (١)، ومسلم (١٩٠٧).

٧- بە ڕیز بەندی(الترتیب). دواجاریش باسی هەر دوکیان دێت.

٨- شۆردنی ئەو ئەندامانەی کە واجبە بشۆردرێت.

## پرسی چوارەم: فەرزەکانی دەست نوێژ -یانی ئەندامەکانی-:

بریتیە لە شەش دانە:

١. شۆردنی هەمو دەم وچاو، لە بەر ئایەتی: ﴿إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ﴾ [المائدة: ٦] «ئەگەر ویستتان هەستن بۆ نوێژ ودەست نوێژتان نەبو ئەوە دەم وچاوتان بشۆن»، ئاو دان بە دەم ولوتیشدا (المَضْمَضَة والاِسْتِنْشَاق) بەشێکە لە شۆردنی دەم وچاو، چونکە دەم ولوت بەشێکە لێی.

٢. شۆردنی هەر دو دەست لەگەڵ قوڕانیسك (ئەنیشك)، لە بەر ئایەتی: ﴿وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ﴾ [المائدة:٦] «دەستەکانیشتان بشۆن لەگەڵ ئەنیشکەکان».

٣. سڕینی هەمو سەر لەگەڵ گوێکاندا، لە بەر ئایەتی: ﴿وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ﴾ [المائدة:٦] «وسەرتان بسڕن»، ولە بەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «الأُذُنَانِ مِن الرَّأْسِ» «هەر دو گوێ بەشێکن لە سەر»[١]. بۆیە سڕینی هەندێکی سەر ونەسڕینی هەندیکی تری لە سەری ناخات (لا يُجزيء)[٢].

٤. شۆردنی هەردو پێ هەتا قاپە ڕەقە (قولە پێ یا گوێزنگ): لە بەر فەرمایشتی: ﴿وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ﴾ [المائدة: ٦] «وپێکانتان بشۆن لەگەڵ هەر دو قولە پێ دا».

---

(١) أخرجه الترمذي (٣٧) وابن ماجه (٤٤٣) وصححه الألباني (صحيح سنن ابن ماجه ٣٥٧، والسلسلة الصحيحة ٣٦) وأفاض الشيخ -رحمه الله- في جمع طرقه والكلام عليه.

(٢) «لا يجزيء»، لای فوقەها، واتە: بە نەکردنی ئەو شتە، فەرمانەکە لە سەرت نەکەوتوە ویە جێت نەگەیاندوە وئەستۆت پاك نەبۆتەوە، جا ئەبێت ئەنجامی بدەیتەوە. «وەگێڕ»

٥. ڕیز بەندی: چونکە پەروەردگار بە ڕیز باسی کرد، وپەیامبەریش ﷺ بەو ڕیز بەندیە دەست نوێژی گرتوە کە پەروەردگار باسی کردوە: دەم وچاو، ئینجا هەر دو دەست، ئینجا سەر، ئینجا هەر دو پێ، لە فەرمودەکەی عەبدوڵای کوڕی زەید[1]، ولە فەرمودەی تریشدا ئەمە هاتوە لە چۆنێتی دەست نوێژ گرتنی پەیامبەر دا ﷺ.

٦. بە دوای یەك دا بکرێت: یانی: شۆردنی هەر ئەندامێك ڕاستەوخۆ دوای ئەندامەکەی تر بێت بە بێ دواخستن، چونکە پەیامبەر ﷺ دەست نوێژی ئاوها ئەگرت، هەروەها لە بەر فەرمودەکەی خالدی کوڕی مەعدان: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى رَجُلًا يُصَلِّي، وَفِي ظَهْرِ قَدَمِهِ لُمْعَةٌ قَدْرُ الدِّرْهَمِ لَمْ يُصِبْهَا الْمَاءُ، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُعِيدَ الْوُضُوءَ وَالصَّلَاةَ» «کە پەیامبەر ﷺ کابرایەکی بینی نوێژی دەکرد، ولە پشتی پێکانیشیەوە ئەوەندەی درهەمێك ئاوی بەر نەکەوتبو، فەرمانی پێ کرد دەست نوێژەکەی دوبارە بکاتەوە»[2]. جا ئەگەر بە دوای یەکدا کردن بە بێ دواخستن مەرج نەبوایە ئەوە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمانی دەکرد تەنها ئەوە بشوات کە نەیشۆردوە، وفەرمانی پێ نەدەکرد دەست نوێژەکەی دوبارە بکاتەوە.

## پرسی پێنجەم: سوننەتەکانی دەست نوێژ:

شتانێك هەیە سوننەتە لە کاتی دەست نوێژدا بکرێت وپاداشت دەدرێتەوە لە سەری، هەر کەسێکیش نەیکات -نەك وەکو نەویستن- ئەوە تاوانی ناگات، وئەم کارانەش پێیان دەوترێت: سوننەتەکانی دەست نوێژ، کە ئەمانەیە:

---

(١) أخرجه مسلم (٢٣٥).

(٢) أخرجه أحمد (٣/٤٢٤)، وأبو داود (١٧٥)، وصححه الألباني. انظر: إرواء الغليل (١/١٢٧).

١. «بسم الله» کردن لە سەرەتاوە: لە بەر فەرمایشتەکەی پەیامبەری خـوا ﷺ: «لَا وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ» «دەست نوێژی کاملّی نەگرتوە ئەوەی نـاوی خوای لە سەر نەهێنێت»[١].

٢. سیواك کردن: لە بەر حەدیسـی: «لَوْلَا أَنْ يَشُقَّ عَلَى أُمَّتِهِ لَأَمَرَهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ وُضُوءٍ» «لە بەر ئەوە نەبێت قورسی بکەم لە سەر ئومەتەکەم، فەرمانم پـێ دەکردن لە هەمو دەست نوێژێك دا سیواك بکەن»[٢].

٣. سێ جار شۆردنی هەر دو لەپ لە سـەرەتای دەسـت نوێـژەوە: بـە بەڵگـەی کرداری پەیامبەر ﷺ، کە هەر دو لەپەکانی سێ جار ئەشۆرد، وەکـو لـە چـۆنیەتی دەست نوێژیدا هاتوە.

٤. موبالەغە لە ئاو دان بە دەم ولوت دا جگە لە ڕۆژوان: ئەمەش لە چـۆنیەتی دەسـت نوێـژی پەیامبـەردا ﷺ هـاتوە، ئـەڵێ: «ئـاوی دا بـە دەمـی ومـش (الاستنثار)[٣]ی کرد». ولە بـەر فـەرمودەی: «وَبَالِغْ فِي الِاسْتِنْشَاقِ، إِلَّا أَنْ تَكُونَ صَائِمًا» «وزیادەڕەوی بکە لە ئاو دان بە لوت دا مەگەر بە ڕۆژو بیت»[٤].

٥. سڕینی ئەندامەکان (الدَّلْك)، وبە ئاو، دەسـت بخرێتـە نـاو ڕیشـی چـڕ تـا دەگاتە ناو ڕیش: بە بەڵگەی کرداری پەیامبەری خوا ﷺ، چونکە «کاتێـك دەسـت

(١) أخرجه أحمد (٤١٨/٢)، وأبو داود (١٠١)، والحاكم (١٤٧/١) وغيرهم من حديث أبي هريرة ﷺ، وحسنه: ابن الصلاح، وابن كثير، والعراقي، وقواه المنذري وابن حجر، وقال الألباني: حسن. «الإرواء» (١٢٢/١).

(٢) أخرجه البخاري معلقًا بصيغة جزم: باب سواك الرطب واليابس للصائم. وصله النسائي. انظر: «الفتح» (١٥٩/٤).

(٣) «الاستنثار»: ئەوەیە کە ئاوت دا بە لوت دا، ئاو وشتەکانی ناو لوتت دەر بکەیت، ئەمەش واتای دروستی «الاستنثار»ـە لەلای جمهوری زانایان. «وەرگێڕ».

(٤) أخرجه أبو داود (١٤٢)،والنسائي (٦٦/١ رقم ٨٧)،وصححه الألباني (صحيح النسائي رقم ٨٥).

نوێژی بگرتایە دەستی دەهێنا بە باڵەکانیدا»[1]، هەروەها «ئاوی دەبردە ژێر چەناکەیی وئەیهێنا بە ناو ڕیشیدا»[2].

٦. پێش خستنی لای ڕاست بە سەر چەپدا لە دەست وقاچەکاندا: بە بەڵگەی کرداری پەیامبەری خوا ﷺ چونکە «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ فِي تَنَعُّلِهِ وَتَرَجُّلِهِ وَطُهُورِهِ، وَفِي شَأْنِهِ كُلِّهِ» «حەزی لە لای ڕاست بوە لە دەست پێ کردن وپێڵاو لە پێ کردن، وقژ شانە کردن، ودەست نوێژ گرتن، ولە هەمو کارێکی تری دا»[3].

٧. سێ بارەکردنەوەی شۆردنی دەم وچاو ودەست وپێکان: ئەوەی واجبە، تەنها یەك جارە، سێ بارە کردنەوەشی سوننەتە، بە بەڵگەی کردەوەی پەیامبەری خوا ﷺ، لێوەی چەسپاوە کە: «دەست نوێژی گرتوە یەك جار یەك جار، ودو جار دو جار، وسێ جار سێ جار»[4].

٨. خوێندنی ویردە هاتوەکان دوای دەست نوێژ: لە بەر فەرمودەی: «ما مِنْكُمْ أَحَدٌ يَتَوَضَّأُ فَيُسْبِغُ الْوُضُوءَ ثُمَّ يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، إِلَّا فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ»[5] «هیچ

---

(١) أخرجه ابن حبان في صحيحه (٣/٣٦٣) (١٠٨٢)، والبيهقي في السنن الكبرى (١/١٩٦)، والحاكم في المستدرك (١/٢٤٣) وصححه، وابن خزيمة في صحيحه (١/٦٢)، والإمام أحمد في مسنده (٤/٣٩).

(٢) أخرجه أبو داود (١٤٥)، وصححه الألباني (الإرواء ٩٢).

(٣) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٦٨)، ومسلم (٢٢٦).

(٤) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٥٧، ١٥٨، ١٥٩) ومسلم (٢٢٦) وعنده ذكر الثلاث فقط.

(٥) أخرجه مسلم (٢٣٤) وزاد الترمذي: (اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنْ التَّوَّابِينَ ، وَاجْعَلْنِي مِنْ الْمُتَطَهِّرِينَ) (٥٥)، وصححه بهذه الزيادة الألباني «الإرواء» (٩٦)، [وجزم ابن القيم في «الزاد» بثبوتها عن النبي ﷺ، أما الحافظ فضعفها كما في «الفتوحات الربانية» (٢/١٩). وأما: «سُبْحانَكَ اللَّهُمَّ وبِحَمْدِكَ، أشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلاَّ أنْتَ، أسْتَغْفِرُكَ وأتُوبُ إلَيْكَ». فقد رواه الحاكم في «المستدرك» عن أبي سعيد، قال الحافظ: «والسند صحيح بلا ريب ، إنما اختلف في رفع المتن ووقفه» كما في «الفتوحات الربانية» (٢/٢١). وصححه الألباني كما في «الصحيحة» (٢٣٣٣)].

كەسێكتان نیە دەست نوێژ بگرێت دەست نوێژێكى جوان، پاشان بڵێ: شایەتى دەدەم هیچ پەرستراوێك حەق نیە جگە لە الله، تاك وتەنهایە وبێ شەریكە، وشایەتى دەدەم موحەممەد بەندە وپەیامبەرى خوایە، مەگەر هەر هەشت دەرگاكەى بەهەشتى بۆ دەكرێتەوە، لە هەر كامى دەیەوێت دەڕواتە ژورەوە)).

## پرسى شەشەم: لە بارەى هەڵ وەشێنەرەوەكانى دەست نوێژەوە:

هەڵ وەشێنەرەوەكان: ئەوانەیە دەست نوێژى پێ بەتاڵ ئەبێتەوە. ئەمەش شەشە:

(١) **هەرچى دەر بچێ لە هەر دو دەرەچەكەوە:** یانى: دەرەچەى میز وپیسى، ودەرچوەكەش یا میزە یا پاشەڕۆ یا تۆوى پیاوە یا (المَذْي)ـە، یان خوێنى (الاِسْتِحَاضَة)یە[1] یا بایە -كەم بێ یا زۆر-، لە بەر ئایەتى: ﴿أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ﴾ [النساء:٤٣]. ولە بەر فەرمودەى: ((خواى گەورە نوێژى هیچ كەس قەبوڵ ناكات بێ دەست نوێژ، مەگەر دەست نوێژ بگرن))، پێشتریش باس كرا. وبە بەڵگەى فەرمودەكەى پەیامبەر ﷺ: «ولكِنْ مِنْ غَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ وَنَوْمٍ» ((تەنها لە كاتى پیسى كردن یا میز كردن یان خەوتن خوفەكانتان دا بكەنن))[2]. هەروەها پەیامبەر ﷺ لە بارەى كەسێكەوە گومانى هەیە باى لێ بەر بوە یا نا فەرمویەتى: «فَلَا يَنْصَرِفْ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أو يَجِدَ رِيحًا» ((با نوێژەكەى نەبڕێت تا گوێى لە دەنگێك دەبێت یا هەست بە بۆنێك ئەكات))[3].

---

(١) لە دەروازەى نۆیەم، لە پرسى سێیەم: چۆنێتى پاك كردنەوەى پیسى دا، پێناسەى مەزى ومەنى دێت - بە ویستى خوا-. هەروەها لە دەروازەى دەیەم، پرسى حەوتەم: لە بارەى خوێنى ئیستیحازە، باسى ئیستیحازەش دێت. ((وەرگێر))

(٢) أخرجه أحمد (٤/٢٣٩) والنسائي (١/٨٣) والترمذي (٩٦) وصححه، وحسنه الألباني في الإرواء (١/١٤١).

(٣) متفق عليه: البخاري (١٣٧)، ومسلم (٣٦١).

**٢. دەرچونی شتێكی پیس لە باقی لاشەوە:** جا ئەگەر میز بێت یا پیسی ئەوە بە هەمو شێوەیەك بەتاڵ ئەبێتەوە، چونكە دەقەكانی پێشو دەیگرێتەوە، خۆ ئەگەر ئەم دوانەش نەبو وەك: خوێن ورشانەوە: ئەگەر زۆر بو ولە ڕادە بەدەر بو ئەوا چاكتر وایە دەست نوێژ بگرێتەوە لە بەر ئیحتیاط، خۆ ئەگەر كەمیش بو بە كۆ دەنگ دەست نوێژی بۆ ناگرێتەوە.

**٣. نەمانی عەقڵ یا داپۆشینی بە هۆی بورانەوە یا خەوتنەوە:** لە بەر فەرمودەی: «تەنها لە كاتی پیسی كردن ومیز كردن وخەوتن دا». وهەروەها پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: «العَيْنُ وِكَاءُ السَّهِ، فَمَنْ نَامَ فَلْيَتوضَّأْ» «چاو پەتی كۆمە جا هەر كەسێك خەوت با دەست نوێژ بگرێت»[1]. سەبارەت بە شێتی وبورانەوە وسەر خۆش بون وهاو شێوەكانیان بە كۆ دەنگی زانایان بەتاڵی دەكەنەوە، وئەو خەوەش كە دەست نوێژ بەتاڵ دەكاتەوە بریتیە لەو خەوە قوڵەی هەستی لەگەڵ دا نامێنێت، ئیتر خەوتنەكە بە هەر شێوازێك بێت، بەڵام سوكە خەو بەتاڵی ناكاتەوە، چونكە هاوەڵان ﷺ جار وا هەبوە لە چاوەڕوانی نوێژدا خەو بردونەتیەوە، هەستاون، نوێژیان كردوە، ودەست نوێژیشیان نەگرتۆتەوە[2].

**٤. دەست دان لە عەورەتی ئادەمیزاد بە بێ بەر بەست:** لە بەر فەرمودەكەی بوسرەی كچی صەفوان ﷺ، كە پەیامبەر ﷺ فەرمویەتی: «مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ» «هەر كەس دەستی بەر زەكەری خۆی كەوت با دەست نوێژ بگرێت»[3].

---

(١) أخرجه أبو داود (٢٠٣)، وابن ماجه (٤٧٧)، وحسنه الألباني في الإرواء (١/١٤٨). والمعنى: أن العينين في يقظتهما بمنزلة الحبل الذي يربط به، فزوال اليقظة كزوال هذا الرباط.

(٢) «صحيح مسلم» (٣٧٦).

(٣) أخرجه أبو داود (١٨١) واللفظ له، والنسائي (١٦٣)، والترمذي (٨٢) وقال: حديث حسن صحيح، وابن ماجه (٤٤٧٩)، وصححه الألباني في الإرواء (١/١٥٠).

ولــە فەرمودەکــەی ئــەبو ئــەیوب وئــوم حەبیبــە دا ﷺ هــاتوە: «مَنْ مَسَّ فَرْجَه فَلْيَتَوَضَّأْ»[1]، «هەمان واتای پێشو».

٥. **خواردنی گۆشتی وشتر:** لە بەر فەرمودەکـەی جـابری کـوڕی سـەموره ﷺ: پیاوێك پرسیاری کرد لە پەیامبەر ﷺ: دەست نوێـژ بگرینــەوە بــە هــۆی خــواردنی گۆشــتی مــەڕەوە؟ فــەرموی: «إِنْ شِئْتَ فَتَوَضَّأْ، وَإِنْ شِئْتَ فَلَا تَتَوَضَّأْ» «ئەگـەر ویستت دەست نوێژ بگرە، نەشت ویســت مــەیگرە». وتــی: ئــەی بــەهۆی گۆشــتی وشترەوە؟ فەرموی: «نَعَمْ، تَوضَّأْ مِنْ لُحُومِ الإِبلِ» «بــەڵێ، دەســت نوێــژ بگـره بــۆ گۆشتی وشتر»[2].

٦. **هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام:** لە بــەر ئایــەتی: ﴿وَمَنْ يَكْفُرْ بِالْإِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ﴾ [المائدة:٥] «هەر کەس هەڵگەڕێتەوە لە ئیمان ئــەوە کــردەوەی پوچــەڵ بوەتــەوە». وهەر شتێکی تریش غوسل واجب بکات دەست نوێژیش واجب دەکات، مردن نەبێت.

[هەروەها کەڕاهەتی هەیە زیاد لە پێویست ئاو بە خەرج بدات].

## پرسی حەوتەم: ئەو شتانەی واجبە دەست نوێژی بۆ بگیرێت:

**واجبە لە سەر تەکلیف لێ کراو** (مكلَّف)[3] بۆ ئەم شتانە دەست نوێژ بگرێ:

(١) رواية أم حبيبة أخرجها: ابن ماجه (٤٨١)، وصححها الألباني في الإرواء (١٥١/١)، أما حديث أبي أيوب فقال الألباني: "لم أقف على إسناده" الإرواء (١٥١/١).

(٢) أخرجه مسلم (٣٦٠).

(٣) «المكلف» لەم کتێبەدا زۆر دوبارە دەبێتەوە، جا واتاکەی بزانە: عاقڵێکی پێگەیشتوی تێگەیشتوە (العاقل البالغ الذاكر أو الفاهم). «وەرگێڕ»

١. نوێژ کردن: لە بەر فەرموودەکەی [پێشتری] ئیبن عومەر ﵄ بەرزی دەکاتەوە ﷺ: «خوا ﷻ نوێژێك وەرناگرێت بەبێ دەست نوێژ، بەخشینیش وەرناگرێت هی دزین بێ لە دەست کەوت وشتی تریش».

٢. سوڕانەوە بە دەوری کەعبە فەرز بێت یا سوننەت: لە بەر کردەوەی پەیامبەر ﷺ: «دەست نوێژی گرتوە وپاشان تەوافی کردوە»[1]. ولە بەر فەرمایشتی پەیامبەر ﷺ[2]: «الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ صَلَاةٌ إِلَّا أَنَّ اللهَ أَبَاحَ فِيهِ الكَلَامَ» «تەواف بە دەوری کەعبەدا نوێژە، ئەوەندە نەبێت خوا قسە کردنی تێدا حەڵاڵ کردوە». هەروەها بە بەڵگەی ئەوەی نەهی کردوە لە سوڕی مانگانەدا ئافرەت تەواف بکات هەتا پاك دەبێتەوە[3].

٣. دەست دان لە قورئان وپێستەی بەری بکەوێت بێ بەربەست: لە بەر ئایەتی: ﴿لَا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ﴾ [الواقعة: ٧٩]. واتە: «ئەم قورئانە کەس دەستی پێوە نادات مەگەر پاکەکان». هەروەها لە بەر فەرموودەی: «لَا يَمَسُّ القُرْآن إلا طاهر» «کەس دەست بەم قورئانەوە نادات، مەگەر کەسێك پاك بێت»[4].

(١) أخرجه البخاري (١٦١٤)، ومسلم (١٢٣٥).
(٢) أخرجه ابن حبان (٣٨٣٦)، والحاكم (٤٥٩/١) وصحح إسناده، وافقه الذهبي، والبيهقي (٨٧/٥) وغيرهم، وصححه الألباني «الإرواء» (١٢١).
(٣) أخرجه البخاري (٣٠٥)، ومسلم (١٢١١).
(٤) أخرجه مالك (٤٦٨)، والحاكم (٣٩٥/١) و(٤٨٥/٣) وصححه، والدارقطني (١/ ١٢١)، والبيهقي (٨٧/١)، وصححه الألباني في «الإرواء» (١٢٢).

## پرسی هەشتەم: ئەو شتانەی سوننەتە دەست نوێژی بۆ بگیرێت:

لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا سوننەتە دەست نوێژ بگیرێت:

١. لە کاتی یادکردنی خوای گەورەدا ﷻ وقورئان خوێندن.

٢. تازە کردنەوەی بۆ هەمو نوێژێك: لە بەر بەردەوامی پەیامبەری خوا ﷺ لە سەری، وەك لە ئەنەسەوە ﷺ هاتوە: «كَانَ النَّبِيّ ﷺ يَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلاةٍ»، «پەیامبەری خوا ﷺ پێش هەمو نوێژێك دەست نوێژی ئەشۆرد»[١].

٣. سوننەتە کەسی لەش گران ئەگەر ویستی دوبارە جوت ببێتەوە، یا ویستی بخەوێت، یا بخواتەوە= دەست نوێژ بگرێتەوە: لە بەر فەرمودەکەی ئەبو سەعیدی خودری ﷺ پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «إِذَا أَتَى أَحَدُكُم أهلَه، ثم أراد أن يعود، فَلْيتوضأ» «ئەگەر کەسێکتان جوت بو لەگەڵ خێزانی دا، ئینجا ویستی دوبارەی بکاتەوە، با دەست نوێژ بگرێت»[٢]. وله بەر فەرمودەکەی عائیشە ﷺ[٣]: «أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ وَهُوَ جُنُبٌ، تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ قَبْلَ أَنْ يَنَامَ» «پەیامبەری خوا ﷺ ئەگەر لەش گران ببوایە وبیویستایە بخەوتایە، پێش خەوتن دەست نوێژی ئەگرت وەکو دەست نوێژی نوێژ» لە ڕیوایەتێکی تری ئەودا: «ئەگەر بیویستایە بخوات یا بخەوێت...»[٤].

٤. دەست نوێژ گرتن پێش غوسل کردن: لە بەر فەرمودەکەی عائیشە ﷺ ئەفەرموێ: «پەیامبەری خوا ﷺ ئەگەر غوسلی بکردایە بۆ لەش گرانی: سەرەتا

---

(١) أخرجه البخاري (٢١٤).

(٢) أخرجه مسلم (٣٠٨).

(٣) أخرجه مسلم (٣٠٥).

(٤) بڕوانە: سەرچاوەی پێشو، فەرمودەی پاشتری.

هەر دو دەستی دەشۆرد، پاشان بە دەستی ڕاستی ئاوی دەکرد بە سەر دەستی چەپی دا، پاشان عەورەتی دەشۆرد پاشان دەست نوێژێکی وەك دەست نوێژی نوێژ ئەگرت...» تا کۆتایی فەرمودەکە[1].

٥. لە کاتی خەوتن دا: لە بەر فەرمودەکەی بەرائی کوڕی عازب ﷺ پەیامبەر ﷺ فەرموی: «إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الْأَيْمَنِ...» «ئەگەر چویتە سەر جێگاکەت دەست نوێژ بگرە وەکو دەست نوێژی نوێژ پاشان بەلای ڕاستدا ڕا بکشێ... » هتد فەرمودەکە[2].

(١) أخرجه مسلم (٣١٦).
(٢) أخرجه البخاري (٢٤٧).

# دەروازەی شەشەم

## لە بارەی مەسح کردن لە سەر سۆل (الخُف) ومێزەر وکەرەستەی گرتنەوە

سۆل «الخُف»: ئەوەیە لە پێ دەکرێت لە پێستە وهاوشێوەکانی، کۆکەی «خِفاف»ە، وهەر شتێك بکرێتە پێ لە خُری (خوری) وهاو شێوەکانی حوکمی خوفی هەیە.

**چەند پرسێکی تێدایە:**

### پرسی یەکەم: حوکمی سڕینی سۆل وبەڵگەکەی:

سڕینی خوف دروستە بە کۆ دەنگی ئەهلی سوننەت وجەماعەت، وڕوخسەت وڕێ پێدانێکی خوایە ﷻ وەك بار سوکیەك لە سەر بەندەکانی، ولابردنی نارەحەتی وتەنگی لە سەریان.

سوننەت وکۆ دەنگیش بەڵگەن لە سەر ئەوەی دروستە.

سەبارەت بە فەرمودە: فەرمودە صەحیحەکان بە موتەواتری لە پەیامبەری خواوە ﷺ چەسپاون؛ هەم بە کردەوەی وهەم بە فەرمانی وڕوخسەت پێدانی. پێشەوا ئەحمەد رَحِمَهُ ٱللَّهُ ئەڵێ: هیچ لە دڵم دا نیە لە ئاست مەسح کردن، چل فەرمودەی لە سەر هاتوە لە پەیامبەرەوە ﷺ. کە ئەڵێ: «هیچ لە دڵم دا نیە» مەبەستی: کەم ترین گومانی نیە کە دروستە. حەسەنی بەصری رَحِمَهُ ٱللَّهُ ئەڵێ: حەفتا کەس لە هاوەڵانی پەیامبەری خوا ﷺ بۆیان گێڕاومەتەوە کە پەیامبەر ﷺ مەسحی لە سەر خوفەکانی کردوە. جا لەو فەرمودانە: حەدیسەکەی جەریری کوڕی عەبدولایە

ﷺ ئەڵیٚ: «رَأَيتُ رَسُولَ الله ﷺ بالَ ثُمَّ توضَّأَ ومَسَحَ عَلَى خُفَّيْه» «پەیامبەری خوام ﷺ بینی میزی کرد، پاشان دەست نوێژی گرت وخوفەکانی سڕی»[1].
ئەعمەش ئەڵیٚ: ئیبراهیم وتی: ئەم فەرمودەیەیان زۆر پیٚ خۆش بو، چونکە جەریر ﷺ دوای دابەزینی سورەتی «المائدة» موسڵمان بوە، یانی: ئایەتی دەست نوێژ.

زانایانی ئەهلی سوننەت وجەماعەتیش کۆکن لە سەر شەرعیەتی ئەم کارە لە سەفەر ونیشتەجیٚ بون، پێویستیەك بێت یا نا.

هەروەها دروستە لە سەر گۆرەویش مەسح بکرێت، کە بریتیە لەوەی لە پیٚ دەکرێت جگە لە پێست، وەك: پەڕۆ وهاوشێوەکانی، دروستیشە، لەبەر ئەوەی وەك خوف وایە لەوەی مرۆڤ پێویستی پیٚ یەتی، وهۆکار (العِلَّة)[2] لە هەر دوکیاندا هەر یەك شتە، وبە ڕاستی لە پیٚ کردنی بەر بلاٚو تریشە لە خوف، بۆیە دروستە مەسحی لە سەر بکرێت ئەگەر پێی داپۆشی.

## پرسی دووەم: مەرجەکانی مەسح کردن لە سەر خوف وجیٚ گرەوەکانی:

**مەرجەکانیش ئەمانەن:**

۱. **بە دەست نوێژەوە لە پیٚ بکرێت:** بە بەڵگەی ئەوەی موغیرە ﷺ ئەڵیٚ: لە سەفەرێکدا لەگەڵ پەیامبەری خوا دا ﷺ بوم، دا چەمیم سۆلەکانی پێی دا بکەنم،

(١) أخرجه مسلم (٢٧٢)، وروى نحوه البخاري عن المغيرة (٢٠٣).

(٢) یەکێك لە بنچینەکانی قیاس هاو هۆکاریە (هەمان هۆکاری هەبێت)، واتە: خوف ڕێگەی پیٚ دراوە لەبەر هۆکارێك، دەی هەمان هۆکار لە جۆراب وگۆرەوی دا هەیە، کەواتە چۆن ئەسڵەکە دروستە لەبەر ئەم هۆکارە، لقەکەش دروستە لەبەر هەمان هۆکار، ئەمەش پێی دەڵێن: قیاس. سەرباری ئەمە لە حەدیسیشدا هاتوە! «وەرگێڕ».

فەرموی: «دَعْهُمَا فَإِنِي أَدْخَلْتُهُما طَاهِرَتَين، فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا» «وازی لیٚ بهیٚنە من بە پاکی (بە دەست نویٚژەوە) لە پیٚم کردوە، پاشان مەسحی لە سەر کردن»[1].

٢. ئەبیٚت ئەو شویٚنەی پیٚ -کە فەرزە بشۆردریٚت-، داپۆشیٚت.

٣. **حەلاڵ بن:** دروست نیە مەسح بکریٚت لە سەر زەوت کراو، یا دزراو، یا ئاوریشم بۆ پیاو، چونکە پۆشینی تاوانە، بۆیە ڕوخسەت نادریٚت.

٤. خودی خوفەکان پاك بن: چونکە دروست نیە مەسح بکریٚ لە سەر شتی پیس، وەك ئەوەی لە پیٚستەی کەر دروست کرا بیٚت.

٥. سڕینەکە لەو ماوەیە بیٚت کە شەرع دیاری کردوە: کە بۆ نیشتە جیٚ شەو ورۆژیٚکە، وبۆ ڕیٚبواریش سیٚ شەو وسیٚ ڕۆژە.

ئەمە پیٚنج مەرجە بۆ دروستیٚتی مەسح کردن لە سەر خوف زانایان لە دەقە حەدیسی، وڕیٚسا گشتیەکانەوە دەریان هیٚناوە، بۆیە ئەبیٚت ڕەچاو بکریٚت لە کاتی مەسح کردن دا.

وهیچی تیٚدا نیە مەسح بکریٚت لە سەر گۆرەوەیی تەنك، تۆزیٚ دڕاو[2]، لە بەر ئەو بەڵگانەی هاتون لە بارەی دروستیٚتی مەسح کردن، هەروەها داکەندنی ناڕەحەتی تیٚدایە.

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٠٦)، ومسلم (٢٧٤).

(٢) [ئەگەر گۆرەوی تەنك، یان دڕا بو" بە ڕادەیەك کە ئەگەر مەسحی لە سەر بکریٚت ئاوەکە بەر پیٚکان بکەویٚت ئەوە پیٚی ناوتریٚت سڕین ومەسح، بەڵکو ئەوە شۆردنە! جا دەردەکەویٚت دروست نەبیٚت].

## پرسی سێیەم: چۆنیەتی سڕین وشێوازەکەی:

ئەو شوێنەی دانراوە مەسح بکرێت: سەروی خوفەکانە، واجبیش لەم بارەوە ئەوەندەیە: ناوی سڕین (مەسح) بیگرێتەوە. وچۆنیەتیەکەشی: زیاتر لای سەروی خوفەکەی بسڕێت، لە بەر فەرمودەکەی موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ کە باسی شێوازی مەسحی پەیامبەرمان ﷺ بۆ دەکات لە کاتی دەست نوێژدا، ئەڵێت[1]: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَمْسَحُ عَلى الخُفَّيْن: عَلَى ظَاهِرِهِما» «پەیامبەری خوام ﷺ بینی سەر هەر دو خوفەکەی سڕی». و[بە تەنها] مەسح کردنی ژێر وپشتی خوف لە سەرتی ناخات، وسوننەتیش نیە، لە بەر فەرمایشتەکەی عەلی ﷺ ئەڵێ[2]: «ئەگەر دین بە ڕا وبۆچون ببوایە، ئەوا بێ گومان سڕینی ژێرەوەی سۆل لە پێشتر بو تا سەرەوەی، بەڵام پەیامبەری خوام ﷺ بینی سەروی خوفەکانی سڕی». خۆ ئەگەر سەرەوە وخوارەوە پێکەوە بسڕێت، دروستە بەڵام کەراهەتی هەیە.

## پرسی چوارەم: ماوەی مەسحی خوف:

وماوەی مەسح کردن لە سەر خوف بۆ نیشتە جێ، وئەوەی لە سەفەرێك بێت بۆی نەبێت نوێژ کورت بکاتەوە: بۆ هەر دوکیان شەو ورۆژێکە، بۆ: موسافریش، کە بۆی هەبێت نویژ کورت بکاتەوە: سێ ڕۆژ وسێ شەوە، لە بەر فەرمودەکەی عەلی ﷺ: ئەڵێ[3]: «جَعَلَ رَسولُ اللهِ ﷺ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيهِنَّ لِلْمُسَافِرِ، وَيَوْمًا وَلَيْلَةً لِلمُقِيم»، واتە: «پەیامبەری خوا ﷺ بۆ موسافر: سێ شەو وسێ ڕۆژی داناوە، وبۆ نیشتەجێش شەو ورۆژێك».

---

(١) أخرجه الترمذي (٩٨)، وقال: حسن. وقال الألباني: حسن صحيح (صحيح الترمذي ٨٥).
(٢) أخرجه أبو داود (١٦٢)، والبيهقي (٢٩٢/١)، وصححه الحافظ ابن حجر (التلخيص الحبير ١٦٠/١).
(٣) أخرجه مسلم (٨٥).

## پرسی پێنجەم: هەڵوەشێنەرەوەکانی مەسح کردن:

سڕینیش بەم شتانە هەڵ دەوەشێتەوە:

١. هەر شتێك ڕو بدات کە غوسل واجب بکات، ئەوە مەسحەکەش هەڵ دەوەشێتەوە، لە بەر فەرمودەکەی سەفوانی کوڕی عەسسال ﵁ ئەڵێ: «كَانَ النَّبي ﷺ يَأْمُرُنَا إذا كُنَّا سفرًا ألا نَنْزِعَ خِفَافَنَا ثَلَاثَةَ أيامٍ وَلَيالِيهِنَّ إِلَّا مِنْ جَنَابَةٍ» «پەیامبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ ئەکردین ئەگەر لە سەفەر بوین خوفەکانمان سێ شەو وسێ ڕۆژ دانەکەنین مەگەر بۆ لەش گرانی»[1].

٢. ئەگەر هەندێك شوێنی فەرزەکە دەرکەوت، یانی: هەندێ شوێنی پێی دەرکەوێ، مەسحەکە هەڵ دەوەشێتەوە.

٣. داکەندنی خوف مەسح پوچەڵ دەکاتەوە، وداکەندنی یەکێکیشیان وەکو داکەندنی هەر دوکیان وایە لە سەر ڕای زۆربەی زانایان.

٤. تەواو بونی ماوەی مەسحەکە هەڵی دەوەشێنێتەوە، چونکە مەسح کاتەکەی دیاری کراوە لە لایەن شەرعەوە، جا دروست نیە زیاتر لە ماوەی دیاری کراو مەسح بکرێت. فەرمودەکانی ئەم باسە ئەمەی لێ دەفامی.

## پرسی شەشەم: سەرەتای دەست پێ کردنی مەسح:

ماوەی مەسح دەست پێدەکات لە یەکەم مەسحی دوای دەست نوێژ شکاندن لە دوای لە پێ کردنی، بۆ نمونە: دەست نوێژ دەگرێت بۆ نوێژی بەیانی، وخوفەکانی لە پێ دەکات، بەڵام دوای هەڵهاتنی خۆر دەست نوێژی دەشکێت، ودەست نوێژ

(١) أخرجه أحمد (٤/٢٣٩)، والنسائي (١/٨٤)، والترمذي (٩٦) وصححه، وحسنه الألباني (الإرواء ١٠٤).

ناگرێتەوە، پاشان پێش نوێژی نیوەڕۆ دەست نوێژ دەگرێت، جا دەست پێ کردنی ماوەکە لە کاتی دەست نویژ گرتنیەوە دەست پێدەکات لە پێش نوێژی نیوەڕۆ، یانی: لە مەسح کردنی دوای دەست نوێژ شکاندن. هەندێکیش لە زانایان وتویانە: سەرەتاکەی لە هەڵاتنی خۆرەوەیە لە کاتی دەست نوێژ شکاندنەکەی[1].

## پرسی حەوتەم: مەسح کردن لە سەر کەرەستەی گرتنەوە ومێزەر وسەرپۆشی ئافرەتان.

«الجبيرة= کەرەستەی گرتنەوە»: دار وهاوشێوەکانیەتی وەك گەچ، لەو شتانەی بە شکاویەوە دەپێچرێت تا ساڕێژ بون وخۆش بونەوەی، مەسحی لە سەر دەکات، هەروەها مەسح دەکات لە سەر لەزگە ولەفافی سەر برینەکان، هەمو ئەمانە مەسحی لە سەر دەکرێ بەو مەرجەی بە گوێرەی پێویستی دانرا بێت، خۆ ئەگەر لە پێویستی زیاتر بو، ئەوا ئەبێت زیادەکە هەڵ مالێت ودایبکەنێت.

هەروەها لە حەدەسی گەورە وگچکە دروستە مەسحی لە سەر بکات، وبۆ مەسح لە سەر کردنیشی ماوەیەکی دیاری کراوی نیە، بەڵکو مەسحی لە سەر دەکات تا لابردنی یا چاك بونەوەی ئەوەی ژێری. بەڵگەش لە سەر ئەمە: ئەوەیە مەسح کردن لە سەری زەرورەتێکە، زەرورەتیش بە گوێرەی خۆی ئەندازەی بۆ دادەنرێ، هیچ جیاوازیەکیش نیە لە نێوان هەر دو جۆرەکەی حەدەس.

هەروەها دروستە مەسح بکرێت لە سەر مێزەر (ئەوەی کە دەپێچرێتە سەرەوە)، بەڵگەش لە سەر ئەمە: فەرمودەکەی موغیرەی کوڕی شوعبەیە ﷺ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَسَحَ عَلَى عِمَامَتِه وَعَلَى النَّاصِيَةِ وَالخُفَّيْن» «پەیامبەری خوا ﷺ سەر

---

(١) واتە: ئەم بۆچونە پێی وایە لە دەست نوێژ شکاندنەوە حساب دەکرێت. وەرگێڕ

مێزەرەکەی وپێشە سەری وخوفەکانی مەسح کرد »[1]. ولە بەر فەرمودەی: «پەیامبەری خوا ﷺ مەسحی کرد لە سەر خوفەکانی ومێزەرەکەی»[2]. مەسح کردنیش لە سەری کاتێکی دیاری کراوی نیە وبەلاَم ئەگەر ئیحتیاط بکات ومەسحی نەکات مەگەر بە دەست نوێژەوە لە سەری کردبێت ولەو ماوە دیاری کراوە بێت کە بۆ مەسح لە سەر خوف باس کرا، ئەوە چاکترە.

سەرپۆشی ئافرەتانیش، ئەوەی کە سەری پێ دادەپۆشێت، باشترە مەسحی لە سەر نەکات مەگەر: قورسیەك هەبێت لە داکەندنی، یا، بە هۆی نەخۆشیەك لە سەری وهاوشێوەی ئەمانە، ئەگەریش سەری گرتبوە خەنە وهاوشێوەکانی، ئەوە دروستە مەسحی لە سەر بکات، چونکە پەیامبەری خوا ﷺکردویەتی، وبە گشتیش پاك کردنەوەی سەر هەندێك کار ئاسانی وبار سوکی تێدا کراوە بۆ ئەم ئومەتە.

---

(١) أخرجه مسلم (٢٧٤).

(٢) أخرجه مسلم (٢٧٥).

# دەروازەی حەوتەم

# لە بارەی خۆ شۆردن (الغُسْل)ـەوە

ئەمەش لە چەند پرسێك پێك هاتوە:

## پرسی یەکەم: واتای غوسل، وحوکمەکەی، وبەڵگەکانی:

١. **واتاکەی:** «الغُسل» لە زمانەوانی دا: چاوگی «غَسَلَ الشيْءَ يَغْسِل غَسْلًا وغُسْلًا»ە، کە بریتیە لە شۆردنی تەواوی لاشە.

واتاکەیشی لە شەرع دا: ئەوەیە ئاو بکەیت بە هەمو لاشەدا، یا: بە کار هێنانی ئاوێکی پاکە بۆ هەمو لاشە، بە شێوازێکی دیاری کراو، وەکو پەرستشی خوا ﷻ.

٢. **حوکمەکەی:** غوسل پێویستە، ئەگەر پێویست کەرەکەی بە دی هات، لە بەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا﴾ [المائدة:٦] «وئەگەر لەشتان گران بو، ئەوا خۆتان بشۆن»، وئەو فەرمودانەی چۆنیەتی غوسلی تێدا هاتوە لە چەندەها هاوەڵەوە، لە پەیامبەرەوە ﷺ بەڵگەن لە سەر واجبێتی غوسل، هەندێکیشی بەم نزیکانە دێت -إن شاء الله تعالى-.

٣. **ئەو شتانەی غوسل واجب دەکەن:** لە بەر هەر یەك لەم هۆکارانەی خوارەوە واجب دەبێ:

أ. **دەرچونی تۆوی پیاو لە شوێنی خۆیەوە:** مەرجیشە پشقە بکات، وبە چێژەوە بێت، لە نێر یا لە مێ، لە بەر ئایەتی: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا﴾ [المائدة:٦]، ولە بەر

فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ بۆ علی رضي الله عنه: «إذا فَضَخْتَ المَاءَ فَاغْتَسِلْ»[1]، واتە: «ئەگەر ئاوت پشقەی کرد، ئەوا غوسل بکە»، بە مەرجێك نە خەوتبێت وهاو شێوەکانی، ئەوسا چێژ نابێتە مەرج، چونکە خەوتو لەوانەیە هەستی پێ نەکات، لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ کە پرسیاری لێ کرا: ئایا ئافرەت غوسلی لە سەرە ئەگەر لەش گران بو، فەرموی: «نَعَمْ إِذَا رَأَتِ الماءَ» «بەڵێ، ئەگەر ئاوی بینی»[2]. هەمو ئەمانەش کۆ دەنگی لە سەرە.

**ب. سەری عەورەت هەر هەموی، یا ئەندازەکەی بچێت بە دامێندا**، بە بێ بەر بەست، با ئاویش نەیەتەوە، لە بەر فەرمودەی: «إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الأربع، وَمَسَّ الخِتَانُ الخِتَانَ، وجبَ الغُسلُ» «ئەگەر لە بەینی چوار پەلی دانیشت وخەتەنە کراو بەر خەتەنە کراو کەوت، ئەوە غوسل واجب بوە»[3]، بەلام لەم حالەتەدا غوسل واجب نابێت مەگەر کوڕێك تەمەنی دە ساڵان وبەرەو سەرەوە بێت، وکچێك نۆ ساڵ وبەرەو سەرەوە بێت.

**ج. موسڵمان بونی کافر ئەگەر هەڵ گەراوەش بێت**، چونکە: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ قَيْسَ بْنَ عَاصِمٍ حِينَ أَسْلَمَ أَن يَغْتَسِل» «کاتێك قەیسی کوری عاصم رضي الله عنه موسڵمان بو، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد غوسل بکات»[4].

**د. نەمانی خوێنی سوڕی مانگانە وزەیستانی**: لە بەر فەرمودەکەی عائیشە رضي الله عنها، کە پەیامبەری خوا ﷺ بە فاتمەی کچی ئەبی حوبەیشی رضي الله عنها فەرمو: «إِذَا

---

(١) أخرجه أبو داود (٢٠٦)، وصححه الألباني (الإرواء ١٢٥).
(٢) أخرجه مسلم (٣١٣).
(٣) أخرجه مسلم (٣٤٩).
(٤) أخرجه أبو داود (٣٥٥)، والنسائي (١/١٠٩)، والترمذي (٦٠٥) وحسنه، وصححه الألباني «الإرواء» (١/١٦٣-١٦٤).

أَقْبَلَتْ حَيْضَتُكِ فَدَعِي الصَّلَاةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ ثُمَّ صَلِّي»، «ئەگەر سوڕی مانگانە هات، واز لە نوێژ بهێنە، ئەگەریش تەواو بو ئەوا خۆت بشۆ ونوێژ بکە»[١].

زەیستانیش وەکو سوڕی مانگانە وایە بە کۆ دەنگی.

ه. **مردن:** لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ -کە زەینەبی کچی وەفاتی کرد بو-: «بیشۆن»[٢]. هەروەها لە بارەی ئەو کەسەی لە ئیحرامدا مرد، فەرموی: «اِغْسِلُوه بِمَاءٍ وَسِدْرٍ» «بیشۆن بە ئاو ونەبك»[٣]، ئەمەش وەکو عیبادەت دەکرێت، چونکە ئەگەر بە هۆی حەدەسەوە ببوایە، حەدەسەکە لا نەدەچو لە کاتێکدا هۆکارەکەشی هێشتا ماوە[٤].

## پرسی دوەم: لە بارەی شێوازی غوسل دەرکردن وچۆنیەتیەکەی:

دەرکردنی غوسلی لەش گرانی دوو شێوازی هەیە: شێوازێکی لە سەر کەوتن[٥]، وشێوازێکی تەواوەتی[٦].

شێوازی لە سەر کەوتن بەوە ئەبێت: بە نیەتەوە، ئاو بکات بە هەمو لاشەیدا، لە بەر فەرمودەکەی مەیمونە ﵂ ئەڵێ: «وَضَعْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ غُسْلًا وَسَتَرْتُهُ،

(١) أخرجه البخاري (٣٢٠)، ومسلم (٣٣٣).

(٢) متفق عليه، أخرجه البخاري (١٢٥٣)، ومسلم (٩٣٩).

(٣) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٢٦٦) كتاب الجنائز، ومسلم (١٢٠٦).

(٤) [واتە: بە هۆی مردنەوە، ئەوا ئەو زیندو نەبۆتەوە وهۆکارەکە لا نەچوە، تا حەدەسەکەی دەر بکەین بە غوسل. وەك ئافرەت لە حەیزدا بێت ناکرێت هێشتا خوێنی لێ بچۆڕێت، کەچی بڕوات غوسل بکات].

(٥) [بۆ واتای لە سەر کەوتن (الاجزاء) بڕوانە: دەروازەی پێنجەم، پرسی چوارەم: فەرزەکانی دەست نوێژ].

(٦) چۆنێتی غوسلی لە سەر کەوتنیش: ئەو غوسلەیە کە لە تەنها واجبەکان پێك هاتوە. چۆنێتی تەواوەتی وسوننەتیش: بریتیە لەوەی واجب وسوننەتەکانی لە خۆ گرتوە.

فَصَبَّ عَلَى يَدِهِ، فَغَسَلَهَا مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ -قَالَ: سُلَيْمَانُ لاَ أَدْرِي، أَذَكَرَ الثَّالِثَةَ أَمْ لاَ؟- ثُمَّ أَفْرَغَ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ، فَغَسَلَ فَرْجَهُ، ثُمَّ دَلَكَ يَدَهُ بِالأَرْضِ أَوْ بِالحَائِطِ، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، وَغَسَلَ رَأْسَهُ، ثُمَّ صَبَّ عَلَى جَسَدِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ، فَنَاوَلْتُهُ خِرْقَةً، فَقَالَ بِيَدِهِ هَكَذَا، وَلَمْ يُرِدْهَا»[١]، «ئاوی غوسلم بۆ پەیامبەری خوا ﷺ دانا، ودام پۆشی، ئاوی کرد بە سەر دەستیدا وجارێك یا دو جار شۆردی، -سولەیمان ئەڵێ: نازانم باسی سێ جاریشی کرد یا نا- پاشان بە دەستە ڕاستی ئاوی کرد بە سەر دەستە چەپی دا وسێ جار عەورەتی خۆی شۆرد، پاشان دەستی ساوی بە زەوی یا بە دیوارەکەدا، پاشان ئاوی دا بە دەم ولوتیدا ودەم وچاو ودەست وسەری شۆرد، وپاشان ئاوی کرد بە سەر هەمو جەستەیدا، پاشان ڕۆیشتە ئەولاترەوە وقاچەکانی شۆرد، منیش خاولیەکم بۆ برد، بە دەستی ئاوهای کرد ونەیویست». بە هەمان شێوە فەرمودەکەی عائیشە ﵂ کە تێیدا هاتوە: «پاشان دەست ئەکاتە ناو قژی تا ئەزانێ ئاو گەیشتۆتە بنی قژی، ئەوسا سێ جار ئاو دەکات بە سەری دا، پاشان هەمو لاشەی شۆرد»[٢].

شێوازی تەواوەتیش ئەوەیە: هەر دو دەستی، وعەورەتی، لەگەڵ شتێك پێوەی بێت بشوات، پاشان دەست نوێژ وەك هی نوێژ دەگرێت، پاشان بە ئاو دەست دەخاتە ناو قژی هەتا بنی، وهەست دەکات ئاو گەیشتۆتە بنەوە، پاشان سێ جار ئاو دەکات بە سەری دا، پاشان ئاو دەکات بە هەمو لاشەیدا، ئەمەش لە بەر فەرمودەکەی عائیشە ﵂ کە بوخاری وموسلیم گێڕاویانەتەوە.

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٢٦)، ومسلم (٣١٧).

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٤٨)، ومسلم (٣١٦).

واجبیش نیە لە سەر ئافرەت پەلکەکانی قژی بکاتەوە لە کاتی غوسلی لەش گرانی دا، بەلاّم بۆ غوسلی سوڕی مانگانە واجبە، لە بەر فەرمودەکەی ئوم سەلەمە ﵂ ئەلێ: وتم: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ! من ئافرەتێکم قژم دەکەمە پەلك، ئایا بۆ غوسلی لەش گرانی بیکەمەوە؟ فەرموی: «لَا، إِنَّمَا يَكْفِيكِ أَنْ تَحْثِي عَلَى رَأْسِكِ ثَلَاثَ حَثَيَاتٍ، ثُمَّ تُفِيضِينَ عَلَيْكِ الْمَاءَ فَتَطْهُرِينَ» «نا، بەستە سێ جار ئاو بکەی بە سەر سەرت دا، پاشان ئاو دەکەی بە خۆت دا وپاك دەبیتەوە»[1].

## پرسی سێیەم: ئەو کەسەی غوسلی لە سەر واجبە، چی حوکمێکی لێ دەبێتەوە؟

ئەو کەسەی غوسلی لە سەر واجب ئەبێت، هەندێك حوکمی لێ دەکەوێتەوە، دەکرێ لەمانەی خوارەوە گرد بکرێتەوە:

١. دروست نیە بۆی لە مزگەوت بمێنیتەوە مەگەر پێیدا تێ پەڕ بێت، لە بەر ئایەتی: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ﴾ [النساء:٤٣] «ونزیکی مزگەوت مەبنەوە لە کاتی لەش گرانی دا مەگەر تێ پەڕ بن پێی دا»، ئەگەریش دەست نوێژی گرت دروستە بۆی بمێنێتەوە لە مزگەوت، چونکە ئەمە چەسپاوە لە کۆمەڵێك لە هاوەڵانەوە لە سەردەمی پەیامبەردا ﷺ، هەروەها دەست نوێژ حەدەس سوك دەکاتەوە، ودەست نوێژیش یەکێکە لە دو پاکیەکە.

٢. دروست نیە بۆی دەست بدات بە قورئانەوە، لە بەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿لَا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ﴾ [الواقعة:٧٩]. هەروەها لە بەر فەرمودەی [پێشتر]: «کەس دەست بە قورئانەوە نادات مەگەر پاك».

---

(١) أخرجه مسلم (٣٣٠).

٣. دروست نیە بۆی قورئان بخوێنێت، جا لەش گران نابێت هیچ قورئان بخوێنێت تا خۆی دەشوات، لە بەر فەرمودەکەی عەلی ﷺ ئەڵێ: «كان ﷺ لا يمنعه من قراءة القرآن شيء إلا الجنابة» «پەیامبەر ﷺ هیچ ڕێگری قورئان خوێندنی لێ نەدەکرد مەگەر لەش گرانی»[1]. کە ڕێ گریشی لێ دەکرێت هاندانێکە بۆی تا پەلە بکا لە غوسل دەر کردن، وڕێ گر لە خوێندن زو لا بدات.

لەو شتانەی تر حەرامە لە سەری:

٤. نوێژ کردن.

٥. تەواف کردن بە دەوری کەعبەدا. وەك پێشتر باس کرا لە پرسی: «ئەو شتانەی پێویستە دەست نوێژی بۆ بگیرێت»، لە دەروازەی پێنجەم.

## پرسی چوارەم: ئەو غوسلانەی سوننەتن:

پێشتر باسی غوسلە واجبەکانمان کرد، غوسلە سوننەتەکانیش ئەمانەن:

١. خۆشۆردنەوە بۆ هەمو جوت بونێك: لە بەر فەرمودەکەی ئەبو ڕافع ﷺ: پەیامبەری خوا ﷺ شەوێکیان غوسلی دەکرد لە لای ئەمەکەیان ولە لای ئەوەکەی تریشیان، وتم: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ بۆ یەك جار خۆت ناشۆیت؟ فەرموی: «هذا أَزْكَى، وَأَطْيَبُ، وأَطْهَرُ» «ئەمە پاك ترە وچاك ترە وخاوێن ترە»[2].

---

(١) أخرجه أحمد (١٠١٤)، وابن ماجه (٥٩٤)، والترمذي (١٤٦)، قال الترمذي: «حسن صحيح». وصححه الحاكم «المستدرك» (١٠٧/٤). ونقل الحافظ تصحيحه عن: ابن السكن، وعبد الحق، والبغوي، وأن شعبة حسَّنه. «التلخيص الحبير» (١٣٩/١).

(٢) أخرجه أبو داود (٢١٦)، وابن ماجه (٥٩٠)، وحسَّنه الألباني «صحيح ابن ماجه» (٤٨٦).

٢. غوسل بۆ هەینی: لەبەر فەرمایشەکەی پەیامبەری خوا ﷺ: «إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ»، «ئەگەر کەسێکتان هات بۆ جومعە، با خۆی بشوات»[١]، ئەمەش لە هەمو غوسلەکان زیاتر سوننەتترە.

٣. غوسل بۆ هەر دو جەژنەکە.

٤. غوسل لە کاتی ئیحرام بەستن بۆ عومرە یا حەج: چونکە پەیامبەر ﷺ کاتێك ئیحرامی بەست خۆی شۆرد.

٥. غوسل بۆ مردو شۆر: لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «من غَسَّلَ ميتًا فلْيغتسل» «هەر کەس مردویەکی شۆرد با خۆی بشوات»[٢].

(١) أخرجه البخاري (٨٧٧).

(٢) أخرجه ابن ماجه (١٤٦٣)، وصححه الألباني (الإرواء ١٤٤).

# دەروازەی هەشتەم

## لە بارەی تەیەمموم (التَيَمُّم)

«التَـيَمُّم» لە زمانەوانی دا: مەبەستە، لە شـەرعیش دا: بریتیـە لـە سـڕینی دەم وچاو ودەست بە خۆڵی پاك، بە شێوەیەکی دیاری کراو، وەك پەرستش بۆ خوا.

چەند پرسێکیشی لە خۆ گرتوە:

### پرسی یەکەم: حوکمی تەیەموم وبەڵگەکەی:

تەیـەموم شـەرعییە، وڕوخسـەتێکی خواییـە بـۆ بەنـدەکانی، یەکێکیشـە لـە جوانیەکانی ئەم شەریعەتە، وتایبەتمەندیەکانی ئەم ئومەتە، لە بەر ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّـذِينَ آمَنُـوا إِذَا قُمْـتُمْ إِلَـى الصَّـلَاةِ فَاغْسِـلُوا وُجُـوهَكُمْ وَأَيْـدِيَكُمْ إِلَـى الْمَرَافِـقِ وَامْسَـحُوا بِرُءُوسِـكُمْ وَأَرْجُلَكُـمْ إِلَـى الْكَعْبَيْنِ وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُبًا فَـاطَّهَّرُوا وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَـاءَ فَلَـمْ تَجِدُوا مَـاءً فَتَيَمَّمُـوا صَـعِيدًا طَيِّبًـا فَامْسَـحُوا بِوُجُـوهِكُمْ وَأَيْـدِيكُمْ مِنْـهُ مَـا يُرِيـدُ اللَّهُ لِيَجْعَـلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ وَلَكِنْ يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ [المائدة: ٦]. [پێشتر ڕاڤەمان کرد]، هەروەها لە بەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێت: «إِنَّ الصَّعِيدَ الطَّيِّبَ طَهُورُ الْمُسْلِمِ وَإِنْ لَـمْ يَجِدِ الْمَاءَ عَشْرَ سِنِينَ، فَإِذَا وَجَدَ الْمَـاءَ فَلْيُمِسَّهُ بَشَرَتَهُ، فَإِنَّ ذَلِكَ خَيْرٌ» «خـۆڵی پـاکی ڕوی زەوی، ئـاوی دەسـت نوێـژە بـۆ موسڵمان، ئەگەر بۆ ماوەی دەساڵیش ئاوی دەست نەکەوێت، کە دەستی کـەوت بـا بیدات بە پێستەی خۆی دا، ئەوە باشترە بۆی»[1]، ولـە بـەر فەرمایشـتی پەیامبـەر

---

(١) أخرجه أبو داود (٣٢٩) [بل (٣٣٢، ٣٣٣)]، والترمذي (١٢٤) [هذا لفظه]، وصححه الألباني «الإرواء» (١٥٣).

ﷺ کە ئەفەرمویّت: «جُعِلَتْ لِيَ الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا» «من هەمو زەویم بۆ کراوە بە شویّنی نویّژ وپاك کەرەوە»[1].

وزانایان کۆکن لە سەر دروستیّتی تەیەموم ئەگەر مەرجەکانی فەراهەم بو، وکۆکن لە سەر ئەوەی کە جیّی دەست نویّژ گرتن بە ئاو دەگریّتەوە، وئەوەی ڕاستە حەدەس ناهیّلّیّت، وئەوەی بە دەست نویّژ گرتن بە ئاو حەلاّلّ ئەبیّت بە ئەمیش حەلاّلّ ئەبیّت، وەك: نویّژ، تەواف، قورئان خویندن، وهتد.

بەمەش دروستیّتی تەیەموم کردن چەسپا بە قورئان وسوننەت وکۆ دەنگی.

## پرسی دووەم: مەرجەکانی تەیەموم وئەو هۆکارانەی کە حەلاّلّی دەکەن:

ئەگەر نەتوانرا ئاو بە کار بهێنریّت، ئەوە تەیەموم دروستە، ئیتر بە هۆی نەبونیەوە بیّت ، یا ترسی زەرەر پیّگەیشتن لە بەکارهیّنانی بە هۆی نەخۆشیەکی لاشەوە یا زۆری سەرماوە بیّت. بە بەلّگەی فەرمودەکەی عیمرانی کوڕی حوصەین ﷛: «عَلَيْكَ بالصَّعيدِ الطَّيِّبِ فإِنَّه يَكْفِيك» «خۆلّی پاك بە کار بهیّنە، بەستە»[2].

**تەیەمومیش دروست ئەبیّت بەم مەرجانەی خوارەوە:**

١. **نیەت:** کە بریتیە لە مەبەستی دلّ بۆ حەلاّلّ کردنی نویّژ، نیەتیش مەرجە لە هەمو عیبادەتیّك دا، جا تەیەمومیش عیبادەتە.

٢. **ئیسلام:** جا لە لایەن کافرەوە بکریّت نابیّت، چونکە عیبادەتە.

٣. **ئاوەز (عەقلّ):** جا لە لایەن نا ژیرەوە نابیّت، وەك: شیّت وبوراو

(١) أخرجه البخاري (٣٣٥).

(٢) أخرجه البخاري (٣٤٤)، ومسلم (٦٨٢).

٤. **جیا کردنەوە**[١]: جا کەسێك نەگەیشتبێتە جیا کردنەوە نابێت، کە بریتیە لە خوار حەوت ساڵان.

٥. نەکرێ ئاو بە کار بهێنرێ: **بە هۆی نەبونیەوە بێت**، وەك خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ [المائدة:٦]، ولە بەر فەرمودەی [پێشتر]: «خۆڵی پاك ئاوی دەست نوێژی موسڵمانە ئەگەر دە ساڵیش ئاوی دەست نەکەوێت، ئەگەر ئاوی دەست کەوت ئەوا با بەکاری بهێنێت لە لاشەیدا، ئەوە خێر وچاکە». یا **بەهۆی ترسی زیان پێ گەیشتنەوە بێت** لە بەکارهێنانی وەك نەخۆشیەك بترسێ زیاد بکات، یا درەنگ تر چاك ببێتەوە بە هۆی ئاو بە کار هێنان، لە بەر ئایەتی: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى﴾ [النساء:٤٣]، «وئەگەر نەخۆش بون». ولە بەر فەرمودەی کابرای زام دار، تێیدا هاتوە: پەیامبەر ﷺ فەرموی: «قَتَلُوه قَتَلَهم الله، هَلَّا سَأَلُوا إِذَا لَمْ يَعْلَمُوا؛ فَإِنَّمَا شِفَاءُ الْعِيِّ السُّؤَالُ» «کوشتیان خوا بیان کوژێت! ئەی بۆ پرسیاریان نەکرد کە نەیان دەزانی، شیفای نەزانین پرسیار کردنە»[٢]. یا بەهۆی زۆری سەرماوە بێت، بترسێت بە هۆی ئاو بەکارهێنانەوە زیانی پێ بگات یا تیا بچێت، لە بەر فەرمودەکەی عەمری کوڕی عاص ﷺ کە نێردراوە بۆ غەزای «ذات السلاسل»، ئەڵێ: «لە شەوێکی زۆر سەرما دا لەش گران بوم، ترسام ئەگەر خۆم بشۆم تیا بچم، بۆیە تەیەمومم کرد وبەر نوێژی بەیانیم بۆ کردن، [کە بۆ پەیامبەرم ﷺ گێڕایەوە پێکەنی وهیچی نەوت]»[٣].

---

(١) بۆ تمییز، بڕوانە: دەروازەی پێنجەم، پرسی سێیەم: لە بارەی مەرجەکانی دەست نوێژەوە. «وەرگێڕ»
(٢) أخرجه أبو داود (٣٣٧)، وابن ماجه (٥٧٢)، وصححه الشيخ أحمد شاكر «حواشي المسند» (٥/٢٢-٢٣)، وحسّنه الألباني «صحيح ابن ماجه» (٤٦٤).
(٣) أخرجه أحمد (٤/٢٠٣)، وأبو داود (٣٣٤)، والدارقطني، وصححه الألباني (الإرواء ١٥٤).

٦. ئەبێت تەیەموم بە خۆڵێکی پاك بێت ونابێت پیس بێت -وەك خۆڵێك میزی بەر کەوتبێت وپاك نەبو بێتەوە-، وتۆزیشی هەبێت وبنوسێت بە دەستەوە، ئەگەر دەستی کەوت، لە بەر فەرمایشتی: ﴿فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ مِنْهُ﴾ [المائدة:٦]. «بە خۆڵێکی پاکی ڕوی زەوی تەیەموم بکەن ودەم وچاو ودەستانی پێ بسڕن»، وئیبن عەبباس ئەڵێ: ««الصَّعِيد» خۆڵی کێڵگەیە، «الطَّيِّب»یش: یانی پاك». ئەگەریش خۆڵی دەست نەکەوت، تەیەموم ئەکات بەوەی دەستی ئەکەوێت لە لم وبەرد، لە بەر فەرمایشتی: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾ [التغابن:١٦] «بە پێی توانا لە خوا بترسن وپارێزی لێ بکەن»، ئەوزاعی ئەڵێت: لم لە «صَعيد»ە.

## پرسی سێیەم: بەتاڵکەرەوەکانی تەیەموم:

ئەو شتانەیە تەیەمومم هەڵ دەوەشێننەوە، پوچەڵ کەرەوەکانیشی سیانن:

١. تەیەموم دەشکێت بە حەدەسی بچوك کە شکێنەری دەست نوێژن، وبە هۆی حەدەسی گەورەشەوە کە پێویست کەرەکانی غوسڵن، وەك لەش گرانی وسوڕی مانگانە وزەیستانی، جا ئەگەر تەیەمومی کرد بە هۆی حەدەسی بچوکەوە، پاشان میزی کرد یا پیسی کرد ئەوە تەیەمومەکەی هەڵ دەوەشیتەوە، چونکە تەیەموم جێ گرەوەی دەست نوێژە، جێگرەوەش حوکمی ئەو شتەی هەیە جێگەی گرتۆتەوە. بەهەمان شێوە تەیەموم کردن بە هۆی حەدەسی گەورەوە.

٢. بونی ئاو، ئەمە ئەگەر تەیەموم کردنەکە بە هۆی نەبونی ئاوەوە بو، لە بەر فەرمودەی: «ئەگەر ئاوت دەست کەوت بیدە لە پێستت» پێشتریش باس کرا.

٣. نەمانی ئەو بیانوەی بە هۆیەوە ڕێگە بە تەیەموم دراوە وەك نەخۆشی وهاوشێوەکانی.

## پرسی چوارەم: شێوازی تەیەموم کردن:

**چۆنێتیەکەی ئەوەیە:** نیەتی هەبێت، پاشان «بسم الله» دەکات، وهەر دوو دەستی دەدات بە سەر زەوی دا یەك جار، پاشان فوی پێ دا دەکات یا دەیتەکێنێت، پاشان دەم وچاو وهەر دو دەستی پێ دەسڕێت تا مەچەکەکانی، مەچەکیش بریتیە لەو جومگەیەی نێوان باسك ولەپ. ئەمەش لە بەر فەرمودەکەی عەممار ﷺ، کە تێیدا هاتوە: «التَّيَمُّمُ ضَرْبَةٌ لِلْوَجه والكَفَّين» «تەیەموم لێ دانێکە بۆ دەم وچاو وهەر دو لەپ»[1]، ولەبەر فەرمودەیەکی تری کە پەیامبەر ﷺ پێی فەرموە: «إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ أَنْ تَصْنَع هَكذا» «ئاوات بکردایە بەست بو»[2]، پاشان لەپەکانی دا بە زەوی دا وتەکاندی وپاشان بە دەستی چەپی بان دەستی ڕاستی سڕی، یا بە دەستی ڕاستی سەر لەپی چەپی سڕی، پاشان مەسحی دەم وچاوی پێ کرد.

(١) أخرجه أحمد (٢٦٣/٤)، وأبو داود (٣٢٧)، وصححه الألباني (الإرواء ١٦١).
(٢) أخرجه البخاري (٣٤٧)، ومسلم (٣٦٨) واللفظ للبخاري.

# دەروازەی نۆیەم

# لە بارەی پیسیەکان وچۆنێتی پاك کردنەوەی

**لە چەند پرسێك پێك هاتوە:**

## مەسەلەی یەکەم: پێناسەی پیسی ودو جۆرەکەی:

**پیسی:** بریتیە لە هەمو شتێکی قیزەون کە شەرع فەرمانی لێ دور کەوتنەوەی کرد بێت.

**ئەمەش دو جۆرە:**

١. **خودی خۆی پیسە** ((پیسی حەقیقی)): ئەو جۆرەیە کە بە هیچ شێوەیەك پاك نابێتەوە، چونکە خودی خۆی پیسە، وەك تەرسەی کەر، وخوێن، ومیز.

٢. **حوکمەکەی پیسە** ((پیسی حوکمی)): ئەم جۆرە ئیعتباریە وبە سەر ئەندامەکان دا دێت، وڕێگرە لە دروستی نوێژ، وحەدەسی بچوك دەگرێتەوە کە بە دەست نوێژ لا دەچێت، وەك دەست بە ئاو گەیاندن، وحەدەسی گەورەش دەگرێتەوە کە بە غوسل لا دەچێت، وەك لەش گرانی.

لە بنەڕەتیشدا ئەو شتەی پیسی پێ پاك دەکرێتەوە ئاوە، ئەوە بنچینە وئەسڵە لە پاك کردنەوە، لە بەر فەرمایشتی: ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُمْ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لِيُطَهِّرَكُمْ بِهِ﴾ [الأنفال:١١] ((وئاوێکتان لە هەورەکانەوە بۆ دا دەبارێنێت بۆ ئەوەی خۆتانی پێ پاك بکەنەوە)).

**پیسیش ئەبێتە سێ بەشەوە:**

**پیسیەکی قورس (سەخت):** کە بریتیە لە پیسی سەگ وئەوەشی لێی دەبێت.

**پیسیەکی سوك:** وەك خوێن ومەزی وچڵك وکێم وزوخاو ومیزی منداڵێك خواردن ناخوات[١].

**پیسی مام ناوەند:** بریتیە لە پیسیەکانی تر، وەك: میز وپاشەڕۆ ومردارەوە بو.

## پرسی دووەم: ئەو شتانەی بەڵگە هەیە لە سەر پیسیەکەی:

١. **میزی ئادەمیزاد وپاشەڕۆی ورشانەوەی:** تەنها میزی منداڵ نەبێت کە خواردن نەخوات ئەوە تەنها ئاو پرژێن دەکرێت، لە بەر فەرمودەکەی ئوم قەیسی کچی میحصەن ﷺ «منداڵێکی بچوکی -کە هێشتا خواردنی نەدەخوارد- هێنایە خزمەتی پەیامبەری خوا ﷺ، ئەویش لە کۆشی خۆی داینا، ومنداڵەکە میزی کرد بە جل وبەرگەکەیدا، ئەویش داوای ئاوی کرد وشوێنەکەی ئاو پرژێن کرد ونەیشۆرد»[٢]. سەبارەت بە میزی منداڵێك خواردن بخوات یا کیژۆڵە، ئەوە وەك میزی گەورە وایە، دەبێت بشۆردرێت.

٢. **خوێنی ڕژاو لە ئاژەڵێکی گۆشت خوراوەوە**، بەڵام ئەو خوێنەی کە لە گۆشت ودەمارەکاندا دەمێنێتەوە ئەوە پاکە، لە بەر ئایەتی: ﴿أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا﴾ [الأنعام:١٤٥]، «یا خوێنێکی چۆڕاو» کە ئەو خوێنەیە بڕژێت وبچوڕێت[٣].

٣. **میز وپاشەڕۆی هەمو ئاژەڵێك گوشتی نەخورێت**، وەك پشیلە ومشك.

(١) یانی: بە سەر بەخۆیی خۆراکی لە سەر خوارەمەنیەکان نیە، وبێ نیازی نەکردوە بە شیر خواردن. بڕوانە: «الفتح» (١/٣٢٦).

(٢) أخرجه البخاري (٢٢٣). وَ«نَضَحَهُ»: ئاو ڕەشەی کرد وئاوی کرد بە سەریدا.

(٣) بۆ ئەوەی خوێنەکانی تری وەك جگەر وهاوشێوەکانی نەگرێتەوە. «وەرگێڕ»

٤. **مردارەوە بو:** ئەو ئاژەڵەیە مردار بو بێتەوە بە بێ ئەوەی بە شێوازێکی شەرعی سەر بڕدرا بێت، ئەمەش لە بەر فەرمایشتەکەی پەروەردگار: ﴿إِلَّا أَنْ يَكُونَ مَيْتَةً﴾ [الأنعام:١٤٥] ((مەگەر مردارەوە بو، ئەوە حەرامە))، بەڵام ماسی وکولەی مردارەوە بو، وهەر شتێکی تر خوێنی لێ نەیەت= ناگرێتەوە، وپاکە.

٥. **مەزی:** بریتیە لە ئاوێکی ڕەنگ ئاوی تەنکی لینج، لە کاتی دەست بازی یا بیر کردنەوە لە جوت بون دەر دەچێت، بێ شەهوەت، وبێ فشقەکردن، وسارد بونەوەی بە دوا دا نایەت، لەوانەشە هەست بە دەرچونی هەر نەکات، ئەمەش پیسە، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ بە عەلی کوڕی ئەبو تالب رضي الله عنه: «تَوَضَّأْ، واغْسِلْ ذَكَرَكَ» ((دەست نویژ بگرە وعورەتت بشۆ))[1]. یانی: بەهۆی مەزیەوە، فەرمانیشی پێ نەکرد بە غوسل کردن، وەك سوك کردنەوە ولا بردنی نارەحەتی، چونکە خۆ لێ پاراستنی قورسە.

٦. **وەدی** (الوَدْي): ئاوێکی سپی خەستە، دوای میز کردن دەر دەچێت، هەر کەسیش بەری بکەوێت، عەورەتی دەشوات ودەست نویژ دەگرێت وغوسڵ ناکات.

٧. **خوێنی سوڕی مانگانە:** وەك لە فەرمودەکەی ئەسمائی کچی ئەبو بەکر دا رضي الله عنهما هاتوە، ئەڵێ[2]: ((ئافرەتێك هات بۆ لای پەیامبەر ﷺ وتی: هی وامان هەیە خوێنی عادە بەر جل وبەرگەکەی دەکەوێت، چی بکا؟ فەرموی: «تَحُتُّهُ، ثم

---

(١) أخرجه البخاري (٢٦٩).

(٢) أخرجه البخاري (٢٢٧)، ومسلم (٢٩١) واللفظ لمسلم.

تَقْرُصُهُ[١] بالماء، ثم تَنْضَحُه، ثم تُصَلي فيه» «با بـه شـتێك بیوەرێنێـت، وبـه ئـاو بیدات بە لەپ دا، وئاو بکات بە سەری دا، وئینجا نوێژی پێوە دەکات».

٨. خوێنی زۆر کە لە ڕێگەی لوت (الرعاف) وهتد لە مرۆڤ دێتە دەرەوە[٢].

## مەسەلەی سێیەم: چۆنێتی پاك کردنەوەی پیسی:

١. ئەگەر پیسیەکە لە زەوی دا بو: ئەوە جارێك شۆردن بەسە بۆ پاك کردنـەوەی، ئەگەر خودی پیسیەکە لا بدات، جا یەك جار ئاوی بە سەردا دەکات، لە بەر ئـەوەی کە کابرای دەشتەکی لە ناو مزگەوت دا میزی کرد، پەیامبەری خـوا ﷺ فـەرمانی کرد، ئاو بکرێت بە سەر میزەکەی دا[٣].

٢. ئەگەریش پیسیەکە لە زەوی دا نەبو: وەك ئەوەی لە جل وبەرگ یا لـە قاپێـك دا بو، جا ئـەگەر بە هۆی سەگەوە بو دەمی خستبوە ناو قاپەکە، ئەوە دەبێت حـەوت جار بشۆردرێت، یەکەمیان بە خوڵ، لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «طُهُورُ إِنَاءِ أَحَدِكُمْ إِذَا وَلَغَ فِيهِ الْكَلْبُ أَنْ يَغْسِلَهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ، أُولَاهُنَّ بِالتُّرَابِ» «پاك بونـەوەی دەفری کەسێکتان ئەگەر سەگ دەمی تێخست، بەوەیە: حەوت جار بیشـوات ویەکـەم جاریشی بە خۆڵ»[٤]، ئەم حوکمەش گشتیە، دەفر وهی تـریش دەگرێتـەوە وەك: کـەل وپەل وفەرش.

---

(١) «تَحُتُّه»: ئەیکرێنی بە بەردێك یان دارێك، و«تقرصه»: بە توندی ئەیدەیت بە لەپدا بە پەنجە ونینۆکەکان، وئاویش دەکات بە سەریدا تا خۆی وشوێنەوارەکەشی نامێنێت.

(٢) وا دەر دەکەوێت ڕای ڕاستتر ئەوە بێت ئەمە دەست نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە. وەرگێر.

(٣) أخرجه البخاري (٢٢٠)، ومسلم (٢٨٤).

(٤) أخرجه مسلم (٢٧٩).

سەبارەت بە پیسی بەرازیش: ئەوەی سەحیحە وەك سەرجەم پیسـیەکانی تـر وایـە، یەك جار شۆردنی بەسە، خودی پیسیەکە لا بدات، مەرج نیە حەوت جار بشۆردرێت.

ئەگەریش پیسیەکە میز وپاشـەڕۆ وخـوێن وهاوشـێوەکانیان بـو: ئـەوە بـە ئـاو دەشۆردرێت لەگەڵ دانە لەپ وگوشاردنی تا هیچی نامێنێت وئاسەوارەکەی دەڕوات، ویەك جاریش بەسە بۆ شۆردنی.

بۆ میزی منداڵیش کە خواردنی نەخواردبێت، ئاو پێ دا پرژانـدنی بەسـە، لەبـەر فەرمودەکەی پەیامبـەر ﷺ: «يُغْسَلُ مِن بَولِ الجَارِيةِ، وَيُنْضَحُ مِن بَولِ الغُلامِ» «میزی کیژۆڵە دەشۆردرێت، هی کـوڕیش ئـاو پـرژێن دەکرێـت»[1]. وهـەروەها بـە بەڵگەی حەدیسەکەی ئوم قەیسی کچی میحصەنی پێشو رضي الله عنها.

سەبارەت بە پێستەی مردارەوەبوی گۆشـت خـوراو: ئـەوە بـە خۆشـەکردنی پـاك دەبێتەوە، لە بەر فەرمودەی پێشـتر: «هـەر پێسـتەیەك خۆشـە بکرێـت ئـەوە پـاك دەبێتەوە»[2].

خوێنی حەیزیش لە قەد جل بەرگ بە ئاو دەشۆردرێت، وپاشان ئەیدات بـە لـەپ دا، ونوێژی پێوە دەکات.

جا پێویستە لە سەر مسوڵمان بایەخ بە پاك وخاوێنی بدات لە پیسیەکان، لە لاشەی بێت یا شوێنەکەی یا ئەو جلەی نوێژی پێوە دەکات، چونکە پاکی مەرجە بۆ دروستێتی نوێژ.

---

(١) أخرجه أبو داود (٣٧٦) والنسائي (٣٠٣) وابن ماجه (٥٢٦) وصححه الألباني «صحيح النسائي» (٢٩٣).

(٢) رواه النسائي (٤٢٥٢)، والترمذي (١٧٢٨)، وابن ماجه (٣٦٠٩)، وصححه الألباني في «الإرواء» (٧٩/١)، وأخرجه مسلم (٣٦٦) بلفظ: «إذا دبغ الإهاب فقد طهر».

# دەروازەی دەیەم

## لە بارەی سوڕی مانگانە وزەیستانییەوە (الحَیْضُ وَالنِّفَاس)

«الحَیْض» لە زمانەوانی دا: بریتیە لە چۆڕان، ولە شەرعیش دا: خوێنێکی ئاسایی وسروشتیە، لە بن منداڵ دانەوە دەر دەچێت لە کاتێکی دیاری کراو دا، لە حاڵەتی تەندروستی ئافرەتدا، بە بێ هۆکاری منداڵ بون.

«النفاس= زەیستانی»ش: خوێنێکە لە ئافرەت دێتە دەرەوە لە کاتی منداڵ بوندا.

ئەم باسەش چەند پرسێك لە خۆ دەگرێت:

### پرسی یەکەم: سەرەتای کاتی سوڕی مانگانە وکۆتاییەکەی:

سوڕی مانگانە ڕو نادات پێش نۆ ساڵان، چونکە هەرگیز لە بون دا نە سەلمێنراوە ئافرەتێك پێش ئەوە توشی هاتبێت، ولە عائیشەوە ﵂ دەگێڕنەوە، ئەڵێ: «ئەگەر کیژۆڵە گەیشتە نۆ ساڵان ئەوە ئیتر ئافرەتە»[(١)].

هەروەها لە دوای پەنجا ساڵیشەوە لە سەر ڕای دروست زۆر جار سوڕی مانگانە ڕو نادات، هەر لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕنەوە، ئەڵێ: «ئەگەر ئافرەت گەیشتە پەنجا ساڵ لە سنوری سوڕی مانگانە دەردەچێت»[(٢)].

### پرسی دوەم: لای کەم ولای ئەو پەڕی سوڕی مانگانە:

ئەوەی صەحیحە: لای کەمەکەی دیاری نیە، هەروەها لای زۆرەکەشی، بەڵکو لەم پرسەدا گەڕانەوە بۆ عورف وداب ونەریتە.

(١) ذكره الترمذي (٤١٨/٣)، والبيهقي في السنن الكبرى (٣٢٠/١) بدون إسناد.
(٢) «المغني» (٤٠٦/١).

## پرسی سێیەم: زۆر جار ماوەی سوڕی مانگانە چەندە؟

سوڕی مانگانە زۆر جار شەش یا حەوت ڕۆژە، لە بەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ بۆ حەمنەی کچی جەحش ﵂ ئەڵێ: «فَتَحَيَّضِي[1] سِتَّةَ أَيَّامٍ أَوْ سَبْعَةَ أَيَّامٍ -فِي عِلْمِ اللهِ تَعَالَى ذِكْرُهُ[2]-، ثُمَّ اغْتَسِلِي، [...] فَصَلِّي ثَلَاثًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً، أَوْ أَرْبَعًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً وَأَيَّامَهَا، [...] وَكَذَلِكَ فَافْعَلِي كُلَّ شَهْرٍ كَمَا يَحِضْنَ النِّسَاءُ، وَكَمَا يَطْهُرْنَ مِيقَاتَ حَيْضِهِنَّ وَطُهْرِهِنَّ» «شەش یا حەوت ڕۆژ -کە خوا ئەزانێت- حیساب بکە بۆ سوڕی مانگانە، پاشان غوسل بکە، وبۆ ماوەی بیست وچوار یا بیست وسێ ڕۆژ نوێژ بکە، ئیتر ماوەی عادە وپاك بونەوەکەت بژمێرە، وەك عادەتی باقی ئافرەتان کە دەکەونە عادەوە وپاك دەبنەوە»[3].

## پرسی چوارەم: ئەو شتانەی بە سوڕی مانگانە وزەیستانی حەرام دەبن:

بە هۆی سوڕی مانگانە وزەیستانیەوە چەند شتێك حەرام دەبێت:

١- جوت بون لە منداڵدانەوە: لە بەر فەرمایشتی: ﴿فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ﴾ [البقرة:٢٢٢] «لە ئافرەتان دور بکەونەوە لە کاتی سوڕی مانگانەدا ونزیکیان مەکەونەوە بۆ جوتبون تا تەواو پاك دەبنەوە». کە

(١) [يقال: تحيضت المرأة، أي: قعدت أيام حيضها عن الصلاة والصوم، أي: اجعلي نفسك حائضة وافعلي ما تفعل الحائض].

(٢) [أي: في علم الله من أمرك من الست أو السبع، فهذا هذا شيء بينك وبين الله، وقيل: حكم الله تعالى، أي: بما أمرتك فهو حكم الله تعالى].

(٣) أخرجه أبو داود (٢٨٧)، والترمذي (١٢٨) [هذا لفظه] وقال: «حسن صحيح». وحسنه الألباني في «صحيح الترمذي» (١١٠).

داشبەزی پەیامبەری خـوا ﷺ فـەرموی: «اصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ إِلَّا النِّكَاحَ» «هـەمو شتێك بكەن تەنها جوت بون نەبێت»[1].

٢. **طــــەلاق:** لـە بـەر ئایـەتی: ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ [الطلاق:١] «لـە مـاوە (عیددە)ی خۆیاندا طـەلاقیان بدەن». وفەرمودەكەی پەیامبەریش ﷺ بـۆ عومـەر ؓ، كاتێك عەبدوڵای كوڕی ؓ، ژنەكـەی لـە حـەیزدا تەلاقـدا، فـەرموی: «مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا» «فەرمانی پێ بكە با بیگێڕێتەوە» هتد فەرمودەكە[2].

٣. **نوێژ كردن:** لە بەر فەرمودەكـەی پەیامبـەر ﷺ بـۆ فاتیمـەی كچـی ئـەبو حوبەیش ؓ: «إِذَا أَقْبَلَتِ الحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلَاةَ»[3] «ئەگەر سوڕی مانگانـە هـات ئەوە واز لە نوێژ كردن بهێنە».

٤. ڕۆژو گرتن: لە بەر فەرمودەی: «أَلَيْسَ إِذَا حَاضَتْ لَمْ تُصَلِّ وَلَمْ تَصُمْ؟ [...] فَذَلِكِ مِنْ نُقْصَانِ دِينِهَا» «ئەوە نیە كە دەكەوێتەوە عادەوە نە نوێژ دەكـات نـە ڕۆژو دەگرێت؟ وتیان: بەڵێ وایە، فەرموی: جا ئەوە كورتی دینەكەیەتی»[4].

٥. تەواف كردن: لە بەر فەرمودەكەی پەیامبەر ﷺ بۆ عائیشـە ؓ كـە توشـی سوڕی مانگانـە هـات، فـەرموی: «اِفْعَلِي مَا يَفْعَلُ الحَاجُّ غَيْرَ أَلَّا تَطُوفِي بِالبَيْتِ حَتَّى تَطْهُرِي» «ئەوە بكە كە حاجی دەیكـات، تـەنها سـوڕانەوە نـەبێت بـە دەوری كەعبەدا، هەتا پاك دەبیتەوە»[5].

---

(١) أخرجه مسلم (٣٠٢).
(٢) أخرجه البخاري (٥٢٥١)، ومسلم (١٤٧١).
(٣) أخرجه البخاري (٣٢٠)، ومسلم (٣٣٣).
(٤) أخرجه البخاري (٣٠٤) [مختصرًا، ولفظ الأصل وجدته في كتب الفُقَهَاء].
(٥) متفق عليه: البخاري (٣٠٥)، ومسلم (١٢١١) (١١٩).

٦. قورئان خوێندن: ئەمەش وتەی زۆربەی زانایانە لە هاوەڵان وشوێن کەوتوان، وئەوانەی دوای ئەوانیش. بەڵام ئەگەر پێویستی بە خوێندنی هەبو -بۆ نمونە: پێویستی بە پێ داچونەوەی ئەوانە هەیە کە لە بەری کردوە، بۆ ئەوەی لە بیری نەڕواتەوە، یا وانە بە کچان دەڵێتەوە لە خوێندنگاکان یا ویردێکی ڕۆژانەی هەبو- ئەوە دروستە بۆی، ئەگەریش پێویستی نەبو ناخوێنێت، وەك هەندێك لە زانایان فەرمویانە[1].

٧. دەست دان لە قورئان: لە بەر فەرمایشتەکەی پەروەردگار: ﴿لَا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ﴾ [الواقعة:٧٩].

٨. چونە مزگەوت ومانەوە تێیدا: لە بەر فەرمودەی: «لَا أُحِلُّ المَسْجِد لِجُنُبٍ، وَلَا حَائِضٍ» «مزگەوت حەڵاڵ ناکەم بۆ لەش گران وئەوەی لە عادە دا بێت»[2]. ولە بەر ئەوەی کاتێك عائیشە لە ژورەکەی خۆی بو، پەیامبەریش ﷺ لە مزگەوت ئیعتیکافی کردبو، لە تاقەکەوە[3]، سەری لێ نزیك کردەوە تا قژی شانە بکات، لە کاتێکدا لە سوڕی مانگانەشدا بو[4]. هەروەها حەرامە بۆی بە ناو مزگەوتدا تێپەڕ ببێت ئەگەر ترسا پیس ببێت، خۆ ئەگەر لە پیس نەبونی دڵنیا بو ئەوە حەرام نیە.

(١) انظر: «الشرح الممتع» (١/٢٩١-٢٩٢).

(٢) أخرجه أبو داود (٢٣٢)، وصححه ابن خزيمة، وحسنه ابن القطان وابن سيد الناس. انظر: نيل الأوطار (١/٢٨٨) (٣٠٥).

(٣) تاقێك یا پەنجەرەیەکی بچوك هەبو لە نێوان ژورەکەیی ومزگەوت. «وەرگێڕ»

(٤) أخرجه البخاري (٢٩٦). قال الحافظ: «في الحديث دلالة على... أن الحائض لا تدخل المسجد» «الفتح» (١/٤٠١).

## پرسی پێنجەم: سوڕی مانگانە چی واجب دەكات؟

١. **غوسل كردن پێویست دەكات:** لە بەر فەرمودەی: «دَعِي الصَّلاة قَدْرَ الأَيَامِ الَّتِي كُنْتِ تَحِيضِين فِيهَا، ثُمَّ اغْتِسِلِي وَصَلِّي» «واز لە نوێژ بهێنە بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانەی كە تێیدا دەكەوتیتە عادەوە، پاشان خۆت بشۆ ونوێژ بكە»(١).

٢. **پێگەیشتن (بالغ بون):** لە بەر فەرمودەكەی پەیامبەری خوا ﷺ: «لَا يَقْبَلُ اللهُ صَلَاةَ حَائِضٍ إِلَّا بِخِمَارٍ» «خوا ﷻ نوێژی ئافرەتێك وەرناگرێت گەیشتبێتە سوڕی مانگانە مەگەر بە سەرپۆشەوە»(٢)، ئەوەتا پەیامبەر ﷺ خۆ داپۆشینی لە سەر واجب كرد بە كەوتنە سوڕی مانگانەوە، ئەمە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی بە سوڕی مانگانە ئیتر تەكلیف لێ كراوە، ئەمەش بە بالغ بون بە دی دێت.

٣. **عیددەگرتن پێی:** ئافرەتی تەڵاق دراو وهاو شێوەكانی عیددەی بە حەیز تەواو دەبێت ئەگەر دەكەوتە سوڕی مانگانەوە. لە بەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ﴾ [البقرة:٢٢٨] «**تەڵاق دراوەكان سێ عادە چاوەڕێ دەكەن**». ﴿ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ﴾ یانی: سێ سوڕی مانگانە.

٤. **بڕیار دان بە پاكی منداڵ دان** لە كاتی عیددە گرتن بە سوڕی مانگانە.

**تێبینی:** ئەگەر لە سوڕی مانگانە یا زەیستانی دا پێش ئاوا بونی خۆر پاك بویەوە، ئەوە لە سەریەتی نوێژی نیوەڕۆ وعەسری ئەو ڕۆژە بكات، ئەگەریش پاك بویەوە پێش دەرچونی سپێدە (الفجر) ئەوە لە سەریەتی نوێژی ئێوارە وعیشای ئەو

---

(١) أخرجه البخاري (٣٠٦)، ومسلم (٣٣٤).

(٢) أخرجه أبو داود (٦٤١)، والترمذي (٣٧٧) وحسَّنه، وابن ماجه (٦٥٥)، وصححه الألباني «الإرواء» (٢١٥/١) (١٩٦). والمقصود بالحائض: التي بلغت سن التكليف.

شەوە بکات، چونکە لە کاتی عـوزردا کـاتی نوێـژی دوەم کـاتی نوێـژی یەکەمـە، زۆربەی زانایانیش لە سەر ئەمەن[١].

## پرسی شەشەم: لای کەمی ماوەی زەیستانی ولای ئەو پەڕی:

کەمترینی ماوەی زەیستانی دیاری نیـە، چـونکە هـیچ شـتێك نـەهاتوە دیـاری بکات، جا تێیدا گەڕاونەتەوە بۆ بـون وواقیـع، لـە بـون وواقعیشـدا، کـەمی هەیـە وزۆریشی هەیە، بەڵام لای زۆرەکەی چل ڕۆژە، تورمزی ئەڵێ: زانایـان لـە هـاوەڵانی پەیامبەر ﷺ وئەوانەی دواتریش کۆکن لە سەر ئـەوەی زەیسـتانی چـل ڕۆژ واز لـە نوێژ ئەهێنێت، مەگەر پێش ئەوە پاك ببێتەوە، ئەوسا غوسل دەکات ونوێژ دەکـات، وله بەر فەرمودەکەی ئوم سەلەمە رضي الله عنها ئـەڵێ: «ئـافرەتی زەیسـتانی لـە سـەردەمی پەیامبەردا ﷺ چل ڕۆژ دادەنیشت»[٢].

## پرسی حەوتەم: لە بارەی خوێنی نەزیفی (الاِسْتِحَاضَة):

«الاِسْتِحَاضَة»: ئیستیحازە بریتیە لە چۆرِینی خوێن بە دەر لە کاتەکەی خۆی لـە شێوەی نەزیفی، لە دەمارێکەوە پێی ئەوترێت: «عَاذِل». خوێنی نـەزیفیش جیـاوازە لە خوێنی عادە هەم لە ڕوی حوکم، وهەم لە ڕوی شێوازەوە، ئەم دەمارێکە لە منداڵ دانەوە دەتەقێت، ئیتر لە کاتی حەیز دا بێت یا نا، ونابێتە ڕێگریش لـە نوێـژ کـردن وڕۆژو گرتن وجوت بون، ئەگەر لە ڕۆژانی حەیز دا نـەبو، چـونکە حـوکمی ئـافرەتی پاکی هەیە، بەڵام لە ڕۆژانی عادە دا ئەبێتە ڕێگر لە بەردەم نوێژ کـردن وڕۆژو گـرتن

(١) انظر: «الملخص الفقهي» (١/٥٩-٦٠).

(٢) أخرجه أبو داود (٣١٢)، والترمذي (١٣٩)، وابن ماجه (٦٤٨)، وقال الألباني: «موقوف ضعيف». «الإرواء» (١/٢٢٦).

وجوت بون. بە بەڵگەی فەرمودەکەی فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش ﵄ وتی: «ئەی پەیامبەری خوا ﷺ من توشی نەزیفی دێم وپاك نابمەوە، ئایا واز لە نوێژ بهێنم؟ فەرموی: «لَا، إِنَّ ذَلكَ عِرْقٌ وَلیسَ بالحَیْضَةِ، فإِذَا أَقْبَلَتِ الحَیضةِ فَدَعِي الصَّلاة، فإِذَا أَدْبَرتْ فَاغْسِلِي عنكِ الدَّمَ وَصَلِّي» «نەخێر، ئەوە دەمارێکە وخوێنی عادە نیە، جا ئەگەر خوێنی حەیز هات ئەوە واز لە نوێژ کردن بهێنە، کە تەواو بو خوێنەکە لە خۆت پاك کەرەوە ودەست بکە بە نوێژ»[1]. بۆیە واجبە لە سەری دوای کۆتایی هاتنی عادە حیساب بۆ کراوەکە غوسل بکات، بەڵام لە کاتی نەزیفی دا تەنها دامێنی دەشوات ولە دەرەچەی دامێنی دا پەمو (لۆکە)یەك وهاوشێوەکانی دادەنێت کە ڕێگر بێت لە خوێن، بە شتێکیش توندی دەکات بۆ ئەوەی نەکەوێت. حەفازە (سانتی)ـە تەندروستی یەکانی ئەم ڕۆژە بە کار بهێنێت، ئەوە جێی ئەمانەی بۆ دەگرێتەوە، پاشان بۆ هەمو نوێژێك دەست نوێژ دەگرێت.

## پرسی هەشتەم: ئافرەتی نەزیف چۆن سوڕی مانگانەکەی خۆی بناسێتەوە:

**ئافرەتی نەزیف (المستحاضة) سێ حاڵەتی بۆ هەیە:**

**حاڵەتی یەکەم:** ئەوەیە عادەتێکی دیار وزانراوی هەبێت، یانی: ماوەی سوڕی مانگانەکەی لە لای زانراو بێت پێش ئەوەی بکەوێتە ئیستیحازەوە، لەم حاڵەتەدا بە ئەندازەی ماوەی عادەکەی دادەنیشێت واز لە نوێژ وڕۆژو دەهێنێت وبەوە هەژمار دەکرێت کە لە سوڕی مانگانە دایە. کە ماوەکەی تەواو بو غوسل دەکات ودەست دەکات بە نوێژ کردن، وئەو خوێنەشی لێی دەر دەچێت بە خوێنی نەزیفی هەژمار دەکات، لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ بۆ ئوم حەبیبە ﵄: «أُمْكُثِي قَدْرَ ما

---
(١) أخرجه البخاري (٣٠٦)، ومسلم (٣٣٤).

كَانَتْ تَحْبِسُكِ حَيْضَتُكِ، ثم اغْتَسِلِي، وَصَلِّي» «چاوەڕێ بکە بە ئەندازەی ماوەی سوڕی مانگانەکەت، پاشان غوسل بکە، ودەست بکە بە نوێژ کردن»[1].

**حاڵەتی دوەم:** ئەگەر عادەتێکی زانراو ودیاری نەبو، بەڵام خوێنەکەی جیا دەکاتەوە، هەندێکی لە شێوەی خوێنی عادە دایە، بۆ نمونە: ڕەشە یان خەستە یا بۆنی هەیە، ئەوەکەی تریش لە شێوەی خوێنی ئیستیحازەیە؛ خوێنێکی سور وبێ بۆنە، ئەوە لەم حاڵەتە دا ئیش بە جیاکردنەوەی خوێنەکان دەکرێت، لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ بۆ فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش ﵄: «إِذَا كَانَ دَمُ الْحَيْضِ فَإِنَّهُ دَمٌ أَسْوَدُ يُعْرَفُ[2]، فَأَمْسِكِي عَنِ الصَّلَاةِ، فَإِذَا كَانَ الْآخَرُ فَتَوَضَّئِي [وَصَلِّي] فَإِنَّمَا هُوَ عِرْقٌ» «ئەگەر خوێنی حەیز بێت، ئەوە ڕەشە ودەناسرێتەوە، جا واز لە نوێژ کردن بهێنە، ئەگەر خوێنەکەی تریش بو ئەوا دەست نوێژ بشۆ ونوێژ بکە، چونکە ئەوە دەمارێکە تەقیوە»[3].

**حاڵەتی سێیەم:** نە عادەت ونە شێوەیەکی جیاوازی نەبو حەیزی پێ جیا بکرێتەوە، ئەوە لەم حاڵەتەدا لای ئەو پەڕی حەیز هەژمار دەکات، ودادەنیشێت کە شەش یا حەوت ڕۆژە، چونکە ئەمە عادەتی زۆر جارەی ئافرەتانە، ئیتر دوای ئەم چەند ڕۆژە هەر خوێنێك هات، ئەوە خوێنی نەزیفیە، دەیشوات ودەست دەکات بە نوێژ کردن وڕۆژو گرتن، لە بەر فەرمودەکەی [پێشتری] پەیامبەر ﷺ بۆ حەمنەی کچی جەحش: «إِنَّمَا هِيَ رَكْضَةٌ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَتَحَيَّضِي سِتَّةَ أَيَّامٍ أَوْ سَبْعَةَ أَيَّامٍ فِي

---

(١) أخرجه مسلم (٣٣٤) (٦٥).

(٢) [فيه احتمالان: الأول: أنه على صيغة المجهول من المعرفة، أي: تعرفه النساء باعتبار لونه وثخانته كما تعرفه باعتبار عادته. والثاني: على صيغة المعروف من الأعراف، أي: له عرف ورائحة].

(٣) أخرجه أبو داود (٢٨٦) وصححه ابن حبان «الإحسان» (٤٥٨/٢)، والحاكم (١٧٤/١)، وصححه الألباني «الإرواء» (٢٠٤).

عِلْمِ اللهِ، ثُمَّ اغْتَسِلِي، فَإِذَا رَأَيْتِ أَنَّكِ قَدْ طَهُرْتِ وَاسْتَنْقَأْتِ فَصَلِّي [...] وَصُومِي [...]، فَإِنَّ ذَلِكِ يُجْزِئُكِ» «ئەوە لێ دانێکی شەیتانە، (چونکە شـەیتان پـاڵی نـاوە وئەو خوێنەی جولاندوە)، جا شەش یا حەوت ڕۆژ دابنیشە وەك لە سوڕی مانگانــەدا بیت، پاشان خۆت بشۆ، ئەگەر تەواو پاك بویتەوە نوێژ بکە وڕۆژو بگرە، ئەوە بەستە ولە سەرت دەکەوێت»[1].

(١) أخرجه أبو داود (٢٨٧) والترمذي (١٢٨) وقال: حسن صحيح، وحسَّنه الألباني «الإرواء» (٢٠٥).

# دووەم: بەشی نوێژ

له پانزه دەروازه پێك هاتوه:

دەروازەی یەکـــەم: پێناسەکەی، فەزڵی، واجبێتی پێنج فەرزەکە.

دەروازەی دوەم: بانگ وقامەت.

دەروازەی ســێیەم: له بارەی کاتەکانی نوێژەوە.

دەروازەی چـــوارەم: مەرجەکانی نوێژ وپایەکانی وبەڵگەکانی ونوێژ نەکەر.

دەروازەی پێنجەم: له بارەی نوێژی سوننەتەوە.

دەروازەی شەشەم: له بارەی سوجدەی سەهو، وقورئان خوێندن، وشوکر

دەروازەی حەوتەم: له بارەی نوێژی جەماعەتەوە.

دەروازەی هەشتەم: له بارەی بەر نوێژی کردن.

دەروازەی نۆیـــەم: له بارەی نوێژی خاوەن عوزرەکان.

دەروازەی دەیـــەم: له بارەی نوێژی جومعەوە.

دەروازەی یانزەیەم: له بارەی نوێژی ترسەوە.

دەروازەی دوانزەیەم: له بارەی نوێژی دو جەژنەکەوە.

دەروازەی سیانزەیەم: له بارەی نوێژە بارانەوە.

دەروازەی چواردەیەم: له بارەی نوێژی خۆر گیران ومانگ گیرانەوە.

دەروازەی پانزەهەم: له بارەی نوێژی جەنازە وحوکمەکانی جەنازەوە.

# دەروازەی یەکەم

## دەربارەی پێناسەی نوێژ وفەزڵەکەی، واجبێتی پێنج فەرزەکە

### (١) پێناسەکەی:

«الصلاة» لە زوباندا: دوعا وپارانەوەیە.

لە شەرعیش دا: پەرستشێکە کۆمەڵێك وتە وکردەوەی تایبەتی لە خۆ گرتوە، بە «الله أكبر» دەست پێ دەکات، وبە سەلام دانەوە کۆتایی پێ دێت.

وردەکاریەکەشی لە دەروازەکانی تردا دێت -إن شاء الله تعالى-.

### (٢) فەزڵەکەی:

نوێژ لە جەخت کراو ترین پایەکانی ئیسلامە دوای شایەتومان، بەڵکو کۆڵەکەی ئیسلامە، لە شەوی میعراج دا لە سەروی حەوت ئاسمانەکانەوە خوا ﷻ لە سەر پەیامبەرەکەی ﷺ فەرزی کردوە، ئەمەش بەڵگەیە لە سەر گرنگیەکەی لە ژیانی موسڵمان دا، پەیامبەریش ﷺ ئەگەر توشی نارەحەتیەك ببوایە هانای بۆ نوێژ دەبرد[١]، چەندین حەدیسیش هاتوە لە بارەی فەزڵی نوێژ وهاندان لە سەری، لەوانە: فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، مُكَفِّرَاتٌ مَا بَيْنَهُنَّ إِذَا اجْتَنَبَ الْكَبَائِرَ» «پێنج فەرزەکە، وهەینی بۆ هەینی ورەمەزان بۆ رەمەزان، سڕینەرەوەی تاوانەکانی ئەو بەینەن ئەگەر لە تاوانە گەورەکان دور بکەوێتەوە»[٢]. هەروەها پەیامبەر ﷺ

---

(١) [انظر: «سنن أبي داود» (١٣١٩)، و«مسند أحمد» (٢٣٧٧٣)]

(٢) أخرجه مسلم (٢٣٣) (١٦).

ئەفەرمێ: «أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهَرًا بِبَابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ مِنْهُ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ هَلْ يَبْقَى مِنْ دَرَنِهِ شَيْءٌ؟» «ئەگەر ڕوبارێك بە بەر دەرگاتانـدا بـڕوات، وهـەمو ڕۆژێك پێنج جار خۆی لێ بشوات، ئایا هـیچ چـڵكی پێـوە دەمێنێـت؟» وتیـان: نەخێر، هیچ چڵكی پێوە نامێنێـت. فـەرموی: «فَذَلِكَ مَثَلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ يَمْحُو اللهُ بِهِنَّ الْخَطَايَا»[1]، «دەی ئەمـە وەكـو پێـنج فەرزەكـە وایـە، خـوا ﷻ تاوانەكانی پێ دەسڕێتەوە».

### ٣. واجب بونی:

فەرز بونی پێنج نوێژەكە زانراوە بە قورئان، وسـوننەت، وكـۆ دەنگیـەكی بەڵگـە نەویست (الضَّرُورِيّ)، خوا ﷻ ئەفەرمێ: ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾ [البقرة:٤٣] «نوێژەكانتان بە جێ بگەیەنن»، لـە چـەندەها ئایەتـدا وا دەفـەرمێ، هـەروەها دەفـەرمێ: ﴿قُلْ لِعِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا يُقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾ [إبراهيم:٣١] «بە بەندەكانم -كە ئیمانیان هێنـاوە- بلێ: با نوێژ ئەنجام بدەن». لە فەرمودەش دا: فەرمودەكەی میعراجە، تێیـدا هـاتوە: «هِيَ خَمْسٌ، وَهِيَ خَمْسُونَ»[2]، «خـۆی پێنجـە بـەڵام پەنجایـە لـە پاداشـت دا». هـەروەها لــە صــەحیحەین دا هــاتوە: پەیامبــەر ﷺ -بـەو كەسـەی پرسـیاری شــەریعەتەكانی ئیســلامی لــێ كــرد- فەرمویــەتی: «خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي اليَوْمِ وَاللَّيْلَةِ»، «پێنج نوێژ لە شەو وڕۆژێك دا فەرزە لە سەرت»، پرسـیار كەرەكـە وتـی:

---

(١) أخرجه البخاري (٥٢٨)، ومسلم (٦٦٧).

(٢) أخرجه البخاري (٣٤٩). والمعنى: «هي خمس في العدد باعتبار الفعل، وهي خمسون في الأجر والثواب».

ئایا جگە لەوەم لە سەرە؟ فەرموی: «لا، إِلَّا أَنْ تَطَّوَّعَ»[١]، «نەخێر مەگەر خۆت سوننەت بکەی».

نوێژیش واجبە لە سەر موسڵمانی پێگەیشتوی ژیر، کەواتە فەرز نیە لە سەر کافر، ومنداڵ، وشێت، لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ»[٢]، «قەڵەم هەڵ گیراوە لە سەر سیان: خەوتو تا هەڵدەسێت، ومنداڵیش تا پێ دەگات، وشێت تا عاقڵ دەبێت».

بەڵام منداڵان گەیشتنە حەوت ساڵان فەرمانیان پێ دەکرێت بە کردنی، ولە دە ساڵان دا لێ یان دەدرێت لە سەر نەکردنی.

جا هەرکەسیش نکوڵی لێ بکات یا نەیکات ئەوە کوفری کردوە، ولە دینی ئیسلام هەڵ گەڕاوەتەوە، لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «العَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمُ الصَّلَاة، فَمَنْ تَرَكَها فقد كفر»[٣]، «ئەو پەیمانەی لە نێوان ئێمە وئەواندا هەیە: نوێژە، جا هەر کەس نەیکات، ئەوە کوفری کردوە».

(١) أخرجه البخاري (٤٦)، ومسلم (١١).
(٢) أخرجه أبو داود (٤٤٠١)، والنسائي (٦/١٥٦)، وصححه الألباني (الإرواء ٢٩٧).
(٣) أخرجه مسلم (١٣٤).

# دەروازەی دووەم

# بانگ وقامەت (الأذان والإقامة)

**چەند پرسێك لە خۆ دەگرێت.**

## پرسی یەکەم: پێناسەی بانگ وقامەت وحوکمەکانیان:

**١. پێناسەی (الأذان والإقامة):**

لە زماندا بریتیە لە ڕاگەیاندن، خوا ﷻ دەفەرمێ: ﴿وَأَذَانٌ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ [التوبة: ٣]، «وڕاگەیاندنێك لە لایەن خوا وپەیامبەرەکەیەوە»، لە شەرعیشدا: بریتیە لە ڕاگەیاندنی هاتنی کاتی نوێژ بە وێردێکی تایبەت.

(الإقامة)یش: لە زماندا: چاوگی (أَقَامَ)یە، حەقیقەتەکەی: هەستانی دانیشتوە. لە شەرعیشدا: بریتیە لە ڕاگەیاندنی هەستان بۆ نوێژ بە ویردێکی تایبەت کە لە شەرعدا هاتوە.

٢. **حوکمیان:** بانگ وقامەت بۆ پێنج فەرزەکە شەرعین دەرهەق بە پیاوان بە تەنها، وفەرزی کیفایەن، ئەگەر کەسانێك پێی هەستان تاوان لە سەر باقیەکەی ئەکەوێت، چونکە لە دروشمە دیارەکانی ئیسلامن، بۆیە دروست نیە پەك بخرێن.

## پرسی دوەم: مەرجەکانی دروست بوونی بانگ وقامەت:

١. ئیسلام: جا دروست نیە لە لایەن کافرەوە.

٢. ژیری: جا دروست نیە لە لایەن شێت وسەر خۆش وجیانەکەرەوە وەك سەرجەم عیبادەتەکانی تر.

٣. نێریەتی: جا دروست نیە لە لایەن ئافرەتەوە لە بەر مەترسی توش فیتنە هاتن، هەروەها نێرە موکیش چونکە نازانرێ نێرە یا نا، وتەنها قامەت سوننەتە بۆ ئافرەتان.

٤. ئەبێت بانگ لە کاتی نوێژدا بێت: جا دروست نیە پێش هاتنی کاتەکەی، جگە لە بانگی یەکەمی بەیانیان وهەینی نەبێت دروستە پێش کاتەکەی بدرێت، وئەبێت قامەتیش لە کاتێکدا بێت کە ئەیانەوێت هەستن بۆ نوێژ.

٥. ئەبێت بانگ بە ڕیز بێت وزۆری نێوان نەبێت: وەك لە سوننەتدا هاتوە، قامەتیش بە هەمان شێوە، لەوەو دواش لە باسی شێوازی بانگ وقامەت زیاتر ڕون دەکرێتەوە.

٦. ئەبێت بانگ، هەروەها قامەتیش بە زمانی عەرەبی بێت، وبەو لەفزانەش بێت کە لە سوننەتدا هاتوە.

## پرسی سێیەم: لە بارەی ئەو سیفەتانەی سوننەتە لە بانگ بێژدا هەبێ:

١. دادگەر ودەست پاك بێت، چونکە جێی متمانەیە وخەڵك لە نوێژ وڕۆژویاندا بۆ ئەو دەگەڕێنەوە، جا ناکرێ بە بانگەکەی فریویان بدات وکاتی نوێژیش نەبێت.

٢. باڵغ وعاقڵ بێت، بانگی مناڵی جیاکەرەوەش دروستە.

٣. شارەزا بێت بە کاتەکانی نوێژ، بۆ ئەوەی هەوڵ بدات لە سەرەتای کاتەکە بانگ بدات، چونکە ئەگەر شارەزا نەبێت لەوانەیە هەڵە یا غەڵەت بکات[1].

---

(١) [الفرق بين الخَطَإ والغَلَط: أن الغَلَط هو وضع الشَّيء في غير مَوضعه، ويجوز أن يكون صوابًا في نفسه، والخطأ لا يكون صوابًا على وجه. وقيل: الغلط: أن يسهى عن ترتيب الشَّيء وإحكامه، والخطأ: أن يسهى عن فعله أو أن يوقعه من غير قصد له ولكن لغيره].

٤. دەنگی گڕ وبە هێز بێت تا دەنگی بگاتە خەڵك.

٥. پاك بێت لە حەدەسی گەورە وبچوك.

٦. بە پێوە ڕو بەرەو قیبلە بانگ بدات.

٧. دو پەنجەکەی بخاتە هەر دو گوێی، ئەگەریش وتی: «حَيَّ عَلَى الصَّلَاة» بە لای ڕاستدا ڕو وەر بگێڕێت، ئەگەریش وتی: «حَيَّ عَلَى الفَلَاح» بە لای چەپدا ڕو وەر بگێڕێت.

٨. لە سەر خۆ بێت لە بانگەکەیدا، بەڵام لە قامەتەکەی پەلە بکات.

**پرسی چوارەم: لە بارەی شێوازی بانگ وقامەتەوە:**

چۆنیەتی بانگ وقامەت: چەند شێوازێکیان هەیە لە فەرمودەکاندا هاتوە، لەوانە: فەرمودەکەی ئەبو مەحزورە ﷺ کە پەیامبەر خۆی ﷺ فێری بانگی کردوە، وفەرمویەتی: «دەڵێی:

الله أكبر الله أكبر، الله أكبر الله أكبر «خوا هەرە گەورەترینە».

أشهد أنْ لا إلـه إلا الله، أشهد أنْ لا إلـه إلا الله «شایەتی ئەدەم هیچ پەرستراوێکی هەق نیە جگە لە الله».

أشهد أنَّ محمدًا رسول الله، أشهد أنَّ محمدًا رسول الله «شایەتی ئەدەم موحەممەد پەیامبەری خوایە».

حيَّ على الصلاة، حيَّ على الصلاة «وەرن هەڵسن بۆ نوێژ».

حيَّ على الفلاح، حي على الفلاح «وەرن هەڵسن بۆ سەر فرازی».

اللهُ أكبر، الله أكبر.

لا إله إلا الله»[1].

شێوازی قامەت کردنیش بەم شێوازەیە:

«الله أكبر، الله أكبر.

أشهد أنْ لا إله إلا الله.

أشهد أنَّ محمدًا رسول الله.

حيَّ على الصلاة.

حي على الفلاح.

قد قامت الصلاة، قد قامت الصلاة «کاتی دابەستنی نوێژ نزیکە».

اللهُ أكبر، الله أكبر.

لا إله إلا الله»

ئەمەش لە بەر فەرمودەکەی ئەنەس ﷺ ئەڵێ: «أُمِرَ بِلَالٌ ﷺ: أَنْ يَشْفَعَ الْأَذَانَ، وَأَنْ يُوتِرَ الْإِقَامَةَ إِلَّا الْإِقَامَةَ» «فەرمان کرا بە بیلال بانگ جوت بکات، وقامەت تاك بکاتەوە، تەنها «قد قامت الصلاة» نەبێت»[2].

کەواتە ڕستەکانی بانگ دو جار دو جار ئەیلێتەوە، وڕستەکانی قامەت یەك جار یەك جار ئەیلێتەوە تەنها «قد قامت الصلاة» نەبێت، لە بەر حەدیسی پێشو.

(١) أخرجه أبو داود (٥٠٣)، وابن ماجه (٧٠٨)، وصححه الألباني «صحيح سنن ابن ماجه» (٥٨١).
(٢) أخرجه البخاري (٦٠٥)، ومسلم (٣٧٨) واللفظ للبخاري.

ئەمە شێوازە سوننەتەکەیە لە بانگ وقامەتدا، چونکە بـیلال ﷺ ئاوهـا بـانگی دەفەرمو لە سەفەر ولە نیشتەجێدا لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ تا وەفاتی کرد. خۆ ئەگەر لە بانگەکەشدا تەرجیعی[١] کرد، یا قامەتەکەی جوت کـردەوە، هیچـی تێـدا نیـە، چونکە لەو جیاوازیەیە کە حەڵاڵە. هەروەها سوننەتە لە بانگی بەیانیـدا دوای «حي على الفلاح» بڵێ: «الصلاة خير من النوم، الصلاة خير من النوم»[٢]، «نوێـژ لـە خەوتن باشترە، نوێژ لە خەوتن باشترە»، لە بەر فەرمودەکـەی ئـەبو مـەحزورە ﷺ، کە پەیامبەر ﷺ پێی فـەرمو: «إن كان في أذان الصبح، قلت: الصلاة خير من النوم»[٣]، «ئەگەر بانگی بەیانی بو، ئەڵێی: الصلاة خير من النوم».

## پرسی پێنجەم: بیسەری بانگ چی ئەڵێت، وبە چی دەپاڕێتەوە دوای بانگ؟

سوننەتە بۆ کەسێك گوێی لە بانگ بو ئەوە بڵێتەوە کە بانگ بێژ ئەیڵێت، لە بەر فەرمودەکەی ئەبو سـەعید ﷺ، پەیامبـەر ﷺ فەرمویـەتی: «إِذَا سَمِعْتُمُ النِّدَاءَ، فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ» «ئەگەر گویتان لە بانگ بێـژ بـو، ئـەوە بڵێنـەوە کـە بانگ بێژ ئەیڵێت»[٤]، تەنها لە هـەر دو «حەییـە عـەلا»کـە نـەبێت، لـەو کاتـەدا شەرعیە بڵێت: «لا حول ولا قوة إلا بالله» «گـۆڕان وهێـز نیـە مەگـەر بـە خـوا»

---

(١) الترجيع: الترديد، بمعنى أنه يخفض صوته في الشهادتين، ثم يعيدهما برفع الصوت، كما أخرجه أبو داود (٥٠٣).

(٢) وهو التثويب، من ثاب يثوبُ: إذا رجع، فالمؤذن حين يقول هذه الجملة في صلاة الصبح، فهو رجوع منه إلى كلام فيه الحث على المبادرة إلى الصلاة.

(٣) أخرجه النسائي (٧،٨/٢)، وصححه الألباني «صحيح سنن النسائي» (٦٢٨).

(٤) أخرجه البخاري (٦٢١)، ومسلم (١٠٩٣).

ئەمەش دوای وتەی بانگ بێژ کە ئەڵێ: «حَيَّ على الصلاة»، هەروەها دوای: «حَيَّ على الفلاح» لە بەر فەرمودەکەی عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه لەم بارەوە[1].

خۆ ئەگەر بانگ بێژ لە نوێژی بەیانیدا وتی: «الصلاة خيرٌ من النوم»، بیسەر وەك خۆی ئەیڵێتەوە، بەڵام لە کاتی قامەت ئەمە سوننەت نیە.

پاشان صەڵاوات ئەدات لە سەر پەیامبەری خوا ﷺ، ئینجا ئەڵێ: «اللهم رَبَّ هذه الدعوة التامَّةِ والصلاة القائمةِ، آتِ محمداً الوسيلةَ والفضيلةَ، وابعثْهُ مقامًا محمودًا الذي وعدته»، «خوایە گیان! پەروەردگاری خاوەن ئەم بانگەوازە تەواو وبێ کورتی، وئەم نوێژە دابەستراوە، وەسیلەت وفەزیلەت ببەخشە بە موحەممەد، لە ڕۆژی دوایشدا ئەو پلە ستایش کراوەی پێ ببەخشە کە بەڵێنت پێ داوە».

(١) أخرجه مسلم (٣٨٥).

# دەروازەی سێیەم

# لە بارەی کاتەکانی نوێژەوە

نوێژە فەرزەکان لە شەو ڕۆژێکدا پێنجن، هەر نوێژێکیان کاتێکی دیاری کراوی هەیە؛ شەرع دیاری کردوە. خوا ﷻ فەرمویێ: ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَوْقُوتًا﴾ [النساء:١٠٣]. یانی: بە ڕاستی نوێژ لە سەر بڕوا داران فەرزە لە کاتێکی دیاری کراو دا، بۆیە نوێژ کردن پێش هاتنی کاتەکەی لە سەریان ناکەوێت.

بەڵگەی ئەم کاتانەش فەرمودەکەی ئیبن عومەرە رضي الله عنهما کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «وَقْتُ الظُّهْرِ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ، وَكَانَ ظِلُّ الرَّجُلِ كَطُولِهِ مَا لَمْ يَحْضُرِ الْعَصْرُ. وقْتُ الْعَصْرِ مَا لَمْ تَصْفَرَّ الشَّمْسُ، وقْتُ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ مَا لَمْ يَغِبِ الشَّفَقُ، وقْتُ صَلَاةِ الْعِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ الْأَوْسَطِ. وقْتُ صَلَاةِ الصُّبْحِ مِنْ طُلُوعِ الْفَجْرِ مَا لَمْ تَطْلُعِ الشَّمْسُ، فَإِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ فَأَمْسِكْ عَنِ الصَّلَاةِ فَإِنَّهَا تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ» «کاتی نوێژی نیوەڕۆ: ئەو کاتەیە خۆر لە ناو جەرگەی ئاسمان لا بدات وسێبەری مرۆڤ وەك بالاّی لیّ بیّت تا کاتی نوێژی عەسر، وکاتی نوێژی عەسریش بەردەوامە تا خۆر زەرد نەبێتەوە، وکاتی نوێژی ئێوارەش بەردەوامە تا شەفەق وسورایی ئاوا بونی خۆر مابێت، وکاتی نوێژی عیشاش تا نیوەی ناوەڕاستی شەو بەردەوامە[1]، وکاتی نوێژی بەیانیش لە دەرچونی سپێدەوە دەست پێدەکات تا هەلاّتنی خۆر»[2].

---

(١) [«نصف الليل الأوسط» صفة مؤكدة للنصف، أي: نصفه تمامًا].

(٢) أخرجه مسلم (٦١٢).

کەواتە: **کاتی نوێژی نیوەڕۆ** دەست پێ دەکات بە لا دانی خـۆر لـە نـاو جەرگـەی ئاسمانەوە بەرەو خۆر ئاوا بون، درێژ ئەبێتەوە تا سێبەری هەر شتێك ئەوەندەی خۆی لێ دێت لە درێژی دا، وسوننەتە پەلەی لێ بکرێت ولـە سـەرەتای کاتەکەیـدا بکرێـت، مەگەر لە گەرمای زۆردا، ئەو کاتە سوننەتە دوا بخرێت بۆ فێنـك بونـەوە[1]، لەبـەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «إِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا بِالصَّلَاةِ، فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ» ((ئەگەر زۆر گەرم بو ئەوا نوێژەکانتان دوا بخەن بۆ فێنکی، چونکە توندی گەرما لـە هەناسەی دۆزەخەوەیە))[2].

**کاتی نوێژی عەسریش** دەست پێ دەکات بە کۆتایی هاتنی کاتی نیوەڕۆ -یـانی: سێبەری هەر شتێك ئەوەندەی خۆی لێ بێت- تا زەرد بونەوەی خۆر، ئەمـەش کـاتی سەر پشکیە، بەڵام کاتی زەرورەت بە ئاوا بونی خۆر کۆتایی دێت، یانی: تا کۆتـایی زەرد بونەوە، بەڵام سوننەتە لە سەرەتای کاتەکەیەوە بکرێت ئەوەش بریتیە لە نوێژی ناوەڕاست کە خوا بە دەق باسی ئەکات لە فەرمایشـتی: ﴿حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ﴾ [البقرة:٢٣٨]، ((پارێزگـاری بکـەن لـە سـەرجەم نوێژەکانتان لەگەڵ نوێژی ناوەڕاست دا -کە نوێژی عەسرە- ولـە نوێژەکانتانـدا گـوێ ڕایەڵ وملکەچ وزەلیل بن)). هەروەها پەیامبەر ﷺ فەرمانی کردوە بە پارێزگـاری لـێ کردنـی، وئەفـەرموێ: «مَنْ فَاتَتْهُ صَلَاةُ الْعَصْرِ، فَكَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ، وَمَالَهُ»[3]، ((هەر کەسێك نوێژی عەسر زایە بکات وەك ئەوەیە خێزان ومالەکـەی لـە دەسـت دا

(١) یانی: نزیك نوێژی عەسر.

(٢) أخرجه مسلم (٦١٥)، والبخاري (٥٣٣-٥٣٤).

(٣) متفق عليه: البخاري (٥٥٢)، ومسلم (٦٢٦، ٢٠١) واللفظ له.

بێت)). هەروەها ﷺ دەفەرموێ: «مَنْ تَرَكَ صَلَاةَ الْعَصْرِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ»[١]، ((هەر کەس واز لە نوێژی عەسر بهێنێت ئەوە کردەوەکانی پوچەڵ بوەتەوە)).

**کاتی نوێژی ئێوارەش** لە ئاوا بونی خۆرەوە دەست پێ دەکات تا نەمانی شەفەقی سور[٢] لە بەر فەرمودەی: «وَقْتُ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ مَا لَمْ يَغِبِ الشَّفَقُ»[٣]، ((کاتی نوێژی ئێوارە بەردەوامە تا نەمانی شەفەق))، وسوننەتە لە سەرەتای کاتەکەیەوە ئەنجام بدرێت، لە بەر فەرمودەی: «لَا تَزَالُ أُمَّتِي بِخَيْرٍ مَا لَمْ يُؤَخِّرُوا الْمَغْرِبَ حَتَّى تَشْتَبِكَ النُّجُومُ»[٤]، ((ئومەتەکەم بەردەوام لە خێر دان تا نوێژی ئێوارە دوا نەخەن بۆ کاتی دەرکەوتنی هەمو ئەستێرەکان [مەبەستی تاریکیە])). جگە لە شەوی موزدەلیفە نەبێت بۆ کەسێ ئیحرامی بە حەج کرد بێت، ئەوە سوننەتە دوای بخات ولەگەڵ عیشا دا بە ((کۆ کردنەوەی دوا خستن= جەمعی تەئخیر)) بیکات.

**کاتی نوێژی عیشاش** دەست پێ ئەکات لە نەمانی شەفەقی سورەوە تا نیوە شەو، لە بەر فەرمودەی: «وَقْتُ صَلَاةِ الْعِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ الْأَوْسَطِ» ((کاتی نوێژی عیشاش تا نیوەی شەو بەردەوامە))[٥]. سوننەتیشە دوا بخرێت بۆ کۆتا کاتی سەرپشکی ئەگەر نارەحەت نەبێت، وکەراهەتی هەیە لە پێشی بخەوێت ولە پاشی قسە بکات بێ هیچ بەرژەوەندیەك، لە بەر فەرمودەکەی ئەبو بەرزە ﵁ ئەڵێ: «أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَ الْعِشَاءِ، وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا» ((پەیامبەر ﷺ حەزی نەدەکرد

(١) أخرجه البخاري (٥٥٣).

(٢) شەفەق: ئەو سوراییەیە کە لە خۆر ئاوا بونەوە دەست پێدەکات تا کاتی عیشا، ئەم سوراییەش لە دوای ئاوابونی خۆرەوە دەبینرێت.

(٣) أخرجه مسلم (١٧٣) (٤٢٧/١)، وهو جزء من حديث المواقيت الطويل.

(٤) أخرجه أحمد (١٧٤/٤)، وأبو داود (٤١٨)، والحاكم (١٩٠/١-١٩١)، وصححه على شرط مسلم، وافقه الذهبي.

(٥) أخرجه مسلم (١٧٣) وهو جزء من حديث المواقيت الطويل (٤٢٧/١).

لە خەوتنی پێش عیشا وقسە کردنی پاشی»[1].

سەبارەت بە **کاتی نوێژی بەیانی** لە دەرچونی سپێدەی دوەمەوە دەست پێ دەکات تا هەڵاتنی خۆر. سوننەتیشە لە سەرەتاوە بکرێ ئەگەر دڵنیایی هەبو لە دەرچونی سپێدە.

ئەمە ئەو کاتانەیە کە ئەنجام دانی نوێژەکانی تێدا دانراوە، جا پێویستە لە سەر موسڵمانان پێوەی پابەند بن وپارێزگاری لێ بکەن ودوای نەخەن، چونکە خوا ﷻ هەڕەشەی کردوە لەوانەی لە کاتی خۆی دا دوای دەخەن: ﴿فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ * الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾ [الماعون:٤-٥] «سزایەکی توند بۆ نوێژ خوێنەکان * ئەوانەی لە نوێژەکانیان بێ ئاگان، وبە جوانی ولە کاتی خۆی دا ئەنجامی نادەن». هەروەها ئەفەرموێ: ﴿فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا﴾ [مريم:٥٩] «دوای ئەو نیعمەت پێ بەخشراوانە پاشین گەلێکی خراپ هاتن نوێژەکانیان زایە کرد -هەر نەیان دەکرد یا کاتەکانی یا پایەکانیان بە جێ نەدەهێنا-، وشوێنی شەهوەت وئارەزوەکانیان کەوتن، بۆیە «غەی» دەبیننەوە». غەییش بریتیە لە سزای توند وچەند قات، وخراپە، وسەر شۆڕی وشەرمەزاری لە دۆزەخ دا، پەنا بە خوا.

بە جێ گەیاندنی نوێژەکانیش لە کاتی خۆی دا لە خۆشەوست ترین وباش ترین کارەکانە لای خوا، ئەوەتا پرسیار ئەکرێت لە پەیامبەری خوا ﷺ: «چی کارێک خۆشەوسترینە لە لای خوا؟ فەرموی: «الصَّلَاةُ عَلَى وَقْتِهَا» «نوێژکردن لە کاتی خۆیدا»[2].

(١) أخرجه البخاري (٥٦٨)، ومسلم (٦٤٧).
(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٥٢٧)، ومسلم (٨٥، ١٣٩).

# دەروازەی چوارەم

# لە بارەی مەرجەکانی نوێژ، وپایەکانی، وبەڵگەکانیان، ولەگەڵ حوکمی نوێژ نەکەر دا

چەند پرسێك لە خۆ دەگرێت:

## پرسی یەکەم: لە بارەی ژمارەی نوێژە فەرزەکانەوە:

ژمارەی نوێژە فەرزەکان پێنجن، ئەوانیش: بەیانی، ونیوەڕۆ، وعەسر، وئێوارە، وعیشا، ئەمانەش بە ئیجماع، وفەرمودەکەی تەڵحەی کوڕی عوبەیدولاّش ﵁ بەڵگەیە لە سەری، کە دەشتەکیەك وتی: ئەی پەیامبەری خوا! خوا چەند نوێژی لە سەرم فەرز کردوە؟ فەرمووی: «خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ... »، «پێنج نوێژ لە شەو ورۆژێکدا...»[1]، هەروەها فەرمودەکەی ئەنەس ﵁ کە باسی چیرۆکی کابرای دەشتەکی دەکات بە پەیامبەر ﷺ وتویەتی: «نێردراوەکەت ئەڵێ: لە شەو ڕۆژێکدا پێنج نوێژمان لە سەرە»، فەرمووی: «صَدَقَ...» «ڕاست دەکات»[2].

## پرسی دوەم: لە سەر کێ واجبە؟

واجبە لە سەر هەمو موسڵمانێکی پێگەیشتوی ژیر کە لە سوڕی مانگانە وزەیستانی دا نەبێت، ومنداڵیش فەرمان دەکرێت بە کردنی ئەگەر گەیشتە حەوت ساڵ، ولە دە ساڵی دا لە سەر نەکردنی لێی دەدرێت، لەبەر فەرمودەی [پێشوتر]:

---

(١) أخرجه مسلم (١١).

(٢) أخرجه مسلم (١٢).

((قەڵەم هەڵ گیراوە لە سەر سیان)) لەوانە: ((ولە سەر منداڵ تا باڵغ ئەبێت))، ولە بەر فەرمودەی: «مُرُوا أَوْلَادَكم بِالصَّلَاةِ لِسَبْعٍ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا لِعَشْرٍ، وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ» ((لە حەوت ساڵاندا فەرمان بکەن بە منداڵەکانتان بە نوێژ کردن، ولـە دە ساڵاندا لە سەری بدەن لێیان، وجێگای خەوتنیشیان جیا بکەنەوە))[1].

## پرسی سێیەم: لە بارەی مەرجەکانیەوە:

مەرجەکانی[2] نۆن:

١. **ئیسلامەتی**: جا کافرێك بیکات دروست نیە، چونکە کردەوەکانی پوچەڵە.

٢. **ژیری**: جا شێتێك بیکات دروست نیە، چونکە تەکلیفی لیٚ نەکراوە.

٣. **پێگەیشتن**: جا لە سەر منداڵ پێویست نیە تا پیٚ ئەگات بەڵام لە حەوت ساڵان دا فەرمانی پیٚ ئەکریٚ ولە دە ساڵاندا لە سەری لێی دەدریٚ لەبەر فەرمودەی پیشتر.

٤. **پاك بون لە هەر دو حەدەسەکە**[3] -ئەگەر توانا هەبو-: لە بـەر فەرمودەکـەی [پێشوتری] ئیبن عومەر ﷺ کە پەیامبەر ﷺ فەرموی: «خوا نوێژ وەرناگرێت بە بـیٚ دەست نوێژ»[4].

٥. **هاتنی کاتی نوێژە کات دیاری کراوەکان**: لە بـەر فەرمایشـتی: ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَوْقُوتًا﴾ [النساء:١٠٣]، ولە بـەر فەرمودەکـەی جبریـل ﷺ

(١) أخرجه أحمد (٢٠١/٣)، وأبو داود (٤٩٤)، والترمذي (٤٠٧) وقال: «حسن»، وصححه الحاكم في المستدرك (٢٠١/١)، وصححه الألباني؛ «الإرواء» (٢٤٧).

(٢) ئەوەیە: دروستی نوێژەکەی لە سەر وەستاوە [واتە: ئەگەر نەبێت نوێژەکە بەتاڵە].

(٣) گەورە وگچکە.

(٤) أخرجه مسلم (٢٢٤).

کە بەر نوێژی کرد بە پەیامبەر ﷺ لە پێنج فەرزەکەدا، فەرموی: «مَا بَيْنَ هَذَيْنِ الْوَقْتَيْنِ وَقْتٌ» «ئەوەی نێوان ئەم دو کاتە کاتی نوێژە»[١] ، بۆیە نە پێش هاتنی کاتەکە نوێژ دروستە ونە دوای ڕۆیشتنی، مەگەر بیانویەکی هەبێت.

٦. **داپۆشینی عەورەت -گەر توانا هەبو- بە شتێك لاشە دەر نەخات:** لەبەر فەرمایشتی: ﴿يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ [الأعراف:٣١] «ئەی ئادەمیزاد نوێژەکانتان بە شێوازێکی جوان ئەنجام بدەن لە داپۆشینی عەورەت وپاك وخاوێنی... هتد».

عەورەتی پیاوی پێگەیشتوش: نێوانی ناوك تا ئەژنۆکانیەتی لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ بۆ جابر ﷺ: «إِذَا صَلَّيْتَ فِي ثَوْب وَاحِدٍ، فَإِنْ كَانَ وَاسِعًا فَالْتَحِفْ بِهِ، وَإِنْ كَانَ ضَيِّقًا فَاتَّزِرْ بِهِ» «ئەگەر بەیەك کراس نوێژت کرد؛ ئەگەر فراوان بو بی پێچە بە خۆتەوە، ئەگەریش تەسك بو ئەوە لە کەمەرتی ببەستە»[٢]. باشتر ولە پێشتریشە هەندێك لە کراسەکەی بدات بە سەر شانی دا چونکە پەیامبەر ﷺ نەهی کردوە نوێژ بکرێت بە بەرگێکەوە وهیچی لێ نەدا بێت بە شانی دا[٣].

ئافرەتیش گیانی هەموی عورەتە تەنها دەم وچاوی وهەر دو لەپی نەبێت مەگەر نوێژەکەی لە بەرچاوی بێگانە بێت -یانی: ئەوانەی مەحرەم نین- ئەو کاتە هەمو شتێك دا دەپۆشێت، لە بەر فەرمودەی: «الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ»[٤]، «ئافرەت عەورەتە»، هەروەها فەرمودەی [پێشتر]: «خوا نوێژی ئافرەتێك وەرناگرێت گەیشتبێتە سوڕی

(١) أخرجه أحمد (٣/٣٣٠)، والنسائي (١/٩١)، والترمذي (١٥٠) وهو صحيح «الإرواء» (٢٥٠).
(٢) أخرجه البخاري (٣٦١)، ومسلم (٣٠١٠).
(٣) [يشير إلى حديث الذي أخرجه البخاري (٣٥٩)، ومسلم (٥١٦)].
(٤) أخرجه الترمذي (٣٩٧)، وصححه الألباني في «الإرواء» (٢٧٣).

مانگانە مەگەر بە سەر پۆشەوە))[1].

٧. دور کەوتنەوە لە پیسی لە لاشە وبەرگ وشوێنی نوێژەکەی دا -ئەگەر توانا هەبو- لە بەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ [المدثر:٤]. ((جل وبەرگەکەشت پاك رابگرە))، هەروەها فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «تَنَزَّهوا عَنْ البَولِ؛ فإنَّ عَامَّةَ عَذَابِ القبر منه» ((خۆتان لە میز پاك را بگرن وپاك بکەنەوە، چونکە زۆربەی سزای گۆڕ بە هۆی ئەوەوەیە))[2]، هەروەها فەرمودەی [پێشتری] پەیامبەر ﷺ کە بە ئەسمائی رضي الله عنها فەرمو -لە بارەی خوێنی سوڕی مانگانەوە بەر جل وبەرگ دەکەوێت-: ((با بە شتێك بیوەرێنێت، وبە ئاو بیدات بە لەپ دا، وئاو بکات بە سەری دا، وئینجا نوێژی پێوە بکات)). هەروەها پەیامبەر ﷺ بە هاوەڵەکانی فەرمو -کە کابرایەکی دەشتەکی میزی لە مزگەوت کردبو-: «أَرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَجْلًا مِنْ مَاءٍ» ((دۆڵەکەیەك ئاو بکەن بە سەر میزەکەی دا))[3].

٨. **رو کردنە قیبلە -گەر توانا هەبو-:** لە بەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ [البقرة:١٤٤] ((جا ڕوت وەر بگێڕە بەرەو مزگەوتی حەرام))، ولە بەر فەرمودەکەی ﷺ: «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ فَأَسْبِغِ الْوُضُوءَ، وَاسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ» ((کە هەستای بۆ نوێژ دەست نوێژێکی جوان بشۆ وئینجا ڕو بکە قیبلە))[4].

٩. **نیەت:** بە هیچ شێوازێکیش ناکەوێت، لە بەر فەرمودەکەی [پێشتری] عومەر رضي الله عنه: ((کار وکردەوەکان بە نیەتە)). شوێنیشی دڵە وحەقیقەتیشی بریتیە لە سور

(١) [تەخریجیەکەیان لێرەدا زۆربەی ژمارەکانی هەڵەیە، ئەگەرچی دوبارەشە فەرمودەکە]
(٢) أخرجه الدارقطني (١/٩٧) (٤٥٣)، وصححه الألباني «الإرواء» (٢٨٠).
(٣) أخرجه البخاري (٢٢٠).
(٤) أخرجه البخاري (٦٢٥١)، ومسلم (٣٩٧).

بون لە سەر کردنی شتێك، ودروست نیە بە دەم بوترێ، چونکە پەیامبەر ﷺ بە دەم نەیفەرموە، ونەشهاتوە کەس لە هاوەڵانی ﷺ کردبێتی.

## پرسی چوارەم: لە بارەی پایەکانیەوە:

**پایەکان:** بریتیە لەو شتانەی پەرستنەکانی لێ پێك دێت، پەرستنەکان دروست نابن بە بێ پایە. وجیاوازی نێوان ئەم ومەرج ئەوەیە: مەرج ئەکەوێتە پێشی پەرستنەکەوە ولەگەڵی دا بەردەوامە، بەڵام پایە ئەو شتانەیە کە پەرستنەکەی لێ پێك هاتوە، لە وتە وکردەوە.

**پایەکانیشی چواردە دانەیە،** لە سەر کەس ناکەوێت نە بە ئەنقەست، نە بە سەهو، نە بە نەزانین، وا لە خوارەوەش رونی دەکەینەوە:

١. **بە پێوە بون:** لە نوێژی فەرز دا بۆ توانا دار، لە بەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ﴾ [البقرة:٢٣٨] «لە نوێژەکانتان دا بە پێوە را بوەستن بە مل کەچیەوە بۆ پەروەدگار»، ولە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ کە بە عیمرانی کوڕی حوصەینی فەرمو ﷺ: «صَلِّ قَائِمًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِدًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلَى جَنْبٍ» «بە پێوە نوێژ بکە، نەتتوانی بە دانیشتنەوە ئەوەشت نەتوانی بە ڕاکشانەوە»[1]، ئەگەریش بە پێوە نوێژی فەرزی نەکرد بەهۆی عوزرێکەوە وەك نەخۆشی وترس وجگە لەمانەش ئەوا پۆزشەکەی وەر دەگیرێت وبە گوێرەی توانای خۆی نوێژەکە دەکات بە دانیشتنەوە بێت یا بە ڕاکشانەوە. بەڵام نوێژی سوننەت وەستان تێیدا سوننەتە وپایە نیە، بەڵام بە پێوە باشترە لە دانیشتو؛ لە بەر فەرمودەی: «صَلَاةُ

(١) أخرجه البخاري (١٢٥١)، ومسلم (٣٩٧).

الْقَاعِدِ عَلَى النِّصْفِ مِنْ صَلاَةِ الْقَائِمِ» «نوێژی دانیشتو پاداشتەکەی نیوەی نوێژی وەستاوە»[1].

٢. تەکبیرەی ئیحرام لە سەرەتایدا: کە بریتیە لە «الله أکبر» کردن، وهیچی تر جێی ناگرێتەوە، لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ بە کابرای هەڵەکار لە نوێژەکەی دا: «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاةِ فَكَبِّرْ» «ئەگەر هەستای بۆ نوێژ بڵێ: «الله أکبر»»[2] ، ولە بەر فەرمودەی: «تَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ، وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ» «حەرام کردنەکەی تەکبیرە کردنە، وحەڵاڵ کردنەکەی سەلام دانەوەیە»[3]، جا نوێژ دانامەزرێ بە بێ تەکبیرەکردن.

٣. خوێندنی فاتیحا بە ڕێکی لە هەمو ڕکاتێك دا: لە بەر فەرمودەی: «لَا صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ» «نوێژی بۆ نیە ئەو کەسەی فاتیحا نەخوێنێت»[4]، بەڵام ئەو کەسەی دوا کەوتوە لەمە هەڵاوێر دەکرێت؛ کە ئەگاتە پێش نوێژ لە ڕکوع دایە یان وەستاوە بەڵام ناگات بە خوێندنی فاتیحا، وهەروەها مەئمومیش لە نوێژە ئاشکراکان دا، ئەمانە هەڵاوێر کراون لە خوێندنی فاتیحا، بەڵام ئەگەر لە کاتی بێ دەنگ بونەکانی پیشەوا دا بیخوێنێت ئەوە چاك ترە، چونکە ئیحتیاتی زیاتری تێدایە.

٤. چەمینەوە لە هەمو ڕکاتێك دا: لە بەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا﴾ [الحج:٧٧] «ئەی ئەوانەی بڕوا دارن ڕکوع ببەن وسوژدە

---

(١) أخرجه مسلم (٧٣٥).
(٢) أخرجه البخاري (٧٩٣)، ومسلم (٣٩٧).
(٣) أخرجه أبو داود (٦١)، وابن ماجه (٢٧٥)، والترمذي (٣)، وقال الألباني: «حسن صحيح» «صحيح ابن ماجه» (٢٢٤).
(٤) أخرجه البخاري (٧٥٦)، ومسلم (٣٩٤).

ببەن))، ولە بەر فەرمودەكەی پەیامبەر ﷺ بە كابرای هەڵە كار لە نوێژەكەی دا: ((ثُمَّ ارْكَع حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا)) ((پاشان ركوع ببە تا ئۆقرە دەگریت بە ڕكوعی))[1].

**٥، ٦. هەستانەوە لە ڕكوع وڕێك كردنەوەی پشت بە پێوە:** لە بەر فەرمودەكەی پەیامبەر ﷺ بە كابرای هەڵە كار لە نوێژەكەی دا: ((...ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا)) ((پاشان هەستەوە لە ڕكوع تا بە پێوە پشتت ڕێك دەبێتەوە)).

**٧. كڕنووش بردن:** لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: ﴿وَاسْجُدُوا﴾ [الحج:٧٧]، ((وسوژدە ببەن))، ولە بەر فەرمودەكەی پەیامبەر ﷺ بە كابرای هەڵە كار لە نوێژەكەی دا: ((ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا)) ((پاشان سوژد ببە تا لە سوژدە ئۆقرە دەگریت)).

سوژدەش لە هەر ڕكاتێك دا دو جارە لە سەر ئەو حەوت ئەندامە دەبرێت كە لە فەرمودەكەی ئیبن عەبباس دا هاتوە: ((أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ: الْجَبْهَةِ -وَأَشَارَ بِيَدِهِ عَلَى أَنْفِهِ- وَالْيَدَيْنِ، والرُّكْبَتَيْنِ، وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ)) ((فەرمانم پێ كراوە سوژدە بەرم لە سەر حەوت ئێسك: تەوێل -وئاماژەی كرد بۆ لوتی-، ودەستەكان، وئەژنۆكان، ونوكی پێكان))[2].

**٨، ٩. هەستانەوە لە سوژدە ودانیشتن لە نێوانیان دا:** لە بەر فەرمایشتەكەی پەیامبەر ﷺ بە كابرای هەڵە كار لە نوێژەكەی دا: ((ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا)) ((پاشان سوژد ببە تا لە سوژدە ئۆقرە دەگریت)).

(١) أخرجه البخاري (٧٩٣)، ومسلم (٣٩٧).
(٢) أخرجه البخاري (٨٠٩)، ومسلم (٤٩٠، ٢٣٠). واللفظ لمسلم.

١٠. **ئۆقرە گرتن (الطمأنينة) لە سەرجەم پایەکان دا**: یانی: نەجولآن، ئەندازەکەشی ئەوەندەی وتنی ئەو زیکرە واجبانەیە لە هەر پایەیەك دا هەیە، لە بەر ئەوەی پەیامبەر ﷺ فەرمانی کرد بە کابرای هەڵە کار لە نوێژەکەی دا لە هەمو پایەیەك دا وا بکات. فەرمانی پێ کرد نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە چونکە ئۆقرەی نەدەگرت.

١١. **[خوێندنی] تەحیاتی کۆتایی**: لەبەر فەرمودەکەی ئیبن مەسعود ﷺ: «ئێمە پێش ئەوەی تەحیاتمان لە سەر فەرز بێت دەمان وت: سەلامی بەندەکانی خوا لە سەر خوا»، ئەوەبو پەیامبەر ﷺ فەرموی: «لَا تَقُولُوا السَّلامُ عَلَى اللهِ [فَإِنَّ اللهَ هُوَ السَّلَامُ] وَلَكِنْ قُولُوا: التَّحِيَّاتُ لِلّٰهِ» «مەڵێن: سەلام لە خوا چونکە خوا خۆی سەلامە، بەڵکو بڵێن: موڵك ومەزنی ومانەوە بۆ خوا»[1]، کە ئەشفەرموێ: «پێش ئەوەی لە سەرمان فەرز بکرێت» کەواتە فەرزە.

١٢. **دانیشتن بۆ تەحیاتی کۆتایی**: چونکە پەیامبەر ﷺ کردویەتی ولە سەری بەردەوام بوە وفەرمویەتی: «صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي» «نوێژ بکەن بەو شێوازەی من دەبینن نوێژ دەکەم»[2].

١٣. **سەلام دانەوە**: لە بەر فەرمودەی [پێشتر] «وحەڵاڵ کردنی سەلام دانەوەیە». جا بە لای ڕاست دا ئەڵێ: السلام عليكم ورحمة الله، وبە لای چەپیشدا ئەڵێ: السلام عليكم ورحمة الله.

١٤. **ڕیز بەندی پایەکان بەو شێوازەی ڕون کرایەوە**: چونکە پەیامبەر ﷺ بە ڕیز کردویەتی وفەرمویەتی [وەك ڕابورد]: «نوێژ بکەن بەو شێوازەی من دەبینن نوێژ

---

(١) أخرجه النسائي (٢/٢٤٠)، وصححه الألباني «الإرواء» (٣١٩).
(٢) أخرجه البخاري (٦٣١).

دەکەم». وکە نوێژی فێری هەڵە کارەکە کرد «ثم»ی بە کار هێنا کە بۆ بە دوای یەکدا هاتنە.

## پرسی پێنجەم: لە بارەی واجبەکانی نوێژەوە:

واجبەکانی هەشتن، بە واز لێ هێنانی ئەنقەست نوێژەکە بەتاڵ دەکاتەوە، بە سەهو ونەزانیش لە سەرت دەکەوێت، وئەگەر بە سەهو بو سوژدەی سەهوی بۆ دەبەی، جیاوازیش لە نێوان ئەم وپایەکان ئەوەیە: هەر کەس پایەیەکی لە بیر بچێت نوێژەکەی دروست نیە مەگەر پایەکە ئەنجام بدات، بەڵام کەسێك واجبێکی لە بیر بچێت سوژدەی سەهو لە سەری دەیخات، جا پایەکان، لە واجبەکان جەخت لە سەر کراو ترن، واجبەکانیش ئەمانەن:

١. هەمو تەکبیرەکان جگە لەوەی سەرەتا، کە پێیان دەوترێ تەکبیرەی «الانتقال»[1]. لە بەر فەرمودەکەی ئیبن مەسعود ﷺ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُكَبِّرُ فِي كُلِّ رَفْعٍ وَخَفْضٍ، وَقِيَامٍ، وَقُعُودٍ» «پەیامبەری خوام بینی ﷺ بۆ هەمو بەرز بونەوە وچەمینەوەیەك، وهەستان ودانیشتنێك الله أكبری دەکرد»[2]، پەیامبەریش ﷺ بەردەوام کردویەتی تا وەفاتی کردوە، فەرموشیەتی ﷺ: «نوێژ بکەن بەو شێوازەی من دەبینن نوێژ دەکەم».

٢. وتنی: «سمع الله لمن حمده»[3] بۆ پێش نوێژ وتەنهاش، لە بەر فەرمودەکەی

---

(١) ئەمەش لای حەنبەلیەکان وایە. شوێنەکەشی: بریتیە لە نێوان چون بۆ ڕوکنێك ولێ بونەوەی، کەواتە نە پێش ڕوکنەکە دەکرێت ونە دوای ڕوکنەکە دەکرێت. وەرگێڕ.

(٢) رواه النسائي (٢/٢٠٥)، والترمذي (٢٥٣)، وقال: حسن صحيح، وصححه الألباني «صحيح الترمذي» (٢٠٨).

(٣) واتە: «خوا بیستی وەڵامی ئەوەی دایەوە کە ستایش وحەمدی کرد».

ئەبو هورەیرە ﷺ: «كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ إِلَى الصلاة، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ حِينَ يَرْفَعُ صُلْبَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ، ثُمَّ يَقُولُ -وَهُوَ قَائِمٌ-: رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ» «پەیامبەر ﷺ کە هەستایە بـۆ نوێـژ، الله أکـبری دەکـرد، هەروەها لە کاتی ڕکوعیش دا، پاشان کە پشتی لە رکوع بـەرز دەکـردەوە ئەیفـەرمو: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، پاشان هەر بە پێوە دەیفەرمو: «رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ»»[1].

**٣. وتنی: «رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ»[2] تەنها بۆ مەئموم، بەڵام پێش نوێژ وکەسی تـەنها سوننەتە هەر دوکی بڵێن، لە بەر فەرمودەکەی ئەبو هـورەیرەی پێشـو ﷺ، هـەروەها فەرمودەکەی ئەبو موسا ﷺ: «وَإِذَا قَالَ «کە پێش نوێژ وتی»: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا «ئەوا بڵێن»: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ»[3].**

**٤. وتنی: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ»[4] یەك جار لە ڕکوع دا.**

**٥. وتنی: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى»[5] یەك جار لە کڕنوش دا،** لە بەر فەرمودەکەی حوزەیفـە: «كَانَ -يعني: ﷺ- يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ پەیامبـەر ﷺ لـە چـەمینەوەدا دەیفەرمو: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ، وَفِي سُجُودِهِ لە کڕنوشـیش دا دەیفـەرمو: سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى»[6]. وسوننەتە زیاتریش بکرێت تا دەگاتە سێ جار[7].

---

(١) أخرجه مسلم (١/٢٩٣) (٢٨).

(٢) واتە: «ئەی پەروەردگارمان! ستایش هەر شایشتەی تۆیە».

(٣) أخرجه مسلم (٤٠٤)، وأحمد (٤/٣٩٩).

(٤) واتە: «پاکی وبێ کورتی بۆ پەروردگاری گەورە ومەزنم».

(٥) واتە: «پاکی وبێ کورتی بۆ پەروردگاری بەرز وبڵندم». هەمو واتا کردنەکانی پێشو هی وەرگێڕن.

(٦) رواه الخمسة: أبو داود (٨٧٤)، والترمذي (٢٦٢) وقال: «حسن صحيح»، والنسائي (١/١٧٢)، وابن ماجه (٨٩٧)، وصححه الألباني في «صحيح النسائي» (١٠٩٧).

(٧) والله أعلم، وا دەردەکەوێت هیچ بەڵگەیەك بە صەحیحی نەهاتبێت لە سەر سێ جار. وەرگێڕ.

٦. **وتنی:** «ربِّ اغفر لي»[١] **لە نێوان دو کڕنوشەکەدا** لە بەر فەرمودەکەی حوزەیفە ﷺ: «كَانَ يَقُولُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ «پەیامبەر ﷺ لە نێوان دو کڕنوشەکە دا دەیفەرمو»: «رَبِّ اغْفِرْ لِي، رَبِّ اغْفِرْ لِي»»[٢].

٧. **تەحیاتی یەکەم:** مەگەر کەسێك پێشەواکەی بە سەهو هەستێتەوە، ئەو کاتە لە سەری واجب نابێت، چونکە واجبە شوێنی پێشەوا بکەوێت؛ چونکە پەیامبەر ﷺ کە تەحیاتی یەکەمی لە بیر چو نەگەڕایەوە بۆی، ولە بری ئەوە سوژدەی سەهوی برد. تەحیاتی یەکەمیش ئەمەیە: «التَّحِيَّاتُ لِلهِ، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ» «گەورەیی ومانەوە وموڵك، ونوێژەکان وپەرستنەکان، ووتە پاك وچاکەکان، هەر هەموی بۆ خوای بەرز ومەزنە، سەلام وڕەحمەت وبەرەکەتت لێ بێت ئەی پەیامبەری خوا، سەلام لە ئێمە ولە سەرجەم بەندە چاکەکان، شاهێدی دەدەم پەرستراوی تر نیە هەق بێت جگە لە خوا، وشاهێدی دەدەم موحەممەد بەندە وپەیامبەری خوایە»[٣].

٨. **دانیشتن بۆ تەحیاتی یەکەم،** لەبەر فەرمودەکەی ئیبن مەسعود ﷺ: «إِذَا قَعَدْتُمْ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ فَقُولُوا: التَّحِيَّاتُ لِلهِ»، «ئەگەر دانیشتن لە هەمو دو ڕکاتێك دا ئەوا بڵێن: التَّحِيَّاتُ لِلهِ»[٤]. ولەبەر فەرمودەکەی ریفاعەی کوڕی ڕافع: «فَإِذَا جَلَسْتَ فِي وَسَطِ الصَّلَاةِ فَاطْمَئِنَّ، وَافْتَرِشْ فَخِذَكَ الْيُسْرَى، ثُمَّ تَشَهَّدْ» «ئەگەر دانیشتی

---

(١) واتە: «پەروەردگارەکەم لێم خۆش ببە».

(٢) رواه النسائي (١/١٧٢)، وابن ماجه (٨٩٧)، وصححه الألباني في «الإرواء» (٣٣٥).

(٣) [أخرجه البخاري (٨٣١)، ومسلم (٤٠٢) وغيرهما].

(٤) أخرجه أحمد (١/٤٣٧)، والنسائي (١/١٧٤)، وصححه الألباني في «الإرواء» (٣٣٦).

بۆ تەحیات لە ناوەڕاستی نوێژدا، ئەوا ئۆقرە بگرە وڕانی چەپت ڕا بخە، پاشان تەحیات بخوێنە»[1].

## پرسی شەشەم: لە بارەی سوننەتەکانی نوێژەوە:

ئەمەش دو جۆرە: سوننەتە کرداریەکان، وسوننەتە گوفتاریەکان.

**سوننەتە کرداریەکانیش:** وەك دەست بەرز کردنەوە لەگەڵ تەکبیرەی سەرەتا ولە کاتی ڕکوع وهەستانەوە لێی، چونکە مالکی کوڕی حوەیرس ئەگەر دەستی بە نوێژ بکردبایە «الله أكبر»ی دەکرد ودەستی بەرز دەکردەوە، وبیویستایە ڕکوع ببات دەستی بەرز دەکردەوە، هەروەها هەڵسایەتەوە لە ڕکوع دەستی بەرز دەکردەوە، دەیوت: پەیامبەر ﷺ وای کردوە[2]. هەروەها دەستی ڕاست خستنە سەر چەپ ودانانی لە سەر سنگ بە پێوە، وتەماشا کردنی شوێنی کڕنوش، وجیا کردنەوەی هەر دو پێ بە پێوە، وئەژنۆکانی بە دەستەکانی بگرێت وپەنجەکانی بلاو بکاتەوە لە کاتی ڕکوع دا، وپشتی درێژ بکاتەوە تێیدا، وسەریشی لە ئاستی پشتی بێت.

**سوننەتە گوفتاریەکانیش:** وەك نزای دەست پێکردن، و«بسم الله الرحمن الرحيم» کردن، و«أعوذ بالله من الشيطان الرجيم» گرتن، ووتنی: ئامین، وخوێندنی زیاتر لە فاتیحا، وتەسبیحاتی ڕکوع وسوژدە جارەکانی زیاتر بکرێت، ودوعا کردن لە دوای تەحیات وپێش سەلام دانەوە.

---

(١) أخرجه أبو داود (٨٥٦)، وحسنه الألباني في «الإرواء» (٣٣٧).

(٢) أخرجه مسلم (٣٩١).

## پرسی حەوتەم: پوچەڵ کەرەوەکانی نوێژ:

چەندین شت نوێژ پوچ دەکەنەوە، بە گردی (إجمالًا) ئەمانەیە:

١. چی دەست نوێژ پوچ بکاتەوە نوێژیش پوچ دەکاتەوە، چونکە دەست نوێژ مەرجە بۆ دروستی نوێژ، جا ئەگەر دەست نوێژ پوچەڵ بویەوە نوێژیش پوچەڵ دەبێتەوە.

٢. پێکەنین بە دەنگ: کە بریتیە لە قاقا، بە ئیجماع پوچی دەکاتەوە، چونکە وەك قسە وایە بەڵکو توند تریش، ولە بەر ئەو سوکایەتی ویاری کردنەی تێیدایە کە دژی مەبەستی نوێژە، بەڵام بزگەی بێ قاقا بەتاڵی ناکاتەوە، وەك ئیبن مونزیر وئەوان باسیان کردوە.

٣. قسە کردن بە ئەنقەست مەگەر بۆ بەرژەوەندی نوێژ: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ﷺ ئەڵێ[1]: ئێمە لە نوێژ دا قسەمان دەکرد، کابرا قسەی لەگەڵ هاوڕێکەی دەکرد کە لە نوێژ دا لە تەنیشتیەوە بو، تا ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ﴾ [البقرة:٢٣٨]، ئەوەبو فەرمانمان پێ کرا بە بێ دەنگ بون ونەهیمان لێ کرا لە قسە کردن. ئەگەریش قسەی کرد بە نەزانیەوە یا لە بیری چو ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە.

٤. تێ پەڕ بونی ئافرەتی پێ گەیشتو یا گوێ درێژ یان سەگی ڕەش بە بەردەمی نوێژ خوێندا نەك لەو دیو شوێن سوژدەکەی: لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي فَإِنَّهُ يَسْتُرُهُ إِذَا كَانَ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلُ آخِرَةِ الرَّحْلِ، فَإِذَا لَمْ يَكُنْ

---

(١) أخرجه البخاري (١٢٠٠)، ومسلم (٥٣٩).

بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلُ آخِرَةِ الرَّحْلِ فَإِنَّهُ يَقْطَعُ صَلَاتَهُ الْحِمَارُ وَالْمَرْأَةُ وَالْكَلْبُ الْأَسْوَدُ» («کەسێکتان هەستا بۆ نوێژ ئەگەر شتێکی وەك تەختی پشتی کۆپان لە پێشیەوە بێت ئەوە ستری دەکات، ئەگەرنا شتێکی وەك ئەوەی لە پێش نەبێت ئەوا گوێ درێژ وئافرەت وسەگی ڕەش نوێژەکەی دەبڕن»)[1]. وپشتی کۆپانیش ئەندازەی باڵێکە، کەواتە ئەو ئەندازە بۆ سترە لە سەرت دەخات.

٥. **دەرخستنی عەورەت بە ئەنقەست**، لەبەر مەرجەکانی پێشو.

٦. **پشت کردنە قیبلە**، چونکە ڕو کردنە ڕوگە مەرجە بۆ دروستێتی نوێژ.

٧. **پیسی پێوە بێت** وپێشی بزانێت ولە بیری بێت، یەك سەریش لای نەدات.

٨. **نەکردنی پایەیەك لە پایەکان** یا مەرجێ لە مەرجەکان بە ئەنقەست وبە بێ عوزر.

٩. **جوڵەی زۆر** کە لە جۆر وڕەگەزی نوێژ نەبێت وزەرور نەبێت، وەك خواردن وخواردنەوەی ئەنقەست.

١٠. **خۆ دان بە سەر شتێك دا** بە بێ عوزر، چونکە بە پێوە بون مەرجە بۆ دروستێتی نوێژ.

١١. **بە ئەنقەست پایەیەکی کردەیی زیاتر بکرێت**، وەك ڕکوع وکڕنوشی زیاتر، لەبەر ئەوەی بە دەرە لە شێواز وهەیئەتی نوێژ، بۆیە بەتاڵ دەبێتەوە بە ئیجماع.

---

(١) أخرجه مسلم (٥١٠).

**١٢. بە ئەنقەست پێش خستنی هەندێك پایە بە سەر هەندێکی تر دا**، چونکە بە ڕیز کردن مەرجە وەك پێشتر باس کرا.

**١٣. بە ئەنقەست سەلام بداتەوە** پێش تەواو کردنی.

**١٤. بە ئەنقەست بە شێوەیەك قورئان بخوینێت واتا بگۆڕێت** وەلّی نەگرێت «إِحَالَةُ المَعْنَى فِي القِرَاءَة»[1]، مەبەست فاتیحایە چونکە پایەیە لە نوێژ دا.

**١٥. هەلّ وەشاندنەوەی نیەت** وسور بون لە سەر هەلّ وەشاندنەوەی ورا را بون تێی دا، چونکە بەردەوامی نیەت مەرجە.

## پرسی هەشتەم: ئەو شتانەی کەڕاهەتی هەیە لە نوێژ دا:

ئەم شتانەی خوارەوە کەڕاهەتی[2] هەیە:

**١. تەنها خوێندنی فاتیحا لە هەر دو ڕکاتی یەکەم ودوەم**، چونکە پێچەوانەی سوننەت ودژی ئیشی پەیامبەرە ﷺ لە نوێژ دا.

**٢. دوبارە خوێندنەوەی فاتیحا**: چونکە دیسانەوە پێچەوانەی سوننەتی پەیامبەرە ﷺ بەلاّم ئەگەر لە بەر پێویستیەك دوبارەی کردەوە؛ وەك ئەوەی خشوعی نەما بێت ودلّی لای خوێندنەکەی نەبو بێت، بیەوێت دوبارەی بکاتەوە تا دلّی ئامادە بێت، ئەوە خراپ نیە بەلاّم بە مەرجێك سەر نەکێشێت بۆ وەسواس.

---

(١) [أي: يلحن لحنًا في القراءة يحيل المعنى ويصرفه إلى غيره. انظر: «الحاوي الكبير» (٢/٣٢٣-٣٢٤)].

(٢) کەڕاهەت لە زاراوەی فەقیهەکاندا: بریتیە لە ڕێ گری کردن لە شت بە بێ ئیلزام کردنی بە واز هێنان. وحوکمی مەکروهیش ئەوەیە: پاداشتی واز لێ هێنەرەکەی دەدرێتەوە کە گوێڕایەلّی دەکات، بەلاّم سزای واز لێ هێنەرەکەی نادرێت، ودروستە بکرێ لە کاتی پێویستی بێ ئەوەی زەروریش بێت.

٣. ئاوڕ دانەوەی کەم کەڕاهەتی هەیە بە بێ پێویستی: لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ کە پرسیاری لێ دەکرێت لە بارەی ئاوڕ دانەوە لە نوێژ دا فەرمووی: «هُوَ اخْتِلَاسٌ، يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ صَلَاةِ الْعَبْدِ»[1] «دزی وگزیەکە شەیتان لە نوێژ بەندەی دەدزێت».

بەڵام ئەگەر ئاوڕ دانەوە لە بەر پێویستی بو، ئەو کات هیچی تێدا نیە، وەك یەکێك بە هۆی وەسواسەوە پێویستی بەوە بێت لە نوێژەکەی دا سێ جار تف بکات بە لای چەپی دا، جا ئەم ئاوڕ دانەوەیە لە بەر پێویستیەکە پەیامبەر ﷺ فەرمانی پێ کردوە، هەروەها وەك کەسێك لە ون بونی منداڵەکەی بترسێت وئاوڕ بداتەوە بۆ ئەوەی ئاگای لێ بێت.

هەمو ئەمانە بۆ ئاوڕ دانەوەیەکی کەمە، بەڵام ئەگەر بە هەمو لاشەی ئاوڕی دایەوە یا پشتی کردە قیبلە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە ئەگەر بە بێ عوزر بیکات، وەك ترسێکی زۆر وهاو شێوەکانی.

٤. داخستنی چاوەکان لە نوێژ دا: چونکە ئەمە لە ئیشی مەجوسەکان دەچێت لە کاتی ئاگر پەرستنیاندا. وتراویشە: لە ئیشی جولەکەش دەچێت[2]، ئێمەش ڕێگریمان لێ کراوە لە خۆ چواندن بە بێ باوەڕان، [بەڵام کەسێك پێویستی بێت کەڕاهەتی نیە].

٥. ڕاخستنی باڵەکان لە سوژدە دا: لە بەر فەرمودەی: «اعْتَدِلُوا فِي السُّجُودِ، وَلَا يَبْسُطْ أَحَدُكُمْ ذِرَاعَيْهِ انْبِسَاطَ الْكَلْبِ» «لە سوژدەدا مام ناوەند بن لە نێوان خۆ

---

(١) أخرجه البخاري (٧٥١).

(٢) الله أعلم ئیشی ئەوانە یان نا؟! بەس بێت کە پەیامبەر ﷺ نوێژی بە چاو کراوەیی کردوە. وەرگێڕ

کوڕ کردن وخۆ ڕاخستن، وکەستان باڵەکانی ڕا نەخات وەك ڕاخستنی سەگ»[١]. جا ئەبێت نوێژ خوێن هەر دو باڵی دور بخاتەوە لە یەکتر ولە زەوی بەرزیان بکاتەوە وخۆی نەچوێنێ بە ئاژەڵ.

٦. زۆر یاری کردن لە نوێژ دا: لە بەر ئەوەی سەرقاڵ بونی دڵی تێدایە کە دژی خشوعە، خشوعیش داواکراوە لە نوێژدا.

٧. دەست گرتن لە سەر کەمەر وناو قەد: لە بەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ: «نُهِيَ أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِرًا» «ڕێ گری کراوە موسڵمان دەست لە سەر ناو قەد بگرێت»[٢]. ناو قەد وکەمەر ئەوەیە ئەکەوێتە سەروی سمت وڕانەوە. عائیشەش ﷺ هۆکارەکەی بەوە دەهێنێتەوە کە جولەکە وا دەکەن[٣].

٨. **شۆڕ کردنەوە «السدل»، وداپۆشینی دەم لە ناو نوێژدا:** چونکە «أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ السَّدْلِ فِي الصَّلَاةِ، وَأَنْ يُغَطِّيَ الرَّجُلُ فَاهُ» «پەیامبەر ﷺ نەهی کردوە لە شۆڕکردنەوە لە نوێژ دا، هەروەها مرۆڤ دەمی داپۆشێت»[٤]، «السدل» ئەوەیە جلەکەی بدات بە سەر شانی دا ودیوەکانی نەگێڕێتەوە بۆ سەر شانەکانی [واتە: دیوی ڕاستی نەداتەوە بەسەر شانی چەپ دا...] وتراویشە: شۆڕ کردنەوەی جل وبەرگە تا دەگاتە ئەرز، لە سەر ئەمەش بێت بە واتای «الإسبال= شۆڕ کردنەوەی جل وبەرگ بۆ خوار قولە پێ» دێت.

---

(١) أخرجه البخاري (٨٢٢).
(٢) أخرجه البخاري (١٢٢٠).
(٣) روى ذلك عنها مسروق، أخرجه البخاري في صحيحه (٣٤٥٨).
(٤) أخرجه أبو داود(٦٤٣)، والترمذي(٣٧٩)، وحسنه الألباني في «صحيح سنن الترمذي» (٣١٢).

٩. موافەقەکردنی پێشەوا، چونکە دژی ئـەو شـوێن کەوتنەیـە داوای لـێ کـراوە، هەروەها ئەو پێش برکێ حەرامەی لێ نەوەشاوەتەوە کە پەیامبەر ﷺ دەیفـەرموێ: «أَمَا يَخْشَى أَحَدُكُمْ، أَوْ: لَا يَخْشَى أَحَدُكُمْ، إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الْإِمَامِ، أَنْ يَجْعَلَ اللهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ، أَوْ يَجْعَلَ اللهُ صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ» «ئایـا کـەس لـە ئێـوە ناترسێت کە سەری پێش پێشەوا بەرز کردەوە خوا سەری بکات بە سەری گوێ درێژ یا وێنەی بکاتە وێنەی گوێ درێژ»[1]، کەواتە کارەکەی بە مەکڕوهی دەمێنێتەوە چونکە لە نێوان حەڵاڵ بون وحەرام بون دایە.

١٠. **پەنجە کردن بە ناو یەك دا:** چونکە پەیامبـەر ﷺ نـەهی کـردوە کەسێك دەست نوێژ بگرێت وبێت بۆ مزگەوت بۆ نوێژ وئەمە بکات[2]، جا لە نوێـژ بێـت لـە پێشترە مەکڕوە بێت، بەڵام پەنجە کردن بە یەك دا لە دوای نوێژ کەڕاهەتی تێدا نیـە، با لە مزگەوتیش بێت چـونکە پەیامبـەر ﷺ کردویـەتی وەك لـە چیرۆکی کـابرای خاوەن دو دەست دا هاتوە[3].

١١. گرتنەوەی قژ وجل وبەرگ «الكَفّ»: لـە بـەر فەرمودەکـەی ئـیبن عـەبباس رضي الله عنهما: «فەرمان کرا بە پەیامبەر ﷺ کـە لـە سـەر حـەوت ئەنـدام سـوژدە ببـات، هەروەها جل وبەرگ وقژی نەگرێتەوە»[4]. «الكَفّ»یش بە واتای کۆ کردنـەوە دێـت، یانی: با کۆی نەکاتەوە ونەینات بە یەك، ئەکرێ بە واتای گرتنەوەش بێت، یانی: بـا

(١) أخرجه البخاري (٦٩١)، ومسلم (٤٢٧).
(٢) أخرجه الحاكم (٢٠٦/١) وصححه، وافقه الذهبي، وافقهما الألباني «الإرواء» (١٠٢/٢).
(٣) [أخرجه البخاري (٤٨٢)، ومسلم (٥٧٣)].
(٤) أخرجه البخاري (٨١٥)، ومسلم (٤٩٠).

نەیگرێتەوە وشۆڕی بکاتەوە لە کاتی کڕنوش دا، هەمو ئەمانەش گاڵتە جاڕیە ودژی خشوعە لە نوێژ دا.

١٢. نوێژ کردن بە ئامادە بونی خواردن، یا بە تەنگە تاوی: لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەری خوا ﷺ: «لَا صَلَاةَ بِحَضْرَةِ الطَّعَامِ وَلَا وَهُوَ يُدَافِعُهُ الْأَخْبَثَانِ» «نوێژ نیە بە ئامادە بونی خواردن، هەروەها لە کاتی تەنگە تاوی دا»[1]. کەڕاهەتی نوێژ کردنیش بە ئامادە بونی خواردن بەو مەرجەیە ئارەزوی بکات، وبتوانێت بیخوات، وئامادە بێت لە بەردەمی دا، جا ئەگەر ئامادە بو بەلاّم بە ڕۆژو بو یا تێر بو ئارەزوی نەدەکرد یا نەیدەتوانی لێی بخوات لەبەر ئەوەی زۆر گەورەیە، لە هەمو ئەمانەدا کەڕاهەتی نیە -ئامادەش بو- نوێژ بکات.

سەبارەت بە هەر دو پیسەکە: بریتیە لە (میز وپیسی، نەهیش کراوە) لە هەمو ئەمانە چونکە دڵی نوێژ خوێن سەرقاڵ دەکەن ومێشکی پەرتەوازە دەکەن وئەمەش دژی خشوعە لە نوێژ دا. لەوانەشە زیانی پێ بگات بە گرتنەوەی میز وپیسی وگل دانەوەیان.

١٣. سەر بەرز کردنەوە بۆ ئاسمان: لە بەر فەرمایشتی پەیامبەر ﷺ: «لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلَى السَّمَاءِ فِي الصَّلَاةِ، أَوْ لَتُخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ» «خەڵکانێك یا واز دەهێنن لە سەر بەرز کردنەوە بۆ ئاسمان لە نوێژ دا یا خوا لە پڕ دا چاویان دەباتەوە»[2].

(١) أخرجه مسلم (٥٦٠).
(٢) أخرجه مسلم (٤٢٩).

## پرسی نۆیەم: حوکمی نوێژ نەکەر:

هەر کەس واز لە نوێژ بهێنێت وەکو نکوڵی لە واجب بونی، ئەوە بێ باوەڕ وهەڵگەڕاوەیە، چونکە خوا وپەیامبەر ﷺ وکۆ دەنگی موسڵمانانی بە درۆ خستۆتەوە.

بەڵام کەسێك نەیکات لە بەر کەمتەرخەمی وتەمبەڵی: لەمەش دا ئەوەی ڕاستە هەر بێ باوەڕە ئەگەر بەردەوام ویەك جارەکی نەیکات، لە بەر فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ﴾ [التوبة:١١] «ئەگەر تەوبەیان کرد ونوێژیان ئەنجام دا وزەکاتیان بەخشیەوە ئەوە براتانن لە دین دا». ئەمە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی ئەگەر مەرجی نوێژ کردنیان بە جێ نەهێنا ئەوا موسڵمان نین ولە دین دا برامان نین، ولە بەر ئەو فەرمودەی پەیامبەر ﷺ: «الْعَهْدَ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمُ الصَّلَاةُ، فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ» «ئەو پەیمانەی لە نێوان ئێمە وئەوان دا هەیە نوێژە، جا هەر کەس وازی لێ بهێنێت کوفری کردوە»[1]. هەروەها پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: «إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلَاةِ» «نێوانی مرۆڤ لەگەڵ شیرك وکوفر دا واز هێنانە لە نوێژ»[2].

---

(١) أخرجه الترمذي (٢١٢٦)، والنسائي (٢٣١/١)، وأحمد (٣٤٦/٥)، والحاكم (٦/١، ٧). قال الترمذي: «حسن صحيح غريب»، وصححه الحاكم وافقه الذهبي، وهو في «صحيح الترمذي ٢١١٣».
(٢) أخرجه مسلم (٨٢).

# دەروازەی پێنجەم

# لە بارەی نوێژی سوننەتەوە

مەبەستیش لە سوننەت: هەمو پەرستنێکە واجب نەبێت.

چەند پرسێکیشی تێدایە:

## پرسی یەکەم: فەزڵی نوێژی سوننەت، وحیکمەت لە شەرعی بونی:

١. **فەزڵەکەی:** نوێژی سوننەت لە باشترین پەرستشەکانە لە دوای تێ کۆشان لە پێناوی خوا وفێرخوازی، ئەمەش لە بەر بەردەوام بونی پەیامبەر ﷺ لە سەر کردنی نوێژی سوننەت، ولە بەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە رضي الله عنه، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «إِنَّ اللهَ تَعَالى قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ، وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ...» «خوا ﷻ فەرمویەتی: هەر کەس دژایەتی دۆستێکی من بکات، ئەوا شەڕی لە دژ ڕا دەگەیەنم، وبەندەکەم لێم نزیك نابێتەوە بە شتێك خۆشەویست تر بێت لە لام وەك فەرزەکان، وبەردەوام بەندەکەم لێم نزیك دەبێتەوە بە سوننەتەکان تا خۆشم دەوێت»[1]

٢. **حیکمەت لە دانانی:** خوا ﷻ سوننەتەکانی داناوە وەك ڕەحمەتێك بە بەندەکانی، جا بۆ هەر فەرزێك سوننەتێکی لە جۆر (ڕەگەز)ی خۆی بۆ داناوە تا ئیماندار بە هۆیەوە ئیمانی زیاتر بێت وپلەی بەرز تر بێت، وفەرزەکانیشی پێ تەواو بکرێت وببێتە جێگرەوەی لە قیامەت، چونکە فەرزەکان کەم وکورتی بە سەردا دێت،

(١) أخرجه مسلم (٨٢).

وەك لە فەرمودەکەی ئەبو هورەیرەدا ﷺ هاتوە، لـە پەیامبـەرەوە ﷺ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الصَّلَاةُ [الْمَكْتُوبَةُ]، فَإِنْ أَتَمَّهَا وَإِلَّا قِيلَ: انْظُرُوا هَلْ لَهُ مِنْ تَطَوُّعٍ ؟ فَإِنْ كَانَ لَهُ تَطَوُّعٌ أُكْمِلَتِ الْفَرِيضَةُ مِنْ تَطَوُّعِهِ، ثُمَّ يُفْعَلُ بِسَائِرِ الْأَعْمَالِ الْمَفْرُوضَةِ مِثْلُ ذَلِكَ» «یەکەم شتێك لە قیامەت دا کە لە سەری لـێ پرسینەوە لە گەڵ موسڵمان دەکرێت، نوێژە فەرزەکانە، جا ئەگەر تەواو وکامڵ بو، ئەوا باشە، وەگەرنا ئەوترێت: تەماشا بکەن بزانن سوننەتی هەیە؟ ئەگەر هەیبو فەرزەکـەی پێ تەواو دەکرێت، پاشان لە گەڵ سەرجەم کارە فەرزەکانی تردا ئاوها دەکرێت»[(١)].

## پرسی دوەم: لە بارەی بەشەکانی نوێژی سوننەوە:

نوێژی سوننەت دو جۆرە:

**جۆری یەکەم:** ئەو سوننەتانەیە کاتێکی دیاری کراوی هەیە، پێشی دەوترێت: سوننەتی «الـمُقَيَّد»، وهەیانە لەگەڵ فەرزەکان دایە وەکو سوننەتە ڕاتیبەکان (الرواتب)، هەشیانە وا نیە وەك نوێژی وتر وچێشتەنگاو وخۆر گیران.

**جۆری دووەم:** ئەو سوننەتانەیە نە بەستراوە بە کاتێکی دیاری کراوەوە.

جۆری یەکەمیش چەندین جۆرە، وهەندێکیشیی لە هەندێکی تەئکید کراو ترە، لـە هەمویشی جەخت کراو تر خۆر گیرانە، پاشان ویتر، دوای ئـەوە نوێـژە بارانـە، ئینجـا نوێژی تەراویح.

بەڵام جۆری دووەم بە شەو بەردەوام دروستە، لە ڕۆژیش دا دروستە جگـە لـە کاتـە نەهی لێ کراوەکان. نوێژی شەویش لە نوێژی ڕۆژ باشترە.

---

(١) أخرجه أبو داود (٨٦٤)، والنسائي (٤٦٦، ٤٦٧)، وابن ماجه (١٤٢٥) قال البغوي «شرح السنة» (١٥٩/٤): «حديث حسن»، وهو في «صحيح النسائي» (٤٥١-٤٥٣)، واللفظ لابن ماجه [وفي الموضع المشار إليه الزيادة المثبتة].

## پرسی سێیەم: ئەو نوێژە سوننەتانەی بە کۆمەڵ بکرێت سوننەتە:

سوننەتە نوێژی جەماعەت بکرێت بۆ: تەراویح، وداوای باران بارین، وخۆر گیران.

## پرسی چوارەم: ژمارەی ڕەواتبەکان:

ڕەواتب کۆی ڕاتبە، واتا: بەردەوامی هەمیشەیی، ئەمانەش لەگەڵ فەرزەکان دان، سودی ئەم ڕاتبانە ئەوەیە کەم وکورتی فەرزەکان پڕ دەکەنەوە، وەك پێشتر ڕون کرایەوە.

ژمارەشیان دە ڕکاتە، وەك لە فەرمودەکەی ئیبن عومەردا رضي الله عنه هاتوە: «حَفِظْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ عَشْرَ رَكَعَاتٍ؛ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ فِي بَيْتِهِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ فِي بَيْتِهِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ، كَانَتْ سَاعَةً لَا يُدْخَلُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فِيهَا. حَدَّثَتْنِي حَفْصَةُ: أَنَّهُ كَانَ إِذَا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ، وَطَلَعَ الْفَجْرُ، صَلَّى رَكْعَتَيْنِ» «دە ڕکاتم لە پەیامبەرەوە ﷺ لە بەر کردوە وفێری بوم: دو ڕکات پێش نیوەڕۆ، دو ڕکاتیش لە پاشی، دو ڕکات دوای مەغریب لە ماڵی خۆی دا، دو ڕکاتیش دوای عیشا لە ماڵی خۆی دا، دو ڕکاتیش پێش نوێژی بەیانی، لەو کاتانەش دا کەس نە دەچوە خزمەتی، حەفسە بۆی گێڕامەوە کە دوای بانگ ودەرچونی سپێدە دو ڕکات نوێژی دەکرد»[1].

وتەئکید لە سەر کراوە دەرهەق موسڵمان پارێزگاری بکات لە سەر دوانزە ڕکات، لە بەر فەرمایشتی پەیامبەر ﷺ: «مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يُصَلِّي لِلهِ تعالى كُلَّ يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً تَطَوُّعًا غَيْرَ فَرِيضَةٍ، إِلَّا بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ - أَوْ إِلَّا بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ» «هیچ موسڵمانێك نیە هەمو ڕۆژێك دوازدە ڕکات نوێژ بکات مەگەر خوای

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (١١٨٠، ١١٨١) [واللفظ له]، ومسلم (٧٢٩).

گەورەماڵێکی لە بەهەشت دا بۆ دروست دەکات»[1]. ئەمەش هەر ئەوەی پێشوە تەنها پێش نیوەڕۆ چوار ڕکاتە، وەك لە زیادەیەکی تورمزیدا هاتوە لە فەرمودەکەی ئوم حەبیبەی پێشو رضي الله عنها: «أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الْفَجْرِ صَلَاةِ الْغَدَاةِ» «چوار ڕکاتە پێش نیوەڕۆ، ودوان لە پاشی، ودوان پاش مەغریب، ودوان پاش عیشا، دوان لە پێش نوێژی بەیانی»[2]. هەروەها لە بەر ئەو فەرمودەیەی کە لە صەحیحدا هاتوە لە عائیشەوە: «پەیامبەر ﷺ چوار ڕکاتەکەی پێش نوێژی نیوەڕۆی واز لێ نەدەهێنا»[3].

وتەئکید کراو ترینی ڕەواتبەکان: دو ڕکاتەکەی پێش نوێژ بەیانیە، لە بەر ئەو فەرمودەیەی پەیامبەر ﷺ کە ئەفەرموێ: «رَكْعَتَا الْفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا» «دو ڕکاتەکەی بەیانی لە دونیا وئەوەشی تێیدایە باشترە»[4]. ولە بەر فەرمودەکەی عائیشە رضي الله عنها لە بارەی ئەو دو ڕکاتەوە: «وَلَمْ يَكُنْ يَدَعُهُمَا أَبَدًا» «هەرگیز وازی لێ نەدەهێنا»[5].

## پرسی پێنجەم: حوکمی ویتر وفەزڵەکەی وکاتەکەی:

**حوکمەکەی:** سوننەتێکی تەئکید کراوە، پەیامبەر ﷺ هانی لە سەر داوە، وەك ئەفەرموێ: «إِنَّ اللهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الوِتْرَ» «خوا تاکە، ویتر (تاك)ی پێ خۆشە»[6]. هەروەها

(١) أخرجه مسلم (٧٢٨) من حديث أم حبيبة رضي الله عنها.
(٢) «جامع الترمذي ٤١٥». وقال: «حسن صحيح»، وهو في «صحيح سنن الترمذي» (٨٣٣، ٨٣٩).
(٣) أخرجه البخاري (١١٨٢).
(٤) أخرجه مسلم (٧٢٥).
(٥) أخرجه البخاري (١١٥٩).
(٦) أخرجه البخاري (٦٤١٠)، ومسلم (٢٦٧٧).

ئەفەرموێ ﷺ: «يَا أَهْلَ الْقُرْآنِ أَوْتِرُوا؛ فَإِنَّ اللهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ» «ئەی قورئان خوێنان ویتر بکەن، خوا ویترە ویتری پێ خۆشە»[1].

**کاتەکەشی:** نێوان نوێژی عیشا ونوێژی بەیانیە بە کۆ دەنگی زانایان، لە بەر کردەوەی پەیامبەر ﷺ خۆی، وفەرمایشتیشی: «إِنَّ اللهَ تَعَالَى قَدْ أَمَدَّكُمْ بِصَلَاةٍ، وَهِيَ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ، وَهِيَ الْوِتْرُ، فَجَعَلَهَا لَكُمْ فِيمَا بَيْنَ الْعِشَاءِ إِلَى طُلُوعِ الْفَجْرِ» «خوا ﷻ نوێژێکی بۆ زیاد کردون، کە لە بە نرخ ترین ماڵ «وشترە سورە» باشترە بۆتان، ئەویش نوێژی ویترە، خستویەتی نێوان نوێژی عیشا ودەرچونی سپێدەوە»[2].

کە سپێدە دەرچو ئیتر وتر نامێنێت، لە بەر فەرمودەی: «صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ صَلَّى رَكْعَةً وَاحِدَةً، تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى» «شەو نوێژ دو ڕکات دو ڕکاتە، جا ئەگەر کەسێکتان ترسا سپێدە دەر بچێت، یەك ڕکات دەکات، ئەبێتە ویتری نوێژەکانی»[3]. ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی نەمانی کاتی ویتر بە دەرچونی سپێدە دەبێت.

حافز ئیبن حەجەر دەڵێت: «وڕاشکاو تر لەمە ئەوەیە کە ئەبو داود ونەسائی دەگێڕنەوە وئەبو عەوانە وجگە لەویش بە صحیحان داناوە... کە ئیبن عومەر رضي الله عنهما ئەیوت: «مَنْ صَلَّى مِنَ اللَّيْلِ فَلْيَجْعَلْ آخِرَ صَلَاتِهِ وِتْرًا فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَأْمُرُ بِذَلِكَ، فَإِذَا كَانَ الْفَجْرُ فَقَدْ ذَهَبَ كُلُّ صَلَاةِ اللَّيْلِ وَالْوِتْرِ» «هەر کەس شەو

---

(١) أخرجه أبو داود (١٤١٦)، وصححه الألباني في التعليق على «صحيح ابن خزيمة» (١٠٦٧).

(٢) أخرجه أبو داود (١٤١٨)، والترمذي (٤٥٢)، والحاكم (٣٠٦/١) وصححه ووافقه الذهبي. وقال الألباني: «صحيح دون قوله: «هي خير لكم من حمر النعم»» «صحيح الترمذي» (٣٧٣).

(٣) أخرجه البخاري (٩٩٠).

نوێژی کرد با ویتر بخاتە کۆتاییەکەی، چونکە پەیامبەر ﷺ فەرمانی بەوە دەکرد، کە سپێدەش دەرچو ئیتر شەو نوێژ ویتریش نامێنێت»»[١].

ونوێژی ویتریش لە کۆتایی شەو دا باشترە لە سەرەتاکەی، بەلاّم سوننەتە پێش بخرێت بۆ کەسێك زانی کۆتایی شەو بۆ خەبەر نایەت، ئەگەریش زانی بە خەبەر دێت سوننەتە دوا بخرێت، لە بەر فەرمودەکەی جابر ﷺ کە پەیامبەر ﷺ فەرمویەتی: «مَنْ خَافَ أَنْ لَا يَقُومَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَلْيُوتِرْ أَوَّلَهُ، وَمَنْ طَمِعَ أَنْ يَقُومَ آخِرَهُ فَلْيُوتِرْ آخِرَ اللَّيْلِ فَإِنَّ صَلَاةَ آخِرِ اللَّيْلِ مَشْهُودَةٌ، وَذَلِكَ أَفْضَلُ» «هەر کەس ترسا کۆتایی شەو دا بە خەبەر نەیەت، ئەوا با سەرەتاکەی ویتر بکات، هەرکەسیش بە تەمای کۆتایی شەو بو ئەوا با کۆتایی شەو ویتر بکات، چونکە نوێژی کۆتایی شەو فریشتەکان ئامادەی دەبن، وئەوەش چاکترە»[٢].

## پرسی شەشەم: شێوازی ویتر وژمارەی ڕکاتەکانی:

ویتر لای کەمەکەی یەك ڕکاتە، لە بەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر وئیبن عەبباس ﷺ ئەیدەنە پاڵ پەیامبەر ﷺ: «الوِتْرُ رَكْعَةٌ مِنْ آخِرِ اللَّيْل» «ویتر ڕکاتێکە لە کۆتایی شەو»[٣]، ولە بەر فەرمودەکەی ئیبن عومەری پێشو ﷺ: «یەك ڕکات دەکات ئەبێتە ویتری نوێژەکانی».

(١) «فتح الباري» (٥٥٧/٢) [انظر: أحمد (٦٤٤٦)، الترمذي (٤٧٩)، وابن خزيمة (١٠٩١)، والحاكم (٣٠٢/١)، وعبد الرزاق (٤٦٤٦)، والبيهقي (٤٧٨/٢)].
(٢) أخرجه مسلم (٧٥٥).
(٣) أخرجه مسلم (٧٥٣، ٧٥٢).

دروستە بە سێ ڕکاتیش بکرێت، لە بەر فەرمودەکەی عائیشە ﵂ کە پەیامبەر ﷺ چوار ڕکاتی[1] دەکرد مەپرسە لە جوانی ودرێژیەکەی پاشان چواری تری دەکرد مەپرسە لە جوانی ودرێژیەکەی، پاشان سێ ڕکاتی دەکرد»[2].

دروستیشە ئەم سیانە بە دو سەلام بکرێت، چونکە عەبدولاّی کوڕی عومەر ﵄ لە دوەم دا سەلامی دەدایەوە بۆ فەرمان کردن بە هەندێك پێداویستی خۆی[3]. ودروستیشە پێکەوە بکرێت بە یەك تەحیات وسەلامێك، لە بەر فەرمودەکەی عائیشە ﵂ ئەڵێ: پەیامبەر ﷺ سێ ڕکات ویتری دەکرد دانەدەنیشت تەنها لە کۆتایی نەبێت[4]. بەڵام بە دو تەحیات وسەلامێك ناکرێت بۆ ئەوەی لە نوێژی مەغریب نەچێت وپەیامبەریش نەهی لەوە کردوە[5].

ودروستیشە ویتر بە حەوت ڕکات وبە پێنجیش بکرێت، دانانیشێت لە کۆتاییەکەی نەبێت، لە بەر فەرمودەکەی عائیشە ﵂: «پەیامبەر ﷺ سیانزە ڕکات شەو نوێژی دەکرد، پێنجیانی دەکردە ویتر، دا نەدەنیشت تەنها لە کۆتاییەکەی نەبێت»[6]. ولە بەر فەرمودەکەی ئوم سەلەمە ﵂: «پەیامبەر ﷺ حەوت یا پێنج ڕکات ویتری دەکرد، نە سەلامی تێدا دەدایەوە ونە قسەی تێدا دەکرد»[7].

---

(١) [مەبەستی دو دوە، بۆیەش ئەڵێ چوار، چونکە دوای چوار ڕکات شەکەتی دەر کردوە]
(٢) أخرجه مسلم (٧٣٨).
(٣) أخرجه البخاري (٩٩١).
(٤) أخرجه النسائي (١٦٩٨)، والبيهقي (٢٨/٣) واللفظ له، والحاكم (٣٠٤/١) وصححه على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي، وإسناد النسائي حسن، والبيهقي صحيح. انظر: «المجموع ١٧/٤».
(٥) أخرجه الدارقطني (٢٤/٢) وقال: «كلهم ثقات»، والبيهقي (٣١/٣) والحاكم (٣٠٤/١) وصححه على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي. «وإسناده على شرط الشيخين» «الفتح» (٥٥٨/٢).
(٦) أخرجه مسلم (٧٣٧).
(٧) أخرجه ابن ماجه (١١٩٢)، وصححه الألباني في «صحيح سنن ابن ماجه» (٩٨٠).

## پرسی حەوتەم: ئەو کاتانەی نەهی کراوە سوننەتی تێدا بکرێت:

هەندێك کات هەیە نوێژی سوننەت کردن تێیدا نەهی لـێ کـراوە -مەگـەر ئـەوەی هەڵاوێر کراوە- کە بریتین لە پێنج کات:

**یەکەم:** لە دوای نوێژی بەیانیەوە تا خۆر دەرچون، لە بـەر فەرمودەکـەی پەیامبـەر ﷺ: «لَا صَلَاةَ بَعْدَ صَلَاةِ الْفَجْرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ» «لـە دوای نوێـژی بەیانیـەوە نوێژ نیە هەتا دەرچونی خۆر»[1].

**دوەم:** لە دەرچونی خۆرەوە تا بەرز بونەوەی بە ئەندازەی ڕمێك لە پـێش چـاودا کـە نزیکەی مەترێك دەکات، ئێستاش دەکاتە نزیکەی چارەك یا سێ یەکی سەعاتێك، جا هەر کە خۆر بەرز بویەوە بە قەد ڕمێك ئیتر کاتی نەهی کۆتایی پـێ هـاتوە، چـونکە پەیامبەر ﷺ بە عەمری کوڕی عەبەسـەی فـەرمو: «صَلِّ صَلَاةَ الصُّبْحِ، ثُمَّ أَقْصِرْ عَنِ الصَّلَاةِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ حَتَّى تَرْتَفِعَ» «نوێژی بەیانی بکە پاشان واز بهێنە لە نوێژ کردن تا خۆر دەر دەچێت»[2]. ولە بەر فەرمودەکەی عوقبەی کوڕی عامر ﷺ کە دێت.

**سێیەم:** کە خۆر هاتە نێو جەرگەی ئاسمان تا دەست دەکات بە لادان بەرەو ڕۆژ ئـاوا وکاتی نوێژی نیوەڕۆ دێت، لە بەر فەرمودەکەی عوقبـەی کـوڕی عـامر ﷺ: «ثَلَاثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ أَوْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا: حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَزُولَ الشَّمْسُ، وَحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ» «سێ کات پەیامبەر ﷺ نەهی لێ دەکردین نوێـژی تێـدا

---

(١) أخرجه البخاري (٥٨٦)، ومسلم (٨٢٧)، واللفظ لمسلم.

(٢) أخرجه مسلم (٨٣٢).

بکەین ومردوی تێدا بنێژین، ئەو کاتەی خۆر هەڵ دێت تا بەرز دەبێتەوە، وئەو کاتـەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان ڕادەوەستێت تا دەست دەكات بە لادان، وئـەو کاتـەی خـۆر خوار دەبێتەوە بۆ ئاوا بون»[1].

**چوارەم:** لە نوێژی عەسرەوە تا خۆر دەست دەكات بە ئاوا بون، لە بـەر فـەرمودەی: «لَا صَلَاةَ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ، وَلَا صَلَاةَ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغِيبَ الشَّمْسُ» «لە دوای نوێژی بەیانی تا خۆر بـەرز دەبێتـەوە نوێـژ نیـە، هـەروەها دوای عەسریش تا خۆر ئاوا دەبێت»[2].

**کاتی پێنجەم:** کە دەستی کرد بە ئاوا بون تا ئاوا دەبێت، وەك لە فەرمودەکە باس کرا.

کەواتە ئەم پێنج کاتە لە سێ کات دا کورت هەڵ هاتوە کە بریتیە لە:

دوای نوێژی بەیانی تا بەرز بونەوەی خۆر بە ئەندازەی ڕمێك، وکاتێك خۆر دێتە ناو جەرگەی ئاسمان تا لا دەدات، ودوای نوێژی عەسر تا خۆر ئاوا دەبێت.

**سەبارەت بەوەی حیکمەت چیە نەهی لە نوێژ کراوە لەم کاتانەدا:** پەیامبەر ﷺ باسی بۆ کردوین کە بێ باوەڕان خۆر دەپەرەستن لە کاتی دەرچونی وئاوا بونی دا، بۆیـە نوێژی موسڵمان لەو کاتانە دا خۆ چـواندنی تێدایـە بـەوان، ئـەوەتا لـە فەرمودەکـەی عەمری کوڕی عەبەسە ﷺ هاتوە[3]: «فَإِنَّهَا -أي: الشمس- تَطْلُعُ حِينَ تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ، وَحِينَئِذٍ يَسْجُدُ لَهَا الْكُفَّارُ... فَإِنَّهَا تَغْرُبُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ وَحِينَئِذٍ يَسْجُدُ لَهَا الْكُفَّارُ» «چونکە خۆر ئەو کاتەی هەڵ دێت لە نێوان شاخەکانی شەیتان هەڵ

---

(١) أخرجه مسلم (٨٣١).

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٥٨٦)، ومسلم (٨٢٧) [تقدم قريبًا].

(٣) أخرجه مسلم (٨٣٢) وقد تقدم.

دیت، ئیتر بێ باوەڕان کڕنوشی بۆ دەبەن... چونکە لەو کاتە دا لـە نیـوان شـاخەکانی شەیتان دا ئاوا دەبیت، ئیتر بێ باوەڕان کڕنوشی بۆ دەبەن».

ئەمە سەبارەت بە کاتی دەرچونی خۆر وئاوا بونی، بەڵام کاتی بەرز بونەوەیی وهاتنە ناو جەرگەی ئاسمان، ئەوە پەیامبەری خوا ﷺ هۆکارەکەی لـە فـەرمودەی پیشـو ڕون کردۆتەوە: «فَإِنَّ حِينَئِذٍ تُسْجَرُ جَهَنَّمُ» «چونکە ئەو کاتە دۆزەخ گڕ وتاو دەدریت».

جا دروست نیە نوێژی سوننەت بکریت لـەم کاتانـەدا مەگـەر بەڵگـە هاتبیـت بـە هەڵاویر کردنی، وەك دو ڕکاتی تەواف کردن، چونکە پەیامبەر ﷺ فەرموی: «يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ! لَا تَمْنَعُوا أَحَدًا طَافَ بِهَذَا الْبَيْتِ، وَصَلَّى أَيَّةَ سَاعَةٍ شَاءَ، مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ» «ئەی نەوەی عەبد موناف! ڕێ گر مەبن لە هەر کەس سوڕایەوە بە دەوری کەعبە دا ونوێژی تیدا کرد لە هەر کـاتیکی شـەو یـا ڕۆژ دا»[1]. هـەروەها قـەزا کردنـەوەی سوننەتی پیش نوێژی بەیانی، وقەزا کردنەوەی نیوەڕۆ دوای عەسر، بە تایبـەت ئەگـەر پیکەوە کۆی کردنەوە، هەروەها ئەو نوێژانەی کـە سـەبەب دارە، وەك نویـژی مـردو، وسلاوی مزگەوت، ونوێژی خۆر گیران، هەروەها قەزا کردنەوەی نوێژە لە دەست چوەکان لەم کاتانەدا، لەبـەر فەرمایشـتەکەی پەیامبـەر ﷺ: «مَنْ نَامَ عَنْ صَلَاةٍ أَوْ نَسِيَهَا، فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا» «هەر کەس نوێژیکی نەکرد خەوی لێ کەوت یا لـە بـیری چـوەوە ئەوا کەی هاتە بیری ئەنجامی دەدات»[2].

هەروەها چونکە فەرزەکان قەرزن پیوستە ئەنجام بدرین، جا کەی هاتە بیری ئەنجامی دەدات.

---

(١) أخرجه أبو داود (١٨٩٤)، والترمذي (٨٦٨)، وقال: حسن صحيح. وابن ماجه (١٢٥٤)، والحاكم (٤٤٨/١) وصححه، وافقه الذهبي، وصححه الألباني كما في «صحيح ابن ماجه ١٠٣٦».
(٢) أخرجه مسلم (٦٨٤).

# دەروازەی شەشەم

# لە بارەی سوژدەی سەهو، وقورئان خوێندن، وشوکرانە بژێریەوە

چەند پرسێکی تێدایە:

## پرسی یەکەم: دروستێتی سوژدەی سەهو وهۆکارەکانی:

مەبەست لێی: ئەو کڕنوشەیە کە داوا کراوە ببرێت لە کۆتایی نوێژدا بۆ قەرەبو کردنەوەی کەم وکورتیەك، یا زیادەیەك، یا گومانێك لە نوێژەکەدا.

سوژدەی سەهویش دروستە لە بەر فەرمایشتی پەیامبەر ﷺ: «إِذَا نَسِيَ أَحَدُكم فَلْيَسْجُد سَجْدَتَيْنِ» «ئەگەر کەسێکیتان لە نوێژەکەی دا شتێکی لە بیر چو، با دو سوژدە ببات»[1]. زانایانیش کۆکن لە سەر دروستێتی سوژدەی سەهو.

هۆکارەکانیشی سیانە: زیاد کردن، کەم کردن، گومان بون.

## پرسی دوەم: کەی واجب دەبێت:

سوژدەی سەهو واجب دەبێت لەم حاڵەتانەی خوارەودا:

١. ئەگەر کارێك زیاد بکات لە ڕەگەزی نوێژ، وەك ئەوەی ڕکوعێك یا سوژدەیەك یا وەستانێك یا دانیشتنێك زیاتر بکات با بە ئەندازەی دانیشتنی «شەکەتی دەر کردن= جلسة الاستراحة»ش بێت، لە بەر فەرمودەکەی ئیبن مەسعود ﷺ: «پەیامبەر ﷺ پێنج ڕکاتی بۆ کردین، کە سەلامی دایەوە ورتە ورتە لە ناو خەڵك

---

(١) أخرجه أبو داود (١٨٩٤)، والترمذي (٨٦٨)، وقال: حسن صحيح. وابن ماجه (١٢٥٤)، والحاكم (٤٤٨/١) وصححه، ووافقه الذهبي، وصححه الألباني كما في «صحيح ابن ماجه» (١٠٣٦).

دا دروست بو، فەرموی: «ما شأنكم؟» چیتانەوە؟ وتیان: ئەی پەیامبەری خوا! ئایا نوێژ زیاد کراوە؟ فەرموی: نەخێر، وتیان: جەنابتان پێنج رکاتتان کرد، ئەوەبو گەڕایەوە ودو سوژدەی برد وپاشان سەلامی دایەوە، ئینجا فەرموی: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ، فَإِذَا نَسِيَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ» «منیش مرۆڤێکم وەکو ئێوە شتم لە بیر دەچێت چۆن ئێوە شتتان لە بیر دەچێت، جا ئەگەر کەسێکتان لە بیری چو با دو سوژدە ببات»[1]. جا ئەگەر زانی زیاتری کردوە وهێشتا لە نوێژ دا بو، ئەوا واجبە لە سەری کەی زانی [وازی لێ بهێنیت] ئەگەر تەنانەت لە رکوعیشدا بێت، چونکە ئەگەر بەردەوام بێت لە سەر زیادەکە وبشزانێت ئەوا شتێکی لە نوێژ دا زیاد کردوە بە ئەنقەست وشتی واش دروست نیە.

٢. یا سەلام بداتەوە پێش تەواو کردنی نوێژەکەی، لە بەر فەرمودەکەی عیمرانی کوڕی حوصەین ﵁: «پەیامبەری خوا ﷺ لە نوێژی عەسر، لە سێیەم ڕکات دا سەلامی دایەوە، پاشان هەستا وچوە حوجرەکەیەوە، پیاوێکی دەست درێژیش هەستا وتی: نوێژ کورت بۆتەوە؟ ئەوەبو پەیامبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە وئەو ڕکاتەی کرد کە لە بیری چو بو، پاشان سەلامی دایەوە وپاشان دو ڕکات سوژدەی سەهوی برد وئینجا سەلامی دایەوە»[2].

٣. یا واجبێك واز لێ بهێنێت، لە بەر فەرمودەکەی ئیبن بوحەینە ﵁ ئەڵێ: «لە یەکێك لە نوێژەکاندا پەیامبەر ﷺ دو ڕکاتی بۆ کردین پاشان هەستایەوە ودانەنیشت، خەڵکیش لەگەڵیدا هەستایەوە، کە لە تەحیات بویەوە چاوەڕێی

---

(١) أخرجه مسلم (٥٧٢).
(٢) أخرجه مسلم (٥٧٤).

سەلامدانەوەمان دەکرد، «(الله أكبر)ی کرد وهەر بە دانیشتنەوە دو سوژدەی برد، پاشان سەلامی دایەوە»[1]. ئەمەی فەرمودەکە لەبارەی نەکردنی تەحیاتی ناوەڕاستەوەیە جا واجبەکانی تریش قیاس دەکرێتە سەری، وەك نەکردنی تەسبیحاتەکان لە ڕکوع وسوژدەدا، هەروەها نەوتنی: «رَبِّ اغْفِرْ لِي» لە نێوان دو سوژدەکە، هەروەها «(الله أكبر)» کردن لە بەینەکان دا.

(٤) هەروەها سوژدەی سەهو واجبە ئەگەر گومانی هەبو لە ژمارەی ڕکاتەکان ونەیزانی چەندێکی کردوە؟ ئەمەش لە ناو نوێژ دا، لە بەر ئەوەی بەشێکی نوێژەکەی ئەنجام داوە لە کاتێکدا ڕا ڕا بوە ئایا هەر بەشێکە لە نوێژەکەی یا زیادەیە، بۆیە نیەتەکەی لاواز بوە وپێویستی بە سوژدە بردنە بۆ قەرەبو کردنەوە، ئەمەش لە بەر گشتی فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە کە پەیامبەر ﷺ فەرمویەتی: «إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ يُصَلِّي جَاءَهُ الشَّيْطَانُ فَلَبَسَ عَلَيْهِ، حَتَّى لَا يَدْرِيَ كَمْ صَلَّى. فَإِذَا وَجَدَ ذَلِكَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ» «ئەگەر کەسێکتان هەستا نوێژی کرد، شەیتان دێت بۆ لای ونوێژەکەی لێ تێك دەدات تا وای لێ دەکات نازانێت چەند ڕکاتی کردوە، جا ئەگەر کەسێکتان وای لێ هات با دو سوژدە ببات هەر بە دانیشتنەوە»[2].

**لەم حاڵەتەشدا لە نێوان دو شتدایە:**

- یا گومان «شَكّ»ـە وهیچ لایەکی گومانەکەی پارسەنگ نیە. لەم حاڵەتەدا لای کەمترەکە وەردەگرێت وبینای لە سەر دەکات، پاشان سوژدەی سەهو دەبات، لە

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٢٣٠)، ومسلم (٥٧٠).
(٢) أخرجه البخاري (١٢٣١)، ومسلم (٣٨٩).

بەر فەرمودەی: «إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى ثَلَاثًا أَمْ أَرْبَعًا، فَلْيَطْرَحِ الشَّكَّ وَلْيَبْنِ عَلَى مَا اسْتَيْقَنَ. ثُمَّ يَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ» «ئەگەر کەسێکتان گومانی هەبو لە نوێژەکەی دا ونەیزانی چەند ڕکاتی کردوە سێ یا چوار، با گومانەکەی وە لا بنێت ولە سەر دڵنیایی بونیاد بنێت، پاشان پێش سەلام دانەوە با دو سوژدە ببات»[1].

- بەڵام ئەگەر لایەکی گومانەکەی لا زاڵتر وپارسەنگ بو، ئەوە ئیشی پێ دەکات وبونیادی لە سەر دەکات، بەڵام هەر دو سوژدەی سەهو دەبات، لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ لە بارەی کەسێك گومان وڕا ڕا بێت: «فَلْيَتَحَرَّ الصَّوَابَ، فَلْيُتِمَّ عَلَيْهِ -أي على التحري- ثُمَّ لِيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ» «با بە دوای ڕاستەکە بگەڕێت پاشان نوێژەکەی لە سەر بونیاد بنێت ئینجا با سەلام بداتەوە پاشان با دوای سەلام دانەوە دو سوژدە ببات»[2].

## پرسی سێیەم: کەی سوژدەی سەهو سوننەتە؟

سوننەتە سوژدەی سەهو ببردرێت ئەگەر بە سەهو لە نوێژەکەیدا قسەیەکی شەرعی کرد جێگای خۆی نەبو، وەك قورئان خوێندن لە ڕکوع وسوژدە، وتەحیات خوێندن بە پێوە سەرباری وتنی زیکرە شەرعیەکانی ئەو شوێنانە، بۆ نمونە: لە گەڵ تەسبیحاتەکاندا قورئانیش بخوێنێ، ئەمەش لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر[3]: «إِذَا نَسِيَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ» «ئەگەر کەسێکتان لە بیری چو با دو سوژدە ببات».

(١) أخرجه مسلم (٥٧١).
(٢) أخرجه مسلم (٥٧٢).
(٣) أخرجه مسلم (٥٧٢) إثر (٩٢).

## پرسی چوارەم: شوێن وشێوازەکەی:

١. **شـوێنەکەی:** گومـانی تێـدا نیـە کـە شـوێنی بردنـی سـوژدەی سـەهو لـە فەرمودەکاندا ئەبێتە دو بەشەوە: بەشێکیان بەڵگەن لـە سـەر ئـەوەی پـێش سـەلام دانەوەیە، وبەشەکەی تریش بەڵگەن لە سەر پاش سەلام دانەوە، هەر بۆیە هەندێك لە زانا موحەقیقەکان ئەڵێن: نوێژگەر سەر پشکە ویستی پێش سەلام دانـەوە ئـەیبات، ویستیشی دوای دەخات، چونکە فەرمودەکان بە هەردو حاڵەتەکە هاتون، بۆ یـە لـە هەر دو حاڵەتەکە پێش سەلام دانەوە یا پاش سەلام دانەوە سوژدە ببات دروستە.

٢. **شێوازەکەی:** کڕنوشی سـەهو دو سـوژدەیە وەك سـوژدەی نوێـژ، لـە هـەمو سوژدەیەکدا الله أكبر دەکـات بـۆ کڕنـوش وهەسـتانەوە، پاشـان سـەلام دەداتـەوە. هەندێکیش ئەڵێن: ئەگەر دوای سەلام دانـەوە بـو تـەحیاتیش دەخوێنێـت، لـە بـەر ئەوەی ئەمە لە سێ فەرمودەی پەیامبەر ﷺ هاتوە وبە هەمویەوە ئەبێتـە حەسـەن وەك حافظ ئیبن حەجەر ئەڵێ[1].

## پرسی پێنجەم: سوژدەی قورئان خوێندن (سجدة التلاوة):

١. **دروستێتی وحوکمەکەی:** شەرعیە سـوژدە ببردرێـت لـە کـاتی خوێنـدن یـا بیستنی ئەو ئایەتانەی سوژدەی تێدایە. ئیبن عومەر ﷺ ئـەڵێ[2]: «پەیامبـەر ﷺ سورەتە سوژدە دارەکانی بە سەرماندا دەخوێند، جا سوژدەی دەبرد وئێمەش لەگەڵیـدا سوژدەمان دەبرد تەنانەت هەمان بو شوێنێکی دەسـت نەدەکـەوت نـاو چـاوانی تێـدا

---

(١) انظر: «فتح الباري» (١١٩/٣).

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٠٧٦)، ومسلم (٥٧٥).

دابنێت»، وله سەر ڕای ڕاست سوننەته، واجب نیه، جا زەیدی کوڕی سابت ﵁ ﴿والنجم﴾ی به سەر پەیامبەر ﷺ خوێند وزەید سوژدەی نەبرد[1]. کەواته واجب نیه.

وشەرعیه قورئان خوێن وگوێ گر سوژده ببەن ئەگەر ئایەتێکی سوژده داری خوێند له نوێژدا بو یا له دەرەوەی، له بەر ئەوەی پەیامبەر ﷺ کاتێك ئایەتی سوژده داری خوێندوه وای کردوه، وهەروەها له بەر سوژده بردنی هاوەڵان له گەڵیدا وەك له فەرمودەکەی ئیبن عومەر ﵄ باس کرا: «سوژدەی دەبرد، ئێمەش سوژدەمان دەبرد». بەڵگەش له سەر ڕەوایەتی بردنی له نوێژدا ئەوەیه که بوخاری وموسلیم دەیگێڕنەوه له ئەبو ڕافعەوه ﵁ ئەڵێ[2]: نوێژی عیشام کرد لەگەڵ ئەبو هورەیرەدا ﵁ ئەوەبو ﴿إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ﴾ی خوێند وسوژدەی برد، وتم: ئەمە چیه؟ وتی: له پشتی باوکی قاسمەوه ﷺ سوژدەم تێدا بردوه، بۆیه بەردەوام دەبم له سەری تا پێی دەگەمەوه». بەڵام که خوێنەر سوژدەی نەبرد گوێگریش نایبات، چونکه گوێگر لەگەڵ خوێنەره، هەروەها له بەر فەرمودەکەی زەیدی کوڕی سابتی پێشو که زەید سوژدەی نەبرد پەیامبەریش ﷺ نەیبرد.

٢. **فەزڵەکەی:** له ئەبو هورەیرەوه ﵁ له پەیامبەرەوه ﷺ فەرمویەتی[3]: «إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ، فَسَجَدَ اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِي يَقُولُ: يَا وَيْلَهُ أُمِرَ ابْنُ آدَمَ بِالسُّجُودِ، فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ، وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَأَبَيْتُ فَلِيَ النَّارُ» واته: «ئەگەر

---

(١) أخرجه البخاري (١٠٧٣).

(٢) أخرجه البخاري (١٠٧٨)، ومسلم (٥٧٨) واللفظ للبخاري.

(٣) أخرجه مسلم (٨١).

ئادەمیزاد سورەتە سوژدە دارەکانی خوێند وسوژدەی برد، شەیتان پشت هەڵ دەکات ودەگری ئەڵێ: تیا بچم، ئادەمیزاد فەرمانی پێ کرا سوژدە ببات وبردی، بۆیە بەهەشتی بۆ هەیە، منیش فەرمانم پێ کرا ونەمبرد بۆیە ئاگرم بۆ هەیە»

٣. **شێوازەکەی:** تەنها یەك سوژدە دەبات، و«الله أكبر»ی بۆ دەکات، ولە سوژدەکەی ئەڵێت: «سبحان ربي الأعلى» وەك لە سوژدەی نوێژ دەیڵێت، هەروەها ئەڵێت: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي»[1]. ئەگەریش بڵێ: «سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ» «ناوچەوان لە ئەرز دادەنێم بۆ ئەو پەروەرینەی دەم وچاوی خولقاندوم، بە دەسەڵات وتوانای خۆی بیستن وبینای پێ کەرەم کردوم»[2] ئەوە هیچی تێدا نیە.

٤. **شوێنەکانی سوژدەی قورئان خوێندن لە قورئاندا:**

شوێنەکانی سوژدەی قورئانی پیرۆز پانزە شوێنە، بەم ڕیزبەندیەی خوارەوە:

١. کۆتایی سورەتی «الأعراف» ئایەتی ژمارە (٢٠٦).

٢. سورەتی «الرعد» ئایەتی ژمارە (١٥).

٣. سورەتی «النحل» ئایەتی ژمارە (٤٩-٥٠).

٤. سورەتی «الإسراء» ئایەتی ژمارە (١٠٧-١٠٩).

٥. سورەتی «مریم» ئایەتی ژمارە (٥٨).

---

(١) [أخرجه البخاري (٤٩٦٨) ومسلم (٤٨٤)].

(٢) أخرجه الترمذي (٥٨٥)، وقال: «حسن صحيح»، وهو في «صحيح الترمذي» (٤٧٤).

٦. لە سەرەتای سورەتی «الحج» ئایەتی ژمارە (١٨).

٧. لە کۆتایی سورەتی سورەتی «الحج» ئایەتی ژمارە (٧٧).

٨. سورەتی «الفرقان» ئایەتی ژمارە (٧٣).

٩. سورەتی «النمل» ئایەتی ژمارە (٢٥-٢٦).

١٠. سورەتی «السجدة» ئایەتی ژمارە (١٥).

١١. سورەتی «فصلت» ئایەتی ژمارە (٣٧-٣٨).

١٢. کۆتایی سورەتی «النجم» ئایەتی ژمارە (٦٢).

١٣. سورەتی «الانشقاق» ئایەتی ژمارە (٢٠-٢١).

١٤. کۆتایی سورەتی «العلق» ئایەتی ژمارە (١٩).

پانزەهەمینیش: بریتیە لە سوژدەی سورەتی «ص»، ئەمەش سوژدەی شوکرە، ئیبن عەبباس ئەڵێ: «سورەتی «ص» لە عەزیمەتەکانی سوژدە نیە[1]، پەیامبەریشم ﷺ بینیوە سوژدەی تێدا بردوە»[2].

## پرسی شەشەم: سوژدەی شوکر:

ئەگەر کەسێك نیعمەتێکی بەسەردا ڕژا، یا بەڵایەکی لێ دور کەوتەوە، یا مژدەیەکی خۆشی پێ درا؛ سوننەتە سوژدە ببات، وچاو لە پەیامبەر بکات ﷺ، مەرجیش نیە ڕوی لە قیبلە بێت، خۆ ئەگەر ڕویشی لێ کرد باشترە.

(١) [واتە: لە ئەو شتانە نیە کە عەزیمەت هاتبێت لە سەر کردنی، وەك فەرمان کردن].
(٢) أخرجه البخاري (١٠٦٩).

پەیامبەر ﷺ وای دەکرد، ئەوەتا لە «ئەبو بەکرە»وە ﷺ هاتوە: «ئەگەر پەیامبەر هەواڵی دڵخۆش کاری بۆ بهاتبا ئەڕۆیشتە سوژدە وەکو شوکرانە بژێری خوا ﷻ»[1]. هەروەها هاوەڵانیش وایان کردوە.

وحوکمی ئەم شوژدەیە هەمان حوکمی سوژدەی قورئان خوێندنە، هەروەها شێواز وچۆنیەتیەکەشی.

(١) أخرجه أبو داود (٢٧٧٤)، والترمذي (١٥٧٨)، وابن ماجه (١٣٩٤)، وقال الترمذي: «هذا حديث حسن غريب لا نعرفه إلا من هذا الوجه». وحسنه الألباني في «الإرواء» (٢/٢٢٦).

# دەروازەی حەوتەم

# لە بارەی نوێژی کۆمەڵەوە

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: فەزڵ وحوکمی نوێژی جەماعەت:

(١) **فەزڵەکەی:** نوێژی جەماعەت لە مزگەوتەکاندا دروشمێکی مەزنە لە دروشمەکانی ئیسلام، موسڵمانان کۆکن لە سەر ئەوەی بە جێگەیاندنی پێنج فەرزەکە لە مزگەوتەکاندا لە گەورەترین پەرستشەکانە، خوا لە هەندێك کاتی دیاری کراودا کۆبونەوەی بۆ موسڵمانان داناوە، لەوانە پێنج فەرزەکە، ونوێژی جومعە، ونوێژی دو جەژنەکە ونوێژی خۆر ومانگ گیران. ولە هەموی گەورەتر وگرنگتر کۆبونەوەی ڕۆژی عەرەفەیە، کە ئاماژەیە بۆ یەکڕیزی ئوممەتی ئیسلام لە بیر وباوەڕ وپەرستنی ودروشمەکانی دینەکەیدا.

ئەم کۆبونەوە مەزنانەش لە ئیسلامدا دانراوە لە پێناو بەرژەوەندی موسڵمانان؛ تێیدا بە یەك دەگەن وهەواڵی یەکتر دەپرسن تا کۆتایی ئەو شتانەی کە گرنگە بۆ ئوممەتی ئیسلام بە جیاوازی گەل وخێڵەکانیانەوە، وەك خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ [الحجرات:١٣]. «ئەی خەڵکینە ئێمە، ئێوەمان دروست کردوە لە یەك باوك ویەك دایك کە ئادەم وحەوایە، بۆیە کەس ڕەچەڵەکی لەوی تر باشتر نیە، ئێوەشمان لە ڕێی وەچەخستنەوەوە کردوە بە چەند گەل وخێڵێکی جیاواز، بۆ یەکتر ناسین، بەڕێزترینیشتان لە لای خوا خۆپارێزترینتانە».

پەیامبەریش ﷺ هانی لە سەر داوە وفەزڵ وگەورەیی پاداشتەکەی ڕون کردۆتەوە، دەفەرموێ: «صَلَاةُ الْجَمَاعَةِ أَفْضَلُ مِنْ صَلَاةِ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً»[1] «نوێژی کۆمەڵ باشترە لە نوێژی تاك بە بیست وحەوت پلە». هەروەها ئەفەرموێ: «صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي الْجَمَاعَةِ تُضَعَّفُ عَلَى صَلَاتِهِ فِي بَيْتِهِ وَفِي سُوقِهِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ ضِعْفًا، وَذَلِكَ أَنَّهُ: إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ، لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا الصَّلَاةُ، لَمْ يَخْطُ خُطْوَةً، إِلَّا رُفِعَتْ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ، وَحُطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ، فَإِذَا صَلَّى، لَمْ تَزَلِ الْمَلَائِكَةُ تُصَلِّي عَلَيْهِ، مَا دَامَ فِي مُصَلَّاهُ...»[2] «نوێژی پیاو بە کۆمەڵ بیست وپێنج جار زیاترە لە نوێژەکەی لە ماڵی وبازاڕەکەیدا، ئەمەش بەوەیە: کە دەست نوێژی گرت، دەست نوێژێکی جوان، پاشان دەرچو بۆ مزگەوت -هیچ دەری ناکات لە ماڵ نوێژ نەبێت- ئەوا یەك هەنگاو نانێت مەگەر پلەیەك بەرز دەبێتەوە، وتاوانێکی لە سەر دەسڕێتەوە، کە نوێژی کرد بەردەوام فریشتە نزای بۆ دەکەن تا لە شوێن نوێژەکەی خۆی بێت...» تا کۆتایی.

٢. **حوکمەکەی:** نوێژ بە جەماعەت واجبە لە پێنج فەرزەکەدا، بەڵگەش لە سەر ئەمە قورئان وفەرمودەیە، لە قورئاندا: ﴿وَإِذَا كُنْتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَاةَ فَلْتَقُمْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ مَعَكَ﴾ [النساء:١٠٢] «وئەگەر ئەی پەیامبەر لە گۆڕەپانی تێکۆشاندا بویت، ویستت نوێژیان بۆ بکەیت، ئەوا با کۆمەڵێکیان هەستن بۆ نوێژ کردن لە گەڵتدا». فەرمانیش بۆ واجبێتیە، جا ئەگەر لە ترسدا بێ، لە ئاسایشدا لە پێشترە.

(١) أخرجه البخاري (٦٤٥، ٦٤٦)، ومسلم (٦٥٠).
(٢) أخرجه البخاري (٦٤٧).

لە سوننەتیشدا فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ پەیامبەر ﷺ فەرموی: «إِنَّ أَثْقَلَ صَلاَةٍ عَلَى الْمُنَافِقِينَ صَلاَةُ الْعِشَاءِ وَصَلاَةُ الْفَجْرِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا. وَلَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِالصَّلاَةِ فَتُقَامَ، ثُمَّ آمُرَ رَجُلًا فَيُصَلِّيَ بِالنَّاسِ. ثُمَّ أَنْطَلِقَ مَعِي بِرِجَالٍ مَعَهُمْ حُزَمٌ مِنْ حَطَبٍ إِلَى قَوْمٍ لاَ يَشْهَدُونَ الصَّلاَةَ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ بِالنَّارِ»[1] «قورسترین نوێژ لە سەر مونافیقەکان نوێژی عیشا ونوێژی بەیانیانە ئەگەر بیانزانیایە چ پاداشتێکی تێدایە ئەوا بە گاوڵکێش ببوایە ئامادەی دەبون. بێگومان نیازم کرد فەرمان بکەم نوێژ دا ببەسترێت، پاشان فەرمان بکەم بە پیاوێك نوێژ بۆ خەڵك بکات، ئینجا چەند پیاوێك لەگەڵ خۆمدا ببەم کە چەند باوەشێك چیلکە وداریان پێ بێت، بۆ ئەوانەی ئامادەی نوێژ نابن، تا ماڵەکانیان بە سەردا بسوتێنم». جا ئەم فەرمودە بەڵگەیە لە سەر واجبێتی نوێژی کۆمەڵ، ئەمەش لە بەر ئەوەی: یەکەم: وەسفی نەهاتوەکان دەکات بە نیفاق، بەلام ئەنجام نەدەری سوننەت پێی ناوترێت مونافیق، کەواتە ئەوان لە واجبێك دوا کەوتون. دوەم: نیازی هەبوە سزایان بدات لە سەر نەهاتن، سزادانیش لە سەر نەکردنی واجبێك دەبێت، ئەوەشی رێگر بو لە جێ بەجێ نەکردنی سزاکە ئەوەیە کەس سزا بە ئاگر نادات مەگەر دروستکەری ئاگر، وتراویشە: بە هۆی ئەو ژن ومندالانەیە کە لە ماڵەکاندان ونوێژی کۆمەڵیان لە سەر واجب نیە[2].

هەروەها: پیاوێکی نابینا کەسیش نەبوە دەستی بگرێت داوای هێڵان «ئیزن»ی کرد لە پەیامبەری خوا ﷺ کە لە ماڵەکەی خۆیدا نوێژ بکات ئەویش هێڵای، کە

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٦٤٤)، ومسلم (٦٥١).

(٢) لە «مسند أحمد» (٣٦٧/٢) هاتوە، وئەلبانی بە لاوازی داناوە: «ضعيف الترغيب والترهيب».

پشتی هەڵکرد بانگی کرد وفەرموی: «هَلْ تَسْمَعُ النِّدَاءَ بِالصَّلَاةِ؟» «ئایا گوێت لە بانگ ئەبێت؟»، فەرموی: بەڵێ. فەرموی: «فَأَجِبْ» «کەوایە وەڵامی دەوە»[1].

هەروەها ئەفەرمویﷺ: «مَنْ سَمِعَ النِّدَاءَ فَلَمْ يُجِبْ، فَلَا صَلَاةَ لَهُ إِلَّا مِنْ عُذْرٍ» «هەر کەس گوێی لە بانگ بێت وەڵامی نەداتەوە ئەوا نوێژی بۆ نیە مەگەر عوزری هەبێت»[2]. ولە بەر وتەکەی ئیبن مەسعود ﷺ: «وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا وَمَا يَتَخَلَّفُ عَنْهَا إِلَّا مُنَافِقٌ مَعْلُومُ النِّفَاقِ» «سوێند بێت ئێمەت دەبینی کەس دوا نەدەکەوت لە نوێژی کۆمەڵ مەگەر مونافیقێکی ئاشکرا»[3].

نوێژی کۆمەڵیش واجبە لە سەر پیاوان نەك ئافرەتان ومنداڵە پێ نەگەیشتوەکان، لە بەر فەرمایشتی پەیامبەر ﷺ دەرهەق بە ئافرەتان: «وَبُيُوتُهن خَيْرٌ لَهُنَّ» «ومالەکانیان باشترە بۆیان»[4]. ورێگریش نیە [منداڵی پێنەگەیشتو و] ئافرەتان ئامادەی نوێژی کۆمەڵ بن لە مزگەوتدا بە داپۆشراوی وپارێزرواى، ودوور بون لە فیتنەوە، وناشبێت ئەگەر داوای هێلانی کرد لە مێردەکەی بۆ مزگەوت، ڕێگری لێ بکات.

نوێژی کۆمەڵیش لە سەر ڕای ڕاست واجبە لە سەر هەر کەسێك نوێژی لە سەر بێت. وهەر کەس واز لە نوێژی کۆمەڵ بهێنێت ویە تەنها بیکات نوێژەکەی دروستە، بەڵام تاوانبارە لەبەر نەکردنی واجبێك.

(١) أخرجه مسلم (٦٥٣).
(٢) أخرجه أبو داود (٥٥١)، وابن ماجه (٧٩٣)، والحاكم (١/٢٤٥)، وصححه على شرط الشيخين، وصححه الألباني في «صحيح ابن ماجه» (٦٤٥).
(٣) أخرجه مسلم (٦٥٤).
(٤) أخرجه أبو داود (٥٦٧)، وأحمد (٢/٧٦)، والحاكم (١/٢٠٩)، وصححه، ووافقه الذهبي وصححه الألباني في «الإرواء» (٥١٥).

## پرسی دووەم: نوێژی کردوە، وچوە مزگەوتەوە: ئایا لە سەریەتی ئەو نوێژە بکاتەوە بە کۆمەڵ یا نا؟

واجب نیە لە سەری بە کۆمەڵ دوو بارەی بکاتەوە، بەڵام سوننە، ونوێژی یەکەمیشی فەرزە ودوەمیشی ئەبێتە سوننەت، لەبەر فەرمودەکەی ئەبو زەڕ ﷺ، پەیامبەر ﷺ فەرمویەتی: «كَيْفَ أَنْتَ إِذَا كَانَتْ عَلَيْكَ أُمَرَاءُ يُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ عَنْ وَقْتِهَا أَوْ يُمِيتُونَ الصَّلَاةَ عَنْ وَقْتِهَا؟ قَالَ: قُلْتُ: فَمَا تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: صَلِّ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، فَإِنْ أَدْرَكْتَهَا مَعَهُمْ فَصَلِّ فَإِنَّهَا لَكَ نَافِلَةٌ» «چی دەکەیت ئەگەر کۆمەڵێك کاریان گرت بە دەستەوە نوێژەکانیان لە کاتی خۆیدا دوا دەخست یا نوێژەکە لە کاتی خۆیدا دەمرێنن؟ ئەڵێ: وتم: فەرمانم بە چی پێ دەکەیت؟ فەرموی: نوێژ لە کاتی خۆیدا بکە، جا ئەگەر لەگەڵ ئەوانیشدا کردت بۆت دەبێتە سوننەت»[1].

هەروەها لەبەر ئەوەی پەیامبەر ﷺ بەو دو پیاوەی دوریان گرتبو لە نوێژی جەماعەت لە مزگەوت، فەرموی: «إِذَا صَلَّيْتُمَا فِي رِحَالِكُمَا، ثُمَّ أَتَيْتُمَا مَسْجِدَ جَمَاعَةٍ، فَصَلِّيَا مَعَهُمْ، فَإِنَّهَا لَكُمَا نَافِلَةٌ» «ئەگەر لە ماڵی خۆتان نوێژتان کرد وپاشان چونە نوێژی جەماعەت، لەگەڵیاندا نوێژ بکەن، بۆتان دەبێتە سوننەت»[2].

## پرسی سێ یەم: کەمترین ژمارە کە نوێژی کۆمەڵی پێ دادەبەسترێ:

کەمترینی کۆمەڵ دوانە بە بێ جیاوازی، لە بەر ئەوەی پەیامبەر ﷺ بە مالکی کوڕی حوەیرسی ﷺ فەرمو: «إِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ فَأَذِّنَا ثُمَّ أَقِيمَا، وَلْيَؤُمَّكُمَا

---

(١) أخرجه مسلم (٦٤٨).

(٢) أخرجه أبو داود (٥٧٥، ٥٧٦)، والترمذي (٢١٩)، والنسائي (١١٢/٢). قال الترمذي: «حسن صحيح». وصححه الألباني في «صحيح الترمذي» (١٨١).

أَكْبَرُكُمَا» «هەر دوكتان: كە كاتی نوێژ هات، ئەوا بانگ بدەن وپاشان قامەت بكەن، وبا گەورەكەتان بەر نوێژی بكات»[1].

## پرسی چوارەم: بە چی دەگەیتە جەماعەت؟

بە گەیشتنە یەك ڕكات دەگەیتە نوێژی كۆمەڵ، هەر كەسێكیش بگاتـە كرنـوش وگومانی نەبێت ئەوا گەیشتۆتە كڕنوشەكە ودرێژەی پێ دەدات. لە بەر فەرمودەكەی ئەبو هـورەیرە ﷺ: «إِذَا جِئْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ وَنَحْنُ سُجُودٌ فَاسْجُدُوا، وَلَا تَعُدُّوهَا شَيْئًا، وَمَنْ أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ» «ئەگەر هاتن بۆ نوێژ وئێمە لـە سـوژدە بوین، ئەوا بڕۆنە سوژدە، هەر كەسیش گەیشتە ڕكوع ئەوا گەیشتۆتە نوێژ»[2].

## پرسی پێنجەم: كێ عوزری هەیە نەیەت بۆ نوێژی كۆمەڵ؟

موسڵمان پۆزشی هەیە نەیەت بۆ نوێژی كۆمەڵ لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:

(١) نەخۆش؛ نەخۆشێك زۆر قورسە لە سەری بڕوات بۆ نوێـژی كۆمـەڵ، لـە بـەر ئایـەتی: ﴿لَيْسَ عَلَى الْأَعْمَى حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ﴾ [الفتح: ١٧]، «ئەی خەڵكینە! كوێرەكانتان تاوانیان لە سەر نیـە، هـەروەها شەل تاوانی لە سەر نیە، هەروەها نەخۆش تاوانی لە سەر نیە ئەگـەر دواكـەوتن لـە تێكۆشان لە پێناو خوادا». ولە بەر ئـەوەی كاتێـك پەیامبـەر ﷺ نـەخۆش كـەوت نەهات بۆ مزگەوت، وفەرموی: «مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ»[3]، «فەرمان بكەن بە ئەبو بەكر نوێژ بۆ خەڵك بكات»، ولە بەر وتەكـەی ئـیبن مەسـعود ﷺ: «لَقَدْ رَأَيْتُنَا

(١) أخرجه البخاري (٦٥٨)، ومسلم (٦٧٤).
(٢) أخرجه أبو داود (٨٧٥)، وابن ماجه (٤٦٨)، وصححه الألباني (الإرواء: ٤٩٦).
(٣) متفق عليه: أخرجه البخاري (٧١٣)، ومسلم (٤١٨).

وَمَا يَتَخَلَّفُ عَنِ الصَّلَاةِ إِلَّا مُنَافِقٌ قَدْ عُلِمَ نِفَاقُهُ، أَوْ مَرِيضٌ»[1]، «واللە ئێمەت دەبینی کەسمان دوا نەدەکەوت لە نوێژ مەگەر مونافیقێکی ئاشکرا، یا نەخۆش» هەروەها کەسێکیش مەترسی نەخۆش کەوتنی هەبێت، چونکە هەروەك نەخۆشی وایە.

٢. تەنگەتاو بە میز یا پیسی یا خواردن ئامادە بێت وپێویستی پێ بێت، لە بەر فەرمودەکەی [پێشتری] عائیشە ﵂، بەرزی دەکاتەوە: «نوێژ نیە بە ئامادە بونی خواردن، هەروەها لە کاتی تەنگەتاویدا».

٣. هەر کەس ونبویەکی هەیە ویە تەمای گەڕانەوەیتی، یان دەترسێت ماڵەکەی یا خواردنەکەی زایە ببێت یا زیانێکی بەر بکەوێت. لە بەر فەرمودەکەی ئیبن عەبباس ﵄ بەرزی دەکاتەوە: «مَنْ سَمِعَ الْمُنَادِيَ فَلَمْ يَمْنَعْهُ مِنَ اتِّبَاعِهِ عُذْرٌ، - قَالُوا: وَمَا الْعُذْرُ؟ قَالَ: خَوْفٌ أَوْ مَرَضٌ- لَمْ تُقْبَلْ مِنْهُ الصَّلَاةُ الَّتِي صَلَّى» «هەر کەس گوێی لە بانگ بێت وهیچ بیانویەکی نەبێت بۆ نەچون، -وتیان: چی عوزرە؟ فەرموی: ترس یا نەخۆشی- ئەوا ئەو نوێژەی لێ وەرناگیرێت»[2]. هەروەها هەر کەسێك ترسی لە خۆی یان ماڵی یا خێزانی یا منداڵەکەی هەبێت، ئەوا عوزری هەیە نەیەتە جەماعەت، چونکە ترسان عوزرە.

٤. توشی ئازار هاتن بە هۆی باران وقوڕ وبەفر ویەستنەوە، یا بایەکی زۆر سارد لە شەوێکی تاریکدا. لە بەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر ﵄: «كان رَسُولُ اللهِ ﷺ

---

(١) أخرجه مسلم (٦٥٤) [هذا لفظه].

(٢) أخرجه أبو داود (٥٥١)، وهو ضعيف بهذا اللفظ، لكنه صحيح بلفظ: «من سمع النداء فلم يأته، فلا صلاة له إلا من عذر» «الإرواء» (٢/٣٣٦-٣٣٧).

يَـأْمُرُ الْمُـؤَذِّنَ إِذَا كَانَـتْ لَيْلَـةٌ بَـارِدَةٌ ذَاتُ مَطَـرٍ يَقُـولُ: أَلَا صَـلُّوا فِـي الرِّحَـالِ»[1]، «پەیامبەر ﷺ لە شەوی سەرمای باراناویدا فەرمانی دەکردە بانگ بێژەکە بڵێ: لـە ماڵەوە نوێژ بکەن».

٥. توشـی نارەحـەتی هـاتن بـە هـۆی درێـژ کردنـەوەی پـێش نوێـژەوە [درێـژ کردنەوەیەك دژی سوننەت بێت]؛ چونکە پیاوێك نوێژی لەگەڵ موعـازدا ﷺ کـرد، پاشان تەنها کەوت وبە تەنها نوێژی کرد بە هۆی نوێژ درێژ کردنەوەی موعازەوە، کە کابرا بە پەیامبەری خوای ﷺ وت، نکوڵی لێ نەکرد[2].

٦. ترسان لە جێهێشتنی هاو سەفەرەکان، چونکە ئەو کاتە بیری سـەرقاڵ ئـەبێت ئەگەر چاوەڕێی جەماعەت بکات، یا بچێتە جەماعەتـەوە، نـەوەك ون ببێـت وهـاو سەفەرەکانی جێی بهێڵن.

٧. ترسان لەوەی نزیکێکی بمرێت وئەمیش ئامادە نەبێت، وەك ئەوەی نزیکەکەی لە سەرە مەرگدا بێت وحەز بکات لەگەڵیدا بێـت وتـەلقینی بکـات بـە شـایەتومان وهاوشێوەکانی، ئەوسا عوزری دەبێت ئەگەر نەهات بۆ جەماعەت.

٨. وازنەهێنانی خاوەن قەرز، ئەمیش هیچی نیە بیداتەوە، ئەو کاتە بـۆی هەیـە واز لە جەماعەت بهێنێت، لە بەر ئەو ئازارەی توشی دێت بە هۆی داواکردنی خاوەن قەرز وازنەهێنانیەوە.

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٦٣٢)، ومسلم (٦٩٧). واللفظ لمسلم.
(٢) انظر: «صحيح مسلم» (٤٦٥).

## پرسی شەشەم: دوبارە کردنەوەی جەماعەت لە یەك مزگەوتدا؟

ئەگەر هەندێك دوا کەوتن لە ئامادەبونی نوێژی جەماعەتی مزگەوت لەگەڵ ئیمامی هەمیشەیی مزگەوت، ونوێژیان لە دەست چو، ئەوا دروستە جەماعەتێکی تر بکەن لە هەمان مزگەوتدا؛ لەبەر گشتێتی فەرمودەی: «[وَإِنَّ] صَلَاةَ الرَّجُلِ مَعَ الرَّجُلِ أَزْكَى مِنْ صَلَاتِهِ وَحْدَهُ...»[1]، واتە: «ونوێژی پیاو لەگەڵ یەکێکی تردا پاکتر وباشترە لەوەی بە تەنها بیکات... هتد»، ولەبەر فەرمایشتی پەیامبەر ﷺ بەو پیاوەی کە دوای نوێژی جەماعەت هاتە مزگەوتەوە، فەرموی: «[أَلَا] رَجُلٌ يَتَصَدَّقُ عَلَى هَذَا فَيُصَلِّي مَعَهُ؟» «کێ خێر دەکات بەم برایەی خۆی؛ نوێژی لەگەڵدا بکات؟» ئەوەبو یەکێکیان هەستا ونوێژی لەگەڵدا کرد[2].

هەروەها ئەگەر هاتو مزگەوتەکە ناو بازاڕ بو یا لە سەر ڕێگا وهاوشێوەکانی بو، ئەوا هیچی تێدا نیە جەماعەتی تێدا دوبارە بکرێتەوە، بە تایبەت ئەگەر ئەو مزگەوتە پێش نوێژی بەردەوامی نەبێت وئەوانەی لە بازاڕن وبە ئەوێدا تێ دەپەڕن زۆر دێن بۆ ئەوێ.

بەڵام ئەگەر مزگەوتەکە بە بەردەوامی دو جەماعەت یا زیاتری تێدا بو، خەڵکیش ئەمەیان کردبوە عادەت، ئەو کاتە دروست نیە؛ چونکە شتی وا لە سەردەمی پەیامبەر ﷺ وهاوەڵەکانیدا نەزانراوە، هەروەها پەرتەوازەیی تێدایە، هەروەها ئەبێتە مایەی تەمبەڵی وتەوەزەلی لە هاتن بۆ جەماعەتە سەرەکیەکە

(١) أخرجه أبو داود (٥٥٤)، والنسائي (١٠٤/٢)، وأحمد (١٤٠/٥)، والحاكم (٢٤٧/١). وصححه الحاكم. وذكر ابن حجر في «التلخيص الحبير» (٢٦/٢) تصحيح ابن السكن والعقيلي والحاكم وابن المديني له.

(٢) أخرجه الترمذي (٢٢٠) وأحمد (٥/٣). وحسنه الترمذي، وصححه الألباني «صحيح الترمذي» (١٨٢).

لەگەڵ پێش نوێژە هەمیشەییەکە، لەوانەشە ببێتە مایەی دواخستنی نوێژ لە سەرەتای کاتەکەی.

## پرسی حەوتەم: حوکمی نوێژ کردن ئەگەر نوێژی فەرز دابەسترا:

ئەگەر بانگ بێژ دەستی کرد بە دابەستنی نوێژی فەرز، ئەوا ئیتر بۆ کەس دروست نیە دەست بکات بە نوێژی سوننەت وبۆ خۆی بە تەنها سەرقاڵ بێت بە نوێژێکی سوننەتەوە لە بری نوێژێکی فەرزی کۆمەڵ، ئەمەش لەبەر حەدیسی: «إذا أقيمت الصلاة فلا صلاة إلا المكتوبة»[1] «ئەگەر نوێژ دابەسترا، نوێژی تر نیە مەگەر فەرزەکە». هەروەها پەیامبەر ﷺ پیاوێکی بینی نوێژی دەکرد وبانگ بێژیش نوێژی دادەبەست بۆ نوێژی بەیانی، پێی وت: «أَتُصَلِّي الصُّبْحَ أَرْبَعًا؟!»[2] «ئایا ئەتەوێ چوار ڕکات بکەی؟!».

بەڵام کە دەستی کرد بە نوێژە سوننەتەکەی، دواجار بانگ بێژ قامەتی کرد، ئەوا بە کورتی تەواوی دەکات لە بەر گەیشتن بە فەزڵی تەکبیرەی ئیحرام، هەروەها پەلەکردن بۆ چونە ناو فەرزەکەوە.

باشتریش وایە ئەگەر لە ڕکاتی یەکەم بو بیبڕێت وئەگەریش لە دوەم بو بە کورتی تەوای بکات وخۆی بگەیەنێتە جەماعەت.

---

(١) أخرجه مسلم (٧١٠).
(٢) أخرجه مسلم (٧١١) - ٦٦.

# دەروازەی هەشتەم

# لە بارەی بەر نوێژیەوە

مەبەستیش لە پێش نوێژی: پەیوەندی نوێژی پاش نوێژە بە پیشەواوە.

چەند پرسێکیشی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: کێ شایستەترینە بۆ پێش نوێژی کردن؟

لەم فەرماشتەدا پەیامبەر ﷺ ڕونی کردۆتەوە کە کێ لە پێشترە بۆ ئیمامەت: «يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللهِ، فَإِنْ كَانُوا فِي الْقِرَاءَةِ سَوَاءً فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا فِي السُّنَّةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً، فَإِنْ كَانُوا فِي الْهِجْرَةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ سِلْمًا»(١). «شارەزاترین بە قورئان خوێندن بەر نوێژی دەکات، ئەگەر لە قورئان خوێندن یەکسان بون ئەوا شارەزاترینیان بە سوننەت، ئەگەریش لە سوننەتدا یەکسان بون، ئەوا لە پێشترینیان لە کۆچکردندا، ئەگەر لە کۆچکردنیش یەکسان بون، ئەوا کێ زوتر موسڵمان بوە». جا لە پێشترین وشایستەرین بۆ بەر نوێژی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

①. باشترین لە خوێندنەوەی قورئاندا، کە کارامەیە لە خوێندنەوەی قورئاندا، بە تەواوترین شێواز دەیخوێنێت، شارەزا بێت لە پرسە فیقهیەکانی نوێژ، جا ئەگەر قورئان خوێنترینی کەم شارەزا لەگەڵ زۆر شارەزای کەم تەجوید زان کۆ بویەوە، ئەو کاتە کەم توجید زانە زۆر شارەزاکە دەخەینە پێش زۆر تەجوید زانە کەم شارەزاکە، چونکە پێویستی بە شارەزایی لە نوێژ وئادابەکانیدا زیاترە وەك جوان خوێندنەوەی قورئان.

(١) أخرجه مسلم (٦٧٣). وسلمًا: يعني إسلامًا.

٢. پاشان شارەزاترین ولێزانترین بە سوننەت پێش دەخرێت، جا ئەگەر دو پێش نوێژ کۆ بونەوە یەکسان بون لە خوێندنەوە بەڵام یەکێکیان شارەزاتر ولێزانتر بو بە سوننەت، شارەزاترەکە پێش دەخرێت، لەبەر فەرمودەکە: «ئەگەر لە خوێندندا یەکسان بون ئەوا شارەزاترینیان بە سوننەت پێش دەخرێت».

٣. پاشان کۆنترین کە کۆچی کردوە لە وڵاتی بێ باوەڕانەوە بۆ وڵاتی ئیسلام، ئەگەر هاتو لە خوێندن وزانستدا یەکسان بون.

٤. پاشان ئەوەی زوتر موسڵمان بو بێت، ئەگەر لە کۆچ کردندا یەکسان بون.

٥. پاشان بە تەمەنترینیان، ئەگەر لەوانەی پێشودا یەکسان بون، لەبەر فەرمودەکە: «ئەگەر لە کۆچ کردندا یەکسان بون ئەوا ئەوەیان زوتر موسڵمان بوە -لە ڕیوایەتێکدا: بە تەمەنترینیان-». ولەبەر فەرمودەی [پێشتر]: «وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ» «وبە تەمەنترینتان بەر نوێژی بکات».

ئەگەریش لە سەرجەم ئەمانەدا یەکسان بون، تیر وپشکیان لە نێوان دەکرێت، کێ بردیەوە لە قورعەکە پێش دەخرێت.

خاوەنماڵیش شایستەترە بۆ بەر نوێژی کردن وەك لە مێوانەکەی [با مێوانەکە خاڵەکانی پێشوشی تێدا بێت ولە خاوەن ماڵدا نەبێت] لەبەر فەرمودەی: «[وَ]لَا [تـَ]ؤُمَّنَّ الرَّجُلَ فِي أَهْلِهِ وَلَا فِي سُلْطَانِهِ»[1] «وبا کەس بەرنوێژی نەکات بۆ کەسێك لە ناو ماڵەکەی خۆیدا یا لەناو دەسەڵاتی ئەودا»، هەروەها پێشەوای هەرە گەورەش «الإمام الأعظم» لە هی تر شایستەترە بۆ پێش نوێژی لەبەر گشتێتی فەرمودەی

(١) أخرجه مسلم برقم (٦٧٣).

پێشو، هەروەها پێش نوێژی مزگەوت لە پێشترە لە غەیرە خۆی -مەگەر دەسەڵاتداری هەرە گەورە- یا لە خۆی قورئان خوێنتر وشارەزاتریش هەبێت، هەر لەبەر گشتێتی فەرمودەی [پێشو].

## پرسی دووەم: بۆ کێ حەرام وقەدەغەیە بەر نوێژی بکات؟

بەر نوێژی کردن لەم حاڵەتانەدا حەرامە:

١. بەرنوێژی کردنی ئافرەت بۆ پیاو، لەبەر گشتێتی فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمُ امْرَأَةً». «هەر گەلێك ژن کار بەدەستیان بێت سەرفراز نابن»(١). هەروەها لەبەر ئەوەی بنچینە وایە لە دواوەوەی ڕیزەکانەوە نوێژ بکات لەبەر پارێزراوی وپاراستنی، جا ئەگەر پێشخرا ئەوە دژی ئەو بنچینە شەرعیەیە.

٢. بەر نوێژی کردنی کەسی بێ دەست نوێژ وئەوەی پیسی بە لاشەیەوە بێت وپێشی بزانێت، خۆ ئەگەر پاش نوێژەکان پێیان نەزانی تا دوای نوێژ ئەوە نوێژەکەیان دروستە.

٣. بەر نوێژی کردنی نەخوێندەوار، کە بریتیە لەو کەسەی فاتیحای ڕەوان نیە، نە لەبەر دەیزانێت ونە بە خوێندنەوە، یا ئەو پیتانەی ئیدغام «تێهەڵکێش» ناکرێن ئیدغامی بکات، یا پیتێك بگۆڕێت بە پیتێکی تر، یا هەڵە بیخوێنێتەوە هەڵەیەك واتا بگۆڕێت، ئا ئەمە دروست نیە بەر نوێژی بکات مەگەر بۆ یەکێکی وەك خۆی چونکە توانای پایەکێکی نوێژی نیە.

(١) أخرجه البخاري (٤٤٢٥).

٤. بـەر نوێـژی کردنـی فاسـقی موبتـەدیع «خراپـەکارێکی داهێنـەر»، ئەگـەر فاسقێکی ئاشکرا بو وبانگەشەی بۆ بیدعەکەیەکی کوفری دەکرد ئەوە نوێـژکردن لـە پشتیەوە دروست نیە، لەبـەر فەرمایشـتی: ﴿أَفَمَنْ كَانَ مُؤْمِنًا كَمَنْ كَانَ فَاسِقًا لَا يَسْتَوُونَ﴾ [السجدة:١٨].

٥. کەسێك نەتوانێت کڕنوش وسوژدە بەرێت وبوەستێت ودابنیشێت، بـەر نوێـژی کردنی دروست نیە بۆ کەسێك بە تواناتر بێت بۆ ئەو شتانە.

## پرسی سێیەم: کێ باش نیە «کەڕاهەت»ی هەیە بەر نوێژی بکات؟

بەر نوێژی کردن لەم حاڵەتانەدا کەڕاهەتی هەیە:

١. هەڵە خوێن «اللَّحَّان»: بریتیە لـەو کەسـەی لادان وهەڵـە خوێندنـەوەی زۆرە، ئەمە لە جگە لە «فاتیحا»، بەڵام «فاتیحا» هەڵەیەك بخوێنێت مانا بگۆڕێـت نوێـژی لەگەڵ دروست نیە، وەك بـاس کـرا، ئەمـەش لەبـەر فەرمودەکـەی پەیامبـەر ﷺ: «قورئان خوێنترین بەر نوێژی بۆ خەڵك دەکات».

٢. کەسێ بەر نوێژی بۆ خەڵکێك بکات لە کاتێکدا هەمویان یا زۆریەیان حـەزی لێ نەکەن، لەبەر فەرمایشتی: «ثَلَاثَةٌ لَا تَرْتَفِعُ صَلَاتُهُمْ فَوْقَ رُؤُوسِهِمْ شِبْرًا: رَجُلٌ أَمَّ قَوْمًا وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ...» «سێ کەس نوێژەکانیان بستێك لە سـەر سـەریان بـەرز نابێتەوە: پیاوێك بەر نوێژی بۆ خەڵکێك بکات وئەوانیش حەزی لێ نەکەن...»[1] تـا کۆتایی.

(١) أخرجه ابن ماجه (٩٧١). وصحح البوصيري إسناده في الزوائد، وحسنه النوي في المجموع (١٥٤/٤)، وحسنه الألباني «صحيح ابن ماجه» (٧٩٢).

(٣) کەسێك هەندێك لە پیتەکان دەشارێتەوە، وئاشکرای ناکات، هەروەها کەسێك هەندێك لە پیتەکان دوبارە بکاتەوە، وەك کەسێك تەتەڵەی «فەفە»ی هەبێ کە «فاء» دوبارە بکاتەوە، یا «تەتە»ی هەبێت کە «تاء» دوبارە بکاتەوە وجگە لەمانەش، ئەمەش لەبەر زیادکرنی پیتێك لە قورئان خوێندندا.

## پرسی چوارەم: شوێنی پێش نوێژ لە ئاست پاش نوێژەکان:

سوننەت وایە پێشەوا بکەوێتە بەردەم پاش نوێژەکانەوە، ئەوانیش لە دوای ئیمامەوە ڕادەوەستن ئەگەر دوان یا زیاتر بون، چونکە پەیامبەر ﷺ کە بەر نوێژی بکردبا پێش دەکەوت، وهاوەڵانیشی لە پشتیەوە دەوەستان، لە موسلم وئەبو داود هاتوە: کە جابر وجەبار یەکێکیان لە دەستە ڕاستی پەیامبەرەوە ڕادەوستێ وئەوی تریشیان لە دەستە چەپیەوە، ئەویش دەستیان دەگرێت وئەیان باتە دواوە[1]. ولەبەر وتەکەی ئەنەس کە پەیامبەر نوێژی بۆ کردون لەماڵدا: «پاشان پەیامبەری خوا ﷺ بەرنوێژی دەکرد وئێمەش لە دواوەی ڕادەوەستاین ونوێژی بۆ دەکرد»[2].

بەڵام ئەگەر یەك کەس بو، ئەوا لە ڕاستی پێشەواوە ڕادەوەستێت ڕێکی ئەو، «لەبەر ئەوەی پەیامبەر ﷺ ئیبن عەبباس وجابری خستە ڕاستی خۆیەوە کاتێك لە دەستە چەپ ڕاوەستان»[3]. دروستیشە ئیمام لە ناوەڕاستی پاش نوێژەکانەوە ڕابوەستێت، چونکە ئیبن مەسعود ئاوها نوێژی کرد لە نێوان عەلقەمە وئەسوەددا، وتی: «پەیامبەرم ﷺ بینی ئاوهای کرد»[4]، بەڵام ئەمە بەندە بە [پێویستیەوە]

(١) أخرجه مسلم (٣٠١٠).
(٢) أخرجه مسلم (٦٥٩).
(٣) أخرجه مسلم (٣٠١٠).
(٤) أخرجه أبو داود (٦١٣) وهو صحيح، انظر إرواء الغليل (٢/٣١٩).

وباشتر وایە لە پشتی پێش نوێژەوە ڕابوەستێت، وئافرەتانیش لە دوای ڕیزی پیاوانەوە بن، لەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] ئەنەس ﷺ: «من وهەتیوەکە لە پشتیەوە ڕیزمان بەست وژنە پیرەکەش لە دوامانەوە».

## پرسی پێنجەم: ئەو شتانەی کە ئیمام لە بری پاش نوێژ لە ئەستۆی دەگرێت:

قورئان خوێندنی نوێژە ئاشکراکان، پێشەوا لە بری پاش نوێژ لە ئەستۆی دەگرێت، لەبەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە بەرزی دەکاتەوە: «وَإِذَا قَرَأَ فَأَنْصِتُوا» «وئەگەر قورئانی خوێند بێ دەنگ بن»[1]. ولەبەر فەرمایشتی پەیامبەر ﷺ: «مَنْ كَانَ لَهُ إِمَامٌ، فَقِرَاءَتُهُ لَهُ قِرَاءَةٌ» «هەر کەس پێش نوێژی هەبو، ئەوا قورئان خوێندنەکەی بۆ ئەویشە»[2]. بەڵام لە نوێژە نهێنیەکاندا پێش نوێژ خوێندنی فاتیحە بۆ پاش نوێژ لە ئەستۆ ناگرێت.

## پرسی شەشەم: پێشبڕکێی پێش نوێژ:

دروست نیە پاش نوێژ پێشبڕکێی پێش نوێژ بکات، جا هەر کەس پێش ئیمامەکەی «الله أكبر»ی سەرەتای کرد، ئەوە نوێژەکەی دانەبەستوە، چونکە مەرجە دوای پێش نوێژ بیکات بەڵام ئەم وای نەکردوە، هەروەها لە سەر پاش نوێژە کارەکانی نوێژ دوای ئیمامەکەی بکات، لەبەر فەرمودەی: «إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ؛ فَقُولُوا:

---

(١) رواه الخمسة إلا الترمذي: أبو داود (٦٠٤)، والنسائي (١٤٦/١)، وابن ماجه (٨٤٦)، وأحمد (٤٢٠/٢)، وقال الألباني: حسن صحيح. «صحيح سنن النسائي» (٨٨٢، ٨٨٣). وهو جزء من حديث أوله: «إنما جعل الإمام ليؤتم به...».

(٢) أخرجه أحمد (٣٣٩/٣)، وابن ماجه (٨٥٠). وحسنه الألباني في «الإرواء» (٥٠٠).

رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا» «پێش نوێژ دانراوە تا چاوی لێبكرێ، جا ئەگەر وتی: الله أكبر، ئێوەش بە دوایدا تەكبیر بكەن، ئەگەریش كڕنوشی برد ئێوەش بە دوایدا بیبەن، ئەگەریش وتی: سمع الله لمن حمده، ئێوەش بڵێن: ربنا لك الحمد، ئەگەریش سوژدەی برد، بە دوایدا بیبەن»[1].

خۆ ئەگەر [بە دوای دا نەی كرد] ولەگەڵیدا كردی هەروەها لە سەلام دانەوەشدا، ئەوا كەڕاهەتی هەیە، چونكە پێچەوانەی سوننەتە، بەڵام نوێژەكەی پوچەڵ نابێتەوە؛ چونكە ڕوكنەكەی لەگەڵ ئەودا كردوە. بەڵام ئەگەر پێشی بكەوێت ئەوا حەرامە، لەبەر فەرمودەكەی پەیامبەر ﷺ: «لَا تَسْبِقُونِي بِالرُّكُوعِ وَلَا بِالسُّجُودِ، وَلَا بِالْقِيَامِ» «جا پێشم مەكەون بە ڕكوع بردن وسوژدە بردن وهەستانەوە»[2]. ونەهیش حەرام بون ئەخوازێ. هەروەها لە ئەبو هورەیرەشەوە ﷺ هاتوە بەرزی دەكاتەوە: «أَمَا يَخْشَى الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَهُ قَبْلَ الْإِمَامِ أَنْ يُحَوِّلَ اللهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ» «ئەو كەسەی سەری پێش ئیمام بەرز دەكاتەوە، ناترسێ خوا سەری بگۆڕێت بۆ سەری كەر»[3].

## پرسی حەوتەم: چەند حوكمێكی تر لەبارەی پێش نوێژی ونوێژی كۆمەڵەوە:

لەو حوكمانەی تر جیا لەوانەی پێشو كە پەیوەستە بە پێش نوێژی ونوێژی كۆمەڵەوە:

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٣٨٩)، ومسلم (٤١١).
(٢) أخرجه مسلم (٤١٦).
(٣) متفق عليه: أخرجه البخاري (٦٩١)، ومسلم (٤٢٧).

١. سوننەتە عاقڵ وژیرەكان لە نزیكی پێش نوێژەوە بن: بۆیە بەرێز وژیر وعاقڵ وسەنگینەكان دەخرێنە پشتی ئیمام ونزیكی وی، لەبەر فەرمودەكەی پەیامبەر ﷺ «لِيَلِنِي مِنْكُمْ أُولُو الْأَحْلَامِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ» «با ژیر وعاقڵەكان بە دوای منەوە ڕابوەستن وپاشان ئەوانەی دوای ئەوان وپاشان ئەوانەی دوای ئەوان»[١]. حكیمەتیش لەمەدا: ئەوەیە تا لە پێش نوێژەوە فێر بن، وگەر پێویست بو خوێندنەكەی بۆ ڕاست بكەنەوە، ولە كاتی پێش هاتێكدا لە نوێژدا كەسێكیان بخاتە شوێن خۆی.

٢. سور بون لە سەر ڕیزی یەكەم: سوننەتە نوێژ خوێنان بچنە پێشەوە بۆ ڕیزی یەكەم وسور بن لە سەری ومۆقەیەدی دوا كەوتن بن، لەبەر فەرمودەكەی پەیامبەر ﷺ: «تَقَدَّمُوا فَائْتَمُّوا بِي، وَلْيَأْتَمَّ بِكُمْ مَنْ بَعْدَكُمْ. لَا يَزَالُ قَوْمٌ يَتَأَخَّرُونَ حَتَّى يُؤَخِّرَهُمُ اللهُ» «بێنە پێشەوە، وچاو لە من بكەن، با ئەوانەی دوای ئێوەش چاو لە ئێوە بكەن، وبەردەوام خەڵكانێك دوا دەكەون تا خوا دوایان دەخات»[٢]. هەروەها پەیامبەر ﷺ دەفەرموێت: «لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الْأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلَّا أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لَاسْتَهَمُوا» «ئەگەر خەڵك بزانن بانگ وڕیزی یەكەم چی فەزڵێكی تێدایە، ئەوا دەست پێشخەریان بۆ دەكرد ئەگەریش دەستیان نەكەوتایە بە تیر وپشك نەبێت، ئەوا تیر وپشكیان بۆ دەكرد»[٣].

(١) أخرجه مسلم (٤٣٢).
(٢) أخرجه مسلم (٤٣٨).
(٣) أخرجه مسلم (٤٣٧).

سەبارەت بە ئافرەتان سوننەت وایە لە ڕیزەکانی دواوەوە بن، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا، وَشَرُّهَا آخِرُهَا، وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا، وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا» «باشترین ڕیزی پیاوان یەکەمەکەیەتی، وخراپترینی کۆتاییەکەیەتی، وباشترین ڕیزی ئافرەتان کۆتاییەکەیەتی وخراپترینی یەکەمیەتی»[1].

٣. ڕێککردنی ڕیز وپڕکردنەوەی وپاڵ بەیەکەوە دان ونەهێشتنەوەی بۆشایی، وتەواوکردنی ڕیزی یەکەم ئینجا ڕیزەکەی تر: سوننەتە پێش نوێژ پێش دەست پێ کردنی نوێژ فەرمان بکات بە ڕێککردنی ڕیزەکان وپڕکردنەوەی بۆشاییەکان، لەبەر ئەوەی پەیامبەر ﷺ وای کردوە، هەروەها ﷺ ئەفەرموێ: «سَوُّوا صُفُوفَكُمْ، فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ تَمَامِ الصَّلَاةِ» «ڕیزەکانتان ڕێك بکەن، چونکە ڕێککردنی ڕیز لە تەواوی نوێژەکانتانە»[2]، ولە ئەنەسەوە رضي الله عنه ئەڵێ: نوێژ دابەسترا، ئەوەبو پەیامبەری خوا ﷺ ڕوی لێ کردین وفەرموی: «أَقِيمُوا[3] صُفُوفَكُمْ وَتَرَاصُّوا، فَإِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي» «ڕیزەکانتان ڕێك بکەن وپاڵ بدەن بە یەکەوە، چونکە من لە پشتەوە دەتان بینم»[4]. هەروەها ئەنەس رضي الله عنه ئەڵێ: «كَانَ أَحَدُنَا يُلْزِقُ مَنْكِبَهُ بِمَنْكِبِ صَاحِبِهِ، وَقَدَمَهُ بِقَدَمِهِ» «ئێمە شانمان دەلکاند بە شانی تەنیشتەکەمانەوە وپێشمان دەلکاند بە پێیەوە»[5].

(١) أخرجه مسلم (٤٤٠).
(٢) أخرجه مسلم (٤٣٣).
(٣) [المراد من «أقيموا» أي: «سوا» كما وقع في رواية معمر].
(٤) أخرجه البخاري (٧١٩).
(٥) صحيح البخاري (٧٢٥).

سوننەتیشە ڕیزی یەكەم تەواو بكرێت ئینجا ڕیزی دوا تر، ئەگەر نوقسانیش هەبو با بكەوێتە ڕیزی كۆتاییەوە، لەبەر فەرمودەكەی پەیامبەر ﷺ: «أَلَا تَصُفُّونَ كَمَا تَصُفُّ الْمَلَائِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَا؟ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ! وَكَيْفَ تَصُفُّ الْمَلَائِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَا؟ قَالَ: يُتِمُّونَ الصُّفُوفَ الْأُوَلَ، وَيَتَرَاصُّونَ فِي الصَّفِّ» «ئایا ڕیز نابەستن وەك چۆن فریشتە ڕیز دەبەستن لەلای پەروەردگارەكەیان؟ وتمان: ئەی پەیامبەری خوا! فریشتە چۆن ڕیز دەبەستن لەلای پەروەردگارەكەیان؟ فەرموی: ڕیزەكانی سەرەتا تەواو دەكەن، وڕیزەكانیشیان ڕیك دەخەن وپاڵ بە یەكەوە دەدەن»[1].

٤- نوێژی تەنها كەس لە پشت ڕیزەوە: نوێژی كەسێك دروست نیە بە تەنها لە پشت ڕیزەوە نوێژ داببەستێت، لەبەر فەرمودەكەی پەیامبەر ﷺ: «لَا صَلَاةَ لِرَجُلٍ فَرْدٍ خَلْفَ الصَّفِّ» «نوێژی بۆ نیە كەسێك بە تەنها لە پشتی ڕیزەوە نوێژ بكات»[2]. هەروەها جارێكیان پەیامبەر ﷺ پیاوێكی بینیوە بە تەنها لە دوای ڕیزەكانەوە نوێژی كردوە، فەرمانی پێكردوە نوێژەكەی دوبارە بكاتەوە[3].

---

(١) أخرجه مسلم (٤٣٠).

(٢) أخرجه أحمد (٢٣/٤) [واللفظ له]، وابن ماجه (١٠٠٣)، وحسنه الإمام أحمد، وصحح البوصيري إسناده في «زوائد ابن ماجه»، وصححه الألباني في «صحيح ابن ماجه» (٨٢٢).

(٣) أخرجه أحمد (٢٢٨/٤)، وأبو داود (٦٨٢)، والترمذي (٢٣٠)، وابن ماجه (١٠٠٤). وحسنه الترمذي. وصححه أحمد شاكر في حواشي الترمذي (٤٤٨/١-٤٥٠). وهو في «صحيح الترمذي» (١٩١).

# دەروازەی نۆیەم

## نوێژی عوزردارەکان

خاوەن عوزرەکان: بریتین لە نەخۆش وموسافیر وئەوانەی ترسیان هەیە وناتوانن نوێژەکانیان بەو شێوازە بکەن کە بێ عوزرەکان دەیکەن، ئەمانەش شەرع لە سەری سوك کردونەتەوە، بۆیە بە گوێرەی توانای خۆیان نوێژ دەکەن، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ [الحج: ٧٨] «خوا مننەتی بەسەر کردون بەوەی شەریعەتەکەتانی ئاسان کردوە، تەسکی وتوندی لە ئەحکام وتەکلیفەکانیدا نیە، وەك لە شەریعەتی گەلانی پێشتر هەبو». هەروەها ﷻ ئەفەرموێ: ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ [البقرة: ٢٨٦] «دینی خوا ئاسانە، قورسی تێدا نیە، بۆیە داوا لە بەندەکانی ناکات شتێك بکەن لە سەروی توانایان بێت». هەروەها ﷻ ئەفەرموێ: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾ [التغابن: ١٦] «ئەی ئیمانداران هەوڵ وتوانای خۆتان بە گەڕ بخەن بۆ پارێزکاری ولە خوا ترسان». جا لە هەر کوێ قورسی هەبو ئاسانکاریش دێت.

### چۆنێتی نوێژی نەخۆش:

نەخۆش: ئەو کەسەیە تەندروستی هەمو لاشەی یا بەشێکی تێکچوە.

پێویستیشە نەخۆش نوێژە فەرزەکان بە پێوە بکات بە هەر شێوازێك بێت، گەر لە شێوەی ڕکوعبەریش بێت بۆ کەسێك دەردێك لە پشتی هەبێت نەتوانێت ڕێکی بکاتەوە، یان پاڵ بداتە دیوارێکەوە یا کۆڵەکەیەك، یان خۆی بداتە سەر گۆچانێك،

لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «إِذا أَمَرْتُكم بَأَمْرٍ فَأْتُوا منه ما اسْتَطَعْتُم»[1]. «کە فەرمانێکم پێکردن بە پێی توانا ئەنجامی بدەن». ئەگەریش نەیتوانی ئەوا بە دانیشتنەوە، ئەوەشی نەتوانی ئەوا بە ڕاکشانەوە، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ بۆ عیمڕانی کوڕی حوصەین رضي الله عنه: «بە پێوە نوێژ بکە، ئەگەر نەتوانی بە دانیشتنەوە، ئەگەریش نەتوانی ئەوا بە ڕاکشانەوە».

ئەگەریش هەمو ئەمانەی نەتوانی ئەوا بە گوێرەی حاڵ وباری خۆی نوێژ دەکات، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾ [التغابن: ١٦]. نوێژیش لە سەر نەخۆش ناکەوێت هەتا عەقڵی مابێت، با بە ئاماژەکردنیش نوێژ بکات، چونکە بە نیەتەوە توانای ئەمەی هەیە.

هەروەها نەخۆش بە دانیشتنەوە نوێژ دەکات، بە ئاماژەکردن وچەماندنەوەی سەری ڕکوع وسوژدە دەبات، سوژدەکەی نزمتر لە ڕکوعەکەکەی، ئەگەر ئاماژەشی بە سەر بۆ نەکرا، بە چاوەکانی ئاماژە دەکات.

## بابەتی نوێژی موسافیر:

ئەم باسانەشی تێدایە:

### یەکەم: کورتکردنەوەی نوێژە چواریەکان:

ئەمەش چەند مەسەلەیەك لە خۆ دەگرێت:

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (١١٧/٩)، ومسلم (١٣٣٧).

## پرسی یەکەم: لە بارەی حوکمی نوێژ کورت کردنەوە «القصر»؟:

جیاوازی نیە لە نێوان زانایاندا لەمەڕ شەرعیەتی کورتکردنەوەی نوێژە چواریەکان بۆ موسافیر، بەڵگەی ئەمەش: قورئان وفەرموودە وکۆ دەنگیە؛ سەبارەت بە قورئـان: فەرمایشـتەکەی پـەروەردگارە: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ [النساء: ١٠١] «وئەگـەر ئەی ئیمانداران سەفەرتان کـرد لـەم ئـەرزەی خـوادا، ئـەوا هیچـتان لـە سـەر نیـە نوێژەکانتان کورت بکەنەوە، ئەگەر ترسان بێ باوەڕان دەست درێژی بکەنە سەرتان لە کاتی نوێژدا». کورتکردنەوەش لە سەفەردا [شەرعیە] ئیتر ترس هەبو یان نا، چونکە کە پرسیار لە پەیامبەر ﷺ کرا لەبارەی کورتکردنەوە لە کاتێکدا خەڵك کەوتونەتـە ئاسایشـەوە وترسـیان نـەماوە، فـەرموی: «صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللهُ بِهَا عَلَيْكُمْ، فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ» «خێر وصەدەقەیەکی خوایە، پێی بەخشیون، جا لێی وەربگرن»(١). هەروەها پەیامبەر ﷺ وجێنشینەکانی بەردەوام بون لە سەری، وەك لە ئیبن عومەرەوە هاتوە ئەڵێ: «إِنِّي صَحِبْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فِي السَّفَرِ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ. وَصَحِبْتُ أَبَا بَكْرٍ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ، [وَصَحِبْتُ عُمَرَ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ، ثُمَّ صَحِبْتُ عُثْمَانَ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ. وَقَدْ قَالَ اللهُ: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾]» «هـاوەڵێتی پەیامبەرم کرد لە سـەفەردا، لـە دو ڕکـات زیـاتری نـەدەکرد هـەتا وەفـاتی کـرد، هاوەڵێتی ئەبو بەکریشم کرد هەر لە دو ڕکات زیاتری نەدەکرد هـەتا وەفـاتی کـرد،

(١) أخرجه مسلم (٦٨٦).

عومەریش هەر لەوە زیاتری نەدەکرد تا وەفاتی کرد، عوسمانیش هەروەها»[١].

وئەحمەد دەگێڕێتەوە لە ئیبن عومەرەوە ﷺ بەرزی دەکاتەوە: «إِنَّ اللهَ يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ تُؤْتَى مَعْصِيَتُهُ» «خوا پێی خۆشە ڕوخسەت وڕێ پێدانەکانی بکرێت، وەك چۆن پێی ناخۆشە ڕێ پێ نەدانەکانی ئەنجام بدرێت»[٢].

سەبارەت بە کۆ دەنگی: نوێژ کورتکردنەوە لەو پرسە دینیانەیە کە بەڵگە نەویستە، وئوممەتیش لە سەری کۆکە.

کەوابو: پارێزگاری کردن لە سەر ئەم سوننەتە وەرگرتنی ئەم ڕوخسەتە باشترە ولە پێشترە وەك واز لێ هێنانی، بەڵکو هەندێك زانا بە مەکروهی دەزانێت لە سەرفەردا نوێژ بە تەواوەتی بکرێت، ئەمەش لەبەر زۆر بەردەوام بونی پەیامبەر ﷺ وهاوەڵەکانی لە سەر ئەم سوننەتە، کە ئیشی بەردەوامی پەیامبەر ﷺ بوە.

## پرسی دووەم: لە بارەی دیاریکردنی ئەو نوێژەی دروستە کورت بکرێتەوە:

ئەو نوێژەی دروستە کورت بکرێتەوە بریتیە لە نوێژە چواریەکان، واتە: نوێژی نیوەڕۆ وعەسر وعیشا، ونە نوێژی بەیانی ونە مەغریب کورت ناکرێتەوە بە ئیجماع، لەبەر ئیشی پەیامبەر ﷺ وهاوەڵەکانی لە دوای ئەوەوە، ولەبەر وتەکەی ئیبن عەبباس ﷺ[٣]: «خوا نوێژی فەرز کردوە لە سەر زوبانی پەیامبەرەکەتان، لە شوێنی نیشتەجێ بون: چوارە، لە سەفەریشدا: دوان...». ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی مەبەست لە کورت کردنەوە چواریەکانە.

(١) أخرجه مسلم (٦٨٩).
(٢) أخرجه أحمد (٥٨٣٢)، وصححه الشيخ الألباني «الإرواء» (٥٦٤).
(٣) أخرجه مسلم (٦٨٧).

## پرسی سێیەم: دوری ئەو سەفەرەی نوێژی تێدا کورت دەکرێتەوە وجۆرەکەی:

دوری ئەو سەفەرەی نوێژی تێدا کورت دەکرێتەوە نزیکەی شانزە فەرسەخە، کە دەکاتە چوار بورد «بُرُد»، بە میلیش دەکاتە چل وهەشت میل، بە کیلۆمەتریش دەکاتە نزیك هەشتا کیلۆمەتر، پەیامبەری خواش ﷺ شەو ورۆژە ڕێیەکی بە سەفەر ناو بردوە[1]، ئیبن عەبباس وئیبن عومەریش نوێژیان کورت دەکردەوە ورۆژویان نەدەگرت لە چوار «بورد»داکە شانزە فەرسەخە[2].

**سەبارەت بە جۆری سەفەرەکە:** بریتیە لە سەفەری حەڵاڵ؛ وەك سەفەری بازرگانی، وگەشت، هەروەها سەفەری واجب؛ وەك سەفەری حەج وجیهاد، هەروەها سەفەری سوننەت؛ وەکو سەردان کردن، وسەفەری دوەم جاری حەج، کەوابو: سەفەری حەرام دروست نیە نوێژی تێدا کورت بکرێتەوە لە سەر ڕای زۆرێکی زانایان[3].

## پرسی چوارەم: کەسێك نیەتی مانەوە «الإقامة»ی هەبێت، کورتی دەکاتەوە؟

کەسێك نیەتی مانەوە بێت وردەکاری تێدایە، بەم شێوەیە: ئەگەر نیەتی مانەوەی ڕەهای[4] هەبێت کورتی ناکاتەوە؛ چونکە ئەو هۆکارەی کورت کردنەوەی بۆ حەڵاڵ دەکات بونی نیە، بە هەمان شێوە ئەگەر نیەتی مانەوەی زیاتر لە چوار[5] ڕۆژی

---

(١) وذلك في قوله ﷺ: «لا يحل لامرأة تؤمن بالله واليوم الآخر أن تسافر مسيرة يوم وليلة ليس معها حرمة». أخرجه البخاري (١٠٨٨) واللفظ له، ومسلم (١٣٣٩) - ٤٢١.

(٢) أخرجه البخاري تعليقًا في «باب في كم يقصر الصلاة». وصله البيهقي في «السنن الكبير» (١٣٧/٣) بسنده عن عطاء بن أبي رباح، أن عبد الله بن عمر ﷺ... فذكره دون ذكر الفراسخ.

(٣) کۆمەڵێکی تری زانایانیش ئەو جیاوازیە ناکەن، ئەمەش پەسەندتر دیارە، والله أعلم. وەرگێڕ.

(٤) واتە: بێ دیاری کردنی چەند ڕۆژێکی دیاریکراو. وەرگێڕ.

(٥) جگە لە ڕۆژی دەرچون وگەڕانەوە. وەرگێڕ.

هەبێت، یا بۆ ئیشێك بمێنێتەوە وابزانێت تەواو نابێت مەگەر دوای چوار ڕۆژ؛ «چونکە پەیامبەر ﷺ کە لە مەککەدا بیست ویەك نوێژ مایەوە کورتیانی دەکردەوە، لە بەرەبەیانی ڕۆژی چوارەمدا گەیشت هەتا ڕۆژی تەرویە [«هەشتەم»] مایەوە، نوێژی بەیانی کرد وئینجا دەرچو». جا هەر کەس چوار ڕۆژ مایەوە یا کەمتر وەك مانەوەکەی پەیامبەر ﷺ کورتی دەکاتەوە، کێش زیاتر مایەوە بە تەواوی دەیکات. پیشەوا ئەحمەد باسی ئەمەی کردوە[1]. کە ئەنەسیش ئەڵێ: «أَقَمْنَا بِمَكَّةَ عَشْرًا نقْصر الصَّلاة» «لە مەککە دە ڕۆژماینەوە، نوێژمان کورت دەکردەوە» بەو مانا دێت باسمان کرد، چونکە دەرچونیشی بۆ مینا وعەرەفە ودواتریشی لە دەکە حساب کردوە. ئەگەریش هاتو لەبەر پێویستیەك زیاتر لە چوار ڕۆژ مایەوە بێ نیەتی مانەوە، ناشزانێت کەی تەواو دەبێت، یا بەند کرا بو بە ستەم یا گیری خواردبو بە هۆی بارانەوە ئەگەر چەندین ساڵیش بێت، ئەوا نوێژ کورت دەکاتەوە. ئیبن ئەلمونزیر ئەڵێ: «وکۆکن لە سەر ئەوەی موسافیر کورتی دەکاتەوە مادام نیەتی مانەوەی نەبێت».

## پرسی پێنجەم: ئەو حاڵەتانەی کە پێویستە لە سەر موسافیر نوێژەکانی بە تەواوەتی ئەنجام بدات:

لێرەدا هەندێك حاڵەت هەیە، جیا کراوەتەوە لە نوێژ کورت کردنەوە بۆ موسافیر، لەوانە:

(١) انظر: «المغني» (٢/١٣٤-١٣٥)، ومجموع فتاوى الشيخ ابن باز، فتاوى الصلاة (ص ٤٥٨). [ڕای مالك وشافعیشە. بشزانە لە ئەحمەدەوە دو ڕیوایەت هەیە: ڕیوایەتێکیان کە مەزهەبی جمهورە: چوار ڕۆژە، وئەوی تریان نوێژ حسێب دەکات، بەڵام لێرەدا هەر دوکیانی تێ هەڵکێش کرد].

**١. ئەگەر ڕێبوار لە پشت نیشتەجێیەکەوە نوێژی کرد:** ئەوا لــە ســەریەتی بــە تەواوەتی بیکات، لەبەر فەرمایشتی پەیامبەر ﷺ: «پێش نوێژ دانراوە تا چاوی لــێ بکرێت»[١]، ولەبەر وتەکەی ئیبن عەبباس رضي الله عنهما کە پرسیاری لێ کرا لە بارەی نوێژ بە تەواوەتی کردن لە پشت نیشتەجێوە؟ وتی: ئەوە سوننەتی باوکی قاسمە ﷺ[٢].

**٢. ئەگەر نوێژی کرد لــە پشــت کەسـێکەوە گومــانی هــەبو موســافیرە یــا نیشتەجێ:** ئەگەر نوێژی دابەست لە پشت کەسێکەوە نازانێ ڕێبوارە یان نیشــتەجێ، وەك ئەوەی لە فڕۆکەخانە وهاوشێوەکانی بێت، ئەو کاتە لە ســەریەتی بــە تــەواوەتی بیکات، چونکە کورت کردنەوە پێویستی بە نیەتێکی دڵنیایی هەیــە، بــەڵام لەگــەڵ ڕاڕاییدا بە تەواوی دەیکات.

**٣. ئەگەر لە سەفەردا نوێژی کــاتی نیشــتەجێی بــیر هاتــەوە:** وەك کەســێکی موسافیر، ولە میانەی سەفەرەکەیدا بیری دەکەوێتەوە لە شاری خۆیدا نوێژی نیوەڕۆی بە بێ دەست نوێژ کردبێت، یا نوێژێکی لە شار فەوتاوی بیر بکەوێتــەوە، لێــرەدا لــە سەریەتی بە تەواوەتی بیکــات، لەبــەر فەرمودەجــەی ﷺ: «مَنْ نَامَ عَنْ صَلَاةٍ أَوْ نَسِيَهَا، فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا» «هەر کەس لە نوێژێك خەوی لێکەوت یا بــیری چــوەوە، ئەوا با بیکاتەوە کەی بیری هاتەوە»[٣]. یانی: وەك خۆی چۆنە، دەیکاتەوە، هــەروەها لەبەر ئەوەی ئەو نوێژە بە تەواوەتی لە سەری فەرز بوە بۆیە لە سەریەتی بە تەواوەتی بیکاتەوە.

(١) پێشتر تەخریج کرا.
(٢) أخرجه أحمد (١/٢١٦). وصححه الألباني في «الإرواء» (٥٧١).
(٣) أخرجه البخاري (٥٩٧)، ومسلم (٦٨٤) - ٣١٥.

**٤. ئەگەر موسافیر نوێژێکی دا بەست کە لە سەریەتی بە تەواوەتی بیکـات، بەڵام بەتاڵ ببێتەوە، جا دوبارەی کردەوە:** وەك موسافیرێك لە پشـت نیشـتەجێیەکەوە نوێژ بکات، لەم حاڵەتەدا ئەبێ بە تەواوەتی بیکات، جا ئەگەر ئەم نوێژەی بەتاڵ بویەوە ودوبارەی کردەوە لە سەریەتی بـە تـەواوەتی بیکاتـەوە، چـونکە دوبـارە کردنـەوەی نوێژێکە کە واجبە بە تەواوەتی بکرێت.

**٥. ئەگەر موسافیر نیەتی مانەوەی ڕەهای هەبو** لەو شوێنەی سەفەری بۆ کردبو بە بێ بەستنەوەی بە کاتێکی دیاری کراو یـا کـارێکی دیـاری کـراو، هـەروەها بـە هەمان شێوە ئەگەر نیەتی هەبو ئەو شوێنە بکاتـە نیشـتمانی خـۆی، ئـەوا ئـەبێت نوێژەکەی بە تەواوی بکات، چونکە حوکمی سەفەر دەرهەق بەو نـەماوە، ئەگـەریش سەفەرەکەی بەستەوە بە کـاتێکی دیـاری کـراو یـا کارێـك کۆتاییـان دێـت، ئـەوا موسافیرە ونوێژ کورت دەکاتەوە.

**دووەم: کۆ کردنەوەی دو نوێژ:**

**چەند مەسەلەیەك لە خۆ دەگرێت:**

**پرسی یەکەم: لە بارەی شەرعی بونی کۆ کردنەوەی دو نوێژ پێکەوە، هەروەها بۆ کێش حەڵاڵە:**

بەو سەفەرەی نوێژی پێ کورت دەکرێتەوە؛ حەڵاڵە نوێژی نیوەڕۆ وعەسر پێکەوە کۆ بکرێتەوە، هەروەها مەغریب وعیشـا لـە کـاتی یەکێکیانـدا کـۆ بکەیتـەوە، لەبـەر فەرمودەکەی موعاز: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ إِذَا ارْتَحَلَ قَبْلَ [أَنْ تَـ]زِيغَ الشَّمْسُ أَخَّرَ الظُّهْرَ حَتَّى يَجْمَعَهَا إِلَى الْعَصْرِ، فَيُصَلِّيَهُمَا جَمِيعًا، وَإِذَا ارْتَحَلَ بَعْدَ زَيْغِ الشَّمْسِ صَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ سَارَ، [وَكَانَ إِذَا ارْتَحَلَ قَبْلَ الْمَغْرِبِ

أَخَّرَ الْمَغْرِبَ حَتَّى يُصَلِّيَهَا مَعَ الْعِشَاءِ، وَإِذَا ارْتَحَلَ بَعْدَ الْمَغْرِبِ عَجَّلَ الْعِشَاءَ، فَصَلَّاهَا مَعَ الْمَغْرِبِ]» «پەیامبەری خوا ﷺ لە غەزای تەبوك دا، ئەگەر پاش لادانی خۆر لە جەرگەی ئاسمان (دوای کاتی نوێژی نیوەڕۆ) بیویستایە بکەوێتە ڕێ، نیوەڕۆ وعەسری پێکەوە دەکرد، پاشان دەکەوتە ڕێ، ئەگەریش پێش مەغریب بکەوتایەتە ڕێ، دوای دەخست ولەگەڵ عیشادا دەیکرد، ئەگەریش دوای مەغریب بکەوتایەتە ڕێ، عیشای پێش دەخست ولەگەڵ مەغریبدا دەیکرد»[1]. ئیتر بەڕێوە بێت یان لای دابێت، چونکە ڕوخسەتێکە لە ڕوخسەتەکانی سەفەر، بۆیە عیبرەت بە بەڕێوە بون نیە وەك ڕوخسەتەکانی تری سەفەر، ئەوەندە نەبێت باشترە بۆ ئەوەی لایداوە کۆی نەکاتەوە، چونکە پەیامبەر ﷺ لە مینا کۆی نەکردەوە لە کاتێکدا لای دابو.

وکۆ کردنەوە حەڵاڵە بۆ نیشتەجێیەکی نەخۆش کە ئەگەر نەیکات نارەحەتە لە سەری، لەبەر وتەکەی ئیبن عەبباس ﵄: «جَمَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِالْمَدِينَةِ مِنْ غَيْرِ خَوْفٍ، وَلَا مَطَرٍ» «پەیامبەر ﷺ لە مەدینە نیوەڕۆ وعەسر، ومەغریب وعیشای کۆ کردەوە، بە بێ ترس وبێ باران»، لە ڕیوایەتێکدا: «من غير خوف ولا سفر» «بە بێ ترس وسەفەر»[2]. بۆیە تەنها بیانوی نەخۆشی مایەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی پەیامبەر ﷺ «فەرمانی کرد بە ئافرەتی نەزیف «الاسْتِحَاضَة» کە نوێژ کۆ بکاتەوە» ئیستیحازەش جۆرێکە لە نەخۆشی، بە ئیبن عەبباسیش وترا -لە سەر فەرمودەی پێشو-: بۆ وای کرد؟ وتی: بۆ ئەوەی ئومەتەکەی توشی نارحەتی نەبن. جا کەی مرۆڤ بە هۆی کۆ نەکردنەوە نارەحەتی

(١) أخرجه أبو داود (١٢٠٨)، والترمذي (٥٥٣)، وقال: «حسن غريب». وصححه الألباني في «الإرواء» (٥٧٨).

(٢) رواهما مسلم (٧٠٥) ٤٩-٥٤.

وتەنگی توش هات، دروستە کۆی بکاتەوە[1]، نەخۆش بێت یان عوزرێکی جگە لە نەخۆشیش؛ وەك نیشتە جێ یان ڕێبوار.

هەروەها لەو عوزرانەی تر کە کۆ کردنەوە حەڵاڵ دەکات جگە لە نە خۆشی وسەفەر:

١. بارانی زۆری بە لێزمە کە کەلوپەل تەڕ بکا، وبە هۆیەوە مرۆڤ توشی ناڕەحەتی ببێ.

٢. قوڕ وقوڕاو، ئەگەر بە هۆیەوە ڕێ کردن لە سەر خەڵك ناڕەحەت دەبو.

٣. بای توندی ساردی لە ڕادە بە دەر.

هەروەها هەر بیانویەکی تر کە ئەگەر کۆی نەکاتەوە ببێتە مایەی ناڕەحەتی بۆ کەسەکە.

## پرسی دووەم: دیاری کردنی ئەو کۆ کردنەوەیەی کە شەرعیە:

وسنوری نوێژ کۆ کردنەوەی شەرعی، بریتیە لە کۆ کردنەوەی نوێژی نیوەڕۆ وعەسر، ومەغریب وعیشا بۆ ڕێبوار وهاو حوکمەکانی، هەروەها کۆ کردنەوە لە نیشتەجێدا بە هۆی باران وهاو حوکمەکانیەوە، کەواتە دروستە کۆ کردنەوەی هەر دو نیوەڕۆکە وهەر دو عیشاکە[2]؛ لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عەبباسی پێشو، هەروەها ئەبو بەکر وعومەر وعوسمانیش ﷺ کردویانە، هەروەها هۆکاری کۆ کردنەوەی هەر دو عیشاکە بونی ناڕەحەتیە، جا ئەم هۆکارە لە هەر دو نیوەڕۆکەش هەیە.

(١) ناڕەحەتیەکی ڕون وئاشکرا. ئەگەرنا هەر خودی پەرستنەکە جۆرە ناڕەحەتیەکی تێدایە. وەرگێڕ.

(٢) هەر دو عیشاکە: مەغریب وعیشایە، هەر دو نیوەڕۆکەش: نیوەڕۆ وعەسرە، ناوی ئەمەکەیان بەوەکەشەوە نراوە لە ڕوی غەلەبە و[وزالیەوە، ئەم ناوەکە زاڵ بوە بەسەر ئەوەکەی تردا].

# دەروازەی دەیەم

# لە بارەی نوێژی هەینییەوە

چەند پرسێکیشی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: حوکمی نوێژی هەینی وبەڵگەکەی:

جومعە فەرزی عەینە لە سەر پیاوان، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ﴾ [الجمعة:٩] «ئەی ئەوانەی بڕواتان بە خوا وپەیامبەر هەیە وئیش بە شەرعەکەی دەکەن! ئەگەر بانگبێژ لە ڕۆژی جومعەدا بانگی فەرمو بۆ نوێژ، بڕۆن بۆ بیستنی وتار وبە جێ گەیاندنی نوێژ، واز لە کڕین وفرۆشتن وهەمو ئەو شتانە بهێنن سەرقاڵتان دەکەن لێی». ولەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «رَوَاحُ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ» «ڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی واجبە لە سەر هەمو پێگەیشتویەك»[1]. هەروەها ئەفەرموێ ﷺ: «لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجُمُعَاتِ أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ، ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ» «خەڵکانێك واز دەهێنن لە نەهاتن بۆ جومعە ئەوە باشە، وەگەرنا خوا مۆر دەدات بەسەر دڵیاندا، پاشان لە بێ ئاگاکان دەبن»[2]. نەوەوی ئەڵێ: «ئەوەی تێدایە کە جومعە فەرزی عەینە»[3]، ولەبەر ئەو فەرمودەیەی کە تۆزێکی تر دێت، وتێیدا هاتوە: «جومعە هەق واجبە لە سەر هەمو موسڵمانێك».

(١) أخرجه النسائي. (٨٩/٣) (١٣٧١) وصححه الألباني «صحيح الجامع» (٣٥٢١).
(٢) أخرجه مسلم (٨٦٥).
(٣) «شرح النوي على مسلم» (١٥٢/٦).

## پرسی دوەم: لە سەر کێ پێویستە؟

جومعە پێویستە لە سەر هەمو موسڵمانێکی نێرینەی باڵغی ژیر، توانای ئامادە بونی بێت، نیشتەجێ بێت، بۆیە پێویست نیە لە سەر: کۆیلە، یا ئافرەت، یا منداڵ، یا شێت، یا نەخۆش، یا ڕێبوار، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «الْجُمُعَةُ حَقٌّ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ فِي جَمَاعَةٍ إِلَّا أَرْبَعَةً: عَبْدٌ مَمْلُوكٌ، أَوِ امْرَأَةٌ، أَوْ صَبِيٌّ، أَوْ مَرِيضٌ» «نوێژی هەینی هەق وواجبە لە سەر هەمو موسڵمانێك بە کۆمەڵ ئامادەی بێت، مەگەر چوار کەس: کۆیلە، یا ئافرەت، یا منداڵ، یا نەخۆش»[1]. جا ڕێبوار لە سەری نیە لەبەر ئەوەی پەیامبەر ﷺ لە سەفەرەکانی خۆیدا نەیکردوە، ڕۆژی عەرەفەش لە حەجەکەیدا کەوتە جومعەوە، کەچی نوێژی نیوەڕۆی کرد وعەسری لەگەڵ کۆ کردەوە. بەڵام ڕێبوارەکە لە شارێکدا بێت هەینی تێدا بکرێت، ئەوە بۆی باشترە لەگەڵ موسڵماناندا بیکات. ئەگەریش کۆیلە یا ئافرەت یا منداڵ یا نەخۆش یا ڕێبوار ئامادەی هەینی بن نوێژەکەیان دروستە ونوێژی نیوەڕۆیان لە سەر دەکەوێت.

## پرسی سێیەم: کاتەکەی:

کاتی جومعە بریتیە لە کاتی نوێژی نیوەڕۆ، کە بریتیە لە دوای لادانی خۆر لە جەرگەی ئاسمانەوە تا ئەوەندەی سێبەری هەر شتێك وەك درێژیەکەی لێ دێت، لەبەر فەرمودەکەی ئەنەسی کوڕی مالك ﷺ کە «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الْجُمُعَةَ حِينَ تَمِيلُ الشَّمْسُ» «پەیامبەری خوا ﷺ نوێژی هەینی دەکرد کاتێك خۆر لای دەدا»[2].

---

(١) أخرجه أبو داود (١٠٥٤)، وصححه الألباني في «الإرواء» (٥٩٢).
(٢) أخرجه البخاري (٩٠٤).

ئەمەش لە کاری هاوەڵانەوە گێڕدراوەتەوە[1]، بۆیە: هەر کەس گەیشتە ڕکاتێکی جومعە پێش دەرچونی کاتەکەی ئەوا گەیشتوە پێی، وەگەرنا نوێژی نیوەڕۆ دەکات، لەبەر ئەو فەرمودەیەی پیشتر باس کرا: «هەر کەس بگاتە ڕکاتێکی نوێژ ئەوا گەیشتۆتە ئەو نوێژە».

## پرسی چوارەم: وتار:

وتار پایەیەکە لە پایەکانی جومعە، نوێژی جومعەش دروست نابێت بە بێ وتار، چونکە پەیامبەر ﷺ بەردەوام بوە لە سەری وهەرگیز وازی لێ نەهێناوە، بریتیشە لە دو وتار، مەرجیشە بۆ دروستێتی نوێژی جومعە کە پێش نوێژ بێت.

## پرسی پێنجەم: لە بارەی سوننەتەکانی وتارەوە:

وسوننەتە دوعا بکرێت بۆ موسڵمانان بەوەی بۆ دین وژینیان باشە، لەگەڵ دوعاکردن بۆ کار بە دەستی موسڵمانان بە چاك بون وموەفەق بون، چونکە پەیامبەر ﷺ «کە جومعە وتاری دەفەرمو دوعای دەکرد، وبە پەنجەکانی ئاماژەی دەکرد، وخەڵکیش ئامینیان دەکرد»[2]، هەروەها سوننەتە وتار ونوێژەکە یەك کەس بیکات، هەروەها بە

(١) انظر: «فتح الباري» (٢/٤٥٠).

(٢) [قال الألباني في: «الإرواء» (٦١٣) (٣/ ٧٤): «لم أقف على سنده، وإنما علقه البيهقي (٣/٢١٠) مرسلًا فقال: وَرُوِّينَا عَنِ الزُّهْرِيِّ(*) أَنَّهُ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا خَطَبَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ دَعَا فَأَشَارَ بِإِصْبَعِهِ وَأَمَّنَ النَّاسُ». وَرَوَاهُ قُرَّةُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ مَوْصُولًا وَلَيْسَ بِصَحِيحٍ، وَاللهُ أَعْلَمُ»» اهـ.

(*) لێرەدا زەهەبی لە «مهذب»ەکەی «السنن الكبير»دا (١١٣٧/٣) (٥١٤٤) دار الوطن نیشانەی «ضبة»یەکی داناوە، وەکو ئاماژەیەك بۆ پچڕاوی سەنەدەکەی. والعجيب أن محقق «شرح منتهى الإرادات» الشيخ عادل سعد (١/٣٩٠) دار الكتب العلمية! ط١، ١٤٢٦، أشار في الهامش إلى أنه أخرجه مسلم وأحمد، ولا شك أنه وهم].

پێی توانا دەنگی تێیاندا بەرز بكاتەوە، وبە پێوە وتار بدات لەبەر ئایـەتی: ﴿وَتَرَكُوكَ قَائِمًا﴾ [الجمعة:١١] «وبە پێوە لە ناو وتار بـە جێیـان هێشـتی». وجـابری كـوڕی سەمورە ﷺ ئەڵێ: «كَانَ [ﷺ] يَخْطُبُ قَائِمًا. ثُمَّ يَجْلِسُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيَخْطُبُ قَائِمًا، فَمَنْ نَبَّأَكَ أَنَّهُ كَانَ يَخْطُبُ جَالِسًا فَقَدْ كَذَبَ. [فَقَدْ وَاللهِ! صَلَّيْتُ مَعَهُ أَكْثَرَ مِنْ أَلْفَيْ صَلَاةٍ]» «پەیامبەر ﷺ بە پێوە وتاری دەفەرمو، ئینجا دادەنیشت، پاشان هەڵدەستا وتاری دەفەرمو بە پێوە، جا هەر كەس پێی وتی بە دانیشتنەوە وتاری فەرموە بێگومان درۆی كردوە، بە خوا زیاتر لە دو هەزار نوێژم لەگەڵدا كردوە»[1]. هەروەها سوننەتە لـە سەر مینبەر یا شوێنێكی بەرز بێت، چونكە پەیامبەر ﷺ «لە سەر مینبـەر وتـاری دەفەرمو»[2]، كە بەرز بو، باشتریشـە بـۆ ڕاگەیانـدن، وكاریگـەرترە بـۆ ئامۆژگـاری، هەروەها لە نێوان هەر دو وتارەكە تۆزێك دادەنیشێت، لەبەر وتەكەی ئیبن عومەر ﷺ: «كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَائِمًا، ثُمَّ يَجْلِسُ، ثُمَّ يَقُومُ» «پەیامبـەر ﷺ لە جومعەدا وتاری دەفەرمو بە پێوە پاشان دادەنیشت وپاشـان هەڵدەسـتا»[3].

سوننەتیشە هەر دو وتارەكە كورت بكاتەوە، دوەمیش لە یەكەم كورتتر ئەبێت، لەبـەر فەرمودەكەی عەممار ﷺ: «إِنَّ طُولَ صَلَاةِ الرَّجُلِ، وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ، مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ. فَأَطِيلُوا الصَّلَاةَ وَاقْصُرُوا الْخُطْبَةَ» «درێـژی نوێـژ، وكـورتی وتارەكـەی، نیشـانەی تێگەیشتنێتی، جا نوێژ درێژ بكەنەوە وتار كورت بكەنەوە»[4]. وسوننەتە وتاربێژ كـە ڕوی كردە خەڵكەكە سەلامیان لێ بكات، لەبەر وتەكەی جابر ﷺ: «پەیامبەر ﷺ كە

---

(١) أخرجه مسلم (٨٦٢).

(٢) [قال في «الإرواء» (٦١٥) (٣/ ٧٥): «متواتر عن جماعة من أصحاب النبي ﷺ»].

(٣) متفق عليه: البخاري (٩٢٨)، ومسلم (٨٦١) [واللفظ المثبت هو للبخاري والذي ذكروه في الأصل هو للنسائي وغيره].

(٤) أخرجه مسلم (٨٦٩).

دەهاتە سەر مینبەر سەلامی دەکرد»، وسوننەتە دابنیشێت تا بانگبێژ لێ دەبێتەوە، لەبەر وتەکەی ئیبن عومەر ﷺ «پەیامبەر ﷺ کە دەچوە سەر مینبەر دەادەنیشت تا بانگبێژ لێ دەبوەوە ئینجا هەڵدەستا وتاری دەفەرمو»، سوننەتیشە خۆی بدات بە سەر گۆچان وهاوشێوەکانی، هەروەها سوننەتە وتار بێژ تەماشای پێش خۆی بکات، چونکە پەیامبەر ﷺ وای کردوە.

## پرسی شەشەم: ئەوەی حەرامە لە جومعەدا بکرێت:

لە کاتی وتاردا قسەکردن حەرامە، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «مَنْ تَكَلَّمَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ فَهُوَ كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا» «هەر کەس لە ڕۆژی جومعەدا قسە بکات لە کاتێکدا پێشەوا وتار دەخوێنێت، ئەوە وەکو گوێدرێژ وایە کتێبی هەڵگرتبێت»[1]. ولەبەر فەرمودەکەی تری ﷺ: «إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ: أَنْصِتْ، وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ فَقَدْ لَغَوْتَ» «ئەگەر بەوەی تەنیشتت بڵێی: بێ دەنگ بە وپێشەواش وتار ئێژێت ئەوە قسەی پوچ وباتڵ وڕەدکراوەت کردوە»[2]. هەروەها ڕۆیشتن بە سەر ملی خەڵکیدا لە میانەی وتاردا حەرامە، لەبەر فەرمایشتەکەی ﷺ بۆ کابرا کە بینی هەنگاو دەنێت بەسەر ملی خەڵکدا: «اِجْلِسْ فَقَدْ آذَيْتَ» «دابنیشە! بەڕاستی ئازارت گەیاند»[3]، جا ئازاردانی موسڵمانانی تێدایە، وسەرقاڵیان دەکات لە گوێ گرتن لە وتار، بەڵام وتاربێژ دروستە بەسەر ملی خەڵکدا بڕوات ئەگەر

(١) أخرجه أحمد (١/٢٣٠). وقال ابن حجر في «بلوغ المرام»: «إسناده لا بأس به». «سبل السلام» (٢/١٠١-١٠٢) (٤٢١).

(٢) متفق عليه: البخاري (٣٩٤)، ومسلم (٨٥١). وانظر: إرواء الغليل (٣/٨٤).

(٣) أخرجه أبو داود (١١١٨)، والنسائي (٣/١٠٣)، والحاكم (١/٢٨٨)، وصححه وافقه الذهبي. وصححه الألباني «صحيح ابن ماجه» (٩١٦).

ڕێگایەکی تری نەبێت مەگەر بەمە، هەروەها کەڕاهەتی هەیە دو کەس لە یەکتر جیا بکەیتەوە [وبڕۆیتە نێوانیان] لەبەر فەرمایشتی پەیامبەر ﷺ[1]: «مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ [وَتَطَهَّرَ بِمَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ، ثُمَّ ادَّهَنَ أَوْ مَسَّ مِنْ طِيبٍ]، ثُمَّ رَاحَ فَلَمْ يُفَرِّقْ بَيْنَ اثْنَيْنِ، فَصَلَّى مَا كُتِبَ لَهُ، [ثُمَّ إِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ أَنْصَتَ]، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى» «هەر کەس لە ڕۆژی هەینی دا خۆی بشوات وئەوەندەی توانی خۆی پاك کردەوە، ئینجا ڕۆنی لە قژیدا یا بۆنی لە خۆیدا، ئینجا زو ڕۆیشت ودو کەسی لە یەك جودا نەکردەوە، وئەوەندەی بۆی نوسرا بو نوێژی کرد، ئیتر کە وتار بێژ هات بێ دەنگ بو، ئەوا لە نێوان ئەم هەینیە وهەینیەکەی تر لێی خۆش دەبێت».

## پرسی حەوتەم: بە چی دەگەیتە جومعە؟

بە گەیشتنە یەك ڕکات لەگەڵ پێشەوادا گەیشتوی بە جومعە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ بەرزی دەکاتەوە: «مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الْجُمُعَةِ رَكْعَةً، فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ»[2] «هەر کەس بگاتە یەك ڕکاتی جومعە، ئەوا بەڕاستی گەیشتۆتە نوێژي جومعە». ئەگەریش گەیشتە کەمتر لە ڕکاتێك ئەوا نوێژ نیوەڕۆ دەکات.

## پرسی هەشتەم: لە بارەی نوێژی سوننەتی جومعەوە:

نوێژی جومعە سوننەتی پێشینەی نیە، بەڵام کەسێك سوننەتی ڕەها بکات پێش هاتنی کاتی بانگ، ئەوا هیچی تێدا نیە [بەڵکو سوننەتە]، چونکە پەیامبەر ﷺ

---

(١) أخرجه البخاري (٩١٠).

(٢) أخرجه ابن ماجه (١١٢١)، وصححه الألباني (صحيح سنن ابن ماجه ٩٢٧، ٩٢٨). [كذا خرَّجوه وفقهم الله، ولفظه في الموضع المشار إليه: «...رَكْعَةً فَلْيَصِلْ إِلَيْهَا أُخْرَى» واللفظ المذكور عند ابن خزيمة: (١٨٥٠) (٣/٣١٠)، وفي ابن ماجه أيضًا: (١١٢٣) ولكن بزيادة: «...مِنْ صَلَاةِ الْجُمُعَةِ أَوْ غَيْرِهَا...»].

هانی بۆ لا داوە، وەك لە فەرمودەکەی سەلمانی پێشودا ﷺ هاتوە: «هەر کەس لە ڕۆژی هەینی دا خۆی بشوات... ئینجا زو چو ودو کەسي لە یەك جودا نەکردەوە، وئەوەندەی بۆی نوسرا بو نوێژی کرد»، ولەبەر کاری هاوەڵان ﷺ، ولەبەر ئەوەی نوێژی سوننەت فەزڵدارە، نەشی کرد نکوڵی لیٚ ناکرێت، چونکە سوننەتە ڕاتیبەکەی جومعە ها لە پاشەوەی کە بریتیە لە دو یا چوار یا شەش ڕکات، کە پەیامبەر ﷺ کردویەتی وفەرمانیشی پیٚ کردوە، چونکە «دوای جومعە دو ڕکاتی دەکرد»[1]. هەروەها ئەفەرموێ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيُصَلِّ بَعْدَهَا أَرْبَعًا»[2] «گەر کەسێکتان نوێژی جومعەی کرد با چوار ڕکات لە پاشیەوە بکات».

لە ڕیوایەتێکی تردا: «کامتان دوای جومعە نوێژی کرد با چوار ڕکات بکات»[3]، سەبارەت بە شەش؛ لەبەر ئەوەی ئیبن عومەر ﷺ ئەگەر لە مەککە بوایە ونوێژی جومعەی بکردایە، دەچوە پێشەوە دو ڕکاتی دەکرد، پاشان پێش دەکەوت وچوار ڕکاتی دەکرد، ئەگەریش لە مەدینە بوایە، نوێژی جومعەی دەکرد ودەگەڕایەوە ولە ماڵەوە دو ڕکاتی دەکرد ولە مزگەوت نوێژی نەدەکرد، کە پێیان وت، وتی: پەیامبەر ﷺ وای دەکرد[4].

---

(١) متفق عليه: البخاري (٩٣٧)، ومسلم (٨٨٢).

(٢) أخرجه مسلم (٨٨١) [هكذا اللفظ في الموضع المشار إليه، وفي الأصل: «أربع ركعات»].

(٣) صحيح مسلم (٨٨١) ٦٩.

(٤) أخرجه أبو داود (١١٣٠).

لەمەوە ڕون بویەوە کەمترین سوننەت دوای جومعە دو ڕکاتە، ئەوپەڕەکەشی شەشە، هەندیّك لە زانایانیش ئەڵیّن: ئەگەر لە مزگەوت کردی چوار ڕکات دەکات، لە ماڵەوەش کردی دو ڕکات دەکات[1]. کەواتە بە گوێرەی حاڵەتەکان جۆراوجۆرە.

## پرسی نۆیەم: چۆنیّتی نویّژی جومعە:

نویّژی جومعە دو ڕکاتە، وقورئان خوێندنەی نویّژەکە بە ئاشکرایە، چونکە ﷺ وای دەکرد، وکرداریشی لە سوننەتی ویە ﷺ، وزانایانیش کۆکن لە سەر ئەمە، سوننەتیشە لە ڕکاتی یەکەمدا سوەرتی «جومعە»، ولە دوەمیشدا «مونافیقون» بخوێنیّت دوای فاتیحا[2]، یا لە یەکەم «ئەعلا» دەخوێنیّت ودوەمیش «غاشیە»[3]، چونکە پەیامبەر ﷺ وای کردوە.

## پرسی دەیەم: لە بارەی سوننەتەکانی جومعەوە:

١- سوننەتە زو بڕوات بۆ نویّژ، تا پاداشتی مەزنی دەست بکەویّت، لە فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ غُسْلَ الْجَنَابَةِ، ثُمَّ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الْأُولَى فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشًا أَقْرَنَ، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الْخَامِسَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَيْضَةً، فَإِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ حَضَرَتِ الْمَلَائِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ» «هەر کەس لە ڕۆژی جومعەدا غوسل دەر بکات وەك غوسلی لەشگرانی، پاشان زو

(١) «زاد المعاد» (١/٤٤٠).
(٢) أخرجه مسلم (٨٧٧).
(٣) أخرجه مسلم (٨٧٨).

بڕوات لە یەکەم ساتیدا، وەکو ئەوە وایە وشترێکی کردبێتە خێر بۆ نزیك بونەوە لە خوا، وهەر کەس لە ساتی دوەمیدا بڕوات وەکو ئەوە وایە مانگایەکی بەخشی بێتەوە، وهەر کەس لە ساتی سێیەمیدا بڕوات وەکو ئەوە وایە بەرانێکی شاخداری کردبێتە صەدەقە، وهەرکەس لە ساتی چوارمیدا بڕوات، وەکو ئەوە وایە مریشکێکی کردبێتە خێر، وهەرکەس لە ساتی پێنجەمیدا بڕوات، وەکو ئەوە وایە هێلکەیەکی کردبێتە خێر، کە پێشەوا هات ئیتر فریشتەکان ئامادە دەبن وگوێ لە وتار دەگرن»[1]. هەروەها ئەفەرموێ: «مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَغَسَّلَ[2]، وَبَكَّرَ وَابْتَكَرَ[3]، وَدَنَا، وَاسْتَمَعَ، وَأَنْصَتَ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ يَخْطُوهَا أَجْرُ سَنَةٍ؛ صِيَامُهَا وَقِيَامُهَا» «هەر کەس جومعە خۆی بشوات وسەریشی بە جوانی بشوات یا غوسلیش بخاتە سەر ژنەکەی، زوش بێت وبگاتە سەرەتای وتار، نزیك پێشەواش دابنیشێت، جوانیش گوێ بگرێت، وبێ دەنگ بێت، ئەوا هەر هەنگاوێکی دەینات پاداشتی سالێك ڕۆژو وشەو نوێژی هەیە»[4].

٢- وخۆشۆردن لە ڕۆژەکەی سوننەتە: لە بەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرەی پێشو: «هەر کەس لە ڕۆژی جومعەدا غوسل دەر بکات وەك غوسلی لەشگرانی» وئەبێت سور بێت لە سەری وازی لێ نەهێنێت، بە تایبەت ئەوانەی بۆنی ناخۆشیان لێ دێت.

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٨٨١)، ومسلم (٨٥٠).
(٢) [«روي بالتشديد والتخفيف، قيل: أراد به غسل رأسه... ويرجح هذا لفظ أبي داود: «من غسل رأسه واغتسل»، وما في البخاري عن طاوس: «ذكروا أن النبي ﷺ قال: «اغتسلوا واغسلوا رءوسكم»... وقيل: جامع زوجته فأوجب عليها الغسل؛ فكأنه غسلها، وقيل: كرر ذلك للتأكيد»].
(٣) [«وابتكر» أي: أدرك أول الخطبة، وقيل: كرره للمبالغة والتأكيد»].
(٤) أخرجه الترمذي (٤٩٦) وحسنه، وحسّنه أيضاً: المنذري «الترغيب والترهيب» (١/٢٤٧).

٣- هەروەها سوننەتە بۆن لە خۆی بدات وخۆی پاکەوە بکات، وئەوەی ئەبێ لابرێ لە لاشە لایبدات، وەك گرتنی نینۆك وجگە لەویش.

خۆ پاککردنەوەش شتێکی زیاترە لە خۆشۆردن، ئەمەش بەوە دەبێت بۆنە گەنەکان وهۆکارەکانی لە خۆی لابدات، وەك ئەو موانەی شەرع فەرمانی کردوە بە لابردنی، هەروەها نینۆکەکان، جا سوننەتە لەگەڵ خۆشۆردنی جومعەدا موی بەر ودوا وبن باڵ لا ببرێت، ونینۆك بگیرێت، سمێل کورت بکرێتەوە وبۆن لە خۆ بدرێت، لەبەر فەرمودەکەی سەلمان [ی پێشو] بەرزی دەکاتەوە: «کەس نیە لە ڕۆژی جومعە خۆی بشوات وئەوەندەی توانی خۆی پاك کردەوە، وڕۆن لە قژی بدات یا لە عەتری ماڵەوە بۆن لە خۆی بدات، وزو بڕوات ودو کەس لە یەك جودا نەکاتەوە، وئەوەندەی بۆی نوسرا بو نوێژی کرد، ئینجا کە پێشەوا هات بێ دەنگ بێت، مەگەر لە نێوان ئەم هەینیە وهەینیەکەی تر خوا لێی خۆشدەبێت»[1]. ئیبن حەجەر ئەڵێ: مەبست پێی موبالەغەیە لە خۆ پاککردنەوە، هەروەها ئەمە لەوەشەوە دەفامرێت کە لەگەڵ خۆشۆردن هاتوە... کە خۆشۆردن مەبەست لێی: گرتنی سمێڵ ونینۆك وموی بەر ودوایە»[2].

٤- هەروەها سوننەتە جوانترین جلوبەرگ لەبەر بکات، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر ﵄: «عومەری کوڕی خەتتاب کراسێکی ئاوریشمی جوانی بینی لە لای دەرگای مزگەوت، وتی: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ئەگەر ئەمە بکڕیایە، ڕۆژانی هەینی، وبۆ هاتنی وەفد ونوێنەرەکان لەبەرت بکردایە»، بوخاری ﵀ ئەم فەرمودەیە دەکاتە بەڵگە بۆ پۆشینی جوانترین جلوبەرگ بۆ ڕۆژانی جومعە، وەك ئەڵێ: «بابەتی:

(١) أخرجه البخاري (٩١٠).
(٢) أخرجه البخاري (٨٨٣) وانظر «فتح الباري» (٢/٤٣٢) [وذكر هذا قبله ابن رجب في «فتحه»].

پۆشینی جوانترینی ئەوەی هەیەتی». حافز ئیبن حەجەر ئەڵێ: «ڕوانگەی کردنە بەڵگە ئەوەیە: پەیامبەر ﷺ ئیقراری عومەر دەکات لە سەر بنچینەی خۆ ڕازاندنەوە بۆ جومعە»[١]، ولە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «مَا عَلَى أَحَدِكُمْ لَوِ اشْتَرَى ثَوْبَيْنِ لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ سِوَى ثَوْبَيْ مِهْنَتِهِ» «هیچتان لە سەر نیە ئەگەر دو کراس بکڕن بۆ ڕۆژی جومعە، جگە لە دو جلوبەرگی ئیشەکەی»[٢].

٥- هەروەها سوننەتە لە شەو وڕۆژەکەیدا زۆر صەڵاوات بدرێ لە سەر پەیامبەر ﷺ، لە بەر فەرمودەی: «فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ فِيهِ» «زۆر صەڵاواتم لە سەر بدەن تێیدا»[٣].

٦- هەروەها سوننەتە لە نوێژی بەیانیەکەیدا هەر دو سورەتی «سەجدە» و«ئینسان» بخوێنێت، چونکە پەیامبەر ﷺ بەردەوام بوە لە سەری[٤].

٧- [٥] هەروەها سوننەتە لە ڕۆژەکەشیدا سورەتی کەهف بخوێنرێ، لەبەر فەرمودەی پەیامبەر ﷺ[٦]: «إِنَّ مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَضَاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ مَا بَيْنَ الْجُمُعَتَيْنِ» «هەر کەس سورەتی کەهف بخوێنێت لە ڕۆژی جومعەدا ئەوا نورێکی بۆ دەدرەوشێتەوە تا نێوان هەر دو جومعەکە دەڕوات».

---

(١) «فتح الباري» (٢/٤٣٤).

(٢) أخرجه أبو داود (١٠٧٨)، وابن ماجه (١٠٩٥)، وصححه الألباني في «صحيح ابن ماجه» (٨٩٨).

(٣) أخرجه أبو داود (١٠٤٧)، والنسائي (٣/٩١)، وابن ماجه (١٠٨٥)، والحاكم (١/٢٧٨)، وصححه وافقه الذهبي، وصححه الألباني «صحيح ابن ماجه» (٨٨٩) [واللفظ المثبت هو من المواضع المشار إليها]

(٤) صحيح البخاري (رقم ٨٩١)

(٥) [لە عەرەبیەکەی دا لەگەڵ خاڵی پێشوە].

(٦) أخرجه الحاكم (٢/٣٦٨)، وصححه، وصححه الألباني «الإرواء» (٣/٩٣). [فالمثبت هنا هو لفظ الحاكم في الموضع الذي أشاروا إليه، وهو من حديث أبي سعيد، أما المثبت عندهم (النسخة العربية) فمن حديث ابن عمر، أخرجه المنذري في «الترغيب والترهيب» وضعفه الألباني وتفصيله في «تمام المنة»].

٨- وسوننەتە بۆ کەسێك لە ڕۆژی جومعە چوە مزگەوتەوە دانەنیشێت تا دو ڕکات نوێژ دەکات، چونکە پەیامبەر ﷺ فەرمانی پێکردوە(١)، ئەگەریش لە میانی وتاری پێشەوادا بو، کورتی دەکاتەوە.

٩- هەروەها سوننەتە زۆر بپاڕێتەوە وچاودێری ساتی گیرا بونی دوعا بکات، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «إِنَّ فِي الْجُمُعَةِ لَسَاعَةً لَا يُوَافِقُهَا مُسْلِمٌ [وَهُوَ] قَائِمٌ يُصَلِّي، يَسْأَلُ اللهَ خَيْرًا، إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ» «هەینی ساتێکی کەمی تێدایە، هیچ موسڵمانێك ڕێکەوتی لێ ناکەوێ خەریکی داوای خێر کردن بێت لە خوا، مەگەر خوا پێی دەبەخشێت»(٢).

---

(١) صحيح البخاري (٩٣٠).
(٢) أخرجه البخاري (٩٣٥)، ومسلم (٨٥٢) [واللفظ له، والزيادة التي ذكروها للبخاري].

# دەروازەی یانزەهەم

# لە بارەی نوێژی ترسەوە ( صَلاَةُ الخَوْفِ )

ئەمە عوزری سێیەمە لەو عوزرانەی کە نوێژ لە شێوازەکەی یا ژمارەکەی جیاوازە، پێشتریش باسی دوو عوزری ترمان کرد کە نەخۆشی وسەفەر بون.

چەند پرسێکی تێدایە:

## پرسی یەکەم: حوکمی نوێژی ترس وبەڵگەکەی شەرعی بونی، ومەرجەکانی:

### ١- حوکمەکەی:

نوێژی ترس شەرعیە لە هەمو شەڕێکی ڕێگەپێدراودا، وەك شەڕکردن لەگەڵ بێ باوەڕ ودەست درێژی کاران وڕێ گر وڕێ بڕ، لەبەر فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ [النساء:١٠١]، ئەوانی تریش کە دروستە شەڕی لەگەڵ بکەی قیاسی کراوەتە سەر ئەمە.

جا ئەم نوێژە شەرعیە لە کاتی ترسان لە هێرشی دوژمن، یا ڕا کردن لە دوژمن ئەگەر ڕا کردنەکە حەڵاڵ بێت. دوژمنیش هەمو دوژمنێك دەگرێتەوە ئادەمی بێت یا دڕندە لەو شتانەی مرۆڤەکان ترسیان لە خۆیان هەبێت لێیان، وەك ئەو هێرشبەر «الصائل»ـەی پەلاماری ماڵ ومنداڵی دەدات، هەروەها خاوەن قەرزی ستەمکار وجگە لەمانەش.

### ٢- بەڵگەی شەرعی بونی:

بەڵگەش لە سەر ئەمە: قورئان وسوننەت وکۆ دەنگیە، سەبارەت بە قورئان بریتیە لە ئایەتی: ﴿وَإِذَا كُنْتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلاَةَ فَلْتَقُمْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ مَعَكَ

وَلْيَأْخُذُوا أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا فَلْيَكُونُوا مِنْ وَرَائِكُمْ وَلْتَأْتِ طَائِفَةٌ أُخْرَى لَمْ يُصَلُّوا فَلْيُصَلُّوا مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ﴾ [النساء:١٠٢] «وئەگەر ئەی پەیامبەر خوا لە گۆڕەپانی جەنگدا بویت ویستت نوێژیان بۆ بکەیت، ئەوا با کۆمەڵێکیان لەگەڵتدا نوێژ بکەن وچەکەکانیان پێ بێت، کە ئەمان سوژدەیان برد با کۆمەڵەکەی تر لە پشتەوە چاویان لە دوژمن بێت وروبەڕویان بن، ئیتر کۆمەڵی یەکەم لە پێشەوە ڕکاتی دوەمیشیان تەواو دەکەن وسەلام دەدانەوە، پاشان کۆمەڵی دوەم دێن کە هێشتا نوێژیان نەکردوە، با چاوت لێ بکەن لە ڕکاتی یەکەمیاندا پاشان دوای سەلامدانەوەی تۆ ڕکاتەکەی تر بۆ خۆیان تەواو بکەن وبا چەکیشیان پێ بێت وریای دوژمن بن».

وپەیامبەریش ﷺ ئەنجامی داوە وهاوەڵانیش کۆك بون لە سەر کردنی.

**٣- مەرجەکانی:**

نوێژی ترس ڕێگە پێدراوە بە دو مەرج:

**مەرجی یەکەم:** دوژمنەکە لەوانە بێت کە شەڕ لەگەڵ کردنی حەڵاڵ بێت، وەك جەنگ لەگەڵ کافران ودەست درێژی کاران، وڕێ گر وڕێ بڕەکان.

**مەرجی دوەم:** مەترسی هێرشکردنی هەبێت لە کاتی نوێژدا.

**پرسی دوەم: چۆنێتی نوێژی ترس:**

نوێژی ترس چەندین شێوازی هەیە، لەوانە ئەو شێوازەیە لە فەرمودەکەی سەهلی کوڕی ئەبو حەثمەی ئەنصاریەوە ﷛ هاتوە لە پەیامبەرەوە ﷺ کە زیاتر لەو شێوازە دەچێ لە قورئاندا هاتوە، وئیحتیاتی تێدایە بۆ نوێژ وبۆ شەڕیش، هەروەها شکستی

دوژمنی تێدایە. پەیامبەریش ﷺ لە غەزای «ذات الرقاع»دا ئەم نوێژەی ئەنجام داوە، شێوازەکەشی وەك سەهل دەیگێڕێتەوە ئەوەیە: کۆمەڵێك لە پشتی پەیامبەرەوە ﷺ ڕیزیان بەستوە، وکۆمەڵێکیش ڕوبەڕوی دوژمن وەستاون، یەك ڕکاتی نوێژی کرد بۆ ئەوانەی پشتی، پاشان بە پێوە وەستا، ئەوانیش ڕکاتەکەی تریان بۆ خۆیان کرد وئینجا ڕۆیشتن وڕوبەڕوی دوژمن ڕیزیان بەست، کۆمەڵی دوەمیش هاتن وئەو ڕکاتەی مابو بۆی کردن، پاشان بە دانیشتنەوە مایەوە تا ئەوان ڕکاتێکی تریان بۆ خۆیان کرد پاشان سەلامی بۆ دانەوە[1].

(١) أخرجه مسلم (٨٤١).

# دەروازەی دوانزەهەم

# لە بارەی نوێژی جەژنەوە

هەر دو جەژنەکە بریتین لە: جەژنی قوربان وجەژنی ڕەمەزان، وهەر دوکیشیان بۆنەیەکی شەرعیان هەیە؛ جەژنی ڕەمەزان بە بۆنەی ئەوەیە موسڵمانان ڕۆژوی ڕەمەزان تەواو دەکەن، هی قوربانیش بە بۆنەی کۆتایی هاتنی نۆمینەی حاجیانەوە، پێشی وتراوە: «عید= جەژن» لەبەر ئەوەی دێتەوە ودوبارە دەبێتەوە (یعود) لەو کاتە.

## چەند پرسێکی تێدایە:

## پرسی یەکەم: حوکمی نوێژی جەژن وبەڵگەکانی:

نوێژی جەژن فەرزی کیفایەیە، ئەگەر هەندێك پێی هەستن لە سەر باقیەکە دەکەوێت، ئەگەریش کەس نەیکات، هەموی تاوانبار دەبێت، چونکە لە دروشمە دیارەکانی ئیسلامە، هەروەها پەیامبەر ﷺ بەردەوام بوە لە سەری، تەنانەت پەیامبەر ﷺ فەرمانی بە ئافرەتانیش کردوە، ئەوەندە نەبێت فەرمانی کرد ئەوانەی لە سوڕی مانگانەن دور بگرن لە نوێژگە، ئەمەش بەڵگەیە لە سەر گرنگی وگەورەیی فەزڵەکەی، چونکە ئەگەر فەرمان بە ئافرەتان بکات لە کاتێکدا لە ئەهلی جەماعەت نین، سا پیاوان لە پێشترن، هەندێك لە زانایانیش ئەوەی پێ بەهێزە فەرزی عەین بێت لە سەر تاك تاك.

## پرسی دوەم: مەرجەکانی نوێژی جەژن:

ولە گرنگترین مەرجەکانی: هاتنی کات، وبونی ژمارەی حساب بۆکراو، ونیشتەجێ بونە.

جا پێش کاتەکە دروست نیە، وهەروەها دروست نیە بە کەمتر لە سێ کەس، وپێویستیش نیە لە سەر ڕێبوارێکی نانیشتەجێ.

## پرسی سێیەم: ئەو شوێنانەی نوێژەکەی تێدا دەکرێت:

سوننەتە لە دەشتدا لە دەرەوەی بیاناکان بکرێت، لەبەر فەرمودەکەی ئەبو سەعید ﷺ: «پەیامبەر ﷺ لە قوربان ورەمەزاندا دەردەچو بۆ نوێژگە»[1]، مەبەستیش لەمە -خواش زاناترە- ئاشکراکردن ودەرخستنی ئەم دروشمەی ئیسلامە، ودروستیشە لە مزگەوتی جامعدا بکرێ ئەگەر عوزرێك هەبو وەك باران وبای توند وهاوشێوەکانی.

## پرسی چوارەم: کاتەکەی:

کاتەکەشی وەك کاتی چێشتەنگا وایە دوای بەرزبونەوەی خۆر بە ئەندازەی ڕمێك دەست پێ دەکات تا لادانی خۆر لە جەرگەی ئاسمان، چونکە خۆی ﷺ وجێنشینەکانیشی دوای بەرزبونەوەی خۆر ئەنجامیان دەدا، ولەبەر ئەوەی پێش بەرزبونەوەی خۆر کاتێکی نەهی لێکراوە[2]، هەروەها سوننەتە جەژنی قوربان زو لە سەرەتای کاتی خۆیدا بکرێت، ورەمەزانیش دوا بخرێت، چونکە خۆی ﷺ وای کردوە، وخەڵکیش لە قوربان پێویستیان بە پەلە کردنە بۆ سەر بڕینی قوربانیەکانیان، بەڵام لە ڕەمەزاندا پێویستیان بە درێژبونەوەی کاتەکە هەیە تا سەر فترە بدەن.

---

(١) متفق عليه: البخاري (٩٥٦)، ومسلم (٨٨٩).

(٢) انظر: المغني (٢/٢٣٢-٢٣٣).

## پرسی پێنجەم: شێوازەکەی وئەوەی تێیدا دەخوێنرێت:

شێوازەکەشی: دو ڕکاتە پێش وتار، لەبەر وتەکەی عومەر: «صَلَاةُ الْأَضْحَى رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ الْفِطْرِ رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَانِ، تَمَامٌ غَيْرُ قَصْرٍ عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ ﷺ [وَقَدْ خَابَ مَنِ افْتَرَى]» «نوێژی جەژنی ڕەمەزان دو ڕکاتە، قوربانیش دو ڕکاتە، جومعەش دو ڕکاتە بە تەواوەتی بێ کورتکردنەوە لە سەر زوبانی پەیامبەرەکەتان [وسەر شۆڕی بۆ ئەوەی درۆ هەڵدەواسێت]»[1]. لە ڕکاتی یەکەمدا دوای تەکبیرەی دابەستن ونزای سەرەتا وپێش پەناگرتن شەش جار تەکبیر دەکات، ولە دوەمیشدا پێش قورئان خوێندن پێنج جار تەکبیرە دەکات بە بێ تەکبیرەی دابەستن، لەبەر فەرمودەکەی عائیشە ﵂: «كَانَ يُكَبِّرُ فِي الْفِطْرِ، وَالْأَضْحَى فِي الْأُولَى سَبْعَ تَكْبِيرَاتٍ، وَفِي الثَّانِيَةِ خَمْسًا» «لە ڕەمەزان وقورباندا لە ڕکاتی یەکەمدا حەوت ولە دوەمدا پێنج تەکبیری دەکرد»[2]. ولەگەڵ هەمو تەکبیرەیەکدا دەستی بەرز دەکاتەوە، چونکە پەیامبەر ﷺ: «يَرْفَعُ يَدَيْهِ مَعَ التَّكْبِيرِ» «لەگەڵ تەکبیرەکاندا دەستی بەرز دەکردەوە»[3]. پاشان دوای پەناگرتن بە کۆ دەنگ قورئان بە ئاشکرا دەخوێنێ. جا فاتیحا دەخوێنێت، ئینجا لە ڕکاتی یەکەمدا ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾ ولە دوەمیشدا «غاشیە» دەخوێنێت، لەبەر وتەکەی سەمورە ﵁: «پەیامبەر ﷺ لە هەر دو جەژنەکەدا ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾ و﴿هَلْ أَتَاكَ

---

(١) أخرجه أحمد (٣٧/١)، والنسائي (٢٣٢/١)، والبيهقي (٢٠٠/٣)، انظر: «الإرواء» (١٠٦/٣). [والمثبت هو اللفظ المذكور في المواضع المشار إليها، والزيادة التي زادوها -وفقهم الله تعالى- من النسائي في «الكبرى» (٤٩٥)، وابن خزيمة (١٦٠٧)].

(٢) صحيح: أخرجه أبو داود (١١٤٩)، انظر: «الإرواء» (٢٨٦/٣) [والمثبت هو لفظه].

(٣) أخرجه أحمد (٣١٦/٤)، وحسنه الألباني في «الإرواء» [(١١٣/٣)] (٦٤١).

حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ﴾ دەخوێند»[1]، هەروەها بە صەحیحی لێوەی هاتوە ﷺ کە لە ڕکاتی یەکەمدا ﴿ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ﴾ ولە دوەمیشدا ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ﴾ی خوێندوە[2]، جا جارێك ئەمە دەخوێنێت وجارێکیش ئەوە، وەك سوننەت، لەگەڵ ڕەچاوکردنی بارودۆخی نوێژخوێنان، وئاسانترەکەیان لەگەڵ دەکات.

## پرسی حەوتەم: شوێنی وتاری جەژن:

شوێنی وتار لە جەژندا دەکەوێتە دوای نوێژەوە، لەبەر وتەکەی ئیبن عومەر ﷺ: «پەیامبەر ﷺ وئەبوبەکر وعومەر نوێژی هەر دو جەژنەکەیان دوای وتار دەکرد»[3].

## پرسی هەشتەم: قەزاکردنەوەی نوێژی جەژن:

کەسێك نوێژی جەژنی لە دەست چو سوننەت نیە بیگێڕێتەوە، چونکە هیچ بەڵگەیەك لە پەیامبەرەوە ﷺ نەهاتوە لەم بارەوە، لەبەر ئەوەش ئەم نوێژە کۆبونەوەیەکی تایبەتی هەیە، بۆیە شەرعی نیە مەگەر بەو شێوازە.

## پرسی هەشتەم: سوننەتەکانی:

١- سوننەتە نوێژی جەژن لە شوێنێکی دیار وفراوان بکرێت، لە دەرەوەی شار، موسڵمانان تێیدا کۆ دەبنەوە بۆ دەرخستنی ئەم دروشمە، ئەگەریش لە مزگەوت بکرێت بە هۆی عوزرێکەوە هیچی تێدا نیە.

---

(١) أخرجه أحمد (٥/٧) وابن ماجه (١٢٨٣)، وصححه الألباني (الإرواء ٦٤٤).
(٢) أخرجه مسلم (٨٩١).
(٣) أخرجه البخاري (٩٦٣)، ومسلم (٨٨٨).

٢- هەروەها سوننەتە نوێژی جەژنی قوربان زو بكرێ وهی جەژنی ڕەمەزان دوا بخرێ، وەك لە باسی كاتەكەیدا ڕونكرایەوە.

٣- وبۆ جەژنی ڕەمەزان پێش دەرچون چەند خورمایەك بخوات، وبۆ قوربانیش هیچ نەخوات تا نوێژ دەكات، چونكە پەیامبەر ﷺ وای دەكرد، لە ڕەمەزان دەرنەدەچو تا چەند خورمایەكی نەخواردایە بە تاكی دەیخوارد[١]، ولە قورباندا هیچی نەدەخوارد تا نوێژی دەكرد[٢].

٤- هەروەها سوننەتە بە پێ زو دەر بچێت بۆ جەژن دوای نوێژ بەیانی، بۆ ئەوەی بتوانێ نزیك پێشەوا دابنیشێت، وپاداشتی چاوەڕێكردنی نوێژی دەست بكەوێت.

٥- سوننەتیشە موسڵمان خۆی بڕازێنێتەوە، وخۆی بشۆرێت، وجوانترین جلوبەرگ لەبەر بكات، وبۆن لە خۆی بدات.

٦- هەروەها سوننەتە لە جەژندا وتارێكی كۆكەرەوە وگشتگیر بدات بۆ سەرجەم كاروبارەكانی دین، وهانیان بدات بۆ زەكاتی سەر فترە، وبۆیان باس بكات چی دەردەكەن، وهانیان دەدات بۆ قوربانی كردن وحوكمەكانی ڕون دەكاتەوە، بەشی ئافرەتانیشی تێدا دا دەنێت، چونكە پێویستیان بەوەیە، وەكو شوێنكەوتنی پەیامبەریش ﷺ؛ كە نوێژ وتارەكەی تەواوكرد هات بۆ لایان وئامۆژگاری كردن ویادی خستنەوە[٣]. نوێژیش دوای وتارە وەك ڕابورد.

---

(١) أخرجه البخاري (٩٥٣).
(٢) أخرجه الترمذي (٥٤٢)، وابن ماجه (١٧٥٦)، وصححه الألباني (صحيح ابن ماجه ١٤٢٢).
(٣) أخرجه البخاري (٩٧٨).

٧- هەروەها سوننەتە زیکری زۆر بکرێت بە «الله أکبر» «لا إلە إلا الله» لەبەر فەرمایشتە پیرۆزەکەی خوا: ﴿وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ [البقرة: ١٨٥] «وبۆ ئەوەی ڕۆژوی مانگەکە تەواو بکەن لە کۆتاییەکەی تەکبیرات بکەن لە ڕۆژی جەژندا، وخوا بە مەزن وگەورە ڕابگرن لە سەر ڕێنمایی کردنتان، هەروەها بۆ ئەوەی شوکرانە بژێری بکەن لە سەر نیعمەت پێ بەخشینتان»، وپیاوان بە ئاشکرا ئەیڵێن لە ماڵ ومزگەوت وبازارەکاندا، وئافرەتانیش بە نائاشکرا.

٨- گۆڕینی ڕێگا، جا بە ڕێگایەك دەڕوات بۆ جەژن وبە یەکێکی تر دێتەوە، لەبەر فەرمودەکەی جابر ﵁: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا كَانَ يَوْمُ عِيدٍ خَالَفَ الطَّرِيقَ» «پەیامبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژندا ڕێگاکەی دەگۆڕی»[1]. وتراویشە: دانایی لەمەدا ئەوەیە: تا هەر دو ڕێگاکە شاهێدی بۆ بدەن، وتراویشە: بۆ دەرخستنی دروشمی ئیسلامە لە هەر ڕێگاکە، جگە لەمەش وتراوە.

هەروەها هیچی تێدا نیە خەڵك پیرۆزبایی لە یەکتر بکەن لە ڕۆژی جەژندا، وەك بڵێ: «تَقَبَّلَ الله منا ومنك صالح الأعمال» «خوا کردەوەی چاکە لە ئێمە وئێوەش وەر بگرێت»، وەك هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ دەیانکرد، لەگەڵ دەرخستنی ڕوخۆشی وخۆشحاڵی بە ڕوی ئەوانەی پێیان دەگات لەو ڕۆژەدا.

---

(١) أخرجه البخاري (٩٨٦).

# دەروازەی سیانزەهەم

# لە بارەی نوێژە بارانەوە

چەند پرسێك لە خۆ دەگرێت:

## پرسی یەکەم: پێناسەی نوێژە بارانە، وحوکمەکەی، وبەڵگەکەی:

**١- پێناسەکەی:**

داوای بارانکردن «الاستسقاء» بریتیە لە داوای باران کردن لە خوا ﷻ لە کاتی پێویستی بەندەکان پێی، بە شێوەیەکی دیاریکراو، ئەمەش ئەگەر زەوی بێ ئاو وئاسمان بێ باران بو، چونکە کەس باران نابارێنێت جگە لە خوا.

**٢- حوکمەکەی:**

سوننەتێکی تەئکید لە سەر کراوە، لەبەر وتەکەی عەبدولاّی کوڕی زەید ﵁: «خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ يَسْتَسْقِي، فَتَوَجَّهَ إِلَى الْقِبْلَةِ يَدْعُو، وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، جَهَرَ فِيهِمَا بِالْقِرَاءَةِ» «پەیامبەر ﷺ دەرچو بۆ نوێژەبارانە دەپاڕایەوە، وعابەیەکەی هەڵگێڕایەوە، پاشان دو ڕکاتی کرد وقورئانەکەی بە ئاشکرا خوێند»[١].

## پرسی دوەم: هۆکاری نوێژە بارانە:

هۆکارەکەی وشکە ساڵیە، کە بریتیە لە باران نەبارین، چونکە پەیامبەر ﷺ لەبەر ئەوە کردی.

---

(١) أخرجه البخاري (١٠١١)، ومسلم (٨٩٤).

## پرسی سێیەم: کاتەکەی وشێوازەکەی:

کاتی نوێژە بارانە وشێوازەکەی وەك نوێژی جەژن وایە، لەبەر وتەکەی ئیبن عەبباس ﷺ: «صَلَّى [ﷺ] رَكْعَتَيْنِ كَمَا يُصَلِّي فِي الْعِيدَيْنِ»[1] «دو ڕکات نوێژی کرد وەك چۆن لە دو جەژنەکە دەیکرد». جا سوننەتە لە نوێژگە بکرێ وەك نوێژی جەژن، ودو ڕکات دەکات، وبە ئاشکرا قورئانەکەی دەخوێنێت وەك نوێژی جەژن، دەشکەوێتە پێشی وتارەوە، هەروەها لە ژمارەی تەکبیرەکان وئەوەی تێیدا دەخوێنرێت هەر وایە، هەروەها داوای باران کردن بە هەرشێوەیەك بێت دروستە، جا مرۆڤ دەپاڕێتەوە وداوای باران دەکات لە نوێژەکەیدا چونکە دوعایە، هەروەها دروستە پێشەواش لە هەینیدا لە سەر سەکۆوە داوای باران بکات، چونکە پەیامبەری خوا ﷺ لە سەر مینبەرەوە لە جومعەدا داوای باران بارینی کرد[2].

## پرسی چوارەم: دەرچون بۆ نوێژەبارانە:

کە پێشەوا ویستی بۆ ئەمە دەربچێت، ئامۆژگاری خەڵك دەکات وفەرمانیان پێ دەکات بە تەوبەکردن وازهێنان لە مافی خەڵك وڕق وکینە ودوبەرەکی، چونکە هۆکارێکە بۆ ڕێگریکردن لە دابەزینی خێر لە خواوە ﷻ، هەروەها لەبەر ئەوەی تاوانەکان هۆکاری بێ بارانیە وخۆپارێزیش هۆکاری بەرەکەتە، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَرَكَاتٍ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَلَكِنْ كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ [الأعراف: ٩٦] «وئەگەر خەڵکی شارەکان بڕوایان بە پەیامبەرانیان بهێنایە وشوێنیان بکەوتنایە وبە گوێیان بکردنایە

---

(١) رواه النسائي (١٥٢١)، والترمذي (٥٥٨)، وهو حسن، انظر إرواء الغليل (١٣/٣٣).
(٢) أخرجه البخاري (٩٣٣)، ومسلم (٨٩٧).

ئەوا خوا دەرگاکانی خێری بۆ دەکردنەوە لە هەمو ڕویەکەوە بەڵام بە دڕیان خستنەوە بۆیە خوا سزای دان بە سزای لەناوبەر بە هۆی بێ باوەڕی وسەرپێچیانەوە».
هەروەها خۆی بۆ پاك دەکاتەوە، وبۆن لە خۆی نادات، وبەرگی ڕازاوە ناپۆشێت، چونکە ڕۆژی زەلیلی وملکەچیە، وبە خاکی وزەلیلی وگەردنکەچی دڵ ولاشە وکڕوزانەوەوە دەردەچێت، لەبەر وتەکەی ئیبن عەبباس: «إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ مُتَبَذِّلًا مُتَوَاضِعًا مُتَضَرِّعًا» «پەیامبەر ﷺ دەرچو بۆ نوێژەبارانە بە بەرگێکی ناڕازاوەوە، بە خاکی وکڕوزانەوەوە»[1].

## پرسی پێنجەم: وتاردان تێیدا:

سوننەتە پێشەوا لە نوێژەبارانەدا یەك وتار بدات لە دوای نوێژ، کە کۆکەرەوە وگشتگیر بێت، فەرمانی تێدا دەکات بە تەوبەکردن وزۆر صەدەقە کردن وگەڕانەوە بۆ لای خوا ووازهێنان لە تاوان. وئەبێت لە وتارەکە زۆر داوای لێ خۆشبون بکات، وئەو ئایەتانە بخوێنێتەوە کە فەرمانی پێ دەکات، وزۆر بپاڕێتەوە بۆ داوای باران کردن لە خوا، وەك فەرمایشتەکەی ﷺ: «اللهم أغِثْنا» «خوایە بارانمان بۆ ببارێنە»[2]، وفەرمایشتی: «اللَّهُمَّ اسْقِنَا غَيْثًا مُغِيثًا مَرِيئًا مَرِيعًا عَاجِلًا غَيْرَ آجِلٍ نَافِعًا غَيْرَ ضَارٍّ» «خوایە! بارانی بە کۆمەك بەخشی ئاسان وپاکی بە پیت وبەرهەممان بۆ ببارێنە، زو ودوا نەکەوێت، بە سود بێت بێ زیان»[3]، وفەرمایشتی: «[الْحَمْدُ لِلهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ]،

---

(١) أخرجه الترمذي (٤٥٨) [هذا لفظه!]، وابن ماجه (١٢٦٦)، وهو حسن، انظر: «الإرواء» (١٣٣/٣).
(٢) أخرجه البخاري (١٠١٤)، ومسلم (٨٩٧)، ضمن حديث الاستسقاء الطويل.
(٣) أخرجه أبو داود (١١٦٩)، وصحح الشيخ الألباني إسناده. (تخريج المشكاة ١٥٠٧).

اللَّهُمَّ أَنْتَ اللهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ الْغَنِيُّ، وَنَحْنُ الْفُقَرَاءُ، أَنْزِلْ عَلَيْنَا الْغَيْثَ، وَاجْعَلْ مَا أَنْزَلْتَ لَنَا قُوَّةً، وَبَلَاغًا إِلَى حِينٍ» «ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان، خاوەن بەزەیی وبەزەییکار، خاوەنی ڕۆژی پاداشت وسزا، پەرستراوی هەق، چی ویست لێی بێت ئەنجامی دەدات، خوایە! هەر تۆ خوای هەقی پەرستراوی تر نیە بە هەق جگە لە تۆ، دەوڵەمەند وبێ نیاز، وئێمەش نیازمەند وئاتاج، بارانمان بۆ ببارێنە وئەو خێرەشی دایدەبەزێنی بیکە مایەی هێز وتوێشویەك بمانگەیەنێتە مەبەست»[١]، وهاوشێوەی ئەم پاڕانەوانە، دەستیش بەرز دەکاتەوە چونکە پەیامبەر ﷺ وای دەکرد بە ڕادەیەك سپیایی بن باڵی دەبینرا[٢]، خەڵکیش دەستیان بەرز دەکەنەوە، چونکە پەیامبەر ﷺ لە وتاری هەینیدا کە دەستی بەرز کردەوە بۆ داوای بارانکردن، هاوەڵانیش دەستیان بەرز کردەوە[٣]، هەروەها زۆر صەڵاوات دەدەیت لە سەر پەیامبەر ﷺ چونکە ئەوە مایەی گیرابونی دوعایە.

## پرسی شەشەم: ئەو سوننەتانەی ئەبێت لە نوێژە بارانەدا بکرێت:

١- زۆر بپاڕێتەوە بەو دوعایانەی لەم بارەوە لە پەیامبەرەوە ﷺ گێڕردراوەتەوە، لە کۆتایی دوعاکەشدا ڕو دەکاتە قیبلە، وکەواکەی هەڵدەگەڕێنێتەوە؛ لای ڕاست دەکاتە دەستە چەپی ولای چەپی دەکاتە ڕاستی، وهەر شتێکی تری هاو وێنەی وەك عابا وهاوشێوەکانی...، چونکە چەسپاوە[٤]: پەیامبەر ﷺ پشتی کردە خەڵك وڕوی

(١) أخرجه أبو داود (١١٧٣) [والزيادة له]، وحسّنه الألباني. (تخريج المشكاة ١٥٠٨).
(٢) متفق عليه من حديث أنس ﷺ: أخرجه البخاري (١٠٣٠)، ومسلم (٨٩٥).
(٣) أخرجه البخاري (١٠٢٩) من حديث أنس ﷺ.
(٤) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٠١١)، ومسلم (٨٩٤).

کردە قیبلە دەپاڕایەوە، پاشان کەواکەی هەڵگەڕانەوە، وتراویشە: دانایی لەم هەڵگێڕانەوەیە: گەشبینیە لە گۆڕانی ئەو حاڵ وبارە.

٢- وسوننەتە هەمو موسڵمانان دەربچن بۆ نوێژەبارانە تەنانەت ژن ومنداڵیش.

٣- سوننەتیشە بە ملکەچی وخۆ شکانەوە وزەلیلیەوە دەر بچن، چونکە پەیامبەر ﷺ بە خۆ زەلیل گرتن وخاکی بون وخۆ شکاندنەوە وکڕوزانەوەوە دەرچو بۆ نوێژە بارانە[١].

٤- سوننەتە لە کاتی دابەزینی باراندا لە سەرەتاکەیەوە لە بەری ڕابوەستێ تا بەری بکەوێت، وبڵێ: «اللَّهُمَّ صَيِّبًا نافعًا»[٢] «خوایە! بە خوڕ ولێزمە بە سود بێت»[٣]، وبڵێ: «مُطِرْنا بِفَضْلِ اللهِ وَرَحْمَتِه» «بە فەزڵ وبەزەیی خوا بارانمان بۆ باری»[٤].

٥- ئەگەریش باران زۆر بو، ومەترسی زیان هەبو، سوننەتە بوترێ: «اللَّهُمَّ! حَوْلَنَا وَلَا عَلَيْنَا، اللَّهُمَّ! عَلَى الْآكَامِ وَالظِّرَابِ، وَبُطُونِ الْأَوْدِيَةِ، وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ» «خوایە! دایبەزێنە دەوروبەرمان نەك بۆ سەرمان، خوایە! بۆ سەر گرد وتەپۆڵکە وناو دۆڵەکان وبن دارەکان»[٥].

(١) أخرجه الترمذي وقال: حسن صحيح. پێشتر باسکرا.
(٢) [أخرجه البخاري: (١٠٣٢)، بدون لفظ: «اللهم» وهو عند غيره].
(٣) [أخرجه البخاري: (٨٤٦)، ومسلم: (٧١)].
(٤) [أخرجه البخاري: (٢٠٥/١)، ومسلم: (٨٣/١)].
(٥) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٠٢١)، ومسلم (٨٩٧) واللفظ له [بتقديم وتأخير].

# دەروازەی چواردەهەم

# لە بارەی نوێژی خۆر گیران ومانگ گیران «الخُسُوفُ وَالكُسُوف»

## چەند پرسێکی تێدایە:

## پرسی یەکەم: پێناسەی خۆر گیران، حیکمەت لێی:

**الكسوف:** بریتیە لە دیار نەمانی ڕۆشنایی خۆر ومانگ بە هۆکارێکی نا ئاسایی، و«الخسوف والكسوف» یەك مانایان هەیە، خواش  ئەمە دەکات بۆ ترساندنی بەندەکانی تا بگەڕێنەوە بۆ لای، وەك پەیامبەر ﷺ فەرموی: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَكْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَلَا لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّهُمَا مِنْ آيَاتِ اللهِ يُخَوِّفُ اللهُ بِهِمَا عِبَادَهُ» «خۆر ومانگ لەبەر مردن وژیانی کەس ناگیرێن، بەڵکو لە نیشانە وئایەتەکانی خوان، بەندەکانی پێ دەترسێنێت»[1].

## پرسی دوەم: حوکمی نوێژی خۆر ومانگ گیران وبەڵگەکەی:

نوێژی خۆر ومانگ گیران لە سونەتە تەئکیدکراوەکانە، چونکە پەیامبەر ﷺ فەرمانی پێ کردوە، وبە ترس وبیمەوە دەرچو بۆ کردنی، فەرمویشی: بۆ ترساندنی بەندەکانە[2].

---

(١) أخرجه البخاري (١٠٤٨)، ومسلم (٩١١). [بل الصواب: البخاري (١٠٥٨)، ومسلم (٩٠١) من حديث عائشة، فإن الموضع الذي أشاروا إليه؛ أخرجه البخاري من حديث أبي بكرة وليس فيه موضع الشاهد، ومسلم من حديث أبي سعيد ﷺ].

(٢) انظر: «فتح الباري» (٢/٦١٢).

## پرسی سێیەم: کاتەکەی:

کاتەکەی لە سەرەتای دەستپێکردنیەوە ئەبێت هەتا نەمانی، لەبەر فەرمودەی پەیامبەر ﷺ: «فَإِذَا رَأَيْتُمْ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ فَصَلُّوا حَتَّى تَنْجَلِيَ» «کە شتێك لەو نیشانانەتان بینی نوێژ بکەن تا نامێنێت»[1].

## پرسی چوارەم: چۆنێتیەکەی وئەوەی تێیدا دەخوێنرێت:

شێوازەکەشی: دو ڕکاتە، لە ڕکاتی یەکەمدا فاتیحا وسورەتێکی درێژ دەخوێنێت بە ئاشکرا -شەو بو یا ڕۆژ-، پاشان ڕکوعێکی درێژ دەبات، پاشان سەر بەرز دەکاتەوە، «سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَه» دەکات، وسوژدە نابات بەڵکو دەست دەکاتەوە بە خوێندنی فاتیحا وسورەتێکی درێژی کەمتر لەوەی پێشو، پاشان ڕکوع دەبات وسەر بەرز دەکاتەوە، پاشان دو سوژدەی درێژ دەبات، ڕکاتی دوەمیش وەك یەکەمە بەڵام کورتترە لە هەمو ئەوانەی پێشو، پاشان تەحیات دەخوێنێت وسەلام دەداتەوە. لەبەر وتەکەی جابر ﷺ: «كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي يَوْمٍ شَدِيدِ الْحَرِّ، فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ بِأَصْحَابِهِ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ، حَتَّى جَعَلُوا يَخِرُّونَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ. ثُمَّ قَامَ فَصَنَعَ نَحْوًا مِنْ ذَاكَ. فَكَانَتْ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ»[2] «لە سەردەمی پەیامبەردا ﷺ لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا خۆرگیرا، ئەوەبو نوێژی بە هاوەڵانی کرد، وەستانەکەی زۆر درێژ کردەوە، بەڕادەیەك ئەیاندا بە ئەرزا، ئینجا ڕکوعی برد ودرێژی کردەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە ودرێژی کردەوە، پاشان

---

(١) أخرجه مسلم (٩١٥).

(٢) أخرجه مسلم (٩٠٤).

ڕکوعی برد ودرێژی کردەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە ودرێـژی کـردەوە، ئینجـا دو سوژدەی برد، دوای ئەوە هەستایەوە وڕکاتێکی تری وەك ئەوەی کـرد، بـو بـە چـوار کڕنوش وچوار سوژدە»[١].

سوننەتیشە پێشەوا دوای نوێژەکە ئامۆژگاری خەڵك بکات وئاگاداریـان بکاتـەوە لە بێ ئاگایی وفریوخواردن بە دونیاوە، وفەرمانیان پێ بکات بـە فـرە دوعـا کـردن وداوای لێ خۆشبون کـردن، لەبـەر ئیشـی پەیامبـەر ﷺ؛ دوای نوێژەکـەی وتـاری فەرمو: «[فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ:] إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ، لَا يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَادْعُوا اللهَ وَكَبِّرُوا، وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا» «سوپاس وستایشی خوای کرد ئینجا فەرموی: خۆر ومانگ دو نیشـانەن لە نیشانە وئایەتەکانی خوا، نە لەبەر مردن ونە لەبەر ژیانی کەس ناگیرێن، جـا کـە بینیتان ئەوا بپاڕێنەوە والله أکبر بکەن ونوێژ ئەنجام بدەن وصەدەقە ببەخشنەوە»[٢].

ئەگەر نوێژ تەواو بو هێشتا خۆر یا مانگ دەرنەکەوتبو دوبارەی ناکەنەوە، بەڵکو یـادی خـوا دەکرێـت وزۆر دەپاڕێنـەوە، لەبـەر فـەرمودەی: «فَصَلُّوا وَادْعُوا، حَتَّى يُكْشَفَ مَا بِكُمْ» «ئەوا نوێژ بکەن وبپاڕێنەوە تا لـە سـەرتان لا دەچـێت»[٣]. ئەمـە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی ئەگەر پێش دەرکەوتن سەلامیان دایەوە خۆی سەرقاڵی دوعا دەکات. خۆ ئەگەر دەرکەوت وهێشتا لە نوێژ بون، بە کورتی نوێژەکە تـەواو دەکـات ونایبڕێت.

(١) أخرجه مسلم (٩٠٤).
(٢) أخرجه البخاري (١٠٤٤)، [ومسلم (٩٠١)].
(٣) أخرجه البخاري (١٠٤٠).

# دەروازەی پانزەهەم

# لە بارەی نوێژی مردو وحوکمەکانیەوە

«الجَنَائِز»: کۆی «جَنِازة»یە -بە فەتحە وکەسرەی جیمەکە- یەك واتایان هەیە. وتراویشە: بە فەتحە بە مردوەکە دەوترێ، بە کەسرەش بە تابوتەکە. ئەشبێت مرۆڤ بیری مردن وکۆتایی خۆی هەبێت لەم ژیانی دونیایە، جا خۆی ئامادە دەکات بە کردەوەی چاکە، وخۆ ئامادەکردن بۆ دوارۆژ، وتەوبەکردن لە سەرپێچیەکان، وگێڕانەوەی مافەکان. هەروەها سوننەتە سەردانی نەخۆش بکرێت وتەوبەکردن وەسیەتکردنی بیر بخرێتەوە، کە گەیشتە سەرە مەرگ سوننەتە تەلقین بکرێت بە: «لا إله إلا الله» وڕوی بکرێتە قیبلە[1]، کە مرد سوننەتە چاوی دابخرێ، وپەلە بکرێ لە ئامادەکردن وناشتنی. ئەم باسەش چەند پرسێکی تێدایە:

## پرسی یەکەم: حوکمی شوردنی مردو وکفن کردنی:

**١- حوکمەکەی:** شۆردنی مردو پێویستە، لەبەر فەرمان پێکردنی پەیامبەر ﷺ، وەك لە بارەی کابراوە کە لە ئیحرامدا ئاژەڵەکەی ملی شکاند فەرموی: «اِغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ» «بە ئاو ونەبك بیشۆن»[2]. هەروەها لە بارەی زەینەبی کچیەوە ﵂ فەرموی [وەك باس کرا]: «سێ یا پێنج یا حەوت جار بیشۆن».

**٢- چۆنێتی شۆردنەکە:** ئەبێت کەسێك دابنرێ بۆ مردو شۆردن کە متمانە پێکراو ودادگەر وشارەزا بێت بە حوکمەکانی غوسل، لە شۆردنیشدا وەسیەت بۆکراو

---

(١) کاری هەندێك بوە لە پێشین -بە ڕەحمەت بن- بەڵام بەڵگەی لە سەر نەهاتوە. وەرگێڕ

(٢) متفق علیه: أخرجه البخاري (١٢٦٦)، ومسلم (١٢٠٦).

پێش دەخرێت، پاشان نـزيكتر ونـزيكتر، وەك بـاوك وبـاپير وكـوڕ ئەگـەر شـارەزاي حوكمەكاني غوسل بون، وەگەرنا جگـە لەمانـە پـێش دەخرێـت كـە شـارەزا بێـت. پياويش پياوان دەيشۆن وژنيش ژنان، وبۆ هەريەك لە ژن ومێرد هەيە يـەكتر بشـۆن؛ مێرد ژنەكەي دەشوات وژنيش مێردەكەي، هەر يەك لە پيـاوان وئافرەتـانيش بۆيـان هەيە منداڵي خوار حەوت ساڵ بشۆن، وبۆ موسڵمان نيە -پياو بێت يـا ژن- نـە بـێ باوەڕ بشوات نە كفني بكات ونە تەرمەكەي هەڵبگرێت ونە نوێژي لە سـەر بكـات، با كەس ونزيكيشي بێت وەك باوك ودايك. مەرجيشـە ئـەو ئـاوەي مردوەكـەي پـێ دەشۆدرێت پاك وحەڵاڵ بێت، ولە شوێنێكي داپۆشراودا بشۆردرێت، ونابێت كەسـێك ئامادە بێت كە پەيوەندي بە شۆردني مردوەكەوە نيە.

**شێوازي شۆردنەكەش:** ئەوەيە بيخاتە سەر جێگاي شۆردنەكە، پاشـان عـەورەتي دادەپۆشێت، ئينجا كەلوپەلەكاني دادەكـەنێت، لـە شـوێنێك بەرچـاوي نـەبێت وەك ژورێك وهاوشێوەكاني، پاشان شۆرەر سەري مردوەكە بەرز دەكاتـەوە تـا وەك نزيـك دانيشتن، پاشان دەست دەنێت بە سكيدا ودەيگوشرێت، وئينجـا هـەردو دەرەچـەكە پاك دەكاتەوە، وتاراتي بۆ دەگرێت وچي پيسي لە سەر هەر دو دەرەچەكەي بو پـاكي دەكاتەوە، ئەمەش بە پارچـەيەك كـە لـە دەسـتي پێچـاوە، پاشـان نيـەتي غوسـل دەهێنێت، وبسم الله دەكات، ودەست نوێژي بۆ دەگرێت وەك دەست نوێژي نوێژ جگە لە ئاو دان بە دەم ولوتدا كە تەنها دەست دەهێنێـت بـە دەم ولوتيـدا، ئينجـا سـەر وڕيشي، بە ئاوي نەبك، يان سابون، يان شتي تر دەشوات، دواي ئەوە دەستي ڕاسـت وئينجا دەستە چەپ دەشوات، ئينجا ئەوەي ماوە لـە لاشـەي دەيشـوات، وباشـترە ((يُستحب)) پارچەيەك بپێچێتە دەستيەوە لە كاتي شۆردندا، ئەوەشي پێويستە يـەك جار شۆردنە ئەگەر پاك بويەوە، سوننەتيشە بكرێتە سێ جـار بـا پـاكيش ببێتـەوە،

هەروەها بە باش زانراوە لە کۆتا شۆردندا کافوری تێکەڵ بکرێـت، پاشـان مردوەکـە وشك دەکرێتەوە، وئەوەی لێ لا دەبرێت کە شەرعیە لا ببرێـت وەك نینـۆك وتـوك. وقژی ئافرەتیش دەکرێتە پەلك بەدوابیدا شـۆڕ دەکرێتـەوە. ئەگـەریش نـەکرا مـردو بشـۆردرێت لەبـەر نـەبونی ئـاو یـان پارچـە پارچـەیی لاشـەکە بـە هـۆی سـوتان وهاوشێوەکانیەوە، ئەو کات بـە خـۆڵ تەیـەمومی بـۆ دەکرێـت، سونەتیشـە دوای شۆردنی، مردو شۆرەکە خۆی بشوات.

## پرسي دوەم: ئەوەی شۆردن ئەگرێتە ئەستۆ:

باشترە ئەو کەسە شۆردن بگرێتە ئەستۆ کە شـارەزاترین بێـت بـە سـونەتەکانی شۆردن لە کەسانی جێی متمانە ودەستپاك ودادگەرەکان، بە تایبەت ئەگەر لە کـەس وخزمانی بێت، چونکە ئەوانەی پەیامبەریان ﷺ شۆرد لە خزمانی بـون وەك عـەلی وجگە لەو رضي الله عنهم[1]، ولە پێشترین کەس بـە شـۆردنی: ئەوەیـە وەسـیەتی بـۆ کـراوە بیشۆرێتەوە، ئینجا باوکی ئینجـا بـاپیری ئینجـا نـزیکتر ونـزیکتر لـە پشـتەکانی «عصباتە»، پاشان خزمانی تری. وپێویستە شۆردنی نێرینە پیاوان بیگرێتـە ئەسـتۆ، ومێینەش ئافرەتان، تەنها ژن ومێرد لەمە دەرۆنە دەرەوە بۆیان هەیە یـەکتر بشـۆن، لەبەر وتەکەی عائیشە رضي الله عنها: «لَوْ كُنْتُ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا غَسَّلَ النَّبِيَّ ﷺ غَيْرُ نِسَائِهِ» «ئەگـەر بـیری ئێسـتام هەبوایـە کـەس پەیامبـەری ﷺ نەدەشۆردەوە جگە لە خێزانەکانی»[2]. هەروەها پەیامبـەر ﷺ بـە عائیشـەی رضي الله عنها فەرمو: «لَوْ مِتِّ قَبْلِي لَغَسَّلْتُكِ وَكَفَّنْتُكِ» «ئەگەر پـێش مـن بمـری بێگومـان خـۆم

---

(١) أخرجه ابن ماجه (١٤٦٧)، وصححه الألباني «صحيح ابن ماجه» (١٢٠٧)، وانظر أيضًا: «الإرواء» (٦٩٩).
(٢) أخرجه أبو داود (٣٢١٥)، وابن ماجه (١٤٦٤)، وحسّنه الألباني (الإرواء ٧٠٢).

دەتشۆم وكفنت دەكەم»[١]. وئەسمائی كچی عومەیس ئەبوبەكری صدديقی مێردی شۆرد رضي الله عنهما[٢]. **وشەهیدی جەنگ ناشۆردرێت**، وكفن ناكرێت ونوێژی لە سەر ناكرێ، هەر لە بەرگەكەی خۆیدا دەنێژرێت، چونكە پەیامبەر ﷺ «فەرمانی كرد كوژراوانی ئوحود لە جلوبەرگەكانی خۆیاندا بنێژرێن ونەشۆردرێن ونوێژیشیان لە سەر نەكرێت»[٣]. «**لە بار چون= السِّقْط**»**یش** كە بریتیە لەو كۆرپەلەیەی پێش تەواو بون لە بار دەچێت نێر بێت مێ: ئەگەر بگاتە چوار مانگ دەشۆردرێت وكفن دەكرێت ونوێژی لە سەر دەكرێت ودەنێژرێتیش.

## پرسی سێیەم: حوكمی كفن كردنی وشێوازەكەی:

وكفن كردنی مردو پێویستە، لەبەر فەرمایشتەكەی پەیامبەر ﷺ لەبارەی ئەو كەسەی كە لە ئیحرام بو وشترەكەی ملی شكاند: «وَكَفِّنُوه في ثَوْبَيْن» «وكفنی بكەن لە دو بەرگدا»[٤]. ئەوەشی پێویستە پۆشینی هەمو لاشەیە، ئەگەر نەبو تەنها پارچەیەكی كورت نەبێت كە بەش هەمو لاشە ناكات، ئەوا سەری دادەپۆشێت وهەندێك داری «ئیزخەر» دەخرێتە سەر قاچەكانی، لەبەر وتەكەی خەبباب رضي الله عنه لەبارەی كفنكردنی موصعەبی كوڕی عومەیرەوە رضي الله عنه: «فَأَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ نُغَطِّيَ رَأْسَهُ وَأَنْ نَجْعَلَ عَلَى رِجْلَيْهِ مِنَ الْإِذْخِرِ» «پەیامبەر ﷺ فەرمانی پێكردین سەری داپۆشین وئیزخەر بخەینە سەر قاچەكانی»[٥]. هەروەها سەری نێرینەیەك لە ئیحرامدا

---

(١) أخرجه ابن ماجه (١٤٦٥)، وهو صحيح، انظر: «إرواء الغليل» (٣/١٦٠).
(٢) أخرجه مالك في الموطأ: (١/٢٢٣).
(٣) أخرجه البخاري (١٣٤٣).
(٤) متفق عليه: البخاري (١٢٦٦)، ومسلم (١٢٠٦).
(٥) متفق عليه: البخاري (١٢٧٦)، ومسلم (٩٤٠).

بێت داناپۆشرێت، لەبەر فەرمودەی: «ولا تُخَمِّرُوا رَأْسَه» «وسەری دامەپۆشن»[1]، کفنیش بە پارچەیەك دەبێت داپۆشەر بێت، تەنك نەبێت لاشە پیشان بدات، وئەبێت پارچەکە لەوە بێت کە هاوشێوەی ئەو مردوە دەیپۆشێت، چونکە شتێك داوا ناکرێ کە لە توانای مردو ووەرەسەکەشی نیە، سوننەتیش وایە مردو کفن بکرێت لە سێ لەفافی سپی لە لۆکە، پێکەوە لە سەر یەك ڕادەخرێن، مردوەکە دەخرێتە سەری بە ڕاکشاوی، ئینجا دیوی سەرەوەی لەفافەکە لە چەپی مردوەکەوە دەهێنیتەوە بەسەر لای ڕاستدا، ئینجا دیوی ڕاستی بەسەر چەپدا، ئینجا دوەم ئاوها وسێیەمیش ئاوها، زیادەکەش دەخەیتە دیوی سەریەوە ودەیبەستیت، ئەگەر لەوەش زیاتر بو دەخرێتە دیوی قاچیشیەوە ودەیبەستیت، چونکە ئەمە کفنەکە قایمتر دەکات، لەبەر وتەکەی عائیشە رضي الله عنها: «كُفِّنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي ثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ (جُدُدٍ يَمَانِيَةٍ، لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلَا عِمَامَةٌ، أُدْرِجَ فِيهَا إِدْرَاجًا» «پەیامبەر ﷺ لە سێ بەرگی سپی سەحولی[2] تازەی یەمەنیدا کفن کرا، نە قەمیسی تێدا بو نە سەروێن، خرا ناویەوە وپێچرا پێیەوە بە پێچرانەوە»[3]، هەروەها پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: «الْبَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضَ؛ فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ» «جلوبەرگی سپی بپۆشن، چونکە لە باشترین جلوبەرگەکانتانە، ومردوەکانتانیشی تێدا کفن بکەن»[4]. مێینەش لە پێنج پارچەی لۆکە خوارە وسەرە «إزار وقميص» وسەرپۆش

---

(١) أخرجه البخاري (١٨٤٩) واللفظ له، ومسلم (١٢٠٦).

(٢) «سُحُل» -بە زەمەی یەکەم ودوەم-: کۆی «سَحْل»ـە، کە بریتیە لە بەرگی سپی خاوێن، تەنها لە لۆکەیە، ئەشڵێن: بە فەتحەی سینەکە، نیسبەتە بۆ «سَحُول» دێیەکە لە یەمەن. «النهاية» (٣١٣/٢) (سحل).

(٣) متفق عليه: البخاري (١٢٦٤)، ومسلم (٩٤١) واللفظ الأخير عند أحمد (١١٨/٦).

(٤) أخرجه أبو داود (٣٨٧٨)، والترمذي (١٠٠٥)، وابن ماجه (١٤٧٢) واللفظ للترمذي. قال الترمذي: حسن صحيح. وصححه الألباني (صحيح الترمذي ٧٩٢).

ودو لەفافدا کفن دەکرێت. مێرد منداڵیش لە یەك پارچەدا، ولە سیانیش دروستە، **کیژۆڵەش** لە قەمیسێك ودو لەفافدا کفن دەکرێن.

## پرسی چوارەم: نوێژکردن لە سەر مردو، وحوکمەکەی، وبەڵگەکەی:

نوێژکردن لە سەر مردو فەرزی کیفایەیە، ئەگەر هەندێك بیکەن کوناه لە سەر ئەوانی تر دەکەوێت، بە بەڵگەی فەرمودەکەی ﷺ لە بارەی مردوە قەرزارەکەوە: «صَلُّوا علی صاحبکم» «نوێژ لە سەر هاوڕێکەتان بکەن»[1]، هەروەها فەرمایشتەکەی ﷺ: «إِنَّ أَخَا لَكُمْ قَدْ مَاتَ، فَقُومُوا فَصَلُّوا عَلَيْهِ» «برایەکتان مردوە هەستن نوێژی لە سەر بکەن»[2].

## پرسی پێنجەم: مەرجەکانی نوێژی مردو وپایەکانی وسونتەکانی:

١- **مەرجەکانی:** مەرجەکانی بەم شێوازەیە: نیەت، وتەکلیف، وڕوکردنە قیبلە، وداپۆشینی عەورەت، ودورکەوتنەوە لە پیسی، چونکە لە نوێژەکانە، وئامادەبونی مردو لە بەردەم نوێژگەردا ئەگەر لە شاردا بو، وموسڵمان بونی نوێژکەر ونوێژلە سەرکراو، وپاك بونی هەر دوکیان با بە خۆڵیش بێت بە هۆی عوزرێکەوە.

٢- **پایەکانی:** پایەکانیشی بەم شێوازەیە: بە پێوە بون -ئەگەر فەرز بو-[3] بۆ توانادار، چونکە نوێژە بۆیە بە پێوە بون تێیدا پێویستە وەك فەرزەکان، وچوار تەکبیرەکە؛ «چونکە ﷺ چوار تەکبیری لە سەر نەجاشی کرد»[4]. وخوێندنی فاتیحا،

(١) أخرجه مسلم (١٦١٩).
(٢) أخرجه مسلم (٩٥٢) - ٦٤.
(٣) [نمونەی نوێژی جەنازەیەکیش سونتەت بێت، وەك نوێژی جەنازەیەك دوبارە بکاتەوە].
(٤) [معنی حدیث أخرجه البخاري في مواضع منها: (١٢٤٥)، ومسلم کذلك (٩٥١)].

لەبەر گشتێتی [فەرمودەی پێشتر]: «نوێژی بۆ نیە کەسێك فاتیحا نەخوێنێت»[1]. هەروەها صەڵاواتدان لە سەر پەیامبەر ﷺ ودوعاکردن بۆ مردوەکە، لەبەر فەرمودەی: «إِذَا صَلَّيْتُمْ عَلَى الْمَيِّتِ فَأَخْلِصُوا لَهُ الدُّعَاءَ» «ئەگەر نوێژتان لە سەر مردو کرد بە دڵسۆزیەوە بۆی بپارێنەوە»[2]. وسەلامدانەوە لەبەر گشتێتی فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «وحەڵاڵکردنی سەلامدانەوەیە»، هەروەها کردنی پایەکان بە رێکی وپایەیەك پێش ئەوی تر نەخات.

**٣- سوننەتەکانی:**

لە سوننەتەکانی: دەست بەرزکردنەوەیە لەگەڵ هەر تەکبیرەیەکدا، وپەناگرتنە پێش خوێندن، ودوعایە بۆ خۆی وموسڵمانان، وبە نهێنیش قورئانەکەی بخوێنرێت.

## پرسی شەشەم: کاتی نوێژی مردو وفەزڵەکەی وشێوازەکەی:

١- **کاتەکەی:** کاتی نوێژی مردو دوای شۆردن وکفنکردن وئامادەکردنی دەست پێدەکات، ئەگەر ئامادە بو، یا هەواڵی مردنەکەی گەیشت ئەگەر نائامادەبو.

٢- **فەزڵەکەی:** پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: «مَنْ شَهِدَ الْجِنَازَةَ حَتَّى يُصَلِّى عَلَيْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنْ شَهِدَهَا حَتَّى تُدْفَنَ فَلَهُ قِيرَاطَانِ، قِيلَ: وَمَا الْقِيرَاطَانِ، قَالَ: مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ» «هەر کەس ئامادەی جەنازە بێت، تا نوێژی لە سەر دەکرێت،

(١) [تەخریجەکەی دوبارە دەکەنەوە بە قسورێکەوە].
(٢) أخرجه أبو داود (٣١٩٩)، وهو حسن. انظر: «إرواء الغليل» (١٧٩/٣).

ئەوە پاداشتی قیراتێکی هەیە، هەر کەسیش ئامادەی بێت تا دەنێژرێت ئەوا دو قیراتی بۆ هەیە« وترا: دو قیرات چەندێکە؟ فەرموی: وەکو دو شاخی گەورە»(1).

**٣- شێوازەکەی:** پێش نوێژ، وتەنیا، لای سەری پیاو، وناوەڕاستی ئافرەتەوە ڕادەوەستن، چونکە پەیامبەر ﷺ ئەمەی ئەنجامداوە وەك ئەنەس ﷺ لێوەی دەگێڕێتەوە(2)، ئینجا تەکبیرەی دابەستن دەکات، دوای تەکبیر پەنا دەگرێت، پاشان «بسم الله الرحمن الرحيم» دەکات، ئینجا فاتیحا بە نهێنی دەخوێنێت، با بە شەویش بێت، ئینجا «الله أكبر» دەکات وصەلاوات دەداتە سەر پەیامبەر ﷺ وەك صەلاواتی تەحیات، ئینجا «الله أكبر» دەکات ودوعا بۆ مردوەکە دەکات بەوەی لە پەیامبەرەوە ﷺ هاتوە، لەوانە: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا، وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا، وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا، وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا. اللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ عَلَى الْإِسْلَامِ، وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الْإِيمَانِ» «خوایە! خۆش ببە لە زیندو ومردومان، ئامادە ونەهاتومان، گچکە وگەورەمان، نێر ومێمان. خوایە! کامانت ژیان لە سەر ئیسلامەتی بیژێنە، کامانیشت مراند لە سەر ئیمان بیمرێنە»(3). «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، وَارْحَمْهُ، وَعَافِهِ، وَاعْفُ عَنْهُ، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ، وَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الْأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ، وَأَهْلًا خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ، وَزَوْجًا خَيْرًا مِنْ زَوْجِهِ، وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، أَوْ مِنْ عَذَابِ النَّارِ» «خوایە لێی خۆشبە، وبەزەییت پێیدا بێتەوە،

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٣٢٥)، ومسلم (٩٤٥).

(٢) أخرجه أبو داود (٣١٩٤)، والترمذي (١٠٤٥)، وابن ماجه (١٤٩٤). قال الترمذي: «حديث حسن». وصححه الألباني «صحيح الترمذي» (٨٢٦).

(٣) أخرجه أبو داود (٣٢٠١)، والترمذي (١٠٢٤)، والحاكم (١/٣٥٨). قال الترمذي: «حسن صحيح». وقال الحاكم: «صحيح على شرط الشيخين»، ووافقه الذهبي.

وبێـوەی بكـە لـە نارەحـەتی وسـزا، ولێـی ببـورە، ورێـز لـە میوانیەكـەی بگـرە، وشوێنەكەی فراوان بكە، وتاوانەكانی بشۆ بە ئاو وبەفر وتەرزە، ولە هەڵەكانی پـاكی بكەوە وەك چۆن كەلوپەلی سپی لە چڵك پاك دەكەیتەوە، ومـاڵەكـەی بـۆ بگـۆڕە بـە لەوەی دونیـای باشـتر، وكـەس وكارەكـەی بـۆ بگـۆڕە بـە لەوانـەی دونیـا باشـتر، وهاوسەرێكی لەوەی دونیا باشتر، وبیخەرە بەهەشتەوە وبیپارێزە لـە سـزای گـۆڕ یـا سزای ئاگر»[1]. ئەگـەر مردوەكـە بچـوك بـو، ئـەڵێ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ سَلَفًا لِوَالِدَيْهِ، وَفَرَطًا وَأَجْرًا» «خوایە! بیكەیتە پێشین بۆ دایك وباوكی، وپاداشت بە پێشتر چـونی، وئەجر بە خۆراكری دایك وباوكی»[2]. پاشان الله أكبر دەكـات وتۆزێـك دەوەسـتێت، ئەگەریش دوعا بكات بەوەی ئاسان بو چاكە، وەك بڵێ: «اللَّهُمَّ لَا تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ وَلَا تَفْتِنَّا بَعْدَهُ» «خوایە لە پاداشتەكەی بێبەشمان مەكە ولە دوای ئەمە توشی فیتنـەمان مەكە»[3]. پاشان یەك جار سەلام بە لای ڕاست دەداتەوە، ئەگەریش دو جار سەلامی دایەوە هیچی تێدا نیە. كەسێكیش هەندێكی لە نوێژەكـە لـە دەسـت چـو، لەگـەڵ پێشەوادا نوێژ دا دەبەستێت وكە سەلامی دایەوە باقیەكەی تەواو دەكات بە شێوازی خۆی، هەر كەسێكیش پێش ناشتن نوێژەكـەی لـە دەسـت چـو، دەتوانێـت لـە سـەر گۆڕەكە نوێژ بكات، چونكە پەیامبەرﷺ لە سەر ئەو ئافرەتـەی گسـكی مزگـەوتی دەدا وای كرد[4]. **نوێژی غائیبیش** -ئەوەی ئامادە نیە لە شار- كـەی زانـرا مـردوە ئەنجام دەدرێت، گەر مانگێك یا زیاتریش بێـت. منـداڵی لەبارچـوش ئەگـەر چـوار

(١) أخرجه مسلم (٩٦٣) [هذا لفظه، والذي في الأصل أشبه أن يكون لفظ ابن ماجة].
(٢) أخرجه عبد الرازق في مصنفه (٥٢٩/٣) ٦٥٨٩.
(٣) أخرجه مالك (٢٢٨/١) ١٧، وعبد الرزاق في مصنفه (٤٨٨/٣) (٦٤٢٥)، وابن حبان، كما في الإحسان (٣٤٢/٧) ٣٠٧٣. وقال محققه: «إسناده صحيح على شرط مسلم».
(٤) أخرجه البخاري (٤٥٨)، ومسلم (٩٥٦).

مانگ یا زیاتری تەواو کردبو نوێژی لە سەر دەکرێت، لەوە کەمتر نوێژی لە سەر ناکرێت.

## پرسی حەوتەم: هەڵگرتنی تەرم وبەڕێ خستنی بۆ گۆڕستان:

شوێنکەوتن وبەڕێ خستنی جەنازە بۆ گۆڕستان سوننەتە، چونکە ئەفەرموێ ﷺ: «هەر کەس ئامادەی جەنازە بێت، تا نوێژی لە سەر دەکرێت، ئەوە پاداشتی قیراتێکی هەیە، هەر کەسیش ئامادەی بێت تا دەنێژرێت ئەوا دو قیراتی بۆ هەیە، وترا: دو قیرات چەندێکە؟ فەرموی: وەکو دو شاخی گەورە»[1]. وئەبێت موسڵمان بە مردنی موسڵمانێکی زانی بچێت بۆ هەڵگرتنی تەرمەکەی ونوێژ لە سەر کردنی وناشتنی، لەبەر فەرمایشتی ﷺ: «حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ خَمْسٌ؛ رَدُّ السَّلَامِ، وَعِيَادَةُ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعُ الْجَنَائِزِ» «مافی موسڵمان لە سەر موسڵمان پێنجە: وەڵامدانەوەی سەلام، وسەردانکردنی نەخۆش، شوێنکەوتنی تەرم»[2]. ئەمەش تەئکیدترە ئەگەر کەس نەهات بۆ تەرمەکەی، هیچیشی تێدا نیە بخرێتە ئۆتۆمبیل یا سەر ئاژەڵ بە تایبەت ئەگەر گۆڕستانەکە دور بو، ئەوەشی دوای کەوتوە لە سەریەتی بەشدار بێت لە هەڵگرتنی.

وشەرعیە مردو لە گۆڕستانی تایبەت بە مردوان بنێژرێت، چونکە پەیامبەر ﷺ مردوی لە گۆڕستانی بەقیعدا دەناشت، وەك هەواڵەکان لەم بارەوە موتەواترن، ولە هیچ کەس لە پێشینانەوە نەهاتوە لە غەیرە گۆڕستان نێژرا بێت.

---

(١) پێشتر تەخریج کرا.

(٢) أخرجه البخاري (١٢٤٠).

هەروەها سوننەتە پەلە بکرێت لە تەرمەکە؛ لە شۆردنی وکفنکردنی ونوێژ لە سەر کردنی وناشتنی، لەبەر فەرمودەکەی ﷺ: «إِذَا مَاتَ أَحَدُكُمْ فَلَا تَحْبِسُوهُ، وَأَسْرِعُوا بِهِ إِلَى قَبْرِهِ» «ئەگەر کەسێکتان مرد دوای مەخەن، وپەلەی لێ بکەن بۆ گۆڕەکەی»[(١)]. وئەوەی هەندێك خەڵك دەیکەن لە دواخستن وبردنی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر یا دیاری کردنی ڕۆژێکی هەفتە تیای بنێژرێت، هەمو ئەمانە دژی سوننەتە، وەك چۆن سوننەتە لە کاتی هەڵگرتن وبردنیدا پەلەی لێ بکرێت، لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «أَسْرِعُوا بِالْجِنَازَةِ، فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا [إِلَيْهِ]، وَإِنْ يَكُ سِوَى ذَلِكَ، فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ» «پەلە لە تەرمدا بکەن، گەر چاکەکار بێ خێرێکە پێشی دەخەیت، ئەگەریش وا نەبێت ئەوە شەڕێکە لە کۆڵی خۆتانی دەکەنەوە»[(٢)]. بەڵام پەلەکردنێکی زۆر نا، نەگاتە ڕاکردن وەك هەندێك لە زانایان فەرمویانە.

هەروەها لە سەر هەڵگرانی تەرمە بیبەن بە سەنگینی وسام وهەیبەتەوە «السكينة والوقار»، هەروەها دەنگ بەرز نەکەنەوە نە بە قورئان خوێندن ونە بە جگە لەوەش، چونکە هیچ شتێکی وا لە پەیامبەری خواوە ﷺ نەچەسپاوە، هەر کەسێکیش بیکات پێچەوانەی سوننەتی کردوە.

هەروەها دروست نیە ئافرەتان دەربچن لەگەڵ تەرمدا، لە بەر وتەکەی ئوم عەتیە رضي الله عنها: «نُهِينَا عَنْ اتِّبَاعِ الجَنَائِزِ [وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا]» «ڕێگریمان لێکرا شوێنی تەرم

---

(١) أخرجه الطبراني (١٢/٣٤٠) (١٣٦١٣)، وحسنه ابن حجر «الفتح» (٣/٢١٩).
(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٣٥١)، ومسلم (٩٤٤) واللفظ للبخاري [ولم أجد الزيادة عنده، وعند مسلم بلفظ: «إلى الخير» و: «عليه»، ووجدتها عند أصحاب السنن وأحمد...].

بکەوین، بەڵام جەختمان لە سەر نەکرایەوە»[(١)]، جا هەڵگرتنی تەرم ودواکەوتنی تایبەتە بە پیاوانەوە. هەروەها کەراهەتی هەیە شوێنکەوتو دابنیشێت پێش دانانی تەرمەکە لە زەوی، چونکە پەیامبەر ﷺ ڕێگری کردوە لە دانیشتن تا دادەنرێت[(٢)].

## پرسی هەشتەم: ناشتنی مردو وشێوازی گۆڕ وئەوەی سوننەتە لەم بارەوە:

سوننەتە گۆڕەکە قوڵ، وفروان بێت، وئەڵهەد «اللَّحْد»ی بۆ بکەنرێ، کە بریتیە لەوەی کەندرێك بکەنرێ لە بن گۆڕەکەوە بە دیوی قیبلە، ئەگەریش ئەڵهەد نەکرا با چاڵ «الشق» بکرێ، کە بریتیە لەوەی: لە ناوەڕاستی گۆڕەکەوە چالی بۆ بکەنرێ، بەڵام ئەڵهەد چاکترە، لەبەر فەرمودەکەی ﷺ: «اللَّحْدُ لَنَا، والشَّقُ لِغَيْرِنا» «ئەڵهەد بۆ ئێمەیە، چاڵیش بۆ جگە لە ئێمە»[(٣)]. ومردو دەخرێتە ناو ئەڵهەدەکەوە بە سەر لای ڕاستدا بە ڕوی قیبلە، وسەر ئەڵهەدەکە بە خشت وقوڕ دەگیرێت وئینجا خۆڵ دەکرێت بە سەریدا، وگۆڕیش بە ئەندازەی بستێك بەرز دەکرێتەوە لە سەر زەوی وەك پشتی وشتر، چونکە ئەمە چەسپاوە لە بارەی گۆڕی پەیامبەر ﷺ ودو هاوەڵەکەی[(٤)]، بۆ ئەوەی بزانرێ ئەوە گۆڕە تا سوکایەتی پێ نەکرێ، هیچیشی تێدا نیە چەند بەردێك یا جگە لەوە بخرێتە دەوروبەری تا بناسرێتەوە وسنورەکەی بزانرێ.
هەروەها بینا لە سەر گۆڕ دروست کردن وگەچ کردن ولە سەری دانیشتن حەرامە، هەروەها کەراهەتی هەیە لە سەری بنوسرێت مەگەر ئەوەندەی پێویست بێت بۆ ناسینەوە، ئەمانەش لەبەر وتەکەی جابر ﷺ: «نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يُجَصَّصَ

(١) أخرجه البخاري (١٢٧٨)، ومسلم (٩٣٨)، واللفظ لمسلم [والزيادة لهما].
(٢) أخرجه البخاري (١٣١٠)، ومسلم (٩٥٩).
(٣) أخرجه الترمذي (١٠٥٦) وحسنه، وصححه الألباني «صحيح الترمذي» (٨٣٥).
(٤) انظر: «الشرح الممتع» (٤/٤٥٨).

الْقَبْرُ، وَأَنْ يُقْعَدَ عَلَيْهِ، وَأَنْ يُبْنَى عَلَيْهِ». «پەیامبەر ﷺ ڕێگری کردوە لە گەچکردنی گۆڕ ودانیشتن وبیناکردن لە سەری»، لە ڕیوایەتەکەی تورمزی ئەڵێ: «وأَنْ يُكْتَبَ عَلَيْها» «ولە سەری بنوسرێ»[1]. چونکە ئەمە لە هۆکارەکانی شیرك وپەیوەست بونە بە مەزارەکانەوە ئەمەش نەزانەکان فریو دەخۆن پێی وپێوەی پەیوەست دەبن.

هەروەها حەرامە گۆڕ ڕوناك بکرێتەوە، چونکە خۆ شوبهاندنی تێدایە بە بێ باوەڕان، وبە فیڕۆدانی ماڵ وسامانیشە، هەروەها بیناکردنی مزگەوت لە سەری ونوێژکردن لە لای یا بەرەو وی، چونکە پەیامبەر ﷺ فەرموی: «لَعَنَ اللهُ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى؛ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ» «نەفرەتی خوا لە جولەکە وگاورەکان، گۆڕی پەیامبەرانیان کرد بە مزگەوت»[2].

هەروەها حەرامە بێ ڕێزی بەرامبەر بکرێ وەك ڕۆیشتن یا بە پێڵاوەوە پێنان بە سەریدا یا دانیشتن لە سەری وهاوشێوەکانی، لەبەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ﵁: پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «لَأَنْ يَجْلِسَ أَحَدُكُمْ عَلَى جَمْرَةٍ فَتَحْرِقَ ثِيَابَهُ، فَتَخْلُصَ إِلَى جِلْدِهِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَجْلِسَ عَلَى قَبْرٍ» «ئەگەر کەسێکتان دابنیشێ لە سەر پشکۆیەك تا بەرگەکەی دەسوتێنێت ودەگاتە پێستەی، باشترە بۆی وەك لەوەی لە سەر گۆڕێك دابنیشێت»[3]، هەروەها لەبەر ئەوەی پەیامبەری خوا ﷺ نەهی کردوە پێ لە سەر گۆڕ بنرێت[4].

---

(١) أخرجه مسلم (٩٧٠)، والترمذي (١٠٦٤)، وقال: «حسن صحيح».

(٢) أخرجه البخاري (١٣٣٠)، ومسلم (٥٢٩).

(٣) أخرجه مسلم (٩٧١) [وفي الأصل: «خير من» وهو هكذا في «الجمع» للحميدي (٣/٢٩١)].

(٤) أخرجه الترمذي (١٠٦٤) [بل (١٠٥٢)] وقال: «حسن صحيح».

هەروەها سوننەتە دوای ناشتن دوعا بۆ مردوەکە بکرێت، چونکە پەیامبەر ﷺ وای کردوە، کاتێك لە ناشتنی بوایەتەوە لە سەری دەوەستا ودەیفەرمو: «اسْتَغْفِرُوا لِأَخِيكُمْ، وَاسْأَلُوا لَهُ بِالتَّثْبِيتِ؛ فَإِنَّهُ الْآنَ يُسْأَلُ» «داوای لێ بوردن وچەسپاوی بۆ براکەتان بکەن چونکە ئێستا پرسیاری لێ دەکرێت»[1]. سەبارەت بە خوێندنی سورەتی فاتیحا وقورئان لە لای گۆڕ ئەوە بیدعەیەکی خراپە، چونکە پەیامبەر ﷺ وهاوەڵانی ﷺ نەیانکردوە، خۆیشی فەرمویەتی: «مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ» «هەر کارێك بکرێت فەرمانی ئێمەی لە سەر نەبێت ئەوا ڕەد دەکرێتەوە»[2].

## پرسی نۆیەم: تەعزیٚ وسەر خۆشی کردن، وحوکمەکەی، وشێوازەکەی:

تەعزیٚ: بریتیە لە سەرەخۆشی کردنی بێ قەوماو وبەهێزکردنی تا بەرگەی ئەو وەی وموسیبەتە بگرێت، جا باسی ئەو پاڕانەوە ویردانەی بۆ دەکرێت کە هاتوە لە بارەی پاداشتی خۆڕاگری وچاوەڕێی پاداشت کردن.

وشەرعیە سەر خۆشی لە کەس وکاری مردو بکرێت بەوەی بەڵاکەیان لە سەر کەمدەکاتەوە وایان لێ دەکات ڕازی وخۆڕاگر بن، ئەمەش بەوەی لە پەیامبەرەوە ﷺ چەسپاوە ئەگەر دەیزانی ولەبەری بو، ئەگەرنا بەوەی بۆی ئاسانە لە قسەی چاك کە مەبەست بەدی دێنێت ودژی شەرع نیە، لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ﷺ ئەڵێ: «كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ إِحْدَى بَنَاتِهِ تَدْعُوهُ، وَتُخْبِرُهُ أَنَّ صَبِيًّا لَهَا، أَوِ ابْنًا

---

(١) أخرجه أبو داود (٣٢٢١)، وصححه الحاكم (١/٣٧٠)، وافقه الذهبي، وحسنه النوي والحافظ، انظر: «التعليق على الطحاوية» (٢/٢٦٥-٦٦٦).

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٦٩٧)، ومسلم (١٧١٨) - ١٨ واللفظ لمسلم.

لَهَا، فِي الْمَوْتِ، فَقَالَ لِلرَّسُولِ: ارْجِعْ إِلَيْهَا، فَأَخْبِرْهَا: أَنَّ لِلهِ مَا أَخَذَ وَلَهُ مَا أَعْطَى، وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى، فَمُرْهَا فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ» «لە خزمـەت پەیامبـەر ﷺ بوین یەکێك لە کچەکانی ناردی بـە دوایـدا بـانگی دەکـرد وپێـی دەوت: کـە منداڵێکی لە سەرەمەرگدایە، پەیامبەریش ﷺ فەرموی: بگەڕێوە بۆ لای وپێی بڵێ: هەر چی خوا بردیەوە هی خۆیەتی، هەرچیشی بەخشی هـەر هـی خۆیـەتی، هـەمو شتێکیش لای خوا ماوەیەکی دیاری کراوی هەیە، فەرمانی پێ بکە: با ئارام بگـرێ وچاوەڕێی پاداشت بکات»[1]، ئەمەش لە باشترین ئـەو لەفزانەیـە هـاتوە لـە بـارەی تەعزیٚ باریەوە.

**لە کاتی تەعزیٚ باریشدا ئەبێت دور بکەوێتەوە لەو شتانەی لە نێـو خەڵکـدا بلاٚوە ولە شەرعدا بنەمای نیە، لەوانە:**

١- کۆ بونەوە بۆ تەعزیٚ باری لە شوێنێکی دیاری کـراودا بـە هێنـانی کورسـی وڕوناکی وقورئان خوێن.

٢- دروست کردنی خواردن لە لایەن کەسوکاری مردوەوە لە ڕۆژانـی تەعزێکـەدا بۆ ئەو میوانانەی دێن بۆ تەعزیٚ باری، لەبەر فەرمودەکـەی جـەریری بەجـەلی ﷺ ئەڵێ: «كُنَّا نَعُدُّ الِاجْتِمَاعَ إِلَى أَهْلِ الْمَيِّتِ، وَصَنِيعَةَ الطَّعَامِ بَعْدَ دَفْنِهِ مِنَ النِّيَاحَةِ» «ئێمە کۆبونەوە لای کەسوکاری مردو وخواردن دروست کردن دوای ناشتنی بـە شـین وڕۆ ڕۆمان دادەنا»[2].

---

(١) أخرجه البخاري (٢٨٤)، ومسلم (٩٢٣) [واللفظ له].
(٢) أخرجه ابن ماجه (١٦١٢)، [وضعفه بعض الأئمة] وصححه الشيخ الألباني «صحيح ابن ماجه» (١٣١٨).

٣- دوبارەکردنەوەی سەر خۆشی، هەندێك خەڵك زیاد لـە جارێـك دەڕوا بـۆ لای کەسوکاری مردو بۆ سەر خۆشی لێ کردن، وبنچینەش ئەوەیـە: سـەر خۆشـی کـردن یەکجارە، بەڵام ئەگەر مەبەست لە دوبارەکردنەوەی یادخستنەوە وفەرمانکردن بو بـە ئارامگرتن وڕازی بون بە قەزا وقەدەر ئەوە هیچی تێـدا نیـە، بـەڵام ئەگـەر دوبـارە کردنەوەی بۆ ئەم مەبەسـتە نـەبو ئـەوا نابێـت، چـونکە ئەمـە لـە پەیامبـەر ﷺ وهاوەڵانەوە نەچەسپاوە.

هـەروەها سـوننەتە خزمـانی مردوەکـە وهاوسـێکانی خـواردن بـۆ کەسـوکاری مردوەکە دروست بکەن، لەبـەر فەرمودەکـەی پەیامبـەر ﷺ: «اصْنَعُوا لِآلِ جَعْفَرٍ طَعَامًا فَقَدْ أَتَاهُمْ أَمْرٌ يَشْغَلُهُمْ، أَوْ أَتَاهُمْ مَا يَشْغَلُهُمْ» «خـواردن بـۆ خـاوخێزانی جەعفەر دروست بکەن، بەڕاستی موسـیبەتێکیان بـە سـەردا هـاتوە کـە سـەرقاڵی کردون»[1].

سەبارەت بە گریان ودڵتەنگی بۆ مردو، هیچی تێدا نیە وزۆرجار هـەر ڕو دەدات، وئەمەش مەیلی سروشتی کەسەکانە بێ زۆر لە خۆ کردن، پەیامبەریش ﷺ بە سەر ئیبراهیمی کوڕی گریا کاتێك مرد، وفەرموی: «إِنَّ الْعَيْنَ تَدْمَعُ، وَالْقَلْبَ يَحْزَنُ، وَلَا نَقُولُ إِلَّا مَا يَرْضَى رَبُّنَا، [وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ]» «چـاو فرمێسـك دەڕێژێت، ودڵ تـەنگ دەبێت، هیچیش ناڵێین مەگەر ئـەوەی خـوا پێـی ڕازی بێـت،

(١) أخرجه أبو داود (٣١١٦)، والترمذي (١٠٠٣)، وابن ماجه (١٦١٠). وحسنه الألباني في «صحيح ابن ماجه» (١٣١٦).

وبەڕاستی ئەی ئیبراهیم ئێمە بە چونت دلّتەنگین»[1]. بەلاّم ئەمە نابێت وەکو نارەزایی وبێزاری وبێ سەبری وسکالاّکردن بێت.

هەروەها پیا هەلّدان بە گریانەوە «النَّدْب» ولاواندنەوە وشینکردن «النیاحة»، ولە گۆنادان وملیواندارنین حەرامە، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەرﷺ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَطَمَ الْخُدُودَ، وَشَقَّ الْجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ» «لە ئێمە نیە کەسێك لە گۆنا بدات، وکراس وسنگ دابرنێت، وبانگەشە وتەی سەردەمی نەفامی بلێت»[2]. وەك ئەوەی بلّێ: هاوار مالّ وێران بە خۆم، هاوار تیاچون! ئەمە کاتێتی وەرە «خۆم رۆ»، وهاوشێوەی ئەمانە، هەروەها لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ کە فەرموی: «النَّائِحَةُ إِذَا لَمْ تَتُبْ قَبْلَ مَوْتِهَا، تُقَامُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَعَلَيْهَا سِرْبَالٌ مِنْ قَطِرَانٍ وَدِرْعٌ مِنْ جَرَبٍ» «شین کەر ولاوێنەر ئەگەر تەوبە نەکات پێش مردنی، لە قیامەت کە زیندو دەبێتەوە کراسێکی قەترانی لەبەردایە، وقەلّغانێك لە گەڕی»[3].

---

(١) أخرجه البخاري (١٣٠٣).

(٢) أخرجه البخاري (١٢٩٤)، ومسلم (١٠٣).

(٣) أخرجه مسلم (٩٣٤). گەڕی: نەخۆشیەکی ناسراوە، زیبکەیە لە سەر پێست دەردەکەوێت وخوریان وئاوڵەی لەگەلّدایە.

# سێیەم: بەشی زەكات

ولە شەش دەروازە پێك هاتوە:

دەروازەی یەكەم: لە بارەی پێشەكیەكانی زەكاتەوە.

دەروازەی دوەم: زەكاتی ئاڵتون وزیو.

دەروازەی سێیەم: زەكاتی ئەوەی لە زەوی دێتە دەرەوە.

دەروازەی چوارەم: لە بارەی زەكاتی مەڕ وماڵاتەوە.

دەروازەی پێنجەم: لە بارەی زەكاتی سەر فترەوە.

دەروازەی شەشەم: لە بارەی ئەوانەی زەكاتیان پێ دەدرێت.

# دەروازەی یەکەم

# لە بارەی پێشەکیەکانی زەکاتەوە

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: پێناسەی زەکات:

زەکات: لە زماندا بریتیە لـە گەشـە وزیـادکردن. ئـەوترێ: «زکا الزرع» ئەگـەر زەرعاتەکە گەشەی کرد. لە شەرعیشدا: بریتیە لە مافێك لەو ماڵەدا پێویسـتە کـە گەیشتبێتە ڕادە «نِصَاب»ێکی[1] دیاری کراو بە چەند مەرجێکی دیـاری کـراو، بـۆ کۆمەڵێکی دیاری کـراو. زەکـاتیش پاکبونەوەیـە بـۆ بەنـدە وخاوێنکردنەوەیـە بـۆ دەرونی، خـوا ﷻ ئەفـەرموێ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا﴾ [التوبة: ١٠٣] «ئەی پەیامبەر لە ماڵەکانیان صەدەقەیەك ببە کـە پاکیـان بکاتـەوە لە چڵکی تاوان ودڵ ودەرونیان خاوێن دەکاتەوە». هەروەها هۆکارێکە بۆ بڵاوبونەوەی هۆگری وخۆشەویسـتی وهەماهـەنگی ویـەدەم یەکـەوە بـون «تكَافُل»ی تاکـەکانی کۆمەڵگا.

## پرسی دوەم: حوکمی زەکات وبەڵگەکەی:

زەکات فەرزێکە لە فەرزەکانی ئیسلام وپایەیەکە لـە پێـنج پایەکـە، وگـرنگترین پایەکانیەتی دوای نوێژ، لەبەر فەمایشتەکەی خوا: ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ [البقرة:٤٣] «ونوێـژەکان بـە جـێ بگەیـەنن وزەکـات بـدەن»، وقولـه تعالى: ﴿خُذْ مِنْ

---

(١) بریتیە: لەو سنور وئەندازەیەی کە ماڵ پێی گەیشت زەکاتی تێدا واجب دەبێت. وەرگێڕ.

أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا﴾ [التوبة:١٠٣]. هـەروەها پەیامبـەر ئەفـەرمویٚ ﷺ: «بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا [عَبْدُهُ] وَرَسُولُهُ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَحَجِّ الْبَيْتِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ» «ئیسـلام لـە سەر پێنج شت بونیاد نراوە: شایەتومان، شاهێدی دەدەم کـە هـیچ پەرسـتراوێك بـە هەق نیە مەگەر خوا، وموحەممـەد بەنـدە وپەیامبـەری خوایـە، وئەنجامـدانی نوێـژ، وزەكاتدان، وحەجی ماڵی خوا، وڕۆژوی ڕەمەزان»[1]. هەروەها لە وەسـیەتەكەی ﷺ بۆ موعاز ﷺ كە ناردی بۆ یەمەن فەرموی: «ادْعُهُمْ إِلَى: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللهَ قَدِ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً فِي أَمْوَالِهِمْ، تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ وَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ» «بانگیـان بكـە بـۆ: شایەتیدان بەوەی كەس شیاوی پەرستن نیـە مەگـەر خـوا وشـایەتیدان بـەوەی مـن پەیامبەری خوام، جا ئەگەر لەمە گوێڕایەڵیان كردی، ئەوا پێیان ڕابگەینـە كـە خـوا پێنج نوێژی لە شەو ڕۆژێكدا لە سەر فەرز كردون، ئەگەر لەمەش گوێڕایەلیان كردی، ئەوا پێیان ڕابگەیەنە كە خوا صەدەقەی لە ماڵەكانیان فەرز كردوە لـە سـەریان، لـە دەوڵەمەندەكانیان وەردەگیرێ ودەدرێتەوە بە هـەژارەكانیان»[2]. وموسـڵمانانیش لـە هەمو دونیا كۆكن لە سەر فەرزێتیەكەی.

بەمەش فەرزێتی زەكات سەلمێنرا بە قورئان وسوننەت وكۆ دەنگی.

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٨)، ومسلم (١٦)، عن ابن عمر ﷺ [واللفظ له].
(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٣٩٥)، ومسلم (١٩)، عن ابن عباس ﷺ [واللفظ لهما إلا في كلمة].

## پرسی سێیەم: حوکمی کەسێك نکوڵی لیٚ بکات:

هەر کەس نکوڵی لە فەرزێتی زەکات بکات نەزانێت، وبکرێت کەسی وا، شتی وا نەزانێت؛ ئیتر لە بەر تازە موسڵمان بونی بێت، یا لەبەر ئەوەی لە دەشتێکی دورە دەست گەورە بوە، ئەوا فەرزێتی ڕۆژوی تێدەگەیەنی، وکافر ناکرێت چونکە عوزری هەیە.

ئەگەریش نکوڵیکەر موسڵمانێك بو لە وڵاتی ئیسلام وناو مامۆستا وزاناکان گەورە بو بو، ئەوە هەڵگەڕاوەیە وحوکمی هەڵگەڕاوەکانی لە سەر جێبەجێ دەکرێت، سێ ڕۆژ داوای تەوبەی لێ دەکرێت وەگەرنا دەکوژرێت، چونکە بەڵگەکانی فەرزێتی زەکات ئاشکرایە لە قورئان وسوننەت وکۆ دەنگی ئوممەت، وەختێ ئەم حوکمە لە کەسی وا شارەوە نەبێت، کە نکوڵی لێ دەکات مەگەر لەبەر بە درۆخستنەوەی قورئان وفەرمودەیە، وبێباوەڕە پێیان.

### پرسی چوارەم: حوکمی زەکاتنەدەر

هەر کەس زەکات نەدات لە ڕژدی پێشی فەرز بێت، ئەوا تاوانبارە بە نەدانی، بەڵام لە ئیسلام نایباتە دەرەوە، چونکە زەکات لقێکە لە لقەکانی دین، بە نەکردنێکی پەتی پێی بێ باوەڕ نابێت، لەبەر ئەو فەرمودە [درێژەی کە دێت] پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێت: «دوای ئەوەی باسی سزادانی زەکات نەدەر دەکات بە ئاگر، ئەفەرموێ: پاشان ڕێگای پیشان دەدرێت یا بەرەو بەهەشت یا بەرەو دۆزەخ». خۆ ئەگەر بێباوەڕ بێت ئەوا ڕێگەی بۆ نیە بۆ بەهەشت. ئەم کەسەش بە زۆر زەکاتی لێ وەر دەگیرێت، ئەگەر ئامادەی شەڕیش بو، شەڕی لەگەڵدا دەکرێت تا ملکەچ دەکات بۆ فەرمانی خوا وزەکات دەدات، لەبەر فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿فَإِنْ تَابُوا

وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ﴾ [التوبة:٥]. «جا ئەگەر وازیان هێنا لە بێباوەڕیان وهاتنە نێو ئیسلامەوە وپابەند بون بە شەریعەتی ئیسلامەوە وەك نوێژ وڕۆژو ئەوا ڕێیان بدەن، چونکە ئیتر براتانن». وپەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلَّا بِحَقِّ الْإِسْلَامِ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ» «فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم تا شایەتومان دەهێنن: هیچ پەرستراوێك شایستەی پەرستن نیە مەگەر خوا، وشایەتی بدەن موحەممەد پەیامبەری خوایە، هەروەها نوێژ بکەن وزەکات بدەن، کە ئەوەیان کرد ئیتر خوێن وماڵیان لە من پارێزراوە مەگەر بە مافی ئیسلام، ولێپیچنەوەش لەگەڵیان لە لای خوایە»[1]. ولەبەر وتەکەی ئەبوبەکرﷺ[2]: «وَاللهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقًا كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا» «بەخوا ئەگەر کارە مێیەك نەدەن کە بە پەیامبەریان ﷺ بەخشیوە، ئەوا لە سەری شەڕ دەکەم لەگەڵیان». لەم بۆچونەش هەر سێ جێنشینەکە وسەرجەم هاوەڵان لەگەڵیدا بون، ئەمەش کۆ دەنگیانە لە سەر شەڕکردن لەگەڵ زەکاتنەدەران، ئەوەشی لەبەر چروکی نەیدات دەڕواتە ژێر ئەم دەقانەوە.

## پرسی پێنجەم: لە بارەی ئەو ماڵانەی زەکاتی تێدایە:

زەکات فەرزە لە پێنج جۆری ماڵ، کە بریتین لە:

### ١- مەڕ ومالات «بهيمة الأنعام»:

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٩٤٦)، ومسلم (٢١).

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٤٠٠)، ومسلم (٢٠).

کە بریتیە لە وشتر، ومانگا، ومەڕ وبزن، لەبەر فەرمودەی: «مَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ، وَلَا بَقَرٍ، وَلَا غَنَمٍ، لَا يُؤَدِّي زَكَاتَهَا، إِلَّا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْظَمَ مَا كَانَتْ وَأَسْمَنَهُ، تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، وَتَطَؤُهُ بِأَظْلَافِهَا، كُلَّمَا نَفِدَتْ أُخْرَاهَا، عَادَتْ عَلَيْهِ أُولَاهَا، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ» «هیچ خاوەن وشتر ومانگا ومەڕو بزنێك نیە وزەكاتی نەدات مەگەر لە ڕۆژی قیامەتدا دێت ها لە ئەوپەڕی گەورەیی وقەڵەوی، بە قۆچەكانی لێی دەدات، وبە سمەكانی پێ دەنێت بە سەریدا هەر كە كۆتاییان هات لە هەوەڵەوە دەست پێدەكەنەوە تا خوا قەزاوەت دەكات لە نێوان خەڵك»[1].

## ٢- هەر دو دراوەكە:

كە زێڕ وزیوە، هەروەها ئەوەی جێگایان دەگرێتەوە لە دراوە كاغەزیە بەربڵاوەكان، لەبەر فەرمایشتی خوا: ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ [التوبة: ٣٤] «وئەوانەی ماڵەكان گل دەدەنەوە وزەكاتەكەی نادەن ومافە واجبەكانی لێ نادەن، ئەوا مژدەیان بدەرێ بە سزایەكی بە ئێش»، هەروەها پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ[2]: «مَا مِنْ صَاحِبِ ذَهَبٍ، وَلَا فِضَّةٍ لَا يُؤَدِّي مِنْهَا حَقَّهَا، إِلَّا إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ صُفِّحَتْ لَهُ صَفَائِحُ مِنْ نَارٍ فَأُحْمِيَ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ، فَيُكْوَى بِهَا جَنْبُهُ، وَجَبِينُهُ وَظَهْرُهُ، كُلَّمَا بَرَدَتْ أُعِيدَتْ لَهُ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، [حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ، فَيَرَى سَبِيلَهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِمَّا إِلَى النَّارِ]» «هیچ خاوەن زێڕ وزیوێك نیە وهەقی نەدات مەگەر ڕۆژی قیامەت ئەبێتە پارچە ئاسنی پلێت ئاسا ئەڵێی ئاگرە، لە ئاگری دۆزەخدا سور

---

(١) أخرجه مسلم (٩٨٧) من حديث أبي هريرة.
(٢) أخرجه مسلم (٩٨٧) من حديث أبي هريرة.

وگەرم دەکرێت، ئەوسا لاتەنیشتی وناوچاوانی وپشتی پێ داخ دەکرێت، هەر سارد بوبەوە دوبارە گەرم دەکرێتەوە لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەی پەنجا هەزار ساڵە تا خوا دادوەری لە نێوان بەندەکاندا دەکات».

## ٣- دانەوێڵە وبەر وبوم «الحبوب والثمار»:

دانەوێڵە: بریتیە لە هەمو دانێکی بە خۆراکدانراوی «مقتات» هەڵگیراو «مدخر» وەك جۆ وگەنم وجگە لەمانەش. بەر وبومیش: خورما ومێوژە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا: ﴿وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ الْأَرْضِ﴾ [البقرة: ٢٦٧]. «وببەخشن لەوەی لە زەوی دێتە دەر»، هەروەها ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَآتُوا حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ﴾ [الأنعام:١٤١]. «ولە ڕۆژی دروێنەی وکردنەوەیدا مافە فەرزەکەی سەرتان بدەن»، وپەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: «فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْعُيُونُ أَوْ كَانَ عَثَرِيًّا[١] الْعُشْرُ وَفِيمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ[٢] نِصْفُ الْعُشْرِ» «ئەوەی ئاسمان وچاوگەکان ئاوی بدەن یا بە ڕەگەکەی خۆی ئاو بخوات ئەوە دەیەکی تێدایە، ئەوەشی بە پشتی وتر ئاو دەدرێت نیوەی یەك لە دەیە»[٣].

## ٤- کانزا وگەنجینەی شاراوەی نەفامی «المَعَادِنُ والرِّكَاز»:

المعادن: بریتیە لە هەمو ئەو شتانەی لە زەوی دەردەهێنرێ لەوانەی دروست دەبێت لە وەزیدا، بە بێ ئەوەی کەس دایبنابێت، وەك زێڕ وزیو ومس وهتد.

---

(١) ئەوەیە کە بە ڕەگەکەی ئاو دەخوات بە بێ ئاودان، وەك ئەوەی لە نزمایەك وهاوشێوەی بێت، ئاوی باران لە جۆگەکانەوە دێن بۆی، یان ئاو نزیکیەتی بە ڕەگەکانی لێی دەخوات وەك ئەوەی نزیك ڕوبارێك بێت.

(٢) واتە: بریتیە لە وشترانەی کە ئاویان لە سەر پشت هەڵدەگیرێت بۆ ئاودانی زەرعات، نێرینەکەی: «ناضح»ی پێ دەوترێت، مێینەکەش: «ناضحة»یە.

(٣) أخرجه البخاري (١٤٨٣) من حديث ابن عمر رضي الله عنهما.

«الرِّكاز»یش: ئەوەیە کە لە زەوی دەدۆزرێتەوە لە نێژروای نەفامی، بەڵگەی فەرزێتی زەکاتیش لە کانزا وگەنجینەی شاراوەی نەفامی، گشتێتی ئەم فەرمایشتەی خوایە ﷻ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ﴾ [البقرة:٢٦٧] «ئەی ئەوانەی بڕواتان بە خوا وپەیامبەرەکەی موحەممەد هەیە ببەخشن لەو حەڵاڵە پاکەی بە دەستان هێناوە ولەوەی لە زەوی بۆمان دەرهێناون». پێشەوا قورتوبی لە تەفسیرەکەی خۆیدا ئەڵێ: مەبەستی ڕوەك وکانزا وگەنجینەی شاراوەی نەفامیە. ولەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «وفي الرِّكَازِ الخُمْسُ»[1] «ولە گەنجینەی نەفامیدا پێنج یەك هەیە». وئوممەتیش کۆکە لە سەر فەرزێتی زەکاتی کانزاکان.

### ٥- ماڵی بازرگانی «عُرُوضُ التِّجَارَةِ»:

بریتیە لە هەمو ئەو شتانەی بۆ کڕین وفرۆشتن دانراوە بۆ قازانج، لەبەر ئایەتی: ﴿أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ﴾ [البقرة:٢٦٧]. جمهوری زانایانیش لە سەر ئەوەن کە مەبەست لەم ئایەتە زەکاتی ماڵی بازرگانیە.

## پرسی شەشەم: دانایی لە فەرزێتی زەکات، هەروەها لە سەر کێ فەرزە (مەرجەکانی فەرز بونی):

### أ- دانایی لە فەرزێتی زەکات:

زەکات فەرزە لەبەر زۆر حیکمەتی باڵا وئامانجی بەرێز کە لە ژماردن نایەت، لەوانە:

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٤٩٩)، ومسلم (١٧١٠) من حديث أبي هريرة ﷺ.

١- پاککردنـەوەی مـاڵ وگەشـەکردنی، وبـە فـەڕ وبەرەکـەتی دەکـات، وشـەڕ ودەردەکەی ئەبات، ولە ئافات وخراپبون دەیپارێزێت.

٢- پاککردنەوەی زەکاتدەر لە ڕژدی وڕەزیلی، وپیسی تاوان وهەڵە، وڕاهێنانی لە سەر بەخشندەیی وبەخشین لە پێناو خوادا.

٣- بەدەمەوەبون «مواساة»ی هەژار وپڕکردنەوەی پێویستی موحتاجـان ونـەداران وبێبەشان.

٤- بەدیهێنانی هەماهەنگی ویارمەتیـدان وخۆشەویسـتی لـە نێـوان تاکـەکانی کۆمەڵگادا، جا کاتێك دەوڵەمەند زەکات دەبەخشێتە برا هەژارەکەی ئەو ڕق وکینـە وئاواتی نەمانی دەوڵەمەندی دارا کە لەوانەیە لە دڵی ئـەودا هـەبێت لەگـەڵ خۆیـدا دەر دەکات. بەمەش ڕقەکان نامێنن وتەبایی وئاسایش بڵاو دەبێتەوە.

٥- زەکاتدان شوکرانەبژێری کردنـی خوایـە لـە سـەر نیعمـەتی مـاڵ وسـامان، هەروەها گوێڕایەڵی کردنی خوایە ﷻ لە جێ بەجێکردنی فەرمانەکانی.

٦- زەکات دان بەڵگەیە لە سەر ڕاستی ئیمانی زەکـات دەرەکـە، چـونکە مـاڵی خۆشەویست دەرناکرێت مەگەر بۆ لەو خۆشەویست تر، هـەر بۆیـە پێـی دەوترێـت: صەدەقە، لەبەر ڕاستی خواستی خاوەنەکەی بۆ خۆشەویستی وڕەزامەندی خوا.

٧- هۆکـارە بـۆ ڕازی بـونی خـوا ودابـەزینی خێـر وخۆشـیەکان، وسـڕینەوەی تاوانەکان، وهی تریش.

**ب- زەکات لە سەر کێ فەرزە (مەرجەکانی فەرز بونی)؟**

زەکات فەرزە لە سەر کەسێك ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

١- ئیسلام: جا فەرز نیە لە سەر بێباوەڕ، چونکە پەرستنێکی ماڵیە پێی لە خوا نزیك دەبێتەوە، بەڵام بێباوەڕ پەرستنی لێ وەرناگیرێت تا دێتە ناو ئیسلامەوە، چونکە خوا ئەفەرموێ ﷻ: ﴿وَمَا مَنَعَهُمْ أَنْ تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَاتُهُمْ إِلَّا أَنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَبِرَسُولِهِ﴾ [التوبة: ٥٤] «وهۆکاری وەرنەگرتنی بەخشینەکانیان ئەوەیە: ئەوان بێباوەڕی وبە درۆخستنەوەی پەیامبەرەکەیان لە دڵدا شاردۆتەوە». جا مادام لێیان وەرناگیرێت پێویستکردنی لە سەریان سودی نیە، ولەبەر مەفهومی وتەکەی ئەبوبەکر ﵁: «ئەمە فەرزی صەدەقەیە کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرزی کردوە لە سەر موسڵمانان»[1]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێت لە سەری، چونکە گوتارە شەرعیەکانیش ئاراستەی ئەویش کراوە لە سەر وتەی دروست.

٢- ئازادی: جا زەکات پێویست نیە لە سەر کۆیلە و«المُكاتَب»[2]، چونکە کۆیلە خاوەنی هیچ نیە، موکاتەبیش خاوەندارێتیەکەی لاوازە، هەروەها کۆیلە وئەوەشی هەیەتی هی خاوەنەکەیەتی، جا زەکاتی ئەم لە سەر ئەوە.

٣- خاوەن ڕادە «نصاب» بێت خاوەندارێتیەکی تەواوی جێگیر وسەقامگیر[3]: هەروەها زیاتر بێت لە پێویستیە زەرورەکان کە مرۆڤ لێی بێ پێویست نیە، وەکو خۆراك وپۆشاك وخانو، چونکە زەکات بۆ بە دەمەوەبونی هەژار دانراوە، کەواتە پێویستە بگاتە خاوەندارێتی ڕادە «نصاب» کە بە هۆیەوە دەگاتە دەوڵەمەندیەکی

(١) أخرجه البخاري (١٤٥٤)، ئەمەش لەو نوسراوەی کە ئەینوسێت بۆ ئەنەس کاتێك دەینێرێت بۆ بەحرەین.

(٢) بریتیە لەو کۆیلەیەی لەگەڵ خاوەنەکەیدا ڕێك کەوتوە دوای پێدانی ئەندازەیەکی دیاری کراوی ماڵ لە شێوەی قیستدا، ئازاد ببێت. وەرگێڕ.

(٣) سەقامگیری واتە: موعەڕڕەز نیە بۆ تیا چون، خۆ ئەگەر موعەڕڕەز بێت بۆ تیاچون ودەسەڵات بەسەریدا نەشکێت ئەوا زەکاتی تێدا نیە.

بایەخپێدراو، ئەمەش لەبەر فەرمودەکـەی پەیامبـەر ﷺ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ» «کەمتر لە پێنج ویسق زەکاتی تێدا نیـە، هـەروەها کـەمتر لـە پێـنج زەود زەکاتی تێدا نیە، هەروەها کەمتر لە پێنج وەقە «ئۆقیە» زەکاتی تێدا نیە»[1].

٤- **ساڵ هاتن بە سەر ماڵدا:** ئەمەش بـەوەی دوانـزە مـانگی قەمـەری تێپـەڕ ببێت بە سەر نیصابەکە لە لای خاوەنەکەی، لەبەر فەرمودەکـەی ﷺ: «لَا زَكَاةَ فِي مَالٍ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ» «زەکات نیە لە هیچ ماڵێکـدا تـا سـاڵی بـە سـەردا تێپەڕ دەبێت»[2]. ئەمەش تایبەتە بە مەڕ ومالآت وپـارە وپـول ومـاڵی بازرگـانی، بەڵام زەرعات وبەر وبوم وکانزاکان وریزکاز، ئەوە سـاڵ تێپـەڕبونی تێـدا بـە مـەرج نـەگیراوە، چـونکە خـوا ئەفـەرموێ ﷻ: ﴿وَآتُوا حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ﴾ [الأنعام:١٤١]. هەروەها لەبەر ئەوەی کانزاکان وریکاز ماڵێکە لە زەویەوە دەست دەکەوێت، بۆیە بۆ پێویست بـونی زەکـات تێیـدا سـاڵ تێپـەڕ بـون مـەرج نیـە وەك کشـتوکاڵ وبـەر وبومەکان.

## پرسی حەوتەم: بەشەکانی زەکات:

زەکات دو بەشە:

١- زەکاتی ماڵ وسامان: کە بریتیە لەوەی پەیوەستە بە ماڵەوە.

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٤٤٧)، ومسلم (٩٧٩)، من حديث أبي سعيد الخدري ﷺ.

(٢) أخرجه ابن ماجه وغيره، وصححه الألباني انظر: إرواء الغليل (٣/٢٥٤) (٧٨٧).

٢- زەکاتی جەستە: ئەوەیە کە پەیوەستە بەلاشەوە، ئەمەش زەکاتی سەر فترەیە.

## پرسی هەشتەم: زەکاتی قەرز:

قەرز ئەگەر هاتو لە لای نەدار یان قەرز کوێر (ئەمڕۆ وبەیانی کەر= مُمَاطِل)ێك بو، ئەوە کەی قەرزەکەی درایەوە زەکاتی یەك ساڵی دەدات لە ساڵی وەرگرتنەکەدا، ئەگەریش بەلای داراکەوە بو دەستی پیێ نەدەکرد ئەو کاتە هەمو ساڵێك زەکاتی دەدات، چونکە وەکو ئەوە وایە لای خۆی بێت.

# دەروازەی دوەم

# لە بارەی زەکاتی زێڕ وزیوەوە

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: حوکمی زەکاتی زێڕ وزیو، وبەلگەکانی:

زەکات لە زێڕ وزیودا فەرزە لەبەر ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ [التوبة: ٣٤] «وئەوانەی ماڵ دەگرنەوە وزەکاتەکەی نادەن ومافە واجبەکانی دەرناکەن وەك ئاڵتون وزیو، ئەوا مژدەیان بدەرێ بە سزایەکی بە ئێش». وهەڕەشەی لەم چەشنەش ناکرێت مەگەر لە سەر نەکردنی فەرزێك.

هەروەها لەبەر ئەو فەرمودەی[ـەی پێشتر]: «هیچ خاوەن زێڕ وزیوێك نیە وهەقی نەدات مەگەر لە ڕۆژی قیامەتدا ئەبێتە پارچە ئاسنی پلێت ئاسا، ئەلێی ئاگرە، لە ئاگری دۆزەخدا سور وگەرم دەکرێت، ئەوسا لا تەنیشتی وناو چاوانی وپشتی پێ داخ دەکرێت، هەر سارد بویەوە دوبارە گەرم دەکرێتەوە لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە تا خوا دادوەری لە نێوان بەندەکاندا دەکات». هەروەها زانایان کۆکن لە سەر ئەوەی لە هەر دو سەد درهەمێك پێنج درهەمی تێدایە، زێڕیش کە گەیشتە بیست مسقاڵ ونرخەکەی دو سەد درهەم بو، زەکاتی تێدایە.

## پرسی دوەم: ئەندازەی زەکات:

ئەندازەی زەکاتی فەرز لە زێڕ وزیو: ڕوبعی «یەك لە دەیە»، واتە: لە هەر بیست دینارێکی زێڕ نیو دیناری تێدایە، ئیتر بە گوێرەی ئەمەیە زۆر بێت یا کەم، هەروەها

لە هەمو دو سەد درهەمێکی زیودا: پێنج درهەمی تێدایە، زیاتریش بو بە گـوێرەی ئەمەیە، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «وَفِي الرِّقَةِ[1] رُبُعُ الْعُشْرِ» «لـە زێـڕ وزیوی نەخت، ڕوبعی ((دە یەك))ی تێدایە»[2]، ولەبەر فـەرمودەی: «...وَلَيْسَ عَلَيْكَ شَيْءٌ -يَعْنِي فِي الذَّهَبِ- حَتَّى تَكُونَ لَكَ عِشْرُونَ دِينَارًا، فَإِذَا كَانَتْ لَكَ عِشْرُونَ دِينَارًا وَحَالَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ فَفِيهَا نِصْفُ دِينَارٍ» «وهیچـت لـە سـەر نیـە -یـانی لـە زێڕدا- تا دەبێتە بیست دینار، کە گەیشتە بیست دینار وساڵی بە سەردا هات ئـەوە نیو دیناری تێدایە»[3]. هەروەها لەبەر ئەوەی لە پەیامبەرەوە ﷺ هـاتوە کـە: «لـە هەمو بیست دینارێکدا -بەرەو سەرەوە- نیو دینار زەکاتی بردوە»[4].

## پرسی سێیەم: مەرجەکانی زەکات:

مەرجە بۆ فەرزێتی زەکات لە زێڕ وزیودا، ئەم مەرجانەی خوارەوە هەبێت:

١- **گەیشتنە ڕادە:** کـە بریتیـە لـە بیسـت مسـقاڵ زێـڕ، لەبـەر فەرمودەکـەی [پێشوی] عەلی رضي الله عنه: «وهیچت لە سەر نیە -یـانی لـە زێـڕدا- تـا دەگاتـە بیسـت دینار، کە گەیشتە بیست دینار وساڵی بە سـەردا هـات ئـەوە نیـو دینـار زەکـاتی تێدایە»، کە دەکاتە «٨٥» گرام.

---

(١) الرِّقَة: بە قافێکی سوك، بریتیە لە زیو ودرهەمی نەخت، بنەڕەتەکەی: «الوَرِق»ـە، واوەکەی لابراوە وهائێك خراوەتە شوێنی. [نەختیش: لە زمانی کوردیدا، واتە: پارەی لە سکەدراو].

(٢) أخرجه البخاري (١٤٥٤) من حديث أنس بن مالك عن أبي بكر رضي الله عنه [ورد لفظه في الأصل هكذا: «وفي الرِّقَةِ كل مائتي درهم ربع العشر». ولم أجده لا في البخاري ولا في غيره، ولعل السبب في هذا وغيره من تغاير الألفاظ -والله أعلم- أنهم -وفقهم الله تعالى- ينقلون كثير من الأحاديث من كتب الفقه، وهنا من «الشرح الممتع على زاد المستقنع» لابن العثيمين (٣١/٦). والله تعالى أعلم]

(٣) أخرجه أبو داود (١٥٧٣) [هذا لفظه، لا «نِصْفُ مِثْقَالٍ»] وغيره عن علي بإسناد حسن أو صحيح كما قال النوي.

(٤) أخرجه ابن ماجه (١٧٩١)، والدارقطني (١٩٩)، وهو صحيح. انظر «إرواء الغليل» (٢٨٩/٣). [هذا لفظه، وفي الأصل: «مِثْقَالًا نِصْفُ مِثْقَالٍ» وهو هكذا في «الروض المربع» و«كشاف القناع»].

ڕادەی زیویش دو سەد درهەمی زیو، لەبەر فەرمایشتەکەی [پێشوی] پەیامبەر ﷺ: «وکەمتر لە پێنج وەقە «ئۆقیە» زەکاتی تێدا نیە»، هەر وەقەیەکیش چل درهەمە، جا پێنج وەقە دەکاتە دو سەد درهەم، ولەبەر فەرمایشتەکەی [پێشوی] ﷺ: «وَفِي الرِّقَةِ رُبُعُ الْعُشْرِ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ إِلَّا تِسْعِينَ وَمِائَةً فَلَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا» «ولە زێڕ وزیوی نەخت چارەکی دە یەکی تێدایە، جا ئەگەر نەیبو جگە لە سەد ونەوەد ئەوا هیچ زەکاتی تێدا نیە مەگەر خاوەنەکەی خۆی حەز بکات». وزانایانیش کۆکن لە سەر ئەوەی ڕادەی زیو پێنج وەقەیە، وڕادەی زێڕ بیست مسقاڵە[1].

**٢- مەرجە گشتیەکانی تر** کە ڕابورد لەباسی: «زەکات لە سەر کێ فەرزە؟» کە بریتی بو لە: ئیسلام وئازادی وخاوەندارێتی تەواو، وساڵ بە سەر هاتن. پێشتریش ڕابورد.

## پرسی چوارەم: لە بارەی زێڕ وزیو خستنە زگ یەك:

ئەم دوانە ناخرێنە سك یەك بۆ تەواوکردنی ڕادە ئەمەش لە سەر ڕای دروست. چونکە هەر دوکیان دو ڕەگەزی جیاوازن، بۆیە ناخرێنە زگ یەك، وەکو مانگا وشتر، وجۆ وگەنم، لە کاتێکدا مەبەست لە هەر دوکیاندا یەك شتە، کە گەشەکردنە لە وشتر ومانگادا، وخۆراکە لە جۆ وگەنمدا، هەروەها لەبەر فەرمایشتەکەی [پێشوی] پەیامبەر ﷺ: «وکەمتر لە پێنج وەقە زەکاتی تێدا نیە». جا کە وترا دەخرێنە زگ یەك لە تەواوکردنی ڕادە، ئەوە وا دەخوازێت: کەمتر لە پێنج وەقەی زیو زەکاتی تێدا

(١) «شرح صحيح مسلم» للنوي (٤٨/٧).

فەرز ببێت، ئەگەر زێڕی هەبو بۆ پڕکردنـەوەی ڕادەکـە. بـەڵام فەرمودەکـە ئـەوەش دەگرێتەوە کە ئەگەر هەیبێ لە زێڕ پێی تەواوی بکات یان نەیبێت. کەوابو ئەگـەر دە دینار [ی زێڕ] وسەد درهەمی [زیوی] هەبو ئەوە زەکاتی لە سەر نیە، چونکە زێڕ بە تەنیا زەکاتی دەدرێت، وزیویش بە تەنها.

## پرسی پێنجەم: لە بارەی زەکاتی خشڵەوە «زَكَاة الحُلِيّ»:

جیاوازی نیە لە نێوان زانایاندا لە سەر فەرزێتی زەکات لە خشڵ کە بۆ هـەڵگرتن وکرێدانن، هەروەها خشڵی حەرام؛ وەك پیاوێك کلوانکەکەی زێڕ بێت، یـا ئافرەتێـك خشڵەکەی لە وێنەی ڕوح لەبەر بێت، یا وێنەی ڕوح لەبەری پێوە بێت، بـەڵام خشـڵ وزێڕی دانراو بۆ بەکارهێنانی حەڵاڵ ولە لادانان «العارية»، جا ئەوەی دروستە لەو دو وتەیەی زانایان زەکاتی تێدا واجبە، لەبەر ئەمانەی خوارەوە:

١- گشتێتی ئەو دەقانەی هاتوە لە بارەی فەرزێتی زەکاتـەوە لـە ئـاڵتون وزیـو، ئەمەش گشتیە خشڵ وجگە لەوەش دەگرێتەوە.

٢- ئەوەی کە خاوەن سونەنەکان دەیگێڕنەوە لە عـەمری کـوڕی شـوعەیبەوە لـە باوکیەوە لە باپیریەوە ﷺ(١): «أَنَّ امْرَأَةً أَتَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَمَعَهَا ابْنَةٌ لَهَا وَفِي يَدِ ابْنَتِهَا مَسَكَتَانِ(٢) غَلِيظَتَانِ مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ لَهَا: أَتُعْطِينَ زَكَاةَ هَذَا؟ قَالَتْ: لَا، قَالَ: أَيَسُرُّكِ أَنْ يُسَوِّرَكِ اللهُ بِهِمَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ سِوَارَيْنِ مِنْ نَارٍ؟! قَالَ: فَخَلَعَتْهُمَا فَأَلْقَتْهُمَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَقَالَتْ: هُمَا لِلهِ وَلِرَسُولِهِ» «ئافرەتێك هاتە خزمـەتی پەیامبـەر ﷺ

(١) أخرجه أبو داود (١٥٦٣) [واللفظ له]، والنسائي (٣٨/٥)، والبيهقي (١٤٠/٤)، وصحح إسناده ابن القطان كما في نصب الراية (٣٧٠/٢)، وحسنه الألباني «صحيح الترمذي» ٥١٨).

(٢) بە چەند فەتحەیەکی بە دوای یەکدا، کۆیە، یانی: بازنگ، تاکەکەی «مَسَكَة»یە.

وکچێکی لەگەڵدا بو، دو بازنە ودەستەوانەی زێڕینی ئەستوری لە دەستدا بو، پێی فەرمو: ئایا زەکاتی ئەمە دەدەیت؟ وتی: نەخێر، فەرمو: حەز ئەکەیت خوا ﷻ لە قیامەتدا بیکاتە بازنی ئاگرین بۆت؟! ئەڵێ: ئەوەبو دایکەند ودای بە پەیامبەر ﷺ، وتی: ئەوە بۆ خوا وپەیامبەرەکەی».

٣- ولەبەر ئەوەی ئەمە ئیحتیات وئەستۆپاکی زیاتری تێدایە، جا پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: «دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لَا يَرِيبُكَ» «واز لە جێی گومان بهێنە وئەوە بکە کە جێی گومان نیە»[1].

## پرسی شەشەم: لە بارەی زەکاتی ماڵی بازرگانیەوە «عروض التجارة»:

«العروض»: کۆی «عَرْض» و«عَرَض»ـە، ئەوەیە کە موسڵمان دایناوە بۆ بازرگانی کردن لە هەر جۆرێك بێت، ئەمەش گشتگیرترین ماڵی زەکاتە. بەمە ناونراوە: چونکە سەقامگیر نیە، بەڵکو دێتە دەست ودەڕوا، لەبەرئەوەی بازرگان خودی ئەم کاڵایەی ناوێت، بەڵکو قازانجەکەی دەوێت لە هەر دو دراوەکە.

زەکاتیش فەرزە تێیدا لەبەر گشتێتی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: ﴿وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾ [الذاريات:١٩] «ولە ماڵەکانیاندا مافی فەرز وسوننەت هەیە بۆ ئەو هەژارانەی داوا دەکەن وئەوانەشی داوا ناکەن لە شەرمدا»، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ﴾ [البقرة:٢٦٧]. ولەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] پەیامبەر ﷺ بۆ موعازی کوڕی جەبەل رضي الله عنه: «ئەوا پێیان ڕابگەیەنە کە خوا صەدەقەی لە ماڵەکانیان فەرز کردوە لە سەریان، لە

(١) أخرجه الترمذي (١٥٦٣)، والنسائي (٥٧١١)، وصححه الألباني.

دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ ودەدرێتەوە بە هـەژارەکانیان». گومانیشـی تێـدا نیـە ماڵی بازرگانی ماڵە.

## مەرجەکانی فەرزبونی زەکات تێیدا:

١- بوو بێتە خاوەنی بە کاری خۆی، وەك: کـڕین وفرۆشـتن، ووەرگـرتنی دیـاری، بۆیە میراتی وهاوشێوەکانی ناڕواتە ژێریەوە، لەوانەی بە ناچاری وزۆر دەبێتە موڵك.

٢- ئەبێت بە مەبەستی بازرگانی بو بێتە خاوەنی.

٣- ئەبێت نرخەکەی بگاتە ڕادە «نصاب».

لەگەڵ پێنج مەرجەکەی پێشوی سەرەتای باسی زەکات.

جا ئەگەر سـاڵی بەسـەردا هـات ئـەوا بـە یـەکێك لـە دو دراوەکـە: زێـڕ وزیـو دەژمێردرێت، جا کە نرخەکە گەیشتە ڕادە ئەوا چارەکی دەیەکی تێدایە.

ولە کاتی ژماردندا تەماشای کاتی کڕینی ماڵـە بازرگانیەکـە ناکرێـت، چـونکە نرخەکەی زیاد وکەم دەکات، بەڵکو عیبرەت بە نرخەکەیەتی لە کاتی کۆتایی هاتنی ساڵەکە.

# دەروازەی سێیەم

## لە بارەی زەکاتی ئەوەی لە زەوی دێتە دەرەوە (الخَارِجُ مِنْ الأَرْضِ)

ئەمەش چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

### پرسی یەکەم: کەی فەرز دەبێت؟ وبەڵگەکەی:

بنەما وبەڵگە لە سەر فەرز بونی، ئەم فەرمایشتەی خوایە ﷻ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ﴾ [البقرة:٢٦٧]. زەکاتیش لە دانەوێڵەدا فەرز دەبێت ئەگەر ڕەق وقایم بو «اِشْتَدَّ» وبو بە فەریکە، ولە بەر وبومدا فەرز دەبێت گەی پێگەیشت، بەوەی تامی خۆش بێت بۆ خواردن بشێت، ومەرج نیە ساڵی بە سەردا بڕوا، لەبەر فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿وَآتُوا حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ﴾ [الأنعام:١٤١]. کەواتە زەکات فەرزە لە هەر دانەوێڵە وبەر وبومێك بپێورێ وهەڵبگیرێ، وەك گەنم وجۆ وزوورات «گەنمەشامی» وبرنج وخورما ومێوژ، بەڵام لە میوەهات وسەوزەوات فەرز نیە. وتمان: «بپێورێ»: لەبەر ئەوەی پەیامبەر ﷺ ئیعتباری بۆ بە ویسق پێوان «التوسيق» دانا کە بریتیە لە بار کردن «التحميل»، وتیشمان: «هەڵبگیرێ»: چونکە لە هەڵگرتن مانایەکی گونجاو «مناسب» هەیە بۆ فەرزکردنی زەکات تێیدا. جا لە سەر ئەمە ئەگەر نە دانەوێڵە وبەر وبومێکی پێوانەکراو بو نە هەڵگیراو زەکاتی تێدا نیە.

### پرسی دوەم: مەرجەکانی زەکاتی دانەوێڵە:

بۆ ئەوەی زەکات فەرز بێت لە دانەوێڵە وبەر وبوم، دو مەرجی پێویستە:

**١- گەیشتنە ڕادە:** کە پێنج ویسقە، ئەمەش لەبەر فەرمودەی [پێشتر]: «کەمتر لە پێنج ویسق زەکاتی تێدا نیە». ویسقیش: بارە وشترێکە، کە دەکاتە شەست مەن (صاع) بە مەنی پەیامبەر ﷺ، پێنج ویسقیش سێسەد مەنە، کەواتە کێشی ڕادە بە گەنمی چاك دەکاتە نزیکەی شەش سەد ودوانزە کگم، لە سەر ئەوەی کێشی مەنێك ٢,٤٠ کیلۆ گرام بێ.

**٢-** ئەبێت لە کاتی فەرزبونی زەکات لە سەری، ڕادەکە مولکی خۆی بێت.

## پرسی سێیەم: لە بارەی ئەو ئەندازەیەی فەرزە بدرێت:

ئەو ئەندازەیەی پێویستە بدرێت لە دانەوێڵە وبەر وبومدا: دە یەکە لەوەی ئاودانەکەی بێ خەرجی وتێچون «كُلْفَة» بێت، وەك ئەوەی ڕەگەکەی خۆی ئاو بخواتەوە «عَثَري»، یا لە چاوگەکانەوە ئاو بخواتەوە. ونیوەی دە یەکە ئەگەر ئاودانەکەی بە دۆڵەکە «الدلاء» وئامێرە نوێیەکان وشترەکان «السواني» وهاوشێوەکانی بێت، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْأَنْهَارُ وَالْعُيُونُ أَوْ كَانَ بَعْلًا الْعُشْرُ، وَمَا سُقِيَ بِالسَّوَانِي وَالنَّضْحِ نِصْفُ الْعُشْرِ» «ئەوەی لە ئاسمان وڕوبارەکان وچاوگەکان ئاوی دەخوارد یا بەعل بو؛ دە یەکی تێدایە، ئەگەریش بە وشترەکان ئاو دەدرا ئەوە نیوەی دە یەکی تێدایە»(١).

---

(١) أخرجه البخاري (١٤٨٣) عن ابن عمر ﷺ، وأبو داود (١٥٩٦) [والنسائي (٢٤٨٧)] واللفظ لهـ[ـما]، بەعلیش: ئەو دارخورمایەیە بە ڕەگەکانی خۆی ئاو دەخوا وپێویستی بە ئاودان نیە.

## پرسی چوارەم: لە بارەی زەكاتی هەنگوینەوە:

زۆربەی زانایان پێیان وایە هەنگوێن زەكاتی تێدا نیــە، ئـەم بۆچـونەش دیــارترە، چونكە نە لە قورئان ونە لە فەرمودەدا بەڵگەیەكی ڕاشكاو نیە لــە ســەر فــەرزبونی، بنچینەش ئەستۆ پاكیە «براءة الذمة» مەگــەر بەڵگەیــەك هــەبیت فــەرزی بكــات. پێشەوا شافعی ئەڵێ: «فەرمودەی: «فِي الْعَسَلِ: الْعُشْرُ» «لە هەنگوێندا یــەك لــە دە هەیــە» لاوازە، هــەروەها «أَلَّا يُؤْخَذ مِنْهُ [أي: من العسل] الْعشْر» «دەیــەك لــە هەنگوێن نیە»ش دیسانەوە لاوازە، جگە لە عومەری كوڕی عەبدولعەزیزەوە نــەبێت، وهەڵبژاردنی من ئەوەیە هیچــی تێــدا نیــە، چــونكە ئــەو فــەرمودە وئاســەوارانەی چەسپاون لەبارەی ئەوەی زەكات لە چیدا هەیە، هــەنگوێنی تێــدا نیــە، وەك ئــەوەی چاوپۆشی لێكرا بێت». ئــیبن ئــەلمونزیر ئــەڵێ: «هــیچ فەرمودەیــەكی چەســپاو نیــە لەبارەی فەرزكردنی زەكات لە هەنگوێندا».

## پرسی پێنجەم: لە بارەی گەنجینەی شاراوەی نەفامی «الرِّكاز»ەوە:

«الرِّكاز»: بریتیە لەوەی لە نافامیدا شاردراوەتەوە زێڕ بێت یا زیو یا هەر شتێكی تر نیشانەی بێباوەڕانی پێوە بێت، وبــە پــارە بخوازرێــت، وتێچــون وكــاركردنی زۆری نەوێت، خۆ ئەگەر بە پارە خوازرا وئیشی زۆری گەرەك بو، ئەوە ریكاز نیە.

پێنج یەك «خُمُس»یشی تێدا پێویستە زۆر بو یا كەم، مەرجیش نیــە ســاڵی بــە سەردا بێت وگەیشتبێتە ڕادە، لەبــەر گشــتێتی فەرمودەكــەی [پێشــتری] پەیامبــەر ﷺ: «لە ریكازدا پێنج یەك هەیە»، ئەمەش دەستكەوت «الفيء»ە، ولە بەرژەونــدی گشتی موسوڵمانانداندا خەرج دەكرێت، مەرجیش نیە لە جۆرە ماڵێكی دیــاریكراو بــێ؛ ئیتر زێڕ بێت یا زیو یا شتی تر.

وبەوە دەزانرێت کە لە چاڵ نراوی نەفامیە: کە نیشانەی بێباوەڕی پێوە بێت، وەك نوسینی ناوەکانیان، ونەشخاندن وکێشانی وێنەکانیان، وهاوشێوەی ئەم نیشانانە.

کانزاکانیش: بریتیە لەوەی لە سکی زەوی دەردەهێنرێت ولە ڕەگەزی زەوی نەبێت، وڕوەك نەبێت، ئیتر تەڕ «الجاری» بێت وەك نەوت وزفت، یا وشك وەك ئاسن ومس وزێڕ وزیو وجیوە، جا زەکاتی تێدا فەرزە، بە کۆ دەنگی زانایان وەك ڕابورد، لەبەر گشتێتی ئەو دەقانەی هاتون لە بارەی واجبێتی زەکاتی ئەو شتانەی لە زەوی دەردەهێنرێت، وەك ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: ﴿أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ﴾ [البقرة:٢٦٧].

# دەروازەی چوارەم

## لە بارەی زەکاتی مەڕ ومالآت «بَهِيمَةَ الأَنْعَام»

«بهيمة الأنعام»: بریتیە لە وشتر ومانگا ومەڕ وبزن، مانگا: گامێشیش دەگرێتەوە چونکە جۆرێکە لە مانگا. پێشی وتراوە: «بهيمة الأنعام» چونکە قسە ناکەن، لە «الإبهام»ەوە هاتوە، کە بریتیە لە شاردنەوە ونارِون بون.

**چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:**

### پرسی یەکەم: مەرجەکان بۆ فەرز بونی زەکات:

**بۆ فەرزبونی زەکات لەو ئاژەڵانەدا ئەبێت ئەم مەرجانەی خوارەوە هەبن:**

**١- ئەبێت مالآتەکە بگاتە ڕادەی شەرعی، ئەمەش لە وشتردا پێنج دانەیە، ولە مانگادا سیە، ولە مەڕ وبزندا چل، لەبەر فەرمودەکەی [پێشتر]: «کەمتر لە پێنج زەود زەکاتی تێدا نیە»[(١)]، ولەبەر فەرمودەکەی موعاز ﷺ: «بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ أُصَدِّقُ أَهْلَ الْيَمَنِ، وَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِنَ الْبَقَرِ مِنْ كُلِّ ثَلَاثِينَ تَبِيعًا، وَمِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةً» «پەیامبەر ﷺ ناردمی بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی خەڵکی یەمەن، فەرمانی پێکردم لە سی مانگادا تەبیعێك ببەم، ولە چل دانەدا موسیننەیەك ببەم [دواتر واتەکانیان دێت]»[(٢)]. ولەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «فَإِذَا كَانَتْ**

---

(١) زەودیش لە وشتردا: لە سیانەوە بۆ دەیە، وشەیەکی مۆنەسە، تاکی نیە لە بێژەکەی خۆی، جا کە ئەفەرموێ: «پێنج زەود» وەکو ئەوە وایە بلّێ: «پێنج بەعیر، پێنج جەمەل، پێنج ناقە».

(٢) صحيح: أخرجه أحمد (٥/٢٤٠)، وأبو داود (١٥٧٦)، والترمذي (٦٢٣)، وغيرهم، وصححه الألباني «الإرواء» (٧٩٥). [«أُصدق أهل اليمن» أي: أجمع صدقاتهم].

سَائِمَةُ الرَّجُلِ نَاقِصَةً مِنْ أَرْبَعِينَ شَاةً وَاحِدَةً، فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ [إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا]» «ئەگەر مەڕومالاّت بۆ چل شەك یەك دانەی کەمتر بو، ئەوا زەکاتی تێدا نیە مەگەر خاوەنەکەی حەز بکات»[1].

٢- ئەبێت ساڵێکی تەواو بە سەر ئاژەڵەکەدا بێت لەلای خاوەنەکەی، ئەمە نیصابە، لەبەر فەرمودەکەی [پێشتر]: «زەکات نیە لە هیچ ماڵێکدا تا ساڵی بە سەردا تێ نەپەڕێت».

٣- ئەبێت لە دەشت بلەوەڕێت «السائمة»: ئەوەیە کە لە گژ وگیای حەلاڵ دا دەلەوەڕێت لە هەمو ساڵەکە یا زۆربەی، کە بریتیە لەوەی خواڕسك بێت وکەس نەیناشتبێت، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «وَفِي صَدَقَةِ الْغَنَمِ: فِي سَائِمَتِهَا إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، شَاةٌ» «ولە زەکاتی مەڕ وبزندا: لەوەی سائیمەیە لە چلەوە هەتا سەد وبیست، شەکێکی تێدایە»[2]. هەروەها ئەفەرموێ ﷺ: «فِي كُلِّ إِبِلٍ سَائِمَةٍ فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ ابْنَةُ لَبُونٍ» «لە هەر وشترێکی سائیمەدا لە هەر چل دانەیەك بنت لەبونێکی تێدایە»[3]. ئەگەریش کەمێکی ساڵەکە دەلەوەڕی وزۆربەی ئالفی دەخوارد ودانی بو، ئەوە سائیمە نیە وزکاتیشی تێدا نیە.

٤- ئەبێت ئیشکەر نەبێت، ئەوەیە کە خاوەنەکەی لە کێلاّن یا غەراز گواستنەوە، یا بار هەڵگرتن بە کاری دەهێنێت، چونکە ئەڕواتە ژێر پێداویستیە

---

(١) أخرجه البخاري (١٤٥٤).

(٢) أخرجه البخاري (١٤٥٤).

(٣) [أخرجه النسائي (٢٤٤٣) وأبو داود (١٥٧٥) وأحمد (٢٠٣٣٥). وصححه الألباني «الإرواء» (٣/ ٢٦٣) (٧٩١). وهذا فيما إذا زادت على مئة وعشرين كما جاء عند البخاري (١٤٥٤)].

سەرەکیەکانی مرۆڤەوە وەك جلوبەرگ. بەڵام ئەگەر دانرابو بۆ کرێ ئەوە زەکات لەوە دەدات کە لە کرێکە دەستی دەکەوێت، ئەگەر ساڵی بە سەردا هات.

## پرسی دوەم: لە بارەی ئەو ئەندازەیەی پێویستە بدرێت:

### ١- ئەو ئەندازەیەی لە وشتر پێویستە:

ئەو ئەندازەیەی پێویستە بدرێت لە زەکاتی پێنج وشتردا: شەکێکە؛ شەش مانگی تەواو کردبێت لە مەڕ «الجذعة من الضأن»، یا ساڵێکی تەواو کردبێت لە بزن «الثنية من المعز»، ولە دە دانەدا: دو شەك هەیە، لە پانزەدا: سێ شەك، لە بیستدا: چوار شەك، ولە بیست وپێنج تا سی وپێنج: کچی ئاوس «بنت مخاض»ێك دەدرێت، کە وشترێکە ساڵێکی تەواو کردوە ولە ناو دوەمدایە، واشی پێ وتراوە لەبەر ئەوەی زۆر جار دایکانەکەی ئاوس «ماخض= حامل»ـە، ئەمەی نەبو کوڕ شیردەر «ابن لبون»ێك دەدات، کە ئەوەیە دو ساڵی تەواو کردبێت ولە ناو سێیەمدا بێت، واشیان پێوتوە لەبەر ئەوەی دایکانەکەی، زۆرجار سکی دوەمی داناوە وشیر دەدات. ولە سی وشەش تا چل وپێنج: کچی شیردەر «بنت لبون»ێك دەدات کە دو ساڵی تەواو کردبێت. ولە چل وشەشدا: شایستە «حِقَّة»یەك دەدات، کە ئەوەیە سێ ساڵی تەواو کردبێت ولە ناو چوارەمدا بێت، واشیان پێوتوە لەبەر ئەوەی شایستەیە نێرینە کەڵی بدات، وتراویشە: لەبەر ئەوەی شایستەی سوار بون وبارکردنە. ولە شەست ویەك تا حەفتا وپێنج ددانکەوتو «جَذَعة»یەك دەدات، کە ئەوەیە چوار ساڵی تەواو کردبێت ولە ناو پێنجەمدا بێت، واشی پێوتراوە چونکە ددانەکانی پێشەوەی کەوتوە «جذعت= سقطت». ولە حەفتا وشەشدا تا نەوەد: دو «بنت لبون» دەدات. ولە نەوەد ویەك تا سەد وبیست: دو «حقة» دەدات. ئەگەریش لە

سەد وبیست زیاتر بو ئەوا لە هەر چل دانەیەك: «بنت لبون»یـك دەدات، ولـە هـەر پەنجا دانەیەك «حقة»یەك دەدات، ئەمەش لەبەر فەرمودەکەی ئەنەس ﵁ لە باسـی نوسراوی زەکاتەکەدا ئەڵێ: «فِي أَرْبَعٍ وَعِشْرِينَ مِنَ الْإِبِلِ فَمَا دُونَهَا، مِنَ الْغَنَمِ، مِنْ كُلِّ خَمْسٍ شَاةٌ، إِذَا بَلَغَتْ خَمْسًا وَعِشْرِينَ إِلَى خَمْسٍ وَثَلَاثِينَ فَفِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ أُنْثَى...» «لە بیست وچوار وشتر وبەرەو خوار، لە مەڕ وبزن دەدەیت؛ لـە هـەر پێـنج دانەیەکدا شەکێك دەدەیت، کە گەیشتە بیست وپێنج تا سی وپێـنج ئـەوا مێینـەی ئاوسێك دەدات»[1].

ئەمەش خشتەیەکە شێوازی زەکاتی وشتر ڕون دەکاتەوە:

| ئەو ئەندازەیەی فەرزە | دانە | |
|---|---|---|
| | بۆ | لە |
| شەکێك | ٩ | ٥ |
| دو شەك | ١٤ | ١٠ |
| سیٚ شەك | ١٩ | ١٥ |
| چوار شەك | ٢٤ | ٢٠ |
| یەك بنت مخاض | ٣٥ | ٢٥ |

(١) أخرجه البخاري (١٤٥٤) [وقد سبق مجزأ مرارًا].

| | | |
|---|---|---|
| ٣٦ | ٤٥ | یەك بنت لبون |
| ٤٦ | ٦٠ | یەك حقة |
| ٦١ | ٧٥ | یەك جذعة |
| ٧٦ | ٩٠ | دو بنت لبون |
| ٩١ | ١٢٠ | دو حقة |

هەرچیش زیاتر بو لە سەد وبیست «١٢٠» ئەوا لە هەر چل دانەیەك: «بنت لبون»ێك دەدات، ولە هەر پەنجا دانەیەك دا: «حقة»یەك دەدات.

**٢- ئەو ئەندازەیەی پێویستە لە مانگادا:**

پێویستە لە سی مانگا دا تا سی ونۆ: شوێنکەوتە «تبیعە»یەك بدات، کە ئەوەیە سالێکی تەواو کردبێت، وای پێ وتراوە چونکە ها بە دوای دایکیەوە. ولە چل تا پەنجا ونۆ: دداندار «مُسِنَّة»یەك دەدات، کە ئەوەیە دو سالّی تەواو کردبێت، واشی پێ وتراوە؛ چونکە ددانی دەرکردوە. ولە شەست تا شەست ونۆ: دو «تبیعة» دەدات. پاشان ئیتر لە هەر سی دانەیەك: «تبیعة»یەك دەدات، ولە هەر چل دانەیەك: «مُسِنَّة»یەك دەدات، وهەروەها. ئەمەش لەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] موعاز ﵁ کە تێیدا هاتبو: «وفەرمانی پێکردم لە سی مانگادا تەبیعێك ببەم، ولە چل دانەدا موسیننەیەك ببەم».

ئەمەش خشتەیەکە شێوازی زەکاتی مانگا ڕون دەکاتەوە:

| دانە | | ئەو ئەندازەیەی فەرزە |
|---|---|---|
| لە | بۆ | |
| ٣٠ | ٣٩ | یەك تبیع |
| ٤٠ | ٥٩ | یەك مسنة |
| ٦٠ | ٦٩ | دو تبیع |
| ٧٠ | ٧٩ | «تَبِیع ومُسِنَّة»یەك |

ئیتر چی زیاتر بو لە هەر سی دانەیەك «تبیعة»یێك، ولە هەر چل دانەیەك «مُسِنَّة»یێك.

**٣- ئەو ئەندازەیەی پێویستە لە مەڕ وبزندا:**

پێویستیشە لە چل مەڕ وبزندا تا سەد وبیست دانە: یەك شەك بدات. ولە سەد وبیست ویەك تا دو سەد: دو شەك دەدات، ولە دوسەد ویەك تا سێ سەد: سێ شەك دەدات، ئیتر دوای ئەم ئەندازە فەرزەکە جێگیر دەبێت، ولە هەر سەد دانە: شەکێك دەدات بگاتە هەر چەندێك. ئەمەش لەبەر فەرمودەکەی [پێشتی] ئەنەس: «ولە زەکاتی مەڕ وبزندا: لەوەی سائیمەیە لە چلەوە هەتا سەد وبیست، شەکێکی تێدایە، ئەگەر زیاتریش بو لە سەد وبیست هەتا دو سەد دو شەکی تێدایە، لە دو سەدیش

زیاتر بو هەتا سێ سەد سێ شەکی تێدایە، ئیتر لەمە زیاتر بو لە هەر سەد دانەیەك شەکێکی تێدایە»[1].

ئەمەش خشتەیەکە شێوازی زەکاتی مەڕ وبزن ڕون دەکاتەوە:

| دانە | | ئەو ئەندازەیەی فەرزە |
|---|---|---|
| لە | بۆ | |
| ٤٠ | ١٢٠ | یەك شەك |
| ١٢١ | ٢٠٠ | دو شەك |
| ٢٠١ | ٣٠٠ | سێ شەك |

ئیتر چی زیاتر لە هەر سەد دانەیەك شەکێك دەدات.

## پرسی سێیەم: شێوازی ئەو ماڵەی کە فەرزە:

ئیسلام بە شەرعە دادگەرەکەی هاوسەنگی ڕاگرتوە لە نێوان بەرژەوەندی هەژاران ودەوڵەمەندان، جا ئیسلام بانگ دەکات بۆ وەرگرتنی مافی هەژار بە تەواوەتی بێ کورتی، هەروەها ڕەچاوی مافی دەوڵەمەندیش بکرێت لە ماڵەکەیدا، هەر بۆیە ئەو واجبەی کە لە زەکاتدا دیاری کردوە بریتە لە مامناوەندی ماڵەکە، نە باشترینەکەی ونە خراپەکەی.

(١) أخرجه البخاري (١٤٥٤).

جا پێویستە لە سەر کۆکەرەوەی زەکات ڕەچاوی ئەو تەمەنە واجبە بکات، چونکە لەوە کەمتر نابێت وزیان گەیاندنە بە هەژاران، ولە سەروی ئەوەشەوە نابات چونکە مافخواردنی دەوڵەمەندانە. جا نەخۆش وعەیب دار وگەورەی پیر نابات، چونکە سود بە هەژار ناگەیەنێت، هەروەها ئەو ئاژەڵەی قەڵەوە ودانراوە بۆ خواردن «الأَكُولَة» نابێت، هەروەها بەخێوکەری بێچو «الرُّبَّى»، وئاوس «المَاخِض»، وفەحل کە دانراوە بۆ کەلدان، ومالّی بە بەها «حرزات المال» چونکە بەرچاویە، هەمو ئەمانە نابات چونکە لە ماڵە بە نرخەکانی مرۆڤە وبردنی زیان گەیاندنە بە دەوڵەمەند، چونکە پەیامبەر ﷺ فەرموی: «فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ» «ئامان وریای ماڵە بە بەهاکانیان بە»[1]، هەروەها لەبەر وتەکەی عومەر کە بە سوفیانی وتوە: «بە خێڵەکەت بڵێ: ئێمە «الرُّبَّى»، وئاوس، وقەڵەو، وفەحلەکانتان نابەین، تەنها «جذعة» و«ثنية» دەبەین ئەم جۆرە ماڵەش مامناوەندیە لە نێوان ئێمە وئێوەدا»[2].

## پرسی چوارەم: لە بارەی تێکەڵ کردنی ئاژەڵان:

تێکەڵکردن ئەبێتە دو جۆرەوە:

**جۆری یەکەم:** تێکەڵکردنی خودی ئاژەڵەکان «خلطة أعيان» کە ئەوەیە: ماڵەکە بە هاوبەشی خاوەندارێتی بکرێت لە نێوان هەر دو لادا، بە هاوبەشی بێت بێ جیاکردنەوە، وبەشی ئەمەکەیان لەوەکەی تریان جودا نەبێت، وئەم جۆری تێکەڵاویەش ئەکرێ بە میراتی ببێت وئەشکرێت بە کڕین.

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٣٩٥) [بل الصواب (١٤٩٦، ٤٣٤٧)، فليس فيه الشاهد أصلًا]، ومسلم (١٩)، من حديث ابن عباس ﷺ [وعندهما بالفاء، أما في الأصل فبالواو!].

(٢) [أخرجه مالك (٩٠٩)، وعبد الرزاق (٦٨٠٦)، وابن أبي شيبة (١٠٠٧٩)، والشافعي في الأم (٧٦٦، ٧٧١)].

**جۆری دوەم:** تێکەڵکردنی سیفاتەکان، کە ئەوەیە پشکی هەر یەکێکیان جیا وزانراو بێت لەوی تر، تەنها لە شوێندا هاوسێی یەکن وپێکەوەن.

ئەمەش بە دو جۆرەکەیەوە هەر دوماڵەکە دەکاتە یەك، ووەك یەك ماڵی لێ دەکات، ئەگەر بە هەردوکیەوە دەگەیشتە ڕادە، وهەروەها ئەبێت هەر دو لا لەوانە بن کە زەکاتیات لە سەر واجب دەبێت، جا ئەگەر یەکێکیان بێ باوەڕ بێت تێکەڵاویەکە دروست نابێت، وکاریگەریشی نابێت، هەروەها ئەبێت دو ماڵە هاوبەشەکە یەك شوێنی مانەوە وگەوڕیان هەبێت «الْمُرَاح»، هەروەها ئەبێت لە دەرچون بۆ لەوەڕخواردن وگەڕانەوەدا پێکەوە بن، هەروەها لە شیرخواردن وشوێنی لەوەڕ وفەحلدا یەك بن، بە شێوەیەك هەمویان یەك فەحلیان هەبێت.

جا ئەگەر ئەم مەرجانە بەدیهات ئەوا هەر دو ماڵەکە وەکو یەك ماڵیان لێ دێت بە هۆی ئەم تێکەڵاویەوە، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «وَلَا يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ وَلَا يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ مَخَافَةَ الصَّدَقَةِ، وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بِالسَّوِيَّةِ[1]» «ومەڕ ومالاتی لە یەك جودا کۆ ناکرێنەوە، وهی کۆش جودا ناکرێنەوە، وئەوەشی تێکەڵ بو، ئەوە بە یەکسانی لە هاوبەشەکەی خۆی

(١) [يريد أن المصدق إذا أخذ من أحد الخليطين ما وجب أو بعضه من مال أحدهما، فإنه يرجع المخالط الذي أخذ منه الواجب أو بعضه بقدر حصة الذي خالطه من مجموع المالين، مثلا: إذا كان بينهما أربعون شاة -مثلا- لكل واحد منهما عشرون، قد عرف كل منهما عين ماله، فيأخذ المصدق من أحدهما شاة فيرجع المأخوذ من ماله على خليطه بقيمة نصف شاة بقيمة نصف شاة لا بنصف شاة؛ لأنها غير مثلية، وهذه تسمى خلطة الجوار].

وەردەگرێتەوە»[1]. جا تێکەڵ کردن کاریگەری دەبێت لە واجب بونی زەکات ولە سەر خستن، ئەمەش تایبەتە بە ئاژەڵانەوە نەك شتی تر.

ونمونەی کۆ کردنەوەی لە یەك جودا: سیٚ کەس هەر یەکەیان چل سەر مەڕ وبزنی هەبێت، هەموی دەکاتە سەد وبیست، جا ئەگەر بە تەنیا هەژماری بکەیت سیٚ شەکە مەڕی تێدایە، بەڵام هەموی بکەینە یەك، تەنها یەك شەکی تێدایە. جا لێرەدا: لە یەك جیایان کۆ کردۆتەوە بۆ ئەوەی سیٚ سەریان لە سەر فەرز نەبێت، بەڵکو یەك دانە.

ونمونەی جیا کردنەوەی کۆ: کەسێك چل سەر شەکی هەیە، کە ئەزانێت کۆکەرەوەی زەکات هاتوە لێکیان جیا دەکاتەوە وبیستیان لە شوێنێك دادەنێت، وبیستەکەی تریش لە شوێنێکی تر، بۆیە زەکاتی لیٚ نابرێت چونکە ئاوها بە جودایی نەگەیشتۆتە ڕادە.

(١) أخرجه الترمذي (٦٢١) [ولفظه ما أثبته] وغيره وحسنه، وهو جزء من حديث النبي ﷺ في كتاب الصدقة الطويل. وصححه الألباني «الإرواء» (٧٩٢). [أخرج الجزء الأول منه البخاري في (٦٩٥٥) بهذا اللفظ، والجزء الثاني في (١٤٥١) بهذا اللفظ، فكان الأولى الاعتماد عليه].

# دەروازەی پێنجەم

## لە بارەی زەکاتی سەر فترەوە

وای پێ ئەڵێن؛ چونکە بە دەمکردنەوە لە ڕۆژی ڕەمەزان فەرز دەبێت، وپەیوەست نیە بە ماڵەوە، بەڵکو پەیوەستە بە ئەستۆوە، جا زەکاتێکە لە بری دەرون وجەستە دەدرێت.

**چەند پرسێکیشی لە خۆ گرتوە:**

### پرسی یەکەم: لە بارەی حوکی سەر فترە، وبەڵگەکەی:

زەکاتی سەر فترە پێویستە لە سەر هەمو موسڵمانێك، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر ﵄ ئەڵێ: «فَرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ زَكَاةَ الْفِطْرِ [مِنْ رَمَضَانَ]، صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، عَلَى الْعَبْدِ وَالْحُرِّ، وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَى، وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ» «پەیامبەری خوا ﷺ مەنێك خورما یا جۆ، زەکاتی سەر فترەی فەرز کرد لە ڕەمەزان لە سەر کۆیلە وئازاد ونێر ومێ وگچکە وگەورە لە موسڵمانان»[1].

### پرسی دوەم: مەرجەکانی، ولە سەر کێ پێویستە؟

سەر فترە پێویستە لە سەر هەمو موسڵمانێکی گەورە وبچوك ونێر ومێ وئازاد وبەندە، لە بەر فەرمودەکەی ئیبن عومەری پێشو.

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٥٠٣) [هذا هو لفظه]، ومسلم (٩٨٤) [والزيادة له].

باشتریشە «يُسْتَحَبّ» لە بری کۆرپەلە دەر بکرێت ئەگەر فو کرابوە ڕوحی، واتە: چوار مانگ بێت، چونکە پێشینان لە بری دەریان دەکرد[1]، وەك لە عوسمان وجگە لەویشەوە ﷺ چەسپاوە[2].

وپێویستە لە بری خۆی وئەوەی بژێوی «نفقة»ی لە سەریەتی دەری بکات، لە هاوسەر وکەس، هەروەها هی کۆیلەش لە سەر خاوەنەکەی پێویستە، لەبەر فەرمودەی: «لَيْسَ فِي الْعَبْدِ صَدَقَةٌ إِلَّا صَدَقَةُ الْفِطْرِ» «لە کۆیلەدا زەکات نیە مەگەر سەر فترە»[3]. واجبیش نابێ مەگەر لە سەر کەسێك زیاتری هەبێت لە بژێوی خۆی وئەوانەشی خەرجیان لە سەریەتی لەگەڵ پێداویستیە زەرورەکانی لە شەو وڕۆژی جەژندا، ئەوەندەی سەر فترەی پێ بدات.

زەکاتی سەر فترەش پێویست نابێت مەگەر بە دو مەرج:

١- ئیسلامەتی: جا پێویست نابێت لە سەر بێ باوەڕ.

٢- زیاتری هەبێت لە بژێوی خۆی ومنداڵەکانی وپێداویستیە سەرەکیەکانی لە شەو وڕۆژی جەژندا.

---

(١) [أخرج عبد الرزاق (٥٧٨٨) وابن أبي شيبة (١٠٤٦٣، ١٠٨٤١) وغيرهما عن أبي قلابة قال: «كَانُوا يُعْطُونَ صَدَقَةَ الْفِطْرِ، حَتَّى يُعْطُونَ عَنِ الْحَبَلِ». وهو ممن أدرك الصحابة، وروى عنهم، وسنده صحيح].

(٢) [أخرجه ابن أبي شيبة (١٠٨٤٠) وغيره عن حميد [الطويل] عن بكر [بن عبد الله المزني]: «أَنَّ عُثْمَانَ كَانَ يُعْطِي صَدَقَةَ الْفِطْرِ عَنِ الْحَبَلِ».

تنبيه: في نسخة التي اعتمد عليها الشيخ الألباني: حميد بن بكر. ومن فطنته رَحِمَهُ ٱللَّهُ استشكله وحاول توجيهه في «الإرواء» (٨٤١) (٣٣١/٣) ثم ضعفه، لأن حميد لم يدرك عثمان! ولم ينبه على هذا لا صاحب «التكميل» ولا صاحب «التحجيل»، والحمد لله سبحانه وتعالى وهو وحده الموفق].

(٣) أخرجه مسلم (٩٨٢) - ١٠.

## پرسی سێیەم: دانایی چیە لە فەرزکردنی سەر فترەدا؟

لەو حیمکەتانەی لە فەرزێتی زەکاتی سەر فترەدا هەیە، ئەمانەی خوارەوەیە:

١- پاککردنەوەی ڕۆژوان لەو شتانەی لەوانەیە لە ڕۆژوەکەی دا ڕویدا بێت، وەك وتەی پوچ وباتڵ «اللغو» ونەشیاو ونا ئەخلاقی «الرفث».

٢- بێ نیازکردنی هەژاران ونەداران لە داواکردن لە ڕۆژی جەژندا، ودڵخۆشکردنیان، بۆ ئەوەی جەژن ببێتە ڕۆژی خۆشی بۆ سەرجەم چینەکانی کۆمەڵگا، ئەمەش لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عەبباس ﷺ: «فَرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصِّيَامِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ، وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ» «پەیامبەر ﷺ زەکاتی سەر فترەی فەرز کرد بۆ پاککردنەوەی ڕۆژوان لە وتەی بێ کەڵك ونا ئەخلاقی»[1].

٣- هەروەها دەرخستنی شوکرانەبژێری تێدایە بەهۆی تەواوکردنی ڕۆژوی مانگێکی ڕەمەزان وتەراویحەکەی، وکردنی ئەو کارە خێرانەی کە لەو مانگە پیرۆزەدا ئاسان بوە.

## پرسی یەکەم: ئەو ئەندازەیەی پێویستە، هەروەها لە چی دەردەکرێت؟

ئەوەی پێویستە لە زەکاتی سەر فترەدا مەنێکە لەو خواردنەی باوە، لە گەنم، یا جۆ، یا خورما، یا مێوژ، یا کەشك[2]، یا برنج، یا گەنمەشامی، وجگە لەمانەش،

(١) أخرجه أبو داود (١٦٠٩)، وابن ماجه (١٨٢٧)، والحاكم (٤٠٩/١) وصححه، وحسنه النوي في «المجموع»، وحسنه الألباني في «صحيح ابن ماجه» (١٤٩٢).

(٢) الأَقِط: بریتیە لە شیری وشکەوەکراوی ڕەق، لە شیرێك دروست دەکرێت کەرەکەی دەر کرا بێ.

چونکە لە فەرمودە صەحیحەکانی پەیامبەردا ﷺ ئەمە چەسپاوە، وەك لە فەرمودەکەی پێشوی ئیبن عومەر دا رضي الله عنهما هاتبو.

دروستیشە کۆمەڵێك سەر فترەکەیان بدەن بە یەك کەس. هەروەها یەك کەس بیدات بە کۆمەڵە کەسێك.

ودەرکردنی نرخ وبەهای خواردن لە سەرتی ناخات، چونکە ئەمە پێچەوانەی ئەوەیە پەیامبەر ﷺ فەرمانی پێکردوە، هەروەها دژی ئیشی هاوەڵانە، ئەوان مەنێك خواردنیان دەردەکرد، هەروەها سەر فترە پەرستنێکە فەرزکراوە لە جۆرێکی دیاری کراودا کە خواردنە، جا دەرکردنی لە جۆرێکی بە دەر لەوەی دیاری کراوە لە سەرتی ناخات.

## پرسی پێنجەم: لە بارەی کاتی پێویست بونی ودەر کردنی سەر فترەوە:

سەر فترە بە ئاوابونی خۆر لە شەوی جەژندا پێویست دەبێت، چونکە ئیتر سەری فتارە لە ڕەمەزان. دەرکردنیشی دوو کاتی هەیە: کاتی کردن وباشترەکە، وکاتی دروستێتی. کاتە چاکترەکەش: بە دەرچونی سپێدەی ڕۆژی جەژن دەست پێدەکات تا تۆزێك پێش کردنی نوێژی جەژن، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر رضي الله عنهما[(١)]: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ» «پەیامبەر فەرمانی کرد بە دەرکردنی زەکاتی سەر فترە پێش دەرچونی خەڵك بۆ نوێژ». کاتی دروستیش: بە ڕۆژێك یا دو ڕۆژ پێش جەژن دەست پێ دەکات، لەبەر ئەوەی ئیبن عومەر وهاوەڵانی تریش رضي الله عنهم وایان دەکرد.

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٥٠٣) [بمعناه، ولفظه (١٥٠٩)]، ومسلم (٩٨٤).

ناشبێت بخرێتە دوای نوێژی جەژن، ئەگەر دوای خست ئەوە خێرێکە لە خێرەکـان، ولە سەر ئەو دواخستنەش تاوانبارە، چونکە پەیامبەر ﷺ فەرموی: «مَنْ أَدَّاهَا قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَهِيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ، وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ الصَّلَاةِ، فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنَ الصَّدَقَاتِ» «کێ پێش نوێژ ئەدای کرد ئەوا زەکاتەکەی لێ وەرگیراوە، کـێش دوای نوێـژ ئـەدای کرد ئەوا خێرێکە لە خێرەکان»[1].

(١) أخرجه أبو داود (١٦٠٩)، وابن ماجه (١٨٢٧)، عن ابن عباس ﷺ، وحسَّنه الألباني «الإرواء» (٨٤٣).

# دەروازەی پێنجەم

## لە بارەی زەکات پێدراوان «أَهْلُ الزَّكَاة»

چەند پرسێکی تێدایە:

### پرسی یەکەم: زەکات پێدراوان کێن، وبەڵگەکەی:

زەکات پێدراوان بریتین لەوانەی شایستەین، ئەوانیش لەو هەشت جۆرەن، خـوا ﷻ کورتی هەڵهێناوە لە ئایەتی: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ [التوبة: ٦٠] «تەنها زەکاتی فەرز دەدرێـت بـە نـەداران کـە هیچیان نیە، وهەژاران کە بەشیان ناکات، وکۆکەرەوانی زەکـات، ودڵ ڕاگـیر کـراوان بە ئومێدی موسڵمان بونی یا بەهێز بونی ئیمانی یا سود گەیاندنی بە موسڵمانان یـا دورخستنەوەی شـەڕ وخراپـەی لـە موسـڵمانان، هـەروەها بـۆ ئـازادکردنی کۆیلـە، وهەروەها بۆ قەرزاران کە بە هۆی ئاشتەوایی وپێکەوەنانەوە قـەرز هاتۆتـە سـەری، وئەوانەی کەوتونەتە ژێر قەرزەوە بە بـێ دەسـت بـادی وخراپـەکاری، هـەروەها بـۆ تێکۆشەرانی ڕێی دینی خوا، هەروەها بۆ ڕێبوار وموسافیر کـە بـژێوی وپـارەی لـێ بڕاوە، ئەم دابەشکاریە فەرزێکە خوا دایناوە وفەرزی کردوە وئەندازەی کـردوە، هـەر خواش زانایە بە بەرژەوەندی بەندەکانی ودانایە لە کارەکانی».

ڕونکردنەوەی ئەم جۆرانەش بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١- **نەداران «الفقراء»**: کۆی «فقیر»ە، بریتیە لـەوەی ئەوەنـدەی نیـە پێداویسـتی خۆی وخێزانەکەی پێ دابین بکـات لـە خـواردن وخواردنـەوە وکەلوپـەل وخـانو، بـە

ڕادەیەك هیچی نەبێت یا کەمتر لە نیوەی پێویستی خۆی هەبێت، ئەم جۆرە بەشی یەك ساڵی تەواو زەکاتی پێ دەدرێت.

٢- **هەژاران** «**المساكين**»: کۆی «مسكين»ە، بریتیە لەوەی نیوەی پێداویستی خۆی یا زیاتر لە نیوەی هەبێت، وەك یەکێك سەدی هەبێت وپێویستی بە دو سەد بێت، ئەمیش بەشی یەك ساڵی تەواو زەکاتی پێ دەدرێت.

٣- **کۆکەرەوانی زەکات** «**العاملين عليها**»: کۆی «عامل»ە، بریتیە لەوەی کار بە دەست دەینێرێت بۆ کۆکردنەوەی زەکات، حکومەت بەشی ڕۆیشتن وهاتنی پێ دەدات با دەوڵەمەنیش بێت، چونکە ئەم خۆی تەرخان کردوە بۆ ئەم کارە، «عاملين»یش هەمو ئەوانە دەگرێتەوە کە ئیش لە کۆکردنەوە ونوسین وپاسەوانی کردن ودابەشکردنی دەکەن.

٤- **دڵ ڕاگیر کراوان** «**المؤلفة قلوبهم**»: خەڵکانێکن لە زەکات پێیان دەدرێت، بۆ ڕاگیرکردنی دڵیان لە سەر ئیسلام ئەگەر بێباوەڕ بون، وچەسپاندنی ئیمانیان ئەگەر لە باوەڕ لاوازە کەمتەرخەمەکان بون بۆ پەرستنەکان، یا بۆ هاندانی کەسەکانی بێنە نێو ئیسلامەوە، یا لەبەر یارمەتیدانیان بۆ موسڵمانان، یا دورخستنەوەی ئازاریان.

٥- **ئازادکردنی کۆیلە** «**في الرقاب**»: کۆی «رقبة»یە، مەبەست پێی کۆیلە یا کەنیزەکی موسڵمانە بە پارەی زەکات دەکڕدرێت وئازاد دەکرێت، یان موکاتەبێکە زەکاتی پێ دەدرێت تا قیستی ڕێکەوتنەکە تەواو بکات، تا ئازاد ببێت وهەڵسوکەتەکانی جێبەجێ ببێت، وببێتە ئەندامێکی بە سودی کۆمەڵگا، وبتوانێت

پەرستنی خوا بە تەواوەتی بکات، هەروەها دیلی موسُـڵمان بـە پـارەی زەکـات لـە دەست دوژمن ڕزگار دەکرێت.

٦- **قەرزارەکان** «الغارمين»: کۆی «غارم»ە، ئەو کەسەیە قەرزێکی لە سـەرە بـە بێ هۆکاری تاوان، ئیتر بۆ خۆی بو بێت لە شتێکی حەڵاڵدا، یا بۆ غەیرە خـۆی وەك پێکەوەنان وئاشتەوایی، ئەمیش بەشی ئەوەندەی قەرزەکەی پێ بداتەوە زەکـاتی پـێ دەدرێت، هەروەها ئەگەر بۆ پێکەوەنانی خەڵك بێت لە زەکـات پێـی دەدرێـت گـەر داراش بێت.

٧- **لە ڕێی خوادا** «**في سبيل الله**»: مەبەست پێی ئەو تێکۆشـەرە خۆبەخشـانەیە کە موچەیان نیە لە خەزێنەی دەوڵەت «بيت المال»، ئەوا لە زەکات پێیان دەدرێـت، هەژار بو یا دەوڵەمەند.

٨- **ڕێبوار** «ابن السبيل»: کە بریتیە لەو موسافیرەی دەستی لە شاری خۆی بڕاوە وپێویستی بە پارەیە بۆ گەیشتنە شارەکەی خۆی.

## پرسی دوەم: لە بارەی ئەوانەی زەکاتیان بۆ ناشێت:

ئەو جۆرانەی زەکاتیان بۆ ناشێت، ئەمانەن:

١- دەوڵەمەندان وئەوانەی توانای کاسبیان هەبێت: لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «لَا حَظَّ فِيهَا لِغَنِيٍّ وَلَا لِقَوِيٍّ مُكْتَسِبٍ» «دەوڵەمەنـد وتوانـا دار بـە سـەر کەسابەت دا، بەشیان لە زەکاتدا نیە»[1]. بەڵام کۆکەرەوەی زەکـات وقـەرزار ئەگـەر داراش بن پێیان دەدرێت وەك باس کرا، هەروەها ئەوەی توانـای کەسـابەتی هـەبێت

(١) أخرجه أحمد (٣٦٢/٥) وأبو داود (١٦٣٣) والنسائي (٩٩/٥)، وصححه الألباني «صحيح النسائي» (٢٤٣٥).

بەڵام خۆی تەرخان کردبێت بۆ زانستی شەرعی ونەدار بێت لە زەکات پێی دەدرێت، چونکە فێرخوازی تێکۆشانە لە پێناو خوا، بەڵام ئەگەر توانای کەسابەتی هەبو ونەیدەکرد بە هۆی خۆ تەرخان کردن بۆ عیبادەتە سوننەتەکان ئەوا زەکاتی پێ نادرێت، چونکە عیبادەت سودەکەی تەنها بۆ خودی خوا پەرستەکەیە بە پێچەوانەی زانستەوە.

٢- بنەچە ولق[١] وهاوسەر «الأصول والفروع والزوجة» ئەوانەی بژێویان لە سەرت پێویستە، جا دروست نیە زەکات بدرێت بەوانەی واجبە لە سەر موسڵمان نەقەیان بکێشێت وەك باوکان ودایکان وباپیران وداپیران، ومنداڵەکان ومنداڵی منداڵەکان، چونکە زەکاتدان بەمانە جێی نەفەقە واجبەکە دەگرێتەوە ولە سەریانی دەخات، ئاوهاش بێت سودی زەکات بۆ خۆی دەگەڕێتەوە.

٣- بێ باوەڕان جگە لە دڵ ڕاگیر کراوان: جا دروست نیە زەکات بدرێت بە بێ باوەڕان، لەبەر فەرمودەی: «زەکات لە داراکانیان وەردەگیرێ ودەدرێ بە هەژارەکانیان». یانی: دەوڵەمەند وهەژاری موسڵمانان نەك جگە لەوان. هەروەها لە مەبەستەکانی زەکات بێ پێویستکردنی هەژاری موسڵمانان وپتەوکردنی کۆڵەکەی خۆشەویستی وبرایەتیە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگادا، ئەمەش لەگەڵ بێ باوەڕدا دروست نیە.

٤- بنەماڵەی پەیامبەر ﷺ: زەکات بۆ خانەوادەی پەیامبەر ﷺ دروست نیە، وەکو ڕێزداریەك بۆیان ئەمەش لەبەر شەرەفمەندیان، چونکە پەیامبەر ﷺ فەرموی:

---

(١) أصول: بریتیە لە باوك وباوکی وبەرەو سەرەوە، فروعیش: بریتیە لە منداڵ ومنداڵی منداڵ [وبەرەو خوارەوە]. وەرگێڕ.

«إِنَّ هَـذِهِ الصَّـدَقَاتِ إِنَّمَـا هِـيَ أَوْسَـاخُ النَّـاسِ، وَإِنَّهَـا لَا تَحِـلُّ لِمُحَمَّـدٍ وَلَا لِآلِ مُحَمَّدٍ» «ئەم زەکاتانە چلکی خەڵکە، وحەڵاڵ نیە نە بۆ موحەممەد ونە بۆ بنەماڵـەی موحەممەد»[1]. وبنەماڵەی پەیامبەریش ﷺ وتراوە: خانـەوادەی هاشـم وخانـەوادەی موتتەلیبن، وتراویشە: تەنها خانەوادەی هاشمن، ئەمەش ڕاسـتە، کـەوابێت دروسـتە زەکات بدرێتە خانەوادەی موتتەلیب، چونکە لە بنەماڵەی پەیامبەر نـین، هـەروەها ئەچنە ژێر گشتێتی ئەم ئایەتەوە: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ﴾ [التوبة: ٦٠].

٥- هەروەها دروست نیە زەکات بدرێتە مەولاکانی بنەماڵەی پەیامبـەریش ﷺ، لەبەر فەرمودەی: «إِنَّ الصَّدَقَةَ لَا تَحِلُّ لَنَا، وَإِنَّ مَوَالِيَ الْقَوْمِ مِنْ أَنْفُسِهِمْ» «زەکـات بۆ ئێمە حەڵاڵ نیە، ومەولای هەر خێڵێك لە خۆیانن»[2]. ومەولای هەر خێڵێکـیش: بریتین لەوانەی ئازادیان کردون، و«لە خۆیانن»یش واتە: حوکمیان وەك حوکمی ئـەوان وایە، جا زەکات قەدەغەیە لە سەر ئازادکراوانی خانەوادەی هاشم.

٦- کۆیلە: زەکات نادرێت بە کۆیلە" ماڵەکەش هی خاوەنەکەیـەتی، جـا ئەگـەر پێی بدرێت دەڕوات بۆ خاوەنەکەی، هەروەها بژێوی لە سـەر خاوەنەکەیـەتی. بـەڵام کۆیلەی موکاتەب لەمە هەڵاوێر دەکرێت، دروستە لە ماڵی زەکات پێـی بـدرێت تـا قەرزە نوسراوەکەی پێ دەداتەوە، هەروەها کۆکەرەوەی زەکات ئەگـەر کۆیلـە بـو پێـی دەدرێ چونکە وەك کرێکار وایە، کۆیلەش بە ئیزنی خاوەنەکەی دروستە بە کرێ بگیرێ.

جا هەر کەس زەکاتیدا بەم کۆمەڵانە وبشزانێت دروست نیە، ئەوا تاوانبارە.

---

(١) أخرجه مسلم (١٠٧٢) [هذا لفظه، واللفظ المذكور في الأصل لم أجده في مسلم].

(٢) أخرجه أبو داود (١٦٥٠)، والترمذي (٦٥٢) -واللفظ له- والحاكم (٤٠٤/١). قال الترمذي: «حسن صحيح». وصححه الحاكم وافقه الذهبي، وصححه الألباني في «صحيح الترمذي» (٥٣٠).

## پرسی سێیەم: ئایا مەرجە لە دابەش کردندا بدرێت بە هەر هەشت جۆرەکە؟

لە سەر ڕای ڕاست مەرج نیە لە کاتی دابەشکردنی زەکاتدا بە هەر هەشت جۆرەکە بدرێت، بەڵکو لە سەرت دەکەوێت بە هەر کام لە هەشت کۆمەڵەکە بدرێت، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: ﴿إِنْ تُبْدُوا الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِنْ تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ [البقرة: ٢٧١] «ئەگەر بەخشین وخێرەکانتان دەربخەن وبە ئاشکرا بیکەن ئەوە صەدەقەیەکی زۆر باشتان کردوە، ئەگەریش بیشارنەوە وبیبەخشن بە هەژاران ئەوا باشترە بۆتان، چونکە لە ڕیاوە دورترە».

هەروەها [باس کرا] پەیامبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ: «زەکات لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێت ودەدرێت بە هەژارەکانیان». هەروەها ئەفەرموێ ﷺ: «أَقِمْ حَتَّى تَأْتِيَنَا الصَّدَقَةُ، فَنَأْمُرَ لَكَ بِهَا» «لامان بمێنەوە تا صەدەقەمان بۆ دێت، ئەوسا فەرمان دەکەین بەشت بدرێ» أخرجه مسلم (١٠٤٤). جا ئەم بەڵگانە بەڵگەن لە سەر ئەوەی مەبەست لە فەرمایشتی: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ﴾ الآية [التوبة: ٦٠]، ڕونکردنەوەی ئەوانەیە شایستەی زەکاتن، نەك گشتاندنی بە سەر ئەم شایستانەدا لە کاتی دابەشکردندا.

## پرسی چوارەم: لە بارەی گواستنەوەی زەکات لە شارێکەوە بۆ ئەوی تر:

دروستە زەکات لە شارێکەوە بگوازرێتەوە بۆ شارێکی تری نزیك یا دور لەبەر پێویستی، وەك ئەوەی شارە دورەکە هەژارترن، یا خاوەن زەکاتەکە کۆمەڵێك خزمی هەژاری هەبێت لە شارێکی دورتر وەك هەژارەکانی شارەکەی خۆی، ئەو کاتە بیدات بە خزمەکانی بەرژەوەندی بە دی دێت کە هەم زەکاتە وهەم گەیاندنی خزمایەتی. ئەمەش وتەی ڕاستە لەبەر گشتێتی ئایەتی: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ﴾ [التوبة:٦٠] یانی: هەژار ونەدار لە هەمو شوێنێك.

# چوارەم: بەشی ڕۆژو

لە پێنج دەروازە پێك هاتوە:

دەروازەی یەکەم: لە بارەی پێشەکیەکانی ڕۆژوەوە.

دەروازەی دوەم: ئەو عوزرانەی ڕۆژنەگرتن حەڵاڵ دەکەن، هەروەها بەتاڵ کەرەوەکانی ڕۆژو.

دەروازەی سێیەم: سوننەت ومەکرِوهەکانی ڕۆژو.

دەروازەی چوارەم: لە بارەی قەزا کردنەوە وڕۆژوی سوننەت، هەروەها چی مەکرِوه وچی حەرامە بۆ ڕۆژوان.

دەروازەی پێنجەم: لە بارەی ئیعتیکاف کردنەوە.

# دەروازەی یەکەم

# لە بارەی پێشەکیەکانی ڕۆژووەوە

**چەند پرسێکی تێدایە:**

**پرسی یەکەم: پێناسەی ڕۆژو، ورونکردنەوەی پایەکانی:**

**١- پێناسەکەی:**

«الصيام» لە زماندا: بریتیە لە خۆگرتنەوە لە شت. لە شەرعیشدا: بریتیە لە خۆگرتنەوە لە خواردن وخواردنەوە، وسەرجەم ئەوانەی ڕۆژو بەتاڵ دەکەنەوە، بە نیەتەوە، لە دەرچونی سپێدە ڕاستەکەوە تا ئاوابونی خۆر لە خۆرئاواوە.

**٢- پایەکانی:**

لە میانەی پێناسەکردنی ڕۆژو لە ڕوی شەرعەوە ڕونەوە بو کە دو پایەی سەرەکی هەیە:

**یەکەم:** خۆگرتنەوە لە شکێنەرەکان لە دەرچونی سپێدەوە تا ئاوابونی خۆر. بەڵگەی ئەم پایەیەش فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ کە ئەفەرموێ: ﴿فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ﴾ [البقرة: ١٨٧] «جا ئێستا جوتبن لەگەڵیاندا وئەوە بخوازن کە خوا بۆی تەقدیر کردون کە منداڵە، وبخۆن وبخۆنەوە تا سپیایی بەیانیان ورەشایی شەوتان لا ڕون دەبێتەوە کە ئەمە بە دەرکەوتنی سپێدەی ڕاست دەبێت، پاشان دەست بکەن بە ڕۆژو گرتن بە دورکەوتنەوە لە بەتاڵکەرەوەکان تا شەو دێت کە ئاوابونی خۆرە». مەبەستیش لە هێڵی سپی ورەش: سپیایی ڕۆژ ورەشایی شەوە.

دووەم: نیەت، كە ڕۆژوگر بەم خۆرگرتنەوەیە لە بەتاڵكەرەوەكان، مەبەستی پەرستشی خوا ﷻ بێت، جا ئەو كردەوانەی مەبەست لێیان پەرستنە بە نیەت جیا دەبنەوە لە كردەوەكانی تر، هەر بە نیەت پەرستنەكان هەندێكی لە هەندێكی تری جیا دەبێتەوە، جا ڕۆژوگر بەم ڕۆژوە: ئەكرێ مەبەستی گرتنی ڕۆژوی ڕەمەزان بێت، ئەشكرێ مەبەستی جۆرێكی تر بێت لە جۆرەكانی ڕۆژو.

بەڵگەی ئەم پایەیەش فەرمایشەكەی [پێشتری] پەیامبەرە ﷺ: «كار وكردەوەكان بە نیەتە، وبۆ هەر بەندەیەك هەیە لە پاداشت وسزا بە گوێرەی نیەتی».

## پرسی دووەم: حوكمی ڕۆژوی ڕەمەزان، وبەڵگەكەی:

خوا ﷻ ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانی فەرز كردوە، وكردویەتیە یەكێك لە پێنج پایەكەی ئیسلام، ئەمەش لەو فەرمایشتەیدا ﷻ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ [البقرة: ١٨٣]. «ئەی ئەوانەی باوەڕتان بە خوا وپەیامبەر هەیە وئیش بە شەرعەكەی دەكەن، خوا ڕۆژوی لە سەر فەرز كردون وەك چۆن لە سەر گەلانی پێش ئێوەی فەرز كردوە، بەشكو پارێز بكەن؛ پارێزێك بخەنە نێوان خۆتان وتاوانەكان»، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ [البقرة:١٨٥] «مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە كە خوا قورئانی تێدا دابەزاندوە لە شەوی قەدردا، بۆ ڕێنماییكردنی خەڵكی بۆ هەق، ڕونترین بەڵگەكانی تێدایە لە سەر ڕێنمایی خوا وجیاكاری هەق وپوچ، جا كێ لە ئێوە گەیشتە ئەو مانگە وتەندروست ونیشتەجێ بو، ئەوا با ڕۆژەكەی بە ڕۆژو بێت». هەروەها لەبەر فەرمودەكەی [پێشتری] ئیبن عومەر ﷺ: «ئیسلام لە سەر

پێنج شت بونیاد نراوە: شایەتومان، شاهێدی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك بە هەق نیە مەگەر خوا، وموحەممەد بەندە وپەیامبەری خوایە، وئەنجامدانی نوێژ، وزەکاتدان، وحەجی ماڵی خوا، وڕۆژوی ڕەمەزان». هەروەها لەبەر فەرمودەکەی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا کە دەشتەکیەکی قژ گڤن وتێك چو دێتە خزمەتی پەیامبەری خوا ﷺ وئەڵێ: «[...] أَخْبِرْنِي مَا فَرَضَ اللهُ عَلَيَّ مِنَ الصِّيَامِ؟ فَقَالَ: شَهْرَ رَمَضَانَ، [فَقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ فَقَالَ: لَا] إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ شَيْئًا» «هەواڵم پێبدە لەبارەی ڕۆژوەوە خوا چی لە سەرم فەرز کردوە؟ فەرموی: مانگی ڕەمەزان، وتی: جگە لەوە؟ فەرموی: نیە، مەگەر خۆت سوننەت بکەیت»[1].

هەروەها ئوممەت کۆکن لە سەر فەرزێتی ڕۆژوی ڕەمەزان، وکە یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام کە لە دیندا بەڵگە نەویستە «معلوم بالضرورة»، وکە نکوڵی لێکەرەکەی بێ باوەڕە ولە دینی ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە.

بەمەش سەلما کە ڕۆژو فەرزە بە قورئان وسوننەت وکۆ دەنگی ونکوڵی لێکەرەکەی بێ باوەڕە.

## پرسی سێیەم: بەشەکانی ڕۆژو:

ڕۆژو دو بەشە: واجب، وسوننەت.

واجبیش ئەبێتە سێ بەشەوە:

١. ڕۆژوی ڕەمەزان.

(١) أخرجه البخاري (٤٦)، ومسلم (١١) [والزيادة له، واللفظ للبخاري (١٨٩١) فَلَفَّقُوا بين الروايتين].

٢. ڕۆژوی کەفارەتەکان.

٣. ڕۆژوی نەزر.

لێرەشدا تەنها باسی ڕۆژوی ڕەمەزان وڕۆژوی سوننەت دەکرێت، سەبارەت بە بەشەکانی تر ئەوا لە شوێنی خۆیدا دێت -بە ویستی خوا-.

## پرسی چوارەم: فەزڵی مانگی ڕەمەزان، وحیکمەت شەرعی بونی:

**١. فەزڵەکەی:** لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ هاتوە، پەیامبەری ﷺ فەرمویەتی: «مَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ» «هەر کەس شەوی قەدر شەو نوێژ بکات بە باوەڕبون وچاوەڕێی پاداشتەوە، ئەوا خوا لە تاوانەکانی پێشوی خۆش دەبێت، وهەر کەس ڕۆژوی ڕەمەزان بە بڕوابون وچاوەڕێی پاداشتەوە بگرێت، ئەوا خوا لە تاوانەکانی پێشوی خۆش دەبێت»[1]. هەر لەوەوە ﷺ هاتوە، [وەك ڕابورد] پەیامبەر ﷺ فەرمویەتی: «پێنج فەرزەکە، وهەینی بۆ هەینی، وڕەمەزان بۆ ڕەمەزان، سڕێنەرەوەی تاوانەکانی ئەو نێوەندەن ئەگەر لە تاوانە گەورەکان دور بێ».

ئەمە هەندێکە لە فەزڵەکانی ڕۆژوی ڕەمەزان کە هاتوە، وفەزڵەکانی تریش زۆرن.

**٢. دانایی لە شەرعیەت بونی ڕۆژوگرتنی:** خوا ﷻ ڕۆژی شەرع کردوە لەبەر زۆر حیکمەت وفرە سود، لەوانە:

---

(١) أخرجه البخاري (١٩٠١)، ومسلم (٧٦٠).

أ. پاکژ وتەمیزکردنەوە وخاوێنکردنەوەی دەرون لە شتە خراپ ورەوشتە نزمەکان، چونکە ڕۆژو ڕێڕەوی شەیتان لە جەستەی مرۆڤ تەسك دەکاتەوە.

ب. لە ڕۆژودا دونیا نەویستی وشەهوەت نەویستی تێدایە لەگەڵ هاندان بۆ دوارۆژ ونیعمەتەکانی.

ت. ڕۆژوگرتن ئەبێتە مایەی بەزەیی هاتنەوە بە هەژاران، وهەستکردن بە ئازاریان، چونکە ڕۆژوگر خۆی ئازاری تینویەتی وبرسیەتی دەچەژێت.

تا کۆتایی ئەو حیکمەتە گەورە وسودە زۆرانە.

## پرسی پێنجەم: مەرجەکانی فەرزبونی ڕۆژوی ڕەمەزان:

ڕۆژوی ڕەمەزان فەرزە لە سەر کەسێك ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدا بێت:

١. **ئیسلامەتی:** جا نە واجبە، نە دروست ئەبێت بێ باوەڕ ڕۆژو بگرێت، چونکە ڕۆژو پەرستنە، پەرستنیش لە بێباوەڕەوە دروست نابێت، کە موسڵمانیش بو لە سەری نییە قەزای لە دەست چوەکان بکاتەوە.

٢. **پێگەیشتن** «البلوغ»: جا ڕۆژو واجب نیە لە سەر کەسێك نەگەیشتبێتە تەمەنی داوا لێکردن «التكليف»، لەبەر فەرمودەکەی [پێشتر] پەیامبەر ﷺ: «قەڵەم هەڵگیراوە لە سەر سیان» لەوانە: «ولە سەر منداڵ تا باڵغ ئەبێت». بەڵام ئەگەر پێ نەگەیشتو ڕۆژوی گرت، دروست ئەبێت ئەگەر لە تەمەنی جیاکاری بێت، وئەبێت کار بە دەست «ولي أمر»ی منداڵ فەرمانی ڕۆژوی پێ بکات، تا ڕا وهۆگر بێت لە سەری.

٣. **ژیری:** جا ڕۆژو واجب نیە لە سەر شێت وکەم عەقڵ، لەبەر فەرمودەکەی [پێشو]: «قەڵەم هەڵگیراوە لە سەر سیان» لەوانە: «شێت تا عەقڵ ئەگرێت».

٤. **توانابون:** جا هەر کەس نەیتوانی لەبەر گەورەیی یا جگە لەوە یا نەخۆش بو توانای ڕۆژی نەبو، فەرز نیە لە سەری، ئەگەریش گرتی دروست ئەبێت، لەبەر ئایەتی: ﴿وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ [البقرة: ١٨٥] «وڕێگەدراوە بە نەخۆش وڕێبوار بە ڕۆژو نەبن، بەڵام دوا جار ئەو ڕۆژانە قەزا دەکەنەوە». کە نەخۆشیەکە نەما ئەوا فەرزە لە سەری قەزای ئەو ڕۆژانە بکاتەوە.

٥. **نیشتەجێیی:** جا ڕۆژو واجب نیە لە سەر ڕێبوار، لەبەر ئایەتی [پێشو]: ﴿وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ الآية [البقرة: ١٨٥]، بەڵام ئەگەر ڕۆژوی گرت دروست ئەبێت. واجبیشە لە سەری ئەوە قەزا بکاتەوە کە لە سەفەر نەیگرتوە.

٦. **لە سوڕی مانگانە وزەیستانی نەبون:** ئافرەتێك وابێت لە سەری فەرز نیە بیگرێت، بەڵکو حەرامە لە سەری، لەبەر فەرمودەکەی [پێشوتری] پەیامبەر ﷺ: «ئەوە نیە کە دەکەوێتەوە عادەوە نە نوێژ دەکات نە ڕۆژو دەگرێت؟ وتیان: بەڵێ، فەرموی: جا ئەوە کورتیە لە دیندا». وپێویستە لە سەریان قەزای بکەنەوە، لەبەر وتەکەی عائیشە ﵂: «كَانَ يُصِيبُنَا ذَلِكَ، فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ، وَلَا نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلَاةِ» «توشی ئەمە دەهاتین، فەرمانمان پێ دەکرا بە قەزاکردنەوەی ڕۆژو، بەڵام فەرمانمان پێ نەدەکرا بە قەزاکردنەوەی نوێژ»[1].

---

(١) أخرجه مسلم (٣٣٥).

## پرسی شەشەم: سەلماندنی هاتنی مانگی ڕەمەزان وتەوابونی:

هاتنی ڕەمەزان دەسەلمێت بە بینینی مانگ، ئیتر خۆی ببینێت یان بە گەواهیدانی جگە لە خۆی کە بینیویەتی، یا هەواڵدانی لەم بارەوە، جا کە موسڵمانێکی دادگەر شایەتیدا مانگی ڕەمەزانی بینیوە، بەو شایەتیدانە هاتنی مانگی ڕەمەزان دەسەلمێت، لەبەر فەرمایشتی: ﴿فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ [البقرة:١٨٥]. هەروەها لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «إِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَصُومُوا» «کە بینیتان بە ڕۆژو بن»[١]، ولەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر رضي الله عنهما: «أَخْبَرْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَنِّي رَأَيْتُهُ، فَصَامَ وَأَمَرَ النَّاسَ بِصِيَامِهِ» «هەواڵم دا بە پەیامبەری خوا کە من مانگم بینا، ئەوەبو ڕۆژوی گرت وفەرمانی کرد بە خەڵك ڕۆژو بگرن»[٢]. جا ئەگەر مانگ نەبینرا، یا موسڵمانێکی دادگەر شایەتی نەدا کە بینیویەتی، ئەوا پێویستە سی ڕۆژەکەی شەعبان تەواو بکەن.

هاتنی ڕەمەزان بە جگە لەم دوانە ناسەلمێت؛ یا بینینی مانگ یا تەواوکردنی هەر سی ڕۆژەکەی شەعبان، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ، وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ غُبِيَ[٣] عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا عِدَّةَ شَعْبَانَ ثَلَاثِينَ» «ڕۆژو بگرن بە هۆی بینینی مانگی ڕەمەزانەوە، وبیشکێنن بە هۆی بینینی مانگی شەوالەوە، جا ئەگەر داپۆشرا ووشاراوە بو ئەوا هەر سی ڕۆژەکەی شەعبان تەواو بکەن»[٤].

---

(١) أخرجه البخاري (١٩٠٠)، ومسلم (١٠٨٠) - ٨.

(٢) أخرجه أبو داود (٢٣٤٢)، والحاكم في المستدرك (٤٢٣/١) وصححه [واللفظ المثبت لأبي داود].

(٣) وفي بعض الروايات: «غُمِّي»، وبعضها: «غُمَّ»، والمعنى: غطي وخفي ولم يظهر.

(٤) أخرجه البخاري (١٩٠٩)، ومسلم (١٠٨١).

وتەواوبونی ڕەمەزانیش دەسەلمێت: بە بینینی مانگی شەوال، ئەمەش بە شـایەتی دانی دو موسڵمانی دادگەر، ئەگەرنا واجبە هەر سی ڕۆژەکەی ڕەمەزان تەواو بکەن.

## پرسی حەوتەم: کاتی نیەت لە ڕۆژودا وحوکمەکەی:

پێویستە لە سەر ڕۆژوان نیەتی ڕۆژویان هەبێت، کە پایەیەکـە لـە پایـەکانی وەك ڕابورد، لەبەر فەرمایشتی [پێشوتری] پەیامبەر ﷺ: «کردەوەکان بە نیەتە وبۆ هــەر کەس هەیە بە گوێرەی نیەتەکەی». هەر بە شەویش ئەبێت نیەت بهێنێت بـۆ ڕۆژوی پێویست، وەك ڕۆژوی ڕمەزان وکەفارەت وقەزاکردنەوە ونەزرکردن، با پێش سپێدەش بێت بە یەك خولەك، لەبەر فەرمایشتی پەیامبــەر ﷺ: «مَنْ لَمْ يُبَيِّتِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ فَلَا صِيَامَ لَهُ» «کێ هەر بە شەو پێش سـپێدە نیـەتی ڕۆژوی فـەرزی نـەبێت ئەوا ڕۆژوی بۆ نیە»[1]. جـا هــەر کـەس نیـەتی ڕۆژوی هـەبێت لـە ڕۆژدا، وهیچـی نەخواردبێت، ناکەوێت لە سەری مەگەر بۆ ڕۆژوی سـوننەت، ئەمــە بــە نیــەتی ڕۆژ دروستە ئەگەر هیچ شتێکی نـەکردبو [لـە تـاڵ کـەرەوەکان]، لەبــەر فەرمودەکـەی عائیشە رضي الله عنها: «دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟ فَقُلْنَا: لَا، قَالَ: فَإِنِّي إِذَنْ صَائِمٌ» «پەیامبەر ﷺ ڕۆژێك هات بۆ لام، فـەرموی: ئایـا هیچـتان لایە بۆ خواردن؟ وتمان: نەخێر، فەرموی: کەواتــە مــن بــە ڕۆژوم»[2]. سـەبارەت بـە ڕۆژوی واجب ئەوا دانامەزرێت بە نیەتی ڕۆژ، وئەبێت شەو نیەتی هەبێت.

ویەك نیەت بەسـە لـە سـەرەتای ڕەمەزانـەوە بـۆ سـەرجەم مانگەکـە، وباشـترە «یستحب» هەمو ڕۆژێك تازە بکرێتەوە.

---

(١) أخرجه الترمذي (٧٣٣)، والنسائي (١٩٦/٤) واللفظ له، وابن ماجه (١٧٠٠)، وصححه الألباني.
(٢) أخرجه مسلم (١١٥٤) - ١٧٠.

# دەروازەی دووەم

# لە بارەی ئەو عوزرانەی ڕۆژو نەگرتن حەڵاڵ دەکەن، هەروەها پوچەڵکەرەوەکانی ڕۆژو

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: ئەو بیانوانەی بە هۆیەوە دروستە بە ڕۆژو نەبیت:

لە ڕەمەزاندا دروستە ڕۆژو نەگیرێت لەبەر ئەم عوزرانەی خوارەوە:

**یەکەم: نەخۆشی وبە تەمەنی:** جا دروستە نەخۆش ڕۆژو نەگرێت، نەخۆشیەك قورس بێت لەگەڵیدا ڕۆژو بگرێت، کە چاك بویەوە پێویستە لە سەری ئەو ڕۆژانە قەزا بکاتەوە کە نەیگرتوە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿أَيَّامًا مَعْدُودَاتٍ فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ [البقرة:١٨٤]، «خوا ڕۆژوگرتنی چەند ڕۆژێکی دیاری کراوی لە سەر فەرز کردون کە ڕۆژانی مانگی ڕەمەزانە، جا کامتان نەخۆش بو قورس بو لە سەری یا لەسەفەر بو ئەوا بۆی هەیە نەیگرێت، بەڵام لە سەریەتی بە ژمارەی ئەو ڕۆژانە قەزا بکاتەوە لە ڕۆژانی داهاتودا». لەبەر ﴿فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ [البقرة:١٨٥].

ئەو نەخۆشیەشی هێڵراوە بە هۆیەوە ڕۆژو نەگیرێت؛ ئەوەیە قورس بێت لە سەر نەخۆش ڕۆژو بگرێت. بەڵام نەخۆشێك کە ئومێدی چاك بونەوەی ناکرێت، یا نەتوانێت ڕۆژو بگرێت نەتوانینێکی بەردەوام وەك بە تەمەن، ئەوا بۆی هەیە ڕۆژو نەگرێت، وپێویست نیە لە سەری قەزای بکاتەوە، تەنها فیدیەی لە سەرە بەوەی بۆ

هەر یەك ڕۆژ نانی هەژارێك بدات، چونكە خوا ﷻ خواردندانی كردە هاوتای ڕۆژوگرتن ئەو كاتەی سەر پشك بون هەبو لە نێوانیاندا لە سەرەتای فەرزبونی ڕۆژودا، كەواتە ئەبێت جێی بگرێتەوە لەكاتی عوزردا.

پێشەوا بوخاری ﷺ ئەڵێ: «وَأَمَّا الشَّيْخُ الْكَبِيرُ إِذَا لَمْ يُطِقِ الصِّيَامَ فَقَدْ أَطْعَمَ أَنَسٌ بَعْدَمَا كَبِرَ عَامًا أَوْ عَامَيْنِ كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِينًا خُبْزًا وَلَحْمًا وَأَفْطَرَ... قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَيْسَتْ بِمَنْسُوخَةٍ، هُوَ الشَّيْخُ الْكَبِيرُ، وَالْمَرْأَةُ الْكَبِيرَةُ، لا يَسْتَطِيعَانِ أَنْ يَصُومَا، فَلْيُطْعِمَانِ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا» «سەبارەت بە پیاوی بە تەمەن ئەگەر نەیتوانی ڕۆژو بگرێت؛ ئەوا ئەنەس ﷺ كە چوە تەمەنەوە ساڵێك یا دو ساڵ، بۆ هەر ڕۆژێك نانی هەژارێكی بەخشیوە... وئیبن عەبباس ﷺ لە بارەی ژن وپیاوی بە تەمەن كە ناتوانن ڕۆژو بگرن وتی: با بۆ هەر ڕۆژێك نانی هەژارێك بدات»[1].

جا ئەگەر توانای ڕۆژوی نەبو، نەتوانینێك ئومێدی باشبونەوەی ناكرێت، بە هۆی نەخۆشی یا پیریەوە، ئەوا بۆ هەر یەك ڕۆژ نانی هەژارێك دەدات بە نیو مەن گەنم یا جۆ یا برزنج وهاوشێوەكانی لە خواردنی شارەكە، ئەندازەی مەنێكیش نزیكەی دو كیلۆ وڕوبعێكە «٢,٢٥» گرام، كەواتە خواردندان بۆ هەر ڕۆژێك: نزیكەی كیلۆیەك وسەد وبیست وپێنج گرامە «١,١٢٥» گرام.

ئەگەریش نەخۆش ڕۆژوی گرت، ڕۆژوەكەی دروستە ولە سەری دەكەوێت.

**دوەم: سەفەركردن:** حەڵاڵە ڕێبوار لە ڕەمەزان دا ڕۆژو نەگرێت، بەڵام پێویستە لە سەری قەزای بكاتەوە، لەبەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ

(١) صحيح البخاري (٤٥٠٥).

عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ [البقرة:١٨٤]. هــەروەها ئەفــەرموێ: ﴿فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ [البقرة:١٨٥]، هەروەها پرسیاریان لــە پەیامبــەر ﷺ کــرد لــە بــارەی ڕۆژو گــرتن لــە ســەفەردا، فەرموی: «إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وإِن شِئتَ فَأَفْطِرْ» «ویستت ڕۆژو بگرە، ویستیشــت لــێ نەبو مەیگرە»[1]. ولە مانگی ڕەمەزاندا پەیامبەر ﷺ بــە زوبــانی ڕۆژوەوە چــو بــۆ مەککە، کە گەیشتە «کەدید» شکاندی، خەڵکیش شکاندیان[2].

هەروەها حەڵاڵە ڕۆژو نەگیرێت لە هەر ســەفەرێکی درێــژدا کــە دروســتە نوێــژی تێــدا کورت بکرێتەوە[3]، کە ئەندازەکەی دەگاتە چل وهەشت میل، واتە: نزیك هەشتا کلم.

ئەو سەفەرەشی حەڵاڵە ڕۆژوی تێدا نەگیرێت لــە ڕەمەزانــدا بریتیــە لــە ســەفەری حەڵاڵ، جا ئەگەر سەفەری تاوان یا حیلە بو بۆ ڕۆژو شکاندن، ئــەوا حــەڵاڵ نیــە بــە هۆیەوە نەیگرێ.

ئەگەر ڕێبوار ڕۆژو بگرێت ئەوا ڕۆژوەکەی دروست ئەبێت ولــە ســەری ئەکــەوێت، لەبەر فەرمودەکەی ئەنەس ﷺ: «كُنَّا نُسَافِرُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ، وَلَا الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ» «ئێمە لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ سەفەرمان دەکرد، جا ڕۆژوگرەکان ڕۆژو نــەگرەکانیان عــەیب دار نــە دەکــرد، وڕۆژو نــەگرەکانیش ڕۆژو گرەکانیان عەیب دار نە دەکرد»[4]. بەڵام بەو مەرجەی ڕۆژوگرتن لە سەفەردا قــورس نەبێت لە سەری، جا ئەگەر قورس بو لە سەری یان زیانی بــۆی هــەبو ئــەوا بــۆ ئــەو

(١) صحيح البخاري (١٩٤٣).
(٢) أخرجه البخاري (١٩٤٤).
(٣) انظر: «المغني» (٣/٣٤).
(٤) أخرجه البخاري (١٩٤٧).

نەگرتنی باشترە، ئەمەش وەکو وەرگرتنی ڕوخسەتەکە، چونکە پەیامبەر ﷺ لە سەفەردا پیاوێکی بینی بە ڕۆژو بو لە گەرمیدا سێبەریان بۆ کردبو، وخەڵکیش لێی کۆبوبونەوە، ئەویش فەرموی: «لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ» «لە چاکە نیە ڕۆژوگرتن لە سەفەردا»[1].

**سێیەم: سوڕی مانگانە وزەیستانی:** جا ئەو ئافرەتەی عادە یا زەیستانی بۆ دێت پێویستە لە ڕەمەزاندا بە ڕۆژو نەبێت، وحەرامە ڕۆژو بگرێت، ئەگەریش بیگرێت، دروست نابێت، لەبەر فەرمودەکەی [پێشوتری] ئەبو سەعیدی خودری رضي الله عنه پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «ئەوە نیە کە دەکەوێتەوە عادەوە نە نوێژ دەکات نە ڕۆژو دەگرێت؟ وتیان: بەڵێ، فەرموی: جا ئەوە کورتیە لە دیندا». هەروەها پێویستە لە سەریان قەزای بکەنەوە، لەبەر وتەکەی [پێشوتری] عائیشە رضي الله عنها «ئێمە توشی ئەمە دەهاتین، جا فەرمانمان پێ دەکرا بە قەزاکردنەوەی ڕۆژو، بەڵام فەرمانمان پێ نەدەکرا بە قەزاکردنەوەی نوێژ».

**چوارەم: دو گیانی وشیردان:** جا ئافرەت ئەگەر دو گیان یا شیردەر بێت، وبە هۆی ڕۆژوەوە ترسا لە خۆی یا لە منداڵەکەی ئەوا دروستە بۆی نەیگرێت، لەبەر فەرمودەکەی ئەنەس رضي الله عنه، پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ وَضَعَ لِلْمُسَافِرِ الصَّوْمَ وَشَطْرَ الصَّلاَةِ، وَعَنِ الْحُبْلَى وَالْمُرْضِعِ» «خوا ﷻ لە سەر موسافیر ڕۆژو ونیوەی نوێژی لاداوە، هەروەها لە سەر دوگیان وشیردەر»[2]. ودو گیان

(١) أخرجه البخاري (١٩٤٦).

(٢) أخرجه الترمذي (٧١٥) وحسنه، والنسائي (١٠٣/٢)، وابن ماجه (١٦٦٧)، وحسَّنه الألباني «صحيح سنن النسائي» (٢١٤٥).

وشیردەر لە بری ئەو ڕۆژانەی نەیگرتوە قەزای دەکاتەوە ئەمە ئەگەر ترسیان لە خۆیان هەبو، خۆ ئەگەر لەگەڵ ئەمەدا دو گیان ترسی کۆرپەلەکەشی هەبو، وشیردەر ترسی لە منداڵەکەی هەبو، ئەوا لەگەڵ قەزاکردنەوە بۆ هەر یەك ڕۆژ نانی هەژارێکیش دەدات، لەبەر وتەکەی ئیبن عەبباس ﷺ: «وشیردەر ودو گیان ئەگەر ترسیان لە منداڵەکانیان هەبو ڕۆژوەکەیان دەشکێنن وخواردن دەدەن»[(١)].

لەمەوە ڕون بویەوە ئەو هۆکارانەی ڕۆژو نەگرتن حەڵاڵ دەکەن چوارە: سەفەر، نەخۆشی، سوڕی مانگانە، وزەیستانی، وترسان لە تیاچون، وەك دو گیان وشیردەر.

## پرسی دووەم: هەڵوەشێنەرەوەکانی ڕۆژو:

ئەو شتانەیە ڕۆژوی ڕۆژوان بەتاڵ دەکەنەوە ودەیشکێنن. وڕۆژوان بە کردنی یەکێك لەم شتانەی خوارەوە ڕۆژوەکەی پوچ دەبێتەوە:

**یەکەم: خواردن یا خواردنەوەی بە ئەنقەست:** لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ﴾ [البقرة: ١٨٧]. ئەم ئایەتە ئەوەی ڕونکردەوە کە حەڵاڵ نیە ڕۆژوان بخۆن وبخۆنەوە لە دوای دەرچونی سپێدەوە تا شەو (خۆر ئاوابون). بەڵام ئەگەر بە لە بیر چونەوە خواردی یا خواردیەوە ئەوا ڕۆژوەکەی دروستە، هەر کە هاتە بیری پێویستە لە سەری دەم بگرێتەوە، یا بیری خرایەوە کە بە ڕۆژوە، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ[(٢)]: «مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صَائِمٌ فَأَكَلَ، أَوْ شَرِبَ، فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللهُ وَسَقَاهُ» «هەر کەس بە ڕۆژو بو، بە هۆی لە بیر چونەوە،

---

(١) أخرجه أبو داود (٢٣١٧، ٢٣١٨) [بمعناه] وصححه الألباني «الإرواء» (٢٥,١٨/٤) وروي مثله عن ابن عمر.
(٢) أخرجه البخاري (١٩٣٣)، ومسلم (١١٥٥) من حديث أبي هريرة ﷺ.

خواردی یان خواردیەوە، ئەوا با ڕۆژوەکەی تەواو بکات، چونکە خوا نان وئـاوی پـێ بەخشیوە». هەروەها ڕۆژو پوچەڵ دەبێتەوە بە سعوتی «برنوتی»[1]، وبە هەر شـتێك بگاتە هەناو، لەو شتانەی کە حوکمی خواردن وخواردنەوەی هەیە با لـە دەمیشـەوە نەبێت وەك دەرزی موغەززی.

دووەم: **جوتبون**: ڕۆژو بە جوتبون بەتاڵ دەبێتەوە، جا هەرکەس جـوت ببێـت وبـە ڕۆژو بێت ڕۆژوەکەی بەتاڵ بۆتەوە، ولە سەریەتی تەوبـە وداوای لێخۆشـبون بکـات، وئەو ڕۆژەش قەزا بکاتەوە کە تێیدا جوت بوە، هەروەها لەگەڵ قەزاکردنەوەدا ئەبێت کەفارەتیش بدات، کە بریتیە لە ئازادکرنی کۆیلەیەك، ئەگەر نەبو دو مانگ لە سـەر یەك بە ڕۆژو دەبێـت، ئەگـەریش پێـی نـەکرا نـانی شەسـت هـەژار دەدات، لەبـەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: لەو کاتەی لە خزمەتی پەیامبـەر ﷺ بـوین، پیاوێك هاتە خزمەتی وتی: ئەی پەیامبەری خوا! تیاچـوم، فـەرموی: چـیتە؟ وتـی: لەگەڵ هاوسەرەکەمدا جوتبوم وبە ڕۆژوش بوم، پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «ئایـا پێت دەکرێت کۆیلەیەك ئازاد بکەیت؟» وتی: نـەخێر، فـەرموی: «ئـەی ئـەتوانی دو مانگ بە دوای یەکدا بە ڕۆژو بیت؟» وتی: نەخێر، فـەرموی: «ئـەی دەتـوانی نـانی شەست هەژار بدەیت؟» وتی: نەخێر، ئـەڵێ: پەیامبـەر ﷺ هەنـدێك مایـەوە، لـەو کاتەی لەو حاڵەتـەدا بـوین زەبیـل (قەوشـەر)ێك خورمایـان بـۆ هێنـا، فـەرموی: «پرسیارکەرەکە لە کوێیە؟» وتی: ئەوەتام، فەرموی: «ئەمە ببە وبیبەخشـەوە» کـابرا وتی: بیبەخشمە لە خۆم هەژارتر ئەی پەیامبەری خوا؟! بـە خـوا لـە نێـوان هـەردو بەردە ڕەشەکانی مەدینەدا لـە مـن هـەژارتری تێـدا نیـە، ئـەوەبو پەیامبـەر بویـە

(١) دەرمانێکە دەکرێتە لوت.

پێکەنیــەوە تــا دانــەکانی دەرکــەوتن، پاشــان فــەرمووی: «بیــدە بــە خــۆردی خانەوادەکەت»[1].

**هەر لەو شتانەی هاوواتای جوت بونە:** دابەزینی مەنی (ئاوی پیاو)ە بە دەست، جا کە ڕۆژوان ئاوی هاتــەوە بــە ویســتی خــۆی بــە هــۆی ماچــکردنەوە یــا دەســت پێوەدانەوە یان ئاوی خۆ هێنانەوەوە یا جگە لەمانە ئەوا ڕۆژوەکەی پــوچ دەبێتــەوە، چونکە ئەمە لەو شەهوەتەیە کە دژی ڕۆژوە، جا لە سەریەتی قەزای بکاتەوە بە بــێ کەفارەت، چونکە کەفارەت پێویست نابێت مەگەر تەنها بە جوتبون، چونکە دەقەکە بە تایبەت لە سەر ئەوە هاتوە. بەڵام ئەگەر ڕۆژوان خەوت ولەشی گران بو، یا ئــاوی هاتەوە بە بێ ئارەزو وەك کەسێك نــەخۆش بێــت ئــەوا ڕۆژوەکــەی بــەتاڵ نابێتــەوە، چونکە ویستی نیە لەمەدا.

**سێیەم: خۆ ڕشاندنەوە بە ئەنقەست:** بریتیە لە دەرکردنی ئەوەی لە گەدەدایە لــە خواردن وخواردنەوە لە ڕێی دەمەوە بە ئەنقەست، بەڵام ئەگەر زۆری بۆ هێنا ودەرچــو بە بێ ویستی خۆی، ئەوە کاریگەری لــە ســەر ڕۆژوەکــەی نیــە، لەبــەر فــەرمودەی پەیامبــەر ﷺ: «مَنْ ذَرَعَهُ الْقَيْءُ فَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءٌ، وَمَنِ اسْتَقَاءَ عَمْدًا فَلْيَقْضِ» «کێ ڕشانەوە زۆری بۆ هێنا ئەوا قەزاکردنەوەی لە سەر نیــە، کــێش خــۆی ڕشــانەوە ئەوا با قەزای بکاتەوە»[2].

**چوارەم: کەڵەشاخ:** بریتیە لە دەرکردنی خوێن لە پێستەوە نــەك دەمارەکــان. جــا کــەی کەڵەشــاخی کــرد ڕۆژوەکــەی دەشــکێت، لەبــەر فــەرمودەی: «أَفْطَرَ الْحَاجِمُ

(١) أخرجه البخاري (١٩٣٦)، ومسلم (١١١١).
(٢) أخرجه أبو داود (٢٣٨٠)، والترمذي (٧٢٠)، وابن ماجه (١٦٧٦)، وصححه الألباني «صحيح ابن ماجه» (١٣٦٨).

وَالْمَحْجُومُ» «حیجامەکەر وکەڵە شاخ بۆ کراو ڕۆژوەکەیان شکاوە»[1]. هەروەها ڕۆژوی حیجامەکەرەکەش دەشکێت مەگەر بە ئامێرێکی لێکجودا بیکات، وپێویستی بە خوێن مژین نەبێت، ئەوا -خواش زاناترە- ناشکێت. هەر لەو شتانەی هاوواتای کەڵەشاخە: دەرکردنی خوێنە لە ڕێی بڕینی دەمارەوە «الفصد»، هەروەها دەرکردنی بۆ بەخشینەوەی.

بەڵام دەرچونی خوێن بە هۆی برین، یا دان هەڵکێشان، یان خوێن لوت بەر بون، ئەوا زیانی نیە؛ چونکە نە کەڵەشاخە ونە هاو واتایەتی.

**پێنجەم: دەرچونی خوێنی عادە وزەیستانی:** جا کەی ئافرەت خوێنی سوری مانگانە یا زەیستانی بینی ڕۆژوەکەی شکاوە، وپێویستە لە سەری قەزای بکاتەوە، لەبەر فەرمودەکەی [پێشوتری] پەیامبەر ﷺ: «ئەوە نیە کە دەکەوێتەوە عادەوە نە نوێژ دەکات ونە ڕۆژو دەگرێت».

**شەشەم: نیەتی شکاندن:** جا هەر کەس پێش خۆر ئاوابون نیەتی شکاندنی هێنا وبە ڕۆژوش بو ئەوا ڕۆژوەکەی بەتاڵ بوەتەوە با هیچ بەتاڵ کەرەوەیەکیش نەکات، چونکە نیەت یەکێکە لە دو پایەکەی ڕۆژو، جا کە نیەتەکەی هەڵ وەشاندەوە، بە مەبەستی شکاندنی وبە ئەنقەستەوە ئەوا ڕۆژوەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

**حەوتەم: هەڵگەڕانەوە:** لەبەر ئەوەی دژی پەرستنە، ولەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾ [الزمر:٦٥] «ئەگەر هاوبەش دابنێیت ئەوا بێگومان سوێند بێت کردەوەکانت هەڵدەوەشێتەوە».

(١) أخرجه أبو داود (٢٣٦٧) وابن خزيمة (١٩٨٣) وصحح الألباني إسناده «التعليق على ابن خزيمة» (٢٣٦/٣).

# دەروازەی سێ یەم

# سوننەتەکانی ڕۆژو ومەکروهەکانی

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: سوننەتەکانی ڕۆژو:

سوننەتە ڕۆژوان لە ڕۆژوەکەیدا ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

١- **پارشێو:** لەبەر فەرمایشتەکەی ﷺ: «تَسَحَّرُوا، فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً» «پارشێو بکەن، لە پارشێو فەڕ وپیت هەیە»[(١)]. بە خواردنی زۆر بێت یا کەم پارشێو بەدی دێت، ئەگەر بە قومە ئاوێکیش بێت.

کاتەکەشی: لە نیوە شەوەوە دەست پێ دەکات تا سپێدە.

٢- **دواخستنی پارشێو:** لەبەر فەرمودەکەی زەیدی کوڕی سابت ﷺ ئەڵێ: «مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ قُمْنَا إِلَى الصَّلَاةِ، قُلْتُ: كَمْ كَانَ قَدْرُ مَا بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: خَمْسِينَ آيَةً» «لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ پارشێومان کرد، پاشان هەستاین بۆ نوێژ، وتم: چەندێك لە نێوان هەر دوکیان دەبو؟ وتی: ئەندازەی پەنجا ئایەت»[(٢)].

٣- **زو دەمکردنەوە:** سوننەتە ڕۆژوان هەر کە دڵنیا بویەوە لە خۆر ئاوا بون، پەلە بکات لە ڕۆژو شکاندن، وەك لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هاتوە ﷺ، پەیامبەر ﷺ

---

(١) أخرجه البخاري (١٩٢٣)، ومسلم (١٠٩٥).

(٢) أخرجه البخاري (٥٧٥)، ومسلم (١٠٩٧)، واللفظ لمسلم.

فەرمویەتی: «لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ» «خەڵك بەردەوام لە خێـردان تـا زو دەم بکەنەوە»[1].

**٤- دەمکردنەوە لە سەر چەند خورمایـەکی تـەڕ:** کـە دەسـتی نەکـەوت، بـە خورمای وشك، ویا تیق بێت، ئەگەر نەبو بە چەند قومێك ئاو، لەبـەر فەرمودەکـەی ئەنەس ﷺ: «كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُفْطِرُ عَلَى رُطَبَاتٍ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ رُطَبَاتٌ فَعَلَى تَمَرَاتٍ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ حَسَا حَسَوَاتٍ مِنْ مَاءٍ» «پەیامبـەر ﷺ پـێش نوێژکردن بە چەند خورمایەکی تەڕ بەربانگی دەکردەوە، نەبوایە بە چەند خورمایەکی وشك، نەبوایە بە چەند قومێك ئاو»[2]. هیچیشی دەست نەکەوت نیەتی شکاندن بـە دڵی دەهێنێ، ئەوە بەسیەتی.

**٥- پاڕانەوە لـە کـاتی بـەر بـانگ کردنـەوە ولـە میانـەی ڕۆژوەکـە:** لەبـەر فەرمودەکەی پەیامبـەر ﷺ: «ثَلَاثَةٌ لَا تُرَدُّ دَعْوَتُهُمْ: الصَّائِمُ حَتَّى يُفْطِرَ، وَالْإِمَامُ الْعَادِلُ، وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ» «سیان دوعاکانیان ڕەد ناکرێتـەوە: ڕۆژوان تـا بـەر بـانگ دەکاتەوە، وپێشەوای دادگەر، وستەم لێکراو»[3].

**٦- زۆر صەدەقەکردن، وقورئان خوێندن، وخواردن دان بە ڕۆژوانان، وسـەرجەم کارە چاکەکانی تر:** لـە ئـیبن عەبباسـەوە ﷺ ئـەڵێ: «كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ وَكَانَ أَجْوَدُ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ وَكَانَ جِبْرِيلُ يَلْقَاهُ فِي

---

(١) أخرجه البخاري (١٩٥٧)، ومسلم (١٠٩٨).

(٢) أخرجه أبو داود (٢٣٥٦)، والترمذي (٦٩٦). وحسنه، والبغوي في شرح السنة (٦/٢٦٦). وصححه الألباني «صحيح الترمذي» (٥٦٠)، وقوى إسناده الأرناؤوط في التعليق على «شرح السنة».

(٣) أخرجه الترمذي (٢٥٢٦) وحسنه، وأخرجه البيهقي (٣/٣٤٥) وغيره عن أنس مرفوعاً بلفظ: «ثلاث دعوات لا ترد: دعوة الوالد، ودعوة الصائم، ودعوة المسافر». وصححه الألباني «الصحيحة» (١٧٩٧).

كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ رَمَضَانَ فَيُدَارِسُهُ الْقُرْآنَ فَلَرَسُولُ اللهِ ﷺ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ أَجْوَدُ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ» «پەیامبەر ﷺ سەخیترین كەس بو، زیاتر لە ڕەمەزاندا كە جبریل دەهات بۆ لای، جا هەمو شەوێكی ڕەمەزان دەهات بۆ لای ودیراسەی قورئانی پێ دەكرد، جا كە پەیامبەر ﷺ جوبریل دەهات بۆ لای بە خوا بۆ خێر لە با بەخشندە تر بو»[1].

**٧- تێكۆشان لە شەو نوێژدا:** بە تایبەت دە شەوی كۆتایی ڕەمەزان، لە عایشەوە ﵂: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ شَدَّ مِئْزَرَهُ، وَأَحْيَا لَيْلَهُ، وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ» «پەیامبەر ﷺ ئەگەر دە شەوی كۆتایی بهاتبایە، ناوقەدی توند دەكرد، وشەوەكەی زیندو دەكردەوە وخانەوادەكەی هەڵدەستان»[2]. ولەبەر گشتێتی فەرمودەكەی پەیامبەر ﷺ: «مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ» «هەر كەس شەو نوێژی ڕەمەزان ئەنجام بدات بە بڕوا بون وچاوەڕێی پاداشتەوە، ئەوا خوا لە تاوانەكانی پێشوی خۆش دەبێت»[3].

**٨- عومرەكردن:** لەبەر فەرمودەكەی ﷺ: «عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ تَعْدِلُ حَجَّةً» «عومرەیەك لە ڕەمەزاندا یەكسانە بە حەج كردنێك»[4].

**٩- وتنی: «من بە ڕۆژوم» بە كەسێك جوێنی پێدا**، ئەمەش لەبەر فەرمودەكەی پەیامبەر ﷺ: «وَإِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ فَلَا يَرْفُثْ وَلَا يَصْخَبْ، فَإِنْ سَابَّهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ فَلْيَقُلْ: إِنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ» «وئەگەر كەسێكتان بە ڕۆژو بو، با قسەی نا

---

(١) أخرجه البخاري (٦) [ولفظهم أقرب إلى (٣٢٢٠)]، ومسلم (٢٣٠٨).
(٢) أخرجه البخاري (٢٠٢٤)، ومسلم (١١٧٤).
(٣) أخرجه مسلم (٧٥٩).
(٤) أخرجه البخاري (١٧٨٢)، ومسلم (١٢٥٦).

ئەخلاقی وقرِە قرِ نەکات، ئەگەریش کەسێك جوێنی پێدا، یا شەڕی لەگەڵ کرد، با بڵێت: من بە ڕۆژوم»[1].

## پرسی دوەم: مەکرِوهەکانی ڕۆژو:

هەندێك شت کەراهەتی هەیە دەرهەق ڕۆژوان کە ئەبێتە مایەی لەکەدار کردن وبریندارکردنی ڕۆژوەکەی، وکەمکردنەوەی پاداشتەکەی، کە ئەمانەیە:

١- **موبالەغەکردن لە ئاو دان بە دەم ولوتدا:** ئەمەش لە ترسی ئەوەی ئاو بڕواتە قورِگیەوە، لەبەر فەرمودەکەی [پێشتر]: «وزیادەڕەوی بکە لە ئاو دان بە لوتدا مەگەر بە ڕۆژو بیت».

٢- **ماچ کردن ئەگەر ئارەزوی دەجولا، لە نەفسی خۆیشی دلنیا نیە:** ئەوە کەراهەتی هەیە ڕۆژوان ماچ هاوسەرەکەی یا کەنیزەکەکەی بکات، چونکە لەوانەیە بێتە مایەی جولاندنی شەهوەتی وئەوەش سەر بکێشێت بۆ پوچەڵ بونەوەی ڕۆژوەکەی، بەڵام ئەگەر لە خۆی دلنیا بو ڕۆژوەکەی بەتاڵ نابێتەوە ئەوە هیچی تێدا نیە، چونکە پەیامبەر ﷺ ماچی دەکرد وبە ڕۆژو بو، عائیشە ئەڵێ: «وَكَانَ أَمْلَكَكُمْ لِإِرْبِهِ» «بەڵام لە هەموتان زیاتر خۆی پێ دەگیرا بۆ پێداویستی خۆی»[2]. هەروەها لە سەریەتی خۆی دور بخاتەوە لە هەر شتێك شەهوەتی دەجولێنێت، وەك بەردەوام تەماشاکردنی هاوسەر یا کەنیزەك، یا بیر کردنەوە لە بابەتەکانی جوتبون، چونکە ئەبێتە مایەی ئاو هاتنەوە یا جوتبون.

---

(١) أخرجه البخاري (١٩٠٤)، ومسلم (١١٥١) واللفظ للبخاري.
(٢) أخرجه البخاري (١٩٢٧)، ومسلم (١١٠٦) - ٦٤.

٣- **بەڵغەم قوت دان:** چونکە دەڕواتە هەناویــەوە وپێــی بــەهێز دەبێــت، ئەمــە سەرباری ئەوەی قیزەونە، زیانیشی لێ دەکەوێتەوە.

٤- **تامکردنی خواردن وپێویستیشی نەبێت:** جا ئەگەر پێویســتی پــێ بــو وەك ئەوەی چێشت لێ نەر بو پێویستی بە تــامکردنی خوێکــە وهاوشــێوەکانیەتی ئــەوە هیچی تێدا نیە لەگەڵ وریا بون لەوەی هیچ نەگاتە قورگی.

# دەروازەی چوارەم

## لە بارەی قەزاکردنەوەی ڕۆژو، وڕۆژوی سوننەت، وڕۆژووی مەکروه، وڕۆژوی حەرام؟

چەند پرسێکی تێدایە:

**پرسی یەکەم: قەزاکردنەوەی ڕۆژو:**

ئەگەر موسڵمان یەك ڕۆژوی ڕەمەزانی نەگرت بە بێ عورز، ئەوا واجبە لە سەری بگەڕێتەوە لای خوا وداوای لێ بوردن بکات، چونکە ئەمە تاوانێکی گەورەیە، وخراپەیەکی مەزنە، لەگەڵ تەوبە وداوای لێ خۆشبون پێویستە لە سەری دوای ڕەمەزان قەزای ئەو ڕۆژانە بکاتەوە کە نەیگرتوە، واجبێتی قەزاکردنەوەش لێرەدا لە سەر ڕای دروستی زانایان بۆ یەکسەر «فوري»یە، چونکە ڕوخسەتی پێ نەدراوە بە ڕۆژو نەبێت، وبنەماکەش ئەوەیە: لە کاتی خۆیدا بیگێڕێتەوە.

بەڵام ئەگەر نەیگرت بە هۆی عوزرێکەوە وەك عادە یا زەیستانی یا نەخۆشی یا سەفەر وجگە لە مانەش لەو عوزرانەی بە هۆیەوە حەڵاڵە ڕۆژو نەگریت؛ ئەوا پێویستە لە سەری قەزای بکاتەوە ئەوەندە نەبێت دەست بە جێ پێویست نیە، بەڵکو دەتوانێت دوای بخات بۆ ڕەمەزانەکەی تر، بەڵام سوننەتە وباشترە پەلە بکات لە قەزاکردنەوەی، چونکە پەلەکردنی تێدایە بۆ ئەستۆ پاککردنەوە، هەروەها ئیحتیاتی زیاتریشی تێدایە؛ لەوانەیە ڕێگرێك بێتە پێشی وەك: نەخۆشی وهاوشێوەکانی، ئەگەریش دوای خست بۆ ڕەمەزانی دوەم وبیانویەکیشی هەبو لەو دواخستنەدا، وەك ئەوەی عوزرەکەی درێژە بکێشێت؛ ئەوا لە سەریەتی دوای ڕەمەزانەکەی تر قەزای

بکاتەوە. بەڵام ئەگەر دوای خست بۆ پاش ڕەمەزانەکەی تر بە بێ عوزر، ئەوا لە سەریەتی لەگەڵ قەزا کردنەوەدا، بۆ هەر یەك ڕۆژ نانی هەژارێکیش بدات.

لە قەزاکردنەوەشدا مەرج نیە بە دوای یەکتردا بێت، بەڵکو بە دوای یەکتر وپچڕ پچڕیش دەبێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ [البقرة:١٨٤]. خوا ﷻ لەم ئایەتەدا بە دوای یەکتری بە مەرج نەگرت.

## پرسی دوەم: ڕۆژوی سوننەت:

لە دانایی خوا ﷻ ومیهرەبانی بە بەندەکانی ئەوەیە: سوننەتیشی داناوە کە هاوشێوەی فەرزەکانن، بۆ زیاتر پاداشت دانەوەی بەندەکان، وپڕ کردنەوەی کەلێن وکورتیەکان کە لەوانەیە لە فەرزەکەدا هەبێت، پێشتریش باسی ئەوەمان کرد کە: فەرزەکان پڕ دەکرێنەوە بە سوننەتەکان لە ڕۆژی قیامەتدا.

**ئەو ڕۆژانەشی سوننەتە بگیرێت ئەمانەیە:**

١- **ڕۆژوی شەشەڵە:** لەبەر فەرمودەکەی ئەبو ئەیوبی ئەنساری رضي الله عنه، لە پەیامبەرەوە ﷺ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتًّا مِنْ شَوَّالٍ، كَانَ كَصِيَامِ الدَّهْرِ» «هەر کەس ڕەمەزانی گرت ئینجا شەش ڕۆژی مانگی شەوالیشی بە دوای دا گرت وەکو ئەوە وایە ساڵەکە بە ڕۆژو بو بێت»[1].

٢- **ڕۆژوی عەرەفە بۆ جگە لە حاجی:** لەبەر فەرمودەکەی ئەبو قەتادە رضي الله عنه، لە پەیامبەرەوە ﷺ: «صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ أَحْتَسِبُ عَلَى اللهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ،

(١) أخرجه مسلم (١١٦٤).

وَالسَّنَةَ الَّتِي بَعْدَهُ» «ڕۆژوی عەرەفە ئومێدم هەیە، خـوا بیکاتـە مایـەی سـڕینەوەی تاوانی ساڵێك پێش وساڵێك پاش»[1]. بەڵام دەرهەقی حـاجی سـوننەت نیـە ڕۆژوی عەرەفە بگرێت، چـونکە پەیامبـەر ﷺ ئـەو ڕۆژە ڕۆژوەکـەی شـکاند وخـەڵکیش تەماشایان دەکرد، هەروەها هێـزی زیـاتری تێدایـە بـۆ حـاجی تـا پەرسـتن بکـات وبپاڕێتەوە لەو ڕۆژەدا.

٣- **ڕۆژوی عاشـورا:** پرسـیار لـە پەیامبـەری خـوا ﷺ کـرا لـە بـارەی ڕۆژوی عاشوراوە؟ فەرموی: «أَحْتَسِبُ عَلَى اللهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ» «ئومێدم بـە خـوا هەیە تاوانی ساڵی پێشو بسڕێتەوە»[2]. هەروەها سوننەتە ڕۆژێك پێش ئەوە وڕۆژێـك پـاش ئـەوە بگیرێـت، لەبـەر فەرمودەکـەی پەیامبـەر ﷺ: «لَئِنْ بَقِيتُ إِلَى قَابِلٍ، لَأَصُومَنَّ التَّاسِعَ» «ئەگەر بمێنمە ساڵی داهاتو ئەوا نۆیەمیش دەگـرم»[3]. هـەروەها ئەفـەرموێ ﷺ: «صُومُوا يَوْمَ عَاشُورَاءَ، وَخَالِفُوا فِيهِ الْيَهُودَ؛ صُومُوا قَبْلَهُ يَوْمًا، وَبَعْدَهُ يَوْمًا» «ڕۆژوی عـاشورا بگـرن، وپێچـەوانەی جولەکـە بکـەن؛ ڕۆژێـك پێشـی وڕۆژێك پاشی بگرن»[4].

٤- **ڕۆژوی دو شەممە وپێنج شەممە لە هەمو هەفتەیەکدا:** لەبـەر فەرمودەکـەی عائیشە ﵂: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَحَرَّى صَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ» «پەیامبـەری خـوا

---

(١) أخرجه مسلم (١١٦٢).

(٢) أخرجه مسلم (١١٦٢). وهو جزء من حديث طويل.

(٣) أخرجه مسلم (١١٣٣).

(٤) [ضعيف مرفوعًا]: أخرجه أحمد (٢٤١/١) [هذا لفظه!]، وابن خزيمة (٢٠٩٥) وفي سنده ضعف، لكنه صح عن ابن عباس بنحوه موقوفًا من قوله.

ﷺ بە دوای ڕۆژوی دو شەممە وپێنج شەممەدا دەگەڕا»[1]. هەروەها ئەفەرموێ ﷺ: «تُعْرَضُ الْأَعْمَالُ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ، فَأُحِبُّ أَنْ يُعْرَضَ عَمَلِي وَأَنَا صَائِمٌ» «کردەوەکان ڕۆژانی دو شەممە وپێنج شەممە دەخرێنە ڕو، جا پێم خۆشە کە کردەوەکەم خرا ڕو بە ڕۆژو بم»[2].

٥- **ڕۆژوی سێ ڕۆژ لە هەمو مانگێکدا:** لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ بۆ عەبدولای کوڕی عەمر: «وَصُمْ مِنَ الشَّهْرِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنَّ الْحَسَنَةَ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، وَذَلِكَ مِثْلُ صِيَامِ الدَّهْرِ» «ولە هەر مانگێکدا سێ ڕۆژ ڕۆژو بگرە، چونکە چاکە بە دە قاتە، کەواتە وەك گرتنی ساڵەکە وایە»[3]. ولە ئەبو هورەیرەوە ﷺ ئەڵێ: «أَوْصَانِي خَلِيلِي ﷺ بِثَلَاثٍ: صِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَرَكْعَتَيِ الضُّحَى، وَأَنْ أُوتِرَ قَبْلَ أَنْ أَنَامَ»[4] «خۆشەویستەکەم ئامۆژگاری کردم بە سێ شت: سێ ڕۆژ ڕۆژو گرتن لە هەمو مانگێك دا، ودو ڕکاتی چێشتەنگا، ووتر بکەم پێش خەوتن». هەروەها سونەتە لە ڕۆژە سپیەکاندا بێت کە بریتیە لە سیانزە وچواردە وپانزەی مانگ [ی ئیسلامی]، لەبەر فەرمودەکەی ئەبو زەر ﷺ، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «مَنْ كَانَ مِنْكُمْ صَائِمًا مِنَ الشَّهْرِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، فَلْيَصُمِ الثَّلَاثَ الْبِيضَ» «کێ لە ئێوە سێ ڕۆژ ڕۆژوی لە مانگێکدا گرت با سێ ڕۆژە سپیەکە بیگرێت»[5].

---

(١) أخرجه أحمد (٥/٢٠١)، والترمذي (٧٤٥) [واللفظ له]، وقال الترمذي: «حسن صحيح»، وصححه الألباني «التعليق على ابن خزيمة» (٢١١٦).

(٢) أخرجه الترمذي (٧٥١)، والنسائي (١/٣٢٢)، وأبو داود (٢٤٣٦) وحسنه الترمذي، وصححه الألباني «صحيح الترمذي» (٥٩٦).

(٣) أخرجه البخاري (١٩٧٦).

(٤) أخرجه البخاري (١٩٨١).

(٥) أخرجه أحمد (٥/١٥٢)، والنسائي (٤/٢٢٢)، واللفظ لأحمد. وحسنه الألباني «صحيح سنن النسائي» (٢٢٧٧-٢٢٨١).

٦- **ڕۆژوی ڕۆژ نـەڕۆژ:** لەبـەر فەرمایشـتەکەی پەیامبـەر ﷺ: «أَفْضَلُ الصِّيَامِ صِيَامُ دَاوُدَ عليه السلام؛ كَانَ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا» «باشترین ڕۆژو ڕۆژوی داودە، ڕۆژ نـە ڕۆژ بە ڕۆژو دەبو»[١]. ئەمەش لە باشترین جۆرەکانی سونەتە.

٧- **ڕۆژوی مانگی موحەڕەم:** لەبەر فەرمودەکەی ئەبو هـورەیرە رضي الله عنه، پەیامبـەر ﷺ فەرمویـەتی: «أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ رَمَضَانَ شَهْرُ اللهِ الْمُحَرَّمُ، وَأَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ صَلَاةُ اللَّيْلِ» «باشترین ڕۆژو دوای ڕەمەزان ڕوژوی مانگی موحەڕەمـە، وباشترین نوێژ دوای فەرزەکان شەو نوێژە»[٢].

٨- **ڕۆژوی نۆمینـەی حاجیـان:** ولـە یەکـەم ڕۆژی مـانگی حاجیانـەوە دەسـت پێدەکات ولە نۆیەم ڕۆژ کۆتایی پێ دێت، کـە بریتیـە لـە ڕۆژی عەرەفـە، ئەمـەش لەبەر گشتێتی ئەو فەرمودانـەی لـە بـارەی فـەزڵی کـردەوە کـردن تێیـدا هـاتون، پەیامبەری خوا ﷺ ئەفـەرموێ: «مَا مِنْ أَيَّامٍ الْعَمَلُ الصَّالِحُ فِيهِنَّ أَحَبُّ إِلَى اللهِ مِنْ هَذِهِ الْأَيَّامِ الْعَشْرِ» «هیچ ڕۆژێك نیە کردەوەی چاك تێیدا خۆشەویسـتر بێـت لـە لای خوا بە ئەندازەی ئەم دە ڕۆژە»[٣]. ڕۆژوگرتنیش لە کردەوە چاکەکانە.

## پرسی سێیـەم: ئەو ڕۆژوەی کەڕاهەتی هەیە وئەوەشی کە حەرامـە:

١- **کەڕاهەتی هەیە مانگی ڕەجەب بە تەنها بگیرێت،** چـونکە ئەمـە دروشمـی نەفامی بوە، ئەو مانگەیان لا گەورە بوە، ئەگەر ڕۆژی تری لەگەڵدا بخات کەڕاهـەتی

---

(١) أخرجه البخاري (١٩٧٦).

(٢) أخرجه مسلم (١١٦٣).

(٣) أخرجه البخاري (٩٦٩) [واللفظ للترمذي (٧٥٧)، أما لفظ البخاري: «مَا الْعَمَلُ فِي أَيَّامِ الْعَشْرِ أَفْضَلَ مِنَ الْعَمَلِ فِي هَذِهِ»].

تێدا نیە، چونکە ئەو کاتە تایبەت نەکراوە بە ڕۆژوەوە، ئەحمەدی کوڕی خەڕەشەی کوڕی حورِ ئەگێڕێتەوە ئەڵێ: عومەری خەتابم بینی ئەیدا بە سەر دەستی ئەوانەی لە ڕەجەبدا بە ڕۆژو بون تا دەستیان دەخستە نێو خواردن، وئەیوت: «كُلُوا، فَإِنَّمَا هُوَ شَهْرٌ كَانَ يُعَظِّمُهُ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ» «بخۆن، ئەمە مانگێکە خەڵکانی سەردەمی نەفامی بە گەورەیان ڕادەگرت»[1].

٢- **کەڕاهەتی هەیە ڕۆژی هەینی بە تەنها بگیرێت**، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «لَا يَصُمْ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إِلَّا أَنْ يَصُومَ قَبْلَهُ، أَوْ يَصُومَ بَعْدَهُ» «کەستان با ڕۆژی هەینی ڕۆژو نەگرێت، مەگەر ڕۆژێك پێشتر یا ڕۆژێك پاشتر بگرێت»[2]. جا ئەگەر لەگەڵ ڕۆژی تردا بو هیچی تێدا نیە لەبەر فەرمودەی پێشو.

٣- **کەڕاهەتی هەیە ڕۆژی شەممە بە تەنها بگیرێت**، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «لَا تَصُومُوا يَوْمَ السَّبْتِ إِلَّا فِيمَا افْتُرِضَ عَلَيْكُمْ» «ڕۆژی شەممە ڕۆژو مەگرن مەگەر ڕۆژویەك فەرز کرا بێت لە سەرتان»[3]. مەبەستیش: نەهی کردنە لە تەنها کردنەوەی وتایبەت کردنی، بەڵام ڕۆژی تری لەگەڵ دا بێت هیچی تێدا نیە، چونکە پەیامبەر ﷺ کە لە ڕۆژی هەینیدا سەردانی دایکی ئیمانداران جوەیریەی کرد وبە ڕۆژو بو، فەرموی: «دوێنێ بە ڕۆژو بویت؟ وتی: نەخێر، فەرموی: ئەتەوێ سبەی بە ڕۆژو بیت؟ وتی: نەخێر، فەرموی: کەواتە ڕۆژوەکەت بکشێنە»[4].

---

(١) أخرجه ابن أبي شيبة (١٠٢/٣)، والطبراني في «الأوسط» (٣٢٧/٧) (٧٦٣٦)، وقال: «صحيح». «الإرواء» (١١٣/٤).

(٢) أخرجه البخاري (١٩٨٥)، ومسلم (١١٤٤) [هذا لفظه].

(٣) أخرجه أبو داود (٢٤٢١)، والترمذي (٧٤٤)، وابن ماجه (١٧٢٦)، والحاكم (٤٣٥/١). وحسنه الترمذي، وصححه الحاكم على شرط البخاري، وافقه الذهبي. وصححه الألباني «صحيح الترمذي» (٥٩٤).

(٤) أخرجه البخاري (١٩٨٦).

جا کە فەرموی: «ئەتەوێ سبەی بە ڕۆژو بیت؟» بەڵگەیە لە سەر دروستێتی گرتنی ڕۆژوی شەممە لەگەڵ ڕۆژی تردا. پێشەوا تورمزی دوای گێڕانەوەی ئەم فەرمودەیە ئەڵێ: «وبونی کەڕاهەت لەمەدا: ئەوەیە کابرا ڕۆژوی شەممە بە تەنها بگرێت، چونکە جولەکە شەممە بە گەورە ڕادەگرن».

٤- **گرتنی ڕۆژی جێی گومان «یوم الشك» حەرامە**، کە بریتیە لە سی شەعبان، ئەگەر ڕێگر هەبو لە بینینی مانگ، کە ئاسمانیش ساماڵ بێت گومان نامێنێت، بەڵگەی حەرامێتیەکەی فەرمودەکەی عەممارە رضي الله عنه ئەڵێ: «مَنْ صَامَ الْيَوْمَ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ» «کێ ئەو ڕۆژە بگرێت کە جێی گومانە ئەو سەرپێچی فەرمانی باوکی قاسمی کردوە»[1]. ولەبەر فەرمودەکەی پەیامبەری خوا ﷺ: «لَا يَتَقَدَّمَنَّ أَحَدُكُمْ رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صَوْمَهُ، فَلْيَصُمْ ذَلِكَ الْيَوْمَ» «با کەس پێش ڕەمەزان بە ڕۆژێك یا دو ڕۆژ بە ڕۆژ نەبێت، مەگەر کەسێك ڕۆژوی خۆی هەیە وئەیگرێت ئەوا قەیدی نیە، با لەو ڕۆژەدا بیگرێت»[2]. یانی: با کەس ڕۆژێك پێش ڕەمەزان ڕۆژو نەگرێت بە مەبەستی ئیحتیاتکردن، چونکە ڕۆژوگرتنی ڕەمەزان پەیوەستە بە بینینی مانگەوە، جا پێویست بە زۆر لە خۆ کردن ناکات، بەڵام کەسێك ڕۆژویەکی سوننەتی هەبێت وبەردەوام بیگرێت ئەوا هیچی لە سەر نیە لەبەر ئەوەی پێشوازی کردن نیە لە ڕەمەزان، هەروەها قەزاکردنەوە ونەزریش هەڵاوێر دەکرێن چونکە واجبن.

---

(١) علّقه البخاري في صحيحه بصيغة جزم [قبل رقم (١٩٠٦)] «الفتح» (١٤٣/٤)... ووصله الترمذي (٦٨٩) وغيره، وقال: «حديث حسن صحيح». وصححه الألباني «صحيح الترمذي» (٥٥٣).

(٢) أخرجه البخاري (١٩١٤).

**٥- حەرامە گرتنی ڕۆژی هەر دو جەژنەکە**، لەبەر فەرمودەکەی ئەبو سەعیدی خودری رضي الله عنه: «پەیامبەر ﷺ نەهی کرد لە گرتنی ڕۆژی جەژنی قوربان وڕەمەزان»[(١)]. ولەبەر فەرمودەکەی عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه: «هَذَانِ يَوْمَانِ نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ صِيَامِهِمَا: يَوْمُ فِطْرِكُمْ مِنْ صِيَامِكُمْ، وَالْيَوْمُ الْآخَرُ تَأْكُلُونَ فِيهِ مِنْ نُسُكِكُمْ» «ئەم دو ڕۆژە پەیامبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە ڕۆژوی تێدا بگیرێت: ڕۆژی کۆتاییهاتن ودەمکردنەوەتان لە ڕۆژوگرتن، وڕۆژەکەی تر کە لە قوربانیەکەتان دەخۆن»[(٢)].

**٦- کەڕاهەتی هەیە ڕۆژانی دانەبەرخۆر «التشريق» ڕۆژو بگیرێت**، کە بریتیە لە سێ ڕۆژی دوای جەژنی قوربان: یانزە ودوانزە وسیانزە، لەبەر فەرمودەکەی ﷺ: «أَيَّامُ التَّشْرِيقِ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ [وَذِكْرٍ لِلهِ]» «ڕۆژانی تەشریق، ڕۆژانی خواردن وخواردنەوە ویادکردنی خوان»[(٣)]. ولەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «يَوْمُ عَرَفَةَ، وَيَوْمُ النَّحْرِ، وَأَيَّامُ التَّشْرِيقِ، عِيدُنَا أَهْلَ الْإِسْلَامِ، وَهِيَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ» «ڕۆژی عەرەفە وڕۆژی جەژنی قوربان وڕۆژانی تەشریق جەژنی ئێمەی ئەهلی ئیسلامە، کە ڕۆژانی خواردن وخواردنەوەیە»[(٤)]. وڕێگە دراوە بە حاجی «متمتع» و«قارن» [کە دواتر لە بەشی حەجدا واتاکانیان دێت] بە ڕۆژو بن تێیدا ئەگەر پارەی قوربانی «الْهَدْي»ان نەبو، لەبەر وتەکەی عائیشە وئیبن عومەر رضي الله عنهم: «لَمْ يُرَخَّصْ فِي أَيَّامِ

---

(١) أخرجه البخاري (١٩٩١).
(٢) أخرجه البخاري (١٩٩٠).
(٣) أخرجه مسلم (١١٤١) [والزيادة له أيضًا في رواية بعده].
(٤) أخرجه الترمذي (٧٧٧)، وقال: حسن صحيح. وصححه الألباني «صحيح الترمذي» (٦٢٠).

التَّشْرِيقِ أَنْ يُصَمْنَ، إِلَّا لِمَنْ لَمْ يَجِدِ الْهَدْيَ» «ڕێگە نەدراوە لە ڕۆژانی تەشریقدا ڕۆژو بگرن مەگەر بۆ یەکێك قوربانی پێ نەکرێ»[1].

(١) أخرجه البخاري (١٩٩٧، ١٩٩٨).

# دەروازەی پێنجەم

## لە بارەی: مانەوە لە مزگەوت «الإعْتِكَاف»

چەند مەسەلەیەکی تێدایە:

### مەسەلەی یەکەم: پێناسەی ئیعتیکاف وحوکمەکەی:

**١- پێناسەکەی:**

ئیعتیکاف لە زماندا بریتیە لە: پابەندبون بە شتێکەوە ومانەوە لە لای. لە شەرعیشدا: پابەندبونی موسڵمانێکی جیاکارە بە مزگەوتەوە بۆ پەرستنی خوا ﷻ.

**٢- حوکمەکەی:**

سوننەتە ونزیکبونەوەیە لە خوا ﷻ، لەبەر فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿أَنْ طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ﴾ [البقرة:١٢٥]. «وەحیمان نارد بۆ ئیبراهیم وئیسماعیلی کوڕی: کە ماڵەکەم پاك بکەنەوە لە هەمو پیسیەك بۆ ئەوانەی خوا پەرستی تێدا دەکەن بە تەواف کردن وئیعتیکاف کردن ونوێژ کردن تێیدا». ئەم ئایەتەش بەڵگەیە کە لە گەلانی پێشتریشدا شەرعی بوە. هەروەها خوا ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنْتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ﴾ [البقرة: ١٨٧] «وجوت مەبن لەگەڵ هاوسەرەکانتاندا یا شتانێك مەکەن سەردەکێشێت بۆ جوتبون ئەگەر لە مزگەوتدا ئیعیکافتان کردبو». لە عائیشەوە ﵂: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللهُ». «پەیامبەر ﷺ دە شەوی کۆتایی

ڕەمەزان ئیعتیکافی دەکرد تا خوا بردیەوە لای خۆی»[1]. موسڵمانانیش کۆکن لە سەر شەرعی بونی، کە سونەتە، واجب نیە مەگەر مرۆڤ خۆی لە سەر خۆی واجبی بکات وەك ئەوەی نەزر بکات.

بەمەش سونەت بونی ئیعتیکاف سەلما بە قورئان وفەرمودە وکۆ دەنگی.

## پرسی دووەم: مەرجەکانی ئیعتیکاف کردن:

ئیعتیکاف پەرستنێکە چەند مەرجێکی هەیە بەبێ ئەوە دروست نابێت، کە بریتیە لە:

١- **ئەبێت ئیعتیکاف کەر موسڵمانێکی جیاکاری ژیر بێت:** جا هی بێ باوەڕ وشێت ومنداڵی ناجیاکار دروست نابێت، پێگەیشتن ونێرینەییش مەرج نیە، بۆیە پێنەگەیشتویەکی جیاکار بیکات دروست دەبێت، مێینەش بە هەمان شێوە.

٢- **نیەت هێنان:** لەبەر فەرمودەی [پێشوتر]: «کردەوەکان بە نیەتە»، جا کەسەکە دەبێت نیەتی مانەوەی هەبێت لە شوێنی ئیعتیکافەکەی، وەکو پەرستن ونزیك بونەوەیەك لە خوا.

٣- **ئەبێت ئیعتیکافەکە لە مزگەوت دا بێت:** لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَأَنْتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ﴾ [البقرة:١٨٧] ولەبەر کردەوەی پەیامبەر ﷺ خۆی کە لە مزگەوتدا ئیعتیکافی دەکرد، ولێوەی نەهاتوە ئیعتیکافی کردبێت لە جگە لەوە.

---

(١) أخرجه البخاري (٢٠٢٠)، ومسلم (١١٧٢).

٤- **ئەبێت مزگەوتەکە نوێژی کۆمەڵی تێدا بکرێت:** ئەمەش ئەگەر ماوەی ئیعتیکافەکە نوێژی فەرزی تێدەکەوت، وکەسەکەش لەوانە بو کە نوێژی کۆمەڵی لە سەر واجبە، چونکە ئیعتیکاف کردن لە مزگەوتێکدا نوێژی کۆمەڵی تێدا نەکرێت ئەبێتە مایەی نەکردنی نوێژی کۆمەڵ کە واجبە لە سەری، یا دەرچونی کەسەکە لە هەمو کاتێکدا، ئەمەش دژی مەبەستی ئیعتیکافە. بەڵام ئافرەت دروستە ئیعتیکاف بکات لە هەمو مزگەوتێك ئیتر جەماعەتی تێدا بکرێت یان نا. ئەمە ئەگەر لە ئیعتیکاف کردنی ئافرەتەکە فیتنەیەك نەدەکەوتەوە، ئەگەرنا ڕێگری لێ دەکرێت. باشتریشە ئەو مزگەوتەی ئیعتیکافی تێدا دەکرێت نوێژی هەینی تێدا بکرێت، بەڵام مەرج نیە بۆ ئیعتیکاف.

٥- **پاك بون لە حەدەسی گەورە:** جا دروست نیە کەسی لەش گران وئافرەتێك لە عادە یا زەیستانی بێت ئیعتیکاف بکات، چونکە دروست نیە ئەمانە لە مزگەوت بمێننەوە.

بەڵام ڕۆژو گرتن مەرج نیە بۆ ئیعتیکاف کردن، لەبەر ڕیوایەتەکەی ئیبن عومەر کە عومەر ﷺ وتی: ئەی پەیامبەر ﷺ! من لە سەردەمی نەفامیدا نەزرم کردوە کە شەوێك لە مزگەوتی حەرامدا ئیعتیکاف بکەم، فەرموی: «أُوْفِ بِنَذْرِكَ» «نەزرەکەت بە جێ بهێنە»(١). جا ئەگەر ڕۆژوگرتن مەرج بوایە ئەوا ئیعتیکافەکەی بە شەو دروست نەدەبو، چونکە ڕۆژو بە شەو ناگیرێت. هەروەها دو پەرستنی لێك جودان، بۆ ئەمەکەیان بونی ئەوەکەیان ناکرێتە مەرج.

---

(١) أخرجه البخاري (٢٠٣٢)، ومسلم (١٦٥٦).

## پرسی سێیەم: کاتی ئیعتیکاف وسوننەتەکانی وئەوەی حەڵاڵە بۆ کەسەکە:

١ - **ماوەی ئیعتیکاف وکاتەکەی:** مانەوە لە مزگەوت بۆ ماوەیەکی دیاری کراو پایەیەکە لە ئیعتیکاف، جا ئەگەر مانەوە لە مزگەوت ڕو نەدات ئیعتیکاف دانەمەزراوە، سەبارەت بە کەمترین ماوەی ئیعتیکاف کردنیش جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان. ئەوەشی ڕاستە -إن شاء الله- لای کەمی کاتی ئیعتیکاف کردن دیاری کراو نیە، بۆیە دروست ئەبێت بە بەشێکی کات یا کەمیش بێت، بەڵام ئەوەندە هەیە باشتر وایە ئیعتیکاف کردنەکە لە ڕۆژێك یا شەوێك کەمتر نەبێت، چونکە لە پەیامبەر ﷺ وهیچ کام لە هاوەڵانی نەهاتوە لەوە کەمتر ئیعتیکافی کردبێت.

باشترین کاتەکانی ئیعتیکاف کردنیش دە شەوی کۆتایی ڕەمەزانە، لەبەر فەرمودەکەی عائیشەی پێشو: «پەیامبەر ﷺ دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان ئیعتیکافی دەکرد تا وەفاتی کرد»، ئەگەر لە جگە لەم کاتەش ئیعتیکافی کرد دروستە بۆی، بەڵام پێچەوانەی باشترین وچاکترینە.

هەرکەسیش نیەتی ئیعتیکافی دە شەوی کۆتایی ڕەمەزانی هەبو، ئەوا نوێژی بەیانی بیست ویەکی ڕەمەزان لەو مزگەوتە دەکات کە ئیعتیکافی تێدا دەکات، پاشان دەڕواتە شوێنی ئیعتیکافەکەیەوە وبە ئاوابونی خۆری کۆتا ڕۆژی ڕەمەزان کۆتایی دێت.

٢ - **سوننەتەکانی:** ئیعتیکاف پەرستنێکە بەندە تێیدا لەگەڵ خوادا تەنها دەکەوێت، وپەیوەندیەکانی جگە لەوەی خوا هەموی دەپچڕێنێت، جا سوننەتە کەسەکە لێ ببڕێت بۆ پەرستن، جا زۆر ئەمانە دەکات: نوێژ وزیکر ودوعا وقورئان

خوێندن وتەوبە وداوای لێ خۆشبون وهاو شێوەکانی تری پەرستنەکان کە لە خوای نزیك دەکەنەوە.

٣- **ئەوەی حەڵاڵە بۆ ئیعتیکاف کار:** حەڵاڵیشە بۆی لە مزگەوت بڕواتە دەرەوە بۆ شتێك کە ناکرێت نەڕوا، وەك دەرچون بۆ خواردن وخواردنەوە، ئەگەر کەس نەبو بۆی بهێنێت، ودەرچون بۆ ئاو دەست، ودەست نوێژ گرتن بە هۆی دەست نوێژ شکاندنەوە، وخۆ شۆردن بە هۆی لەش گرانیەوە.

بۆشی حەڵاڵە بۆ شتی بە سود قسە بکات لەگەڵ خەڵکدا، وهەواڵیان بپرسێت، بەڵام بۆ شتی بێ سود ونا زەرور [وبێ پێویست]، ئەوە دژی مەبەستی ئیعتیکاف وئەو ئامانجەیە کە لە پێناویدا شەرع کراوە. هەروەها بۆی حەڵاڵە کەس ونزیکەکانی سەردانی بکەن وماوەیەك قسەی لەگەڵدا بکات ولە شوێنی ئیعتیکافەکەی بێتە دەرەوە بۆ بە ڕێ کردن وماڵ ئاوایی کردنیان، لەبەر فەرمودەکەی صەفیە ﵂ ئەڵێ: «كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مُعْتَكِفًا فَأَتَيْتُهُ أَزُورُهُ لَيْلًا فَحَدَّثْتُهُ ثُمَّ قُمْتُ فَانْقَلَبْتُ فَقَامَ مَعِي لِيَقْلِبَنِي» «پەیامبەر ﷺ لە ئعتیکافدا بو منیش چوم بۆ سەردان کردنی، قسەم لەگەڵ کرد، پاشان هەستام بگەڕێمەوە، ئەویش لەگەڵم دا هەستا بۆ ڕەد کردنەوەم بۆ ماڵ»(١).

هەروەها کەسەکە دەتوانێت بخوات وبخواتەوە وبخەوێت لە مزگەوتدا، لەگەڵ پارێزگاری کردن لە پاك وخوێنی مزگەوت.

(١) أخرجه البخاري (٢٠٣٥) [ولفظهم أشبه بـ(٢١٧٥)]، ومسلم (٢١٧٥).

## پرسی چوارەم: پوچەڵ کەرەوەکانی ئیعتیکاف:

ئیعتیکاف بەمانەی خوارەوە پوچەڵ دەبێتەوە:

**١ - دەرچونی بە ئەنقەست لە مزگەوت بێ هیچ پێویستیەك**، با کاتی دەرچونەکەشی کەم بێت: لەبەر فەرمودەکەی عائیشە ﵂: «وَكَانَ لَا يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلَّا لِحَاجَةٍ إِذَا كَانَ مُعْتَكِفًا» «وپەیامبەر ﷺ ئەگەر لە ئیعتیکاف بوایە نەدەهاتەوە ماڵ مەگەر بۆ پێویستی -میز وپیسی وەك زوهری ڕاویەکە وا لێکی دەداتەوە-»[1]، چونکە دەرچون دژی مانەوەیە کە پایەی ئیعتیکافە.

**٢ - جوت بون**، با بە شەو یا لە دەرەوەی مزگەوتیش بێت: لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنْتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ﴾ [البقرة: ١٨٧].

هەروەها لەو شتانەی حوکمی ئەمەی هەیە: ئاو هاتنەوە بە شەهوەتەوە بە بێ جوتبون وەك ئاو خۆ هێنانەوە، وچونە لای هاوژین با لە دەرەوەی دامێنیش بێت.

**٣ - نەمانی عەقڵ**: جا ئیعتیکاف بەتاڵ دەبێتەوە بە شێتی وسەر خۆشی؛ چونکە شێت وسەر خۆش لە ئەهلی پەرستن نین.

**٤ - سوڕی مانگانە وزەیستانی**: لەبەر ئەوەی دروست نیە ئافرەت لە عادە وزەیستانی لە مزگەوتدا بمێنێتەوە.

**٥ - هەڵ گەڕانەوە**: چونکە دژی پەرستنە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾ [الزمر: ٦٥].

---

(١) أخرجه البخاري (٢٠٢٩).

# پێنجەم: بەشی حەج

ولە حەوت دەروازە پێك هاتوە:

دەروازەی یەکەم: لە بارەی پێشەکیەکانی حەجەوە.

دەروازەی دوەم: لە بارەی پایەکانی حەج وپێویستیەکانیەوە.

دەروازەی سێیەم: لە بارەی قەدەغە کراوەکان وفیدیەدان وقوربانیەوە.

دەروازەی چوارەم: لە بارەی شێوازی حەج وعومرەوە.

دەروازەی پێنجەم: ئەو شوێنانەی دروستە سەردان بکرێت لە مەدینە

دەروازەی شەشەم: لە بارەی قوربانی کردنەوە.

دەروازەی حەوتەم: لە بارەی گوێزەبانە کردنەوە.

# دەروازەی یەکەم

# لە بارەی پێشەکیەکانی حەجەوە

چەند پرسێکی تێدایە:

## پرسی یەکەم: پێناسەی حەج:

حەج لە زماندا: بریتیە لە مەبەست. لە شەرعیشدا: بریتیە لە پەرستن کردن بۆ خوا لە شوێنێکی دیاری کراودا لە کاتێکی دیاریکراودا، وەك لە سوننەتی پەیامبەری خوا دا ﷺ هاتوە.

## پرسی دوەم: حوکمی حەج وفەزڵەکەی:

١- حوکمی حەج:

حەج پایەیەکە لە پایەکانی ئیسلام وفەرزە مەزنەکانی، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ﴾ [آل عمران:٩٧] «وخوای گەورە واجبی کردوە لە سەر توانادار لە هەر شیوێنێك بێت بەرەو ماڵی خوا بڕوات بۆ حەج، هەر کەسیش نکوڵی لە فەرزێتی حەج بکات ئەوە کوفری کردوە، خواش بێ نیازە بە حەجەکەیی وکردەوەکانیشی، بەڵکو بە سەرجەم دروست کراوەکانیشی». هەروەها خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ [البقرة: ١٩٦] «وحەج وعومرە بە جێ بگەیەنن بە تەواوی، بە نیەتی پاکەوە بۆ خوا»، ولەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] ئیبن عومەر رضي الله عنهما بەرزی دەکاتەوە: «ئیسلام لە سەر پێنج پایە دامەزراوە»، لەوانە باسی حەج دەکات.

ئوممەتیش کۆکن لە سەر ئەوەی واجبە توانا دار یەك جار لە تەمەنی دا حەج بکا.

## ٢- فەزڵەکەی:

لەبارەی فەزڵی حەجەوە زۆر فەرمودە هاتوە لەوانـە: فەرمودەکـەی ئـەبوهورەیرە ﷺ بەرزی دەکاتەوە: «الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلَّا الْجَنَّةَ» «عـومرە بـۆ عـومرە، سـڕێنەرەوەی تاوانـەکانی نێـوانی هـەر دوکیانە، وحەجی «دور لە تاوان» بەهەشت نەبێت هـیچ پاداشـتێکی تـری نیـە»[1]. هەروەها ﷺ ئەفەرموێ: «مَنْ حَجَّ لِلهِ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ» «کێ حەجی کرد بۆ خوا، جوت نەبو، تاوان وشتی نائەخلاقی نەکرد، ئـەوا وەك ڕۆژی لە دایك بونی دەگەڕێتەوە»[2]. تا کۆتایی فەرمودەکان.

## پرسی سێیەم: ئایا حەج پێویستە زیاتر لە جارێك بکرێت لە تەمەندا ؟

حەج لـە تەمەنـدا واجـب نیـە یـەکجار نـەبێت، زیـاتر لـەوە سـوننەتە، لەبـەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە، پەیامبەری خـوا فـەرموی: «أَيُّهَا النَّاسُ! قَدْ فَرَضَ اللهُ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ فَحُجُّوا» «ئەی خەڵکینە! خوا حەجی لە سەر فەرز کردون حەج بکـەن» پیاوێك وتی: ئەی پەیامبەری خوا! هەمو ساڵێك؟ ئەڵێ: ئەویش بێدەنگ بو، تا سێ جار پرسیاری لێ کردەوە، پاشان فەرموی: «لَوْ قُلْتُ: نَعَمْ، لَوَجَبَتْ، وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ» «ئەگەر بڵێم: بەڵێ، ئەوا واجب دەبێت، ئـەو کاتـەش نـاتوانن»[3]. هـەروەها لەبـەر ئەوەی پەیامبەر ﷺ دوای کۆچ کردنەکەی بۆ مەدینە جارێك زیاتر حەجی نەکردوە.

زانایانیش کۆکن لە سەر ئەوەی جارێك زیاتر حەج واجب نیە لە سەر توانادار.

---

(١) أخرجه مسلم (١٣٤٩).

(٢) أخرجه البخاري (١٥٢١)، ومسلم (١٣٥٠).

(٣) أخرجه مسلم (١٣٣٧).

کەوابو ئەبێت ئەگەر مەرجەکانی بەدی هات پەلە بکات لـە بـە جـێ گەیانـدنی، وتاوانی دەگات دوای بخات بە بێ عوزر، لەبـەر فـەرمودەی: «تَعَجَّلُوا إِلَى الْحَجِّ - يَعْنِي: الْفَرِيضَةَ- فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَا يَدْرِي مَا يَعْرِضُ لَهُ» «پەلە بکەن بـۆ حـەجکردن - مەبەستی فەرزەکەیە- چونکە نازانن چی دێتە پێشتان وتوشـی دێـن»[1]. هـەروەها گێڕانەوە هەیە لە وتەی پەیامبەر ﷺ، ولە وتـەی هاوەڵەکانیشـی -ڕیوایەتـەکانیش یەکتر بەهێز دەکەن- ئەفەرمون[2]: «مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَى الْحَجِّ سَبِيلًا وَلَمْ يَحُجَّ فَلْيَمُتْ إِنْ شَاءَ يَهُودِيًّا وَإِنْ شَاءَ نَصْرَانِيًّا» «کێ توانای حـەجی هـەبێت ونـەیکات، ئـەوا بـا بمرێت بە جولەکەیی ئەیەوێت یان بە گاوریی».

## پرسی چوارەم: مەرجەکانی حەج:

بۆ واجب بونی حەج ئەبێت پێنج مەرج هەبێت:

١- **ئیسلام:** جا حەج واجب نیە لە سەر بـێ بـاوەڕ وئەنجامیشـی بـدات دروسـت نابێت، چونکە ئیسلامەتی مەرجە بۆ ئەوەی پەرستنەکەی دروست بێت.

٢- **ژیری:** جا حەج پێویست نیە لە سەر شێت ولـەو کاتـەدا ئەنجامیشـی بـدات دروست نابێت، چونکە عەقڵ مەرجە بـۆ تـەکلیف لێکـردن، شـێتیش لـە تـەکلیف

(١) أخرجه أحمد (١/٣١٤)، وحسنه الألباني «الإرواء» (٩٩٠). «ما يعرض له»: أي ما يطرأ ويحدث له.

(٢) انظر: نيل الأوطار (٤/٣٣٧) [أخرجه بمعناه من طريق عبد الرحمن بن سابط عن أبي أمامة مرفوعًا: الدارميُّ (١٨٢٦) والبيهقي (٨٧٥٢). وعنه مرسلًا ابن أبي شيبة (١٤٦٦٥)، وفي سندهم ضعيفان: ليث بن سليم، وشريك بن عبد الله القاضي. وأخرجه عن علي مرفوعًا: الترمذي (٨١٢)، والبزار (٨٦٣) وأعلاه. وفي سندهما ضعيفان هلال بن عبد الله مولى ربيعة، والحارث بن عبد الله الأعور. أما موقوفًا فأخرج ابن أبي شيبة (١٤٦٧٠، ١٤٦٧١) عن عمر، ونسبه ابن كثيرُ (٢/ ٨٥) إلى أبي بكرٍ الإسماعيلي أيضًا، وصححه. وانظر: «التلخيص الحبير» (٩٥٨) فرجح بطرقه أن يكون للحديث أصلٌ ثم وجهه، وكذا فعل الشوكانيٍ].

لێکـراوان نیـە وقەڵەمیشـی لـە سـەر هـەڵگیراوە تـا هۆشـی دەێتـەوە، وەك لـە فەرمودەکەی [پێشوتری] عەلیدا ﷺ هاتبو پەیامبەری خوا ﷺ فـەرموی: «قەڵـەم هەڵ گیراوە لە سەر سیان: خەوتو تا هەڵ دەسێت، ومنداڵ تا پێ دەگات، شێتیش تـا عاقڵ دەبێت».

٣- **پێ گەیشتن:** جا حەج واجب نیە لە سـەر منـداڵ، چـونکە لـە تـەکلیف لـێ کراوان نیە وپێنوسیشی لە سەر هەڵ گیراوە تا باڵغ دەبێت، لەبەر فـەرمودەی پێشـو: «قەڵەم هەڵ گیراوە لە سەر سیان: ...»، بەڵام ئەگەر حەجی کرد حەجەکـەی دروسـت ئەبێت وکار بـە دەسـتەکەی نیـەتی بـۆ دەهێنێـت ئەگـەر جیاکـار نـەبو، جێگـەی حەجەکەی ئیسلامیشی بۆ ناگرێتەوە، بە بێ ڕا جیاوازی لـە نێـوان زانایـان، لەبـەر فەرمودەکەی ئیبن عەبباس ﷺ کە ئافرەتێك منداڵێکی بەرز کردۆتـەوە، وتویـەتی: ئەی پەیامبـەری خـوا! ئەمـە حـەجی بـۆ هەیـە؟ وتـی: «بـەڵێ، تـۆش پاداشـتت دەگات»[1]، ولەبەر فەرمودەکـەی پەیامبـەر ﷺ: «أَيُّمَا صَبِيٍّ حَجَّ ثُمَّ بَلَغَ الْحِنْثَ فَعَلَيْهِ أَنْ يَحُجَّ حَجَّةً أُخْرَى، [...] وَأَيُّمَا عَبْدٍ حَجَّ ثُمَّ أُعْتِقَ فَعَلَيْهِ حَجَّةٌ أُخْرَى» «هەر منداڵێك حەجی کرد، دوای کە پێگەیشت حـەجێکی تـری لـە سـەرە، وهـەر کۆیلەیەك حەجی کرد دوای کە ئازاد کرا حەجێکی تری لە سەرە»[2].

٤- **ئازادی:** جا حەج واجب نیە لە سەر کۆیلە، چونکە خـەڵك خاوەنیـەتی خـۆی خاوەنی هیچ نیە، بـەڵام ئەگـەر حـەج بکـات دروسـت ئـەبێت ئەگـەر بـە هیلانـی

(١) أخرجه مسلم (١٣٣٦).

(٢) أخرجه الشافعي في «مسنده» (٧٤٣) ترتيب السندي [وعنده موقوف على ابن عباس]، والبيهقي (١٧٩/٥) [هذا لفظه]. وصححه الشيخ الألباني في «الإرواء» (٩٨٦).

خاوەنەکەی بێت، زانایانیش کۆن لە سەر ئەوەی ئەگەر بەندە حەجی کرد لە کاتی کۆیلەتیدا، پاشان ئازاد کرا حەجێکی تری لە سەرە ئەگەر بۆی لوا، وحەجی کاتی کۆیلایەتیەکەی، حەجە فەرزەکەی لە سەر ناخات، لەبەر فەرمودەکەی پێشو: «وهەر کۆیلەیەك حەجی کرد دوای کە ئازاد کرا حەجێکی تری لە سەرە».

٥- **تواناداری:** لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾ [آل عمران:٩٧]، **جا** کەسێك توانای: ماددی نەبێت وەك ئەوەی توێشوی نەبێت بەس بێت بۆ خۆی وخانەوادەکەی، یا سواریەکی نەبێت بیگەیەنێت بە مەککە وبیگەڕێنێتەوە، یا توانای جەستەیی نەبێت وەك ئەوەی پیرێکی بە تەمەن، یا نەخۆش بێت، وناتوانێت لە سەر ئاژەڵ بوەستێت وبەرگەی ناڕەحەتی سەفەر بگرێت، یا ڕێگەی حەج کردن ئاسایشی تێدا نیە، وەك ئەوەی جەردە یا پەتای لێ بێت، جگە لەمانەش کە حاجی لە خۆی ومالّی مەترسی هەبێت، ئەو کاتە حەجی لە سەر واجب نیە تا ئەو کاتەی پێی دەکرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ [البقرة: ٢٨٦] توانا بونیش لەو «وُسْع»یە خوا باسی دەکات.

وله توانابون (الاسْتِطَاعَة)ی ئافرەتیش بۆ حەجی ئافرەت: بونی مەحرەمێکە لەگەڵیدا بێت، چونکە دروست نیە سەفەر بکات بە بێ مەحرەم ئیتر بۆ حج بێت یا جگە لە حەج، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تُسَافِرَ سَفَرًا يَكُونُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ فَصَاعِدًا إِلَّا وَمَعَهَا أَبُوهَا، أَوِ ابْنُهَا، أَوْ زَوْجُهَا، أَوْ أَخُوهَا، أَوْ ذُو مَحْرَمٍ مِنْهَا» «حەلاڵ نیە بۆ ئافرەتێك باوەڕی بە خوا وبە

ڕۆژی دوایی هەبێت سەفەرێك بکات سێ ڕۆژ بێت یا بەرەو سەرەوە مەگەر ئەبێت باوکی یا کوڕەکەی یا مێردەکەی یا براکەی یا مەحرەمێکی خۆی لەگەڵدا بێت»[1].

هەروەها لەبەر ئەوەی کابرایەك بە پەیامبەری ﷺ وت: ژنەکەم دەرچوە بۆ حەج ومنیش خۆم ناو نوس کردوە لە فلان غەزا-: «انْطَلِق فحُجّ معها» «بڕۆ لەگەڵ ئەودا حەج بکە»[2]. ئەگەریش حەجی کرد بە بێ مەحرەم، ئەوا حەجەکەی دروست ئەبێت بەڵام تاوان بارە.

## پرسی پێنجەم: حوکمی عومرە وبەڵگەکەی:

عومرە لە تەمەندا یەکجار واجبە لە سەر توانادار، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ [البقرة: ١٩٦]، ولەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ بۆ عائیشە ﵂ کە پرسیاری لێ کرد: ئایا ئافرەتان جیهادیان لە سەرە؟ فەرموی: «نَعَمْ، عَلَيْهِنَّ جِهَادٌ لَا قِتَالَ فِيهِ: الْحَجُّ وَالْعُمْرَةُ» «بەڵێ، جیهادێك شەڕی تێدا نیە: حەج وعومرە»[3]. هەروەها لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەری خوا ﷺ بۆ ئەبو ڕەزین ﵁ کاتێك پرسیاری لێ کرد کە: باوکی ناتوانێت نە حەج بکات نە عومرە، نە ڕێ بکات یا لە سەر ئاژەڵ ڕابوەستێت؟ فەرموی: «احْجُجْ عَنْ أَبِيكَ، وَاعْتَمِرْ» «حەج وعومرە بکە لە بری باوکت»[4].

---

(١) أخرجه مسلم (١٣٤٠).

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٨٦٢)، ومسلم (١٣٤١).

(٣) أخرجه أحمد (٦/١٦٥)، وابن ماجه (٢٩٠١)، والبيهقي (٤/٣٥٠)، وصححه الألباني في «الإرواء» (١١٨٥)، و«صحيح سنن ابن ماجه» (٢٣٦٢).

(٤) أخرجه أبو داود (١٨١٠)، والنسائي (٥/١١١)، وابن ماجه (٢٩٠٤، ٢٩٠٥)، وأحمد (١/٢٤٤)، وصححه الألباني «صحيح النسائي» (٢٤٧٣).

**وپایەکانی عومرەش سیانە:** ئیحرام کردن، تەواف کردن، سەفا ومەڕوا کردن.

## پرسی شەشەم: کات وشوێن «میقات»ـەکانی حەج وعومرە:

میقات لە زماندا: بریتیە لە سنور، لە شەرعیشدا بریتیە لە: شوێن یا کاتی پەرستن، کەواتە ئەبێتە دو بەشەوە: میقاتی کاتی، میقاتی شوێنی.

سەبارەت بە میقاتی کاتی حەج وعومرە:

**عومرە:** دروستە ئەنجام بدرێت لە هەمو کاتێکیساڵدا.

**حەجیش:** چەند مانگێکی دیاری کراوی هەیە وهیچ کارێکی حەج دروست نابێت مەگەر لەو مانگانەدا، لەبەر فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَعْلُومَاتٌ﴾ [البقرة:١٩٧] «کاتی حەج چەند مانگێکی دیاری کراوە». کە بریتیە لە مانگی شەوال، وزولقەعدە، وزولحیججە.

**سەبارەت بە میقاتی شوێنی حەج وعومرە:** بریتیە لەو سنورانەی کە دروست نیە حاجی وعومرەکار تێی پەڕێنێت مەگەر بە ئیحرامەوە، وەك پەیامبەر ﷺ ڕونی کردۆتەوە، ئەوەتا ئیبن عەبباس رضي الله عنهما ئەڵێ: «إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَقَّتَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلِأَهْلِ الشَّأْمِ الْجُحْفَةَ، وَلِأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنَ الْمَنَازِلِ، وَلِأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ، هُنَّ لَهُنَّ، وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِهِنَّ، مِمَّنْ أَرَادَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ فَمِنْ حَيْثُ أَنْشَأَ، حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ مِنْ مَكَّةَ» «پەیامبەر ﷺ میقاتەکانی بەم شێوازە دیاری کرد: زولحولەیفە بۆ خەڵکی مەدینەیە، جوحفەش بۆ خەڵکی شام، قەرن ئەلمەنازلیش بۆ خەڵکی نەجد، ویەلەملەم بۆ خەڵکی یەمەن، ئەمانە میقاتن بۆ ئەوانەی نیازی حەج وعومرەیان هەیە لە خەڵکی ئەو شوێنانە هەروەها بۆ ئەو کەسانەشی بەو شوێنانەدا دێن وخەڵکی ئەوێ نین، کێش لەوە نزیکتر بو ئەوا هەر لە

شوێنی خۆی ئیحرام دەکات، خەڵکی مەککەش هەر لە شوێنی خۆیان «مەککە»ەوە ئیحرام دەکەن»[1]. جا هەر کەس ئەم میقاتانەی تێپەڕاند بە بێ ئیحرام، واجبە لە سەری بگەڕێتەوە بۆی ئەگەر کرا، ئەگەریش نەکرا فیدیەی لە سەرە، ئەویش شەکێکە لە مەککە سەری دەبڕێت وبە سەر هەژارانی حەرەمدا دابەشی دەکات. ئەوەشی ماڵەکانی نزیکتر بو لە میقاتەکان ئەوا لە شوێنی خۆیانەوە ئیحرام دەکەن، لەبەر فەرمودەی پێشو: «کێش لەوە نزیکتر بو میقاتەکەی ئەو شوێنەیە ئیحرامی لێ دەکات».

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٥٢٤)، ومسلم (١١٨١). وفي لفظ: «وَمُهَلُّ أَهْلِ الْعِرَاقِ مِنْ ذَاتِ عِرْقٍ».

# دەروازەی دووەم

# لە بارەی پایە وواجبەکانی حەجەوە

دو پرسی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: پایەکانی حەج:

پایەکانی حەج چوارە، کە بریتیە لە:

١- **ئیحرامکردن:** واتە نیەت ومەبەستی حەج، چونکە حەج پەرستنێکی پەتیە بە بێ نیەت دروست نابێت بە کۆ دەنگی موسُڵمانان، بەڵگەی ئەمەش فەرمایشتەکەی [پێشوتری] پەیامبەرە ﷺ: «کردەوەکان بە نیەتە». نیەتیش شوێنەکەی دڵە، بەڵام بۆ حەج باشترە بە دەم بوترێت، وئەو عیبادەت (نسُك)ە دیاری بکات مەبەستیەتی، چونکە ئەمە لە کردەوەی پەیامبەرەوە ﷺ چەسپاوە.

٢- **مانەوە لە عەرەفە «الوقوف بعرفة»:** ئەمەش پایەیەکە بە کۆ دەنگ، بەڵگەکەشی فەرمایشتەکەی پەیامبەرە ﷺ: «الحَجُّ عَرَفَةُ» «حەج بریتیە لە عەرەفە»[1]، کاتی مانەوەش: لە دوای لادانی خۆرەوە لە نێو جەرگەی ئاسمان دەست پێدەکات تا دەرچونی سپێدە لە ڕۆژی جەژنی قوربان.

٣- **تەوافی سەردان «طواف الزيارة»:** پێشی دەوترێ تەوافی «الإفاضة» چونکە دوای گەڕانەوەی فراوانی بە قەرەبارغ دێت لە عەرەفەوە، پێشی دەوترێت تەوافی فەرز، ئەمەش ڕوکنە بە ئیجماع، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾ [الحج: ٢٩] «پاشان با حاجیان

(١) أخرجه الترمذي (٨٨٩)، وأبو داود (١٩٤٩)، والنسائي (٥/٢٥٦)، والحاكم في المستدرك (٢/٢٧٨) وصححه، والألباني في «صحيح النسائي» (٢٨٢٢).

ئەوەی ماوە لە نوسوکەکان تەواوی بکەن ولە ئیحرام تەواو بن، ئەمەش بە لادانی چڵکی لاشەیان وگرتنی نینۆکیان وتاشینی موەکانیان، ویا ئەوە جێ بەجێ بکەن کە لە سەر خۆیان پێویستیان کردوە لە حەج وعومرە وهەدی «قوربانی» ویا بشسورێنەوە بە دەوری ماڵە کۆنە ئازادکراوەکەدا، کە خوا ئازادی کردوە لە دەست زۆردارەکان کە ئەویش کەعبەیە».

٤- **ڕۆیشتن وهاتن لە نێوان سەفا ومەڕوا دا: ئەمەش پایەیەکە،** لەبەر وتەکەی عائیشە ﵂: «مَا أَتَمَّ اللهُ حَجَّ امْرِئٍ، وَلَا عُمْرَتَهُ لَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ» «خوا، نە حەج ونە عومرەی کەسێکی وەرنەگرتوە نەسورێتەوە لە نێوان سەفا ومەروە»[1]، هەروەها فەرمودەکەی پەیامبەرە ﷺ کە ئەفەرموێ: «اسْعَوْا فَإِنَّ اللهَ كَتَبَ عَلَيْكُمُ السَّعْيَ» «سەعی وکۆشش بکەن لە نێوان صەفا ومەڕوادا، چونکە خوا سەعی کردنی لە سەر نوسیون»[2].

جا بە بێ ئەم پایانە حەج تەواو نابێت، هەر کەسیش پایەیەکی نەکات حەجەکەی تەواو نابێت تا ئەنجامی دەدات.

## پرسی دووەم: واجبەکانی حەج:

١- **ئیحرامکردن لەو میقاتەوە** کە شەرع حسابی بۆ کردوە.

٢- **مانەوە لە عەرەفە تا شەو** بۆ کەسێك بە ڕۆژ هاتبێت، چونکە پەیامبەر ﷺ تا خۆر ئاوابون مایەوە -وەك لە چۆنێتی حەجەکەیدا دێت- وفەرموی: «خُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ» «پەرستنەکانی حەج لە منەوە وەربگرن»[3].

---

(١) أخرجه مسلم (١٢٧٧).

(٢) أخرجه أحمد (٦/٤٢١)، وابن خزيمة (٢٧٦٤)، والبيهقي (٥/٩٨)، وصححه الألباني.

(٣) [أخرجه مسلم (١٢٩٧)، واللفظ للبيهقي]

٣- **مانەوە لە موزدەلیفە** لە شەوی جەژنی قورباندا تا نیوە شەو، بـا پێشـتریش هاتبێت، چونکە پەیامبەر ﷺ وای کردوە.

٤- **مانەوە لە مینا** لە شەوانی تەشریقدا.

٥- **شەیتان ڕەجم کردن** بە شوێن یەکتردا.

٦- **سەر تاشین یا کورت کردنەوە**، لەبەر فەرمایشـتەکەی خـوا ﷻ: ﴿مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ﴾ [الفتح: ٢٧] «ئەڕۆنە بەیتەوە بە سـەر تاشـراوی یـا کـورت کراویەوە». هەروەها پەیامبەریش ﷺ وای کردوە وفەرمانیشی پێکردوە.

٧- **تەوافی ماڵ ئاوایی**، مەگەر ئافرەتێك لە سوڕی مانگانە یـا لـە زەیسـتانیدا بێت، لەبەر فەرمودەکەی ئـیبن عـەبباس ﷺ: «أُمِرَ النَّاسُ أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بِالْبَيْتِ، إِلَّا أَنَّهُ خُفِّفَ عَنِ الْمَرْأَةِ الْحَائِضِ» «فەرمان کرا بە خـەڵك کـە کۆتـا کـار وحاڵیان لەگەڵ بەیت بێت، ئەوەندە نەبێت سوك کرا لە سەر ئـافرەت کـە لـە سـوڕی مانگانەدا بێت»[1]. جا هەر کەس واز لە واجبێك بهێنێت بە ئەنقەست بێت یـان بـە بیرچونەوە ئەوا ئەبێت ئاژەڵێك سەر ببڕێت وحەجەکەی دروست ئەبێت، لەبەر ئـەوەی لە عەبدوڵای کوڕی عەبباسەوە چەسپاوە ﷺ وتویەتی: «مَنْ نَسِيَ مِنْ نُسُكِهِ شَيْئًا أَوْ تَرَكَهُ فَلْيُهْرِقْ دَمًا» «هەر کەس پەرستنێك لەوانەی حەجی لە بیر چو یان نەیکرد ئـەوا با ئاژەڵ سەر ببڕێت»[2].

جگە لەم کارانەی باس کرا، سوننەتە.

---

(١) أخرجه البخاري (١٧٥٥).

(٢) أخرجه الدارقطني (١٩١/٢) (٢٥١٢)، والبيهقي (١٥٢/٥) وغيرهما [كمالك والأولى نسبته إليه لأنه أقدم بل البيهقي رواه عنه ونسب الشك إليه، مع أن الشك عند مالك من أيوب بن أبي تميمة]، وهو ثابت عن ابن عباس من قوله، كما قال ابن عبد البر «الاستذكار» (١٨٤/١٢) والألباني «الإرواء» (٢٩٩/٤).

## گرنگترین ئەو سوننەتانەی حەجیش:

١- **خۆ شۆردن بۆ ئیحرام کردن** وبۆن لە خۆدان وپۆشینی دو پۆشاکی سپی.

٢- **نینۆك گرتن** ولابردنی موی بەر وبن باڵ، وشوارب کورت کردنەوە وئەوەی ئەبێت لا ببرێت.

٣- **تەواف کردنی هاتن «القدوم»** بۆ کەسێك **نیەتی حەجی تەنهای هەبێ «المُفْرِد»** یا نیەتی حەج وعومرەی پێکەوە هەبێت به بێ خۆکردنەوە لە ئیحرام «القَارِن».

٤- **ڕا کردنی لە سەر خۆ «الرَّمَل»** تا سێیەم سوڕانەوە لە تەوافی هاتن.

٥- **«الاِضْطِبَاع» کردن** لە تەوافی هاتن، ئەمەش ئەوەیە: ناوەڕاستی دەست ماڵەکەی بخاتە ژێر شانی ڕاستی وهەردو دیوەکەشی بخاتە سەر شانی چەپی.

٦- **مانەوە لە مینا** لە شەوی عەرەفەدا.

٧- **وتنی «لبیك اللهم لبیك...»**: هەر لە ئیحرام کردنەوە تا شەیتان ڕەجمی عەقەبە.

٨- **کۆکردنەوەی نێوان نوێژی** ئێوارە وعیشا لە موزدەلیفە بە پێشخستن.

٩- **مانەوە لە موزدەلیفە** لە ناوچەی مەشعەری حەرام هەر لە سپێدەوە تا خۆر هەڵاتن ئەگەر کرا، ئەگەرنا موزدەلیفە هەر هەموی دروستە بۆ مانەوە.

# دەروازەی سێیەم

## لە بارەی قەدەغە کراوەکان وفیدیە دان وقوربانی یەوە

## «فِي الْمَحْظُورَاتِ والفِدْيَةِ وَالْهَدْي»

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

**پرسی یەکەم: قەدەغە کراوەکانی ئیحرامەوە:**

کە بریتیە لەو شتانەی قەدەغەیە لە سەر کەسێك لە ئیحرامدا بیکات:

١- **پۆشینی دوراو «الْمَخِيط»**: ئەوەیە پۆشاکەکە بە گوێرەی قەد وجەستە یا ئەندامەکە برِا بێت «الْمُفَصَّل»، وەك شەروالٌ وپۆشاك وجگە لەمانەش مەگەر یەکێك پشتە مالٌ «إزار»ێکی دەست نەکەوێت ئەوا دروستە بۆی شەروالٌ بپۆشێت، ئەم رِێگری لیٚ کراوەش تایبەتە بە پیاوانەوە، بەلاٌم ئافرەت کام پۆشاکەی بوێت دەیپۆشێت جگە لە نیقاب ودەستکێش، وەك دواتر دێت.

٢- **بەکارهێنانی بۆن بۆ لاشەی وپۆشاکەکەی**، هەروەها بە ئەنقەست بۆن هەلٌ بمژێت، بەلاٌم دروستە بۆنی شتە بۆن خۆشەکان بکات لە رِوەکەکانی زەوی، هەروەها چاو رِەشتن بەو شتانەی بۆنی پێوە نیە.

٣- **لادانی مو ونینۆك**، نێر بێت یان مێ، هەروەها بۆی هەیە بە نەرمی سەری بشوات، ئەگەریش نینۆکی شکا دروستە برك (فرِیٚ)ی بدات.

٤- **داپۆشینی سەری پیاو** بە شتێك پێوەی بنوسێت، بۆشی هەیە بچێتە ژێر چادر وهاوشێوەکانی وەك دار. هەروەها بۆی هەیە چەتر بەکار بهێنێت لە کاتی پێویستیدا.

ئافرەتیش ڕێ گری لێ کراوە دەم وچاوی داپۆشێت بە شتێك بە گوێرەی دەم وچاوی بێت وەك نیقاب وڕوو پۆش «البرقع»، وپێویستە لە سەری ئەگەر پیاوی بێگانە هەبو بە تارا دەم وچاوی داپۆشێت، هەروەها قەدەغەیە دەست کێش لە دەست بکات. بۆشی هەیە هەر پۆشاکێك بپۆشێت کە بۆی گونجاوە.

جا هەر کەس بۆنی لە خۆی دا یا سەری داپۆشی یا مەخیتی لەبەر کرد بە نەزانی یان لە بیر چونەوە یان بە زۆر، هیچی لە سەر نیە، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «إِنَّ اللهَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ» «خوای گەورە، تاوانی بە هەڵە وبە لە بیر چونەوە وبە زۆر لێ کردنی لە سەر ئوممەتەکەم لاداوە»[1].

٥- **گرێ بەستی هاوسەرێتی** بۆ خۆی وجگە لە خۆیشی.

٦- **خستنە دامێن «الوَطء في الفرج»**، ئەمەش هەڵوەشێنەرەوەی حەجە ئەگەر پێش خۆکردنەوەی یەکەم بێت لە ئیحرام (التَّحَلُّل الأَوَّل)، با دوای وەستانیش بێت لە عەرەفە.

٧- **چونە لا «المباشَرة»** بە بێ خستنە دامێن، حەجەکە هەڵ ناوەشێتەوە، هەروەها ماچ کردن ودەست بازی ونەزەر کردن بە ئارەزووەوە.

٨- **کوشتنی نێچیر وڕاو کردنی**، دروستیشە بۆی ئەو ئاژەڵە لە سنور دەرچوانە بکوژێت کە پەیامبەر ﷺ فەرمانی کردوە بە کوشتنی لە حەرەم ودەرەوەی حەرەم دا، بۆ کەسێك لە ئیحرامدا بێت وجگە لەویش، کە بریتیە لە: قەڵە ڕەش، ومشك، وکولاژدم، وکۆلارە، ومار وسەگ وسەگی هار. دروستیش نیە یارمەتیدەر بێت بۆ

(١) أخرجه ابن ماجه (٢٠٤٥) واللفظ له، والحاكم في المستدرك (١٩٨/٢)، وصححه وأقره الذهبي، وصححه الألباني في «صحيح ابن ماجه».

کوشتنی نێچیر، نە بە ئاماژە نە بە جگە لەوەش، هەروەها دروست نیە لەوە بخوات کە لە پێناو ئەو دا ڕاو کرا بێت.

٩- **هەروەها دروست نیە** نە بۆ کەسێك لە ئیحرامدا بێت نە بۆ جگە لەوەش داری حەرەم یا ڕووەکە تەڕە بێ ئازارەکانی ببڕێت، بەڵام دروستە لقە بە ئازارەکانی سەر ڕێگا ببڕێت. لە دارەکانی حەرەمیش تەنها داری ئیزخەر ومرۆڤ ڕسکەکان هەڵاوێر کراوە بە کۆ دەنگی.

## پرسی دووەم: فیدیەی ڕێگری لێ کراوەکان:

- **سەبارەت بە:** موتاشین، ونینۆکگرتن وپۆشینی دوراو، وبۆن لە خۆدان، سەر دا پۆشین، ئاو هێنانەوە بە تەماشاکردن، وچونەلا بە بێ ئاو هاتنەوە: لە فیدیەدانی ئەمانەدا سەر پشکە لە نێوان ئەم سیانەدا:

١- سێ ڕۆژ ڕۆژو گرتن.

٢- یا خواردندان بە شەش هەژار.

٣- یا سەر بڕینی شەکێك.

لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ بۆ کەعبی کوڕی عوجرە کە ئەسپێکانی سەری ئازاریان دا[1]: «احْلِقْ رَأْسَكَ، وَصُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، أَوْ أَطْعِمْ سِتَّةَ مَسَاكِينَ، أَوِ انْسُكْ بِشَاةٍ» «سەرت بتاشە وسێ ڕۆژ ڕۆژی بگرە، یا نانی شەش هەژار بدە، یا شەکێك سەر ببڕە». کارەکانی تریش قیاس کراوەتەوە سەر ئەمە، چونکە بە ئیحرامکردن حەرام دەبێت، وحەج بەتاڵ ناکاتەوە.

---

(١) أخرجه البخاري (١٨١٥)، ومسلم (١٢٠١).

**- سەبارەت بە کوشتنی نێچیر:** کەسەکە سەر پشك دەکرێت لە نێوان سەر بڕینی هاو وێنەیەکی ئەو ئاژەڵە لە مەڕ ومالآت، یان هەڵسەنگاندنی هاوشێوەکەی بە گوێرەی شوێنی تیاچونەکە، وبە نرخەکەی خواردنێك دەکڕێت کە لە فیدیەی ڕۆژو نەگرتندا لە سەری دەکەوێت، بە هەر هەژارێك گویلێك لە گەنم، لە غەیرە گەنمیش وەك خورما وجۆ دو گوێل دەبەخشێت، یا لە بری ناندانی هەر هەژارێك ڕۆژێك ڕۆژو دەگرێت، لەبەر ئایەتی: ﴿وَمَنْ قَتَلَهُ مِنْكُمْ مُتَعَمِّدًا فَجَزَاءٌ مِثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَلِكَ صِيَامًا﴾ [المائدة: ٩٥] «وهەر کەس ڕاوی هەر ئاژەڵێکی وشکانی بکات بە ئەنقەست، ئەوا پاداشتەکەی ئەوەیە: ئەبێت هاوشێوەی ئەو نێچیرە سەر ببڕێت لە مەڕ ومالآت کە تەنها وشتر ومانگا ومەڕو بزن دەگرێتەوە، دوای ئەوەی دو کەسی دادگەر دەیخەملێنن، وئەبێت بیبەخشێتە هەژارانی حەرەم، یان بە نرخی هاوشێوەکەی خواردن بکڕێت وبیبەخشێتە هەژارانی حەرەم، یان لە جیاتی ئەمە لە بری هەر هەژارێك ڕۆژێك ڕۆژو بگرێت».

**- سەبارەت بە خستنە دامێن لە حەجدا پێش خۆ لە ئیحرام کردنەوەی یەکەم،** ئەوە حەج بەتاڵ دەکاتەوە وشترێکیش پێویست دەکات، ئیتر بە نەزانی بێت یا لە بیر چونەوە یا بە زۆر پێی کرا بێ، بەڵام ئەگەر کەوتە دوای لە ئیحرامکردنەوەی یەکەمەوە ئەوا حەج پوچەڵ ناکاتەوە وشەکێك پێویست دەکات. **سەبارەت بە** هاتنەوەی ئاو بە هۆی چونەلا یا ئاو خۆ هێنانەوە یا دەست پێوەدان بە شەهوەتەوە، یا دوبارەکردنەوەی نەزەر: ئەوا حەرامە، بەڵام حەج بەتاڵ ناکاتەوە، ئەگەریش پێش لە ئیحرام کردنەوەی یەکەم ڕویدا خوێنی دەکەوێتە سەر.

- **سەبارەت بە گرێ بەستی هاوسەرێتی:** ئەوا هیچ فیدیەكی لـە سـەر پێویسـت نابێت، تەنها گرێ بەستەكە هەڵدەوەشێتەوە.

- **سەبارەت بە بڕینی داری حەرەم وئەو ڕوەكەی كە خوا ڕسكە:** داری بچوك لـە ڕوی نەریتەوە بە شەك بەرانێك زەمانەت دەكرێت، گەورەتر بو بە مانگایـەك، بـەڵام ڕوەك وگەڵا، بە نرخەكەی دادەنرێت چونكە نرخی هەیە «متقومٌ».

## پرسی سێیەم: لە بارەی هەدی (الْهَدْي) وحوكمەكانیەوە:

قوربانی «الْهَدْي»: بریتیە لەوەی بە دیاری وهەدیە دەبەخشـرێتە مـاڵی خـوا لـە مەڕ ومالآت (وشتر ومانگا ومەڕ وبزن) بە مەبەستی نزیك بونەوە لە خوا.

### جۆرەكانی قوربانی:

١- **قوربانی حەجی** «التَّمَتُّع» و«القِران»: ئەمەش واجبە لە سەر هـەمو كەسـێك كە نیشتەجێی خاكی حەرەم نەبێت، كە بریتیە لە سەر بـڕینی پەرسـتن نـەك بـریتی وتەعویز، لەبەر فەرمایشتەكەی پەروەردگار ﷻ: ﴿[فَإِذَا أَمِنْتُمْ] فَمَنْ تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ [البقرة: ١٩٦]. «ئەگـەریش لـە ئاسـایش وتەندروستی دا بون: كێ حەجەكەی تەمەتوع بو، دوای تەواوبونی عومرەكەی چـێژی وەرگرت تا كات حەج، ئەمەش بە حەڵاڵ بونی ئەوەی پێشتر لە سەری حەرام بوە بـە هۆی ئیحرامەوە، ئەوا پێویستە لە سەری قوربانیەك بكات بـە گـوێرەی بـۆ كـران».

**ئەگەریش نە قوربانی هـەبو نـە نرخەكـەی** سـێ ڕۆژ لـە حەجـدا ڕۆژو دەگرێـت، دروستیشە لە ڕۆژانی تەشریقدا بیگرێتەوە، هەروەها لەگـەڵ حـەوت ڕۆژی تـردا كـە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. لەبەر فەرمایشتەكەی خـوا ﷻ: ﴿فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ﴾ [البقرة: ١٩٦] «كێش قوربانیـەكی نـەبو سـەڕی

ببڕێت ئەوا لە سەریەتی سێ ڕۆژ ڕۆژو بگرێت لە مانگەكانی حەجدا، لەگەڵ حەوت ڕۆژی تر دەیگرێت دوای تەواوبونی پەرستنەكانی حەج وگەڕانەوە بۆ شوێنی خۆی».

**سوننەتیشە حاجی لە گۆشتی قوربانی** «التمتع» و«القِران» **بخوات**، لەبەر ئایەتی: ﴿فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْقَانِعَ وَالْمُعْتَرَّ﴾ [الحج: ٣٦]. «جا بخۆن لەو سەر براوانە ولێشی ببەخشن بەو هەژارانەی كە زۆر نەدارن».

٢- **قوربانی قەرەبو**: بریتیە لە فیدیەی واجب لەبەر نەكردنی واجبێك، یا كردنی قەدەغەكراوێك لە قەدەغەكراوەكانی ئیحرام، یا بەهۆی ڕێگری لێكردنەوە «الإحصار» ئەگەر هۆكارەكەی هەبو، لە بەر فەرمایشتی: ﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ [البقرة: ١٩٦]، «ئەگەر لە ئیحرام بون ڕێگری هاتە پێشتان لە تەواوكردنی حەج وعومرە وەك دوژمن ونەخۆشی، ئەوا پێویستە لە سەرتان ئاژەڵێك سەر ببڕن لە وشتر ومانگا ومەڕ وبزن، بۆ ئەوەی لە ئیحرامەكەتان دەربچن»، ولەبەر وتەكەی [پێشتری] ئیبن عەبباس: «هەر كەس پەرستنێكی حەجی لە بیر چو یان نەیكرد با لە جیاتی ئەوە ئاژەڵ سەر ببڕێت».

ئەم جۆرەش دروست نیە لێی بخورێت، ودەبەخشرێتەوە بە سەر هەژارانی حەرەمدا.

٣- **قوربانی سوننەت**: ئەمەش سوننەتە بۆ هەمو حاجی وعومرەكارێك، وەك شوێنكەوتنی پەیامبەر ﷺ، چونكە ئەو سەد وشتری كردە قوربانی لە حەجی ماڵ ئاویی دا.

سوننەتیشە لێی بخورێت، چونکە پەیامبەر ﷺ فەرمانی کرد لە هەر وشترێك پارچەیەکی لێ بنرێت، ئەوەبو لێی خوارد، ولە مەرگەکەشی خواردەوە[1].

ئەوانەشی لە ئیحرام دا نین دروستە هەدی وقوربانی بنێرێن بۆ مەککە تا لەوێ سەر ببڕدرێت، بۆ نزیکبونەوە لە خوا، وهیچ لەو شتانەی لە سەر قەدەغە نابێت کە لە سەر ئیحرامکەر قەدەغەیە.

٤- **قوربانی نەزر:** بریتیە لەوەی حاجی وەکو نەزر دەیکات لەلای بەیت بۆ نزیکبونەوە لە خوا، وپێویستە ئەم نەزرە بە جێ بهێنرێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ﴾ [الحج:٢٩].

## کاتی سەر بڕینی قوربانی:

قوربانی «التمتع» و«القِرَان»، کاتەکەی لە دوای نوێژی جەژنی ڕۆژی جەژنەوە دەست پێدەکات تا کۆتایی ڕۆژانی تەشریق. سەبارەت بە سەر بڕینی فیدیەی بونی ئازار وپۆشین، ئەوا لەگەڵ کردنەکەیەتی، هەروەها فیدیەی واجب لەبەر نەکردنی واجبێك. بەڵام خوێنی ڕێگری لێ کردن «الإحصار» کەی هۆکارەکەی بەدی هات دەکرێت، کە یان شەکێکە یا یەك لە حەوتی وشترێك یا حەوت یەکی مانگایەك، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ [البقرة: ١٩٦].

### شوێنی سەر بڕینەکەی:

**هەروەها قوربانی تەمەتتوع وقیان:** سوننەت وایە لە مینا سەری ببڕێت، ئەگەریش لە هەر بەشێکی حەرەم سەری ببڕێت لە سەری دەکەوێت.

---

(١) أخرجه مسلم (١٢١٨).

بە هەمان شێوە فیدیەی نەکردنی واجب وکردنی قەدەغە کراوەکان، سەر نابڕدرێت مەگەر لە حەرەمدا، جگە لە قوربانی «الإحصار» ئەوە لە شوێنەکەی خۆیدا سەری دەبڕێت. بەڵام ڕۆژوگرتن لە هەمو شوێنێك لە سەری دەکەوێت. سوننەتیشە سێ ڕۆژ لە حەج دا بگرێت وحەوتیش کە گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، لەبەر فەمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَإِذَا أَمِنْتُمْ فَمَنْ تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ﴾ [البقرة: ١٩٦].

سوننەتیشە حاجی بە دەستی خۆی سەری ببڕێت، ئەگەریش کەسێکی لە جێی خۆی دانا هیچی تێدا نیە، سوننەتیشە لە کاتی سەر بڕینەکەدا بڵێت(١): «بسم الله، اللهم هذا منك ولك» «بەناوی خوا، خوایە! ئەمە لە تۆوەیە وبۆ تۆشە».

## سەبارەت بە مەرجەکانی هەدی کردن:

خودی هەمان مەرجەکانی قوربانیە:

١- **ئەبێت لەمانە بێت:** وشتر ومانگا ومەڕ وبزن.

٢- **ئەبێت ئەو عەیبانەی تێدا نەبێت کە ناهێڵێت لە سەرت بکەوێت** وەك نەخۆشی وکوێری وشەلی ولەڕی [ڕون وئاشکرا].

٣- **ئەبێت تەمەنی ڕێگەپێدراو بێت** بۆ وشتر پێنج ساڵ، بۆ مانگا دو ساڵ، وبۆ بزن ساڵێك، وبۆ مەڕ شەش مانگ.

---

(١) [جزء حديث أخرجه أبو داود (٢٧٩٥)، وابن ماجه (٣١٢١)، ابن خزيمة (٢٨٩٩)، والحاكم (٤٦٧/١) ومن طريقه البيهقي (٢٨٧/٩). والدارمي (١٩٨٩). وانظر: «الإرواء» (٣٥٠/٤) (١١٣٨)].

# دەروازەی چوارەم

# لە بارەی چۆنیەتی حەج وعومرە کردنەوە

بنەما لای زانایان لەمەڕ چۆنێتی حەجەوە فەرمودە بەناوبانگەکەی جابرە ﵁[1].

جا بە دواداچون «تَتبّع»مان کرد بۆ سەرجەم ڕیوایەتە صەحیحە چەسپاوەکان لە پەیامبەرەوە ﷺ، لە کۆی هەموی ئەم شێوازەی خوارەوەمان بۆ پوخت بویەوە:

ئەوەی مەبەستی حەج یان عومرە (مَنَاسك)ە، کە گەیشتە میقات سوننەتە خۆی بشوات، وئەو موانە لا بدات کە پێویستی بە لابردنە، لەوانەی دروستە لا ببرێن، وەك موی بن باڵ وبەر وسمێڵ، ونینۆکیشی دەگرێت، وپۆشاکی دووراو (مَخِيط)یش دادەکەنێت ئەگەر پیاو بو، پێش نیەت هێنانی چونە ئیحرامەوە بۆن لە خۆی دەدات، وپیاو دەستماڵ وسەر شانێکی خاوێنی سپی دەپۆشێت. بەڵام ئافرەت لە هەر پۆشاکێك بیەوێت ئیحرام دەکات. وپیاو شانەکانی بە سەر شان (رِدَاء)ەکەی دا دەپۆشێت، ئیتر ئیحرام دەکات بەو نوسوکەی دەیەوێت. باشتریشە ئیحرامکردنەکەی ئەو کاتە بێت کە دەچێتە سەر ئاژەڵەکەی. ئەگەریش کەسەکە ترسا ڕێگرێك بێتە پێشی نەهێڵێ نوسوکەکەی تەواو بکات وەك نەخۆشی وجەردە وهاوشێوەکانی ئەو کاتە مەرج دەگرێت وئەڵێ: «اللَّهُمَّ مَحِلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي» «خوایە شوێن وکاتی دەرچونم لە حەج وکەوتنە حەلاڵیەوە ئەو کات وشوێنەیە تۆ نەهێڵی وبمگریەوە».

باشتریشە «یستحب» لە کاتی ئیحرامکردندا ڕو لە قیبلە بکات وبڵێت: «اللَّهُمَّ هَذِهِ حَجَّةٌ لَا رِيَاءَ فِيهَا وَلَا سُمْعَةَ» وشەرعیشە لە کاتی لەببەیك کردندا بڵێ:

---

(١) أخرجه مسلم (١٢١٦).

«لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ» «وەڵامتم دایەوە دوای وەڵامدانەوە خوایە، وەڵامتم دایەوە وبە دەم بانگەوازەکەوە هاتم، وەڵامم دایەوە وبەردەوامم لە وەڵامدانەوە ئەی بێ شەریك وهاوبەش، گوێڕایەڵی فەرمانتم، ستایش ونیعمەت وبەخشش وموڵك ودەسەڵات هەموی هی تۆیە وبۆ تۆیە، هیچ شەریك وهاوبەشێکت نیە». هاوەڵانیش لەگەڵ ئەوەدا ئەمەشیان دەوت: «لَبَّيْكَ ذَا الْمَعَارِجِ وَلَبَّيْكَ ذَا الْفَوَاضِلِ» «وەڵامی بەردەوامتم دایەوە ئەی خاوەنی بەرزی ومەزنی وشکۆمەندی، وەڵامتم دایەوە دوای وەڵامدانەوە ئەی خاوەن نیعمەت وبەخششە زۆرەکان».

سوننەتیشە لە لەببەیەك کردندا دەنگی بەرز بکاتەوە. کە گەیشتە مەککە سوننەتە خۆی بشوات، کە ویستیشی تەواف بکات ئەگەر پیاو بو «اضطباع» دەکات بەوەی شانی ڕاستی بخاتە دەر، وشانی چەپی بە سەر شانەکەی دا بپۆشێت. مەرجیشە لە کاتی تەواف کردندا بە دەست نوێژ بێت. سوننەتیشە دەست بدات بە بەردە ڕەشەکەوە وماچی بکات، ئەگەریش پێی نەکرا دەستی پێوە دەدات ودەستی ماچ دەکات، ئەوەشی پێ نەکرا بە دەست ئاماژەی بۆ دەکات وماچی ناکات، ئەمە لە هەمو سوڕاوەنەوەیەکدا دوبارە دەکاتەوە، هەمو سوڕانەوەیەکیش بە تەکبیر دەست پێدەکات، ئەگەر بە «بسم الله» و«الله أكبر»یش دەستی پێ کرد چاکە. کە گەیشتە سوچە یەمەنیەکە «الركن اليماني» دەستی پێوە دەدات وماچی ناکات، ئەگەر ئەمەی پێ نەکرا نە ئاماژەی بۆ دەکات نە تەکبیر، ولە نێوان هەر دو سوچەکەدا - کە سوچی بەردە ڕەشەکە وسوچە یەمەنیەکەیە- ئەڵێت: ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ [البقرة:٢٠١]، «پەروەردگارا بێوەیی وڕۆزی وزانستی بە سود وکردەوەی چاك وجگە لەمانەشمان پێ ببەخشە لە شتە دینی

وژینیەکان، لە دوارۆژیشدا بەهەشتمان پێ کەرەم بکە، وسزای ئاگرمان لێ دور بخەرەوە». لە باقیەکەی دا دەپارێتەوە بەوەی حەز دەکات، وسوننەتیشە بە وردە ڕا (الرَّمَل) -سەروی ڕێ کردن وخوار ڕا کردن- سێ سوڕانەوەی یەکەم ئەنجام بدات، وچوارەکەی تریش بە ڕێکردن بیکات، کە حەوتەکەی تەواو کرد بە سەر شانەکەی شانی دا دەپۆشێتەوە، پاشان دەڕوات بۆ لای مەقامی ئیبراهیم وئەمە دەخوێنێت: ﴿وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾ [البقرة:١٢٥] «وتمان: لە مەقامی ئیبراهیم دا شوێنێك تەرخان بکەن بۆ نوێژ کردن تێیدا، کە بریتیە لەو بەردەی ئیبراهیم لە سەری ڕاوەستاوە لە کاتی بونیاد نانی کەعبە دا». ودو ڕکات نوێژ لە پشت مەقامەوە دەکات، لە ڕکاتی یەکەم دا سورەتی «الكافرون» دەخوێنێت ولە دوەمیشدا «الإخلاص»، ئەگەریش نەیتوانی لەوێ نوێژ بکات -لەبەر قەرەباڵغی وهاوشێوەکانی- ئەوا لە هەر شوێنێکی تری مزگەوتەکە بۆی کرا نوێژ دەکات، ئەم تەوافەش بریتیە لە: تەوافی هاتن (القُدوم) بۆ موفرید وقارین، وتەوافی عومرە بۆ موتەمەتیع. دوای ئەوە شەرعیە بۆی لە ئاوی زەمزەم بخواتەوە ولێی بکات بە سەریدا، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ بەردە ڕەشەکە ئەگەر کرا دەستی پێوە دەدات. ئینجا دەچێت بۆ سەفا ومەڕوە وئەم ئایەتە دەخوێنێت: ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ﴾ [البقرة: ١٥٨] «سەفا ومەڕوە -کە دو کێوی بچوکن لە نزیك کەعبە لە دیوی ڕۆژهەڵاتەوە- لە دروشمە دیار وئاشکراکانی دینی خوایە کە داوا لە خەڵك کراوە سەعی بکات لە نێوانیاندا»، ئینجا دەڕواتە سەر کێوی سەفا تا بەیت دەبینێت ورو دەکاتە قیبلە ودەستەکانی بەرز دەکاتەوە، وسێ جار تەکبیر دەکات وئەڵێ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ» «هیچ

پەرستراوێکی هەق نیە مەگەر خوا، تاك وبێ شەریکە، خاوەنی موڵك وستایشە، وهەر خۆی توانای هەیە بە سەر هەمو شتێکدا، هیچ پەرستراوێکی هەق نیە مەگەر خوا، تاك وتەنهایە، بەڵێنی خۆی بە جێهێنا، وبەندەکەی خۆی سەر خست، گروپەکانی هەمو بە تەنها لە ناوبرد» ئەمە سێ جار دەکات ولە نێوان هەر دو جارێکدا دوعای زۆر دەکات، پاشان دادەبەزێت بە پیادە دەڕوات بۆ مەڕوە، ولە نێوان هەر دو نیشانە سەوزەکەدا بە خێرا ڕا دەکات، ئەمەش بۆ پیاوانە نەك ئافرەتان، پاشان ڕێ دەکات تا دەچێتە سەر مەڕوە، ئەوەی لە سەر سەفا کردی لێرەش دەیکات، ئەمەش ئەبێتە یەك فڕە ودەست «شوط»، ئینجا لە مەڕوەوە بۆ سەفا شەوتێکی ترە تا هەر حەوت سەعیەکە کۆتایی پێ دێت، ئەمەش بۆ حەجی موفرید وقارین سەعی حەجە وبۆی نیە دوای ئەمە خۆی لە ئیحرام بکاتەوە، بەڵکو هەر لە ئیحرام دەمێنێتەوە، وبۆ حەجی تەمەتتوعیش سەعی عومرەیە.

وحاجی موتەمەتتیع دوای عومرەکەی، خۆی لە ئیحرام دەکاتەوە بە کورت کردنەوەی قژی، وئیتر جل وبەرگەکانی خۆی لەبەر دەکاتەوە تا ڕۆژی «التَّرْوِيَة» -کە ئەکاتە هەشتی زو ئەلحیججە-، سەبارەت بە حاجی موتەمەتتیع ئەو هەر لە شوێنەکەی خۆیەوە ئیحرام دەکات، بە هەمان شێوە نیشتەجێیانی مەککە ودەوروبەری. وسوننەتە دیسانەوە ئەوە بکات کە لە کاتی میقاتدا کردی لە خۆشۆردن وبۆن لە خۆدان وخۆپاککردنەوە. وسەرجەم حاجیان بە دەم لەببەیك کردنەوە بەرەو مینا دەکەونە ڕێ، ولە میناداا نوێژی نیوەڕۆ وعەسر وئێوارە وعیشا وبەیانی دەکەن بە کورتکردنەوەی چواریەکان بە بێ کۆکردنەوە، پاشان لە بەرەبەیانی ڕۆژی نۆیەمدا حاجی دەکەوێتە ڕێ بەرەو عەرەفە، ئەگەر توانی لە «نەمیرە» لا بدات تا لادانی خۆر لە جەرگەی ئاسمان ئەوا چاکە. کە خۆر لایدا پێشەوا یا جێگرەکەی وتارێکی

کورت پێشکەش دەکات، ئینجا نوێژی نیوەڕۆ وعەسر بە کۆکردنـەوە وکورتکردنـەوە دەکات لە کاتی نیوەڕۆدا، پاشان دەڕواتە عەرەفەوە. واجبە لـە سـەر حـاجی دڵنیـا بێتەوە لەوەی لە ناو سنوری عەرەفەیە، ڕو دەکاتە قیبلە، ودەسـتی بـەرز دەکاتـەوە دەپاڕێتەوە ولەبیەیەك دەکات وستایشی خوا دەکـات، وتێدەکۆشـێت لـە کڕوزانـەوە ویاد وپاڕانەوە لەو ڕۆژە مەزنەدا. وباشترین شتێك لەو ڕۆژەدا بوترێت بریتیە لـە: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ» «هیچ پەرستراوێکی هەق نیـە مەگـەر خـوا، تـاك وبـێ شـەریکە، خـاوەنی موڵـك وستایشە، وهەر خۆی بە سەر هەمو شتێکدا بـە توانایـە». لـەو ڕۆژەشـدا بـە ڕۆژو نابێت، چونکە توانادارتری دەکات بـۆ پەرسـتن، هـەروا بـە بـەردەوام بـە پێـوە بـە کڕوزانەوە وملکەچی وزەلیلیەوە دەمێنێتەوە تا خۆر ئاوابون، کە ئـاوابو بـە هێـوری وسەنگینیەوە بە دەم لەبیەیك کردنەوە لە عەرەفـەوە دەڕژێـت ودەگەڕێتـەوە بـەرەو موزدەلیفە، لەوێ نوێژی ئێـوارە وعیشـا دەکـات بـە کۆکردنـەوە، وکورتکردنـەوەی عیشا. ڕێگەش دراوە بە لاوازەکان هەر شەوەکەی لە موزدەلیفە دەر بچن، بـەڵام بـە هێز لە موزدەلیفە دەمێنێتەوە تا نوێژ بەیانی. دوای نوێژ ڕو دەکاتە قیبلە وحەمـدی خوا دەکات وتەکبیر دەکات ولا إله إلا الله دەکات تـا دونیـا زۆر ڕۆشـن دەبێتـەوە، پێش خۆر دەرچون بە هێوری وسەنگینی وبە دەم لەبیەیك کردنەوە لـە موزدەلیفـەوە دەکەوێتە ڕێ، وحەوت بەردی بچوك لـە ڕێگـادا هەڵـدەگرێت، تـا دەگاتـە شـەیتان ڕەجمی عەقەبە لەوێ حـەوت بـەردی بچـوکی لـێ دەهاوێـژێت ولەبیـەیك کـردنیش دەبڕێت، ئینجا قوربانیەکەی سەر دەبڕێت، وسوننەتیشە لێی بخـوات، ئینجـا سـەری دەتاشێت، دوای ئەوە تەوافی «الإفاضة»، وسەعی دەکات -سـەعی سـەفا ومـەڕوەی حەج-ئەگەر موتەمەتتیع بو، یا موفرید یا قارین بو ولەگـەڵ تـەوافی هـاتن سـەعی

نەکردبو. سوننەتیشە ئەم کارانە بە ڕیز بێت: شەیتان ڕەجم، ئینجا سەر بڕین، پاشان سەر تاشین یا کورت کردنەوە، [دوای ئەوە تـەوافی «الإفاضة»]، جـا ئەگـەر یـەکێك لەمانەی پاش وپێش خست هیچی تێدا نیە، ئەگەریش دوانی لـەم سـێ کـارە کـرد: شەیتان ڕەجمی عەقەبە، وسەر تاشین یا کورتکردنەوە، وتەوافکردن لەگەڵ سـەعیدا - ئەگەر سەعی لە سەر بو-، ئەوا لە ئیحرام دەرچوە دەرچونی یەکەم، وهەمو شـتێکی بۆ حەڵاڵ ئەبێت کە بە ئیحرام لێی حەرام بوە جگە لە ئافرەت، ئەگەر هەر سـێکیانی کرد ئەوە لە ئیحرام دەرچوە دەرچونی گەورە، وهەمو شتێکیشی بۆ حەڵاڵ دەبێت بـە ئافرەتیشەوە، ولە شەوی یانزە ودوانزەهەم واجبە لـە مینـا بمێنێتـەوە، وهـەر سـێ شەیتانەکە ڕەجم دەکات لە ڕۆژی یانزەهەم بـە بچـوکەکە دەسـت پێـدەکات ئینجـا مامناوەنـد وپاشـان گەورەکـە، بـە هـەمان شـێوە ڕۆژی دوانزەهـەمیش. کـاتی هاویشتنیش لە لادانی خۆرەوە لە جەرگەی ئاسمـان دەسـت پێـدەکات تـا دەرچـونی سپێدە. کە بچوکەکەی هاویشت سوننەتە تۆزێك بڕواتە پێشەوە بە لای ڕاسـتدا، بـە پێـوە ڕوەو قیبلـە دەوەسـتێت ودەسـتەکانی بـەرز دەکاتـەوە ودەپاڕێتـەوە، کـە مامناوەندیەکەشی هاویشت سوننەتە بڕواتە پێشەوە بە لای چەپدا وڕو دەکاتە قیبلە وزۆر ڕا دەوەسـتێت ودەپاڕێتـەوە بـە دەسـتی بـەرزکراوەوە، بـەڵام دوای گـەورە «عەقەبە»کە ڕاناوەستێت، ئەگەریش ویستی پەلە بکات «أن يتعجل» ئەوا واجبە لە سەری لە ڕۆژی دوانزەهەمدا پێش ئاوابونی خـۆر لـە مینـا دەر بچـێت، ئەگـەر بـە ویستی خۆی لە مینا مایەوە تا خۆری لە سەر ئاوا بو ئەوا واجبە لـە سـەری شـەوی سیانزەش بمێنێتەوە. پاشان ئەگەر ویستی لە مەککە دەر بچێت پێویستە لـە سـەری تەوافی ماڵئاوایی بکات، وکۆتا دیداری لەگەڵ بەیتدا بێت، ئـەم تەوافـەش لـە سـەر ئافرەت دەکەوێت ئەگەر لە عادە یا زەیستانی بێت.

# دەروازەی پێنجەم

# لە بارەی ئەو شوێنانەی شاری مەدینە کە شەرعیە سەردان بکرێت

چەند پرسێکی تێدا باس کراوە:

## پرسی یەکەم: سەردان کردنی مزگەوتی پەیامبەر صلی الله علیه وسلم:

سوننەتە سەردانی مزگەوتی پەیامبەر ﷺ بکرێت وکۆڵ وباری بۆ بپێچرێتەوە لە هەر رۆژێك لە رۆژەکانی ساڵدا، ئیتر پێش حەج بێت یان دوای حەج، وکاتێکی دیاری کراوی نیە، وپەیوەندی بە حەجەوە نیە ونە لە مەرج ونە لە واجبەکانیەتی، بەڵام کەسێك هات بۆ حەج ئەبێت سەردانی مزگەوتی پەیامبەر ﷺ بکات پێش حەج بێت یا دوای حەج. بە تایبەت ئەگەر کەسێك لە سەری قورسە سەفەر بۆ ئەم شوێنانە بکات. جا ئەگەر حاجیان تێپەڕ بن بە مزگەوتی پەیامبەر ﷺ ونوێژی تێدا بکەن، ئەوا ئاسانترە بۆیان وگەورەترە بۆ پاداشتیان وکۆکردنەوەی هەردو چاکەکەیە: هەم حەجە وهەم سەردانی مزگەوتی پەیامبەریشە ﷺ بۆ نوێژکردن تێیدا. لە کاتێکدا وەك باس کرا ئەم سەردانکردنە لە تەواوکاریەکانی حەج نیە وپەیوەندیشی پێوە نیە، جا حەج بە بێ ئەم سەردانە تەواوە وکامڵە، وهەرگیز هیچ پەیوەستیەك نیە لە نێوان ئەم ولە نێوان حەجدا.

بەڵگەش زۆرە لە سەر شەرعی بونی بنکە وبارگە پێچانەوە بۆ مزگەوتەکەی ﷺ ونوێژکردن تێیدا، لەوانە: فەرمودەی: «لَا تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَّا إِلَى ثَلَاثَةِ مَسَاجِدَ: الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَمَسْجِدِ الرَّسُولِ ﷺ، وَمَسْجِدِ الْأَقْصَى» «بارەگە وبار

ناپێچرێتەوە مەگەر بۆ سێ مزگەوت نەبێت: مزگەوتی حەرام، مزگەوتی پەیامبەر، ومزگەوتی قودس»[1]. هەروەها فەرمودەکەی پەیامبەری خوا ﷺ[2]: «صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ، إِلَّا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ» «نوێژێك لەم مزگەوتەم خێردارترە لە هەزار نوێژی جگە لەم مزگەوتە مەگەر مزگەوتی کەعبە».

ئەم دەقانە بەڵگەن لە سەر شەرعی بونی سەردان کردنی مزگەوتی پەیامبەر ﷺ بۆ نوێژکردن تێیدا لەبەر فەزڵ داریی وچەند قاتی پاداشتەکەی، هەروەها بەڵگەیە لە سەر ئەوەی حەرامە کۆڵ وبنکە بگوازرێتەوە بۆ جگە لەم سێ مزگەوتە بە مەبەستی پەرستن، جا سەردانکردن وسەفەرکردن بۆ هیچ شوێنێکی سەر زەوی شەرعی نیە مەگەر بۆ ئەم سیانە. ڕۆیشتنیش بەرەو مەدینە بە مەبەستی نوێژکردن لە مزگەوتی پەیامبەر ﷺ دەرهەق بە ژنان وپیاوان شەرعیە لەبەر گشتێتی بەڵگەکانی ڕابردو.

**سەبارەت بە چۆنێتی سەردان کردنی**: کە سەردان کەر گەیشتە مزگەوت سوننەتە بە پێی ڕاست بڕواتە مزگەوتەوە، ونزا بەناوبانگەکەی چونە مزگەوت بخوێنێت: «بِسْمِ اللهِ وَالصَّلاةُ والسَّلاَمُ عَلَى رَسُولُ اللهِ، اللَّهم افْتَحْ لِي أَبْوابَ رَحْمَتِكَ» «بەناوی خوا، وصەڵات وسەلام لە سەر پەیامبەری خوا، خوایە دەرگاکانی بەزەیی خۆتم بۆ بکەیتەوە»[3].

ویردێکی تایبەتیش نیە بە مزگەوتەکەیەوە ﷺ، دوای ئەوە دو ڕکات نوێژ دەکات لە هەر شوێنێك بێت، ئەگەر لە ڕەوزەش بێت باشترە، لەبەر فەرمایشتەکەی

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (١١٨٩)، ومسلم (١٣٩٧) من حديث أبي سعيد الخدري.
(٢) أخرجه البخاري (١١٩٠)، ومسلم (١٣٩٤).
(٣) [أخرجه أبو داود (٤٦٥)، وابن ماجه (٧٧٢). وأخرجه مسلم (٧١٣) وغيره بدون لفظ التسليم].

ﷺ: «مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ» «نێوان ماڵەکەم ومینبەرەکەم باخێکە لە باخەکانی بەهەشت»[1].

کێش سەردانی مزگەوتەی بکات ﷺ ئەبێت پارێزگاری بکات لە ئەنجامدانی پێنج فەرزەکە تێیدا، وئەبێت زیکر وپاڕانەوە ونوێژی سوننەتی زۆر لە ڕەوزەدا بکات، بە ئومێدی ئەجر وپاداشتی گەورە. بەڵام بۆ نوێژە فەرزەکان باشترە سەردان کار وجگە لەویش زیاتر بڕواتە پێشەوە وسور بێ لە سەر لە ڕیزەکانی پێشەوە -بە پێی توانا- کە هانی بۆ لا دراوە، چونکە ڕیزەکانی پێشەوە دەکەونە بەردەم ڕەوزەوە.

## پرسی دوەم: سەردان کردنی گۆڕی پەیامبەر صلی الله علیه وسلم:

ئەگەر موسڵمان سەردانی مزگەوتی پەیامبەری ﷺ کرد باشترە سەردانی گۆڕی پەیامبەر ﷺ ودو هاوەڵەکەشی ئەبو بەکر وعومەر رضي الله عنهما بکات، چونکە ئەمەش تابعە بەوەی پەیامبەرەوە ﷺ نەك لە بنچینەدا مەبەست بێت. ئەمە سەردانی شەرعیە، دروستیش نیە بنکە وکۆڵی بۆ بپێچرێتەوە، بەڵکو کۆڵ وبار پێچانەوە بۆ سەردانکردنی گۆڕی پەیامبەر ﷺ وچاکان وشوێنەکانی تر جگە لە سێ مزگەوتەکە [کە باس کران] کۆ دەنگی زانایان هەیە لە سەر حەرام بونی. کێش بیکات ئەوا بە نیەت ومەبەستەکەی سەرپێچی کارە، چونکە دژی ئەو تێگەیشتنەیە کە لە فەرمودەی کۆڵ وبار پێچانەوەدا هاتوە.

**سەبارەت بە چۆنێتی سەردان کردن:** لە سەر سەردانکەرە، بە ئەدەب ودەنگێکی نزمەوە لە ئاستی گۆڕەکەی پەیامبەر ﷺ ڕابوەستێت، وپاشان سەلامی لێ بکات

(١) أخرجه البخاري (١١٩٦)، ومسلم (١٣٩١).

وبڵێ: «السلام عليك يا رسول الله ورحمة الله وبركاته» لەبەر فـەرمودەی: «مَا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إِلَّا رَدَّ اللهُ عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ» «هیچ کەسـێك نیـە سەلامم لێ بکات مەگەر خوا ڕوحـم بـە بـەر دەکاتـەوە تـا وەڵامـی سـەلامەکەی بدەمەوە»[1].

هیچیشی تێدا نیـە ئەگـەر سـەردانکەر بڵێـت: «السَّلامُ عَلَيْكَ يَا خِيرَةَ الله مِنْ خَلْقِه، أَشْهَدُ أَنَّكَ قَدْ بَلَّغْتَ الرِّسَالَةَ، وَأَدَّيْتَ الأَمَانَةَ، وَنَصَحْتَ الأُمَّةَ، وَجَاهَدْتَ فِي اللهِ حَقَّ جِهَادِهِ، اللَّهُمَّ آتِهِ الوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وابْعَثْهُ المَقَامَ المَحْمُودَ الَّذِي وَعَدْتَّه، اللَّهُمَّ اجْزِهِ عَنْ أُمَّتِهِ خَيْرَ الجَزَاءِ»[2] «سـەلامی خـوات لـێ بێـت ئـەی هەڵبژێردراوی خوا لە سەرجەم دروستکراوەکان، شایەتی دەدەم کە پەیامەکەت ئـەدا کـرد، وئامانەتەکـەت گەیانـد، وئامۆژگـاری ئوممـەتت کـرد، ولـە پێنـاوی خـوادا تێکۆشایت تەواوی تێکۆشان، سا خوایە مەنزیلەتی وەسیلە وپلەی بـەرزی فەزیڵـەتی پێ کەرەم بکەی، هەروەها ئەو پایە ستایشکراوەی بۆ کەرەم فەرمو کە بـەڵێنت پـێ داوە، خوایە لە سەر ئوممەتەکەی باشترین پاداشتی پێ بفەرمـە». پاشـان سـەلام لـە ئەبو بەکر وعومەر رضي الله عنهما دەکات ودوعایان بۆ دەکات وڕەحمەتیان بۆ دەنێرێـت، لەبـەر ئەوەی لە ئیبن عومەرەوە هاتوە کە سەلامی بکردبایە لە پەیامبـەر ودو هاوەڵەکـەی لەمـە زیـاتری نـەدەوت: «السلام عليك يا رسول الله، السلام عليك يا أبا بكر،

---

(١) أخرجه أبو داود (٢٠٤١)، وأحمد (٥٢٧/٢) من حديث أبي هريرة، وصحح النوي إسناده «الأذكار» (٣٤٩)، وابن القيم «جلاء الأفهام» (٣٢)، وحسَّنه الألباني «صحيح الترغيب» (١٦٦٦).

(٢) [ينظر: «الفتوحات الربانية» (٣٤/٥) لابن علان، وعنه: «موسوعة الحافظ ابن حجر الحديثية» (٣٣٢/٢). انظر: تعليق شيخنا العصيمي على: «التحقيق والإيضاح» ص٢٣٣، ط الصميعي].

السلام عليك يا أبتاه» «سەلامەت لێ بێت ئەی پەیامبەری خوا، سەلامەت لێ بێت ئەی ئەبو بەکر، سەلامەت لێ بێت ئەی باوکە»[(١)]، ئینجا دەڕوات.

وحەرامە سەردان کەر وجگە لەویش دەست بساوێت بە ژورەکەی پەیامبەر ﷺ یا ماچی بکات یا بە دەوریدا بسوڕێتەوە، یا ڕوی لێ بکات لە کاتی دوعاکردندا، یا داوای لێ بکات ﷺ پێویستیەکانی بۆ جێبەجێ بکات، وناڕەحەتیەکانی لە سەر لابدات، وشیفای نەخۆشی بۆ بدات وهاوشێوەی ئەمانە، چونکە هەمو ئەمانە تەنها بۆ خوایە، وداوا ناکرێت مەگەر لە خوا. وسەردانکردنی قەبری پەیامبەر ﷺ ودوو هاوەڵەکەی واجب نیە، ومەرجێکیش نیە بۆ حەج، وەك هەندێك نەزان وا تێیگەیشتون، بەڵکو ئەمە سوننەتە دەرهەق هەر کەسێك سەر لە مزگەوتی پەیامبەر ﷺ بدات، وهەرگیز هیچ پەیوەندیەك نیە لە نێوان ئەمە ولە نێوان حەجدا. وهەمو ئەو فەرمودانەشی لەم بارەوە دەکرێنە بەڵگە بۆ شەرعی بونی کۆڵ وبار پێچانەوە بۆ قەبری پەیامبەر ﷺ، وکە ئەمە لە تەواوکاریەکانی حەجە، هەموی فەرمودەی بێ بنەمایە؛ یا لاوازە یا هەڵبەستراوە، وەك فەرمودەی: «مَنْ حَجَّ وَلَمْ يَزُرْنِي فَقَدْ جَفَانِي»[(٢)] «کێ بێت بۆ حەج وسەردانم نەکات ئەوا پشتی

---

(١) [أخرجه عبد الرزاق (٦٧٢٤) -وزاد: «مَا نَعْلَمُ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فَعَلَ ذَلِكَ إِلَّا ابْنَ عُمَرَ»-، وابن أبي شيبة (١١٩١٥)، والبيهقي (١٠٣٨٠)، وأورده ابن حجر في «المطالب العالية» (٢/١٣٢٠) ط العاصمة، وصححه موقوفًا، وانظر: في «الفتوحات الربانية» (٣٤/٥). وأخرجه مالك (٥٧٤) وغيره مختصرًا. وصححه شيخ الإسلام في «الإقتضاء» (ص٧٢٧)].

(٢) [موضوع: قاله الذهبي في «ميزان الاعتدال» (٢٦٥/٤)، وابن حجر في «لسان الميزان» (٢٨٥/٨)، والصغاني في «الأحاديث الموضوعة»، والزركشي، وابن الجوزي، والشوكاني «الفوائد المجموعة» (ص ١١٨) وغيرهم. ومما يدل على وضعه أن جفاء النبي ﷺ من الكبائر إن لم يكن كفرًا فاستلزم أن يكون زياته ﷺ فرضًا كالحج، وهذا مما لم يقله العلماء. انظر: «الضعيفة» (٤٥)].

لێکردوم»، یـا فـەرمودەی: «مَنْ زَارَ قَبْرِي وَجَبَتْ لَه شَفَاعَتِي»[1] «کـێ سـەر لـە گۆڕەکەم بدات ئەوا شـەفاعەتمی بـۆ حـەلاڵ بـوە» جگـە لـەم دوانـەش زۆرە، یـەك فەرمودەی لە پەیامبەرەوە ﷺ نەچەسپاوە، بەڵکو هەندێك لـە زانایـان جـەخت لـە سەر ئەوە دەکەنەوە کە هەموی هەڵبەستراو ودرۆیە.

## پرسی سێیەم: ئەو شوێنانەی تری مەدینە کە شەرعیە سەردان بکرێ:

سوننەتە سەردان کار -پیاو بێت یا ئافرەت- بچێت بۆ مزگەوتی قوبا بـە دەسـت نوێژەوە ونوێژی تێدا بکات، چونکە پەیامبەر ﷺ وای کـردوە؛ بـە پیـادە وسـواری سەردانی مزگەوتی قوبای دەکرد ودو ڕکاتی تێدا دەکـرد[2]. وفەرمایشـتەکەی تـری پەیامبەرە ﷺ: «مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ أَتَى مَسْجِدَ قُبَاءَ فَصَلَّى فِيهِ صَلَاةً كَانَ لَهُ كَأَجْرِ عُمْرَةٍ» «هەر کەس لە ماڵی خۆیدا دەست نوێژ بگرێت پاشان بڕوا بۆ مزگەوتی قوبا، ونوێژێکی تێدا بکات، ئەوە پاداشتی عومرەیەکی هەیە»[3]. وسوننەتە تـەنها دەرهەق بە پیاوان سەردانی گۆڕستانی بەقیع وگۆڕی شەهیدەکانی ئوحود بکـات وەك گۆڕی حەمزە وجگە لەویش ﷺ، وسەلامیان لێ بکات ودوعایان بۆ بکات، چونکە پەیامبەر ﷺ وای کـردوە؛ سـەردانی کـردون وبۆیـان پاڕاوەتـەوە، هـەروەها لەبـەر گشـتێتی فـەرمودەی: «زُورُوا الْقُبُورَ، فَإِنَّهَا تُذَكِّرُ الْمَوْتَ» «سـەردانی گۆڕسـتان بکەن، چونکە مردنتان بیر دەخاتـەوە»[4]. وپەیامبـەری خـوا ﷺ هاوەڵـەکانی فێـر

---

(١) [ضعيف جدًا. وقال النووي والصغاني وابن الجوزي والزركشي وغيرهما: «موضوع، انظر: «الفوائد المجموعة» (ص ١١٧) (٣٥)، و«الضعيفة» (١٢/٥٢٠) (٥٧٣٢). و«الإرواء» (٤/٣٣٥) (١١٢٨)].

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (١١٩٤)، ومسلم (١٣٩٩) (٥١٦).

(٣) أخرجه أحمد (٣/٤٨٧)، وابن ماجه (١٤١٢)، والنسائي (٢/٣٧) وغيرهم، وصححه الألباني (صحيح الترغيب ١١٨١)، وانظر: الأحاديث الواردة في فضائل المدينة (ص ٥٤٢).

(٤) أخرجه مسلم (٩٧٦) - ١٠٨.

دەکرد لە کاتی سەردانی گۆڕستاندا بڵێن: «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، وَالْمُسْلِمِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللهُ لَلَاحِقُونَ، أَسْأَلُ اللهَ لَنَا وَلَكُمُ الْعَافِيَةَ» «سەلامتان لێ بێت ئەی خەڵکی گۆڕستان لە باوەڕداران وموسڵمانان، ئێمەش بە ویستی خوا بە دڵنیاییەوە پێتان دەگەینەوە، داوا دەکەم لە خوا ئێمە وئێوەش بێوەی بکات وببورێت»[(١)].

ئەمە ئەو شوێنانەی شاری مەدینەیە کە شەرعیە سەردان بکرێت.

**بەڵام ئەو شوێنانەی تر کە هەندێك ڕەشۆك وا دەزانێت سەردان کردنی شەرعیە:**

وەك شوێنی یەخ کردنی وشترەکە (مبرك الناقة)، ومزگەوتی هەینی (مسجد الجمعة)، وبیری کلوانەکەکە (بئر الخاتم)، وبیری عوسمان (بئر عثمان)، وحەوت مزگەوتەکە (المساجد السبعة)، ومزگەوتی دوو قیبلەکە (مسجد القبلتين)، ئەمانە هیچ بنەمایەکی نیە، ولە پەیامبەریشەوە ﷺ نەچەسپاوە سەردانی ئەم شوێنانەی کردبێت یان فەرمانی بە سەردان کردنی کردبێت، لە کەسیش لە پێشینانەوە نەهاتوە سەردانیان کردبێت، وهیچ مزگەوتێك نیە لە مەدینە فەزڵێکی تایبەتی هەبێت، مەگەر مزگەوتی پەیامبەر ﷺ ومزگەوتی قوبا، پەیامبەریش فەرمویەتی [وەك ڕابورد]: «هەر کارێك بکرێت فەرمانی ئێمەی لە سەر نەبێت ئەوا ڕەد دەکرێتەوە». جا ئەبێت موسڵمان کە سەریدا لە مەدینە پابەند بێت بە سەردانکردنی ئەو شوێنانەی کە شەرعیە سەردان بکرێت، ودور بکەوێتەوە لەو شوێنانەی شەرعی نیە سەردان بکرێت.

---

(١) أخرجه مسلم (٩٧٥).

# دەروازەی شەشەم

# لە بارەی قوربانی کردنەوە «الأُضْحِيَّة»

چەند پرسێکی تێدا باس کراوە:

## پرسی یەکەم: پێناسەی قوربانی، وحوکمەکەی، وبەڵگەکانی شەرعی بونی، ومەرجەکانی:

### ١- پێناسەی قوربانی:

«**الأضحية**» لە زماندا: بریتیە لە سەر بڕینی قوربانی لە کاتی «الضحى= چێشتەنگا». لە شەرعیشدا: ئەو وشتر ومانگا ومەڕ وبزنەیە کە لە ڕۆژی جەژندا سەر دەبڕدرێت بۆ نزیك بونەوە لە خوا.

### ٢- حوکمەکەی وبەڵگەکانی شەرعی بونی:

قوربانی سوننەتێکی تەئکیدکراوە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾ [الكوثر: ٢] «نوێژ بۆ پەروەردگارەکەت بکە وسەر بڕینیش هەر بۆ ئەو بکە»، ولەبەر فەرمودەکەی ئەنەس رضي الله عنه: «ضَحَّى النَّبِيُّ ﷺ بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ، ذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ وَسَمَّى وَكَبَّرَ، ووضَعَ رِجْلَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا» «پەیامبەر دو شەك بەرانی ڕەش وسپی شاخ داری کردە قوربانی، بە دەستی خۆی سەڕی بڕی، بسم الله والله أكبری کرد، وقاچیشی خستە سەر ملیان»[1].

### ٣- مەرجەکانی شەرعی بونی قوربانی کردن:

---

(١) أخرجه البخاري (٥٥٥٣) [بل (٥٥٦٥) بهذا اللفظ]، ومسلم (١٩٦٦).

قوربانی کردنِ ئەبێتە سوننەت دەرهەق هەر کەسێك ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

١- **ئیسلامەتی:** جا واجب نابێت لە سەر غەیرە موسڵمان.

٢- **پێگەیشتن.**

٣- **وژیری:** جا هەر کەس بالّغ وژیر نەبێت ئەوا تەکلیف لێکراو نیە بیکات.

٤- **توانا داری:** بەوە بەدی دێت کە بایی قوربانیەکەی هەبێت جگە لە بوونی بژێوی خۆی وئەوانەی بژێویان لە سەریەتی لە شەو ورۆژی جەژن ورۆژانی تەشریقدا.

## پرسی دووەم: قوربانی بە چی دروستە:

قوربانی دروست نابێت مەگەر بە:

١- وشتر.

٢- یا مانگا.

٣- یا مەڕ وبزن.

بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنْسَكًا لِيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَى مَا رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ﴾ [الحج: ٣٤] «وبۆ هەر کۆمەڵێکی ئیمانداری پێش ئێوە مەناسکمان بۆیان داناوە لە سەر بڕین وخوێن ڕشتنی ئاژەڵان، ئەمەش بۆ ئەوەی ناوی خوا بهێنن لە کاتی سەر بڕینی ئەوەی خوا بە ڕۆزی پێی بەخشیون لە مەڕ ومالاّت». ئەنعامیش لەو سێ کۆمەڵە ناڕواتە دەرەوە، ولەبەر ئەوەی لە پەیامبەر ﷺ وهیچ کام لە هاوەڵانیەوە نەگوازراوەتەوە قوربانیان کردبێت بە جگە لەمانە.

لە قوربانیشدا شەکێك لە سەر کەسێك وخانەوادەکەی دەکەوێت، وەك لە ئەبو ئەیوبی ئەنساریەوە ﷺ هاتوە: «كَانَ الرَّجُلُ فِي عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ يُضَحِّي بِالشَّاةِ عَنْهُ

وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ، فَيَأْكُلُونَ وَيُطْعِمُونَ» «پیاوێك لە سەردەمی پەیامبەردا ﷺ شەكێكی دەكردە قوربانی بۆ خۆی وخانەوادەكەی، لێیان دەخوارد ولێشیان دەبەخشیەوە»[1].

دروستیشە وشترێك یا مانگایەك بكرێتە قوربانی بۆ حەت كەس، لەبەر فەرمودەكەی جابر رضي الله عنه: «نَحَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ الْبَدَنَةَ عَنْ سَبْعَةٍ وَالْبَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ» «لە ساڵی حودەیبیەدا، لەگەڵ پەیامبەری خوادا ﷺ وشترێك ومانگایەكمان سەر دەبڕی بۆ حەوت كەس»[2].

## پرسی سێیەم: ئەو مەرجانەی ئەبێت ڕەچاو بكرێت لە قوربانی دا:

**١ - تەمەن:**

أ. **وشتر:** مەرجە پێنج ساڵی تەواو كردبێت.

ب. **مانگا:** مەرجە دو ساڵی تەواو كردبێت.

ج. **بزن:** مەرجە ساڵێكی تەواو كردبێت. لەبەر فەرمودەكەی جابر، پەیامبەری خوا فەرمویەتی: «لَا تَذْبَحُوا إِلَّا مُسِنَّةً، إِلَّا أَنْ يَعْسُرَ عَلَيْكُمْ فَتَذْبَحُوا جَذَعَةً مِنَ الضَّأْنِ» «موسیننە نەبێت سەر مەبڕن، مەگەر پێتان نەكرا، ئەوسا جەزەعەیەك لە مەڕ سەر ببڕن»[3]. موسیننەش لە وشتردا ئەوەیە پێنج ساڵان بێت، ولە مانگاش دو ساڵان، لە بزنیش سەك ساڵ. پێشی دەوترێ: ثـەنییە.

---

(١) أخرجه ابن ماجه (٣١٤٧) [واللفظ له]، والترمذي وصححه (١٥٠٥)، «صحيح ابن ماجه» (٢٥٦٣).
(٢) أخرجه مسلم (١٣١٨).
(٣) أخرجه مسلم (١٩٦٣).

د. مەڕ: مەرجە جەزەعە بێت، کە بریتیە لەوەی شەش مانگی تەواو کردبێت، لەبەر فەرمودەکەی عوقبەی کوڕی عامر ئەڵێ: وتم: «يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّهُ أَصَابَنِي جَذَعٌ؟» «ئەی پەیامبەری خوا، جەزەعەیەکم بەر کەوتوە لە دەستکەوت»، فەرموی: «ضَحِّ بِهِ» «بیکە بە قوربانی»[1]. هەر لەوەوە، ئەڵێ: «ضَحَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ بِجَذَعٍ مِنَ الضَّأْنِ» «لەگەڵ پەیامبەری خوادا ﷺ جەزەعەمان کردە قوربانی»[2].

٢- بێ عەیب بون: مەرجە وشتر ومانگا ومەڕ وبزن لەو عەیبانە سەلامەت بن کە ئەبێتە مایەی کەم کردنەوەی گۆشت، جا ئەم عەیبانە: لەڕی بێ مۆخ، وشەل، یەك چاو، ونەخۆش لەسەری ناخات، لەبەر فەرمودەکەی بەڕاء لە پەیامبەرەوە ﷺ فەرمویەتی[3]: «أَرْبَعٌ لَا تُجْزِئُ فِي الْأَضَاحِيِّ: الْعَوْرَاءُ الْبَيِّنُ عَوَرُهَا، وَالْعَرْجَاءُ الْبَيِّنُ عَرَجُهَا، وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُهَا، وَالْعَجْفَاءُ الَّتِي لَا تُنْقِي» «چوار عەیب لە قوربانیدا هەبێت لە سەرت ناکەوێت: کوێرێکی ڕون، شەلێکی ڕون، نەخۆشێکی ڕون، لەڕێك مۆخ لە ئێسکەکانیدا نەبێت بە هۆی لاوازیەوە». هەرچیش هاوواتای ئەم عەیبانە بێت قیاس دەکرێتە سەری؛ وەك «الهتماء» کە دانەکانی پێشەوەی نەبێت، هەروەها «العَضْباء» کە زۆربەی گوێی یا شاخەکانی بڕا بێت، هاوشێوەی ئەم عەیبانە.

(١) أخرجه البخاري (٥٥٥٧) [بل (٥٥٤٧ و...)]، ومسلم (١٩٦٥) - ١٦. واللفظ له.

(٢) صحيح: رواه النسائي (٢١٩/٧)، وقوّى إسناده في «الفتح» (١٥/١٠). «صحيح النسائي» (٤٠٨٠).

(٣) أخرجه مالك في الموطأ (ص ٢٤٨)، وأحمد (٢٨٩/٤)، والترمذي (١٤٩٧) وقال: «حسن صحيح»، وأبو داود (٢٨٠٢)، والنسائي (٢٤٤/٧) وما بعدها [واللفظ له دون الشطر الأول فهو لابن ماجه]، وابن ماجه (٣١٤٤)، وصححه الألباني «صحيح سنن النسائي» (٤٠٧٣).

## پرسی چوارەم: کاتی سەر بڕینی قوربانی:

کاتەکەی لە دوای نوێژی جەژنەوە دەست پێ دەکات بۆ کەسێك بەشدار بێت، ولە دوای دەرچونی خۆرەوە لە ڕۆژی جەژن بە ئەندازەی ئەوەی دو ڕکات نوێژ بکەیت لەگەڵ دو وتاردا بۆ کەسێك بەشدار نەبێت، لەبەر فەرمودەکەی بەڕائی کوڕی عازب ﷺ، پەیامبەر ﷺ فەرموی: «مَنْ صَلَّى صَلَاتَنَا، وَنَسَكَ نُسُكَنَا، فَقَدْ أَصَابَ النُّسُكَ وَمَنْ ذَبَحَ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ فَلْيُعِدْ مَكَانَهَا أُخْرَى، وَمَنْ لَمْ يَذْبَحْ فَلْيَذْبَحْ» «کێ نوێژی وەك نوێژەکەی ئێمە کرد، وسەر بڕین وقوربانی وەك ئەوەی ئێمە کرد ئەوا قوربانیەکەی تەواوە، کێش سەری بڕی پێش نوێژ ئەوە با یەکێکی تر سەر بڕێت، کێش سەری نەبڕیوە با سەری بڕێت»[1]. کاتەکەشی درێژە دەکێشێت تا ئاوابونی خۆری کۆتا ڕۆژی تەشریق، لەبەر فەرمودەکەی جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «كُلِّ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ ذَبْحٌ» «هەمو ڕۆژانی تەشریق ڕۆژی سەر بڕینە»[2].

باشتریشە دوای لێ بونەوە لە نوێژ سەر ببڕدرێت، دیسانەوە لەبەر فەرمودەکەی بەڕائی کوڕی عازب، پەیامبەر فەرمویەتی ﷺ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ مِنْ يَوْمِنَا هَذَا أَنْ نُصَلِّيَ، ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ، فَمَنْ فَعَلَ هَذَا فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ ذَبَحَ قَبْلَ ذَلِكَ فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ يُقَدِّمُهُ لِأَهْلِهِ لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ» «ئەمڕۆ یەکەم شتێك دەست پێ بکەین نوێژە، ئینجا دەگەڕێینەوە حەیوانەکە سەر دەبڕین، جا هەر کەس ئەمە

---

(١) أخرجه البخاري (٢٣٨/٦) [(٩٨٣)]، ومسلم (١٥٥٣/٣) [(١٩٦١)]. والذي بالغامق للبخاري من حديث جندب بن سفيان البجلي [(٥٥٦٢)].

(٢) أخرجه أحمد (٨٢/٤)، والبيهقي (٢٩٥/٩)، وابن حبان (١٠٠٨)، والدارقطني (٢٨٤/٤)، قال الهيثمي: «ورجال أحمد وغيره ثقات» «مجمع الزوائد» (٢٥/٣).

بکات ئەوا سوننەتی ئێمەی پێکاوە، کێش پێش ئەوە سەری ببڕی بێت ئەوا گۆشتێکە پێشکەشی ماڵ ومنداڵی خۆی کردوە وفڕی بە قوربانیەوە نیە»[1].

## پرسی پێنجەم: قوربانیەکە چی لێ دەکرێت، وئەگەر نۆمینە هات قوربانی کەر چی دەکات؟

١- **قوربانی چی لێ دەکرێت:** سوننەتە قوربانی کار لە قوربانیەکەی بخوات، وبەشی خزم ودراوسێ هاوڕێیانی بدات، وبە سەر هەژارانیشدا لێی ببەخشێتەوە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْبَائِسَ الْفَقِيرَ﴾ [الحج:٢٨]. باشتریشە «یستحب» بیکاتە سێ بەشەوە: یەك لە سێی بۆ خێزانەکەی، سێیەکیشی بۆ هاوسێ هەژارەکانی، یەك لە سەر سێشی بکاتە دیاری، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عەبباس کە باسی شێوازی قوربانیەکەی پەیامبەر ﷺ دەکات: «وَيُطْعِمُ أَهْلَ بَيْتِهِ الثُّلُثَ، وَيُطْعِمُ فُقَرَاءَ جِيرَانِهِ الثُّلُثَ، وَيَتَصَدَّقُ عَلَى السُّؤَّالِ بِالثُّلُثِ» «سێیەکی بۆ خێزانەکەی دادەنێت، سێیەکیشی بۆ هاوسێ هەژارەکانی، وسێیەکی دەبەخشێتە ئەوانەی داوا دەکەن»[2].

دروستیشە گۆشتی قوربانی سەروی سێ ڕۆژ هەڵ بگیرێت، لەبەر فەرمودەکەی بورەیدە ﷺ کە پەیامبەر خوا ﷺ فەرموی: «نَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ فَوْقَ

(١) أخرجه البخاري (٥٥٦٠) [واللفظ له والذي بالغامق (٩٧٦)]، ومسلم (١٩٦١).
(٢) أخرجه الحافظ أبو موسى في «الوظائف» وحسنه. انظر: «المغني» (٦٣٢/٨) [وفي ط التركي (٣٧٩/١٣-٣٨٠)]. [وانظر لزامًا: الإرواء: (١١٦٠) (٣٧٤/٤)]

ثَلَاثٍ، فَأَمْسِكُوا مَا بَدَا لَكُمْ» «ڕێگریم لێ کردن لە هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی لە سەروی سێ ڕۆژەوە، جا چەند ڕۆژتان حەز لێ بو لێی هەڵبگرن»[1].

٢- **قوربانی کەر چی لە سەرە ئەگەر نۆمینە هات:** کە نۆمینەی حاجیان هات حەرامە قوربانی کار هیچ لە قژ ونینۆکی بگرێت تا قوربانیەکە سەر دەبڕێت، لەبەر فەرمودەکەی ئوم سەلەمە ﷺ بەرزی دەکاتەوە: «إِذَا دَخَلَتِ الْعَشْرُ وَأَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يُضَحِّيَ، فَلَا يَمَسَّ مِنْ شَعَرِهِ وَبَشَرِهِ شَيْئًا» لە ڕیوایەتێکی تردا: «وَلَا يَقْلِمَنَّ ظُفُرًا» «ئەگەر نۆمینە هات ویەکێکتان ویستی قوربانی بکات، ئەوا با هیچ لە مو وپێستە ونینۆکی نەگرێت»[2].

(١) أخرجه مسلم (١٥٦٤/٣) رقم (١٩٧٧) [هذا لفظه].
(٢) أخرجه مسلم (١٩٧٧) [وغيرت لفظهم إلى هذا؛ لإيهامه أن الحكم مختص بمن عنده أضحية، وليس كذلك].

# دەروازەی حەوتەم

# لە بارەی گوێزەبانەوە «العقيقة»

چەند مەسەلەیەکی تێدایە:

## پرسی یەکەم: پێناسەی حەوتم وحوکمەکەی وبەڵگەکانی وکاتەکەی:

**١ - پێناسەی «العقيقة»:**

لە زماندا لە «العَقّ»ەوە وەرگیراوە، لە بنەڕەتدا بەو قژە دەوترێت کە ها بە سەر کۆرپەلەوە لە کاتی لە دایك بونیدا.

لە شەرعیشدا: بریتیە لەوەی بۆ تازە لە دایك بو لە ڕۆژی حەوتەم سەر دەبڕدرێت لە کاتی سەرتاشینیدا. ئەمەش مافی منداڵە لە سەر دایك وباوکی.

**٢ - حوکمەکەی:**

گوێزەبانە سوننەتێکی تەئکید لە سەرکراوە، لەبەر فەرمودەکەی سەلمانی کوڕی عامری دەببی ﷺ، ئەڵێ: گوێم لە پەیامبەری خوا ﷺ بو ئەیفەرمو: «مَعَ الْغُلَامِ عَقِيقَةٌ، فَأَهْرِيقُوا عَنْهُ دَمًا وَأَمِيطُوا عَنْهُ الْأَذَى» «منداڵ لە دایك بو گوێزەبانەشی لەگەڵدایە، بۆیە ئاژەڵێکی بۆ سەر بڕن وئازاریشی لە سەر لا بدەن»[١]. وفەرمودەکەی سەمورە ﷺ، پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «كُلُّ غُلَامٍ رَهِينَةٌ بِعَقِيقَتِهِ، يُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سَابِعِهِ، وَيُسَمَّى، وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ» «هەمو منداڵێك بارمتەی گوێزەبانەکەیەتی، لە ڕۆژی حەوتەمدا بۆی سەر دەبڕدرێت، وناو دەنرێت، وقژیشی

---

(١) أخرجه البخاري (٢١٧/٦) [(٥٤٧١)].

دەتاشرێت»[1]. وفەرمودەکەی عەبدولاّی کوڕی عەمری کوڕی عاصە ﷺ[2]، کە پەیامبەری خوا فەرموی ﷺ: «مَنْ وُلِدَ لَهُ وَلَدٌ، فَأَحَبَّ أَنْ يَنْسُكَ عَنْهُ، فَلْيَنْسُكْ» «هەر کەس خوا منداڵێکی پێ بەخشی وپێی خۆش بو ئاژەڵی بۆ سەر ببڕێت، با بۆی سەر ببڕێت».

٣- **کاتی گوێزەبانە**: کاتی دروستێتی سەر بڕینی گوێزەبانە دەست پێ دەکات لە بە تەواوەتی دەرچونی کۆرپەلەکە لە سکی دایکی، وکاتی سوننەتێکەی درێژە دەکێشێت تا باڵغ بون، بەلاّم سوننەتە ڕۆژی حەوتەمی لە دایك بونی گوێزەبانەی بۆ بکرێت، لەبەر فەرمودەی پێشتر: «هەمو منداڵێك بارمتەی حەوتمەکەیەتی، لە ڕۆژی حەوتەمدا بۆی سەر دەبڕدرێت، وناو دەنرێت، وقژی دەتاشرێت».

## پرسی دوەم: ئەو ئەندازەیەی سەر دەبڕدرێت لە گوێزەبانە:

سوننەتە بۆ کوڕ دو شەك وبۆ کچ شەکێك سەر ببڕدرێت، لەبەر فەرمودەکەی ئوم کورزی کەعبیە ﷺ، ئەڵێ: گوێم لە پەیامبەری خوا ﷺ بو فەرموی: «عَنِ الْغُلَامِ شَاتَانِ مُكَافِئَتَانِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ» «بۆ کوڕ دو شەکی هاوتا دەکرێت، وبۆ کچیش شەکێك»[3].

(١) أخرجه أحمد (٧/٥، ٨، ١٢)، وأبو داود (٢٨٣٧) وما بعدها [واللفظ له (٢٨٣٨)]، والترمذي (١٥٢٢)، والنسائي (١٦٦/٧) وما بعدها، وصححه الحاكم، ووافقه الذهبي «المستدرك» (٢٣٧/٤)، وصححه الألباني «صحيح النسائي» (٣٩٣٦).

(٢) أخرجه أبو داود (٢٨٤٢) وما بعدها [واللفظ له]، والنسائي (١٦٢/٧)، وأحمد (١٨٢/٢) وما بعدها، وصححه الألباني «صحيح النسائي» (٣٩٢٨).

(٣) أخرجه أحمد (٣٨١/٦)، وأبو داود (٢٥٧/٣) [واللفظ له]، والنسائي (١٦٥/٧)، وصححه الألباني «صحيح النسائي» (٣٩٣١).

## پرسی سێیەم: ناونانی منداڵ، وسەرتاشین، ودەم شیرین کردن «تحنيك»ی، وبانگ دان بە گوێی دا:

١- **ناونانی منداڵ:** سوننەتە لە ڕۆژی حەوتەمی لە دایکبونیدا ناوی منداڵ بنرێت، لەبەر فەرمودەکەی پێشتری سەمورە: «هەمو منداڵێك بارمتەی گوێزەبانەکەیەتی، لە ڕۆژی حەوتەمدا بۆی سەر دەبڕدرێت، وناو دەنرێت، وقژی دەتاشرێت». سوننەتیشە ناوێکی چاکی بۆ هەڵبژێرێت، چونکە پەیامبەر ﷺ چەندین ناوی گەنی گۆڕی، فەرمانی بەوەش کردوە[١]. چاکترین ناویش: عەبدوڵا «بەندەی الله»، وعەبدولڕەحمان «بەندەی ڕەحمان»ە، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر رضي الله عنهما: «إِنَّ أَحَبَّ أَسْمَائِكُمْ إِلَى اللهِ، عَبْدُ اللهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ» «خۆشەویستترین ناوتان لە لای خوا عەبدولا وعەبدولڕەحمانە»[٢].

٢- **سەرتاشینی:** هەروەها سوننەتە ڕۆژی حەوتەم دوای سەر بڕینی ئاژەڵەکە سەری بتاشرێت -نێر بێت یا مێ- وبە ئەندازەی کێشی قژی زیو ببەخشرێت، لەبەر فەرمودەکەی عەلی رضي الله عنه ئەڵێ: پەیامبەر ﷺ شەکێکی کردە گوێزەبانە بۆ حەسەن وفەرموی: «يَا فَاطِمَةُ احْلِقِي رَأْسَهُ، وَتَصَدَّقِي بِزِنَةِ شَعَرِهِ فِضَّةً» «ئەی فاتیمە سەری بتاشە وبە ئەندازەی کێشی قژی زیو ببەخشەوە»[٣].

٣- **دەمشیرینکردنی کۆرپەلە:** هەروەها سوننەتە دەمی کۆرپەلە -نێر بێت یا مێ-بە خورما شیرین بکرێت تا هەندێکی دەڕواتە هەناویەوە، لەبەر فەرمودەکەی

---

(١) انظر: «فتح الباري» (١٠/٥٧٧).
(٢) أخرجه مسلم (٣/١٦٨٢).
(٣) أخرجه أحمد (٦/٣٩٠، ٣٩٢)، ومالك في الموطأ (ص ٢٥٩)، والترمذي (١٥١٩)، والحاكم (٤/٢٣٧)، والبيهقي (٩/٣٠٤)، وحسنه الشيخ الألباني «صحيح الترمذي» (١٢٢٦).

ئەبو موسا ﷺ ئەڵێ: «منداڵێکمان بو، هێنامە خزمەتی پەیامبەر ﷺ، ئەوەبو ناوی لێنا ئیبراهیم وبە خورما مەڵاشوی شیرینکرد»[1]. لەبەر فەرمودەکەی عائیشە ﷺ کە پەیامبەری خوا منداڵیان بۆ دەهێنا وئەویش مەڵاشوی شیرین دەکردن[2].

٤- **بانگدان بە گوێی کۆرپەلەدا:** سوننەتە لە کاتی لە دایك بوندا بانگ بدرێت بە گوێی کۆرپەلەدا، وتراوە[3]: بانگیش دەدرێت بە گوێی ڕاستیدا، وقامەت دەکرێت لە گوێی چەپیدا، لەبەر فەرمودەکەی ئەبو ڕافع ﷺ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَذَّنَ فِي أُذُنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ حِينَ وَلَدَتْهُ فَاطِمَةُ بِالصَّلَاةِ» «پەیامبەری خوام بینی کاتێك فاتیمە حەسەنی کوڕی عەلی بو، بانگیی نوێژی دا بە گوێیدا»[4].

---

(١) أخرجه البخاري (٦/٢١٦)، ومسلم (٢١٤٥).

(٢) أخرجه مسلم (٢١٤٧).

(٣) [«وتراوە» بۆ شتی لاواز بە کار دێت، بەڵکو لە خودی بانگەکەشدا ڕاجیاوازی هەیە، جا با قامەت نەکا].

(٤) أخرجه الترمذي (١٥١٤) وقال: «حسن صحيح». وحسنه الألباني «صحيح الترمذي» (١٢٢٤).

## شەشەم: بەشی تیّ کۆشان «الجِهَاد»

ئەمەش لە سیّ دەروازە پیێك هاتوە:

دەروازەی یەکەم: پیێناسەی تیێکۆشان وفەزلّەکەی وحوکمەکەی ومەرجەکانی، وئەو شتانەی جیهاد دەخەن.

دەروازەی دوەم: لە بارەی دیلەکان ودەست کەوتەکانەوە.

دەروازەی سیێیەم: لە بارەی ئاگر بەست، وئەهلی زیمە، وئەمان پیێ دراوەکانەوە.

# دەروازەی یەکەم

# پێناسەی تێکۆشان، وفەزڵەکەی، وحوکمەکەی، ومەرجەکانی وجیهادخەرەکان

# ( تَعْرِيفُ الجِهَادِ، وَفَضْلُه، وَحُكْمُه، وشُرُوطُه، ومُسْقِطَاتُه )

چەند پرسێکی تێدایە:

**پرسی یەکەم: پێناسەی تێکۆشان، وفەزڵەکەی، وحیکمەت لێی، وحوکمەکەی، وکەی واجب دەبێت؟**

أ. **پێناسەکەی:**

جیهاد لە زماندا: هەوڵدان وتێ کۆشان وتوانا وتەقالا خستنە گەڕ. لە شەرعیشدا: هەوڵدان وتێ کۆشانە لە شەڕ کردن لەگەڵ بێ باوەڕاندا وبەرگری کردنە لە دژیان.

ب. **فەزڵەکەی وحیکمەت لێی:**

جیهاد چڵە پۆپەی ئیسلامە، وەك پەیامبەری خوا ﷺ ناوی لێناوە[1]، واتا: بەرزترینیەتی، واشی پێوتراوە چونکە بە هۆیەوە ئیسلام بەرز وبالاّ دەبێت ودەردەکەوێت، خواش ﷻ تێکۆشەرانی بە ماڵ ونەفس لە پێناوی خۆیدا فەزڵدار کردون وبەڵێنی بەهەشتی پێداون داون، وەك تۆزێکی تر لە ئایەتەکەی سورەتی نیسائدا دێت، ئایەت وفەرمودەکانیش لە بارەی فەزڵی تێکۆشان وتێکۆشەران زۆرە.

(١) أخرجه الترمذي (٢٦١٦)، وقال: «حسن صحيح». وأحمد في مسنده (٢٣١/٥)، وصححه الألباني «صحيح سنن الترمذي» (٢١١٠). وهو جزء من حديث طويل.

**حیكمەتیش لە شەرعی بونی:** خوا ﷻ بۆ زۆر ئامانجی بەرز ومەبەستی شەریف جیهادی داناوە:

١- جیهاد دانراوە بۆ ئەوەی بت وتاغوت پەرستی لە كۆڵ خەڵك ببێتەوە، ورزگاریان بێت بۆ خوا پەرستی بە تاك وتەنها، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾ [الأنفال: ٣٩] «ئەی باوەڕداران بجەنگن لەگەڵ هاوبەشدانەراندا تا نە شیرك ونە ڕێگری لە دینی خوا نەمێنێت وتەنها خوا بپەرەستێ، بەوەش بەلا لە سەر بەندەكانی خوا نامێنێ لە سەر زەوی، هەروەها تا دین داری وگوێ ڕایەڵی وپەرستن بە تەنها بۆ خوا بێت بە پاكی وبەس».

٢- هەروەها دایناوە بۆ لابردنی ستەم وگێڕانەوەی مافەكان بۆ خاوەنەكانیان، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾ [الحج: ٣٩] «خوا ڕێگەی دا بە موسڵمانان بجەنگن، بە هۆی ئەو ستەم ودەست درێژیەی كراوەتە سەریان، خواش بە توانایە كە سەریان بخات ودوژمنەكەیان سەر شۆڕ بكات».

٣- وەكو چۆن دانراوە بۆ سەر شۆڕ كردن ولوت شكاندنی بێ باوەڕە شەڕ كەرەكان وتۆڵە لێكردنەوەیان، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنْصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ﴾ [التوبة: ١٤] «ئەی باوەڕداران بجەنگن لەگەڵ دوژمنانی خوادا، خوا سزایان دەدات بە دەستی ئێوە، وسەر شۆڕیان دەكات بە دۆڕان، وسەرتان دەخات بە سەریاندا، وشەی خۆی سەر دەخات، وبە دۆڕاندنیان شیفای دڵتان دەدات ئەو دڵانەی كە زۆریان چەشتوە بە دەست بێباوەڕانەوە لە خەم وخەفەت بە هۆی فرت وفێڵیانەوە».

ج. **حوکمەکەی وبەڵگەکەی:**

تێکۆشان بە واتا تایبەتەکەی فـەرزی کیفایەیـە، ئەگـەر ئەوەنـدەی بەسـە پێـی هەستێت، ئەوا لە سەر ئەوانی تر دەکـەوێت ودەرهـەقیان دەبێتـە سـوننەت، لەبـەر فەرمایشـتەکەی خـوا ﷻ: ﴿لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ [النساء: ٩٥] «دواکەوتو ونەهاتوەکان بۆ جیهاد لە پێنـاوی خوا -جگە لە خاوەن عوزرەکان- یەکسان نین لەگەڵ تێکۆشەرانی ڕێی خـوا بـە مـاڵ ونەفسەوە، خوا فـەزڵی تێکۆشـەرانی داوە بەسـەر دواکەوتوانـدا، لـە بەهەشتیشـدا پلەیەکی باڵا وبەرزی پێ بەخشیون، بێگومان خوا بەڵێنی بە هەشتی بە هەر یەك لە تێکۆشەرانی ڕێی خوا بە ماڵ ونەفسیان وبە دواکەوتوان بە هۆی عـوزرەوە داوە، بـە هۆی ئەو هەولانەی لە ڕێگای خوادا دەیدەن، بێگومـانی خـوا فـەزڵی تێکۆشـەرانی داوە بە سەر دانیشتوەکاندا بە پاداشتێکی فراوان». ئـەم ئایەتـە بەڵگەیـە لـە سـەر ئەوەی جیهاد فەرزی کیفایەیە نەك فەرزی عەین، چـونکە خـوای گـەورە بـەراوردی فەزڵی کرد لە نێوان تێکۆشەران ونەهاتوەکان بە بێ عوزر، وکە بەڵێنی بەهەشتی بـە هەردوکیان داوە. خۆ ئەگەر جیهاد فەرزی عـەین بوایە ئـەوا دواکـەوتوان شایسـتەی هەڕەشە بون نەك بەڵێنی چاك. هەروەها لەبەر فەرمایشـتەکەی خـوا ﷻ: ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنْفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ﴾. ئەمەش مەرج دارە بەوەی موسـڵمانان هێـز وتوانایـان هـەبێت بـۆ ڕوبەڕوبونـەوەی دوژمنەکەیان، ئەگەر توانا وهێزیان نەبو لە سەریان دەکـەوێت وەك واجبـەکانی تـر، کە جەنگیان کرد لەگەڵ دوژمنەکەیان -بەم حاڵەوە- خۆیان توشی تیاچون دەکەن.

**د. کەی فەرز دەبێت:**

بەڵام هەندێك حاڵەت هەیە، جیهاد تێیدا دەبێتە فەرزی عەین لە سەر موسڵمان، کە بریتیە لەمانە:

**حاڵەتی یەکەم:** ئەگەر دوژمنان هێرشیان هێنایە سەر وڵاتانی موسڵمانان، هاتنە ناویەوە، یان دەوریان دا، ئەوسا کوشتار لەگەڵ کردنیان ودورخستنەوەی زیانیان فەرزە لە سەر تاك تاکی موسڵمانان.

**حاڵەتی دوەم:** ئەگەر ئامادەی جەنگەکە بو، ئەمەش بەوەی هەر دو سوپا ڕوبەڕو بونەوە وڕیزەکانی هەر دو لا بەرامبەر یەك وەستان، ئەوسا جیهاد فەرز دەبێت وحەرامە لە سەر کەسێك ئامادە بێت شەڕەکە جێ بهێڵێت، وپشت بکاتە دوژمن، لەبەر فەرمایشتی خوا ﷺ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ الْأَدْبَارَ﴾ [الأنفال:١٥]، «ئەی باوەڕداران ئەگەر لە شەڕدا ڕوبەڕوی بێ باوەڕان بونەوە نزیك یەك، پشتیان لێ مەکەن، بەڵکو چەسپاو وخۆڕاگر بن بەرامبەریان»، هەروەها لەبەر ئەوەی پەیامبەر پشت هەڵکردنی ڕۆژی ڕو بە ڕو بونەوەی بە تاوانە گەورە لە ناو بەرەکان هەژمار کردوە(1). بەڵام لەم پشت هەڵکردنە هەڕەشە لێکراوەدا دو حاڵەت هەڵاوێر کراوە:

**یەکەم:** ئەگەر بڕوا هێزی زیاتر بهێنێت.

**دوەم:** یان لا بداتەوە بۆ لای کۆمەڵێکی تری موسڵمانان بۆ بەهێزکردن وسەر خستن.

(١) أخرجه البخاري (٢٧٦٦)، ومسلم (١٤٥).

**حاڵەتی سێیەم:** ئەگەر پێشەوا دیاریان بکات وداوای دەرچونیان لێ بکات بۆ تێکۆشان، لەبەر ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ انْفِرُوا فِي سَبِيلِ اللهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الْأَرْضِ أَرَضِيتُمْ بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنَ الْآخِرَةِ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الْآخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ (٣٨) إِلَّا تَنْفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ [التوبة: ٣٨-٣٩] «ئەی باوەڕداران ئەوە چیتانەوە کە پێتان دەوترێت: دەرچن بۆ جیهادی دوژمنەکانتان لە پێناوی خوادا تەمبەڵی وکەسلانی دەکەن ولە ماڵی خۆتان دادەنیشن، بەشە دونیاییەکانتان ئەخەنە پێش بەشی دواڕۆژتانەوە، ئەوەی ئێوە چێژی لێ وەر دەگرن لە دونیا کەمە وئەڕوا، بەڵام خۆشیەکانی دواڕۆژ کە خوا بۆ تێکۆشەرانی داناوە زۆرە وبەردەوامە * ئەی بڕواداران ئەگەر نەچن بۆ شەڕکردن لەگەڵ دوژمنەکانتان ئەوا خوا سزای خۆیتان بە سەردا دەبارێنێت»، هەروەها فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا» «کە داوای دەرچونتان لێکرا بۆ جیهاد دەربچن»[1].

**حاڵەتی چوارەم:** ئەگەر پێویستیان پێی بو، ئەوا جیهادی لە سەر فەرز دەبێت.

## پرسی دوەم: مەرجەکانی جیهادکردن:

حەوت شت بە مەرج گیراوە بۆ واجب بونی جیهاد، کە بریتیە لە: ئیسلامەتی، وباڵغ بون، وژیری، ونێری، وئازادی، وتوانای ماددی وجەستەیی، وبێ نەخۆشی وئازار.

- بۆیە تێکۆشان واجب نیە لە سەر بێ باوەڕ، چونکە ئەمە پەرستنە، پەرستنیشی لە سەر واجب نیە، ودروستیش نابێت، هەروەها لەبەر ئەوەی خوا

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٨٣٤)، ومسلم (١٣٥٣) من حديث ابن عباس رضي الله عنهما.

مەبەست بون ودەستپاکی وگوێڕایەڵی تێدا فەراهەم نابێت، بۆیە ڕێگەی نادرێت لەگەڵ سوپای موسڵمان بێت بۆ جەنگ، لەبەر ئەوەی پەیامبەر بە کابرای موشریك کە لە شەڕی بەدر بە دوایدا هات، پێی فەرمو: «تُؤْمِنُ بِالله وَرَسُولِه؟» «باوەڕت بە خوا وپەیامبەرەکەی هەیە» وتی: نەخێر، ئەمیش فەرموی: «فَارْجِعْ فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ» «بگەڕێوە یارمەتی ناخوازم لە موشریك»[1].

- هەروەها واجب نیە لە سەر منداڵی پێنەگەیشتو، چونکە تەکلیف لێکراو نیە، هەروەها لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر ﷺ: کە خۆی خستۆتە ڕوی پەیامبەر ﷺ بۆ شەڕی ئوحود، بەڵام وەری نەگرتوە لە ڕیزی تێکۆشەران[2].

- هەروەها شێت لە سەری واجب نیە، چونکە پێنوسی لە سەر هەڵگیراوە، ولە تەکلیف لێکروان نیە.

- لە سەر کۆیلەش واجب نیە، چونکە سەییدەکەی خاوەنداریەتی دەکات.

- هەروەها ئافرەتیش، لەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] عائیشە ﷺ وتی: ئەی پەیامبەری خوا! ئایا ئافرەتان حەجیان لە سەرە؟ فەرموی: «بەڵێ، جیهادێك شەڕی تێدا نیە: حەج وعومرەکردن»[3]. لە لەفزێکی تردا ئەڵێ: دەبینین جیهاد باشترین کارە، ئەی جیهاد نەکەین؟ فەرموی[4]: «لَا، لَكِنَّ أَفْضَلَ الْجِهَادِ حَجٌّ مَبْرُورٌ» «نەخێر، بەس باشترین تێکۆشان حەجێکی بێ سەرپێچیە».

---

(١) أخرجه مسلم (١٨١٧) من حديث عائشة رضي الله عنها.
(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٦٦٤)، ومسلم (١٨٦٨).
(٣) أخرجه ابن ماجه (٢٩٠١)، والبيهقي (٤/٣٥٠) وغيرهما، وصححه الألباني «الإرواء» (١١٨٥).
(٤) أخرجه البخاري (٢٧٩٤) [والزيادة (١٥٢٠)].

- هەروەها بێ توانا، کە ناتوانێت چەك هەڵبگرێت لەبەر لاوازی یا پیری، هەروەها هەژار کە لە بژێوی خێزانەکەی زیاتری نیە بۆ خەرجی ڕێگا، ئەمانە تێکۆشانیان لە سەر نیە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿لَيْسَ عَلَى الضُّعَفَاءِ وَلَا عَلَى الْمَرْضَى وَلَا عَلَى الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنْفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ [مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِنْ سَبِيلٍ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ]﴾ [التوبة:٩١] «خاوەن عوزرەکان لە لاواز ونەخۆش ونەدارەکان کە ئەوەندەیان نیە خۆیانی پێ ئامادە بکەن بۆ **دەرچون،** ئەمانە تاوانیان لە سەر نیە لە دانیشتن ودەرنەچون ئەگەر هاتو موخڵص بن بۆ خوا وپەیامبەرەکەی وئیشیان کرد بە شەرعەکەی، ئەو کەسەی چاکەکارە؛ عورزێکی هەیە لە دەرنەچون وموخڵصە بۆ خوا وپەیامبەرەکەی، هیچ هۆکارێك نیە بۆ سزادانی ولێگرتنی، خواش لێبوردەیە بە چاکەکاران ویە بەزەییە لەگەڵیان». بە هەمان شێوە کەسێك ئازارێك یا نەخۆشیەك یا هەر عوزرێکی تری هەبێت، جیهادی لە سەر واجب نیە، چونکە بێ توانایی واجبێتی ناهێڵێت، هەروەها لەبەر فەرمودەکەی خوا ﷻ: ﴿لَيْسَ عَلَى الْأَعْمَى حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ﴾ [الفتح: ١٧]. «خاوەن عوزرەکان لە کوێر وشەل ونەخۆشەکان تاوانیان لە سەر نیە لە نەکردنی شتە واجبەکان کە ناتوانن ئەنجامی بدەن، وەك جیهاد وهاوشێوەکانی کە پێویستی بە بینای نابینا وساغی شەل وتەندروستی نەخۆش هەیە». هەروەها لەبەر ئایەتی پێشو.

## پرسی سێیەم: ئەو شتانەی جیهادت لە سەر دەخەن:

هەندێك عوزر هەیە جیهاد لە سەر خاوەنەکەی دەخات «مُسْقِطَات الْجِهاد» ئیتر فەرزی عەین بێت یان فەرزی کیفایە، کە بریتیە لەمانە:

١، ٢- شێتی ومنداڵی: لەبەر فەرمودەی [پێشتر]: «قەڵـەم هـەڵگیراوە لـە سـەر سیان: لە سەر شێت تا عاقڵ دەبێـت، خـەوتو تـا هەڵدەسـێت، منـداڵیش تـا بـاڵغ دەبێت».

٣- مێینەیی: بۆیە واجب نیە لە سەر مێینە، پێشتریش باس کرا.

٤- کۆیلەیی: لەبـەر فەرمودەکـەی ئـەبو هـورەیرە ﷺ، پەیامبـەری خـوا ﷺ فـەرموی: «لِلْعَبْدِ الْمَمْلُوكِ الصَّالِحِ أَجْرَانِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْلَا الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَالْحَجُّ، وَبِرُّ أُمِّي، لَأَحْبَبْتُ أَنْ أَمُوتَ وَأَنَا مَمْلُوكٌ» «**کۆیلـەی چـاك دو پاداشتی هەیە**. پاشان ئەبو هورەیرە وتی: سوێند بەوەی نەفسی مـنی بـە دەسـتە، لەبەر جیهادی ڕێی خوا وحەج وچاکەکردن لەگەڵ دایك وبابم نەبوایـە، حـەزم دەکـرد بمرم وکۆیلە بوایەم»[١].

٥، ٦- لاوازی جەستەیی ونەداری، ونەخۆشی، وساغ نەبونی هەندێك ئەنـدام وەك کوێری وشەلیەکی زۆر، وپێشتریش باس کرا.

٧- ڕێگەنەدانی دایك وباوك یا یەکێکیان، ئەمە ئەگـەر تێکۆشـانەکە سـوننەت بو، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر ﷺ، پیاوێك دێتـە خزمـەت پەیامبـەری خـوا ﷺ وداوای هیلانی لێدەکات بۆ تێکۆشان؟ ئەویش فەرموی: «أَحَيٌّ وَالِدَاكَ» «دایـك وباوکت زیندون؟» کابرا وتی: بەڵێ، فەرموی: «فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ» «بڕۆ تایبـەتیان بکـە بە جیهادی نەفس تا لێت ڕازی دەبن»[٢]. جا چاك بون لەگەڵیان فەرزی عەینـە، لـەم حاڵەتەشدا جیهاد فەرزی کیفایەیە، بۆیە فەرزی عـەین پـێش دەخرێـت، بـەڵام کـە

(١) أخرجه البخاري (٢٥٤٨)، وقوله: «والذي نفسي بيده» الصحيح أنه مدرج من كلام أبي هريرة.
(٢) أخرجه البخاري (٣٠٠٤)، ومسلم (٢٥٤٩).

جیهادەکە فەرزی عەین بو ئەوسا بۆیان نیە ڕێگری لـێ بکـەن، وداوای هێڵانیشـیان لێ ناکرێت.

٨- ئەو قەرزەی کابرا نیەتی بیداتەوە وخاوەنەکەشی ئیزنی نادات، وجیهادەکـەش سوننەت بـو، لەبـەر فـەرمودەی: «الْقَتْلُ فِي سَبِيلِ اللهِ يُكَفِّرُ كُلَّ شَيْءٍ إِلَّا الدَّيْنَ» «کوژران لە پێناوی خوا هەمو شتێك دەسڕێتەوە مەگـەر قـەرز»[1]. کـە جیهادەکـە فەرز بو ئەوا ئیزنی خاوەن قەرزی پێویست نیە.

٩- ئەو زانایەی کە کەسی تر لە وڵاتدا نیە جگە لەو، چـونکە ئەگـەر بکوژرێـت خەڵك پێویستیان پێ دەکەوێت، ئاخر چونکە کەس ناتوانێت جێی پـڕ بکاتـەوە، جـا ئەگەر لەو شارەزاتر نـەبو جیهـادی لـە سـەر دەکـەوێت لەبـەر ئـەوەی موسـڵمانان پێویستیانە.

---

(١) أخرجه مسلم (١٨٨٦) من حديث عبد الله بن عمرو بن العاص رضي الله عنهما.

# دەروازەی دووەم

# لە بارەی دیلەکان ودەست کەوتەکانەوە

چەند پرسێکی تێدا باس کراوە:

## پرسی یەکەم: حوکمی دیلی بێ باوەڕان:

زۆربەی زانایان پێیان وایە -ئەمەش ڕاستە-: کە بڕیاری دیلی بێ باوەڕان لای پێشەوایە، سەر پشك دەکرێ لەوەی بەرژەوەندی ئیسلام وموسڵمانانی تێدایە لە: کوشتن، وبە کۆیلەکردن، ومننەتکردن بێ بەرامبەر، وگۆڕینەوە وڕزگارکردن بە بەرامبەر «الفداء» ئیتر پارە بێت یا سودێك یا دیلێکی موسڵمان. سەبارەت بە ژن ومنداڵیش هەر بە گرتنیان دەبنە کۆیلە، ئەچنە ڕیزی سامانەوە وئەخرێنە نێو دەستکەوت، وپێشەوای تێدا سەر پشك ناکرێ، ودروستیش نیە بکوژرێن، چونکە ڕێگری لەوە کردوە[1].

**بەڵگەش لە سەر کوشتن:** فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾ [التوبة:٥] «جەنگ ڕا بگەیەنن لە دژ هاوبەش دانەران لە هەر کوێ بون»، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ﴾ [الأنفال:٦٧] «گونجاو نیە بۆ هیچ پەیامبەرێك دیلی جەنگی هەبێت تا زۆریان لێ نەکوژێت بۆ ئەوەی ترس بخاتە دڵیانەوە، جارێکی تر هێرش نەهێنن»، خوا

(١) [انظر: «صحيح البخار» كتاب الجهاد..، باب قتل الصبيان في الحرب (٣٠١٤). وباب قتل النساء في الحرب (٣٠١٥)، و«صحيح مسلم» كتاب الجهاد..، باب تحريم قتل النساء والصبيان في الحرب (١٧٤٤)، وباب تأمير الإمام الأمراء على البعوث وصيته إياهم بآداب الغزو وغيرها (١٧٣١)]

باسی ئەوە دەكات كە كوشتنی هاوبەشدانەران لە شەڕی بەدردا لە پێشتر بو وەك گرتن وبە بەرامبەر بەردانیان. هەروەها لەبەر فەرموودەكەی ئەنەس[1]، كە پەیامبەر خوا ﷺ لە ساڵی فەتحدا چوە مەككە وكلاوی لە سەر بو، كە دایكەند پیاوێك هات وتی: ئیبن خەتەل دەستی گرتوە بە پەردەی كەعبەوە، فەرموی: «بیكوژن». هەروەها پیاوانێكیشی لە خێڵی قورەیزە كوشت.

**بەڵگەش لە سەر بە كۆیلە كردن:** فەرموودەكەی ئەبو سەعیدی خودریە باسی چیرۆكی بەنی قورەیزە دەكات، كە ڕازی بون بە حوكمی سەعدی كوڕی موعاز، ئەویش بڕیاری داوە شەڕ كەرانیان بكوژرێن وئافرەتیان بە كۆیلە بكرێن[2].

**بەڵگەش لە سەر مننەت كردن، وخستنە بەر وگۆڕینەوە:** فەرمایشتەكەی پەروەردگارە: ﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنْتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا﴾ [محمد:٤] «ئەی باوەڕداران ئەگەر گەیشتنە بێ باوەڕان لە گۆڕەپانی جەنگدا، بە دڵەوە لەگەڵیاندا بجەنگن، بدەن لە گەردنیان، كە لاوازیانتان كرد بە زۆری كوشتارەكان، وهێزتان لێیان بڕی وتوانایان نەما، ئەوسا توند دەستیان ببەستنەوە وكەلەپچەیان بكەن، ئیتر یا ئەوەیە مننەتیان بە سەردا دەكەن وبە بێ بەرانبەر ڕزگاریان دەكەن، یان دەیانگۆڕنەوە بە سامان یا شتی تر، لە سەر ئەمەش بەردەوام بن تا شەڕ كۆتایی پێ دێت». وئەبێت پێشەوا لەمانە بەرژەوەندیدار ترینەكەی بكا، چونكە هەڵس وكەوتەكەی بۆ خۆی نیە، بۆیە ئەبێت ڕەچاوی بەرژەوەندی بكات.

---

(١) أخرجه البخاري (١٨٤٦)، ومسلم (١٣٥٧).

(٢) أخرجه البخاري (٣٠٤٣).

## پرسی دوەم: دابەشکردنی دەست کەوت لە نێوان بەشداربوان:

دەست کەوت (الغَنِيْمَة): ئەو ماڵانەی کافرانە کە بە زۆر لە شەڕ دا دەبرێت، بەشێوەیەك کە بەرز ڕاگرتنی وشەی خوای تێدا بێت. ئەنفالیشی پێ دەوترێ -کۆی نەفل «زیادە»یە- چونکە زیادبونێکە لە ماڵی موسڵمانان. بەڵگەش لە سەر شەرعی بونی، فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَالًا طَيِّبًا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ [الأنفال: ٦٩] «جا بخۆن لە دەستکەوتەکان ئەوە حەڵاڵە وپاکە بۆتان، وپارێزگاریش بکەن لە ئەحکامەکانی دین، خوا لێبوردەیە بەرانبەر بەندەکانی». خوای میهرەبانیش دەستکەوتی تەنها بۆ ئەم ئوممەتە حەڵاڵ کردوە، پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: «وَأُحِلَّتْ لِيَ الْغَنَائِمُ وَلَمْ تَحِلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي» «دەستکەوتیشم بۆ حەڵاڵ کراوە وبۆ هیچ پەیامبەرێکی پێش من حەڵاڵ نەبوە»[(١)].

غەنیمەتیش: ماڵە گوازراوەکان (المَالُ المَنْقُول)[(٢)]، ودیل، وزەوی دەگرێتەوە.

وزۆربەی زانایان لە سەر ئەوەن کە دەستکەوت دەکرێتە پێنج بەشەوە:

**بەشی یەکەم:** بەشی پێشەوا، کە بریتیە لە پێنجیەکی دەستکەوت پێشەوا یا جێگرەکەی دەری دەکات. ئەم پێنج یەکەش بەو شێوازە دابەش دەکرێت کە خوا باسی کردوە لە ئایەتی: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ [الأنفال: ٤١] «وبزانن ئەی

---

(١) أخرجه مسلم (٥٢١).

(٢) [**ماڵی گوازراوە:** ئەو ماڵەیە دەکرێت بگوازرێتەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، جا پارە وپول وئاژەڵان وکێشراوەکان وپێوراوەکان دەگرێتەوە. **ماڵی نەگوازراوەش:** ئەوەیە کە ناکرێت لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بگوازرێتەوە وەك ئەرز وخانوبەرە وهاوشێوەکانی، کە پێیان دەوترێت: عەقار. بڕوانە: «المعاملات المالية أصالةً ومعاصرةً» (١/٢٥٥)].

ئیمانداران ئەوەی زەفەری پێ دەبەن لە سامانی دوژمنەکانتان لە کاتی جیهاد لە پێناوی خوادا ئەوا چوار لە پێنجی بۆ جەنگاوەرانی بەشداربوە، پێنج یەکەکەی تر دەکرێتە پێنج بەشەوە ودەدرێتە: خوا، وپەیامبەرەکەی ولە بەرژەوەندی گشتیدا بە کاردەهێنرێت، وبنەماڵەی پەیامبەر چونکە زەکاتیان بۆ حەلاڵ نیە، وهەتیوان، ونەداران، ورێبواران» جا ئەمە دەکرێتە پێنج بەشەوە:

١- **بۆ خوا وپەیامبەرەکەی:** ئەمەش ئەبێتە فەی ودەڕواتە خەزێنەی دەوڵەتەوە ولە بەرژەوەندی گشتیدا خەرج دەکرێت، لەبەر فەرمودەی: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا لِي مِمَّا أَفَاءَ اللهُ عَلَيْكُمْ، وَلَا مِثْلُ هَذِهِ، إِلَّا الْخُمُسَ وَالْخُمُسُ مَرْدُودٌ عَلَيْكُمْ» «سوێند بەوەی نەفسی منی بە دەستە، هیچم بۆ نیە لەو دەستکەوتانەی ئێوە تەنانەت شتێکی ئاوهاش بێت -یانی تەڵە مویەك-، مەگەر پێنج یەك، ئەویش ئەگەڕێتەوە بۆ خۆتان»[(١)]. جا دەبینی کردیە هی هەمو موسڵمانان.

٢- **خزمان:** کە بریتین لە بنەماڵەی پەیامبەر ﷺ، کە بریتین لە: خانەوادەی هاشم، وخانەوادەی موتەللیب. ئەم پێنج یەکەشیان لە نێوان دابەش دەکرێت بە پێی پێویستی.

٣- **هەتیوان:** بریتیە لەوەی باوکی مردوە پێش باڵغ بون، نێر بێت یا مێ، بەڵام ئەگەر هاتو دەوڵەمەند بو ئەوا پێی نادرێت.

٤- **هەژاران:** هەروەها نەدارانیش دەگرێتەوە.

---

(١) أخرجه أبو داود (٢٦٩٤)، والنسائي (٤١٣٨) [واللفظ لمالك (٤٤٢/١٦٦٦) مؤسسة زايد] في حديث طويل، وصححه الألباني في «إرواء الغليل» (١٢٤٠) [ولو نظرت في «الإرواء» لعملت أن إيراد حديث عمرو بن عبسة أولى وهو عند أبي داود (٢٧٥٥)].

٥- **ڕێبوار:** بریتیە لەو موسافیرەی لە وڵاتی خۆی دابڕاوە، ئەوەندەی پێ دەدەیت بگاتە شوێنی مەبەست.

**بەڵام چوار بەشەكەی تر** -چوار لە پێنجەكە-، بۆ هەر كەسێكە بەشداری كردبێت، لە پیاوە باڵغە ئازاد وعاقڵەكان، ئەوانەی ئامادەی «استعداد» شەڕ بون ئیتر شەڕی كردبێت یان نا، بەهێز بێت یان لاواز، لەبەر وتەكەی عومەر ﷺ: «**إِنَّمَا الْغَنِيمَةُ لِمَنْ شَهِدَ الْوَقْعَةَ**» «دەستكەوت بۆ ئەوانەیە بەشداری شەڕیان كردبێت»[1].

**چۆنێتی دابەشكردنەكەی:**

پیادە -كە لە سەر پێكانی جەنگاوە- یەك بەشی پێ دەدرێت، وسواریش -كە لە سەر ئاژەڵەكەی جەنگاوە- سێ بەشی پێ دەدرێت؛ بەشێكی بۆ خۆی ودوانەكەی تریش بۆ ئاژەڵەكەی، لەبەر فەرمودەكەی ئیبن عومەر ﷺ: كە پەیامبەری خوا ﷺ دەستكەوتی دابەشكرد: بۆ وڵاخ دو بەش وبۆ پیادە بەشێك[2]. ولەبەر ئەوەی لە خەیبەریش ﷺ وای كرد: بۆ پیادە بەشێكی دانا وبۆ سواریش سێ بەش[3].

ئافرەت وكۆیلە ومنداڵانیش ئەگەر بەشداری شەڕەكەیان كرد، ئەوەی ڕاستە شتێكیان پێ دەدرێت «يُرْضَخُ لهم»[4] بەڵام بەشی دیاری كراویان نیە، چونكە ئیبن عەبباس كە پرسیاری لێ كرا وتی: نامەت نوسیوە ودەپرسی لە بارەی ئافرەت وكۆیلەوە كە بەشداری شەڕ دەكەن، هیچیان پێ دەدرێت؟ ئەمانە بەشی دیاری

---

(١) رواه البيهقي بإسناد صحيح (٩/٥٠) كتاب الجهاد، باب الغنيمة، وعبد الرزاق في مصنفه (٥/٣٠٢)، [وسعيد بن منصور (٢٧٩١)، وابن أبي شيبة (٣٣٩٠٠)، والطبراني في «الكبير» (٨٢٠٣)].

(٢) أخرجه البخاري (٤٢٢٨)، ومسلم (١٧٦٢).

(٣) أخرجه البخاري (٢٨٧٣).

(٤) الرَّضْخ: شت پێدان بەڵام زۆر نەبێت.

کراویان نیە مەگەر هەر وا شتێکیان پێ بدرێت[1]. لە لەفزێکدا: بەڵام کۆیلە هەر وا بەشی دەدرا[2].

ئەگەریش دەستکەوتەکە زەوی بو، پێشەوا سەر پشك دەکرێت لە نێوان دابەشکردنی بەسەر بەشداربواندا، وەقفکردنی بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان وسەرانەیەکی بەردەوام دەسێنرێت (وەر دەگیرێت) لەو کەسەی لە لایەتی، ئیتر موسڵمان بێت، یا ئەهلی زیمە، هەمو ساڵێك لێی وەر دەگیرێت. ئەم سەر پشککردنەش سەر پشککردنە بۆ بەرژەوەندی.

## پرسی سێیەم: «الفيء» بە کێ دەدرێت؟

«**الفيء**»: بریتیە لەو سامانەی بە ڕەوا لە شەڕکەران دەبرێت بە بێ کوشتار، وەك: ئەو ماڵانەی بێ باوەڕان ڕادەکەن وبە جێی دەهێڵن لە ترسا کە ئەزانن موسڵمانان هاتون.

شوێنی خەرج کردنیشی: برتیە لە بەرژەوەندی موسڵمانان بە گوێرەی ڕوانگەی پێشەوا، وەك موچەی دادوەر وبانگ بێژ وپێش نوێژ وزانا ومامۆستاکان وجگە لەمانەش لە بەرژەوەندی موسڵمانانن، بە بەڵگەی ئەوەی لە عومەرەوە ﵁ چەسپاوە وتویەتی: سامانی خێڵی نەدیر لەو فەیئە بو کە خوا بەخشیە پەیامبەر کە موسڵمانان بۆ بە دەستهێنانی نە ئەسپ ونە وشتریان تاو نەدا، بەڵکو بە بێ کوشتار هاتە دەست، بۆیە بۆ پەیامبەری خوا بو بە تەنها، جا ساڵەکە لەوە بژێوی

(١) أخرجه مسلم (١٨١٢).
(٢) أخرجه أبو داود (٢٧٢٧).

خانەوادەکەی دەدا، چیش بمایەتەوە لە ئەسپ وچەکەکاندا خەرجی دەکرد وەك ئامادەکاری بۆ جیهاد لە پێناوی خوا[1].

هەر بۆیە لە ڕونکردنەوەی ئەوەی فەیئەکە بە کێ دەدرێت خوا ﷻ باسی هەمو کۆمەڵێکی موسڵمانان دەکات وئەفەرموێ: ﴿مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنْكُمْ﴾ [الحشر: ٧] «ئەو فەیئەی خوا بۆ پەیامبەری هێنایەوە لە ماڵی هاویەشدانەرە شار نشیەکان بە بێ ئەسپ وشتر تاودان، ئەو دەستکەوت وفەیئە دەدرێت بە: خوا وپەیامبەرەکەی -ئەمەش لە بەرژەوەندی گشتی موسڵمانان خەرج دەکرێت-، وبە بنەماڵەی پەیامبەر، وهەتیوان، وهەژاران، وڕێبواران. ئەمەش بۆ ئەوەی ماڵ وسامان تەنها لە نێوان دەوڵەمەندەکاندا ئاڵوگۆڕی پێ نەکرێت». پێشەواش بە بێ دیاری کردن لێی دەبات، وبە بۆچونی خۆی بەشی بنەماڵەی پەیامبەریشی لێ دەدات، باقیەکەشی لە بەرژەوەندی موسڵماناندا خەرج دەکات.

(١) أخرجه البخاري (٢٩٠٤)، ومسلم (١٧٥٧). و«الكُرَاع»: الخيل.

# دەروازەی سێیەم

# لە بارەی ئاگربەست وئەهلی زیممە وئەمان پێدراوانەوە

# «الهُدنَه والذِّمَّه والأمان»

باسی چەند پرسێکی تێدایە:

## پرسی یەکەم: بەستنی ئاگربەست لەگەڵ بێ باوەڕاندا:

**١- پێناسەکەی:**

«الهُدْنَة»: لە زماندا بێدەنگیە.

لە شەرعیشدا بریتیە لە پەیمان بەستنی پێشەوا یا جێگرەکەی لەگەڵ بێ باوەڕاندا لە سەر شەڕنەکردن بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بە گوێرەی پێویستی با درێژەش بکێشێت، پێشی دەوترێت: مهادنة، وموادعة، ومعاهدة.

**٢- شەرعیەت بونی وبەڵگەکەی:** دروستە پێشەوا ئاگربەست لەگەڵ کافراندا گرێ بدات لە سەر شەڕ نەکردن بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بە گوێرەی پێویست، ئەگەر بەرژوەندی موسڵمانان لە بە ستنیدا هەبو، وەك لاوازیان یان ئامادەبونیان وجگە لەمانەش لە بەرژوەندیەکان وەك ئومێد بون لە موسڵمان بونی بێباوەڕان وهاوشێوەکانی، لەبەر ئایەتی: ﴿وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا﴾ [الأنفال:٦١] «ئەگەریش مەیلی شەڕنەکردن وئاشتیان هەبو لەگەڵت، تۆش ئەو مەیلەت هەبێت ئەی پەیامبەری خوا». هەروەها پەیامبەر ﷺ دە ساڵ ئاگر بەستی کرد گرێ دا لەگەڵ کافراندا لە ئاشتەوایی حودەیبیە دا، هەروەها صوڵحی کرد لەگەڵ جولەکەکانی مەدینە.

## ٣- پابەندبون بە ئاگربەستەوە:

- ئەو ئاگربەستەی کە پێشەوا یا جێگرەکەی گرێی داوە جێ بەجێ دەبێت «لازمة»؛ دروست نیە بشکێنرێ، یا هەڵبوەشێنرێتەوە، مادام بەرامبەرەکە پێوەی پەیوەستن وخیانەت ناکەن، وترسی خیانەتیشیانمان نیە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَمَا اسْتَقَامُوا لَكُمْ فَاسْتَقِيمُوا لَهُمْ﴾ [التوبة: ٧] «جا تا پابەند بون بە پەیمانەکەیانەوە، ئێوەش پابەند بن پێوەی». هەروەها خوا ﷻ ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾ [المائدة: ١] «ئەی باوەڕداران پەیمانەکان ببنە سەر وپابەند بن پێوەی، کە دژی قورئان سوننەت نیە».

- ئەگەریش پەیمانەکەیان شکاند: بە شەڕکردن، یان پشتگیری کردنی دوژمنێکمان لە دژمان، یا کوشتنی موسڵمانێك، یا بردنی سامانێك، ئەوا گفتەکەی نێوانمان هەڵدەوەشێتەوە ودروستە شەڕیان لەگەڵدا بکرێت، لەبەر فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿وَإِنْ نَكَثُوا أَيْمَانَهُمْ مِنْ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا فِي دِينِكُمْ فَقَاتِلُوا أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لَا أَيْمَانَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنْتَهُونَ﴾ [التوبة: ١٢] «ئەگەر هاوبەشدان ئەو پەیمانەیان شکاند کە لەگەڵیاندا بەستوتانە، وبە ئاشکرا تانەیان دەدا لە دینی ئیسلام، ئەوا بجەنگن لەگەڵیاندا چونکە ئەوانە سەرانی گومڕایین، نە پەیمانیان هەیە ونە ئەمان، تا واز دەهێنن لە بێ باوەڕی ودوژمنایەتیان بۆ ئیسلام».

- ئەگەریش مەترسی هەبو لە شکاندنی پەیمانەکە، نیشانە هەبو ئاماژە بون لە سەر ئەمە، ئەو کاتە دروستە پەیمانەکە بشکێنین ولە سەر گفتەکە نەمێنینەوە، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِنْ قَوْمٍ خِيَانَةً فَانْبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ [إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْخَائِنِينَ]﴾ [الأنفال: ٥٨]، یانی: وئەگەریش ئەی پەیامبەری خوا لە خیانەت

وغەدری کۆمەڵێك ترسایت، دەبینی سەرەتاکانی خیانەتیان دەرکەوتوە ئەوا، پێیان ڕابگەیەنە کە پەیمانەکە ئیتر شکاوە، بۆ ئەوەی تۆ وئەوانیش هەر دو لا بزانن، دروست نیە شەڕیان لەگەڵدا بکەیت پێش پیٚ ڕاگەیاندنی نەمانی پەیمانەکە.

## پرسی دوەم: پەیمان گریٚ دان، وسەرانە دان:

### ١- پێناسەی «عَقْدُ الذِّمَّة»:

«الذِّمَّة» لە زماندا: پەیمانە، کە بریتیە لە ئەمان وگرەنتی «ضمان».

وپەیمان گرێدانیش لە شەرعدا: بریتیە لە داننان بە مانەوەی هەندیٚ لە بیٚ باوەڕان لە سەر بیٚ باوەڕی خۆیان بە مەرجی سەرانەدان، وپابەندبون بە ئادابەکانی ئەو دینەی کە ئیسلام حوکمی لە سەر ئەوان پیٚ کردوە.

### ٢- شەرعی بونی:

بەڵگەی شەرعی بونی پەیمان گرێدان، فەمایشتەکەی خوایە: ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ [التوبة: ٢٩] «ئەی موسڵمانان بجەنگن لەگەڵ ئەو بێباوەڕانەی بڕوایان بە خوا وزیندو بونەوە نیە، ودور ناکەونەوە لەوانەی خوا وپەیامبەرەکەی ڕێگریان لیٚ کردوە، وپابەند نابن بە ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلامەوە لە جولەکە وگاورەکان، تا بە دەستی خۆیان بە زەلیلی وسەرشۆڕیەوە ئەو سەرانەیە دەدەن کە خوا لە سەریانی سەپاندوە»، هەروەها لەبەر فەرمودەکەی بورەیدە ﷺ، کە پەیامبەر ﷺ فەرمویەتی: «ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الْإِسْلَامِ، فَإِنْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ... فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَسَلْهُمُ الْجِزْيَةَ» «پاشان بانگیان بکە بۆ ئیسلام، ئەگەر بە دەمتەوە هاتن ئەوا وەری بگرە

لێیان ودەستیان لێ هەڵبگرە... ئەگەریش بە دەمتەوە نەهاتن وڕازی نەبون ئەوە داوای سەرانە وجیزیەیان لێ بکە»[1].

### ٣- کێ سەرانەی لێ وەر دەگیرێت؟

سەرانە وەردەگیرێت لە پیاوی تەکلیف لێکراوی ئازادی دەوڵەمەند کە توانای دانی هەبێت. جا لە کۆیلە وەرناگیرێت، چونکە خاوەن هیچ نیە وەك هەژار وایە. لە ئافرەت ومنداڵ وشێتیش وەرناگیرێت، چونکە خەڵکی شەڕکەر نین. لە بەردەوام نەخۆش وپیری بەتەمەنیش وەرناگیرێت، چونکە خوێنیان پارێزراوە وەك ئافرەتان وان.

**٤- پەیمان گرێدان چی پێویست دەکات؟** بەستنی ئەم گفتە لەگەڵ بێ باوەڕاندا ئەم شتانە پێویست دەکات:

- حەرامێتی کوشتاریان.
- وپارێزگاری کردن لە سەر وماڵیان.
- وپاراستنی ناموسیان.
- وزەمانەت کردنی ئازادیان.
- وئازار نەدانیان.
- وسزادانی کەسێك بیەوێت ئازاریان بدات.

لەبەر فەرمودەکەی [پێشو] پەیامبەری خوا ﷺ: «پاشان بانگیان بکە بۆ ئیسلام، ئەگەر بە دەمتەوە هاتن ئەوا وەری بگرە لێیان ودەستیان لێ هەڵبگرە... ئەگەریش بە دەمتەوە نەهاتن وڕازی نەبون ئەوا داوای سەرانە وجیزیەیان لێ بکە».

## پرسی سێیەم: ئەمان بەستن:

### ١- پێناسەی «عَقْدُ الأمَان»:

---

(١) أخرجه مسلم (١٧٣١).

لە زماندا ئەمان دژی ترسە. لە شەرعیشدا: بریتیە لە مسۆگەر کردنی ئاسایشی ماڵ وخوێنی بێ باوەڕ بۆ ماوەیەکی دیاری کراو.

**٢- شەرعی بوونی وبەڵگەکەی:** بنەما لە بارەی ئەمان بەستنەوە، فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ﴾ [التوبة:٦] «ئەگەر یەکێك لەو هاوبەشدانەرانەی خوێن وماڵیان حەڵاڵ بوە داوای پەنا وئەمانی لێ کردیت، -ئەی پەیامبەری خوا- بە دەم داواریەکەی بڕۆ وئەمانی بدە بەشکو گوێی لە قورئان بێت، وڕێنماییەکانی ببیستێت، دوای ئەوە بیگێڕەوە ئەو شوێنەی بە ئەمان لێوەی هات، ئەمەش بۆ ئەوەی ئیقامە حوجحە بکرێت».

**٣- هی کێ دروستە، ومەرجەکانی:**

ئەمان بەستن لە هەر موسڵمانێکەوە بکرێت دروست ئەبێت، بە مەرجێك ئەبێت:

- عاقڵ بێت.

- وبالغ بێت: جا هی شێت ومنداڵ دروست نابێت.

- بە ویستی خۆی بێ: جا هی زۆرلێ کراو وسەکران ولە هۆش چو دروست نابێ.

جا هی ئافرەت دروست ئەبێت، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «قَدْ أَجَرْنَا مَنْ أَجَرْتِ يَا أُمَّ هَانِئٍ» «ئەوە ئەمانی ئەوەمان دا کە تۆ پەنات دا ئەی ئوم هانی»[1]. تەنانەت هی کۆیلەش دروست ئەبێت، لەبەر فەرمودەکەی ﷺ: «ذِمَّةُ

---

(١) أخرجه مسلم (٣٣٦) -٨٢

الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ، يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ». «ئـەمانی موسـڵمانان هـەموی وەك یەكـە، كەمترین پلەیان ئەیگرێتە ئەستۆ»[1].

**ئەمانیش گشتی ئەبێت:** ئەگەر لە پێشەواوە بو بۆ سـەرجەم هاویـەش دانـەران، یان لە لایەن ئەمیرەوە بۆ دانیشتوانی شارەكەی. وتایبەتیش ئەبێت: لـە تـاك تـاكی موسڵمانانەوە بۆ تاكێكی دوژمنان. ئەمان دانی گشـتیش لـە دەسـەڵاتی پێشـەوای موسڵمانانە، چونكە دەسەڵاتەكەی گشتیە، بۆ كەسیش نیە ئەمە بكات مەگـەر بـە ڕەزامەندی ئەو.

**ئەمانیش بەدی دێت** بە هەر قسـەیەك بەڵگـە بێـت لـە سـەری، وەك: «تـۆ لـە ئەمانداییت»، یا: «پەنام دایت»، یـا: «هیچـت پـێ ناكرێـت» «لا بأس عليك»، یـا ئاماژەیەكی واتادار.

**«المُسْتَأْمِن»یش:** بریتیە لەوەی داوای ئەمان دەكات تا گوێی لە قسەی خوا بێـت وشەریعەتی ئیسلام بناسێت، جا ئەبێت وەڵام بدرێتەوە لەبەر ئایەتی پێشـو، پاشـان بگێڕدرێتەوە شوێنی ئەمانی خۆی.

٤- **حوكمی ئەمان، وچی پێویست دەكات:** پابەنـد بـون بـە ئـەمان بەسـتنەوە پێویستە، بۆیە حەرامە ئەمان پێ دراو بكوژرێت یا بە دیل بگیرێـت یـا بـە كۆیلـە بكرێت، لەگەڵ هەمو ئەو شتانەی تر لە كە لە پەیمانی ئەمانەكەدا هاتوە پابەند بـون پێوەی واجبە. دروستیشە ئەمانەكە لە سەر دوژمن لا ببرێت ئەگەر مەترسـی خراپـە وخیانەتیان هەبو.

(١) أخرجه البخاري (٣١٧٢)، ومسلم (١٣٧٠).

# حەوتەم: بەشی موعامەلات «الْمُعَامَلات»

لە بیست وسێ دەروازە پێك هاتوە:

دەروازەی یەکەم: کڕین وفرۆشتن.

دەروازەی دوەم: سو.

دەروازەی سێیەم: قەرز.

دەروازەی چوارەم: بارمتە.

دەروازەی پێنجەم: سەلەم.

دەروازەی شەشەم: گواستنەوەی قەرز.

دەروازەی حەوتەم: بریکاری.

دەروازەی هەشتەم: کەفالەت وزەمانەت.

دەروازەی نۆیەم: حەجرکردن.

دەروازەی دەهەم: شەریکایەتی.

دەروازەی یانزەهەم: کرێدان.

دەروازەی دوانزەهەم: موزارەعە وموساقات.

دەروازەی سیانزەهەم: شوفعە وهاوسێیەتی

دەروازەی چواردەهەم: سپاردن ولەوناوچون

دەروازەی پانزەهەم: داگیر کردن

دەروازەی شانزەهەم: ئاشتەوایی

دەروازەی حەڤدەهەم: پێشبڕکێ

دەروازەی هەژدەهەم: دەستیار

دەروازەی نۆزدەهەم: بوژانەوەی زەوی مردو

دەروازەی بیستەم: جیعالە

دەروازەی بیست ویەکەم: دۆزینەوە ودۆزراوە

دەروازەی بیست ودوهەم: وەقف

دەروازەی بیست وسێیەم: دیاری وبەخشین

## دەروازەی یەكەم

## لەبارەی كڕین وفرۆشتنەكانەوە «البُيُوع»

چەند پرسێكی لە خۆ گرتوە:

**پرسی یەكەم: پێناسەی كڕین وفرۆشتن وحوكمەكەی؟**

**أ. پێناسەكەی:**

بەیع لە زماندا: بردنی شتێك وپێدانی شتێكە.

لە شەرعیشدا: گۆڕینەوەی ماڵێكە بە ماڵێكی تر -با لە ئەستۆش بێت- یا سودێكی حەلاڵ بۆ هەمیشەیی، نە سو بێت ونە قەرز.

**ب. حوكمەكەی:**

كڕین وفرۆشتن دروستە بە بەلگەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ﴾ [البقرة: ٢٧٥] «خوا كڕین وفرۆشتنی حەلاڵ كردوە، وسو خواردنیشی حەرام كردوە». هەروەها لەبەر فەرمودەكەی ئیبن عومەر كە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «إِذَا تَبَايَعَ الرَّجُلَانِ، فَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا، وَكَانَا جَمِيعًا» «ئەگەر دو كەس كڕین وفرۆشتنیان كرد ئەوە هەر دوكیان سەر پشكن تا لە یەك جیا نەبو بێتنەوە وپێكەوە بن»[1]. موسڵمانانیش كۆكن لە سەر دروستێتی كڕین وفرۆشتن بە گشتی. پێویستی خەڵكیش ئەیخوازێت ببێت؛ چونكە مرۆڤ پێویستی ئەكەوێت بەوەی لای غەیرە خۆیەتی وبەرژەوەندی ئەوی پێوە پەیوەستە، هیچ ڕێگەكیش نیە

---

(١) متفق عليه: رواه البخاري برقم (٢١١٢)، ومسلم برقم (١٥٣١).

بۆ گەیشتن پێی وبە دەستهێنانی مەگەر بە کڕین وفرۆشتن، بۆیە دانایی دەخوازێت دروست وشەرعی بێت بۆ گەیشتن بەوەی دەتەوێ.

## پرسی دووەم: پایەکانی کڕین وفرۆشتن:

**پایەکانی سیانن:** گرێدەر، وگرێ لە سەر دراو، وشێوازەکەی «الصیغة».

- گرێدەرەکە: کڕیار وفرۆشیار دەگرێتەوە.

- گرێ لە سەر دراویش: فرۆشراوەکەیە.

- صیغەکەش بریتیە لە: ئیجاب وقەبوڵ کردن «الإیجاب والقبول».

ئیجابیش: بریتیە لەو لەفزەی لە فرۆشیارەوە دەردەچێت، وەك بڵێت: فرۆشتم.

قەبولکردنیش: بریتیە لەو لەفزەی لە کڕیارەوە دەردەچێت[1]، وەك بڵێت: کڕیم.

ئەمە بریتیە لە شێوازی وتەیی.

شێوازی کردەییش بریتیە لە پێدان وەرگرتن «المعاطاة»، وەك ئەوەی کڕیار نرخی کاڵاکە بداتە فرۆشیار، ئەویش کاڵاکەی پێ بدات بە بێ هیچ قسەیەك.

## پرسی سێیەم: شایەتگرتن لە سەر کڕین وفرۆشتن:

شایەتگرتن لە سەر کڕین وفرۆشتن سوننەتە واجب نیە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَأَشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ﴾ [البقرة:٢٨٢] «وشاهید بگرن بۆ کڕین وفرۆشتن بۆ ئەوەی کێشە ودو بەرەکی دروست نەبێت». جا خوا ﷻ فەرمانی کرد بە شایەت گرتن لە

(١) [بۆچونێکی تر هەیە وا دەر دەکەوێ نزیکتر بێت: ئیجاب ئەو لەفزەیە کە لە یەکەم کەسەوە دەر دەچێت].

کڕین وفرۆشتندا، ئەوەنـدە نـەبێت ئـەم فەرمانـە بـۆ سـوننەت بونـە، بـە بەڵگـەی فەرمایشتەکەی تری خوا ﷻ: ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ﴾ [البقرة:٢٨٣] «ئەگەریش متمانەتان بە یەکتر هەبو ئەوا نەنوسین وشـایەتنەگرتن ونـەبونی بارمتە هیچی تێدا نیە». ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی فەرمانەکە بۆ ڕێ نیشاندانە، بە مەبەستی بە بەڵگە کردن (التَّوثِيق) وبەرژەوەندی. هەروەها لـە عومـارەی کـوڕی خزەیمەوە، مامی بۆی گێڕاوەتەوە -کە لە هـاوەڵانی پەیامبـەرە ﷺ-[1]: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ ابْتَاعَ فَرَسًا مِنْ أَعْرَابِيٍّ فَاسْتَتْبَعَهُ النَّبِيُّ ﷺ لِيَقْضِيَهُ ثَمَنَ فَرَسِهِ، فَأَسْرَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمَشْيَ، وَأَبْطَأَ الْأَعْرَابِيُّ، فَطَفِقَ رِجَالٌ يَعْتَرِضُونَ الْأَعْرَابِيَّ فَيُسَاوِمُونَهُ بِالْفَرَسِ، وَلَا يَشْعُرُونَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ ابْتَاعَهُ» «پەیامبـەر ﷺ ولاخێکـی لـە دەشتەکیەك کڕیوە، ئەمیش دوای کەوتوە تا پارەی ولاخەکەی لێ وەر بگرێت، بـەڵام پەیامبەر ﷺ خێراتـر ڕۆیشـتوە ودەشـتیەکەش خـاو بـوە، ئـیتر خـەڵکیش ڕێیـان پێدەگرت وسەودا ومامەڵەی ولاخەکەیان لەگەڵ دەکرد، نەیان دەزانی کـە پەیامبـەر ﷺ کڕیویەتی. ڕوی مەبەست لە بەڵگەکە: ئەوەیـە پەیامبـەر ﷺ ولاخەکـەی لـێ دەکڕێت وهیچ شاهیدێکیش نیە لە نێوانیان، ئەگەریش لە کـڕین وفرۆشـتن دا واجـب بوایە، پەیامبەر ﷺ بە بێ شایەت گرتن نەیدەکڕی.

هاوەڵانیش ﷿ لە سەردەمی ویدا ﷺ لە بازاڕەکان کڕین وفرۆشـتنیان دەکـرد، لێیانەوە نەهاتوە فـەرمانی پێکـردبێتن بـە شـایەتگرتن، ولـە خۆشـیانەوە نـەهاتوە کردبێتیان.

(١) أخرجه أحمد (٥/٢١٥)، وأبو داود (٣٦٠٧)، والنسائي (٧/٣٠١)، «صحيح سنن النسائي» (٤٣٣٢).

هەروەها لەبەر ئەوەی کڕین وفرۆشتن لەو شتانەیە لە ژیـانی ڕۆژانـەی خـەڵك لـە بازەڕکاندا زۆر ڕو دەدات، جا ئەگەر لە سـەر هـەمو شـتێك شـایەت بگـرن ئەبێتـە مایەی بارگرانی وناڕەحەتی.

بەڵام ئەگەر کاڵاکە لە گرێ بەستە گەورەکان بو، نرخەکەشی قەرز بـو، پێویسـتی دەکرد بە بەڵگە بکرێت، ئەوە ئەبێت بنوسرێتەوە وشایەتیشی لە سـەر بگیرێـت، بـۆ ئەوەی ناکۆکی دروست بو لە نێوانیاندا بگەڕێنەوە بۆ بەڵگەنامەکە.

## پرسی چوارەم: سەر پشکی لە کڕین وفرۆشتندا:

«**الْخِيَار**»: ئەوەیە هەر یەك لە کڕ یار وفـرۆش یـار مـافی بردنـە سـەر یـان هـەڵ وەشاندنەوەی هەبێت.

بنەماش لە کڕین وفرۆشتن دا ئەوەیە کەی پایە ومەرجەکانی تێدا بو ئەبێت جێ بـە جێ ببێت «لازم»، وبۆ کەس نیە لە دو لایەنە گرێ دەرەکە لێی پەشیمان ببێتەوە.

بەڵام دینی ئیسلام دینی ئاسانی وفراوانیە، ڕەچاوی بەرژەوەندی وهـەل ومـەرجی هەمو تاکەکانی کردوە. لەوانەش: موسڵمان ئەگەر کاڵایـەکی کـڕی یـا فرۆشـت بـە هۆیەکەوە، ئینجا پەشیمان بویەوە، ئەوا شەرع سەر پشکی بۆ حەڵاڵ کردوە تا بـیری لێ بکاتەوە، وسەرنجی بەرژەوەندی خۆی بدات، ئەوسا یا مامەڵەکە دەباتە سـەر یـا پەشیمان دەبێتەوە، بە گوێرەی ئەوەی گونجاوە.

**بەشەکانی سەر پشك بون:** سەر پشکی چەند بەشێکی هەیە، گرنگترینیان:

### یەکەم: سەر پشکی نشتگە «خِيَارُ الْمَجْلِس»:

کە بریتیە لەو شوێنەی کڕین وفرۆشتنەکەی تێدا ڕو دەدات، جا هەر یەك لە دو لایەنە گرێ دارەکە سەر پشکە مادام لە نشتگە (مجلس)ی گرێ بەستنەکەن وجیا نەبونەتەوە، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر ﷺ، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا» «کڕیار وفرۆشیار سەر پشکن مادام جیا نەبونەتەوە»[1].

## دوەم: سەر پشکی مەرج «خِيَارُ الشَّرْط»:

بریتیە لەوەی هەر دو لا، یان یەکێکیان سەر پشکی بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بکاتە مەرج کە گرێ بەستەکە ببەستێت یا هەڵی بوەشێنێتەوە، کە ئەو ماوە دیاری کراوەی نێوانیان لە سەرەتای گرێ بەستەکەوە تەواو بو وهەڵیان نەوەشاندەوە ئەوە گرێ بەستەکە جێبەجێ دەبێت. بۆ **نمونە**: پیاوێك ئۆتۆمبیلێك بکڕێت لە کەسێکی تر، وکڕیارەکە ئەڵێ: تا یەك مانگ سەر پشکم، جا ئەگەر لەو مانگەدا پەشیمان بویەوە لە کڕینەکە، ئەوا بۆی هەیە، ئەگەرنا بە تەواوبونی مانگەکە فرۆشتنی ئۆتۆمبیلەکە جێبەجێ دەبێت.

## سێیەم: سەر پشکی عەیب «خِيَارُ العَيْب»:

بریتیە لەو سەر پشکیەی کە بسێن هەیەتی ئەگەر عەیبێکی لە کاڵاکە بینیەوە، وفرۆشیارەکەش پێی نەوتبو، یا فرۆشیار پێی نەزانی بو، وبە هۆی ئەم عەیبەوە نرخی کاڵاکە کەم دەکات. بۆ زانینی ئەمەش دەگەڕێنەوە بۆ لای شارەزایان لە بازرگانە باوەڕپێکراوەکان، چیان پێ عەیب بو، سەر پشکی بۆ دەبێت، ئەگەرنا

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢١١٠)، ومسلم (١٥٣٢).

نەخێر. ئەم سەر پشکیەش بۆ کڕیار دەچەسپێت، ئەگەر ویستی ئەیباتە سەر وقەرەبوی عەیبەکە وەردەگرێتەوە، کە بریتیە لە نرخی کالاکە بە بێ عەیبی ونرخەکەی بە عەیبداری، ئەگەریش حەزی لێ بو مالەکە دەداتەوە وپارەکەی وەردەگرێتەوە.

## چوارەم: سەر پشکی گزی کردن «خِيَارُ التَّدْلِيسِ»:

بریتیە لەوەی بفرۆشەکە گزیەك بکات لە کڕیارەکە کە لە نزخەکەی زیاد بکات، ئەم کارەش حەرامە لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «مَنْ غَشَّنَا فَلَيْسَ مِنَّا» «هەر کەس فلێڵمان لێ بکات لە ئێمە نیە»[1]. **بۆ نمونە**: سەیارەیەکی هەبێت، عەیبێکی زۆر لە ناوەوەی هەبێت، ئەمیش دەڕوا بە ڕەنگێکی جوان نمایشی دەکات، دیمەنی دەرەوەی وا دەرازێنێتەوە تا کڕیار فریو بدات وا بزانێت بێ عەیبە، دەیکڕێت، لەم حالەتەدا کڕیار مافی گێڕانەوەی کالاکەی هەیە بۆ فرۆشیار وپارەکەی دەباتەوە.

## پرسی پێنجەم: مەرجەکانی کڕین وفرۆشتن:

مەرجە بۆ دروست بونی کڕین وفرۆشتن ئەم مەرجانەی خوارەوە هەبێت:

**یەکەم**: ڕازیبونی نێوان کڕیار وفرۆشیار. خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ﴾ [النساء:٢٩] «ئەی باوەڕداران بۆتان حەلاڵ نیە ماڵی یەکتر بخۆن بە ناهەق، مەگەر بە گوێرەی شەرع وکەسابەتی حەلاڵ وبە ڕەزامەندی خۆتان». ولە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «إِنَّما البَيْعُ عَنْ تَرَاضٍ» «کڕین

(١) أخرجه مسلم (١٠١).

وفرۆشتن بە ڕەزامەندی هەر دو لا دەبێت»[1]. بۆیە ئەگەر یەکێکیان زۆری لێ بکرێت -بە ناحەق- دروست نابێت، ئەگەریش بە هەق بو وەك ئەوەی قازی زۆر لە کەسێك بکات بۆ فرۆشتنی شتێك تا قەرزەکەی بداتەوە.

**دوەم:** ئەبێت گرێدەر هەڵس وکەوت دروست بێت (جائز التصرف)، بەوەی: بالغ وعاقڵ وئازاد وسەر ڕاست بێت.

**سێیەم:** ئەبێت بفرۆش خاوەنی کاڵاکە بێت، یا لە جێی خاوەنەکەی بێت، وەك بریکار وەسیەت بۆ کراو وکاربە دەست (الولي) وبەڕێوەبەر (الناظر). جا کەسێك شتێك بفرۆشێت هی خۆی نەبێت دروست نابێت، لەبەر فەرمایشتەکەی ﷺ بۆ حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ: «لا تَبِعْ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ» «شتێك لات نیە مەیفرۆشە»[2].

**چوارەم:** ئەبێت کاڵاکە لەو شتانە بێت کە حەڵاڵە کەڵکی لێوەر بگیرێت، وەك خواردن، خواردنەوە، وپۆشاك، وسوار، وخانوبەرە، وهاوشێوەکانی، بۆیە فرۆشتنی ئەوەی حەرامە، وسودی لێ ببینرێت دروست نیە، وەك مەی وبەراز ومردارەوە بو، وئامێرەکانی ڕابواردن ومۆسیقا. لەبەر فەرمودەکەی جابر ﷺ، پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «إِنَّ اللهَ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ، وَالْمَيْتَةِ، وَالْخِنْزِيرِ، وَالأَصْنَامِ» «خوا فرۆشتنی مەی ومردارەوە بو وبەراز وبتی قەدەغە کردوە»[3]. هەروەها لە ئیبن عەبباسەوە ﷺ، پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «وَإِنَّ اللهَ تَعَالَى إِذَا حَرَّمَ عَلَى قَوْمٍ أَكْلَ شَيْءٍ حَرَّمَ عَلَيْهِمْ ثَمَنَهُ» «خوا ئەگەر شتێکی لە سەر گەلێك حەرام کرد، نرخەکەشیان لە

(١) أخرجه ابن ماجه (٢١٨٥)، وابن حبان (١١/٣٤٠)، والبيهقي (١٧/٦). وصححه الألباني «الإرواء» (١٢٥/٥).
(٢) أخرجه أحمد (٤٠٢/٣)، وأبو داود (٣٥٠٣)، والنسائي (٢٨٩/٧)، والترمذي (١٢٣٢) وابن ماجه (٢١٨٧) وصححه الألباني، انظر: «الإرواء» (١٣٢/٥) و«صحيح سنن النسائي» (٤٢٩٩).
(٣) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٢٣٦)، ومسلم (١٥٨١).

سەر حەرام دەکات»[1]. دروستیش نیە سەگ بفرۆشرێت، لەبەر فەرمودەکەی ئەبو مەسعود ﷺ، ئەڵێ: «نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ ثَمَنِ الكَلْبِ...» «پەیامبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لە نرخی سەگ»[2].

**پێنجەم:** ئەبێت بتوانرێت کاڵاکە تەسلیم بکرێت، چونکە ئەوەی نەتوانرێ تەسلیم بکرێ وەك نەبو (الْمَعْدوم) وایە، کە دروست نابێت بفرۆشرێت، چونکە ئەڕواتە ژێر کڕین وفرۆشتنی فریودان «الغَرَر»ەوە[3]، جا کڕیار پارەکە دەدات بەڵام کاڵاکەی نایەتە دەست، بۆیە فرۆشتنی ماسی لە ئاودا، ونـاوك لە خورمادا، وباڵندە لە هەوادا، وشیر لە گواندا، وبێچوی سك دایك، وئاژەڵی هەڵاتو، هەمو ئەمانە دروست نیە. ئەمەش لەبەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ، ئەڵێ: «نَهَى رَسولُ الله ﷺ عنْ بَيْعِ الغَرَر» «پەیامبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لە کڕین وفرۆشتنی فریودان»[4].

**شەشەم:** ئەبێت کاڵاکە بۆ هەر دو لا زانراو بێت، بە بینینی لە کاتی گرێ بەستەکەدا، یا وەسفی بکات وەسفێك جیای بکاتەوە لە جگە لە خۆی، چونکە نەزانین فریودانی تێدایە، فریودانیش نەهی لێکراوە، بۆیە شتێك بکڕێت ونەیبینی بێت یان بینیبێتی بەڵام نەزانراو بێت ولە نشتگەی گرێ بەستەکە نەبێت دروست نابێت.

**حەوتەم:** ئەبێت نرخەکە زانراو بێت، ئەمەش بە دیاری کردنی نرخی کاڵا فرۆشراوەکە، وبزانێت بایی چەندە.

(١) أخرجه أحمد (٢٤٧/١)، وأبو داود (٣٤٨٨)، وصححه الأرناؤوط في حاشية المسند (٩٥/٤).

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٢٣٧)، ومسلم (١٥٦٧).

(٣) بەیعی «الغرر»: بریتیە لەو کڕین وفرۆشتنەی ڕوکەشێکی هەیە فرۆشیار فریو دەدا، لە ناوەوەش نادیارە.

(٤) أخرجه مسلم (١٥١٣).

## پرسی شەشەم: ئەو کڕین وفرۆشتنانەی نەهی لێکراوە:

ئەم شەرعە دانایە نەهی کردوە لە هەندێك کڕین وفرۆشتن کە ئەبێتە مایەی زایەکردنی لەخۆی گرنگتر وەك سەرقاڵ بون لە جێبەجێکردنی پەرستنێکی واجب، یا ببێتە مایەی زیان گەیاندن بە خەڵکی تر.

**جا لەو کڕین فرۆشتنانەی کە نەهی لێکراوە:**

**١ - کڕین وفرۆشن دوای بانگی دوەمی ڕۆژی هەینی:**

کڕین وفرۆشتن دوای بانگی دوەم لەلایەن کەسێکەوە جومعەی لە سەر بێت دروست نابێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ﴾ [الجمعة: ٩]. جا خوا نەهی دەکات لە کڕین وفرۆشتن لەو کاتەدا، نەهیش، حەرام کردن ودروست نەبونی کڕین وفرۆشتنەکە دەخوازێت.

**٢ - فرۆشتنی شتانێك بە کەسێك کە بە هۆیەوە گوناه دەکات، یا بۆ حەرام بە کاری دەهێنێت:**

جا شەریەت فرۆشتن بە کەسێك بیکات بە مەی دروست نابێت، هەروەها قاپ وقاچاغ بۆ کەسێك مەی پێ بخواتەوە، هەروەها فرۆشتنی چەك لە کاتی فیتنە وئاشوبی نێوان موسڵماناندا. خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ [المائدة:٢] «ویارمەتی یەکتر بدەن لە نێوان خۆتاندا ئەی باوەڕداران بۆ کردنی کاری خێر وتەقوای خوا، ویارمەتی یەکتر مەدەن بۆ شتێك تاوان وسەرپێچی وسنوری خوا بەزاندنی تێدایە، وریا بن لە پێچەوانەکردنی فەرمانی خوا چونکە خوا سزای بە ئێشە».

## ٣- فرۆشتن بەسەر فرۆشتنی براکەت:

بۆ نمونە: کەسێك شتێکی سەندوە بە دە، پێی بڵێ: من پێت دەفرۆشم بە لەوە کەمتر، یان لەوە باشترت پێ دەفرۆشم بە هەمان نرخ، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن وعومەر ﵄: «وَلَا يَبِعْ بَعْضُكم عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ» «وکڕین وفرۆشتن مەکەن بەسەر کڕین وفرۆشتنی یەکتردا»[1].

## ٤- کڕین بەسەر کڕین:

بۆ نمونە: کەسێك شتێکی فرۆشتوە، پێی بڵێ: فرۆشتنەکە هەڵبوەشێنەوە، من بە زیاتر لێت دەکڕم، ئەمە دوای ئەوەی کڕیار وفرۆشیار لە سەر نرخەکەش ڕێککەوتون. ئەم جۆرەش هەر دەڕواتە ژێر ئەو نەهیەی لە فەرمودەکەی پێشودا هاتبو.

## ٥- کڕین وفرۆشتنی «العِيْنَة»:

شێوازەکەی ئاوهایە: کەسێك کاڵایەك بفرۆشێت بە یەکێکی تر بە نرخێکی زانراو بە قەرز، پاشان فرۆشیار لێی دەکڕێتەوە بە نرخێکی کەمتر، لە کۆتایی کاتی قەرزەکەشدا کڕیارەکە نرخی یەکەم دەدات. وەك ئەوەی زەویەك بفرۆشێت بە پەنجا هەزار بە قەرز بۆ ساڵێك، پاشان فرۆشیار لێی بکڕێتەوە بە چل هەزار بە نەخت، پەنجا هەزارەکە لە ئەستۆی دەمێنێتەوە کڕیارەکە لە سەر ساڵەکە دەیدات. پێشی وتراوە: عینە، چونکە کڕیارەکە لە شوێنی کاڵاکە عەینێك دەبات، یانی: نەختی حازر. ئەم کڕین وفرۆشتنەش حەرامکراوە چونکە فێڵ ولف لێدانێکە بۆ گەیشتنە سو، لە ئیبن عومەرەوە ﵄، ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «إِذَا تَبَايَعْتُمْ

---

(١) أخرجه البخاري (٢١٦٥)، ومسلم (١٤١٢).

بِالْعِينَةِ، وَأَخَذْتُمْ أَذْنَابَ الْبَقَرِ، وَرَضِيتُمْ بِالزَّرْعِ، وَتَرَكْتُمُ الْجِهَادَ، سَلَّطَ اللهُ عَلَيْكُمْ ذُلًّا لَا يَنْزِعُهُ حَتَّى تَرْجِعُوا إِلَى دِينِكُمْ» «ئەگەر کڕین وفرۆشتنی عینەتان کرد، ودەستان گرت بە کلکی مانگاوە وڕازی بون بە کشتوکاڵ کردن، و وازتان لە تێ کۆشان هێنا کە لە سەرتانە بیکەن، ئەوە خوا زەلیلی وسەر شۆڕیەکتان بە سەردا زاڵ دەکات، هەڵی ناگرێ تلە سەرتان مەگەر بگەڕێنەوە بۆ دینەکەتان»[1].

### ٦- فرۆشتنی ماڵی کڕدراو پێش ئەوەی بگاتە دەستت:

بۆ نمونە: کاڵایەك بکڕێت لە کەسێك، پاشان بیفرۆشێتەوە پێش ئەوەی بگاتە دەستی. لە ئەبو هورەیرە ﷺ، ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا، فَلَا يَبِعْهُ حَتَّى يَقْبِضَهُ» «کێ خواردەمەنیەکی فرۆشت با نەیفرۆشێت تا وەری دەگرێت»[2]. ولە زەیدی کوڕی سابتەوە ﷺ: «إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى أَنْ تُبَاعَ السِّلَعُ حَيْثُ تُبْتَاعُ، حَتَّى يَحُوزَهَا التُّجَّارُ إِلَى رِحَالِهِمْ» «پەیامبەری خوا ﷺ نەهی کردوە کاڵا بفرۆشرێت هەر لەو شوێنەی دەسێنرێت مەگەر بازرگانەکان بیبەنەوە شوێنی خۆیان»[3]. جا دروست نیە کەسێك کە شتێکی کڕی بیفرۆشێتەوە تا بە تەواوی وەری دەگرێت.

### ٧- فرۆشتنی بەر وبوم پێش ئەوەی شیاوی دەر بکەوێ «بَيْعُ الثِّمَارِ قَبْلَ بُدُوِّ صَلَاحِها»:

دروست نیە بەر وبوم بفرۆشرێت پێش ئەوەی دەر بکەوێت پێ گەیشتوە؛ نەوەك بفەوتێت یان عەیبێکی تێ بکەوێت پێش بردنی، لە ئەنەسەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا

---

(١) أخرجه أحمد (٢٨/٢)، وأبو داود (٣٤٦٢) [هذ لفظه، أما لفظ الأصل فلم أجده في الموضعين اللذين أشاروا إليهما، ويشبه لفظ الشوكاني في «السيل»]. وصححه الشيخ الألباني «الصحيحة» (١١).

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢١٣٦)، ومسلم (١٥٢٥).

(٣) أخرجه أبو داود (٣٤٩٩)، وصحح الإمام النوي إسناده. «اللؤلؤ المصنوع» (١٦٩١).

ﷺ فەرموی: «أَرَأَيْتَ إِنْ مَنَعَ اللهُ الثَّمَرَةَ، فَبِمَ يَأْخُذُ أَحَدُكُمْ مَالَ أَخِيهِ» «ئەگەر خوا بەر وبومەکەی فەوتان، بە چ هەقێك ئەڕۆن ماڵی براکەتان دەخۆن»[1]. ولە ئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما ئەڵێ: «أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهَا، نَهَى الْبَائِعَ وَالْمُبْتَاعَ» «پەیامبەری خوا ﷺ نەهی کرد لە فرۆشتنی بەر وبوم پێش دەرکەوتنی شیاوبونی، نەهی کرد لە کڕیار وفرۆشیار»[2]. ودەرکەوتنی شیاو بونی: بە سور بونی بەر وبومی خورما یان زەرد بونی دەبێت، لە ترێشدا ڕەش ببێتەوە وشیرین ببێت، لە دانەوێڵەشدا وشك ببێتەوە وڕەق ببێت، لە بەر وبومەکانی تریشدا هاوشێوەی ئەمانە.

### ٨- کڕین وفرۆشتنی «النَّجْش»:

بریتیە لەوەی کەسێك لە نرخی ئەو کاڵایەی دانراوە بۆ فرۆشتن زیاد بکات ومەبەستی کڕینیشی نەبێت، بەڵکو بۆ ئەوەی خەڵکی پێ فریو بدات وڕەغبەتی بۆ دروست بکات ولە نرخەکەی بەرز بکاتەوە. لە عەبدولای عومەرەوە رضي الله عنهما: «أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ النَّجْشِ» «پەیامبەری خوا ڕێگری کردوە لە نەجش»[3].

## پرسی حەوتەم: هەڵوەشاندنەوەی گرێ بەست «الإقالة»:

**الإِقَالَة:** بریتیە لە هەڵوەشاندنەوەی ئەو گرێ بەستەی لە نێوان دو لایەنەکە ڕویداوە بە ڕەزامەندی هەر دو لا. ئەمەش ڕو دەدات بەهۆی پەشیمان بونەوەی یەکێکیان، یا بۆ کڕیار دەردەکەوێت پێویستی بە کاڵاکە نیە، یا ناتوانێت نرخەکەی

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢١٩٨)، ومسلم (١٥٥٥).
(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢١٩٤)، ومسلم (١٥٣٤).
(٣) متفق عليه: أخرجه البخاري (٦٩٦٣)، ومسلم (١٥١٦).

بدات، بۆیە هەردولا ماڵەکەی خۆی دەگێڕێتەوە وەك خۆی بێ زیاد وکەم. ئیقالەش شەرعیە وپەیامبەری خوا هانی لە سەر داوە وەك ئەفەرموێ: «مَنْ أَقَالَ مُسْلِمًا [بَيْعَتَه] أَقَالَهُ اللهُ عَثْرَتَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ» «هەر موسڵمانێك پەشیمانی براکەی لە کڕینەکە قەبوڵ بکات خوای گەورە تاوانەکانی لا دەبات ولێی خۆش دەبێت»[1].

## پرسی هەشتەم: گرێ بەستی مورابەحە:

«الْمُرَابَحَةُ»: فرشتنی کاڵایە بەو نرخەی زانراوە لای هەر دو لا، بە قازانجێکی زانراوی نێوان هەر دو کیان. **نمونەکەی:** خاوەن کاڵاکە ئەڵێ: بە سەد لە سەرم کەوتوە، بە سەدەکە پێتی دەفرۆشم لەگەڵ دەی قازانج. کڕین وفرۆشتنیش بەم شێوازە دروست ئەبێت، ئەگەر کڕیار وفرۆشیارەکە هەر دو کیان ئەندازەی دەست مایەکە وئەندازەی قازانجەکەیان دەزانی. خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ﴾ [البقرة:٢٧٥]، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ﴾ [النساء:٢٩]. مورابەحەش کڕین وفرۆشتنێکە ڕازی بونی هەر دو لای تێدا بەدی هاتوە، وپێویستیش زۆرە بۆ دروست بونی، چونکە خەڵك هەیە نازانێت یەکسەر بسێنێت، بۆیە پشت بە کەسی تر دەبەستێت بۆ کڕین، جا قازانجێکی دیاری کراوی زانراوی بۆ زیاد دەکات.

---

(١) أخرجه أحمد (٢/٢٢٥)، وأبو داود (٣٤٦٠)، وابن ماجه (٢١٩٩)، وابن حبان (١١/٤٠٥)، وصححه الألباني «صحيح سنن ابن ماجه» (١٨٠٠).

## پرسی نۆیەم: کڕین وفرۆشتن بە قیست (بەش بەش)

«القِسْط» فرۆشتنێکە بە نرخێك کە قەرزە، ئەدرێتە فرۆشیار لە شێوەی قیست، ئیتر نرخەکە بەرامبەر کالاَّکە بێت یان بە هۆی قەرزەکەوە زیاتر بێت. **نموونەی زیاتریش:** وەك ئەوەی لای فرۆشیار ئۆتۆمبیلێك هەبێت، نرخەکەی بە نەخت بە چل هەزار دینار بێت، بە قەرزیش بە شەست هەزار دینار بێت، جا لەگەڵ کڕیارەکە ڕێك دەکەوێت کە بڕە پارەکە بە دوانزە بەش (قیست) بدات، لە کۆتایی هەر مانگێکدا پێنج هەزار دینار بدات.

**حوکمەکەی:** دروستە، لەبەر ئەوەی ئەڕواتە ژێر گشتێتی کڕین وفرۆشتن بە قەرز، لە عائیشەوە ﵂ ئەڵێ[1]: «اشْتَرَى رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ يَهُودِيٍّ طَعَامًا بِنَسِيئَةٍ [أي: بالأجل]، وَرَهَنَهُ دِرْعَهُ» «پەیامبەری خوا ﷺ خواردنی جۆی لە یەهودیەك کڕی بە قەرز، وقەڵغانەکەشی بە بارمتە دانا». هەروەها بەڵگە لە سەر بەشبەش کردنی نرخ فەرمودەکەی عائیشەیە ﵂ لە هەردو سەحیحەکەدا[2] کە بەریرە وتویەتی: من موکاتەبەی خاوەنەکەی خۆم کردوە لە سەر نۆ وەقە، هەر ساڵێك وەقەیەك.

بەڵگەش لە سەر زیادکردنی نرخەکە بە هۆی قەرزەوە فەرمودەکەی عەبدوڵای کوڕی عەمرە کە وشتری بردوە بە دو وشتر وسێ وشتر بە قەرز تا بەردەست بونی وشتری صەدەقە، ئەمەش بە فەرمانی پەیامبەری خوا ﷺ بوە. بەیهەقی ودارەقوتنی ڕیوایەتیان کردوە وئەلبانی بە حەسەنی داناوە لە «إِرْوَاءُ الغَلِيل»دا[3].

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٠٦٨)، ومسلم (١٦٠٣) [والتفسير ليس في الرواية].

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢١٦٨)، ومسلم (١٥٠٤).

(٣) «سنن الكبير» (٥/٢٨٧-٢٨٨)، و«سنن الدارقطني» (٣٠٥٣). و«الإرواء» (١٣٥٨).

كڕین وفرۆشتنیش بەم شێوازە سودی بۆ هەر یەك لە كڕیار وفرۆشیار تێدایە، فرۆشیار فرۆشراوەكانی زیاد دەكات، وئوسلوبەكانی جۆراو جۆر دەكات لە فرۆشتنی كالاَكانی دا، هەم بە نەخت وهەم بەقیست دەفرۆشێت، ولە قیستیشدا قازانج لە زیادەی نرخەكە دەكات بەرامبەر قەرزەكە، وەك چۆن كڕیار كالاَكەی دەست دەكەوێت ئەگەر نرخەكەشی نەبێت، ئینجا لەوەودوا نرخەكەی بە قیست دەدات.

## مەرجەكانی دروستێتی كڕین وفرۆشتن بە قیست:

بۆ ئەوەی كڕین وفرۆشتن بە قیست دروست بێت كۆمەڵێ مەرجی هەیە جگە لە مەرجەكانی كڕین وفرۆشتنی پێشو:

١- ئەبێت كالاَكە لە كاتی گرێ بەستەكەدا لە لای بفرۆش بێت ولە ژێر هەڵس وكەوتی خۆیدا بێت، بۆیە دروست نیە بۆیان ڕێك بكەون لە سەر نرخەكەی وكاتی قیست دانەكەش دیاری بكەن، دوای فرۆشیار بڕوات ئەو كالاَیە بكڕێت، ئینجا بیداتە كڕیارەكە، ئەمەش حەرامە، لەبەر فەرمودەكەی [پێشتری] پەیامبەر ﷺ: «شتێك مەفرۆشە كە لات نیە».

٢- دروست نیە كڕیار ناچار بكرێت -لە كاتی گرێ بەستەكە دا بێت یان لەوەو دوا- بە پێدانی زیاتر لەوەی ڕێك كەوتون لە سەری لە كاتی گرێ بەستەكەدا ئەگەر لە دانی قیستەكە دواكەوت، چونكە ئەمە سووە وحەرامە.

٣- بۆ كڕیاری دارا حەرامە دانەوەی قیستەكە لە كاتی خۆی دوا بخات.

٤- فرۆشیار ئەو مافەی نیە خاوەندارێتی فرۆشراوەكە لای خۆی بهێڵێتەوە، بەلاَم دروستە بۆی بیكاتە مەرج بەسەر كڕیارەوە كە وەكو بارمتە فرۆشراوەكەی لا بێت، بۆ ئەوەی مافی خۆی زەمان بكات لە وەرگرتنەوەی قیستە قەرزەكان.

# دەروازەی دووەم

# لە بارەی سووەوە «الرِّبَا»

چەند پرسێکی تێدایە:

## پرسی یەکەم: پێناسەی سو وحوکمەکەی؟

### ١- پێناسەکەی:

ڕیبا لە زماندا: واتە زیادە. لە شەرعیشدا: زیادکردنی یەکێکە لە دو لەجیاتیە هاوجۆرەکە (البَدَلَينِ الْمُتَجَانِسَينِ)، بێ ئەوەی ئەو زیادە لە بریتی شتێك بێت.

### ٢- حوکمەکەی:

سوو لە کتێبەکەی خوادا حەرامە، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾ [البقرة: ٢٧٥] هەروەها ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ [البقرة: ٢٧٨] «ئەی باوەڕداران خۆ پارێز بن، لە خوا بترسن واز بهێنن لە داواکردنی ئەو سووەی کە ماوەتەوە بە سەر کابراوە، ئەگەر بەڕاستی ئێوە ئیماندارن». هەروەها خوا ﷻ هەڕەشەی کردوە لە مامەڵەکەر بە سووەوە بە توندترین هەڕەشە، ئەفەرموێ ﷻ: ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ﴾ [البقرة:٢٧٥]، یانی: [ئەوانەی مامەڵە بە ڕیباوە دەکەن] لە کاتی زیندوبونەوەدا لە گۆڕەکانیان هەڵئاسنەوە مەگەر وەکو یەکێك شەیتان دەستی لێ وەشاند بێت، ئەمەش لەبەر هەڵ ئاوسانی ورگیان بە هۆی سوو خواردنیانەوە لە دونیادا. پەیامبەر خواش ﷺ لە تاوانە گەورەکانی ژماردوە، ونەفرەتیشی کردوە لە هەمو ئەوانەی مامەڵە بە سووەوە دەکەن بە هەر شێوەیەکی

مامەڵەکردنەوە بێت، ئەوەتا جابری کوڕی عەبدوڵا دەگێڕێتەوە ﷺ، ئـەڵێ[1]: «لَعَنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ آكِلَ الرِّبَا وَمُؤْكِلَهُ، وَكَاتِبَهُ وَشَاهِدَيْهِ، وَقَالَ: هُمْ سَوَاءٌ» «پەیامبەر ﷺ لەعنەتی کرد لـە سـوو خـۆر، وسـو دەر، ونوسـەرەکەی، ودو شاهیدەکەشـی، وفەرموشی: هەمویان وەك یەکن». وهەمو ئومەتیش کۆکن لە سەر بە حەرام دانانی.

## پرسی دوەم: دانایی لە حەرامکردنی سوو:

مامەڵە کردن بە ڕیباوە ئەبێتە مایەی خۆ خۆشویستن، وبە حیرس وهەڵپـەبون بـۆ کۆکردنەوەی ماڵ وسامان لە دەرەوەی ڕێگا شەرعیەکە، وحەرام کردنیشـی ڕەحمەتـە بە بەندەکان، چونکە بردنی ماڵی خەڵکی تێدایە بێ هیچ بەرامبەرێك، جا سوو خـۆر ماڵی خەڵك دەخوات بە بێ ئەوەی هیچ سـودێك ببیـنن لـە بەرامبـەردا، هـەروەها ئەبێتە هۆی هەڵاوسانی پارە وزیادبونی لە سەر حسابی بردنی ماڵی هـەژاران، سـوو خۆرەکەش لەگەڵ تەمبەڵی وتەوەزەلی دا ڕا دێت، ودور دەکەوێتەوە لە سـەرقاڵ بـون بە کار وکەسابەتی حەڵاڵ وبە سود. وەکو چۆن بڕین ونەهێشـتنی چـاکەیە لـە نێـوان خەڵکدا، وداخستنێکە بـۆ دەرگـای قـەرزی چـاکە (القَرْضُ الحَسَنَة)، هـەروەها وا دەکات چینێکی سوخۆر پارە وسامانی ئومەت وئابوری وڵاتیان بکەوێتە دەست وبـە کەیفی خۆیان هەڵس وکەوتی پێوە بکەن. هـەروەها سەرپێچـیەکی مـەزنی خوایـە. ئەگەرچی سو ماڵی سوو خۆر زیاد دەکات بەڵام خوا پیت وقـوتی دەبڕێتـەوە وفـەڕی تێدا ناهێڵێـت، خـوا ﷻ ئەفـەرموێ: ﴿يَمْحَقُ اللَّهُ الرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ﴾ [البقرة: ٢٧٦]، «خوا سو ئەبات هەر هەموی وبێ بەشی دەکـات لـە پیـت وقـوت وفـەڕ، جـا سودی لێ نابینێت، بەڵام خێر وصەدەقە گەش ونما پێ دەکات».

---

(١) أخرجه مسلم (١٥٩٨).

## پرسی سێیەم: جۆرەكانی سو:

### یەكەم: سوی زیادە (رِبَا الفَضْلِ):

زیادكردنە لە یەكێك لە دو لەجیاتیە ڕیبابیەكە (البَدَلَينِ الرِّبَوِيَينِ) كە هاو جۆرن.

**بۆ نمونە:** هەزار مەنی گەنم بكرێت لە كەسێك بە هەزار ودو سەد مەنی گەنم، هەر لە نیشتگەی گرێ بەستەكەشدا هەر دو لە جیاتیەكە دەست بە دەست دەكرێت. جا ئەم زیادەیە كە دو سەد مەنی گەنمە بەرامبەری هیچ شتێك نیە وزیادەیە.

**حوكمەكەی:** شەریعەتی ئیسلام سوی زیادەی لە شەش شتدا قەدەغە كردوە: زێڕ، وزیو، وگەنم، وجۆ، وخورما، وخوێ. جا ئەگەر یەكێك لەم شەشە فرۆشرا بە هاوجۆرێكی خۆی ئەوا زیادەی تێدا حەرام دەبێت، لەبەر فەرمودەكەی ئەبو سەعیدی خودری ﷺ پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ، وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ، وَالْمِلْحُ بِالْمِلْحِ، مِثْلًا بِمِثْلٍ، يَدًا بِيَدٍ، فَمَنْ زَادَ أَوِ اسْتَزَادَ فَقَدْ أَرْبَى، الآخِذُ وَالْمُعْطِي فِيهِ سَوَاءٌ» «ئالتون بە ئالتون دەفرۆشرێت، وزیو بە زیو، وگەنم بە گەنم، وجۆ بە جۆ، وخورما بە خورما، وخوێ بە خوێ، لە كاتێكدا ئەبێت بە ئەندازەی یەك وەكو یەك بێت، ودەست بە دەست بێت، جا هەر كەس زیادە بدات یان زیادە وەر بگرێت ئەوا سوی ئەنجام داوە، وەرگر وبدەریش وەكو یەكن»[1].

جا هۆكار (عِلَّةُ)ی سو لەم شتانەدا بریتیە لە پێوان وكێشان، جا لە هەمو كێشراو وپێوراوێكدا زیادە حەرامە.

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢١٧٥، ٢١٧٦)، ومسلم (١٥٨٤) واللفظ لمسلم.

**دوەم: سوی قەرز ودواختن (رِبَا النَّسِيئَة):**

زیادکردنە لە یەکێك لە دو لەجیاتیەکە (البَدَلَينِ) لە بەرانبەر درەنگ دانەوە، یا دواخستنی وەرگرتن لە فرۆشتنی هەمو هاو جۆرێك بە یەکتر، کە هەمان هۆکاری سوی زیادەی تێدا بێت، هەروەها یەکێکیان دراو نەبێت. **بۆ نمونە:** هەزار مەنی گەنم بفرۆشێت بە هەزار ودوو سەد مەنی گەنم بۆ ماوەی ساڵێك، جا زیادەکە لێردا بەرامبەر درێژبونەوەی ماوەکەیە. یا کیلۆیەك جۆ بفرۆشێت بە کیلۆیەك گەنم ودەست بە دەست نەبێت.

**حوکمەکەی:** ئەمە حەرامە، چونکە ئەو دەقانەی لە قورئان وفەرمودەدا هاتون لەسەر حەرامێتی سوو ودور کەوتنەوە لە مامەڵە پێ کردنی، ئەم جۆرەی سووە لە پێشتر دەگرێتەوە، هەر ئەمەش بووە لە سەردەمی نەفامیدا بڵاو بووە، هەر ئەمەشە لەم سەردەمەدا بانکە سو خۆرەکان ئەنجامی دەدەن. لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﵁، پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «وَلَا تَبِيعُوا مِنْها غَائِبًا بِنَاجِزٍ» «ونا ئامادەکەی مەفرۆشن بە حازری»، لە لەفزێکی تردا: «مَا كَان يدًا بيد فَلا بَأْس بِه، ومَا كَانَ نَسِيئَة فَهُو ربا» «هەر کامەی دەست بە دەست بو هیچی تێدا نیە، کامەشی دواخرا ئەوە ڕیبایە»[1].

## پرسی چوارەم: شێوەی هەندێك مەسەلەی ڕیبایی:

بە جێ بە جێ کردنی ئەم بنەمایەی خوارەوە وئەوەی لە خۆی گرتوە، ڕون دەبێتەوە کە هەر مەسەلەیەکی لە مەسەلەکان، ئایا مامەڵەیەکی سووە یا حەڵاڵە، ڕێساکەش ئەمەیە:

---

(١) أخرجه مسلم (١٥٨٩).

ئەگەر ماڵێکی ڕیبایی[1] بە هاو جۆرێکی خۆی فرۆشرا ئەبێ دو مەرجی تێدا بێ:

١- دەست بە دەستکردن لە لایەن هەر دو لاوە لە نشتگەکەدا پێش بڵاوە لێ کردن.

٢- بە پێوەری شەرعی وەکو یەك ویەکسان بن، پێوراو بە پێوراو، کێشراو بە کێشراو.

بەڵام ئەگەر ماڵی ڕیبایی فرۆشت بە جۆرێکی تر بە دەر لە جۆرەکەی خۆی، ئەوا ئەبێت یەك مەرجی تێدا بێت، کە وەرگرتنە پێش جیابونەوە، یەکسان بونیش مەرج نیە. ئەگەریش ڕیبایی بە جگە لە ڕیبایی فرۆشرا ئەوا دروستە زیاتر بێت وجیاش ببنەوە پێش وەرگرتن.

**وا لە خوارەوەش هەندێك شێوەی مامەڵەکردن وحوکمەکەی ڕون دەکەینەوە:**

١- سەد گرام زێڕی فرۆشت بە سەد گرام زێڕ بەڵام دوای مانگێك پێی دەدات. ئەمە حەرامە، وسوە، چونکە لە نشتگەکە دەست بە دەستیان نەکردوە.

٢- کیلۆیەك جۆ دەکرێت بە کیلۆیەك گەنم، دروستە، لەبەر جیاوازی جۆرەکەیان، مەرجیشە لە نیشتگەکە دەست بە دەست ڕو بدات.

٣- ئەگەر پەنجا کیلۆ گرام گەنمی کڕی بە شەکێك ئەوە بە ڕەهایی دروستە، ئیتر لە نشتگەکەدا دەست بە دەست ڕو بدات یان نا.

٤- ئەگەر سەد دۆلاری فرۆشت بە سەد وبیست دۆلار، دروست نیە.

---

(١) مەبەست لێی: ئەگەر یەکێك بێت لە شەش جۆرەکەی پێشو کە لە فەرمودەکەی ئەبو سەعیدی خودریدا باسکرا، یا هاواتای ئەو شەشە بێت [هاواتاش واتە: بکێشرێ وپێورێت].

٥- ئەگەر هەزار دۆلاری قەرزکرد بە هەزار ودو سەد دۆلار بە مەرجێك دوای مانگێك یا زیاتر بیگێڕێتەوە، دروست نیە.

٦- ئەگەر سەد درهەمی زیوی کڕی بە سەد **دیناری** ئالْتون، دوای ساڵێك دەیدات، دروست نیە، چونکە ئەبێت دەست بە دەست ڕو بدات.

٧- دروست نیە کڕین یا فرۆشتنی سەهمی ئەو بانکانەی مامەڵە بە ڕیباوە دەکەن، چونکە لە جۆری فرۆشتنی دراوە بە دراو بە بێ یەکسانی وبە بێ دەست بە دەست.

# دەروازەی سێ یەم

# لە بارەی قەرزەوە

**چەند پرسێکی تێدایە:**

## پرسی یەکەم: پێناسەکەی وبەڵگەکانی شەرعی بونی؟

قەرز: بریتیە لە ماڵدان بە کەسێك سودی لێ ببینێت دواتر لەجیاتیەکەی بگێڕێتەوە. قەرزیش شەرعیە، بەڵگەش لە سەر ئەمە گشتێتی ئەو ئایەت وفەرمودانەی پەیامبەرە ﷺ کە لە بارەی فەزڵی یارمەتی یەکتر دان وبە جێ گەیاندنی پێداویستی موسڵمان ولە مەینەتی دەرکردنیەوە هاتوە بەڵگەن لە سەری، موسڵمانانیش کۆکن لە سەر دروستیەکەی. ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پەیامبەری خوا ﷺ وشترە گەنجێکی لە پیاوێك قەرز کرد، کە وشتری صەدەقە هات، فەرمانی کرد بە ئەبو ڕافع ﷺ قەرزی کابرا بداتەوە، ئەبو ڕافع گەڕایەوە خزمەتی وتی: وشتری لەو تەمەنەم نەبینیوە تەنها وشتری پێنج ساڵە نەبێت، فەرموی ﷺ: «أَعْطِهِ إِيَّاهُ، إِنَّ خِيَارَ النَّاسِ أَحْسَنُهُمْ قَضَاءً» «پێی بدە، بە ڕاستی باشترینی خەڵك ئەوانەن باشترینن لە قەزاکردنەوەدا»[(١)]. هەر لەو بەڵگانەی تر لە سەر فەزڵەکەی: فەرمودەکەی پەیامبەری خوایە ﷺ ئەفەرموێ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُقْرِضُ مُسْلِمًا قَرْضًا مَرَّتَيْنِ إِلَّا كَانَ كَصَدَقَتِهَا مَرَّةً» «هیچ موسڵمانێك نیە دو جار قەرز بدات بە موسڵمانێکی تر مەگەر وەکو ئەوە وایە یەك جار کردبێتیە خێر»[(٢)].

---

(١) أخرجه البخاري (٢٣٩٣)، ومسلم (١٦٠١) واللفظ لمسلم.

(٢) أخرجه ابن ماجه (٢٤٣٠) وهو حديث حسن. انظر إرواء الغليل (٢٢٦/٥).

## پرسی دوەم: مەرجەکانی قەرز وهەندێك حوکمی پەیوەست پێوەی:

١- دروست نیە موسڵمان قەرزێك بدات بە براکەی خۆی بە مەرجێك دوای گێڕانەوەی، قەرز بەم بداتەوە، چونکە قەرزدەر سود گەیاندنی بە مەرج گرتوە، هەرچی قەرزێکیش سودێکی [مەرج داری] لێ بکەوێتەوە ئەوا سوە، وەك: بە مەرجی ئەوەی بە بەلاش، یا هەرزان بڕواتە خانوەکەی، یا ئاژەڵەکەی خۆی بخاتە لای، یا هەر شتێکی تر، یا هەر سودێکی تر. کومەڵێك لە هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ فەتوایان لە سەر ئەمە داوە، وزانایانیش کۆکن لە سەر ڕێگری لێ کردنی.

٢- ئەبێت قەرزدەر هەڵس وکەوت دروستێکی، باڵغی ژیری سەر ڕاست بێت، بەخشینی دروست بێت.

٣- بۆ قەرزدەر نیە زیادە دانەوە لە ماڵەکە بکاتە مەرج، چونکە ئەوە سوە، دروستیش نیە وەری بگرێت، بەڵکو تەنها ئەوەندە وەردەگرێت کە یەکەمجار پێیداوە.

٤- ئەگەر قەرزار باشتر لە قەرزەکە یان زیاتری بۆ خاوەن قەرزەکە گێڕایەوە بە بێ مەرج ومەبەست، ئەوە دروست ئەبێت، چونکە بەخشین وجوان قەزاکردنەوەیە لە قەرزارەوە، فەرمودەکەی ئەبو ڕافعیش بەڵگەیە لە سەر ئەمە.

٥- ئەبێت قەرزدەر خاوەنی ئەوە بێت دەیدات بە قەرز، بۆشی دروست نیە شتێك بدات بە قەرز کە هی خۆی نیە.

٦- هەروەها مامەڵە ڕیباییە حەرامەکان: ئەوەیە کە بانکەکان لە سەردەمی ئەمڕۆماندا پێی هەڵدەستن، وەك قەرزدان بە کەسێکی پێویستدار، ئەوا بڕێك پارەی پێ دەدات بەرامبەر سودێکی دیاری کراو، لێی وەری دەگرێت جگە لە قەرزەکە، یان بانکەکە لەگەڵ قەرزکەرەکە ڕێکدەکەوێت لە سەر نرخی قەرزەکە، پاشان بانکەکە

ئەڕوا کەمتر لەوەی ڕێککەوتبون پێی دەدات، بەو مەرجەی قەرزکەرەکە بە تەواوەتی بیداتەوە، بۆ نمونە: قەرزکەرەکە داوای سەد هەزار لە بانك دەکات، بـانکیش هەشـتا هەزاری پێ دەدات وبە مەرجی دەگرێت دواجار سەد هەزاری بۆ بگێڕێتەوە. ئەمـەش سوە وحەرامە.

# دەروازەی چوارەم

# لە بارەی بارمتەوە ( الرَّهْن )

دوو پرسی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: واتای بارمتە، وبەڵگەکانی شەرعی بونی؟

بارمتە: دانانی زاتێکیماڵیە، وەکو بەڵگە نامەیەك بۆ قەرزەکە، تا لە کاتی نەدانەوەی، قەرزەکە یا نرخەکەی لێ ببات.

بەڵگەش لە سەر شەرعی بونی بارمتە، فەرمایشتەکەی خوایە: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ﴾ [البقرة: ٢٨٣] «ئەگەریش لە سەفەر بون وکەستان دەست نەکەوت قەرزەکەتان بۆ بنوسێت ئەوسا شتێك بدەن بە خاوەن هەقەکە تا وەکو زەمانەتی هەقەکەی خۆی لە لای بێت تا قەرزارەکە قەرزەکە دەداتەوە»، باسی سەفەریش لە ئایەتەکەدا بۆ زۆر جار هاتوە، بۆیە عیبرەت بە مەفهومەکەی نیە، چونکە سوننەت بەڵگەیە لە سەر شەرعی بونی لە نیشتەجێدا، لە عائیشەوە ﵂ [پێشتر باس کرا]: «پەیامبەری خوا ﷺ خواردنی لە یەهودیەك کڕی بە قەرز، وقەڵغانەکەشی بە بارمتە لا دانا».

## پرسی دوەم: ئەو حوکمانەی پەیوەستن بە بارمتەوە:

١- هەر شتێك دروست نەبێت بفرۆشرێت دروست نیە بکرێتە بارمتە، وەك وەقف وسەگ، چونکە ناکرێت قەرزەکەی لێ ببڕدرێت، شتێکیش نەکرێت خاوەنداریێتی بکرێت ناکرێتە بارمتە.

٢- مەرجیشە ئەندازە وجۆر وشێوازی بارمتەکە بزانرێت.

٣- ئەبێت بارمتەدانەر هەڵس وکەوت دروست بێت، خاوەنی بارمتەکە بێت یان ڕێگەی پێدرا بێت.

٤- بۆ بارمتەدانەر نیە هیچ بکات بە بارمتەکە بە بێ ڕەزامەندی بارمتە لادانراو، ئەمیش ئەوەی بۆ نیە بە بێ ڕەزامەندی بارمتەدانەر.

٥- دروست نیە «بارمتە لا دانراو» کەڵك وەر بگرێت لە بارمتەکە مەگەر بارمتەکە سوار یان شیردارێك بکات، ئەوا دروستە بۆی سواری ببێت، وشیردارەکەش بدۆشێت ئەگەر خەرجی دەکێشا.

٦- بارمتە ئەمانەتە لە دەست بارمتە لا دانراو، جا زەمانەتی لە سەر نیە مەگەر دەست درێژی بکاتە سەری، جا ئەگەر کاتی ئەو قەرزە هات کە بارمتەی لەگەڵدایە، پێویستە لە سەر قەرزار قەرزەکە بداتەوە، ئەگەر نەیکرد دادوەر ناچاری دەکات، هەر نەیکرد بەندی دەکات وتەمبێی دەکات تا قەرزەکە بداتەوە، یا بارمتەکە دەفرۆشێت ولە نرخەکەی دەیبژێرێت.

# دەروازەی پێنجەم

# لە بارەی کڕین وفرۆشتنی «السَّلَم»ـەوە

**ئەمیش دو پرسی تێدایە:**

## پرسی یەکەم: واتای سەلەم وبەڵگەکانی شەرعی بونی، ودانایی لێی؟

[١] **پێناسەکەی:** «السَّلَف» و«السَّلَم» یەك واتایان هەیە، بریتیە لە فرۆشتنی نائامادەیەکی وەسفکراو لە ئەستۆ بە نرخێکی حازری وپێشوەختە.

[٢] **بەڵگەی شەرعی بونی:** شەرعیە وەك ئیبن عەبباس ئەڵێ: «قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ وَهُمْ يُسْلِفُونَ فِي الثِّمَارِ السَّنَةَ وَالسَّنَتَيْنِ، فَقَالَ: مَنْ أَسْلَفَ [...] فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، ووَزْنٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ» «پەیامبەری خوا ﷺ کە هات بۆ مەدینە مامەڵەی سەلەمیان لە بەر وبومدا دەکرد بۆ ساڵ ودوان یا سیان، فەرموی: کێ سەلەمی کرد با بیکات بە پێوانەیەکی زانراو، وبە کێشانەیەکی زانراو، بۆ ماوەیەکی زانراو»[١].

[٣] **حیکمەت لە شەرعی بونی:** وشەریعەتی ئیسلام ڕێگەی پێداوە بۆ فراوانی کردن دەرهەق موسڵمانان، **بۆ نمونە:** جوتیار لەوانەیە پارەی نەختی نەبێت بۆ چاککردنی زەوی وکشتوکاڵەکەی، کەسیشی دەست ناکەوێت قەرزی پێ بدات، بۆیە سەلەمی بۆ حەڵاڵ کراوە بۆ ئەوەی بەرژەوەندی وەبەرهێنانکردن لە زەویەکەی لەدەست نەچێت.

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٢٤٠)، ومسلم (١٦٠٤).

## پرسی دوەم: لە بارەی مەرجەکانیەوە:

سەلەم جۆرێکە لە جۆرەکانی کڕین وفرۆشتن، جا بۆ ئەوەی دروست ببێت مەرجەکانی پێشتری کڕین وفرۆشتنی پێویستە، ئەمانەشی بۆ زیاد دەکرێت:

١- ئەبێت «سەلەم لە بارەوە کراو» بکرێت سیفەتەکانی زەبت بکرێت، وبە وردی دیاری بکرێت بە پێوانە یان کێشانە یا گەز، بۆ ئەوەی سەر نەکێشێت بۆ کێشە وناکۆکی.

٢- زانینی ئەندازەی «سەلەم لە بارەوە کراو» بە پێوەرە شەرعیەکەی، جا دروست نابێت نە لە پێوراوێك بە کێشراوێك، ونە لە کێشراوێك بە پێوراوێك.

٣- ئەبێت ڕەگەز وجۆری سەلەم لەبارەوە کراو باس بکات، بە سیفاتانێك کە جیای بکاتەوە.

٤- ئەبێت قەرز بێت لە ئەستۆدا.

٥- ئەبێت حازری نەبێت.

٦- ئەبێت ماوەکە زانراو ودیاری کراو بێت لە لایەن هەر دو لاوە.

٧- ئەبێت نرخەکە بە تەواوەتی بە زانراوی لە نیشتگەکەدا وەر بگرێت پێش ئەوەی هەر دوکیان بڵاوە لێ بکەن.

٨- ئەبێت سەلەم لەبارەوە کراو لەوانە بێت زۆرجار بکرێت لە ماوەکەدا بێتە دی، بۆ ئەوەی لە ماوەی دیاری کراودا تەسلیمی بکات، جا ئەگەر بونی نەدەبو -وەك خورمای تەڕ لە زستاندا- ئەوە دروست نابێت، چونکە فریودان وغەرەری تێدایە.

# دەروازەی شەشەم

# لە بارەی حەواڵە کردنەوە «الْحَوَالَة»

ئەمیش دو پرسی لە خۆ گرتوە[1]:

## پرسی یەکەم: واتای حەواڵە، وبەڵگەکانی شەرعی بونی:

**حەواڵە:** بریتیە لە گواستنەوەی قەرز لە ئەستۆی هەواڵە کەرەکەوە بۆ ئەستۆی هەواڵە بۆ کراو.

قەرز گواستنەوەش شەرعیە لەبەر ئەو نەرمیە، وە ئەو بەرژەوەندیەی کە تێیدایە لە گۆڕینەوەی نێوان تاکەکانی ئوممەت، لەگەڵ ئاسان کردنی مامەڵەکان. لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «إِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكم عَلَى مَلِيءٍ فَلْيَتْبَعْ»[2]، یانی: ئەگەر کەسێکتان قەرزێکی هەبو، هەواڵەی دارایەك کرا با هەواڵەکە کردنەکە قەبوڵ بکات. جا ئەگەر هەواڵەی مایە پوچێکی کرد ئەوا هەقەکەی دەگەڕێتەوە لای ئەوەی هەواڵەی کردوە، چونکە موفلیس بون عەیبەیە وئەمیش پێی ڕازی نەبوە، بۆیە مافی پەشیمان بونەوەی هەیە.

---

(١) بۆ ئەوەی ئەم باسەت لا ڕون بێت، ئەم زاراوانە بزانە:
هەواڵەکەر «المحیل»: قەرزارەکەیە، کە دێت خاوەن قەرز، هەواڵەی کەسی سێیەم دەکات.
هەواڵەکراو «المحال»: خاوەن قەرزەکەیە، کە قەرزارەکە، هەواڵەی کەسێکی تری دەکات.
هەواڵە بۆ کراو «المحال علیه»: ئەو کەسی سێیەمەیە کە خاوەن قەرزەکەی بۆ لا حەواڵە دەکرێت.
هەواڵە لە سەر کراو «المحال به»: خودی قەرزەکەیە. وەرگێڕ.
(٢) متفق علیه: أخرجه البخاري (٢٢٨٧)، ومسلم (١٥٦٤).

## پرسی دوەم: مەرجەکانی حەواڵە بۆ ئەوەی دروست بێت:

بۆ ئەوەی دروست بێت ئەمانەی خوارەوە مەرجن:

١- ڕەزامەندی حەواڵەکەر، چونکە سەر پشکە لەو دیوەی قەرزەکەی پێدا دەداتەوە، جا ناچار ناکرێت لە سەر لایەك.

٢- ئەبێت هەردو ماڵە «هەواڵە لە سەر کراو» و«هەواڵە بۆ کراو»ەکە لە ڕوی ئەندازە وجۆر وسیفەت وەك یەك بن.

٣- ئەبێت ماڵە لە سەر هەواڵەکراوەکە قەرزێکی جێگیر بێت لە ئەستۆی هەواڵە بۆ کراوەکە.

**ئەگەریش حەواڵە دروستەکە دامەزرا بەو شێوازەی باس کرا ئەوا ئەبێتە هۆی ئەوەی:** مافەکە لە ئەستۆی هەوالکەرەوە بگوازرێتەوە بۆ ئەستۆی حەواڵە بۆ کراو.

هەروەها لە شێوە سەردەمیەکانی حەواڵە:

- **حەواڵەی بانکی** (الحَوَالةُ المَصْرِفيَّة): هۆکارێکە بۆ تەسلیمکردنی بڕە پارەیەکی نەخت، لە بەرامبەر دانەوەی نرخەکەی لە شوێنێکی تر.

**ئەمەش شێوەکەیەتی:** کەسێك هەڵدەستێت بڕێك پارەی نەخت دەداتە یەکێك لە بانکەکان، داوای لێ دەکات نرخی ئەو بڕە تەسلیمی کەسێکی تر بکات لە شارێکی تر، لە بەرامبەر کرێ وعمولەیەك لە بانکەکە وەری دەگرێت.

- سفتەچی (السُّفْتَجَة): ئەمەش هەر دەخرێتە پاڵ حەواڵەوە، کە بریتیە لە نوسراوێك یا تەختەیەك قەرزارەکە یان جێگرەکەی دەینوسێت بۆ خاوەن قەرزەکە یان جێگرەکەی لە شارێکی تر بیداتەوە بە قەرزدەر. یا قەرزێك بداتە کەسێك لە شارێك

بۆ ئەوەی قەرزار یان جێگرەکەی بیداتەوە بە قەرزدەرەکە یان جێگرەکەی لە شارێکی تر. جا ئەو کاغەزەی قەرزار دەینوسـێت پێـی دەوترێـت سفتەچـی -کـە وشـەیەکی فارسی بە عەرەبی کراوە-[1]. هەندێك لە زانایانیش ڕێگەیان پێنەداوە، بەڵام ئـەوەی ڕاستە: دروستە، چونکە بەرژوەندی هـەر دو لای تێدایـە بـە بـێ ئـەوەی زیـانی بـۆ کەسیان یا ناشەرعیەکی تێدا بێت.

(١) ئەم وشە خۆی لە ئەسڵدا -والله أعلم- لە وشەی سفتی کوردیەوە وەرگیراوە، واتە موحکەم وپتەو، بەمەش ناونراوە چونکە کارەکە پتەو وسفتە. «چی»یەکەش تورکیە واتە: خاوەن، وەك پینەچی. وەرگێڕ.

# دەروازەی حەوتەم

# لە بارەی بریكاریەوە «الْوَكَالَة»

دو پرسی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەكەم: واتای بریكاری، وحوكمەكەی، وبەڵگەكانی شەرعی بونی:

### ١- پێناسەكەی:

بریكاری: ئەوەیە كەسێك جگە لە خۆی ڕا بسپێرێت بۆ ئەوەی جێگەی بگرێتەوە لەو شتانەی بریكاری دەیگرێتەوە.

### ٢- حوكمەكەی وبەڵگەكانی شەرعی بونی:

بریكاری شەرعیە، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿فَابْعَثُوا أَحَدَكُمْ بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ﴾ [الكهف:١٩] «جا یەكێكتان بنێرن ودراوە زیویەكەتانی پێ بدەن با بڕوا بۆ شار بزانێت كامەیان خواردنەكەی حەلاڵ تر وپاكترە تا بۆمان بهێنێت برسیمانە» ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا﴾ [التوبة:٦٠]. جا خوا لە بەر كاركردنی ڕێ پێدا، چونكە لە جیاتی ئەوانەی شایستەن زەكات كۆ دەكەنەوە. لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە ئەڵێ: ویستم بچم بۆ خەیبەر، پەیامبەری خوا فەرموی: «إِذَا أَتَيْتَ وَكِيلِي فَخُذْ مِنْهُ خَمْسَةَ عَشَرَ وسْقًا» «كە چوی بۆ لای بریكارەكەم ئەوا پانزە ویسقی لێ بسێنە»(١). لە عەمری كوڕی جەعدەوە ﷺ ئەڵێ: «عَرَضَ لِلنَّبِيِّ ﷺ جَلَبٌ فَأَعْطَانِي دِينَارًا، وَقَالَ: أَيْ عُرْوَةُ، ائْتِ الْجَلَبَ فَاشْتَرِ لَنَا شَاةً...» «ئاژەڵ وشتومەك

(١) أخرجه أبو داود (٣٦٣٢)، والدارقطني (٤/١٥٥).

هێنرابو بۆ فرۆشتن پەیامبەری خوا ﷺ بینی، فەرموی: ئەی عوروە بڕۆ شەكێكمان بۆ بكڕە...»[1].

موسڵمانانیش كۆكن لە سەر دروستێتی بریكاری بە گشتی، چونكە پێویستی ئەیخوازێت، لەبەر ئەوەی هەمو كەسێك پێی ناكرێت بە خۆی ئەوە بكات كە پێویستی پێیەتی، جا پێویستی، خواستی كە شەرعی بێت.

## پرسی دوەم: مەرجەكانی بریكاری، وئەو حوكمانەی پێوەی پەیوەستە:

١- مەرجە بریكار وبریكارگرتەكەش هەڵس وكەوت دروست وبالّغ وژیر وسەر ڕاست بن.

٢- بریكاری دروست ئەبێت لە هەر شتێك كە بریكاری بیگرێتەوە، وەك كڕین وفرۆشتن وسەرجەم گرێ بەستەكانی تر، وهەڵوەشاندنەوەكان وەك تەلاّق وخولع. هەروەها دروست ئەبێت لە هەر شتێك بریكاری بیگرێتەوە لە پەرستنەكان وەك زەكات وسەر فترەدان، ونەزر وحەج كردن وهاوشێوەكانیان.

٣- دروست نابێت لەو شتانەی كە بریكاری نایگرێتەوە لە مافەكانی خوا وەك دەست نوێژ ونوێژ.

٤- بریكار ئەتوانێت ئەو هەڵس وكەوتانە بكات كە ئیزنی وەكیل گرتە ئەیخوازێت، یا بە گوێرەی نەریتی خەڵك، بە مەرجێك ئیزنەكە زیانی بۆ وەكیل گرتە نەبێت.

---

(١) أخرجه البخاري (٣٦٤٢).

٥- بۆ بریکار نییە کەسی تر بکاتە وەکیل مەگەر بریکارگرتە خۆی بهێڵێت، یا بریکار خۆی تەتوانێت کارەکە بکات، یا لێی نەزانێت ئەو کاتە دەست پاکێك ئەخاتە جێی خۆی لەوەی ئەم تێیدا کراوەتە بریکار.

٦- بریکار دەستپاکە لەوەی پێی سپێردراوە، زەمانەتی لە سەر نییە مەگەر کەمتەرخەمی یا دەست درێژی بکات.

٧- بریکاری گرێ بەستێکی ناچاری نییە «جَائزٌ»، بۆ هەر دو لا هەیە هەڵیب وەشێنێتەوە.

٨- وەکالەتەکە بەم شتانە هەڵ دەوەشێتەوە:

مردن یا شێت بونی یەکێك لە دو لاکە، یان یەکێکیان هەڵی بوەشێنێتەوە، یان لە لایەن وەکیل گرتەوە بریکاریەکە هەڵ بوەشێتەوە، یان حەجری بخرێتە سەر بە هۆی گەمژەییەوە.

# دەروازەی هەشتەم

# لە بارەی کەفالەت وزەمانەتەوە «الْكَفَالَةَ وَالضَّمَان»

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: واتاکەی کەفالەت وبەڵگەکانی شەرعی بونی:

١- **پێناسەکەی:** کەفالەت بریتیە لە پابەندبون بە ئامادەکردنی ئەو کەسەی کە مافێکی دارایی لە سەرە بیهێنێت بۆ مەجلسی حوکمدان.

٢- **بەڵگەکانی شەرعی بونی:** کەفالەت شەرعیە بە بەڵگەی قورئان وفەرمودە وکۆ دەنگی. لە قورئاندا ئەم ئایەتەیە: ﴿قَالُوا نَفْقِدُ صُوَاعَ الْمَلِكِ وَلِمَنْ جَاءَ بِهِ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا بِهِ زَعِيمٌ﴾ [يوسف:٧٢] «وتیان: کاسە (جامولکە)کەی پادشامان لێ بزربوە کە شتی پێ دەپێوێت، پاداشتی ئەوەشی بیدۆزێتەوە یەك بارە وشتر خواردنە، منیش کەفیلی وزامنی ئەو بارە وشترە دەکەم. جا زعیم» یانی: کەفیل وزەمانەتکەر، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَلِكَ زَعِيمٌ﴾ [القلم:٤٠] «ئەی پەیامبەری خوا پرسیار لە هاوبەشدانەران بکە: کێ لە ئێوە ئەبێتە کەفیل وزامنی ئەو حوکمە. جا زعیم لێرەش» یانی: کەفیل. لە فەرمودەشدا: پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ[1]: «الْعَارِيَةُ مُؤَدَّاةٌ، وَالزَّعِيمُ غَارِمٌ، وَالدَّيْنُ مَقْضِيٌّ» «دەستیار دەدرێتەوە دەست خاوەنەکەی، کەفیلیش پابەندە بە بژاردنەوە، قەرزیش پێویستە بدرێتەوە».

(١) أخرجه أبو داود (٣٥٦٥)، والترمذي (١٢٦٥) وقال: «حديث حسن». «السلسلة الصحيحة» (٦١٠).
زەعیمیش کەفیلە، زەعامەتیش کەفالەتە. «معالم السنن» (١٧٧/٣). [لە ئەسڵدا لە سەرەوە دانراوە].

زانایانیش کۆکن لە سەر دروستێتی کەفالەت، چونکە خەڵك پێویستیان پێ دەبێ وزیان لە قەرزدەر دور دەخاتەوە.

## پرسی دووەم: پایەکانی کەفالەت ومەرجەکانی:

پایەکانی کەفالەت پێنجە:

شێواز (صیغة)کەی، وکەفیل، وکەفالەت بۆ کراو (الَمكْفُولُ لَه)، کەفالـەت لـە بـر کراو (الْمَكْفُولُ عَنْهُ)، مافە کەفالەت بۆ کراوەکە (الْمَكْفُولُ بِه) [1].

صیغەکەشی بە ئیجابی کەفیلەکە بە تەنها تەواو دەبێـت وڕاناوەسـتێت لـە سـەر قەبوڵکردنی کەفالەت بۆ کراوە.

سەبارەت بە کەفیل: مەرجە لەوانە بێت، شیاو بێت تەبەڕوع بکـات وببەخشـێت، ئیتر پیاو بێت یان ژن، چونکە کەفالەت لە تەبەڕوعاتەکانە.

کەواتە کەفالەتی شێت وتێك چو (الْمَعْتُـوه) ومنـداڵ دروسـت نابێـت، هـەروەها ئەوەی حەجری لە سەرە بـە هـۆی گەمژییەکەیـەوە، نـە کەفالـەتی ونـە زەمانـەتی دروست نابێت.

کەفالەت لە بر کراویش: ڕازی بونی مەرج نیـە بـۆ ئـەوەی کەفالەتەکـە دروسـت بێت، بە پێچەوانەی کەفیلەوە کە ڕەزامەندی مەرجە بۆ دروستێتی کەفالەت.

---

(١) کەفیل: ئەو کەسەیە کە پابەند ئەبێت بە ئامادەکردنی کەسەکە.
کەفالەت بۆ کراو (المَكْفُولُ لَه): ئەو کەسەیە کە خاوەن مافە وداوای کەفیلی کردوە.
کەفالەت لە بر کراو (الْمَكْفُولُ عَنْهُ): ئەو کەسەیە ئەبێت ئامادە بێت ومافەکە بدات.
مافە کەفالەت بۆ کراوەکە (الْمَكْفُولُ بِه): ئەو ماف ومالەیە کە پێویستە لە سەر «الْمَكْفُولُ عَنْهُ». وەرگێڕ.

جێگای کەفالەت کردنەکەش: ئەکرێ بە ماڵ وسامان بێ، وپێی دەوترێ: زەمانەت، ئەشکرێ بە خۆ (النفس) بێت، پێشی دەوترێت: کەفالەتی لاشە وڕومەت.

## پرسی سێیەم: هەندێك لە حوکمەکانی کەفالەتکردن:

١- کەفالەت کردن دروست ئەبێت بە لاشەی هەمو کەسێك کە هەقێکی ماڵی بە سەرەوە بێت.

٢- کەفالەت کردن دروست نابێت بە لاشەی کەسێك حەددی لە سەرە.

٣- کەفالەت کردن دروست نابێت بە لاشەی کەسێك تۆڵە سەندنەوەی لە سەرە.

٤- کەفیل ئەستۆ پاك ئەبێ بە مردنی کەفالەت بۆ کراوەکە کە ناکرێت بهێنرێت.

٥- ئەگەر کەسەکە خاوە-خاوی دەکرد ونەیدەدایەوە، یا مایەپوچ بو، ئەوا ئەو کەفیلەی مافدانەوەی لە ئەستۆ گرتوە زەمانەتی لە سەرە.

٦- ئەو کەفیلەی مافدانەوەی لە ئەستۆ نەگرتوە -کەفیلی هێنان- زەمانەتی لە سەر نیە، چونکە کەفالەتەکەی کەفالەتی ناساندن وهێنانی کەفالەت لە بر کراوە.

٧- کەفالەتکردن بە لاشە دروستە، کە بریتیە لە پابەندبونی کەفیل بە هێنانی «لە بر کراو» بۆ «کەفالەت بۆ کراو» یا بۆ نشتگەی حوکمەکە وهاوشێوەکانی.

## پرسی چوارەم: لە بارەی زەمانەتەوە:

زەمانەتکرن: بریتیە لە پابەند بون بەوەی لە سەر کەسێکی تر پێویست بوە. ئەمەش دروستە، لەبەر فەرمایشتەکەی [پێشتری] خوا ﷻ: ﴿ئەوەی بیدۆزێتەوە پاداشتەکەی یەك بارە وشتر خواردنە، منیش کەفیلی وزامنی ئەو بارە وشترە دەکەم﴾ [یوسف:٧٢]، جا زعیم یانی: زامنکەر، هەروەها فەرمودەکەی [پێشوی]

پەیامبەر ﷺ: «زامن کەریش لـە سـەریەتی پابەنـد بێـت بـە بـژاردنی مافەکـە».
زانایانیش کۆن لە سـەر ئـەوەی دروسـتە، چـونکە پێویسـتی ئـەیخوازێت، ئەمـەش ئەڕواتە ژێر ئەو پێداویستی پڕکردنەوە وهاوکاریەی کە شەرع فەرمانی پێکردوە.

## حوکم ومەرجەکانی زەمانەت:

١- دروست نیە قەرەبوی لە سەر وەر بگیرێت.

٢- دروستە چەند زامنکەرێك هەبن" دو زامنکەر وزیاتریش هەبن.

٣- مەرج نیە زامنکەر زەمانەت بۆ کراو بناسێت.

٤- دروستە زەمانەتی زانراو ونەزانراو بکرێت ئەگەر سـەری دەکێشـا بـۆ زانـین، هەروەها زەمانەتی بەرپرسیارێتی فرۆشراو (ضَمَانُ عُهْدَةِ المَبِيع) دروستە[1].

٥- زەمانەت دروستە بە هەر دەستەواژەیەك واتەکەی بگەیەنێت، وەك بلێت: من زامنی دەکەم، یا زەمانەتی دەکەم، یا هاوشێوەکانی.

٦- زامنکەر ئەستۆی پاك نابێتەوە تا ئەستۆی زەمانەت لەبر کراو لە قـەرز پـاك نەبێتەوە، ئەمەش بە گەردن ئازایی ئەبێت، یا دانەوەی.

٧- بۆ ئەوەی دروست بێت مەرجە: زامنکەرەکە ڕازی بێت، جا کە زۆری لێ کـرا لە سەر زەمانەت کردن ئەوا دروست نابێت.

[٨-] مەرجیش نیە زەمانەت لە بر کراو وزەمانەت ویست ڕازی بن.

[٩-] وەکو چۆن بۆ ئەوەی زەمانەت کردنەکە دروست بێت، مەرجـە: زامـن کـەر هەڵس وکەوت دروست بێت، بەوەی باڵغ وژیر وسەر ڕاست بێت.

---

(١) زەمانەت یا کەفالەتی «الدَّرَك»یشی پێ ئەڵێن؛ واتە: کەسێك بەڵێن بدات وزەمانەت بدات بە کڕیار بە گێڕانەوەی نرخی فرۆشراوەکە ئەگەر دەرکەوت عەیبێك یا نوقسانیەك لە فرۆشراوەکەدا هەیە. وەرگێڕ

# دەروازەی نۆیەم

# لە بارەی حەجر وڕێگری کردنەوە «الحَجْر»

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

**پرسی یەکەم: واتای حەجر، وبەڵگەکانی شەرعی بونی، وجۆرەکانی:**

١- **پێناسەکەی:** حەجر لە زماندا: ڕێگریکردنە. لە شەرعیشدا بریتیە لە: ڕێگریکردن لە کەسێك لەوەی هەڵوسوکەوت بکات لە ماڵ وسامانەکەی خۆیدا.

٢- **بەڵگەکانی شەرعی بونی:** بنەمای ئەم بابەتە ئەم فەرمایشتەی خوایە ﷻ: ﴿وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ﴾ [النساء: ٥] «ئەی بەخێوکەران ماڵ وسامانەکانتان مەدەن بەوانەی زەرەر وقازانجی خۆیان نازانن دواجار زایەی دەکەن» یانی: ماڵەکانیان، بەڵام دایە پاڵ بەخێوکەرانەوە چونکە ئەوان بەڕێوەبەر وسەرپەرستیاری ئەو ماڵ وسامانەن. هەروەها فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿وَابْتَلُوا الْيَتَامَى حَتَّى إِذَا بَلَغُوا النِّكَاحَ فَإِنْ آنَسْتُمْ مِنْهُمْ رُشْدًا فَادْفَعُوا إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ﴾ [النساء: ٦] «وهەتیوەکانی ژێر دەستان تاقی بکەنەوە بۆ ئەوەی بزانن تا چەند بە ڕێکی هەڵس وکەوت بە پارە وماڵەکەیانەوە دەکەن، تا دەگەنە تەمەنی پێگەیشتن، ودەزانن لە ڕوی دین داریەوە چاکن، وتوانای پاراستنی ماڵەکانی خۆیانیان هەیە، ئەو کاتە تەسلیمیان بکەن»، هەروەها فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿فَإِنْ كَانَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ بِالْعَدْلِ وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ﴾ [البقرة: ٢٨٢] «جا ئەگەر قەرزار حەجری لە سەر بو بە هۆی دەست بادی ودەست بڵاویەوە، یان منداڵ بو، یان شێت بو، یان ناتوانێت قسە بکات بە هۆی

لالێیەوە ویان نەیتوانی قسە بکات بە تەواوەتی، با لە بری ئەو، بەخێوکەرەکەی هەقەکە بە دەمی خۆی بڵێت بە رێکی وراستی ودادگەری، وبڕۆن دو شایەتی موسُڵمانی باڵغی ژێری دادگەر بهێنن». جا ئەم ئایەتە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی حەجر ورێگریکردن دروستە لە ماڵ وسامانی گەمژە وهەتیو وهاو واتاکانیان وەك شێت ومنداڵ، بۆ ئەوەی توشی فەوتان وخراپ بون نەیەت، پێشیان نادرێت هەتا سەر ڕاستیان بەدی دێت، بەخێوکەرەکەش بۆی هەیە هەڵس وکەوت لە ماڵەکەیان بکات ئەگەر بەرژەوەندی خواستی.

٣- **جۆرەکانی:** حەجر ورێگریکردن دو جۆرە:

**جۆری یەکەم:** حەجر بۆ بەرژەوەندی ڕێگری لێکراو، وەك ڕێگری کردن لە منداڵ وگەمژە وشێت، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ﴾ [النساء:٥].

**جۆری دوەم:** ڕێگریکردن لە کەسێك لەبەر بەرژەوەندی غەیرە خۆی، وەك ڕێگری کردن لە مایە پوچ، جا ڕێگری لە هەڵس وکەوت کردن لە ماڵەکەی خۆیدا لێ دەکرێت، بۆ ئەوەی زیان بە خاوەن قەرزەکان نەگات. هەروەها وەك حەجر خستنە سەر نەخۆش نەخۆشی مردن لە زیاتر لە سێ یەکی ماڵەکەی، ئەمەش لەبەر مافی میراتگران. هەروەها کۆیلە ڕێگری لێدەکرێت لەبەر مافی خاوەنەکەی، بۆیە بە بێ هێڵانی خاوەنەکەی ڕێکەی هەڵس وکەوتی پێ نادرێت.

## پرسی دوەم: ئەو حوکمانەی پەیوەستە بە جۆری یەکەمەوە:

کە بریتیە لە حەجر خستنە سەر کەسەکە لە بەر بەرژەوەندی خودی خۆی:

١- ئەگەر ڕێگری لێ کراو -بە هۆی منداڵی وهاو وشێوەکانی- دەست درێژی کردە سەر نەفس یا ماڵێك بە تاوان، ئەو کاتە زەمانەتی لە سەرە وچی لەو دەست

درێژیه بکهوێتهوه بژاردنی له سهر ئهمه، چونکه دهست درێژی له سهر کراو کهمتهرخهمی نهکردوه وئیزنیشی له سهر نهبوه، بهڵام ئهگهر خۆی ماڵهکهی بداته دهست منداڵێك یان گهمژهیهك یان شێتێك ئهویش له ناوی بدات، ئهوه زهمانهتی له سهر نیه، چونکه خۆی دهسهڵاتی ئهوهی پێداوه به ڕهزامهندی خۆی، بۆیه کهمتهرخهمه.

٢- حهجریش له سهر منداڵ ههڵ دهگیرێت به دو شت:

**یهکهم شت:** بالغ بون: ئهمهش دهزانرێت به چهند نیشانهیهك؛ که بریتیه له: ئاو هاتنهوه، یا موی بهری زبر بێت، یان بگاته پانزه ساڵ [زۆر جار]، یان سوڕی مانگانه دهرههق ئافرهتان.

**دوهم شت:** سهر ڕاستی (الرُّشد): ئهمهش بریتیه ههڵس وکهوتی دروست له ماڵ وسامان، لهبهر فهرمایشتهکه خوا ﷻ: ﴿وَابْتَلُوا الْيَتَامَى حَتَّى إِذَا بَلَغُوا النِّكَاحَ فَإِنْ آنَسْتُمْ مِنْهُمْ رُشْدًا فَادْفَعُوا إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ﴾ [النساء:٦] وسهر ڕاستیهکهشی به تاقیکردنهوه دهزانرێت، چهند جارێك ههندێك ههڵس وکهوتکردنی له ماڵ وسامان پێدهدرێت جا ئهگهر زهرهرێکی زۆری نهکرد وماڵهکهی له حهرام یا له شتی بێ کهڵك خهرج نهکرد ئهوا بهڵگهی سهر ڕاستیهتی.

٣- حهجر له سهر شێتیش لا دهبرێت به دو شت:

**یهکهم شت:** نهمانی شێتیهکه وژیری بۆ بگهڕێتهوه.

**دوهم شت:** سهر ڕاستی.

٤- ] گەمژەش لە سەری لا دەبرێت: ئەگەر گەمژەیی وهەڵەشەییەكەی نەما، وەسف كرا بە چاكی هەڵس وكەوت لە ماڵ وساماندا[1].

٥- باوك ئەگەر دادگەر وسەر ڕاست بو كار وباری «ڕێگری لێ كراو» دەباتە ڕێوە، ئینجا وسیەت بۆ كراو -لە لایەن باوكەوە-. پێویستیشە لە سەر بەڕێوبەری كاروباریان بە شێوەیەك هەڵس وكەوت بكات كە سود وكەڵكی بۆ ئەوان تێدا بێت، لەبەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ [الأنعام:١٥٢] «ئەی بەڕێوبەرانی كاروباری هەتیوان نزیكی ماڵی هەتیوان مەبنەوە مەگەر لە كاتێكدا بۆ سودی ماڵەكەی ئەو بێت وقازانجی ئەوی تێدا بێت»، ئایەتەكەش بە دەق باسی هەتیو دەكات، بەڵام هەر كەسێكی هاو واتای ئەم قیاس دەكرێتە سەری.

٦- لە سەر بەخێوكەری هەتیوە كە پارێزگاری لە ماڵەكەی بكات، وبە ستەم وبوهتان دەست بۆ ماڵەكەی نەبات ولێی نەخوات، لەبەر فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا﴾ [النساء:١٠] «ئەوانەی دەست درێژی دەكەنە سەر ماڵی هەتیوان وبە ناهەق دەیبەن، لە ڕۆژی دواییدا ئەوانە ئاگر دەخۆن كە لە سنگیان بڵێسەی دێت، بێگومان دەشڕۆنە دۆزەخەوە ولە گەرمیەكەشی دێت بە سەریاندا».

## پرسی سێیەم: ئەو حوكمانەی پەیوەستە بە جۆری دووەمی حەجرەوە:

كە بریتیە لە حەجر خستنە سەر كەسەكە لە بەر بەرژەوەندی كەسی تر:

---

(١) چونكە جیایە كردمە ژمارە چوار. وەرگێڕ.

١- حەجر ناخرێتە سەر قەرزارێك کە جاریێ کاتی قەرزەکە نەهاتوە، چونکە پێش هاتنی کاتەکەی لە سەری نییە، بەڵام ئەگەر ویستی سەفەرێکی درێژ خایەن بکات وکاتی قەرزەکەی دێت پێش گەڕانەوەی، بۆ خاوەن قەرز هەیە ڕێگری سەفەری لێ بکات تا بارمتەیەکی لێ وەردەگرێت یان کەفیلێکی دارای لێدەگرێت.

٢- ئەگەر ماڵی ڕێگری لێکراو زیاتر بو لەو قەرزەی لە سەری بو، ئەوە حەجر ناخرێتە سەر ماڵەکەی، بەڵام لە کاتی داواکردنەوەی فەرمانی پێدەکرێت بیداتەوە، ئەگەریش نەیدایەوە بەند دەکرێت وتەمبێ دەکرێت تا قەرزەکە بداتەوە، ئەگەر هەر نەهاتە ژێر بار ئەوسا دەست بۆ ماڵەکەی دەبرێت بۆ دانەوەی قەرزەکانی، بەڵام ئەگەر ماڵەکەی کەمتر بو لەو قەرزانەی ها بە سەریەوە، وئێستاش کاتی دانەوەی ئەو قەرزانەیە، ئەوا لە کاتی داواکردنەوەی حەجر دەخرێتە سەر ماڵەکەی، بۆ ئەوەی خاوەن قەرزەکان زیانیان پێ نەگات. هەروەها ڕێگە بە قەرزار نادرێت هەڵس وکەوت بکات لە ماڵەکەی بە بەخشینەوە وجگە لەوەش ئەگەر ئەمە زیانی بە خاوەن قەرزەکان دەبو.

٣- هەر کەس شت بفرۆشێت یان قەرز بدات بە ڕێگری لێکراو دوای حەجر خستنە سەر، ئەوا بۆی نییە داوای مافەکەی بکات، مەگەر دوای هەڵگرتنی حەجر لە سەری.

٤- بۆ دادوەر هەیە ماڵەکەی بفرۆشێت ونرخەکەی دابەش بکات بە گوێرەی قەرزی خاوەن قەرزەکان کە کاتی هاتوە، چونکە ئەمە مەبەستە لە ڕێگری لێکردنی، دواخستنیشی ماتەڵ کردن وستەمە لەوان، ئەوەشی پێویستی پێیەتی لە بژێوی وشوێنی نیشتەجێبون دادوەر بۆی دەهێڵێتەوە.

# دەروازەی دەیەم

## شەریکایەتی وهاوبەش کاری «الشَّرِكَة»

دو پرسی لە خۆ گرتوە:

### پرسی یەکەم: واتای شەریکایەتی وحوکمەکەی وبەڵگەکانی شەرعی بونی:

١- **پێناسەی «شَرِكَة»:** لە زماندا: تێکەڵاویە، یانی: تێکەڵکردنی ماڵێك بە ماڵێکی تر بە شێوەیەك لە یەکتر جیا نەکرێنەوە. لە شەرعیشدا: بریتیە لە کۆبونەوە وهاوبەش بون لە ماف وشایستەیی (الاستحقاق) یان هەڵس وکەوت (التصرف)دا.

**کۆبونەوە لە شایستەییدا:** وەك هاوبەشی لە میرات وەسیەت ودیاری لە زات (عَيْن) یان سود (مَنْفَعَة)ی شتێکدا، ئەمەش پێی دەوترێت: هاوبەشی موڵك (شَرِكة الأَمْلاك).

**کۆبونەوەش لە هەڵس وکەوتدا:** بە هاوبەشی گرێ بەست (شَرِكة العُقُود)یش دەناسرێت، لێرەشدا ئەمە مەبەستە بۆ لێکۆڵینەوە. جا ئەمە هەر دوو بەشەکەی شەریکایەتیە بە گوێرەی ئەم پێناسەیە.

٢- **بەڵگەکانی شەرعی بونی:** شەریکایەتی شەرعیە، ئایەت وفەمودەکانیش بەڵگەن لە سەر دروستێتی. خوای میهرەبان ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ الْخُلَطَاءِ لَيَبْغِي بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾ [ص:٢٤] «بەڕاستی زۆرێکی شەریکەکان ستەم لە یەکتر دەکەن وبە ئینساف نین لەگەڵ یەکتردا» ﴿الخُلَطَاء﴾ یانی: شەریکەکان. هەروەها ئەفەرموێ: ﴿فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ﴾ [النساء:١٢] «ئەوا لە یەکلە سەر سێ شەریکن».

شەریکایەتیش لە گریٚ بەستە دروست (جائزة)کانە، کۆمەڵگاش پێویستی زۆری پێویستی پێیەتی بە تایبەت لە پرۆژە قەبەکاندا کە کەسێك بە تەنها ناتوانێت پێی هەستێت.

## پرسی دووەم: جۆرەکانی شەریکایەتی گریٚ بەست:

**یەکەم:** شەریکایەتی جڵەو (شَرِكَةُ العِنَان): بریتیە لە هابەوشی کردنی دوان یان زیاتر لە ماڵێکدا، بازرگانی تێدا دەکەن، واشی پیٚ وتراوە لەبەر ئەوەی هەموویان وەك یەکن لە ماڵدان ولە هەڵس وکەوتدا، وەك چۆن ئەگەر لە سەر وڵاخێك دا بن جڵەوی هەر دوکیان یەکسانە ئەگەر وەك یەك بە ڕێدا برۆن. جا مەرجیشە بۆ ئەوەی دروست بێت دەستمایەکە لە هەردولاوە یان هەموویانەوە بێت، بە نەختی وزانراوی وئامادەیی، هەروەها بۆ هەر یەکێکیان ڕێژەیەکی دیاری کراوی قازانج دیاری کرا بێت.

**دووەم:** شەریکایەتی «الْمُضَارَبَة»: ئەوەیە یەکێك لە شەریکەکان ماڵەکە ئەدات بەوەکەی تر بازرگانی پێوە بکا بەرامبەر بەشێکی دیاریکراوی بیٚ تایبەتکراو (مُشَاع)ی قازانج[1].

**سێیەم:** شەریکایەتی بە ڕوو (شَرِكَةُ الوُجُوه): بریتیە لە شەریکیکردن لەوەی بە پایەی خۆیان دەیکڕن بیٚ ئەوەی دەستمایەیان هەبێت، وەکو پشت بەستنێك بە متمانەی بازرگانان پێیان.

(١) مُشاع: وەك بە نیوە یا چوار یەك وهتد، یانی: جۆرێکی دیاری کراو تایبەت نەکرێت بە یەکێکیانەوە وهاوشێوەی ئەمانە. وەرگێڕ

**چوارم:** شەریکایەتی بە لاشە (شَرِكَةُ الأبدان): بریتیە لە شەریکی کردن لەوەی بە لاشەی خۆیان بە حەلاڵی کەسابەتی تێدا دەکەن، وەك چیلکە کۆکردنەوە وڕاوکردن وکانزا ودار کۆکردنەوە. یا شەریکی بکەن لەوەی ڕازی دەبن بخرێتە ئەستۆیان لە ئیشکردن وەك چنین ودورین وهاوشێوەکانیان. قازانجەکەش بە گوێرەی ڕێککەوتن لە نێوان هاوبەشەکاندا دابەشدەکرێت، بە هەمان شێوە زەرەر وزیان بە گوێرەی پارەکەیان دەبێت، بەڵام ئەمە لە هاوبەشی «الْمُضَارَبَة»دا نیە. هەروەها بۆ هەر یەکەشیان هەیە کەی ویستی گرێ بەستی هاو بەشیەکە هەڵ بوەشێنێتەوە وەك چۆن بە مردنی یەکێکیان یا شێت بونی هەڵدەوەشێتەوە.

# دەروازەی یانزەهەم

# کرێ دان «الإِجَارَة»

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: واتای بە کرێ دان وبەڵگەکانی شەرعی بونی:

١- **واتای «الإجارة» وپێناسەکەی:** لە زماندا لە «أجر»ەوە وەرگیراوە، کە بریتیە لە بەرامبەر وتەعویز، هەر بۆیە بە پاداشت وتراوە: ئەجر. لە شەرعیشدا: بریتیە لە گرێ بەستێك لە سەر سودێکی حەڵاڵی زانراو، بەرە بەرە لە ماوەیەکی دیاری کراودا وەر دەگیرێت لە سەر زات «عَیْن»ێکی زانراو یان وەسفکراو لە ئەستۆ، یان لە سەر کارێکی زانراو بە بەرامبەرێکی زانراو وەردەگیرێت.

٢- **بەڵگەکانی شەرعی بونی:** بەڵگەی شەرعی بونی فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ [الطلاق:٦] «ئەگەر بە کرێ شیریاندا بەو منداڵانەی خۆیان کە لە ئێوەن، ئەوا کرێکەیان بە تەواوەتی بدەن» ﴿قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ﴾ [القصص:٢٦] «یەکێك لە دو ئافرەتەکە بە باوکی وت: باوکە! بە کرێ بیگرە بۆ لەوەڕاندنی مەڕ وماڵاتەکەت، بێگومان باشترین کەسێك بە کرێ بیگری بۆ شوانی: بەهێز ودەستپاکە؛ بەهێزە بۆ پارستنی ماڵاتەکە، دەستپاکە ولە خیانەتی ناترسی». هەروەها چەسپاوە کە «اسْتَأْجَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ رَجُلًا مِنْ بَنِي الدِّيلِ... هَادِيًا خِرِّيتًا» «پەیامبەری خوا ﷺ وئەبوبەکر پیاوێکیان لە خێڵی «دیل» بە کرێ گرتوە بۆ دەلالی ورێ نیشاندان». هەرِەشەش کراوە لەو کەسەی بە تەواوەتی کرێی کرێکار نادات؛ لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ثَلَاثَةٌ أَنَا

خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ:... وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيرًا فَاسْتَوْفَى مِنْهُ وَلَمْ يُعْطِ أَجْرَهُ» «خوا ﷻ فەرموی: سێ کۆمەڵ خۆم دژیانم لە دوارۆژدا... وپیاوێك کرێکارێك بگرێت، ئیشەکەی بە تەواوەتی بۆ بکات بەڵام ئەم مافەکەی پێ نادات»[1]. هەروەها لە ئیبن عومەرەوە ﷺ، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «أَعْطُوا الْأَجِيرَ أَجْرَهُ قَبْلَ أَنْ يَجِفَّ عَرَقُهُ» «کرێی کرێکار بدەن پێش ئەوەی ئارەقەکەی وشکەوە بێت»[2].

## پرسی دووەم: مەرجەکانی بە کرێ دان:

١- دروست نابێ مەگەر کەسەکە هەڵس وکەوت دروست (ژیر وباڵغ وئازاد وسەر ڕاست) بێت.

٢- ئەبێت سودەکە زانراو بێت، چونکە لێرەدا سودەکە بریتیە لە «گرێ بەست لە سەرکراو»، جا مەرجە بزانرێت، هەر وەك کڕین وفرۆشتن.

٣- ئەبێت کرێکەش زانراو بێت، چونکە بەرامبەرەکەیە (عِوَض)ەکەیە لە گرێ بەستێکی ئاڵ وگۆڕ کردن دا، جا پێویستە بزانرێت، وەك نرخ [لە کڕین وفرۆشتن دا].

٤- ئەبێت سودەکەش حەڵاڵ بێت، جا کرێ لە سەر دامێن پیسی وگۆرانی وفرۆشتنی ئامێرەکانی مۆسیقا دروست نابێت.

٥- ئەبێت سودەکە ئامادەگی ئەوەی هەبێت هەقەکەی بدرێت، جا بە کرێدان دروست نابێت لە سەر شتێك ناکرێ هەقی سودەکە بدرێت، وەك بە کرێگرتنی کوێر بۆ پاراستنی شتێك پێویستی بە بینین هەیە.

---

(١) أخرجه البخاري (٢٢٢٧).

(٢) أخرجه ابن ماجه (٢٤٤٣)، وصححه الألباني (صحيح سنن ابن ماجه ١٩٩٥).

٦- ئەبێت سودەکە موڵکی بە کرێ دەرەکە یان ڕێگە پێ دراو بێت، چونکە بە کرێ دان فرۆشتنی سودەکانە، بۆیە ئەوە مەرجە بۆی هەر وەك فرۆشتن.

٧- ئەبێت ماوەکە زانراو بێت، جا بە کرێ دان دروست نیە بۆ ماوەیەکی نەزانراو، چونکە سەردەکێشێت بۆ ناکۆکی.

## پرسی سێیەم: ئەو حوکمانەی پەیوەستن بە کرێ دانەوە:

ئەم حوکمانەی خوارەوەش پەیوەستە بە گرێ بەستی بە کرێ دانەوە:

١- بە کرێگرتن دروست نیە بۆ ئەو شتانەی نزیکبونەوەن لە خوا وپەرستنن، وەك بانگدان وحەجکردن وفەتواودان وپێشنوێژی کردن وفێرکردنی قورئان، چونکە نزیکیە لە خواوە، بەڵام ئەوەی هەڵدەستێ بەمانە دروستە بۆی لە بەرامبەردا موچەی لە خەزێنەی دەوڵەت وەربگرێت.

٢- بە کرێ دەر لە سەریەتی خودی شتەکە بدات بە کرێ گرتەکە ودەسەڵاتی سود لێ وەرگرتنی پێ بدات، وپێویستیشە لە سەر بە کرێگرتە پارێزگاری بکات لە ماڵە بە کرێ دراوەکە، هەروەها لە کاتی خۆیدا کرێکە بدات.

٣- دروست نیە تاك لایەنە گرێ بەستی بە کرێ دان هەڵ بوەشێنرێتەوە مەگەر ڕەزامەندی ئەوەکەی لە سەر بێت، ئەگەریش یەکێکیان مرد وخودی بە کرێدراوەکە مابو گرێ بەستەکە هەڵناوەشێتەوە ومیراتگرەکەی جێی دەگرێتەوە.

٤- ئەگەر خودی ماڵە بە کرێدراوەکە فەوتا، یان سودەکەی نەما وەك ئاژەڵێك مردار بێتەوە، یان ماڵێك بڕوخێت ئەوا بە کرێدانەکە هەڵدەوەشێتەوە.

# دەروازەی دوانزەهەم

## پێکەوە زەرعاتکردن، وپێکەوە ئاودان «الْمُزَارَعَةَ والْمُسَاقَاة»

**چەند پرسێکی تێدایە:**

**پرسی یەکەم: واتای پێکەوە زەرعاتکردن، وپێکەوە ئاودان، وحوکمەکەیان:**

**١- واتاکەیان:**

«الْمُزَارَعَة»: بریتیە لەوەی زەوی بدرێت بە کەسێك بیکاتە کشتوکاڵ، یا دانەوێڵەی پێ بدرێت بیچێنێت وبە ئیشەکانی هەستێت، بەرامبەر بەشێکی زانراوی بێ تایبەتکراو (مشاع)ی بەر وبومەکە.

«الْمُسَاقَاة»یش: بریتیە لەوەی داری چێنراوی زانراوی بەربوم خوراو بدرێت بە کەسێك بە ئیشەکانی هەستێت بەرامبەر بە بەشێکی زانراوی بێ تایبەتکراوی بەر وبومەکە.

پەیوەندی نێوان هەردوکیشیان ئەوەیە: موزارەعەکردن ئیش لە سەر زەرعاتەکە دەکرێت وەك دانەوێڵە، موساقاتیش ئیش لە سەر دارەکە دەکرێت وەك خورما، لە هەردوکیشیاندا بەشێکی داهاتەکە بۆ ئیشکەرەکەیە.

**٢- حوکمەکەیان:**

هەر دوکیان شەرعین، ولە گرێ بەستە دروست (جَائِزَة)ەکانن، لەبەر ئەوەی خەڵك پێویستیان پێ دەبێت. لە ئیبن عومەرەوە ﷺ: «أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَامَلَ أَهْلَ خَيْبَرَ بِشَطْرِ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا مِنْ ثَمَرٍ أَوْ زَرْعٍ» «پەیامبەری خوا ﷺ مامەڵە (موساقات)ی

لەگەڵ خەڵکی خەیبەردا کرد بە رامبەر نیوەی داهاتەکەی لە بەر وبوم وکشتوکاڵ»[1].

## پرسی دوەم: مەرجەکانی موساقات وموزارەعە:

١- ئەبێت لە موساقاتدا دارەکان زانراو بێ، ولە موزارەعەشدا تۆوەکە زانراو بێ.

٢- ئەبێت ئەو کەسەی گرێ بەستەکانی دەکات هەڵس وکەوت دروست بێت، بۆیە نابێت مەگەر پێگەیشتویەکی ئازادی سەر ڕاست بیکات.

٣- ئەبێت دارەکە بەر وبومێکی خوراوی هەبێت، وەك خورما وهتد.

٤- ئەبێت ئیشکەرەکە لە بەر وبومی دارەکە، یان لە دەخلی داهاتی زەویەکە بەشێکی بێ تایبەتکراوی زانراوی هەبێت وەك سێیەك وچواریەك وهاوشێوەکانیان.

## پرسی سێیەم: ئەو حوکمانەی پەیوەستە بە هەر دوکیانەوە

ئەم حوکمانەی خوارەوەیان پێوە پەیوەستە:

١- لە سەر ئیشکەرەکەیە هەمو ئەو شتانە بکات کە ئەبێتە مایەی باشبون وچاك بونی بەر وبومەکە وەك کێڵان وئاودان وپاککردنەوە وپاراستن وموتروبەکردن وشکردنەوەی بەر وبوم وجگە لەمانەش.

٢- لە سەر خاوەن زەویەکەشە هەمو ئەو شتانە بکات کە ئەسڵەکە دەپارێزێت، وەك بیر کەندن وئاو دابینکردن ودیوار وپەرژین لێدان، وهێنانی ئامێر وماتۆڕ.

---

(١) متفق علیه: أخرجه البخاري (٢٣٢٩)، ومسلم (١٥٥١). [گرێ بەستی جائز هەیە لەگەڵ گرێبەستی «لازم»، جائز: ئەو گرێبەستانەیە واجب نیە پێوەی پابەند بیت وبۆت نەبێت هەڵی بوەشێنیتەوە، هەڵبەت ئەگەر زیانی بۆ لایەنی بەرامبەر تێدا نەبو].

٣- لەگەڵ دەرکەوتنی بەر وبومەکەدا ئیشکەر دەبێتە خاوەنی بەشەکەی خۆی.

٤- هەر دو لا، کەی ویستیان دەتوانن گرێ بەستەکە هەڵبوەشێننەوە، چونکە گرێ بەستێکە دروستە ولازم نیە، جا ئەگەر هەڵوەشایەوە وبەر وبومەکەش دەرکەوتبو، ئەوا بە گوێرەی مەرجەکانی هەر دو لایانە، لە سەر ئیشکەرەکەشە کارەکەی تەواو بکات. جا ئەگەر ئیشکەرەکە پێش دەرچونی کشتوکاڵەکە ودەرکەوتنی بەر وبومەکە هەڵی وەشاندەوە ئەوا هیچی بۆ نیە، لەبەر ئەوەی ڕازی بوە مافەکەی خۆی بخات وەك ئیشکەر لە «مضاربة»دا. بەڵام ئەگەر خاوەنماڵەکە هەڵی وەشاندەوە پێش دەرکەوتنی بەر وبومەکە ودوای دەست کردنە بە ئیش، ئەوا ئیشکەرەکە قازانجی هاوشێوەی ئەوەی بۆ هەیە.

٥- ئەگەر موساقات یان موزارەعەی لەگەڵ کرد لە ماوەیەکدا کە زۆرجار بەر وبومی تێدا دێتە بەرهەم بەڵام ئەو ساڵە هیچی بەرهەم نەهێنا ئەوا ئیشکەرەکە هیچی بۆ نیە.

# دەروازەی سیانزەهەم

# شوفعە وهاوسێیەتی «الشُّفْعَة وَالجِوَار»

**چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:**

## پرسی یەکەم: واتای شوفعە، وبەڵگەکانی شەرعی بونی:

١- **واتاکەی:** «الشُّفْعَة»: ماف دانە بە شەریك كە بەشی شەریكەكەی خۆی وەربگرێتەوە لە كەسی سێیەم كە بە بەرامبەر ئەو بەشەی كەوتۆتە دەستی. واشی پێوتراوە چونكە هاوڕێكەی فرۆشراوەكەی هێناوەتەوە سەر موڵكی خۆی وبۆتە جوت «شفع»، دوای ئەوەی لە موڵكەكەی بەشەكەی تەنها بو، وتراویشە: بریتیە لە خاوەندارێتیەكی ناچاری كە شەریكە كۆنەكە هەیەتی بەسەر شەریكە نوێیەكەدا بە هۆی شەریكایەتی، تا زیان دور بخاتەوە.

٢- **بەڵگەكانی شەرعی بونی:** بنەما تێیدا فەرمودەكەی جابرە ﷺ ئەڵێ: «قَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ مَا لَمْ يُقْسَمْ، فَإِذَا وَقَعَتِ الْحُدُودُ، وَصُرِّفَتِ الطُّرُقُ، فَلَا شُفْعَةَ» «پەیامبەری خوا ﷺ فەرمانی بە شوفعە كرد لە هەر شتێك مادام دابەش نەكرا بێت، كە سنور دیاری كرا وڕێگا وجادەكانی ڕونەوە بون ئیتر شوفعە نیە»[1]. لە ڕیوایەتێكی تردا[2]: «قَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ شَرِكَةٍ لَمْ تُقْسَمْ رَبْعَةٍ أَوْ حَائِطٍ لَا يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَبِيعَ حَتَّى يُؤْذِنَ شَرِيكَهُ، فَإِنْ شَاءَ أَخَذَ وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ، فَإِذَا بَاعَ وَلَمْ يُؤْذِنْهُ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ» «پەیامبەری خوا ﷺ

(١) أخرجه البخاري (٢٢٥٧) واللفظ له، ومسلم (١٢٢٩).

(٢) أخرجه مسلم (١٦٠٨) (١٣٤). والرَّبعَة والربع: الدار والمسكن ومطلق الأرض.

فەرمانی بە شوفعە کرد لە هەر شەریکیەکدا خانو ومالّ وزەوی وبێستانەکە دابەش نەکرابێت، حەلاّل نیە بۆی بیفرۆشێت تا داوای ئیزن لە شەریکەکەی دەکات، ئەگەر ویستی لێی دەکڕێت، یان نایەوێت، جا ئەگەر فرۆشتی ئیزنی نەخواست ئەوا ئەو لە پێشترە بۆی». هەروەها ئەفەرموێ ﷺ: «جَارُ الدَّارِ أَحَقُّ بِالدَّارِ» «هاوسێ ماڵ لە پێشترە بە ماڵەکە»[1]. زانایانیش کۆکن لە سەر ئەوەی مافی شوفعە بۆ شەریك چەسپاوە ئەگەر فرۆشراوەکەی دابەش نەکرا بێت وەك زەوی وخانو وبێستان. بەمەش ڕون بویەوە شوفعە بە سوننەت وکۆ دەنگی شەرعیە.

## پرسی دووەم: ئەو حوکمانەی پەیوەستن بە شوفعەوە:

١- بۆ شەریك دروست نیە بەشەکەی خۆی بفرۆشێت تا داوای ئیزن لە شەریکەکەی دەکات، کە فرۆشتی وئیزنی نەخواست ئەوا شەریکەکەی لە پێشترە بەو بەشەی فرۆشراوە.

٢- شوفعە نیە جگە لە زەوی وزار وخانوبەرە، وەك گوازراوەکان (المنقولات) لە شتومەکەکان وئاژەلاّن وهاوشێوەکانی.

٣- شوفعە مافێکی شەرعیە دروست نیە فێلّ وحیلە بکرێت بۆ خستنی، چونکە دانراوە بۆ لادانی زەرەر لە سەر شەریك.

٤- بە گوێرەی بەش وموڵکی شەریکەکان شوفعە دەچەسپێت، کێش شوفعەی بۆ بچەسپێت بەو نرخە دەیبات کە فرۆشراوە ئیتر بە قەرز بێت یان نەخت.

---

(١) أخرجه الترمذي (١٣٦٨) وقال: «حسن صحيح». وأبو داود (٣٥١٧). وصححه في «الإرواء» (١٥٣٩).

٥- شوفعە دەچەسپێت ئەگەر ئەو بەشە گوازراوەی شەریكەكە بە فرۆشتنێكی ڕاشكاوانە وهاوواتاكانی فرۆشرا بێت، بۆیە شوفعە نیە لە بەش گواستنەوەی بێ فرۆشتن، وەك: بەخشراوی بێ بەرامبەر، ومیراتی، وەسیەتكراو.

٦- ئەبێت ئەو خانو بەرەیەی گوازراوەتەوە بە فرۆشتن، دابەشكردن هەڵبگرێت، بۆیە شوفعە نییە لەوەی دابەشكردن هەڵناگرێت وەك گەرماوی بچوك، وبیر، وڕێگا.

٧- كەی بە فرۆشتنەكەی زانی شوفعە یەكسەر دەچەسپێت، جا ئەگەر كاتی فرۆشتنەكە داوای نەكرد ئەوە مافەكەی دەكەوێت، مەگەر نەزانێت ئەوە شوفعەكە هەر دەمێنێت، بە هەمان شێوە ئەگەر داواكاریەكەی دواخست لەبەر عوزرێك وەك نەزانینی حوكمەكەی وجگە لەمەش لە بیانوەكان.

٨- شوفعە لەو زەویەیە كە دابەش نەكراوە وسنوری دیاری نەكراوە، چی درەختی چێنراو وبیناش هەبو ئەوە هەر لەگەڵ زەویەكەدایە، ئەگەریش دابەش كرا بەڵام هەندێك مەرافق وپێداویستی هاوبەش لە نێوان هاوسێكان مایەوە وەك ڕێگا وئاو وهاوشێوەكانی، ئەوە لە سەر ڕاسترین دو بۆچونی زانایان شوفعە ماوە.

٩- ئەبێت شوفعەكەر هەمو فرۆشكراوەكە ببات، جا هەندێكی نابات وهەندێكیشی واز لێ بهێنێت، ئەمەش بۆ دورخستنەوەی زەرەر وزیان لە سەر كڕیار.

## پرسی سێیەم: حوكمەكانی هاوسێیەتی:

دراوسێ مافی هەیە بە سەر دراوسێكەی ترەوە، پەیامبەریش ﷺ ئەوەندە ئامۆژگاری كردوە دەرهەق بە دروسێ تا خەریك بوە بیكاتە میرات گر، جا كێ پێویستی بە هاوسێكەی كەوت وەك ئەوەی پێویستی بەوە بێت ئاو یا ڕێڕەوێك

وهاوشێوەکانی بە موڵکەکەیدا ببات، ئەوا لە سەر هاوسێکەیەتی پێداویستیەکەی بۆ دابین بکات، ئیتر بە بەرامبەر بێت یان بێ بەرامبەر.

بۆ مرۆڤیش نییە شتێك لە موڵکەکەی خۆیدا بکات ببێتە مایەی زیان بۆ هاوسێکەی، وەك کردنەوەی پەنجەرەیەك بە ڕوی ماڵەکەی ئەودا، یان کارگەیەك بە دەنگەکەی دراوسێکان بێزار دەکات وهاوشێوەکانی. ئەگەریش دیوارێکی هاوبەش هەبو لە نێوانیان بۆی نیە هەڵس وکەوتی تێدا بکات وداری لە سەر دابنێت مەگەر زەرور بێت، وەك کاتی سەرگرتنی خانوەکەی، ئەو کاتە با هاوسێکەی ڕێگری لێ نەکات، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «لَا يَمْنَعَ جَارٌ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَةً فِي جِدَارِهِ» «با هیچ هاوسێیەك ڕێگری لە هاوسێکەی تری نەکات کارێك بچەقێنێت بە دیوارەکەیدا»[1].

## پرسی چوارەم: لە بارەی ڕێگا وبانەوە:

١- دروست نییە ڕێگا لە موسڵمانان تەسك بکرێتەوە.

٢- دروست نییە لە موڵکەکەی خۆیدا شتێك بکات ڕێگاکەی پێ تەسك ببێتەوە.

٣- دروست نییە شوێنی ڕاگرتنی ئاژەڵ وئۆتۆمبیلەکەی سەرە ڕێ بێت.

٤- ڕێگا مافی هەموانە بۆیە پێویستە پارێزگاری لێ بکرێت لە هەمو ئەو شتانەی زیان بە تێ پەڕ بوان دەگەیەنێت، وەك زبڵ وخاشاك وهاوشێوەکانی بخەیتە سەری، چونکە لادانی ئازار لە سەر ڕێگا بەشێکە لە بەشەکانی باوەڕ.

---

(١) أخرجه البخاري (٢٤٦٣)، ومسلم (١٦٠٩)، واللفظ للبخاري.

# دەروازەی چواردەهەم

# سپاردن ولە ناوچون «الوَدِيعَةُ والإِتْلَافَات»

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: پێناسەی سپاردن، وبەڵگەکانی شەرعی بونی:

**١- واتاکەیان:**

سپاردن؛ زات (عَيْن)ی شتێکە خاوەنەکەی یان جێگرەکەی لای کەسێك دایدەنات بیپارێزێت بە بێ بەرامبەر.

**٢- بەڵگەکانی شەرعی بونی:**

بنەما تێیدا فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ﴾ [البقرة:٢٨٣] «وقەرزەکە ئەمانەتە لە ئەستۆی قەرزکەر پێویستە لە سەری بیداتەوە». وئەفەرموێ ﷻ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾ [النساء:٥٨]. «خوا فەرمانتان پێ دەکات بە دانەوەی ئەمانەتەکان بە هەمو جۆرەکانیەوە کە خاوەنەکانیان ئێوەیان تێدا بە دەستپاك زانیوە، بۆیە کەمتەرخەمی تێدا مەکەن»، پەیامبەری خواش ﷺ ئەفەرموێ: «أَدِّ الْأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ، وَلَا تَخُنْ مَنْ خَانَكَ» «ئەمانەت بگێڕەوە بۆ ئەوەی لای داناوی وتۆی بە ئەمین زانیوە، خیانەتیش مەکە لەوەی خیانەتت لێ دەکات»[1]. هەروەها زەرورەت وپێویستی دروستێتی سپاردن ئەخوازن.

---

(١) أخرجه مسلم (٢٦٩٩).

کێش دەیزانـی پێـی دەکرێـت ئەمانـەت بپارێزێـت، ئـەوا سـوننەتە سـپاردەکە وەربگرێت، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبـەر ﷺ: «وَاللهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ» «وخوا هەمیشـە یارمـەتی بەندەکـەی دەدات، تـا بەنـدە یارمـەتی براکەی بدات»[1]. بەڵام ئەگەر زانی ناتوانێت سپاردەکە بپارێزێت ئەوە بۆی نیە وەری بگرێت.

## پرسی دوەم: مەرجەکان بۆ ئەوەی سپاردن دروست بێت:

ئەبێت هەردولا هەڵس وکەوت دروست بن، بۆیە ئەگەر کەسێکی هـەڵس وکـەوت دروست ماڵەکەی سپاردە منداڵێك یا شێتێك یان گەمژەیەك ئـەویش لەناویـدا ئـەوا زەمانەتی لە سەر نیە چونکە کەمتەرخەم بوە، هەروەها ئەگەر منداڵ وهاوشێوەکانی ماڵێکی لای کەسێکی تر دانا، ئەوا زەمانەتی لە سەرە چونکە بە وەرگرتنی دەست درێژی کردوە.

## پرسی سێیەم: ئەو حوکمانەی پەیوەستە بە سپاردنەوە:

١- سپاردە ئەمانەتە لە دەستی پێسپێردراو، بۆیە زەمانەتی لە سەر نیـە ئەگـەر کەمتەرخـەمی نـەکات، چـونکە ئەمانەتێکـە وەك ئەمانەتـەکانی تـر، ئـەمینیش زەمانەتی لە سەر نیە ئەگەر دەست درێژی نەکات، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبـەر ﷺ: «لَا ضَمَانَ عَلَى مُؤْتَمَنٍ» «زەمانـەتکردن نیـە لـە سـەر ئەمانـەت پـێ سپێردراو»[2].

---

(١) أخرجه أبو داود (٣٥٣٥)، والترمذي (١٢٦٤)، وصححه الألباني في الإرواء (٥/٣٨١).

(٢) أخرجه الدارقطني (٤١١٣)، والبيهقي (٦/٢٨٩)، وحسّنه الألباني بمجموع طرقه «الإرواء» (١٥٤٧).

٢- ئەگەر دەست درێـژی كـردە سـەر سـپاردەكە یـان كەمتەرخـەمی كـرد لـە پاراستنی ئەوا زەمانەتی لە سەرە ئەگەر فەوتا، چونكە ماڵی كەسی تری فەوتاندوە.

٣- پێویستە لە سەر پێ سپێردراو (الْمُسْتَوْدَع) سپاردەكە بپارێزێت لـە شـوێنێك بە لە ڕوی نەریتەوە بە گـوێرەی سـپاردەكە بێـت، لەبـەر ئـەوەی خـوا ﷻ فـەرمان دەكات بە گێڕانەوەی ئەمانەتەكان بـۆ خاوەنـەكانیان، ئەمــەش نابێـت مەگـەر بـە پاراستنی، هەروەها لەبەر ئەوەی مەبەست لە سپاردن پاراسـتنێتی، پێسـپێردراویش خۆی پابەند كردوە بەوەوە، كە نەیپاراست ئەوە ئەوەی نەكردوە كە پێوەی پابەند بوە.

٤- دروستە پێ سپێرداو سپاردەكە بداتە دەست كەسێكی ترەوە كە عادەتەن ئـەو ماڵەكەی دەپارێزێت وەك ژن وكۆیلە وخەزنەدار وخزمەت كارەكەی، ئەگەریش لایـان فەوتا بە بێ دەست درێژی وكەم تەرخەمی ئەوا زەمانەتیان لە سەر نیە.

٥- دروست نیە بێ عوزر بیخاتە لای كەسی تر، عـوزریش وەك: سـەفەر وهـاتنی مەرگ جا ئەوە دروستە. كەوابو بە عوزرەوە لای كەسی تر داینا وفەوتا زەمانەتی لە سەر نییە، ئەگەریش بە بێ عوزر بو زەمانەتی لە سەرە، چونكە دەست درێژی وكـەم تەرخەمی كردوە.

٦- ئەگەر پێ سپێردراو ترسی لە سپاردەكە هەبو یا ویستی سەفەر بكات، ئـەوا پێویستە لە سەری بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەكەی یا بریكارەكـەی، ئەگـەر نەیدۆزینـەوە ئەوە لەگەڵ خۆیدا دەیبات بۆ سەفەر ئەگـەر وا پـارێزراوتر دەبـو، وەگـەرنا دەیداتـە حكومەت، ئەوەشی پێ نەكرا دەیخاتە لای جێ متمانەیـەك، چـونكە پەیامبـەر ﷺ پێش كۆچكردن بۆ مەدینە سپاردەكانی خستە لای ئـوم ئەیمـەن رضي الله عنها، وفەرمانیشـی

کرد بە عەلی ﷺ بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان[1]. بە هەمان شێوە ئەگەر پێ سپێردراو نەخۆش کەوت ومەترسی لە سەر بو، ئەوا پێویستە لە سەری بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانی ئەگەر نەکرا دەیخاتە لای حکومەت ئەگەرنا دەیخاتە لای کەسێك جێی متمانەی بێت.

٧- ئەگەر سپاردەکە ئاژەڵ بو لە سەر پێ سپێردراوە ئالف وخۆراکی بۆ دابین بدات، ئەگەر کەم تەرخەمی کرد زەمانەتی لە سەرە، بەم کەم تەرخەمیەش تاوانی دەگات چونکە حورمەتی هەیە، وهەروەهاش لە هەمو جەرگێکی تەڕ پاداشت هەیە.

٨- پێ سپێردراو دەست پاکە وقسەی وەر دەگیرێت؛ ئەگەر وتی سپاردەکەم گێڕاوەتەوە بۆ خاوەنەکەی یان جێگرەکەی، هەروەها ئەگەر سوێندی خوارد قسەی وەردەگیرێت ئەگەر وتی فەوتاوە بە بێ دەست درێژی وکەمتەرخەمی. ولە سەریەتی ئەگەر خاوەنەکەی داوای کرد دوای نەخات، ئەگەریش دوای خست بە بێ عوزر ولە ناوچو ئەوا زەمانەتی لە سەرە.

٩- لە شێوە سەردەمیەکانی سپاردن: سپاردە بانکیەکانە (الوَدَائِعُ الْمَصْرِفِيَّة) بریتیە لەوەی هەندێك لە تاکەکان پێی هەڵدەستن وبڕێك پارەی نەخت دەخەنە بانکەوە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو یان ڕەها، بانکەکەش هەڵدەستێت بە هەڵس وکەوتکردن بەم پارانەوە، لە بەرامبەردا سودێکی پارەیی چەسپاو دەدات بە خاوەنەکەی، ئەمەش هەمان واتای قەرزە، کە بانکەکە خود وزاتی ماڵەکەی لایە ولە ئەستۆیەتی، وبەڵێنیش دەدات هەمان نرخ بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی کەی داوای

(١) رواه البيهقي (٢٨٩/٦) وحسنه الألباني في إرواء الغليل (٣٨٤/٥).

کرد، ئا بەم شێوازەش بێت ڕیبایە وحەرامە، جا با موسُڵمانان وریا بن وتێی نەکەون.

بەڵام ئەو سپاردانەی کە خاوەنەکەی سوی لە سەر وەرناگرن ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەوترێت: «الحساب الجاري» ئەوە هیچی تێدا نیە، چونکە زیاتر لە پارەکەی خۆی وەرنەگرتوە. ئەگەریش کەسەکە پابەند کرا زیادە وەربگرێت، ناچاریش بو سپاردە بخاتە ئەم جۆرە بانکانە ئەگەریش نەیکات بە دڵنیاییەوە توشی زیان دەبێت، ئەو کاتە زیادەکە وەردەگرێت ولە بەرژەوەندی گشتی موسُڵمانان خەرجی دەکات.

## پرسی چوارەم: لە بارەی لە ناوچونەکانەوە (الإتلافات):

حەرامە دەست درێژی بکرێتە سەر ماڵی موسُڵمانان وبە ناڕەوا ببرێت، هەر کەسێکیش دەست درێژی بکاتە سەر ماڵی جگە لە خۆی وبیفەوتێنێت وماڵەکەش حورمەتدار بێت، ئەوە زەمانەتی لە سەرە، بە هەمان شێوە کەسێك ببێتە هۆکاری فەوتانی ماڵی جگە لە خۆی بە کردنەوەی قوفڵێك یان کردنەوەی دەرگایەك وهاوشێوەکانی.

ئەگەریش مەڕ ومالاتی هەبو پێویستە لە سەری بە شەو بیپارێزێت لە خراپکردنی کشتوکاڵی خەڵك یان خودی خۆیان، جا ئەگەر ئیهمالی کرد وخراپەی لێ کەوتەوە، زەمانەتی لە سەرە، چونکە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە کە ئەبێت خاوەن ماڵەکان بە ڕۆژ بیپارێزن، وخاوەن مەڕ ومالاتەکان بە شەو بیپارێزن[1]، جا چی بە شەو خراپ ببێت ئەوە زەمانەتی لە سەریانە، چونکە ماڵ وڕوحی

(١) [أخرجه أبو داود (٣٥٦٩) وغيره. انظر: «الصحيحة» (٢٣٨)].

موسڵمانان حورمەت گیراوە، بۆیە دەست درێژی کردنە سەر یا بونە هۆکار بۆ خـراپ بون وتیا چونی حەرامە.

هەڵ کوتەر وپەلامار دەر (الصَّائِل)یش[1] لە مرۆڤ وئاژەڵـدا ئەگـەر وازی نـەهێنا مەگەر بە کوشتن، ئەویش کوشتنی ئەوە قەرەبوی لە سەر نیە، چونکە وەکـو بـەرگری لە خۆی کوشتویەتی، لەبەر ئەوەی پەیامبـەر ﷺ ئەفـەرموێ: «مَنْ أُرِيدَ مَالُهُ بِغَيْرِ حَقٍّ فَقَاتَلَ فَقُتِلَ فَهُوَ شَهِيدٌ» «کێ پەلاماری ماڵەکەی درا ویستیان بیبەن بە ناحەق، ئەویش لە سەری جەنگا وکوژرا ئەوە شەهیدە»[2].

هەر کەسێکیش ئامێرە حەرامکراوەکانی لە ناودا وەك ئامێرەکانی مۆسیقا وخاچ وقاپ وچاقاغی مەی، وکتێبی گومڕا وبیدچـیەکان، وشـریت «کاسـێت» وگۆڤـاری ئابڕو بەر وڕوت، ئەوە زەمانەت وقەرەبوی لە سـەر نیـە، بـەڵام لەناوبردنەکـەش بـە ڕەهایی نیە، بەڵکو ئەبێت بە فەرمانی دادوەر بێت ولە ژێر چاودێری ئەودا بێت، بـۆ پاراستنی بەرژەوەندی ولادانی خراپەکاری، ودورخستنەوەی فیتنە وئاشوب.

---

(١) «الصائل» لە مرۆڤدا: ئەوەیە بە دەست درێژی هەڵ دەکوتێتە سەر ماڵ یا ناموس یا خودی خەڵك.

(٢) أخرجه الترمذي (١٤٢٠)، وقال: «حديث حسن صحيح»، وابن ماجه (٢٥٨٢)، وحسَّن البوصيري إسناده في «الزوائد»، وصححه الشيخ الألباني «صحيح الترمذي» (١١٤٧).

# دەروازەی پانزەهەم

# لە بارەی زەوت کردنەوە «الغَصْب»

دو پرسی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: پێناسەی زەوت کردن، وحوکمەکەی:

١- **واتاکەی:** (الغَصْب) لە زماندا: بردنی شتێکە بە ستەم. لە شەرعیشدا: دەستگرتنە بە سەر مافی کەسی تردا، بە ستەم ودەست درێژی بە ناڕەوایی.

٢- **حوکمەکەی:** حەرامە بە کۆ دەنگی زانایان، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ﴾ [البقرة:١٨٨] «ومالی یەکتر مەخۆن بە هۆکاری ناڕەواوە وەك سوێندی درۆ وداگیرکردن ودزین وبەرتیل وسو وهاوشێوەکانی». هەروەها پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: «لَا يَحِلُّ مَالُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلَّا بِطِيبِ نَفْسِهِ» «مالی هیچ موسڵمانێك حەلاڵ نیە مەگەر بە ڕەزامەندی خۆی»[1]. هەروەها ئەفەرموێ ﷺ: «مَنِ اقْتَطَعَ شِبْرًا مِنَ الْأَرْضِ ظُلْمًا، طَوَّقَهُ اللهُ إِيَّاهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ» «هەر کەس بستێك زەوی بە ناڕەوا زەوت بکات ئەوا خوا لە ڕۆژی دواییدا تا حەوت تەبەقەی خوارەوەی دەکاتە گەردنی»[2]. جا پێویستە لە سەر هەمو کەسێك کە مافی برایەکی لایە ستەمێکی لێکردوە تەوبە بکات وگەردنی خۆی پێ ئازاد بکات، وهەر لە دونیادا داوای لێبوردنی لێ بکات، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «مَنْ كَانَتْ لَهُ مَظْلِمَةٌ لِأَحَدٍ مِنْ عِرْضِهِ أَوْ شَيْءٍ فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهُ الْيَوْمَ،

(١) أخرجه أحمد (٥/٧٢)، والدارقطني (٣/٢٦) وصححه الألباني «الإرواء» (١٤٥٩).
(٢) أخرجه البخاري (٢٤٥٢-٢٤٥٣)، ومسلم (١٦١٠) واللفظ لمسلم.

قَبْلَ أَنْ لَا يَكُونَ دِينَارٌ وَلَا دِرْهَمٌ، إِنْ كَانَ لَهُ عَمَلٌ صَالِحٌ أُخِذَ مِنْهُ بِقَدْرِ مَظْلَمَتِهِ، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ صَاحِبِهِ فَحُمِلَ عَلَيْهِ» «هەر کەس ستەمێکی لە براکەی کردوە لە ناموس وکەسایەتیی یان هەر شتێك، با هەر ئەمڕۆ گەردن ئازادی لێ بکات پێش ڕۆژێك کە دینار ودرهەمی تێدا نیە، ئەگەر کردەوەی چاکەی هەبێت بە گوێرەی ستەمەکە لێی دەبات، ئەگەریش کردەوەی چاکەی نەبو لە خراپەکانی ستەملێکراو دەدرێت بە سەر کۆڵی ستەمکاردا»[١].

**پرسی دوەم: ئەو حوکمانەی پەیوەستن بە زەوت کردنەوە:**

١- پێویستە لە سەر زەوتکەر، زەوتکراو وەك خۆی بگێڕێتەوە، ئەگەریش فەوتاندبوی هاوشێوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە [هاوشێوەکەی نەبو، نرخەکەی].

٢- هەروەها پێویستە لە سەری زەوتکراو بە زیادەکەیەوە بگێڕێتەوە، ئیتر زیادەیەکی جودا بێت لە زەوتکراوەکە یان لەگەڵ زەوتکراوەکە پێکەوە بن.

٣- زەوتکەر ئەگەر هەڵس وکەوتی کرد لە زەوتکراوەکە وەك بیناکردن یا ناشتن، فەرمان دەکرێت بە هەڵکەندنی ئەگەر خاوەنەکەی داوای ئەمەی کرد.

٤- زەوتکراو ئەگەر گۆڕا بو یان کەمەوە بو بو، یان هەرزان بو بو، زەوتکەر زەمانەتی کورتهێنانەکەی لە سەرە.

٥- زەوتکردن جاری وا هەیە بە دژ وەستانەوە (خصومة) وسوێندی درۆ ئەبێت.

٦- هەمو هەڵسوکەوتەکانی زەوت کەر پوچە، ئەگەر خاوەنەکەی ڕێگەی نەدابێت.

---

(١) أخرجه البخاري (٢٤٤٩). والمَظْلِمة: ما يطلبه المظلوم، وهو اسم ما أُخذ منه ظلمًا.

# دەروازەی شانزەهەم

# لە بارەی ئاشتەوایی كردنەوە «الصُّلح»

چەند پرسێكی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەكەم: ماناكەی، وبەڵگەكانی شەرعی بونی:

١- **واتاكەی:** (الصلح) لە زماندا: پێكەوەنان، یانی: نەهێشتنی كێشە. لە شەرعیشدا: ئەو گرێ بەستەیە كە كێشەی كێشەداران دەبڕێتەوە.

٢- **بەڵگەكانی شەرعی بونی:** بەڵگەی شەرعی بونی قورئان وفەرمودە وكۆ دەنگیە. لە قورئاندا: ئەم ئایەتەیە: ﴿وَالصُّلْحُ خَيْرٌ﴾ [النساء: ١٢٨] «وئاشتەوایی لە پێشترە وباشترە»، هەروەها خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا﴾ [الحجرات:٩] «وئەگەر دو كۆمەڵ لە باوەڕداران بە شەڕ هاتن لەگەڵ یەكتردا ئەوا -ئەی بڕواداران- ئاشتەوایی بكەن لە نێوانیاندا، بە بانگكردنیان بۆ قورئان وسوننەتی پەیامبەر وڕازی بون بە حوكمیان» هەروەها ئەفەرموێ ﷻ: ﴿لَا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِنْ نَجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاةِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ [النساء: ١١٤] «**خێر لە زۆربەی چپە وقسە نهێنیەكانی خەڵكدا نیە مەگەر قسەیەك فەرمان بە بەخشین بكات، یان قسەی باش بێت، یان خەڵك بنات بە یەكەوە، كێش ئەمانە بكات بە مەبەستی ڕەزامەندی خوا ئەوا بێگومان پاداشتی زۆر وفراوانیان پێ دەبەخشێت**». لە سوننەتیشدا: پەیامبەر ئەفەرموێ ﷺ[١]: «الصُّلْحُ جَائِزٌ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ إِلَّا صُلْحًا

---

(١) أخرجه أبو داود (٣٥٩٤)، والترمذي (١٣٥٢) وقال: «حسن صحيح»، وابن ماجه (٢٣٥٢)، وصححه الشيخ الألباني «صحيح ابن ماجه» (١٩٠٥).

أَحَلَّ حَرَامًا أَوْ حَرَّمَ حَلَالًا» «ئاشتەوایی لە نێوان موسڵماناندا دروستە مەگەر ئاشتەواییەك حەرامێك حەڵاڵ بكات یان حەڵاڵێك حەرام بكات». وپەیامبەری خوا ﷺ خۆی ئاشتەوایی دەكرد لە نێوان خەڵكدا. هەمو ئوممەتیش كۆكن لە سەر شەرعی بونی ئاشتەوایی لە نێوان خەڵكدا بە مەبەستی ڕەزامەندی خوا، وڕازیكردنی هەر دو لایەنەكە. جا قورئان وسوننەت وئیجماع بەڵگەن لە سەر دروستێتی ئاشتەوایی.

## پرسی دوەم: جۆرە گشتیەکانی ئاشتەوایی:

ئاشتەوایی لە نێوان خەڵكدا جۆرا وجۆرە:

**١- ئاشتەواییكردن لە نێوان ژن ومێرددا:** ئەگەر مەترسی تێك چونی نێوانیان هەبو، لە بەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا إِنْ يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا﴾ [النساء:٣٥] «ئەگەریش زانیتان كێشەكەی نێوانیان ئەبێتە مایەی جیابونەوە، ئەوا دادوەرێكی دادگەر لە كەسی مێردەكە ودادوەرێكی دادگەر لە كەسی ژنەكە بنێرن بۆ لایان تا لە كێشەكە بڕوانن وئەو حوكمە بدەن كە بەرژەوەندی هەردوكیانی تێدا بێت، ئەگەریش هەردو دادوەرەكە مەبەستی ئاشتەواییان هەبێت وئوسلوبی چاك بە كار بهێنن ئەوا خوا ئەیاننات بە یەكەوە». یان ئەگەر ئافرەتەكە لە پشت لێكردنی پیاوەكەی ترسا، یانی: ئەمی نەوێت ولوتبەرز بێت لە ئاستی، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ﴾ [النساء: ١٢٨] «ئەگەریش ژنەكە زانی پیاوەكەی لوتبەرزە لە ئاستی یان نایەوێت وبەو لادا دەڕوات، ئەوا تاوانیان لە سەر نیە ئاشتەوایی بكەن لە سەر ئەوەی خۆیان پێی ڕازی دەبن لە دابەشكردن وبژێوی، ئاشتەواییش لە پێشترە وچاكترە».

**٢- ئاشتەواییکردن لە نێوان دو کۆمەڵی بە شەڕ دا هاتو لە موسڵمانان.** خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا﴾ [الحجرات: ٩].

**٣- ئاشتەواییکردن لە نێوان موسڵمانان ونا موسڵمانان** دا کە بە شەڕ هاتون.

**٤- ئاشتەواییکردن لە نێوان دو کێشەدار** لە سەر پارە نەبێت.

**٥- ئاشتەواییکردن لە نێوان دو کێشەدار** لە سەر پارە، ئەمەش مەبەستی توێژینەوەکەی ئێرەیە، ئەوەش ئەبێتە دو بەشەوە:

**أ. ئاشتەواییکردن لەگەڵ دانپێدانان، ئەمەش دیسانەوە دو جۆرە:**

١- ئاشتەوایی لێ کەمکردنەوە (الإِبْرَاء): ئەو ئاشتەواییەیە کە لە سەر جۆری مافە دانپێدانراوەکەدا دەکرێت، وەك ئەوەی هەڵس وکەوت دروستێك دان بنێت کە کەسێکی تر قەرز یا خود (عَيْن)ی شتێکی لایە، ئینجا بەرامبەرەکەی هەندێك لە شتەکە یان قەرزەکە لا دەدات، وباقیەکەی دەبات، جا لێ خۆشبونە لە هەندێکی قەرزەکە بە دەستەواژەی «صوڵح». ئەمەش دروستە بە مەرجێك خاوەن هەقەکە ئەهلی لێ داشکاندن وتەبەڕوع بێت، هەروەها ئەبێت بە مەرج نەگیرا بێت لە کاتی دان پێدانانەکەدا.

٢- ئاشتەوایی گۆڕینەوە (الْمُعَاوَضَة): ئەو ئاشتەواییەیە کە لە سەر مافە دان پێدانراوەکەدا دەکرێت بە جۆرێکی تر، وەك ئەوەی دان بنێت بە قەرزەکەی یان خودی شتەکەی، ئینجا ئاشتەوایی لەگەڵدا دەکات لە سەر وەرگرتنی بەرامبەرەکەی لە جۆرێکی تر، ئەمەش حوکمی کڕین وفرۆشتنی هەیە، ئەگەریش لە سەر سودێك بو حوکمی بە کرێدانی هەیە.

**ب. ئاشتەواییكردن لەگەڵ نكوڵی كردن**، ئەوەیە بانگەشەكار بڵێ: خودی شتێكم لای كەسێكی ترە، یان قەرزێكم لە ئەستۆیەتی، بانگەشە لە سەر كراویش نكوڵی لێدەكات، یان بێ دەنگ بێت بێ ئەوەی زانستی بەو شتە هەبێت، پاشان ئاشتەوایی دەكات لەگەڵ بانگەشەكار لە سەر ماڵێكی حازری یا قەرز، لەم حاڵەتەشدا ئاشتەوایی دروست ئەبێت ئەگەر نكوڵیكار پێی وابو بانگەشەكە ناڕەوایە، بۆیە پارە دەدات تا كێشە لە خۆی دور بخاتەوە، وبیكاتە قوربانی سوێندەكەی، بانگەشەكاریش پێی وایە بانگەشەكە ڕەوایە بۆیە پارەكە دەبات وەك قەرەبوی مافە چەسپاوەكەی.

## پرسی سێیەم: لە بارەی ئەو حوكمانەی پەیوەستە بە ئاشتەواییەوە:

١ – ئاشتەوایی دروست ئەبێت ئەگەر لە سەر مافێكی نەزانراو بو، ئیتر هی هەردوكیان بو لە سەر یەكتر، یان هی یەكێكیان بو، ئەگەر ئەو نەزانراوە نەدەكرا بزانرێت قەرز بێت یان زاتی شتێك، وەك ئەوەی لە نێوان دو كەسدا مامەڵە وحساباتێك هەبێت وماوەیەكی بە سەردا تێپەڕ بو بێت، هیچ كامیشیان لە بیری نیە چی مافێكی هەیە بە سەر هاوڕێكەیەوە.

٢ – هەر شتێك دروست بێت بەرامبەری لە سەر وەربگری ئاشتەوایی لە سەر دروست ئەبێت، وەك ئاشتەوایی لە سەر تۆڵە سەندنەوە بەو خوێن باییەی شەرع دیاری كردوە یان كەمتر یان زیاتر لەوە.

٣ – وهەر شتێك دروست نەبێ بەرامبەری لە سەر وەربگری دروست نابێ ئاشتەوایی بۆ بكەی، وەك ئاشتەوایی لە سەر حەددەكانی خوا، چونكە شەرع كراوە بۆ واز هێنان.

# دەروازەی حەڤدەهەم

# پێشبڕکێ «الْمُسَابَقَة»

چەند پرسێکی تێدایە:

## پرسی یەکەم: واتای پێشبڕکێ، وحوکمەکەی، و[بەڵگەکەی]:

### ١- واتاکەی:

گرەو لە سەر کراو (السَّبَق): ئەوەیە کە بەشداربوانی پێشبڕکێی ئەسپ وشتر سواری وتیر هاوێژی گرەوی لە سەر دەکەن، کێ بردیەوە دەیبات. پێشبڕکێ (الْمُسَابَقَة)ش بریتیە لە پێشبڕکێی ڕاکردنی ئاژەڵان وهی تریش. (الْمُنَاضَلَة والنِّضَال)یش بریتیە لە پێشبڕکێی تیر هاویشتن وهاوشێوەکانی.

### ٢- حوکمەکەی وبەڵگەکەی:

پێشبڕکێ دروستە بە قورئان وفەرمودە وکۆ دەنگی. سەبارەت بە قورئان: فەرمایشتەکەی خوایە: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ﴾ [الأنفال: ٦٠]. «ئەی گرۆی موسڵمانان بۆ بەرەنگار بونەوەی دوژمنەکانتان چیتان لە دەست دێت بیکەن لە ژمارە زۆری وئامادەکاری» سەبارەت بە سوننەتیش: فەرمودەکەی ئیبن عومەرە ﵄: «أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سَابَقَ بِالْخَيْلِ الَّتِي قَدْ أُضْمِرَتْ مِنَ الْحَفْيَاءِ، وَكَانَ أَمَدُهَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ، وَسَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي لَمْ تُضَمَّرْ مِنَ الثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ» «پەیامبەر ﷺ پێشبڕکێی کرد بەو ئەسپەی لەڕ کرا بو (أُضْمِرتْ) لە هەیفاوە بۆ سەنیەی وەداع، وبە ئەسپی لەڕنەکراو پێشبڕکێی کرد لە سەنیەی وەداعەوە بۆ

سزگەوتی خێڵی زوڕەیق»[(١)]، هەروەها ئەفەرمویٚ ﷺ[(٢)]: «لَا سَبَقَ إِلَّا فِي خُفٍّ، أَوْ نَصْلٍ، أَوْ حَافِرٍ» «گرەو كردن نیە مەگەر لە وشتر سواری وتیرهاویٚژی، وئەسپ سواری». وموسڵمانانیش بە گشتی كۆكن لە سەر دروستیٚتی پیٚشبڕكیٚ.

## پرسی دووەم: ئەو حوكمانەی پەیوەستن بە پیٚش بڕكیٚوە:

١- پیٚشبڕكیٚكردن بە ئەسپ وجگە لەویش لە ئاژەڵان وسواریەكان دروستە، هەروەها بە پیٚ، هەروەها بە تیر هاویشتن وچەك بە كارهیٚنان.

٢- پیٚشبڕكیٚكردن لە وشتر وئەسپ وتیر هاویشتن دروستە لە سەر بەرامبەریٚك، لەبەر فەرمایشتەكەی [پیٚشوی] پەیامبەر ﷺ: «گرەو كردن نیە مەگەر لە وشتر سواری وتیرهاویٚژی، وئەسپ سواری».

٣- هەرچی بەرژەوەندیەكی شەرعی لیٚ بكەویٚتەوە، وەك ڕاهیٚنان كردن بۆ تیٚكۆشان، وڕاهیٚنان كردن لە سەر مەسەلە زانستیەكان، ئەوا پیٚشبڕكیٚ كردن تیٚیدا حەڵاڵە ودروستیشە بەرامبەری لە سەر وەر بگریت.

٤- هەمو ئەو شتانەی ئەكریٚن وەكو یاری وخۆشی، وزیانیشی تیٚدا نیە، لەوانەی شەرع حەڵاڵی كردوە، ئەوا پیٚشبڕكیٚكردن تیٚیدا دروستە، بە مەرجیٚك سەرقاڵت نەكات لە شتە دینیەكان وەك نویٚژ وهاوشیٚوەكانی. بەڵام ئەم جۆرە دروست نیە بەرامبەری لە سەر وەربگری.

---

(١) أخرجه البخاري (٢٨٦٨)، ومسلم (١٨٧٠) [ولفظ الأصل يشبه لفظ أحمد (٥٢٧٧)، والمثبت هنا لمسلم]، «تَضْمِيرُ الخَيْلِ»: ئەوەیە ئالفی پیٚ بدەیت تا قەڵەو دەبیٚت پاشان لیٚی بگریتەوە مەگەر ئەوەندەی لاشەی ڕا بگریٚت بۆ ئەوەی لەڕ وسوك ببیٚتەوە، لەڕكردنەوەی ئەسپیش بۆ غەزا وپیٚشبڕكیٚ كراوە..

(٢) أخرجه أبو داود (٢٥٧٤) والنسائي (٣٦١٦) والترمذي (١٧٠٠) وحسنه. وصححه في «الإرواء» (٥/٣٣٣).

٥- بۆ هەر یەك لە پێشبڕکێ کاران هەیە پێشبڕکێکە هەڵبوەشێنێتەوە مادام دەرنەکەوتبێ هاوڕێکەی پێشکەوتوە، ئەگەرنا بەس بۆ پێشکەوتو هەیە نەك پاشکەوتو.

٦- بە مردنی یەکێك لە پێشبڕکێکەران یان سوارەکان پێشبڕکێکە هەڵدەوەشێتەوە.

٧- کەڕاهەتی هەیە دادوەر یان ئامادەبوان ستایش یان عەیبداری یەکێك لە پێشبڕکێکەران بکەن.

## پرسی سێیەم: مەرجەکانی وەرگرتنی بەرامبەر لە پێشبڕکێدا:

١- دیاری بونی تیرهاوێژان لە تیرهاویشتن وسوارەکان لە پێشبڕکێدا، ئەمەش بە بینین.

٢- یەکێتی جۆری سوارەکان یان کەوانەکان لە پێشبڕکێ وتیرهاوێژیدا، بۆیە دروست نابێت لە نێوان ئەسپی ڕەسەن وناڕەسەن، هەروەها لە نێوان کەوانی عەرەبی وفارسی.

٣- دیاری کردنی مەودا وئامانجەکە، ئەمەش هەر بە چاو یان بە گەز.

٤- ئەبێت بەرامبەرەکە دیاری کراو وحەڵاڵیش بێت، چونکەماڵێکە لە گرێ بەستێکدا بۆیە ئەبێت بزانرێت وحەڵاڵ بێت وەك باقی گرێ بەستەکانی تر.

# دەروازەی هەژدەهەم

# دەستیار «العَارِيَة»

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: واتای دەستیار، وبەڵگەکانی شەرعی بونی:

### ١- واتاکەی:

دەستیاردان: حەڵاڵ کردنی سود وەرگرتنە لە شتێك لەگەڵ مانەوەی خود وزاتی شتەکە. دەستیار (العارية)یش: خودی ئەو شتە براوەیە بۆ سود وەرگرتن، وەك ئەوەی داوای ئۆتۆمبیلی کەسێك بکات بە ئیستیعارە تا سەفەری پێ دەکات ودوای بۆی دەیگێڕێتەوە.

### ٢- بەڵگەکانی شەرعی بونی:

ئەمەش شەرعی وسوننەتە، لەبەر گشتێتی ئایەتی: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى﴾ [المائدة: ٢]. هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ﴾ [الماعون: ٧] «ورێگری دەکەن لە بە ئیستعارە دانی ئەو شتانەی کە بە دەستیاردانی زەرەری نیە لە قاپ وقاچاغ وجگە لەوەش»، مەبەستیش ئەوەیە کە هاوسێکان دەستیار بە یەکتری دەدەن، وەك قاپ وقازان وهاوشێوەکانی، جا خوا ﷻ سەرزەنشتیان دەکات لە سەر دەستیار نەدان، ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی سوننەتە وهانی بۆ لا دراوە، هەروەها سەفوانی کوڕی ئومەییە ﵁ دەگێڕێتەوە: «أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ اسْتَعَارَ مِنْهُ أَدْرُعًا يَوْمَ حُنَيْنٍ» «پەیامبەری خوا ﷺ لە شەڕی حونەیندا قەڵغانێکی بە دەستیار

لیٚ خواستوه»(١). هەروەها لە ئەنەسەوە ﷺ: «اسْتَعَارَ النَّبِيُّ ﷺ فَرَسًا مِنْ أَبِي طَلْحَةَ» «پەیامبەری خوا ﷺ ولاخێكی بە دەستیار لە ئەبو تەڵحە خواستوه»(٢).

## پرسی دووەم: مەرجەكانی دەستیار:

١- ئەبێت دەستیاردەر وەرگریش شیاوی تەبەڕوع وبەخشین بێت لە ڕوی شەرعەوە، وخودی دەستیارەكەش موڵكی دەستیاردەرەكە خۆی بێت.

٢- ئەبێت خودی دەستیارەكە سودەكەی حەڵاڵ بێت، بۆیە ئیستیعارە بۆ گۆرانی وتن وهاوشێوەكانی دروست نابێت، هەروەها بردنی قاپی زێڕ وزیو وەكو دەستیار بۆ پێخواردنەوە دروست نابێت، بە هەمان شێوە ئەو شتانەی حەرامە سودی لیٚ وەر بگیرێت.

٣- ئەبێت خودی دەستیارەكە دوای سود لیٚ وەرگرتنی بمێنێت، جا ئەگەر لەو شتانە بێت نامێنێت وەك خواردن، ئەوا دروست نیە ببرێت وەكو دەستیار.

## پرسی سێیەم: هەندێك لەو حوكمانەی پەیوەستن بە دەستیارەوە:

١- بۆ داواكەری دەستیار نیە جارێكی تر بە ئیستعارەی بداتەوە، چونكە هی ئەو نیە، بە هەمان شێوە بۆی نیە بە كرێی بدات، مەگەر خاوەنەكەی بهێڵێت.

٢- دەستیار ئەمانەتە لای دەستیار لادانراو، پێویستە پارێزگاری لێبكات وبە ساغی وەك بردویەتی بیگێڕێتەوە، جا ئەگەر دەست درێژی كرد یا كەمتەرخەمی زەمانەتی لە سەرە.

---

(١) أخرجه أحمد (٤/٢٢٢)، وأبو داود (٣٥٦٣)، وصححه الألباني (الإرواء ١٥١٣).

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٦٢٧)، ومسلم (٢٣٠٧).

٣- دەستیاردان گریبەستێکی نا پەیوەستە (غیر لازم)، جا دەستیاردەر کەی ویستی دەتوانێت پەشیمان ببێتەوە مادام زیان بە دەستیارخواز ناگات، ئەگەرنا دروست نیە.

٤- دەستیاردان کۆتایی پێدێت ودەستیارەکە دەگێڕدرێتەوە بە چەند شتێك، لەوانە:

- داواکردنی خاوەنەکەی، با مەبەستی دەستیار خوازیش بە دی نەهاتبێت لێی.
- بە تەواوبونی ئەو ئامانجەی شتەکەی لە پێناو بە دەستیار براوە.
- تەواو بونی کاتەکە ئەگەر دەستیارەکە بۆ ماوەیەك برا بو.
- مردنی دەستیاردەر یان دەستیارخواز، چونکە بەمە دەستیاردان هەڵدەوەشێتەوە.

٥- دەستیارخواز لە سودوەرگرتندا وەك بە کرێگر وایە، بۆی هەیە خۆی وجێگرەکەی سودی لێ ببینێت، چونکە بۆی هەیە هەڵس وکەوتی پێوە بکات بە هێڵانی خاوەنەکەی.

# دەروازەی نۆزدەهەم

# زیندو کردنەوەی زەوی مردو «إِحْيَاءُ الْمَوَاتِ»

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: لە بارەی واتای زیندو کردنەوەی زەوی مردووەوە، وحوکمەکەی:

**١- واتاکەی:**

(الْمَوات) ئەوەیە گیانی تێدا نەبێت، مەبەستیش لێرەدا ئەو زەویەیە کە ئاوەدان نەکراوەتەوە وخاوەنی نیە. لە شەرعیشدا: زەویەکە خاڵیە لە تایبەتکراوی وخاوەندارێتی خوێنپارێزراوێك. کەواتە ئەو زەویە چۆڵەیە کە موڵکی کەس نەبوە وشوێنەواری ئاوەدانیشی پێوە نیە، ونەشزانراوە کەس خاوەنی بێت.

**٢- حوکمەکەی وبەڵگەکانی:**

بنەمای ئەمەش فەرمودەکەی پەیامبەرە ﷺ: «مَنْ أَحْيَا أَرْضًا مَيْتَةً فَهِيَ لَهُ وَلَيْسَ لِعِرْقٍ ظَالِمٍ حَقٌّ» «هەر کەس زەویەکی مردو زیندو بکاتەوە ئەوە هی خۆیەتی، ورەگ وریشکی ستەمکاریش هیچ مافێکی نیە»[1]. «العرق الظالم»: ئەوەیە زەویەك کەسێك زیندوی کردۆتەوە، کەسێکی تر دەروا داری تێدا دەچێنێت یا کشتوکاڵی تێدا دەکات، بۆ ئەوەی زویەکە بۆ خۆی مسۆگەر بکات. جاری واش هەیە زیندوکردنەوە ئەبێتە سوننەت ئەگەر خەڵك وئاژەڵان پێویستیان بو سودی پێدەگەیاندن، لە بەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «مَنْ أَحْيَا أَرْضًا مَيْتَةً فَلَهُ فِيهَا

---

(١) أخرجه أبو داود (٣٠٧٣)، والترمذي (١٣٧٨)، وصححه الألباني (الإرواء ١٥٥١).

أَجْرٌ، وَمَا أَكَلَتِ الْعَوَافِي[١] فَهُوَ لَهُ صَدَقَةٌ» «هەر کەس زەویەکی مردو زیندو بکاتەوە ئەوا پاداشتی بۆ هەیە، وهەر ڕۆزی خوازێك لێی بخوات ئەبێتە صەدەقە بۆی»[٢].

## پرسی دووەم: مەرجەکانی زەوی زیندو کردنەوە، وئەوەی بەهۆیەوە بە دی دێت:

بۆ زیندوکردنەوەی زەوی مردو دو مەرج پێویستە:

١- **پێشتر مولکی هیچ موسڵمانێك نەبو بێت**، ئەگەرنا حەرامە زیندو بکرێتەوە، مەگەر بە ڕێگە پێدانێکی شەرعی.

٢- ئەبێت زیندوکەرەوەکە موسڵمان بێت، جا زیندوکردنەوەی زەوی لە لایەن بێ باوەڕەوە لە خاکی ئیسلامدا دروست نیە.

**زیندوکردنەوەش بە چەند شتێك بە دی دێت:**

١- ئەگەر بە پەرژینێکی قایم لەوەی کە نەریتە دەوری بدات، ئەوا زیندوی کردۆتەوە، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «مَنْ أَحَاطَ حَائِطًا عَلَى أَرْضٍ فَهِيَ لَهُ» «هەر کەس پەرژینێکی دا بە دەوری زەویەکدا ئەوە هی ئەوە»[٣].

٢- ئەگەر لە زەویەکی مردودا بیرێکی هەڵ کەند وگەیاندیە ئاو ئەوا زیندوی کردۆتەوە، ئەگەریش نەگەیشتە ئاو هەر ئەو لە پێشترە بەو زەویە، بە هەمان شێوە ئەگەر جۆگەی ئاوی پێدا کێشا.

---

(١) کۆی «العافیة»یە و«العافي»ش: بریتیە لە هەمو ڕۆزی خوازێك لە باڵندە یا مرۆڤ یان ئاژەڵان.
(٢) رواه الدارمي (٢/٢٦٧)، وأحمد (٣/٣١٣)، وصححه الألباني في الإرواء (٦/٤).
(٣) أخرجه أبو داود (٣٠٧٧) عن سمرة بن جندب، وصححه الشيخ الألباني (الإرواء ١٥٥٤).

٣- ئەگەر لە چاوگێك یان ڕوبارێـك وجگـە لەمانەشـەوە ئـاوی گەیانـدە زەویـە مردوەکە ئەوا بەوە زیندوی کردۆتەوە.

٤- ئەگەر داری تێدا ناشت، لە کاتێکدا پێش ئەوە بۆ دار تێدا ناشت شیاو نەبو، هات پاکی کردەوە وداری تێدا ناشت ئەوە زیندوی کردۆتەوە.

٥- لە زانایانیش هەیە ئەڵێ: زیندوکردنەوە لە سنوری ئەمانە ناوەستێت، بـەڵکو دەگەڕێنەوە بۆ داب ونەریت، جا خەڵك چـیان بـە زیندوکردنـەوە دانـا ئـەوە زینـدو کردنەوەیە، ئەگەرنا نەخێر.

## پرسی سێیەم: هەندێك حوکمی پەیوەست بەمەوە:

١- هەر کەس زەویەکی مـردوی زینـدو کـردەوە ئـەوە ئەبێتـە مـوڵکی، لەبـەر گشتێتی فەرمودەکانی پێشو، لەوانەش: «هەر کەس زەویەکی مردو زینـدو بکاتـەوە ئەوا هی ئەوە».

٢- پاکـژی[1] ئـاوەدانی بـە زیندوکردنـەوە نابێتـە خـاوەنی، چـونکە خـاوەنی ئاوەدانیەکە شایستەی مەڕافق وپێویستیەکانیشیەتی.

٣- بۆ پێشەوای موسڵمانان هەیە زەوی مردو دابڕێت وببەخشێت بەوەی زیندوی دەکاتەوە، لەبەر فەرمودەکەی وائیلی کوڕی حـوجر ﷺ کـە: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَقْطَعَهُ أَرْضًا بِحَضْرَمَوْتَ» «پەیامبەری خوا ﷺ زەویەکی حەزرەمەوتی بۆ دابڕی»[2].

(١) حەرەم و قێغە (قەدەغە)ی شتێك: بریتیە لەو شتانەی دەوربەری لە ماف وپێویستیەکانی، وای پێوتراوە چونکە قەدەغەیە لە سەر غەیرە خاوەنەکەی، ئەو بە تەنها کەڵکی لێ وەر دەگرێت.
(٢) أخرجه الترمذي (١٣٨١) وقال: حديث حسن، وصححه الألباني «صحيح سنن الترمذي» (١١١٦).

٤- بۆ پێشەوا دروستە گژ وگیای زەوی مردو دابڕێت بۆ وشتری زەکات وئەسپی تێکۆشەران ئەگەر پێویست بو، وبەر تەسکی وزیانی تێدا نەبو بۆ موسڵمانان، ئەمەش بۆ کەس نیە مەگەر پێشەوا، ئەمەش ڕێگە پێدراوە لەبەر بەرژەوەندی گشتی، وەك لە فەرمودەکەی سەعبی کوڕی جەسسامەدا ﷺ هاتوە بەرزی دەکاتەوە: «لَا حِمَى إِلَّا لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ» «پاکژ نیە مەگەر بۆ خوا وپەیامبەرەکەی»[1].

واتا: بیکاتە حەرام، یانی: قەدەغەی بکات ونزیکی نەبنەوە.

(١) أخرجه البخاري (٢٣٧٠).

# دەروازەی بیستەم

# جیعالە «الجُعَالَة»

دو پرسی تێدایە:

## پرسی یەکەم: واتاکەی، وحوکمەکەی:

### ١- واتاکەی:

(الجِعالة): پابەند بونە بە بەرامبەر «عِـوَض»ێکی زانراو، لە سەر کـارێکی دیـاری کراو، بە بێ لەبەر چاو کردنی بکەرەکەی.

بۆ نمونە بڵێ: هەر کەسێك ئۆتۆمبیلە دیارنەماوەکەم بۆ بدۆزێتەوە هەزار دینـاری پێدەدەم.

### ٢- حوکمەکەی وبەڵگەکانی:

لە گرێ بەستە حەڵاڵەکانە لـە ڕوی شـەرعەوە، وئایـەتی: ﴿وَلِمَنْ جَاءَ بِهِ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا بِهِ زَعِيمٌ﴾ [يوسف:٧٢]، بەڵگەیە لە سەر ئەمە.

هەروەها ئەبو سەعیدی خودری ﷺ ئەڵێ: «کە خەڵکانێك لە هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ تێپەڕ بون بە لای خێڵێکی عەرەبدا، داوای میوانـداریان لـێ کـردون ئـەوانیش میوانداریان نەکردون، دوایی دەم سپی خێڵەکە پێوەی دراوە، بە هاوەڵەکانیان وتـوە: کەستان هەیە ڕوقیە وچارەسەری بزانێت، وتیان: بەڵێ، بەڵام هەتا شت «جُعل»ێکمان بۆ دانەنێن نایکەین، ئەوانیش لا ڕانێکیان ومێگەلێکیان پێدان، ئەوانیش یـەکێکیان هەستا وبە فاتیحە چارەسـەری بـۆ کـرد، کـابرا یەکسـەر چـاك بویـەوە، ئـەوانیش شەکەکانیان هێنا، ئەمان وتیان: نایبەین تا پرسیاری پەیامبەری خوا ﷺ نەکـەین،

که گەڕانەوە پرسیاریان لێ کرد ﷺ، فەرموی: لێیانی وەر بگرن وبەشێکیش بۆ من بهێنن»[١].

## پرسی دوەم: ئەو حوکمانەی پەیوەستە پێوەی:

جوعالە ئەم حوکمانەی خوارەوەی پێوە پەیوەستە:

١- مەرجە ئەوەی خۆی پابەندکردوە بە بەرامبەرەکەوە هەڵس وکەوت دروست بێت، هەروەها کارکەرەکەش ئەبێت توانای کارەکەی هەبێت.

٢- ئەبێت کارەکە حەڵاڵ بێت، بۆیە لە سەر حەرام دروست نابێت وەك گۆرانی وتن ومەی دروست کردن وهاوشێوەکانیان.

٣- ئەبێت کاتێکی بۆ دیاری نەکرێت، جا ئەگەر بڵێ: هەر کەس وشترەکەم بۆ بگێڕێتەوە تا کۆتایی ئەم هەفتەیە ئەوە دینارێك پێی دەدەم، ئەوە دروست نابێت.

٤- هەروەها ئەمە گرێ بەستێکی دروستە، بۆ هەردولاش هەیە هەڵی بوەشێنێتەوە، جا ئەگەر کەسی یەکەم هەڵی وەشاندەوە ئەوا کارکەرەکە شایستەی کرێی هاوشێوەیە، ئەگەر کارکەرەکە هەڵی وەشاندەوە ئەوا هیچی بۆ نیە.

---

(١) متفق علیه: أخرجه البخاري (٢٢٧٦)، ومسلم (٢٢٠١). [لە هەر فەرمودەیەکدا ئەم شێوازەت بینی، ئەوە بۆ تەشریع وگومان ڕەواندنەوە ولادانی دو دڵی وچەسپاندنی دڵنیاییە، وەك پێیان بڵێت: هیچی تێدا نیە بە ڕادەیەك ئەوە خۆشم لێی دەخۆم، هاو شێوەی ئەمەش: مارە کردنی زەینەب].

# دەروازەی بیست ویەکەم

# دۆزراوەی ئادەمی وجگە لەویش «اللُّقَطَةَ واللَّقِيط»

چەند پرسێکی تێدایە:

## پرسی یەکەم: واتاکەی، وحوکمەکەی:

### ١- واتاکەی:

(اللُّقَطَة) لە زماندا: شتی هەڵگیراوە، کە ناوە بۆ ئەو شتەی دەبینی فڕێ دراوە هەڵی دەگریتەوە. لە شەرعیشدا بریتیە لە هەڵگرتنەوەی ماڵێکی حورمەتدار لە شوێنی ونبونەکەی، تا بیپارێزێت یان بیبات بۆ خۆی دوای ناساندنی.

### ٢- حوکمەکەی وبەڵگەکەی:

بنەما لەم بارەوە فەرمودەکەی زەیدی کوڕی خالدی جوهەنیە ﵁: کە پەیامبەری خوا پرسیاری زێڕ وزیوی دۆزراوەی لیّ کراوە، ئەویش فەرموی: «اعْرِفْ وِكَاءَهَا وَعِفَاصَهَا، ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ لَمْ تُعْرَفْ فَاسْتَنْفِقْهَا، وَلْتَكُنْ وَدِيعَةً عِنْدَكَ، فَإِنْ جَاءَ طَالِبُهَا يَوْمًا مِنَ الدَّهْرِ فَأَدِّهَا إِلَيْهِ. وَسَأَلَهُ عَنْ ضَالَّةِ الْإِبِلِ، فَقَالَ: مَا لَكَ وَلَهَا، دَعْهَا فَإِنَّ مَعَهَا حِذَاءَهَا، وَسِقَاءَهَا، تَرِدُ الْمَاءَ وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ، حَتَّى يَجِدَهَا رَبُّهَا. وَسَأَلَهُ عَنِ الشَّاةِ، فَقَالَ: خُذْهَا، فَإِنَّمَا هِيَ لَكَ، أَوْ لِأَخِيكَ، أَوْ لِلذِّئْبِ» «قەیتانەکەیی وتۆشەدانەکەی جوان بزانە، پاشان تا ساڵێك پێناسەی بکە، ئەگەر کەس نەیناسیەوە ئەوا خەرجی بکە، با سپاردەش بێت لە لات، ئەگەریش ڕۆژێك لە ڕۆژان خاوەنەکەی هات پێی بدەوە. هەروەها پرسیاری لیّ کرد لە بارەی وشتری دۆزراوە؟ فەرموی: چیت داوە لە وشتر وهەقت چیە پێیەوە!؟ وازی لیّ بهێنە پێڵاو

وئاوی خۆی پێیە، بۆ خۆی ئەڕواتە سەر ئاو ولە دار دەخوات تا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوە. هەروەها پرسیاری مەڕ وبزنی لێ کرد، فەرموی: بیبە، چونکە یا بۆ تۆیە یا بۆ براکەت یا بۆ گورگ»[1].

## پرسی دوەم: بە شەکانی دۆزراوە:

١- ئەوەی کە خەڵك بایەخی پێ نادەن، وەك قامچی ونان وبەر وبوم وگۆچان، ئەمە یان دروستە هەڵ بگیرێتەوە، ودۆزەرەوەش بۆی هەیە کەلکی لێ وەر بگرێ وبێ ناساندن بیبات بۆ خۆی.

٢- ئەوەی هەر بە خۆی بەرگری دەکات لە دڕندە بچوکەکان وجگە لەوانیش، وەك: وشتر وئەسپ ومانگا ومایین (هێستر)، ئەمەشیان حەرامە ببرێت ودۆزەرەوەش بە ناساندنی نابێتە خاوەنی، لەبەر فەرمایشتەکەی پێشوی پەیامبەر ﷺ: «چیت داوە لە وشتر وهەقت چیە پێیەوە!؟ وازی لێ بهێنە پێڵاو وئاوی خۆی پێیە، بۆ خۆی ئەڕواتە سەر ئاو ولە دار دەخوات تا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوە».

٣- ئەوەی دروستە هەڵ بگیرێتەوە ولە سەریەتی پێناسەی بکات، وەك ئاڵتون وزیو وکەل وپەل، وئەوانەی تریش کە ناتوانن خۆیان بپارێزن لە دڕندە بچوکەکان وەك مەڕ وبزن ومریشك هاوشێوەکانیان، ئەمەش لە بەر فەرمودەکەی زەیدی کوڕی خالدی پێشو، ئەمەش بۆ کەسێکە متمانەی بە خۆی هەیە وئەتوانێت پێناسەی بکات.

---

(١) أخرجه البخاري (٢٣٧٢)، ومسلم (١٧٢٢)، و«الوكاء»: ئەو حەبل وپەتەیە کە تورەکە وکیسە وجگە لەمانەشی پێ توند دەکرێت. و«العِفَاص»: جێ خواردنێکە لە پێستە وجگە لەوەش. مەبەستیش: ناسینەوەی دۆزراوەکەیە بە نیشانەکانەوە بۆ ئەوەی کەسێك وەسفی کرد، بزانرێت ڕاست دەکات یان نا.

## پرسی سێیەم: هەندێك حوکمی پەیوەست بە دۆزراوەوە:

١- ئەگەر دۆزراوەکە ئاژەڵێکی گۆشت خوراو بو، ئەوە سەر پشکە لە نێوان خواردنی ویەکسەر نرخەکەی بدات، یان بیفرۆشێت ونرخەکەی لای خۆی بۆ خاوەنەکەی دابنێت دوای ناسینەوەی شێوەکەی، یان هەڵی دەگرێت ولە ماڵی خۆی خەرجی دەکێشێت ونایبات بۆ خۆی، کە خاوەنەکەی هات پێی دەداتەوە وخەرجیەکەشی لێ وەر دەگرێتەوە، ئەگەریش خاوەنەکەی هات پێش ئەوەی دۆزەرەوەکە بیخوات ئەوە بۆی هەیە بیبات.

٢- ئەگەر دۆزراوەکە لەو شتانە بو مەترسی دەکرا خراپ ببێت، وەك میوە، ئەوا بۆ دۆزەرەوەکە هەیە بیخوات ونرخەکەی بداتەوە بە خاوەنەکەی، یان بیفرۆشێت ونرخەکەی هەڵبگرێت تا خاوەنەکەی دێت.

٣- بەڵام پارە وقاپ وقاچاخ وشتومەك لە سەریەتی هەموی بە ئەمانەت بپارێزێت وپێناسەی بکات لە شوێنی کۆبونەوەی خەڵکدا.

٤- دروست نیە دۆزراوە هەڵبگیرێت مەگەر لە خۆی دڵنیا بێت وبتوانێت پێناسەی بکات، چونکە ناساندنی دۆزراوە واجبە، ئەگەر بردی ئەوا شێوەکەی دەناسێت ئینجا یەك ساڵی ڕەبەق دەیناسێنێت، ئەمەش بە بانگکەوازی بۆ کردنی لە شوێنی کۆبونەوەی خەڵکی، ئەگەریش خاوەنەکەی هات وەك خۆی وەسفی کرد پێی دەدات، ئەگەریش دوای ساڵێکی ڕێکی ناساندن هەر نەهات ئەوە ئەبێتە موڵکی.

٥- دوای ناساندنی وتێپەڕ بونی ساڵێك دۆزەرەوە ئەبێتە خاوەنی دۆزراوەکە، بەڵام هەڵس وکەوتی پێوە ناکات مەگەر دوای زانینی شێوەکەی، جا کەی

خاوەنەکەی ئەو وەسفانەی وەك خۆی کرد پێی دەدات بە بێ بەڵگە وسوێندان، چونکە پەیامبەری خوا ﷺ ئاوها فەرمانی کرد لە فەرمودەکەی خالدی کوڕی زەیدی رضي الله عنه پێشو.

## پرسی چوارەم: لە بارەی منداڵی دۆزراوەوە (اللّقِیط):

(اللقیط): بریتیە لەو منداڵەی بە فڕێدراوی دەدۆزرێتەوە لە جادەیەك یان دەرگای مزگەوتێك وهاوشێوەکانی، یان وێل ئەبێت لە کەسەکانی خۆی، نە ڕەچەڵەکی دەزانرێ ونە کەفیلێکی شك دەبرێت.

وناشبێت منداڵی دۆزراوە وێڵ بکرێت، لە بەر فەرمایشتی خوا: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى﴾ [المائدة:٢] جا گشتێتی ئەم ئایەتە بەڵگەیە لە سەر واجبێتی هەڵگرتنەوەی منداڵی دۆزراوە، جا هەڵگرتنەوەیی وبەخێوکردنی فەرزی کیفایەیە، هەروەها لە هەڵگرتنەوەیدا زیندوکردنەوەی ئەو کەسەی تێدایە. هەر چی پارەشی پێ بێت ئەوە هی ئەوە، وەکو ئیشکردن بە ڕوکەش، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەو دەستی ها پێوە، وخەرجی دەکێشێت، ئەگەریش هیچی پێ نەبو لە خەزێنەی دەوڵەت (بیت المال) خەرجی دەکێشێت.

منداڵی دۆزراوەش ئازاد وموسڵمانە لە هەمو حوکمەکانیدا، مەگەر لە وڵاتی بێ باوەڕان بدۆزرێتەوە ئەو کاتە بێ باوەڕە. وڕەچەڵەکی دۆزراوەش دەچەسپێت بە دانانی هەر کەسێك بانگەشەی بکات وڕێی تێبچێت. ئەگەریش زیاتر لە کەسێك

ململانێیان لە سەر کرد وبەڵگەش نەبو ئەوا پێشانی ڕەچەڵەکناسەکان «القافة»[(١)] دەدرێت.

شایستەترین کەسیش بە بەخێوکردنی دۆزراوە دۆزەرەوەکەیە، بەو مەرجەی ئازاد ودەست پاك ودادگەر وسەر ڕاست بێت، وبێ باوەڕ وفاسق بۆی نیە موسڵمان بەخێو بکات.

ودۆزەرەوە مەرجە: ژیر وبالغ وئازاد وئیسلام ودادگەر وسەر ڕاست بێت. جا هەڵگرتنی منداڵ وشێت وکۆیلە وفاسق وگەمژە دروست نابێت، هەروەها هەڵگرتنی بێ باوەڕ بۆ باوەڕدار دروست نابێت.

(١) کۆی «قائف»یە: بریتیە لەوەی لە شوێنەوارەکان ورد دەبێتەوە ودەیناسێتەوە، وهاوێنەی مرۆڤیش بە برا وباوکیەوە دەناسرێتەوە. «النهایة» مادة (قوف).

# دەروازەی بیست ودووەم

# وەقف «الوَقْف»

دو پرسی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: مانای وەقف، وحوکمەکەی:

### ١- واتاکەی:

وەقف هێشتنەوەی زات (عَيْن)ێکە، کەڵکی لێ وەر دەگیرێت وخودی خۆیشی دەمێنێتەوە، بە مەبەستی نزیك بونەوە لە خوا. جا بریتیە لە هێشتنەوەی خودی شتەکە، وکردنە ڕێی خوای بەر وبومەکەی. بۆ نمونە: ماڵێك دەکاتە وەقف وبە کرێی دەدات، کرێکەشی بە ئاتاج ومزگەوت ولە چاپدانی کتێبە دینیەکان دەدات.

### ٢- حوکمەکەی وبەڵگەکەی:

لە کارە سوننەتەکانە، وبنەماش تێیدا ئەوەیە کە لە عومەرەوە هاتوە کە زەویەکی لە خەیبەر بەر کەوتوە، وتویەتی: ئەی پەیامبەری خوا! «إِنِّي أَصَبْتُ أَرْضًا بِخَيْبَرَ، لَمْ أُصِبْ مَالًا قَطُّ أَنْفَسَ عِنْدِي مِنْهُ، فَمَا تَأْمُرُ بِهِ؟ قَالَ: إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا وَتَصَدَّقْتَ بِهَا، قَالَ: فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ، أَنَّهُ لَا يُبَاعُ وَلَا يُوهَبُ وَلَا يُورَثُ» «زەویەکم لە خەیبەر بەر کەوتوە هەرگیز هیچ ماڵێکم ئەوەندە لەلا بە نرخ نەبوە، فەرمانم بە چی پێ دەکەیت؟ فەرموی: ئەگەر ئەتەوێ ئەسڵەکەی بکە وەقف وسودەکەی بکە خێر، عومەریش کەڵکەکەی کرد بە خێر کە نافرۆشرێت

ونابەخشرێتەوە ونابێتە میراتیش»[١]. هەروەها لە ئەبو هـورەیرەوە ﷺ پەیامبـەری خـوا ﷺ فەرمویـەتی: «إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثَةٍ: إِلَّا مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ» «ئەگـەر مـرۆڤ مـرد، کردەوەکانی لێ دەبڕێت مەگەر سێ شت نەبێت پاداشتەکەی بەردەوامـە: صـەدەقەی بەردەوام، یا زانستێك کەڵکی لێ وەر بگیرێت، یان منداڵێك دوعای بـۆ بکـات»[٢].

مەبەستیش لە صەدەقەی ڕۆیشتو: وەقفە.

## پرسی دوەم: ئەو حوکمانەی پەیوەستن بە وەقفەوە:

وەقفیش ئەم حوکمانەی خوارەوەی پێوە پەیوەستە:

١- ئەبێت وەقفکەرەکە هەڵس وکەوت دروست وژیـر وپێگەیشـتو وئـازاد وسـەر ڕاست بێ.

٢- ئەبێ وەقفەکە بە کەڵکێکی بەردەوام بێـت وزاتەکەشـی بمێنێتـەوە ودیاریشـی بکات.

٣- ئەبێت وەقفەکە لە سەر شتی چاك وباش بێت، وەك مزگەوت وهەژار وکتێبی زانستی وهاوشێوەکانی، چونکە نزیکبونەوەیە لە خوا، بۆیە وەقفکردن بۆ پەرسـتگای بێ باوەڕان، یان بۆ کڕینی شتی حەرام حەرامە.

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٧٣٧) [هذا لفظه]، ومسلم (١٦٣٢) [ولم أجد لفظ الأصل في الموضعين، وانظر: مصنف ابن أبي شيبة (٢١٣٣٣)].

(٢) أخرجه مسلم (١٦٣١).

٤- ئەگەر وەقفەكە كەڵكی نەما، ونەشكرا سودی لێ وەر بگیرێت، ئەوا دەفرۆشرێت، ونرخەكەی لە هاوشێوەكەی خەرج دەكرێت، ئەگەر مزگەوت بو پارەكەی لە مزگەوتی تردا خەرج دەكەیت، یان خانویەك بو دەفرۆشرێت وخانویەكی تری پێ دروست دەكرێت، چونكە ئەمە نزیكترە لە مەبەستی كابرای وەقفكەر.

٥- وەقف گرێ بەستێكی پەیوەست (لازم)ە، تەنها بە وتنی دەچەسپێت، ودروست نیە هەڵبوەشێنرێتەوە یان بفرۆشرێت.

٦- ئەبێت وەقفكراو دیاری كراو بێت، جا وەقفكردنی دیاری نەكراوێك دروست نابێت.

٧- ئەبێت وەقفەكە بڕواتە سەر (الْمنجز) بێت، جا وەقفكردنی شتی هەڵواسراو وكاتی (المعلق والمؤقت) دروست نابێت، مەگەر لە سەر مردنی خۆی.

٨- پێویستە ئیش بكرێت بە مەرجی وەقفكەرەكە ئەگەر دژی شەرع نەبو.

٩- ئەگەر كردیە وەقف لە سەر منداڵەكانی ئەو كاتە نێر ومێیان یەكسانە.

# دەروازەی بیست وسێیەم

# دیاری وبەخشینەوە «الهَدِيَّة والعَطِيَّة»

**چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:**

## پرسی یەکەم: مانای دیاری، وبەڵگەکانی:

**١- واتاکەی:**

دیاری؛ بەخشین وتەبەرِوعێکە لە هەڵس وکەوت دروستێکەوە لە ژیانی خۆیدا بۆ کەسێکی تر بە ماڵێکی زانراو یان شتی تر بە بێ بەرانبەر.

**٢- حوکمەکەی وبەڵگەکەی:**

دیاری سوننەتە ئەگەر مەبەست لێی خوا بێت، وەك دیاری بۆ پیاوچاکێك، یان هەژارێك، یان خزمێك، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «تَهَادَوْا تَحَابُّوا» «دیاری ببەخشنەوە یەکتر تا خۆشەویستی بکەوێتە نێوانتانەوە»[١]، هەروەها لە عائیشەوە ﷺ ئەڵێ: «پەیامبەری خوا ﷺ دیاری وەردەگرت وپاداشتیشی لە سەر دەدایەوە»[٢]. ئەگەریش بۆ روپامایی وبیستن وشانازی بێت کەراهەتی هەیە.

## پرسی دوەم: مەرجەکانی دیاری:

دیاریش ئەم حوکمانەی پێوە پەیوەستە:

---

(١) رواه البيهقي (١٦٩/٦)، وحسنه الألباني «الإرواء» (١٦٠١).
(٢) أخرجه البخاري في صحيحه (٢٥٨٥).

١- ئەبێت لە هەڵس وکەوت دروستێکەوە بێت، کە بریتیە لە تـەکلیفلێکراوێکی ئازادی سەر ڕاست.

٢- ئەبێت بەخشەرەکە بە ویستی خۆی بێت، جا هی زۆر لێ کراو دروست نابێت.

٣- ئەبێت بەخشراو دروست بێت بفرۆشرێت، جا ئەوەی دروست نابێت بفرۆشرێت دروست نابێت ببەخشرێت، وەك: مەی وبەراز.

٤- ئەبێت پێبەخشراو بەخشراوەکە قەبوڵ بکات، چـونکە دیـاری بەخشـین گـرێ بەستی بە خاوەنکردنە بۆیە پێویستی بە ئیجاب وقەبول هەیە.

٥- ئەبێت دیاری دەستەجێ بێت وبڕواتە سەر (حالّة منجـزة)، جا دیـاری کـاتی، دروست نابێت، وەك: ئەمەم پێدای بۆ مانگێك یان ساڵێك، چـونکە دیـاری بەخشـین گرێ بەستی بە خاوەنکردنە، ئەگەر کاتی بێت دروست نابێت.

٦- ئەبێت بێ بەرانبەر بێت، چونکە بەخشینێکی پەتیە.

## پرسی سێیەم: هەندێك حوکمی پەیوەست بە دیاریەوە:

دیاریش ئەم حوکمانەی پێوە پەیوەستە:

١- ئەگەر پێ بەخشـراو بـە هێڵانـی بەخشـەرەکە دیاریەکـەی وەر گـرت، ئـەوا دیاریەکە پەیوەست ئەبێت، وبۆ بەخشەر نیە پەشیمان ببێتەوە لە دیاریەکـەی لەبـەر فـەرمودەی: «الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ، كَالْكَلْبِ يَقِيءُ ثُمَّ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ» «پەشـیمان لـە دیاریەکـەی، وەکـو سـەگ وایـە دەڕشـێتەوە ئینجـا دێتـەوە ڕشـانەوەکەی خـۆی

دەخوات»[١]، مەگەر باوك بێت، ئەو کاتە بۆی هەیە پەشیمان ببێتەوە لە دیاریەکەی بۆ منداڵەکەی، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عەبباس ، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی[٢]: «لَا يَحِلُّ لِلرَّجُلِ أَنْ يُعْطِيَ الْعَطِيَّةَ، فَيَرْجِعَ فِيهَا، إِلَّا الْوَالِدَ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ» «حەلاڵ نیە بۆ پیاو دیاریەك ببەخشێتەوە ئینجا لێی پەشیمان بیتەوە مەگەر باوك لەوەی دەیدات بە کوڕەکەی».

٢- پێویستە لە سەر باوك یەکسانی بکات لە نێوان منداڵەکانی لە دیاری بەخشینەوەدا، جا ئەگەر تایبەتی بکات بە هەندێکیانەوە، یان زیاتر بدات بە هەندێکیان بە بێ ڕەزامەندی ئەوانی تر دروست نابێت، ئەگەریش ڕازی بون ئەوا دیاریەکە دروست ئەبێت، ئەمەش لە بەر فەرمودەکەی نوعمانی کوڕی بەشیر : کە باوکی هەندێك ماڵی پێبەخشیوە، پەیامبەری خوا ﷺ پێی فەرموە: «أَعْطَيْتَ سَائِرَ وَلَدِكَ مِثْلَ هَذَا» «ئایا وەك ئەمەت بە هەمو منداڵەکانت بەخشیوە» وتی: نەخێر، ئەویش فەرموی: «فَاتَّقُوا اللهَ وَاعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلَادِكُمْ» «لە خوا بترسن ودادگەربن لە نێوان منداڵەکانتان»[٣]، لە ڕیوایەتێکی تردا: «لَا تُشْهِدْنِي عَلَى جَوْرٍ» «نەمکە بە شاهید بەسەر ستەمەوە»[٤].

(١) أخرجه البخاري (٢٦٢٢)، ومسلم (١٦٢٠).
(٢) أخرجه أبو داود (٣٥٢٢)، والترمذي (١٢٩٩) وقال: حسن صحيح. وابن ماجه (٢٣٧٧)، وصححه الألباني «الإرواء» (١٦٢٤).
(٣) أخرجه البخاري (٢٥٨٧) [هذا لفظه]، ومسلم (١٦٢٣).
(٤) [هذا لفظ البخاري (٢٦٥٠)، ومسلم (١٦٢٣)].

٣- ئەگەر باوك لە نەخۆشی مردنەکەی زیاتری بە هەندێك لە منداڵەکانی بەخشی، یان هەندێکیانی تایبەت کرد بە دیاریەوە بە بێ ئەوانی تر، ئەوا دروست نابێت مەگەر باقی وەرەسە ڕێگە بدەن.

٤- دیاری هەڵواسراو دروست ئەبێت، وەك ئەوەی بڵێ: ئەگەر ڕێبوارەکە هاتەوە یان باران باری ئەوا ئەوەت پێ دەبەخشم.

٥- بەخشینی قەرز دروست ئەبێت بۆ کەسێك قەرزی لە گەردندایە، ئەمەش ئەبێتە ئەستۆپاکی بۆی.

٦- نابێت دیاری وبەخشین ڕەد بکرێتەوە با کەمیش بێت، وسوننەتیشە پاداشتی لە سەر بدرێتەوە، لەبەر کرداری پەیامبەر ﷺ، [وەك لە فەرمودەی پێشتردا هاتبو] لە عائیشەوە ﵂ ئەڵێ: «پەیامبەری خوا ﷺ دیاری وەر دەگرت وپاداشتیشی لە سەر دەدایەوە».

# هەشتەم: بەشی میرات وەسیەت وئازادکردن

ئەمەش لە چوار دەروازە پێك هاتوە:

دەروازەی یەکەم: هەڵس وکەوتی نەخۆش

دەروازەی دوەم: وەسیەتکردن

دەروازەی سێیەم: ئازادکردن وموکاتەبەوە وتەدبیر

دەروازەی چوارەم: میرات

# دەروازەی یەکەم

## هەڵس وکەوتەکانی نەخۆش «تَصَرُّفَاتُ الْمَرِيضِ»

مرۆڤ ئەگەر تەندروست ولەشساغ بو، ئەو بۆی هەیە بە هەمو ئازادیەکەوە هەڵس وکەوت لە ماڵەکەی خۆیدا بکات لە سنوری ڕێگەدانی شەرع.

بەڵام ئەگەر نەخۆش بو، ئەوا لە دو حاڵەت بە دەر نیە؛ یان مەترسی لە سەر نیە واتە: مەترسی نیە بە هۆیەوە بمرێت وەك ئازاری کاکیلە وپەنجەکان وسەر ئێشە وئازارەکانی لاشە کە کاریگەری نیە، وئەکرێ شیفای بێت وچاك ببێتەوە، ئەم نەخۆشە هەڵس وکەوتی پەیوەست (لازم)ە وەك هەڵس وکەوتی ساغ، جا بەخشین ودیاری لە ماڵەکەی دروست ئەبێت، ئەگەریش پەرەی سەند بۆ نەخۆشیەکی مەترسیدار وبەهۆیەوە مرد، ئەوا عیبرەت بە کاتی بەخشین ودیاریەکەیە ولەو کاتەش حوکمی لەش ساغی هەیە.

ئەگەریش نەخۆشیەکە مەترسیدار بو وەك ئەوەی چاوەڕوانی مردنی لێ بکرێت وەك نەخۆشیە مەترسیدار وبێ چارەسەرەکان، لەم کاتەدا بەخشینەکانی جێبەجێ دەکرێت لە یەك لە سەر سێ، نەك لە دەست مایەکە، جا ئەگەر لە دەوری یەك لە سەر سێ وکەمتر بو جێ بە جێ دەبێت. ئەگەریش زیاتر بو لەمە ئەوا جێ بەجێ ناکرێت مەگەر بە هێڵانی وەرەسەکە دوای مردنی. لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ [(١)]: «إِنَّ اللهَ تَصَدَّقَ عَلَيْكُمْ بِثُلُثِ أَمْوَالِكُمْ عِنْدَ وَفَاتِكُمْ، زِيَادَةً فِي حَسَنَاتِكُمْ؛

---

(١) أخرجه ابن ماجه (٢٧٠٩) [من حديث أبي هريرة]، وأحمد في مسنده (٢٧٤٨٢) ط الرسالة [من حديث أبي الدرداء]، والدارقطني (٢٦٣/٥) ط الرسالة [واللفظ له من حديث معاذ]، والبيهقي (٢٦٤/٦) [من حديث أبي الدرداء]، وهو حديث حسن، انظر: «الإرواء» (٧٧/٦).

لِيَجْعَلَهَا لَكُمْ زَكَاةً فِي أَعْمَالِكُمْ» «خوای گەورە صەدەقەی بە سەردا کردون بە سێیەکی ماڵەکانتان لە کاتی مردنتاندا، ئەمەش وەك زیاترکردنی چاکەکانتان تا بیکاتە مایەی پاك بونەوە وزیادکردنی کارەکانتان». ئەم فەرمودە وهاو واتاکانی تری بەڵگەیە لە سەر ئەوەی دروستە نەخۆش لە نەخۆشی مردن هەڵس وکەوت بکات لە سێ یەکی ماڵەکەی، چونکە بەخشینی لە هەمو ماڵەکە زیان بە وەرەسە دەگەیەنێت، بۆیە هێنرایەوە بۆ سێیەك وەك وەسیەت.

ئەگەریش نەخۆشیەکە درێژخایەن بو بەڵام مەترسی لە سەر نەبو ونەیخستە سەر جێگا، وەك نەخۆشی شەکرە وهتد، لەم حاڵەتەدا بەخشینەکانی دروست ئەبێت لە هەمو ماڵەکەی وەك کەسی لەش ساغ چونکە مەترسی زو مردنی لێ ناکرێت وەك پیاوی پیر.

بەڵام ئەگەر خستیە سەر جێگا ئەوا نە بەخشین ونە وەسیەتەکانی دروست نابێت مەگەر لە سنوری یەك لە سێ ئەویش بۆ جگە لە وەرەسە، چونکە نەخۆشە وکەوتۆتە سەر جێگا ومەترسی مردنی لێ دەکرێت، بۆیە لەم حاڵەتەدا عیبرەت بە هەڵس وکەوت وبەخشینەکانی نیە وەك نەخۆش لە نەخۆشی مردن.

# دەروازەی دووەم

# ڕاسپێری «الوصية»

دو پرسی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەكەم: مانای وەسیەت، وبەڵگەكانی شەرعی بونی:

### ١- واتاكەی:

وەسیەت لە زمانـدا: واتـا ڕاسـپاردن بـە كەسـی تـر، یـان فـەرمان كـردن. لـە شەرعیشدا: بریتیە لەوەی مرۆڤ زات یان قەرز یان سودێك ببەخشـێتە كەسـێكی تـر كە بەخشراوەكە دوای مردنی وەسیەتكەر وەسیەت بۆ كراوەكە ئەبێتە خاوەنی.

وەسیەتكردن لەمە زیاتریش دەگرێتەوە، جا بـە واتـای فـەرمانكردن بـە هـەڵس وكـەوت كـردن دوای مـردنیش دێـت -وەك هەنـدێك وا پێناسـەی دەكـەن- بۆیـە وەسیەتكردن بۆ كەسێك بیشۆرێتەوە دەگرێتەوە، یا بەرنوێژی لـە سـەر بكـات، یـان بەشێك لە ماڵەكەی بدرێتە لایەنێك.

### ٢- بەڵگەكانی شەرعی بونی:

شەرعیە بە قورئان وسـوننەت وكـۆ دەنگـی. لەبـەر فەرمایشـتەكەی خـوا ﷻ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾ [البقرة:١٨٠] «وەسیەتكردن فەرزكراوە لە سەرتان ئەگـەر كەسێكتان نیشانە وپێشەكیەكانی مردنی لێ دەركەوت -مـاڵێكی بـە جێهێشـتبو- ئەوە ئەوەسیەت فەرزكراوە بە بەشێك لە ماڵەكەی بۆ دایك وباوك وخزمـان ونزیكـان لەگەڵ ڕەچاوكردنی دادگەریدا، نەڕوا هەژار وێڵ بكا وەسیەت بۆ دەوڵەمەنـدە بكـات

وبا لە یەك لە سەر سێ زیاتر نەبێت، ئەمەش مافێكی چەسپاوە تەقواكاران ئیشی پێدەكەن كە لە خوا دەترسن». ولەبەر فەرمودەكەی ئیبن عومەر ﷺ، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی[1]: «مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ وَلَهُ شَيْءٌ يُوصِي فِيهِ إِلَّا وصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ» «شیاو نیە موسڵمان دو شەوی بە سەردا بێت وشتێكی هەبێت پێویست بە وەسیەت بكات مەگەر ئەبێت وەسیەتەكەی لای نوسرابێت».

## پرسی دوەم: ئەو حوكمانەی پەیوەستن بە وەسیەتەوە:

ئەم حوكمانەی خوارەوەش پەیوەستن بە وەسیەتەوە:

١- پێویستە لە سەر موسڵمانان ئەو مافەی ها بە سەریەوە وئەوەشی ها لای خەڵكەوە لە وەسیەتێكدا بینوسێ، ئەمەش لەبەر فەرمودەكەی ئیبن عومەری پێشو ﷺ.

٢- سوننەتە هەندێكی ماڵ بكرێتە وەسیەت بۆ خەرجكردنی لە ڕێگاكانی خێر وچاكەدا، بۆ ئەوەی پاداشتەكەی دوای مردنەكەی پێ بگات، لەبەر فەرمودەكەی ئەبو دەردائی ﷺ پێشتر كە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «خوای گەورە صەدەقەی بە سەردا كردون بە سێیەكی ماڵەكانتان لە كاتی مردنتاندا، ئەمەش وەك زیاتركردنی چاكەكانتان تا بیكاتە مایەی پاك بونەوە وزیادكردنی كارەكانتان».

٣- دروستە سێیەك وكەمتر بكرێتە وەسیەت، سەبارەت بە دروستێتی یەك لە سێ فەرمودەكەی سەعدی كوڕی ئەبو وەقاصە كاتێك لە نەخۆشكەوتنی مردنەكەیدا پرسیاری لە پەیامبەری خوا كرد: دو لە سێی ماڵەكەم بكەمە خێر؟ فەرموی:

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٧٣٨)، ومسلم (١٦٢٧).

«نەخێر»، وتم: ئەی نیوەی؟ فەرموی: «نەخێر»، وتم: ئەی سێیەك؟ فەرموی: «با سێیەك بێت، ئەگەرچی زۆریشە». سەبارەت بە سوننەتیەتی كەمتر لە سێیەك؛ لەبەر وتەكەی ئیبن عەبباس ﷺ[1]: ئەگەر خەڵك چاوپۆشیان لە سێیەك بكردایە بۆ چواریەك باشتر بو، چونكە پەیامبەر فەرموی: «با سێیەك بێت، ئەگەرچی زۆریشە».

٤- كەسێك میراتگری هەبێت وەسیەتكردن بە زیاتر لە سێیەك دروست نابێت، لەبەر فەرمودەكەی سەعدی كوڕی ئەبو وەقاصی پێشتر، مەگەر وەرەسە ڕێگا بەوە بدەن، بەڵام ئەگەر میراتگری نەبو ئەوە بە هەمو ماڵەكەشی دروست ئەبێت.

٥- وەسیەت بۆ هیچ كام لە میراتگرەكان دروست نابێت، لەبەر فەرمودەكەی ئەبو ئومامە ﷺ، كە پەیامبەری خوا فەرمویەتی ﷺ: «إِنَّ اللهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، فَلَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ» «خوای گەورە مافی بە هەمو خاوەن مافێك بەخشیوە، جا وەسیەت بۆ میراتگر ناكرێت»[2].

٦- حەرامە وەسیەت بكرێت بە شتێك سەرپێچی تێدا بێت، چونكە دانراوە بۆ زیاتركردنی چاكەی وەسیەتكەر وەك لە فەرمودەكەی پێشتری ئەبو دەردائدا هاتبو.

٧- قەرز واجبە شەرعیەكان وەك زەكات وحەج وكەفارەتەكان دەخرێتە پێش وەسیەتەوە، لە بەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾ [النساء:١١]، «لە دوای بە جێهنانی وەسیەتێك كە كردویەتی یان دانەوەی قەرزێك كە لە

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٣٦٣/٥)، ومسلم (١٦٢٨).
(٢) أخرجه أبو داود (٢٨٥٣)، والترمذي (٢٢٠٣)، وابن ماجه (٢٧١٣)، وصححه الألباني «صحيح ابن ماجه» (٢١٩٣).

سەریەتی»، عەلیش ﷺ ئەڵێ: «قَضَى النَّبِيّ ﷺ بِالدَّيْنِ قَبْلَ الوَصِيَّة» «پەیامبەری خوا ﷺ بڕیاریدا قەرزدانەوە پێش جێبەجێكردنی وەسیەت بێت»[1].

٨- مەرجە وەسیەتكەر هەڵس وكەوت دروست بێت لەماڵەكەی خۆیدا؛ ژیر وپێگەیشتو وئازاد وبە ویستی خۆی بێت.

٩- حەرامە وەسیەت بكات بۆ لایەنێك سەرپێچی بێت، وەك وەسیەت كردن بۆ پەرستگای بێ باوەڕان، یان كڕینی ئامێری مۆسیقا وهاوشێوەكانی، ئەوە وەسیەتی باتڵە.

١٠- وەسیەتكردن سوننەتە ئەگەر ماڵێكی زۆری هەبو ومیراتگرەكانیشی پێویستیان نەبو، لەبەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ﴾ [البقرة:١٨٠]، خێریش لێرە بریتیە لە ماڵی زۆر، وكەسێكیش ماڵی كەم بێت ومیراتگرەكانی پێویستیان هەبێت كەراهەتی هەیە، لەبەر فەرمودەكەی پەیامبەر ﷺ: «إِنَّكَ إِنْ تَذَرْ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ» «ئەگەر میراتگرەكانت بە دەوڵەمەندی بە جێ بهێڵێیت باشترە لەوەی بە هەژاری بە جێیان بهێڵیت دەست لە خەڵك پان بكەنەوە»[2]، وزۆرێك لە هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ مردن وهیچ وەسیەتیشیان نەكرد.

(١) [أخرجه البخاري تعليقًا بصيغة التمريض قبل رقم: (٢٧٥٠)، وأخرجه أحمد (٦٠٥)، والترمذي (٢٠٩٤)، وابن ماجه (٢٧١٥)].

(٢) أخرجه البخاري (١٢٩٥)، ومسلم (١٦٢٨).

١١ – وەسیەتکردن حەرامە ئەگەر وەسیەتکەر مەبەستی زیانگەیاندن بێت بە وەرەسە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿غَيْرَ مُضَارٍّ﴾ [النساء: ١٢] «بە بێ زیان گەیاندن».

١٢ – وەرگرتنی وەسیەت وخاوەنداریێتی کردنی دروست نابێت مەگەر دوای مردنی وەسیەتکەرەکە، چونکە ئەوە کاتی مسۆگەر بونی هەقەکەیەتی، ئەمە ئەگەر وەسیەتەکە بۆ دیاریکراوێك بو، بەڵام ئەگەر بۆ دیاری کراوێك نەبو وەك هەژاران ونەداران، یان فێرخوازان، ومزگەوتەکان وخانەی هەتیوان، لەو کاتەدا پێویستی بە وەرگرتن نیە هەر بە مردن پەیوەست دەبێت.

١٣ – دروستە وەسیەتکەر لە هەمو وەسیەتەکەی یان هەندێکی پەشیمان ببێتەوە، یان هەڵی بوەشێنێتەوە. عومەر ﷺ ئەڵێ: کابرا چی بوێت لە وەسیەتەکەی دەیگۆڕێت[1].

١٤ – وەسیەتکردن دروستە بۆ هەمو کەسێك کە خاوەنداری کردنی دروست بێت ئیتر موسڵمان بێت یان کافر، لەبەر ئایەتی: ﴿إِلَّا أَنْ تَفْعَلُوا إِلَى أَوْلِيَائِكُمْ مَعْرُوفًا﴾ [الأحزاب:٦] «مەگەر ئەی موسڵمانان چاکە بکەن لەگەڵ ئەوانەی وەرەسە نین بە سەرخستن وچاکەکردن وپەیوەندی خزمایەتی گەیاندن ووەسیەتکردن».

(١) سنن البيهقي: (٦/٢٨١). وأخرجه عبد الرزاق (٩/٧١) من قول عطاء وطاوس وأبي الشعثاء.

# دەروازەی سێیەم

## کۆیلە ئازاد کردن، ونوسراو لەگەڵ کردن وئازاد کردن لەدوای خۆ «العِتْق، والكِتَابَة، والتَّدْبِير»

**چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:**

**پرسی یەکەم: پێناسەی ئازادکردن، وشەرعی بونی، وفەزڵەکەی، وحیکمەت لە شەرعی بونی:**

**١- پێناسەی «العتق»:**

لە زماندا بە کەسرەی عەینەکە وسکونی تائەکە: ئازادکردن ورزگاربونە، لەو قسەیە وەرگیراوە کە ئەڵێ: «عَتَق الفرس= ولاخەکە ئازاد بو» ئەگەر پێش بکەوێت، و«عتَق الفَرْخ= جوجەڵەکە ئازاد بو» ئەگەر بفرێ وسەر بەخۆ ونجاتی ببێت. لە شەرعیشدا: بریتیە لە ئازادکردنی گەردن ورزگارکردنی لە کۆیلایەتی ولە ژێر خاوەندارێتی لای بدەیت، ئازادی بۆ چەسپاندنی.

**٢- بەڵگەکانی شەرعی بونی:**

بنەما لەمەڕ شەرعی بونی ئازادکردن: قورئان وفەرمودە وکۆ دەنگیە؛ سەبارەت بە قورئان: فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ﴾ [النساء:٩٢]، «ئەوا کۆیلەیەك ئازاد بکەن»، هەروەها ﷻ ئەفەرموێ: ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا﴾ [المجادلة:٣] «ئەوا کۆیلەیەك ئازاد بکەن پێش جوت بون». سەبارەت بە سوننەتیش: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ ئەڵێ: لە پەیامبەری خواوە ﷺ[1]: «مَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً أَعْتَقَ اللهُ

---

(١) أخرجه البخاري (٢٥١٧)، ومسلم (١٥٠٩)-٢٢، واللفظ له.

بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهَا عُضْوًا مِنْ أَعْضَائِهِ مِنَ النَّارِ حَتَّى فَرْجَهُ بِفَرْجِهِ» «هەر كەس گەردنێك ئازاد بكات، ئەوا خوا بە هەر ئەندامێكی ئەو كۆیلە ئەندامێكی ئەم لە ئاگر ڕزگار دەكات، تەنانەت دامێنی بە دامێنی». ئوممەتیش كۆكن لە سەر ئەوەی ئازادكردن دروست ئەبێت، وبەندە لە خواوە پێی نزیك دەبێتەوە.

## ٣- فەزڵەكەی:

ئازادكردن لە باشترین نزیكبونەوەكان ومەزنترین پەرستنەكانە، لەبەر ئەو دەقانەی لەم بارەوە هاتون، وەك فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿فَكُّ رَقَبَةٍ﴾ [البلد:١٣] «بەندەیەك ئازاد بكەن» یانی: ڕزگاركردنی كەسەكە لە كۆیلایەتی، ئەم ئایەتەش لە باسی ئەو ڕێگایانەدا هاتوە كە ڕزگاربون وخێری تێدایە بۆ كەسێك بیگرێتە بەر، ئەویش بریتیە لە كۆیلە ئازادكردن. پێشتریش باسی فەرمودەكەی ئەبو هورەیرە كرا لەبارەی فەزڵی ئازادكرنەوە، هەروەها لە ئەبو ئومامەوە ﷺ لە پەیامبەری خواوە ﷺ: «أَيُّمَا امْرِئٍ مُسْلِمٍ أَعْتَقَ امْرَأً مُسْلِمًا ؛ كَانَ فَكَاكَهُ مِنَ النَّارِ...» «هەر موسڵمانێك كۆیلەیەكی موسڵمان ڕزگار بكات، ئەوا ئەبێتە مایەی ڕزگاركردنی لە ئاگر» تا كۆتایی[1]. دەقەكانیش لە بارەی ئازادكردنەوە زۆر زۆرە. ئازاد كردنی پیاویش باشترە لە ئازاد كرنی ئافرەت، وگەردنی گرانت ر وبە نرخ تر لای خاوەنەكەی باشترە لە هی تر.

## ٤- حیكمەت لە شەرعی بونی:

ئازادكردن لە ئیسلامدا بۆ چەندین ئامانجی مەزن ومەبەستی باڵا دانراوە، لەوانە: ڕزگاركردنی ئادەمیزادێكی خوێنپارێزراو لە زیانی كۆیلایەتی، وببێتە خاوەنی خۆی، ودەسەڵاتی پێ بدەی بتوانێت هەڵس وكەوت بكات بۆ خۆی وبەرژەوەندیەكانی بە

---

(١) أخرجه الترمذي (١٥٤٧) وصححه، وصححه الألباني «صحيح سنن الترمذي» (١٢٥٢).

ویست وهەڵبژاردنی خۆی. هەروەها خوای گەورە كردویەتی بە كەفارەت بۆ: كوشـتن، وجوت بون لە ڕەمەزان، وسوێندەكان.

## پرسي دوەم: پایەكانی ئازادكردن ومەرجەكانی وصیغەكەی ولەفزەكەی:

١- **پایەكانی ئازادكردن:** پایەكانی سیانە:

أ. ئازاد كەر (الْمُعتِق): ئەو كەسەیە كە كەسێكی تر ئازاد دەكات.

ب. ئازاد كراو (الْمُعتَـق): ئەو كەسەیە كە ئازاد كراوە یا ئازاد كردنەكە بە ئەو دا ڕویداوە.

ج. صیغەكەی: ئەو دەستەواژەیەیە كە ئازاد كردنەكەی پێ ڕو دەدات.

٢- **مەرجەكانی:**

بۆ ئەوەی ئازادكردنەكە دروست بێت وڕو بدات، ئەمانە مەرجە:

- ئەبێت ئازادكەرەكە هەڵس وكەوت دروست بێت كە بریتیە لـە پێگەیشـتویەكی ژیری سەر ڕاستی سەر پشك، جا ئازادكردن نە لە لایەن منداڵ ونە شێت ونە تێكچـو ونە زۆر لێكراوەوە دروست نابێت، لەبەر فەمودەی پێشـتر: «پێنـوس هـەڵگیراوە لـە سەر سیان: لە سەر منداڵ تا باڵغ دەبێت، وشـێت تـا هۆشـی دێتـەوە، وخـەوتو تـا هەڵدەستێت». ونە ئازادكردنی زۆرلێكراو نە هیچ هـەڵس وكـەوتێكی تـری دروست نابێت.

- ئەبێت خاوەنی ئەوە بێ كە ئازادی دەكات، جا ئازادكردن لـە لایـەن جگـە لـە خاوەنەكەیەوە دروست نابێت.

- ئەبێت ئازادكراو هیچ مافێكی لازمی پێـوە پەیوەسـت نـەبێت ببێتـە ڕێگـری ئازاد كردنەكەی، وەك قەرز ودەست درێژی، جا ئازاد كردنەكەی دروسـت نابێـت تـا قەرزەكەی دەدرێتەوە یان خوێن بایی دەست درێژیەكەی دەدرێت.

- ئەبێت ئازاد کردنەکە بە دەستەواژەیەکی ڕاشکاوانە یان جێگرەوەی لە نا ڕاشکاوەکان بێ، وتەنها نیەتبون بەس نیە، چونکە نەهێشتنی خاوەندارێتیە جا نیەتی پەتی بەس نیە.

**٣- صیغە ودەستەواژەکانی:**

- دەستەواژەکانی یان ڕاشکاوانەیە، ئەویش ئەوەیە بە لەفزی ئازاد کردن یا بەڕەڵا کردن ولێ دەرهێنراوەکانی بێت؛ وەك: تۆ ئازادیت، یا ئازاد کراویت، یان: ئازادم کردیت.

- یان نا ڕاشکاوانەیە، وەك بڵێ: بۆ کوێ ئەڕۆی بڕۆ، یان: ئیتر من دەسەڵاتم نیە بە سەرتەوە، یان: ون بە، یان: لێم دور بکەوە، یان: وازم لێ هێنای، وهاوشێوەکانی. ئەم ئاماژانەش ئازادکردنی پێ بەدی نایەت مەگەر کەسەکە مەبەستی ئازادکردن بێت.

## پرسی سێیەم: لە حوکمەکانی ئازادکردن:

١- کۆیلە وکەنیزەك دروستە زیاتر لە کەسێك بەشدار بن لە خاوەندارێتی کردنیان.

٢- لە کۆیلەیەکی هاوبەشدا ئەگەر یەکێکیان لە بە شەکەی خۆی ئازادی کرد، ئەوە لەو بەشە ئازاد بوە، ئەگەریش ئازادکراوەکە دارا بو ئەوا لە بەشی هاوبەشەکەی تریش ئازاد دەبێت، بەشی شەریکەکەی تر دەخەملێنرێت بایی چەندە، پێی دەدرێت. ئەگەریش نەدار بو ئەوا لە بەشەکەی تر ئازاد نابێت، وکۆیلەکە هەوڵی پەیداکردنی نرخی بەشی ئەم شەریکە دەدات، دوای تەسلیمکردنی ئەو بەشە ئازاد دەبێت، ئەو کاتەش وەك کۆیلەی موکاتەب وایە [کە دوایی باسیان دێت]. بەڵگەی ئەمەش: فەرمایشتەکەی پەیامبەرە ﷺ: «مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي عَبْدٍ، فَكَانَ لَهُ مَالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ الْعَبْدِ، قُوِّمَ عَلَيْهِ قِيمَةَ الْعَدْلِ، فَأَعْطَى شُرَكَاءَهُ حِصَصَهُمْ، وَعَتَقَ عَلَيْهِ الْعَبْدُ،

وَإِلَّا فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ» «هەر کەس لە بەشی خۆی کۆیلەیەکی موڵك هاوبەش ئازاد بکات، کۆیلەکەش ئەوەندەی هەبو بگاتە نرخی کۆیلەیەك، ئەوا بە دادگەری نرخەکەی دەخەملێنرێت لەوەی ماوە، ئەوسا شەریکەکان بەشەکانی خۆیان پێ دەدرێت، وبەندەکەی پێ ئازاد دەبێت، وەگەرنا ئەوەندەی ئازاد بوە کە ئازاد بوە»[1].

هەروەها پەیامبەری خوا ﷺ ئەفەرموێ: «مَنْ أَعْتَقَ نَصِيبًا، أَوْ شَقِيصًا فِي مَمْلُوكٍ، فَخَلَاصُهُ عَلَيْهِ فِي مَالِهِ، إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ، وَإِلَّا قُوِّمَ عَلَيْهِ، فَاسْتُسْعِيَ بِهِ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ» «هەر کەس بەشەکەی خۆی لە کۆیلە هاوبەشەکەی ڕزگار کرد، ئەوە نجات بونی هەر بەماڵەکەی خۆی ئەبێت ئەگەر ماڵی هەبو، وەگەرنا ئەوەی ماوە نرخی لە سەر دادەنرێت وهەوڵ وتەقەلا دەدرێت، وئەرك ناخرێتە سەری ونرخەکەی لە سەر گران بکرێت»[2]. وەك دەریش دەکەوێت ئەمە بە ڕەزامەندی بەندەکەیە.

٣- ئازادکەر هەمو میراتی ئازادکراو دەبات بە بێ پێچەوانە، چونکە ئازادکراو وەلائو دۆستایەتی بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردوە، وەك پەیامبەر ﷺ فەرموی[3]: «الْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ» «وەلائو دۆستایەتی بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردوە». هەروەها[4] پەیامبەر وەلائی وەك پشت وڕەچەڵەك لێکردوە، وەك ئەفەرموێ: «الوَلاءُ لُحْمَةٌ كَلُحْمَةِ النَّسَبِ» «وەلاء تێکەڵبون وگۆشتێکە وەك گۆشت وتێکەڵبونی ڕەچەڵەك».

٤- هەر کەس بدات لە کۆیلەکەی بە ستەم، یان لێدانێکی بە ئازار، یان شێواندنی لێ بکات، یان تێکی بدات، یان ئەندامێکی ببڕێت وهاوشێوەکانی، ئەوا

---

(١) أخرجه البخاري (٢٥٢٢)، ومسلم (١٥٠١) [واللفظ له].

(٢) أخرجه البخاري (٢٥٢٧)، ومسلم (١٥٠٣).

(٣) أخرجه البخاري (١٤٩٣)، ومسلم (١٥٠٥).

(٤) أخرجه الشافعي في الأم (١٢٣٢)، والحاكم (٣٤١/٤) وصححه، والبيهقي (٢٩٢/١٠)، وصححه الألباني «صحيح الجامع» (٧١٥٧)، و«الإرواء» (١٠٩/٦). واللُّحمة: القرابة.

لە سەر ئەمانە ئازاد دەکرێت، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «مَنْ ضَرَبَ غُلَامًا لَهُ حَدًّا لَمْ يَأْتِهِ أَوْ لَطَمَهُ، فَإِنَّ كَفَّارَتَهُ أَنْ يُعْتِقَهُ» «ئەگەر کەسێك حەددێك لە سەر کۆیلەیەك جێبەجێ بکات وشیاوی ئەوەش نەبێت، یان زللەی پیا بکێشێت، ئەوە کەفارەتەکەی ئازادکردنیەتی»[1]، بەڵام ئەگەر لێ دانێکی سوك بو بۆ ئەدەب دان ئەوە هیچی تێدا نیە.

## پرسی چوارەم: ئازادکردن لە دوای خۆ «التَّدبير».

### ١- پێناسەکەی:

تەدبیر، بریتیە لە بەستنەوەی ئازادکردنی کۆیلە بە مردنی خاوەنەکەی. ئەوترێ: «دَبَّر الرَّجُلُ عَبْدَه تَدْبِيرًا» ئەگەر دوای مردنی خۆی کۆیلەکەی ئازاد بکات، بە هەمان شێوە کە وترا: «أعتَقَه عن دُبُرٍ». «الْمُدَبَّر= دواخراو»یش: ئەو کۆیلەیەیە کە تەدبیرەکەی لەگەڵ کراوە، واشی پێوتراوە چونکە ئازادکردنی خراوەتە دوای ژیانی خاوەنەکەی، جا مردن دوای ژیانە.

### ٢- حوکمەکەی، وبەڵگەکەی:

تەدبیر دروستە، وبە کۆ دەنگی زانایانیش صەحیحە، بنەماش تێیدا فەرمودەکەی جابرە، کە ئەنصاریەك کۆیلەیەکی خۆی بە تەدبیر ئازاد کردوە، هیچ ماڵ وسامانێکیشی نەبوە جگە لەو، ئەمە گەیشتە پەیامبەر ﷺ، فەرموی: «مَنْ يَشْتَرِيه مِنِّي؟» «کێ لێمی دەکڕێت؟» ئەوەبو نوعەیمی کوڕی عەبدوڵا بە هەشت سەد درهەم کڕی، پەیامبەر ﷺ پارەکەی هێنا ودایە دەستیەوە[2].

---

(١) أخرجه مسلم (١٦٥٧)-٣٠.

(٢) أخرجه البخاري (٢٥٣٤)، ومسلم (٩٩٧) واللفظ له.

### ٣- لە حوکمەکانی کۆیلەی دواخراو «المدَّبر»:

- فرۆشتنی دواخراو بە ڕەهایی دروستە لە بەر پێویستی، هەندێکی تری زانایان بە ڕەهایی فرۆشتنی پێ دروستە پێویستی هەبێت یان نا، لە بەر فەرمودەکەی جابری پێشو.

- دواخراو لە سێیەکەکە ئازاد دەکرێت، نەك لە دەستمایە، چونکە حوکمی وەسیەتی هەیە، جا هەر دوکیان جێبەجێ ناکرێت تا دوای مردن.

- خاوەنەکەی دەتوانێت بیبەخشێتەوە، چونکە دیاری وەك فرۆشتن وایە.

- دروستە بۆ خاوەن کەنیزەکی تەدبیرکراو جوت ببێت لەگەڵیدا، چونکە ئەم خاوەنیەتی، لەبەر: ﴿إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ﴾ [المؤمنون:٦]. «دامێنیان دەپارێزن مەگەر بۆ ژن وکەنیزەکانیان ئەوە لۆمە وتاوانیان لە سەر نیە».

## پرسی پێنجەم: لە بارەی کۆیلەی نوسراو لەگەڵ کراو «الْمُکاتَب»:

### ١- پێناسەکەی:

«الكِتَابَة» و«المُكَاتَبَة» لە زماندا: لە «كَتَبَ= نوسیەوە» وەرگیراوە، واتا: پێویستی وئیلزامی کرد. لە شەرعیشدا خۆ ئازاد کردنی کۆیلەیە لە دەست خاوەنەکەی بەرامبەر پارەیەك کە لە ئەستۆیەتی، بە قەرز پێی دەدات. لە شەرعیشدا موکاتەب -بە فەتحەی تائەکە-: ئەو کۆیلەیەیە ئازادکردنی بەستراوەتەوە بە پارە ومالێك کە دەیداتە خاوەنەکەی. بە کەسرەش خاوەنەکەیەتی. پێشی وتراوە نوسراو (کتابة)؛ چونکە خاوەنەکەی لە نێوان خۆی وبەندەکەی نوسراوێك دەنوسێت لە مەڕ ئەوەی لە سەری ڕێککەوتون.

### ٢- حوکمی موکاتەبە، وبەڵگەکەی:

نوسراو لەگەڵ کۆیلە کردن دروست وسوننەتە ئەگەر کۆیلەیەکی ڕاستگۆی کاسب بو، توانای ئەو پارەیەشی هەبو کە خاوەنەکەی کردبویە مەرج بە سەریەوە، ئەمەش لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا﴾ [النور: ٣٣] «وئەو کۆیلانەی ئەیانەوێت ئازاد ببن وداوای نوسراو دەکەن لە خاوەنەکانیان بەرامبەر پارەیەك پێیانی دەدەن لە ئایندەدا، ئەوا لە سەر خاوەنەکانیانە نوسراویان لەگەڵ بنوسن ئەگەر بینیان خێریان تێدایە؛ وەك سەر ڕاستی وتوانای کەسابەت وبە دین بون و...».

**٣- لە حوکمەکانی موکاتەبە:**

- کۆیلە وکەنیزەك کەی ئەوەیان بە جێ گەیاند کە ڕێککەوتبون لەگەڵ خاوەنەکانیان دەبنە ئازاد، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەری خوا ﷺ[1]: «الْمُكَاتَبُ عَبْدٌ مَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ مُكَاتَبَتِهِ دِرْهَمٌ» «موکاتەب هەر بە کۆیلەیی دەمێنێتەوە تا درهەمێکی لە سەر مابێت». مەفهومی ئەم فەرمودە ئەوەیە کە ئەگەر هەموی بە جێ گەیاند لە کۆیلەیی دەر دەچێت ودەبێتە ئازاد بە نە کردنی.

- کۆیلە ئازاد نابێت تا هەمو ئەوە نەدات کە نوسراوە، لە بەر فەرمودەی پێشو.

- وەلائی موکاتەب بۆ خاوەنەکەی خۆی دەبێت ئەگەر هەمو ئەوەی لە سەری بو دابوی، لەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] پەیامبەری خوا ﷺ: «وەلائی بۆ ئەوەیە ئازادی کردوە».

- لە سەر خاوەنەکەیەتی هەندێك لەو پارەیە دابشکێنێت کە لەگەڵی ڕێککەوتوە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَآتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ﴾

---

(١) أخرجه أبو داود (٣٩٢٦) واللفظ له، والترمذي (١٢٦٠) وحسنه والألباني في «الإرواء» (١٦٧٤).

«ئەمە هەر درێژەدەری ئایەتی پێشوە، واتە: وپێیان بدەن لەو ماڵەی خوا پێی داون».

ئیبن عەبباس لە سەر ئەم ئایەتە ئەڵێ: هەندێك لەوە دابشكێنن كە نوسراوتان لەگەڵ نوسیون[1]. خاوەنەكەشی سەر پشكە لە نێوان داشكاندن، ولە نێوان لێ وەرگرتن وپێدانەوەی.

- پارەكە دەكرێتە قیست[2] (مُنَجَّمًا)، دو قیست وبەرەو سەرەوە، بەو مەرجەی قیستەكان دیاری كراو بێت، ولە هەر قیستێكدا ئەندازەی پارەكە تەسلیمكراوەكە بزانرێ.

- بۆ موكاتەب نیە ژن بهێنێت مەگەر بە هێلانی خاوەنەكەی، لەبەر فەرمودەكەی پەیامبەر ﷺ[3]: «أَيُّمَا عَبْدٍ تَزَوَّجَ بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ فَهُوَ عَاهِرٌ» «هەر كۆیلەیەك بە بێ هێلانی خاوەنەكەی ژن بهێنیت ئەوە زیناكارە». شو كردنیش بە هەمان شێوە.

- دروستە موكاتەب بفرۆشرێت، ونوسراوەكە دەمێنێت لە دەست كڕیارەكە، جا ئەگەر ئەوەی لە سەری بو هەموی تەسلیم كرد ئازاد دەبێت، وەلائیشی بۆ كڕیارەكەیەتی، لەبەر فەرمودەكەی پەیامبەر ﷺ لە چیرۆكی بەریرە بە عائیشەی ﵂ فەرمو: «اِشْتَرِيها وَأَعتِقِيها... فَإِنَّ الوَلَاءَ لِمَنْ أَعْتَق» «بیكڕە وئازادی بكە... چونكە وەلاء بۆ ئەو كەسەیە ئازادی كردوە»[4].

---

(١) أخرجه البيهقي في «سننه» (١٠/٣٣٠). وانظر: «المغني» لابن قدامة (١٠/٣٤٢).

(٢) النَّجم: كاتی هاتنی پارەدانەكەیە، ئەوترێ: «نَجَمت عليه الدين»، ئەگەر بەش بەش بكرێت.

(٣) أخرجه أبو داود (٢٠٧٨)، والترمذي (١١١١) وحسَّنه، والألباني «صحيح سنن الترمذي» (٨٨٧). عاهر: زانٍ.

(٤) أخرجه البخاري (٢٥٦٥)، ومسلم (١٥٠٤)-١٢.

# دەروازەی چوارەم

# میرات «الفَرَائِض والْمَوارِيث»

چەند پرسێكی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: واتای میرات، وهاندان بۆ فێربونی:

میراتزانی لە گرنکترین زانستەکانە، جا پێویستە لە سەر موسڵمانان بایەخی پێ بدەن وتێی بگەن، چونکە خەڵك پێویستیان زۆر پێ دەکەوێت. ئەم زانستەش پێی دەوترێت: «الفرائض» کۆی «فريضة»یە، لە «الفرض»ەوە وەرگیراوە کە بریتیە لە ئەندازەگیری، وەك پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ﴾ [البقرة:٢٣٧] یانی: «نیوەی ئەوەی ئەندازەتان بۆ داناوە». «الفَرْض»یش لە شەرعدا بەشێكی لە شەرع دیاری کراوە بۆ ئەوەی شایستەیەتی.

زانستی میراتیش: بریتیە لەوەی زانستت بە میرات هەبێت لە ڕوانگەی تێگەیشتن لە حوکمەکانی، ولە ڕوانگەی زانینی هەژماردن کە دەت گەیەنێت بە چۆنێتی دابەش کردنی.

«المیراث»یش کۆی «المیراث»ـە، بریتیە لەو مافەی لە مردوەکە بە جێماوە ودەگوازرێتەوە بۆ وەرەسە.

وپێویستە لە سەر موسڵمان کە بایەخ بە پرسی میرات بدات، وهەڵس وکەوتێکی تێدا نەکات ببێتە مایەی گۆڕینی لەو شێوەیەی شەرع دایناوە؛ کە یەکێك میرات نابات بەشداری بکات، یان ئەوەی میرات بەرە بێبەشی بکات یان بەشێکی مافەکەی پێ بدات، بەمەش خۆی توشی توڕەیی وسزای خوا دەکات.

## پرسی دووەم: ئەو مافانەی پەیوەستن بە پاشماوەوە، وهۆکارەکانی میرت بردن، وڕێ گرەکانی:

### ١. مافەکانی ماڵی بە جێماو (الترکة):

تەریکە بریتیە لەوەی مردو بە جێی دەهێڵێت لە ماڵی نەختی ونانەختی (النقدیة والعینیة) ومافەکان، وبە جێماوی مردوش چوار مافی پێوە پەیوەستە:

أ. خەرجی ئامادەکردنی لە پارەی کفن وعەتر وکرێی شۆردن وناشتن وجگە لەمانەش.

ب. دانەوەی قەرزەکان، وقەرزی خواش لە پێشترە وەك زەکات وسەر فترە وکەفارەت ونەزر، دوای ئەوە قەرزی ئادەمیزادەکان.

ج. دەرکردنی ئەوەی وەسیەتی کردوە بە مەرجێك لە دەوری سێیەك وکەمتر بێت،

د. میرات: هەرچی مایەوە بە شێوەیەکی شەرعی دابەش دەکرێت بە سەر میرات گرەکان.

میراتیش: بریتیە لە گواستنەوەی ماڵی مردو دوای خۆی بۆ زیندوان، بە گوێرەی ئەوەی لە وقورئان وفەرمودەدا هاتوە.

هەندێك جاریش مافی کەسی تر لە کاتی ژیانیدا پەیوەست دەبێت بە پاشماوەوە، ئەمەش بریتیە لە مافە نانەختیەکان، وەك مافی کڕیار لە تەسلیم کردنی فرۆشراوەکە، ومافی خاوەن بارمتە لە بارمتەکە، ئەمانە دەخرێتە پێش ئامادەکردنی مردو، چونکە پەیوەستە بە خودی ماڵەکەوە پێش ئەوەی ببێتە بە جێماو وتەریکە.

### ٢. هۆکارەکانی میرات بردن:

ئەو هۆکارانەی ئەبنە مایەی میرات بردن سیانە:

**یەکەم: هاوسەر گیری (النكاح):** ئەمەش گرێ بەستێکی دروستی هاوسەرگیریە بە ئامادەبونی دو شاهید وکار بە دەستەکەی، جا جوت بون وتەنیا کەوتنیش ڕوی نەدا بێت، لە بەر گشتێتی فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ﴾ [النساء:١٢] «ونیوەی ئەوەتان بۆ هەیە کە لە هاوسەرەکانتان بە جێ دەمێنێت».

**دوەم: ڕەچەڵەك (النسب):** یانی نزیکەکانی مردو، ئەمەش: بنەوان وچڵ وپەراوێزەکان دەگرێتەوە (الأصول، والفروع، والحواشي)

بنچینەکانیش بریتین لە: باوکان وباپیران وبەرەو سەرەوە بە نێرینەی پەتی.

چڵەکانیش بریتین لە: منداڵەکان ومنداڵی کوڕەکان وبەرەو خوارەوە.

پەراوێزەکانیش بریتین لە: براکان وکوڕەکانیان وبەرەو خوارەوە، هەروەها مامەکان وبەرەو سەرەوە، وکوڕەکانیان وبەرەو خوارەوە.

**سێیەم: وەلاء:** ئەمەش پەیوەندیەکە هۆکارەکەی چاکە کاری ئازاد کەرەکەیە بە سەر کۆیلەکەیدا بە هۆی ئازاد کردنەوە، جا ئازاد کراو میرات لە ئازادکەر نابات بە کۆ دەنگی.

جا هۆکارەکانی میراتبردن لەم سیانە کورت هەڵهات: ڕەچەڵەك، وهاوسەرگیری دروست، وەلاء.

٣. **ڕێگرەکانی میرات بردن:** ڕێگرەکانی بەردەم میراتبردن دیسانەوە سیانە:

أ. **کوشتن:** زانایان کۆکن لە سەر ئەوەی کوشتنی بە ئەنقەستی حەرام ڕێگرە لە میرات، جا هەر کەس میرات لێ بەرەکەی بە ستەم بکوژێت میراتی لێ نابات،

لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ(1): «لَيْسَ لِلْقَاتِلِ مِنَ المِيرَاثِ شَيْءٌ» «بکوژ هیچی لە میرات بۆ نیە».

ب. **کۆیلە بون:** جا کۆیلە میرات لە نزیکەکەی خۆی نابات، چونکە میراتیشیی پێ بدرێ دەبێتە هی خاوەنەکەی نەك ئەو، هەروەها میراتیشی لێ نابرێت چونکە مولکی نیە.

ج. **جیاوازی دینی میرات لێ براو ومیرات بەر:** ئەمەش ڕێگرە لە میرات بردن، لەبەر فەرمودەکەی ﷺ: «لَا يَرِثُ الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ، وَلَا الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ» «بێ باوەڕ میرات لە موسڵمان نابات، موسڵمانیش هەروەها میرات لە بێ باوەڕ نابات»(2).

## پرسی سێیەم: بەشەکانی میراتگر [لە ڕوانگەی نێرینە ومێینەوە]:

میرات بەرەکان دو بەشن: نێر ومێ:

**میرات بەرە نێرینەکان، دەن:**

1، 2- **کوڕ وکوڕەکەی وبەرەو خوارەوە،** لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ﴾ [النساء:11] «لەبارەی منداڵەکانتانەوە خوا ئامۆژگاریتان دەکات وفەرمانتان پێدەکات، ئەگەر کەسێکتان منداڵی بە جێهێشت: نێر ومێ بون، ئەوا هەمو میراتەکە بۆ ئەوانە، هەر نێرینەیەکیان وەك بەشی دو مێینەی هەیە ئەگەر میرات بەری تر نەبو».

---

(1) أخرجه الدارقطني (4102) والبيهقي (6/220) [والنسائي في الكبرى وهو أولى بالعزو إليه]، وصححه الألباني «الإرواء» (1671).

(2) أخرجه [البخاري (6764)، و]مسلم (1614).

٣، ٤- **باوك وباوكی باوك وبەرەو سەرەوە**، وەك باوكی باوك، وباوكی باپیر، لەبەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ﴾ [النساء:١١] «وبۆ دایك وباوكی مردووەكە هەر یەكەیان شەش یەكی بۆ هەیە ئەگەر مندالّی هەبو نێر یان مێ، یەكێك یان زیاتر». باپیریش باوكە وپەیامبەریش ﷺ شەش یەكی پێ بەخشیوە.

٤- **برا لە هەر لایەكەوە بێت**، دایك وباوكی بێت، یان لە باوكەوە یان لە دایكەوە بێ، لەبەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا وَلَدٌ﴾ [النساء:١٧٦] «ئەگەر كەسێك مرد نە باوكی هەبو نە كوڕ، وخوشكی دایك وباوكی یان باوكی هەبو، ئەوا نیوەی بە جێماوەكەی بۆ هەیە، وبراش دایك وباوكی بێت یان باوكی هەمو مالّەكە بە میراتی دەبات، ئەگەر ئافرەتە مردوەكە نە باوكی هەبو، نە كوڕ». هەروەها خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ﴾ [النساء:١٢] «وئەگەر پیاوێك یان ئافرەتێك مرد ونە باوكی هەبو نە كوڕ، بەلاّم برای دایكی یان خوشكی دایكی هەبو ئەوا هەر یەكەیان شەش یەكی بۆ هەیە».

٦- **كوڕی برا، لە دایكەوە نا**، چونكە كوڕ برای دایكی میراتی ناكەوێت چونكە لە خزمان (ذو الأرحام)ـە.

٧، ٨- **مامەی دایك وباوكی یان لە باوكەوە** -نەك لە دایكەوە چونكە لە خزمانە-، هەروەها **كوڕی مام لە باوكەوە**.

٩- **مێرد**: لەبەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ﴾ [النساء:١٢] «ونیوەی ئەوەتان بۆ هەیە كە ژنەكانتان بە جێی دەهێلّێت».

١٠- **ئازادکەری کۆیلە یان جێگرەوەکەی:** لەبەر فەرموودەکەی [پێشتری] پەیامبەر ﷺ: «وەلاء تێکەڵ بونی وەك تێکەڵ بونی گۆشت وڕەچەڵەك وایە». هەروەها ﷺ ئەفەرموێ: «وەلاء بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردوە».

**میرات بەرە مێینەکانیش، حەوتن:**

١، ٢- **کچ وکچی کوڕ وبەرەو خوارەوە بە نێرینەی پەتی،** لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ فَإِنْ كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِنْ كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ﴾ [النساء:١١] «لەبارەی منداڵەکانتانەوە خوا ئامۆژگاریتان دەکات وفەرمانتان پێدەکات، ئەگەر کەسێکتان منداڵی بە جێهێشت: نێر ومێ بون، ئەوا هەمو میراتەکە بۆ ئەوانە، هەر نێرینەیەکیان وەك بەشی دو مێینەی هەیە ئەگەر میرات بەری تر نەبو، ئەگەریش تەنها کچ وبەرەو سەرەوەی بە جێ هێشتبو ئەوا دو کچ وبەرەو سەرەوە دو لە سەر سێی بۆ هەیە، ئەگەریش یەك کچ بو نیوەی بۆ هەیە».

٣- **دایك:** لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَلَدٌ وَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِنْ كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ﴾ [النساء: ١١] «وبۆ دایك وباوکی مردوەکە هەر یەکەیان شەش یەکی بۆ هەیە ئەگەر منداڵی هەبو نێر یان مێ یەکێك یان زیاتر، ئەگەریش منداڵی نەبو دایك وباوکی میراتیان برد ئەوا دایکی سێ یەکی بۆ هەیە، وباوکیشی باقیەکەی، ئەگەریش مردوەکە دو برا یان زیاتری هەبو نێر بون یان مێ ئەوا دایکی شەش یەك دەبات وباقیەکەشی بۆ باوکە وبراکانیش هیچیان پێ نادرێت».

٤- **داپیر:** خوای دانا شەش یەکی بۆ داناوە، لەبەر فەرموودەکەی بورەیدە ﷺ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَعَلَ لِلْجَدَّةِ السُّدُسَ إِذَا لَمْ تَكُنْ دُونَهَا أُمٌّ» «پەیامبەر خوا ﷺ

شەش یەکی بەخشیوە بە داپیر ئەگەر دایك نەبو»[1]. جا شەش یەکی بۆ هەیە ئەگەر دایك نەبێت.

٥- **خوشك:** لە هەر لایەکەوە بێت، دایك وباوکی یان باوکی بێت، یان دایکی لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَإِنْ كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ﴾ [النساء:١٢] «وئەگەر پیاوێك یان ئافرەتێك مرد ونە باوکی هەبو نە کوڕ، بەڵام برای دایکی یان خوشکی دایکی هەبو ئەوا بۆ هەر یەکەیان شەش یەك هەیە». هەروەها خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ﴾ [النساء:١٧٦]. لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ﴾ [النساء:١٧٦] «ئەگەریش ئەوەی مردبو نە باوکی هەبو نە منداڵ ودو خوشکی هەبو ئەوە دو لە سێی بە جێماوەکەی بۆ هەیە».

٦- **ژن (هاوسەر):** لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ﴾ [النساء:١٢] «وژنەکانتان چواریەکیان بۆ هەیە لەوەی بە جێتان هێشتوە».

٧- **ئازادکەری کۆیلە (الْمُعتِقة):** لەبەر فەرمودەی: «وەلاء بۆ ئەوەیە ئازادی کردوە».

## پرسی چوارەم: بەشەکانی میرات بەران لە ڕوانگەی میرات بردنەوە:

**بەشی یەکەم:** ئەوەی تەنها بە ئەندازەیەکی دیاری کراو (فَرْض) میرات دەبات، ئەمانەش حەوتن: ژن ومێرد، باپیر وداپیر، ودایك، وبرای دایکی وخوشکی دایکی.

---

(١) أخرجه أبو داود (٢٨٩٤)، وابن ماجه (٢٧٢٤)، والترمذي (٢١٠١)، قال الحافظ ابن حجر: «صححه ابن خزيمة وابن الجارود، وقوّاه ابن عديّ». «بلوغ المرام» رقم: (٨٩٦).

**بەشی دوەم:** ئەوەی تەنها بە تەعصیب -یانی: بیّ ئەندازەیەکی دیاری کراو- میرات دەبات، بریتین لە دوانزە: کوڕی وکوڕەکەی، برای دایك وباوکی وکوڕەکەی، وبرای باوکی وکوڕەکەی، ومامەی دایك وباوکی وکوڕەکەی، ومامەی باوکی وکوڕەکەی، وئازادکەری پیاو وژن.

**بەشی سێیەم:** ئەوەی کە هەندێك جار بە تەعصیب میرات دەبات وهەندێك جاریش بە ئەندازە، هەندێك جاریش بە هەردوکیان، ئەوانیش بریتین لە: باوك وباپیر.

**بەشی چوارەم:** ئەوەی کە هەندێك جار بە تەعصیب وهەندێك جاریش بە ئەندازە میرات دەبات، بەڵام پێکەوە نا، ئەوانیش بریتین لە: ئەوانەی نیوە دەبەن -جگە لە مێرد-، وئەوانەی دو لە سیّ دەبەن.

کەواتە ئەوانەی بە ئەندازە میرات دەبەن بیست ویەکن.

ئەو ئەندازەیەشی دیاری کراوە بۆ خاوەن ئەندازەکان شەشە، بریتیە لە: نیوە $\frac{1}{2}$ ، چوار یەك $\frac{1}{4}$ ، هەشت یەك $\frac{1}{8}$ ، دو لە سیّ $\frac{2}{3}$ ، سیّ یەك $\frac{1}{3}$ ، شەش یەك $\frac{1}{6}$ .

- **یەکەم:** ئەوانەش نیوە دەبەن، پێنجن:

١- **مێرد:** بە مەرجێك لقی میرات بەر نەبیّ نێر یان میّ، لەم مێردە بێت یان نا.

٢- **کچ:** بە مەرجێك تەنها بێت نە هاوبەش لە خوشك، نە تەعصیبکەر لە برای لەگەڵدا نەبێت.

٣- **کچی کوڕ:** بە مەرجێك نە هاوبەشی هەبێت، نە تەعصیبکەر، ونە لقی میرات بەر.

٤- **برای دایك وباوکی:** بە مەرجێك نە تەعصیبکەر هەبێت، نە هاوبەش، ونە لقی میرات بەر، ونە بنچینەی میرات بەر.

٥- **خوشکی باوکی:** بە مەرجێك نە تەعصیبکەر، ونە هاوبەش، ونە لقی میرات بەر، ونە بنچینەی میرات بەر، ونە برای دایك وباوکی ونە خوشکی دایك وباوکی هەبێت.

- **دوەم:** ئەوانەی چوار یەك دەبەن، ئەمانەش دوانن:

١- **مێرد:** بە مەرجێك لقی میرات بەر هەبێت.

٢- **هاوسەر:** بە مەرجێك لقی میرات بەر نەبێت.

- **سێیەم:** ئەوانەی هەشت یەك دەبەن، ئەمەش یەکێکە:

**هاوسەرێك** وزیاتر بە مەرجێك لقی میرات بەر هەبێت.

- **چوارەم:** ئەوانەی دو لە سێ دەبەن، ئەمانەش چوارن:

١- **کچان:** بە مەرجێك تەعصیبکەر نەبێت کە بریتیە لە کوڕی پشتی مردوەکە، هەروەها دوان وبەرەو سەرەوە بن، واتە: کۆ بن.

٢- **کچانی کوڕ:** بە مەرجێك تەعصیبکەر نەبێت کە بریتیە لە کوڕی کوڕ، هەروەها لقی میرات بەر نەبێت، هەروەها دوان وبەرەو سەرەوە بن.

٣- **خوشکی دایك وباوکی:** بە مەرجێك تەعصیبکەریان نەبێت کە بریتیە لە برای دایك وباوکی، هەروەها لقی میرات بەر نەبێت کە بریتیە لە منداڵ ومنداڵی کوڕ، هەروەها دوان وبەرەو سەرەوە بن.

٤- **خوشکانی باوك:** بە مەرجێك تەعصیبکەر، ولقی میرات بەر نەبێت، هەروەها دوان وبەرەو سەرەوە بن، هەروەها برای دایك وباوکی وخوشکی دایك وباوکی نەبێت.

- **پێنجەم:** ئەوانەی سێ یەك دەبەن، ئەمانەش دوانن:

١- **دایك:** بە مەرجێك لقی میرات بەر نەبێت، هەروەها کۆمەڵێك برا وخوشکی نەبێت.

٢- **برای دایکی:** بە مەرجێك لقی میرات بەری لە منداڵ ومنداڵی کوڕانی نەبێت، هەروەها دوان بەرەو سەرەوە بن، هەروەها بنچینەی میرات بەری نێر نەبێت کە باوك وباپیرە

● **شەشەم:** ئەوانەی شەش یەك دەبەن، ئەمانەش حەوتن:

١- **باوك:** بە مەرجێك لقی میرات بەر هەبێت لە منداڵ ومنداڵی کوڕان.

٢- **باپیر:** بە مەرجێك لقی میرات بەر هەبێت لە منداڵ ومنداڵی کوڕان.

٣- **دایك:** بە مەرجێك لقی میرات بەر هەبێت، هەروەها کۆمەڵێك برا هەبێت.

٤- **داپیر:** بە مەرجێك دایك نەبێت.

٥- **کچی کوڕ:** بە مەرجێك نە تەعصیبکەر، ونە لقی میرات بەری لە خۆی بەرزتر هەبێت جگە لە مێینەیەکی خاوەن نیوە، چونکە ئەم شەشیەك نابات مەگەر لەگەڵ ئەودا.

٦- **خوشکی باوکی:** بە مەرجێك تەعصیبکەر نەبێت کە براکەیەتی، هەروەها ئەبێت خوشکێکی دایك وباوکی لەگەڵدا بێت کە یەك لە شەش وەك ئەندازە دەبات.

٧- **برا وخوشکی دایکی:** بە مەرجێك لقی میرات بەر، وبنچینەی نێری میرات بەریش نەبێت، هەروەها ئەبێت تەنها بێت.

## پرسی پێنجەم: لە بارەی تەعصیبکردنەوە:

عەصەبە: ئەوانەن بەبێ ئەندازە میرات دەبەن، چونکە ئەگەر تەنها بکەوێت هەمو ماڵەکە دەبات، ئەگەریش خاوەن ئەندازەیەکی لەگەڵدا بێت هەرچی بمێنێتەوە دەیبات. لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا، فَمَا بَقِيَ

فَلِأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ» «یەکەم جار بەشی خاوەن ئەندازەکان بدەن، ئینجا چی مایەوە دەدرێتە لە پێشتریش نێرینە»[1]، یانی: نزیکرین پیاو.

عەصەبەش ئەبێتە سێ بەشەوە: هەر بە خۆی عەصەبەیە (عصبة بالنفس)، وعەصەبەیە بە جگە لە خۆی (عصبة بالغیر)، وعەصەبەیە لەگەڵ جگە لە خۆی (عصبة مع الغیر).

١- **عەصەبە بە خۆ:** بریتین لە کوڕ وکوڕەکەی وبەرەو خوارەوە، وباوك وباپیر لە دیوی باوکەوە وبەرەو سەرەوە، وبرای دایك وباوکی وبرای باوکی وکوڕەکانی هەردوکیان وبەرەو خوارەوە، ومامەی دایك وباوکی ومامەی باوکی وبەرەو سەرەوە ومندالّەکانیان وبەرەو خوارەوە، وئازادکەری نێر، وە مێ، جا کێ لەمانە تەنها بکەوێت هەمو ماڵەکە دەبات، ئەگەریش لەگەڵ خاوەن ئەندازەکاندا بون ئەوەی بمێنێتەوە دەیبەن، نەشمایەوە هیچ نابەن.

٢- **عەصەبە بە غەیر:** بریتین لە کچ، وکچی کوڕ، وخوشکی دایك وباوکی وخوشکی باوکی، هەر یەکەیان لەگەڵ براکەیدا ئەبێتە عەصەبە، کچی کوڕ زیاتر لەمە شێکی تریشی هەیە؛ کوڕی کوڕێکی هاو پلەی خۆی -واتە براکەی- بە ڕەهایی تەعصیبی دەکات، یان کوڕی مامەکەی وکوڕی کوڕەکەی کە لە خۆی خوارترە ئەگەر پێویستی پێکەوت. ئەم نێرینانەی لێ دەر بکە، ئەوانی تر خوشکەکانیان هیچ نابەن لەگەڵیاندا، وەك کوڕانی برا ومامەکان، وکوڕانی مام.

٣- **عەصەبە لەگەڵ غەیر:** بریتین لە: خوشکانی دایك وباوکی لەگەڵ کچان وکچانی کوڕدا.

(١) أخرجه البخاري (٦٧٣٢)، ومسلم (١٦١٥).

ئەگەریش دو عەصەبە وبەرەو سەرەوەمان هەبو، ئەگەر لە دیو وهێز وپلە (الجهة والقوة والدرجة)دا یەکسان بون، ئەوا میرات پێکەوە دەبەن، وەك کوڕان وبراکان، ئەگەریش لە دیودا یەکسان بون ئەوا بەهێزەکەیان پێش دەخرێ وەك کوڕ وباوك، ئەگەریش یەك دیویان هەبو بەڵام لە پلەدا جیاواز بون ئەوە نزیکترین پلە پێش دەخرێ، وەك کوڕ لەگەڵ کوڕی کوڕدا، ئەگەریش لە دیو وپلەدا یەکسان بون بەڵام لە هێزدا جیاواز بون ئەوا بەهێزتر پێش دەخرێ وەك برای دایك وباوکی لەگەڵ برای باوکی.

## پرسی شەشەم: بێ بەشکردن (الْحَجْبُ):

بێبەشکردن: بریتیە لە بێبەشکردن لە هەمو میرات یان هەندێکی بە هۆی بونی کەسێکی لەو لە پێشتر.

**ئەشبێتە دو بەشەوە:**

١- **بێ بەشکردنی وەسفی (حَجْبُ الأَوْصَاف)**: ئەمەش بەوەیە کەسەکە ڕێگریەك لە ڕێگریەکانی میراتی تێدا بێت کە بریتیە لە کۆیلایەتی وکوشتن وجیاوازی ئایین، جا هەر کەس یەکێك لەم وەسفانەی تێدا بێت میرات نابات وبونی وەك نەبونی وایە، ئەمەش ئەکرێ بە سەر هەمو میرات بەرەکاندا بێت.

٢- **بێ بەشکردنی کەسی (حَجْبُ الأَشْخَاص)**: کە بشوترێ بێبەشکردن وحەجب بیر بۆ ئەمە دەڕوات، ئەشبێتە دو بەشەوە:

**یەکەم**: بێبەشکردنی یەکجاری (حجب حرمان): بریتیە لە ڕێگری کردنی کەسێکی دیاری کراو بە یەکجاری، ئەمەش ئەکرێ بە سەر هەمو وەرەسەدا بێت جگە لە شەش کەس: باوك، ودایك، وکوڕ، وکچ، ومێرد، وژن.

**دووەم: بێبەشکردنی نوقسان:** ئەمەش بێبەش کردنیەتی لە بەشێکی زیاترە بۆ کەمتر. هۆکاری ئەم بێبەشکردنەش: بونی کەسێکی لەو شایستەترە، بۆیە پێی وتراوە بێبەشکردنی کەسی. ئەشبێتە حەوت بەشەوە:

١- گواستنەوە لە ئەندازەیەکەوە بۆ ئەندازەیەکی کەمتر لەوە، ئەمە دەرهەق ئەوانەیە دو ئەندازەیان هەیە، وەك ژن ومێرد، ودایك، وکچی کوڕ، وخوشکی باوکی.

٢- گواستنەوە لە ئەندازەیەکەوە بۆ تەعصیب، ئەمەش دەرهەق خاوەن نیوە ودو لە سێکانە، ئەگەر تەعصیبکەریان لەگەڵدا بو.

٣- گواستنەوە لە تەعصیبەوە بۆ فەرزێکی کەمتر، ئەمەش دەرهەق باوك وباپیر، لە میراتبردن بە تەعصیب دێن بۆ میراتبردن بە فەرز.

٤- گواستنەوە لە تەعصیبەوە بۆ تەعصیبێکی کەمتر. ئەمەش دەرهەق خوشکی دایك وباوکی یان خوشکی باوکیە، چونکە لەگەڵ براکەیاندا کەمتر لەوەیان بۆ هەیە کە لەگەڵ کچ وکچی کوڕدا هەیانە.

٥- قەرەبارغی لە ئەندازەیەك دا، وەك کۆبونەوەی دو ژن لە چوار یەك، یان چەند داپیرێك لە شەش یەك.

٦- قەرەبارغی لە تەعصیبدا، وەك کۆبونەوەی عەصەبەکان لە ماڵەکەدا یان لەوەی لە خاوەن ئەندازەکان ماوەتەوە.

٧- قەرەبارغی لە عەولدا[1] دەرهەق خاوەن ئەندازەکان ئەمەش لەو بنەمایانەی عەولی بە سەردا دێت.

---

(١) عەول: بریتیە لە زیادکردنی بەشی خاوەن ئەندازەکان، وکەمکردنەوەی ئەندازەی بەشەکانیان لە میرتدا.

بۆیە ئەڵێین: هەر کەس بە واسیتەی کەسێکەوە شۆڕ ببێتەوە (الإدلاء)[1]، ئەوا ئەو واسیتە بێ بەشی دەکات. وبنچینەکان هیچ بێبەشیان ناکات مەگەر خودی بنچینەکان. ولقەکان هیچ بێبەشیان ناکات مەگەر لقێکی لە خۆی بەرزتر. بەڵام پەراوێزەکانیش بنچینە ولق وپەراوێزەکان بێبەشیان دەکەن.

## پرسی حەوتەم: لە بارەی میراتی خزمانەوە:

ذَوُو الأرحام: هەمو ئەو خزمانەیە کە نە خاوەن ئەندازەیە ونە عەصەبەیە، ئەمانەش ئەبنە چوار بەشەوە:

١- ئەوانەی نەسەبیان دەگاتە مردوەکە، کە بریتین لە منداڵەکانی کچ ومنداڵەکانی کچی کوڕ وبەرەو خوارەوە.

٢- ئەوانەی مردو نەسەبی دەگاتەوە پێیان، کە بریتین لە باپیرە وداپیرە «بێ بەشەکان» وبەرەو سەرەوە.

٣- ئەوانەی نەسەبیان دەگاتەوە دایك وباوکی مردوەکە، کە بریتین لە منداڵەکانی خوشك وکچەکانی برا ومنداڵەکانی برای دایکی وئەوانەشی بەمان شۆڕ دەبنەوە، وبەرەو خوارەوە.

٤- ئەوانە دەگەنەوە باپیر وداپیری مردوەکە، کە بریتین لە مامەی دایکیی وخوشکی باوك (پور) بە ڕەهایی، وکچەکانی مامە بە ڕەهایی، ولالە (خاڵۆ)کان چەند دوریش بن، ومنداڵەکانیان، وبەرەو خوارەوە، بەڵگەی میرات بەرکەوتنیشیان، فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿وَأُولُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ﴾

---

(١) شۆڕبونەوە (الإدلاء): بریتیە لە پەیوەندی هەبون بە مردوەوە ئیتر ڕاستەوخۆ بێت بە خودی خۆ وەك باوك ودایك وکوڕ وکچ، یان ناڕاستەوخۆ وەك پەیوەندی کوڕی کوڕی بە کوڕەوە هەروەها کچی کوڕ بە کوڕەوە.

[الأنفال:٧٥] «وخزمان هەندێکیان لە پێشترین بە هەندێکی تریان لە میراتبردندا لە حوکمی خوادا». وقال ﷺ: «وَالْخَالُ وَارِثُ مَنْ لَا وَارِثَ لَهُ» «لالە میرات بەری ئەوەیە کە میرات بەری نیە»[1]. شێوازی میراتبردنەکەشیان ئەوەیە هەر یەکێکیان ئەخرێتە شوێن ئەوەی پێیدا شۆڕ بۆتەوە، وبەشی ئەوی پێ دەدرێت. خواش زاناترە[2].

(١) أخرجه أحمد (٢٨/١)، وأبو داود (٢٨٩٩)، والترمذي (٢١٠٣) وقال: «حديث حسن صحيح»، وصححه الشيخ الألباني «صحيح سنن الترمذي» (١٧٠٩).
(٢) بۆ چونێکی تر هەیە وهێزیشی تێدایە، ئەویش ئەوەیە کە میراتی بەر ناکەوێت. وەرگێڕ

# نۆیەم: بەشی هاوسەرگیری وتەڵاق دان

لە یانزە دەروازەش پێك هاتوە:

دەروازەی یەکەم: لە بارەی هاوسەرگیریەوە.

دەروازەی دوەم: لە بارەی مارەیی ومافەکانی هاوسەرگیری وپێویستیەکانی وخواردن دانی هاوسەرگیریەوە.

دەروازەی سێیەم: لە بارەی خولعەوە.

دەروازەی چوارەم: لە بارەی تەڵاق دانەوە.

دەروازەی پێنجەم: لە بارەی سوێندخواردنەوە.

دەروازەی شەشەم: لە بارەی زیهار کردنەوە.

دەروازەی حەوتەم: لە بارەی لەعنەت کردنەوە.

دەروازەی هەشتەم: لە بارەی عیددە وحیدادەوە

دەروازەی نۆیەم: لە بارەی شیر دانەوە

دەروازەی دەیەم: لە بارەی بەخێو کردن وحوکمەکانەوە.

دەروازەی یانزەیەم: لە بارەی بژێوی کێشانەوە

# دەروازەی یەكەم

# لە بارەی هاوسەرگیریەوە «النّكاح»

**چەند مەسەلەیەكی لە خۆ گرتوە:**

**پرسی یەكەم: پێناسەی نیكاح، وبەڵگەكانی شەرعی بونی:**

أ- **پێناسەی نیكاح:** «النكاح» لە زماندا: كۆ كردنەوە وگرتنە خۆ وچونە ناو یەكە، ئەوترێ: «تناكحت الأشجار= دارەكان نیكاحیان كرد»، ئەگەر هەندێكیان چونە ناو هەندێكی تریان، یان: «نكح المطر الأرض= باران نیكاحی زەوی كرد» ئەگەر تێكەڵی خاكەكەی بو.

ب- **بەڵگەكانی شەرعی بونی هاوسەرگیری:** بنەما لەمەڕ شەرعی بونی ژنهێنان: قورئان وفەرمودە وكۆ دەنگیە. جا زۆر ئایەت بەڵگەیە لە سەر شەرعی بونی هاوسەرگیری؛ لەوانە فەرمایشتەكەی خوای دانایە: ﴿فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ [النساء:٣] «ئەوا هاوسەرگیری بكەن لەگەڵ ئافرەتانی بەدەر لە هەتیوەكان: دوان یان سیان یان چوار، ئەگەریش ترسان دادگەر نەبن لە نێوانیان دا ئەوا تەنها یەك دانە بەسە یان كەنیزەكانتان بەسە». هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَأَنْكِحُوا الْأَيَامَى(١) مِنْكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ﴾ [النور:٣٢] «هاوسەر گیری بكەن -ئەی باوەڕداران- لەگەڵ ئەوانەتان هاوسەریان نیە لە ئازاد وكۆیلە وكەنیزەكە چاكەكانتان». هەروەها فەرمودەیەكی زۆریش، لەوانە: فەرمودەكەی ئیبن مەسعود ﷺ لە پەیامبەرەوە ﷺ: «يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ،

---

(١) الأيامى: كۆی «أَيم»ـە، ئەو پیاو وژنەیە كە هاوسەریان نیە. «النظم المستعذب» (١٢٦/٢).

وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ؛ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ» «ئەی گرۆی گەنجان! کێ لە ئێوە توانای ژنهێنانی هەبو با بیهێنێت یانی: خەرجی وتێچوی ژنهێنان، کێش نەیتوانی ئەوا با ڕۆژو بگرێت چونکە شەهوەتی کپ دەکاتەوە»[1]. هەروەها فەرمودەکەی مەعقیلی کوڕی یەسارە ﷺ، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الْأُمَمَ» «ئەو ئافرەتانە بخوازن کە ڕوخۆشن ومنداڵیان دەبێت، چونکە من لە دوا ڕۆژدا شانازی بە زۆریتانەوە دەکەم»[2].

موسڵمانانیش کۆکن لە سەر شەرعیەتی هاوسەرگیری.

## پرسی دوەم: حیکمەت لە شەرعی بونی هاوسەر گیری:

خوای دانا لە بەر زۆر حیکمەتی باڵا هاوسەرگیری شەرعکردوە، دەکرێ لەمانەی خوارەوە گردی بکەینەوە:

١- داوێن پاکی، چونکە خوای گەورە مرۆڤی دروستکردوە، وغەریزەی ڕەگەزی وتێدا داناوە، جا هاوسەر گیری داناوە بۆ پڕ کردنەوەی ئەو عەریزە وحەزە، وبۆ ئەوەی یاری پیێ نەکرێت.

٢- بەدیهاتنی ئارامی وهۆگری وئاسودەیی وڕاحەتی وئۆقرەیی لە نێوان ژن ومێرددا، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ [الروم:٢١] «ولە نیشانەکانی مەزنی دەسەڵات وتەواوی توانای خوا ئەوەیە: بۆ ئێوەی پیاوان هاوسەری دروستکردوە بۆ ئەوەی

(١) أخرجه البخاري (٥٠٦٦)، ومسلم (١٤٠٠)، والمراد بالصوم وجاء: أي قاطع لشهوة النكاح.
(٢) أخرجه أبو داود (٢٠٣٥)، والنسائي (٦٥١٦) وصححه الألباني، انظر: «صحيح النسائي» (٣٠٢٦).

دەرونتان ئاسودە بێت وئۆقرە بگرێت، ولە نێوان ئافرەت ومێردەکەیدا خۆشەویستی وسۆزی داناوە».

٣- پاراستنی وەچە ورەچەڵەك، وبەستنەوەی کەس وخزمەکان بە یەکترەوە.

٤- هێشتنەوەی وەچەی مرۆڤایەتی وزیاترکردنی ژمارەی موسڵمانان، بۆ تورەکردنی بێ باوەڕان وبلاوکردنەوەی دینی خوا.

٥- پارێزگاری کردن لە ڕەوشتەکان لە تێکچونی ودارمانی بۆ نێو چاڵی داوێن پیسی وپەیوەندیە گوماناویەکان.

## پرسی سێیەم: حوکمی هاوسەرگیری وهەڵبژاردنی هاوسەر:

### ١- حوکمی هاوسەرگیری:

حوکمی هاوسەرگیری لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت:

**یەکەم:** دەبێتە واجب ئەگەر کەسەکە لە خۆی ترسا توشی داوێن پیسی ببێت، وتوانای تێچون وخەرجیەکانی هاوسەرگیری هەبو، چونکە هاوسەر گیری ڕێگای داوێن پاکی وپاراستنێتی لە توش حەرام هاتن، ئەگەریش نەیتوانی ئەوا لە سەریەتی ڕۆژو بگرێت ویا داوێنی خۆی پاك بگرێت تا خوا بە فەزڵی خۆی بێنیازی دەکات.

**دوەم:** دەبێتە سوننەت ئەگەر کەسەکە شەهوەتی هەبو وتوانای خەرجی هاوسەرگیریشی هەبو بەڵام ترسی لە خۆی نیە توش داوێن پیسی ببێت، ئەمەش لە بەر گشتیەتی ئەو ئایەت وفەرمودانەی کە هاتون لە بارەی هاندان بۆ هاو سەر گیری هاتون.

**سێیەم:** ئەبێتە مەکروە، ئەگەر کەسەکە پێویستی پێ نەبو، وەك: (العِنِّين) ئەوەی نەتوانێت بچێتە لای ئافرەتان یان شەهوەتی بۆیان ناڕوات،، یان بە تەمەن بێت، یان نەخۆشێك کە شەهوەتی نەهێشتبو.

## ٢- هەڵبژاردنی هاوسەر وئەو شتانەی لە سەر ڕاوەستاوە:

سوننەتە ئافرەتێکی دیندار وداوێن پاك، وبنەچە وناوبانگ پاك، وجوان هەڵبژێرێت، لە بەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ، پەیامبەری خوا ﷺ: «تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَجَمَالِهَا، وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ» «ئافرەت لە بەر چوار شت هاوسەرگیری لەگەڵ دەکرێت: لەبەر ماڵەکەی، ولەبەر بنەماڵە ولەبەر بەناوبانگیەکەی، ولەبەر جوانیەکەی، ولەبەر دینەکەی، دیندارەکە هەڵبژێرن دەستت خۆڵاوی بێت»[1]. جا لە پلەی یەکەم سور دەبێت لە سەر دیندار، ئەمەش ئەکاتە بنەمای هەڵبژاردنەکەی نەك شتی تر، هەروەها سوننەتە ئافرەتێك بهێنێت منداڵی ببێت، لەبەر فەرمودەکەی ئەنەس ﷺ لە پەیامبەرەوە ﷺ فەرمویەتی: «تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ، إِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الْأَنْبِيَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ» «ئەو ئافرەتانە بخوازن کە ڕوخۆشن ومنداڵیان دەبێت، چونکە من لە دوا ڕۆژدا لە ناو پەیامبەران شانازی بە زۆریتانەوە دەکەم»[2]. سوننەتیشە کیژە عازەب بێت، لە بەر فەرمودەکەی جابر ﷺ کە پەیامبەری خوا ﷺ پێی فەرموە: «فَهَلَّا بِكْرًا تُلاعِبُها وتُلَاعِبُكَ» «ئەی بۆ کیژە عازەبێکت نەهێنا یاری لەگەڵدا بکەیت ویاریت لەگەڵدا بکات»[3]. مەگەر بەرژەوەندیەك هەبێت وا بکات بێوەژن هێنان چاکتر بێت، ئەو کاتە بێوەژن هێنان لە پێشترە، وجوان هەڵ دەبژێردرێت چونکە بۆ دڵ ودەرونی ئارام ترە، وبۆ چاوی پارێزرواو ترە، وزیاتر ئەبێتە مایەی خۆشویستنی.

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٥٠٩٠)، ومسلم (١٤٦٦). و«دەستت خۆڵاوی بێت»: یانی: دەستت هەژار بێت، وبە خۆڵەوە بنوسێت. ئەمەش ڕستەیەکە مەبەست پێی هاندانە نەك دوعا لێکردن.

(٢) أخرجه أحمد (١٢٦١٣، ١٣٥٦٩)، وصححه الألباني «الإرواء» (١٧٨٤).

(٣) متفق عليه: أخرجه البخاري (٥٠٧٩)، ومسلم (٧١٥).

## پرسی چوارەم: لە حوکمەکانی داواکردن، وئادابەکانی:

لە حوکم وئادابەکانی داواکاری:

١- حەرامە موسڵمان داوای ژن بکات بە سەر داوای براکەیدا کە وەڵامی داواکەی دراوەتەوە با بە ماناشەوە بێت، ودوەمیش بزانێت یەکەم وەڵام دراوەتەوە، ئەمەش لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «وَلَا يَخْطُبُ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَنْكِحَ أَوْ يَتْرُكَ» «وکابرا داواکاری ناکاتە سەر داواکاری براکەی هەتا پێی دەدرێت یان وازی لێ دەهێنێت»[(١)]. ئەمەش چونکە چونە پێشەوە بۆ داواکاری لەم کاتەدا کارەکە لە کەسی یەکەم تێك دەدات وڕقە بەرایەتیشی لێ دەبێتەوە.

٢- حەرامە بە ڕاشکاوانە داوای ئافرەتێك بکرێت لە عیددەدا بێت لە تەڵاقی بائن، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاءِ﴾ [البقرة: ٢٣٥] «وتاوانتان ناگات ئەی پیاوان ئەگەر بە ماناوە داوای هاو سەر گیری لەگەڵ ئەو ئافرەتانە بکەن کە مێردەکانیان مردوە یان تەڵاق دروان (تەڵاقی بائن) لە کاتی عیددەکەی دا». جا دروستە بۆی مانا بهێنێت، وەك بڵێ: حەزم دەکرد خوا ئافرەتێکی چاکی بۆ ئاسان بکردایەم، یان: ئەمەوێت ژن بهێنم، جا مادام فەرمایشتەکە تاوانی هەڵ گرت لە سەر ئەو کەسەی مانا ئەهێنێت بەڵگەیە لە سەر ئەوەی ڕاشکاوی دروست نیە، چونکە لەوانەیە سور بون لە سەر شو کردنەوە وای لێ بکات پێش تەواو بونی عیددەکەی بڵێ تەواو بوە. بەڵام ئەوەی لە عیددەی تەڵاقی ڕەجعی بێت، حەرامە بە ماناشەوە داوا بکرێت، چونکە حوکمی ژن وهاوسەرەکانی هەیە.

---

(١) أخرجه البخاري (٥١٤٤).

٣- هەر كەس ڕاوێژی پێ كرا لە بارەی داواكەرێك یان داواكراوێك واجبە لە سەری باسی ئەو چاكی وخراپیە بكات كە تێیاندا هەیە، ئەمەش نابێتە غەیبەت بەڵكو لەو دڵسۆزی ونەسیحەتەیە كە ئیسلام هانی بۆ لا داناوە.

٤- پێ دان ودیاری كردن (الخِطْبَة)[1] تەنها بەڵێنێكە بە هاوسەرگیری، ودەربڕینی حەزە بۆی، هاوسەرگیری نیە، بۆیە هەر یەك لە داواكەر وداواكراو بۆ یەكتر بە بێگانەیی دەمێننەوە.

## پرسی پێنجەم: حوكمی تەماشاكردنی داواكراو:

هەر كەس ویستی داوای ئافرەتێك بكات شەرعیە وسوننەتە تەماشای ئەوەی بكات عادەتەن دەر دەكەوێت، وەك دەم وچاوی ودەستەكانی وپێكانی، لەبەر فەرمودەكەی سەهلی كوڕی سەعد ﵁: «أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! جِئْتُ لِأَهَبَ لَكَ نَفْسِي، فَنَظَرَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَصَعَّدَ النَّظَرَ إِلَيْهَا وَصَوَّبَهُ، ثُمَّ طَأْطَأَ رَأْسَهُ» «ئافرەتێك هاتە خزمەتی پەیامبەر ﷺ وتی: ئەی پەیامبەری خوا! هاتوم خۆمم پێبەخشیوی، ئەویش تەماشای كرد وچاوی تێبڕی، پاشان لە شەرما سەری كردە خوار»[2]. هەروەها فەرمودەكەی ئەبو هورەیرەیە ﵁ ئەڵێ: لە خزمەت پەیامبەر بوم ﷺ پیاوێك هاتە خزمەتی وپێی وت كە ئافرەتێكی ئەنصاری هێناوە، ئەویش پێی فەرمو: «أَنَظَرْتَ إِلَيْهَا؟» «بینیوتە؟» وتی: نەخێر، فەرموی: «فَاذْهَبْ، فَانْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّ فِي أَعْيُنِ الْأَنْصَارِ شَيْئًا» «بڕۆ بیبینە، چونكە ئەنصاریەكان شتێك لە چاویاندا هەیە»[3]. هەروەها فەرمودەكەی جابرە ﵄، كە

---

(١) [ئەوەی كە بە نارەوا پێی دەوترێت: «شیر بایی بڕین»، بێگومان مارەیی نە بایی شیرەكەیە ونە كرێیەتی!].

(٢) أخرجه البخاري (٥٠٨٧)، ومسلم (١٤٢٥).

(٣) أخرجه مسلم (١٤٢٤). و«شتێك»: وتراوە: مەبەست پێی: بچوكیە، وتروایشە: شینایی.

پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «إِذَا خَطَبَ أَحَدُكُمُ الْمَرْأَةَ فَإِنِ اسْتَطَاعَ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى مَا يَدْعُوهُ إِلَى نِكَاحِهَا فَلْيَفْعَلْ» «ئەگەر کەسێکتان داوای ئافرەتێکی کرد، ئەگەر توانی تەماشای ئەوەی بکات هانی دەدات بۆ هاوسەرگیری کردن لەگەڵیدا ئەوا با بیکات» ئەڵێ: جا داوای ئافرەتێکم کرد، ئەوەبو خۆم بۆی دەشاردەوە، تا ئەوەم لێ بینی هانیدام هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەم»[1].

حیکمەتیش لەمەدا: تەماشا کردن ئەبێتە مایەی زیاتر خۆش ویستنی، هەروەها زیاتر بچێت دڵیەوە، ئەمەش ئەبێتە هۆی زیاتر هۆگری ودۆستایەتی وبەردەوامی خۆشەویستی نێوانیان، وەکو پەیامبەر ﷺ بە موغیرەی ﷺ فەرمو: «انْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّهُ أَحْرَى أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا» «تەماشای بکە، ئەوە ئەبێتە مایەی زیاتر ڕێك هاتن ودروست بونی خۆشەویستی»[2].

## پرسی شەشەم: مەرجەکانی هاوسەرگیری وپایەکانی:

### یەکەم: مەرجەکانی هاوسەر گیری:

ئەبێت لە هاوسەرگیریدا ئەم مەرجانە هەبێت:

١- دیاری بونی ژن ومێردەکە: جا گرێ بەستی هاوسەرگیری دروست نابێت لە سەر کەسێك بە بێ دیاری کردن، وەك بڵێت: «کچەکەی خۆمم لێ مارە کردی» ئەگەر زیاتر لە کچێکی هەبێت، یان بڵێ: «ئەوە لە کوڕەکەتم مارە کرد» ئەگەر زیاتر لە کوڕێکی هەبێت، بەڵکو ئەبێت بە ناو کوڕەکە دیاری بکات، وەك: فاتیمە وموحەممەد، یان بە سیفەت، وەك: گەورەکە، بچکۆلەکە.

---

(١) أخرجه أبو داود (٢٠٨٢)، وأحمد (٣/٣٣٤)، والحاكم (٢/١٦٥) وقال: «صحيح على شرط مسلم» وافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني «السلسلة الصحيحة» (٩٩).

(٢) أخرجه الترمذي (١٠٨٧) وحسنه، وابن ماجه (١٨٦٥)، وصححه الألباني «صحيح سنن الترمذي» (٨٦٨).

٢- ڕازی بونی ژن ومێردەکە بە یەکتر: جا هاوسەرگیری بە زۆر دروست نابێت، لەبەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «لَا تُنْكَحُ الْأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلَا تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ» «بێوەژن مارە ناکرێت تا خۆی فەرمان دەکات، کیژیش مارە ناکرێت تا داوای ئیزنی لێ نەکرێت»(١).

٣- کار بە دەستی لە هاوسەرگیریدا: جا کەس بۆی نیە گرێ بەستەکە گرێ بدات مەگەر کار بە دەستەکەی، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ» «هاوسەرگیری نیە مەگەر بە بونی کار بەدەستەکەی»(٢). مەرجیشە کار بە دەستەکە: پیاو، وپێگەیشتو، وژیر، وئازاد، ودادگەر بێت با بە ڕوکەشیش بێ.

٤- شایەتگرتن لە سەر گرێ بەستی هاوسەرگیری: جا هاوسەر گیری دروست نابێت مەگەر بە بونی دو شایەتی موسڵمان، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ وَشَاهِدَيْ عَدْلٍ، وَمَا كَانَ مِنْ نِكَاحٍ عَلَى غَيْرِ ذَلِكَ فَهُوَ بَاطِلٌ» «هاوسەر گیری نیە مەگەر بە بونی کار بە دەست ودو شاهیدی دادگەر، هەر هاوسەر گیریەك لە سەر جگە لەمە بێت ئەوا پوچە»(٣). تورمزی ئەڵێ: «ئیشی زانایان لە سەر ئەمەیە هەر لە سەردەمی هاوەڵانی پەیامبەرەوە ﷺ ودوای ئەوانیش لە شوێنەکەوتوان وجگە لەوانیش، وتویانە: هاوسەرگیری نیە بە بێ شایەت» بە مەرج گرتنی شایەتیش لە هاوسەر گیری دا ئیحتیات کردنە بۆ وەچە، نەوەك دوایی بدات لە ژێری.

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٥١٣٦)، ومسلم (١٤١٩).
(٢) أخرجه الترمذي (١١٠١)، وأبو داود (٢٠٨٥)، وابن ماجه (١٩٠٧، ١٩٠٨)، وصححه الشيخ الألباني «صحيح سنن ابن ماجه» (١٥٣٧، ١٥٣٨).
(٣) أخرجه ابن حبان في صحيحه (٤٠٧٥) [هذا لفظه]، وصححه ابن حزم في المحلى (٩/٤٦٥).

٥- بوك وزاواكە هیچ ڕێگریەكی هاوسەر گیریان تێدا نەبێت؛ ڕێگری ڕەچەڵەك یان هۆكار، وەك شیردان وژن وژن خوازی وجیاوازی ئایین، وهاوشێوەی ئەم هۆكارانە، وەك ئەوەی یەكێكیان لە ئیحرامدا بێت هی حەج یان وعومرە.

**دوەم: پایەکانی هاوسەرگیری:** ئەو پایانەی کە بون وڕاوەستانی هاوسەر گیری لە سەرە، ئەمانەیە:

١- هەر دو گرێ دەرەکە: کە بریتیە لەو ژن ومێردەی هیچ ڕێگریەكی هاوسەر گیریان تێدا نیە کە پێشتر باس کرا وئەوانەشی دواتر دێت لە باسی مەحرەمەکان.

٢- ئیجاب کردن: کە بریتیە لەو لەفزەی لە کار بە دەستەکەوە دەر دەچێت یان ئەوەی لە جێگەیەتی (وەکو بریکار)، بە لەفزی: بە شودان ویان بە هاوسەر کردن.

٣- قەبوڵ کردن: کە بریتیە لەو لەفزەی لە مێردەکەوە یان جێگر (بریکار)ەکەی دەر دەچێت، بە لەفزی: قەبوڵم کرد، یان: ڕازیم بەم هاوسەرگیریە.

وئەبێت ئیجاب کردن پێش قەبولکردن بێت.

## پرسی حەوتەم: مەحرەمەکان لە هاوسەرگیریدا:

مەحرەمەکان لە هاوسەرگیریدا دو بەشن: بەشێك مەحرەمی هەمیشەییە، وبەشێکیشی مەحرەمی کاتیە.

### بەشی یەکەم: مەحرەمە هەمیشەییەکان:

چواردە ئافرەت بۆ هەمیشە حەرامن، حەوتیان بە هۆی ڕەچەڵەکەوە حەرامن وحەفتی تریشیان بە هۆی هۆکار (سَبَب)ەوە، مەبەستیش لە هەمیشەیی ئەوەیە بۆ هەتا هەتایە دروست نیە هاوسەرگیری لەگەڵ بکرێت لە هەر حاڵ وبارێکدا بێت، ئەم حەرامێتیەش سێ هۆکاری هەیە: نزیکی، ژن وژن خوازی، وشیردان.

**یەکەم: ئەوانەی بە هۆی نزیکیەوە مەحرەمن:**

١- دایك، ودایکی دایك، ودایکی باوك. بنەچەی مرۆڤیشیان پێ دەوترێت.

٢- کچ، وکچی کچ، وکچی کوڕ. لقی مرۆڤیشیان پێ دەوترێت.

٣- خوشکی دایك وباوکی، یان باوکی، یان دایکی. لقی دایك وباوکیشیان پێ ئەوترێت.

٤- کچی خوشکی دایك وباوکی، وکچی برای باوکی، وکچی برای دایکی.

٥- کچی خوشکی دایك وباوکی، یان باوکی، یان دایکی.

٦- پور؛ خوشکی باوك، بە هەمان شێوە پوری باوك وپوری دایك. پێشیان دەوترێت لقەکانی باپیر وداپیر لە دیوی باوکەوە.

٧- پور؛ خوشکی دایك، بە هەمان شێوە پوری دایك وپوری باوك. پێشیان دەوترێت لقەکانی باپیر وداپیر لە دیوی دایکەوە.

ئەم ئافرەتانە دروست نیە هیچ کامیان مارە بکرێت بە هیچ شێوەیەك، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالَاتُكُمْ وَبَنَاتُ الْأَخِ وَبَنَاتُ الْأُخْتِ﴾ [النساء: ٢٣] «خوای دانا هاوسەرگیری کردنی لە سەرتان حەرام کردوە لەگەڵ: دایکانتان (داپیرانیش لە دیوی باوك یان دایکەوە دەگرێتەوە)، وکچەکانتان (وکچی منداڵ ورۆڵەکان وبەرەو خوارەش دەگرێتەوە)، وخوشکەکانتان لە دایك وباوکەوە بێت یان لە دایکەوە یان لە باوکەوە، هەروەها خوشکانی باوکان وباپیرانتان، هەروەها پورەکانتان؛ خوشکانی دایکان وداپیرانتان، هەروەها کچی براکانتان، هەروەها کچی خوشکەکانتان (منداڵەکانیشیان دەگرێتەوە)»

**دووەم: ئەوانەی بە هۆی ژن خوازیەوە مەحرەمن:**

وئەمانەی خوارەوەی پێ حەرام دەبێت:

١- ژنی باوك، بە هەمان شێوە ژنی باوکی باوك، وژنی باوکی دایك. پێشیان دەوترێت هاوسەری بنچینەکان. ئەمەش لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَلَا تَنْكِحُوا مَا نَكَحَ آَبَاؤُكُمْ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتًا وَسَاءَ سَبِيلًا﴾ [النساء:٢٢]. «وهاوسەرگیری مەکەن لەگەڵ ئەوانەی باوکانتان لەگەڵیاندا هاوسەرگیریان کردوە مەگەر پێشتر کردبێتتان لە سەردەمی نەفامیدا ئەوا لێتان ناگیرێت، ئەم هاوسەرگیریە شتێکی زۆر گەن وزۆر خراپە، وخواش تورە دەکات، بە ڕاستی کارێکی خراپ بو لە نەفامیدا دەتان کرد».

٢- هاوسەری کوڕ، وهاوسەری کوڕی کوڕ، وکوڕی کچیش، بە هەمان شێوە هاوسەری لقەکانی تریش. لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَحَلَائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلَابِكُمْ﴾ [النساء:٢٣]. «هەروەها حەرامە لە سەرتان هاوسەرگیری بکەن لەگەڵ ژنی کوڕە پشتیەکانتاندا (کوڕی شیریش دەگرێتە) ئەمەش هەر بە گرێ بەست کردن حەرام دەبێت».

٣- دایکی هاوسەر، بە هەمان شێوە هەمو بنچینەکانی لە ئافرەتان وەك دایکی دایکی هاوسەر، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ﴾ [النساء:٢٣] «هەروەها دایکانی هاوسەرەکانتان حەرامن لە سەرتان».

ئەم سیانە تەنها بە گرێ بەست کردن حەرام دەبن، ئیتر گواستبێتیەوە یان نا.

٤- کچی هاوسەر، کە پێی دەوترێت زڕکچ، جا ئەم، مەحرەمی مێردەکەی دایکیەتی، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَرَبَائِبُكُمُ اللَّاتِي فِي حُجُورِكُمْ مِنْ نِسَائِكُمُ اللَّاتِي دَخَلْتُمْ بِهِنَّ﴾ [النساء:٢٣] «هەروەها هاوسەرگیری حەرامە لەگەڵ کچانی ژنەکانتان کە لە خۆتان نین، کە زۆرجار لە ماڵی ئێوە ولە ژێر چاودێری خۆتان پەروەردە دەبن، بەڵام بەو مەرجەی جوت بوبێتن لەگەڵ دایکانیاندا». بۆ حەرامێتیش

مەرج نیە زڕکچەکە لە ماڵی مێردەکەی دایکیدا گەورە بو بێت، لە ئایەتەکەش بۆ زۆری هاتوە. جا ئەم کچە ئەبێتە مەحرەمی ئەو پیاوەی کە لەگەڵ دایکیدا هاوسەر گیری کردوە وجوت بوە، جا ئەگەر جوت نەبو بو لەگەڵیدا وەك ئەوەی دایکی تەڵاق دابێت یان مردبێت پێش گواستنەوە، ئەوا بۆی دروستە کچەکەی مارە بکات، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ [النساء:٢٣] «جا ئەگەر نەچوبونە لای دایکانیان وتەڵاقیانتان دابو، یان مردبو، ئەوا دروستە بۆتان هاوسەرگیری لەگەڵیاندا بکەن».

٥- لە سەر ئافرەت ئەمانە حەرامن: مێردی دایکی، ومێردی کچەکەی، وکوڕی مێردەکەی، وباوکی مێردەکەی.

**سێیەم: ئەوانەی بە هۆی شیردانەوە مەحرەمن:**

بە شیردان حەوت ئافرەت حەرام دەبن، قورئان باسی دوانی بۆ کردوین، سوننەتیش پێنجی تری خستۆتە پاڵیان.

**أ- ئەوانەی قورئان حەرامی کردون:**

١- دایکی شیری، کە ئەو ئافرەتەیە شیری پێداوی، دایکی ودایکی دایکی ودایکی باوکیشی دەگرێتەوە.

٢- خوشکی شیری، کە ئەو ئافرەتەیە شیری دایکتی خواردوە، یان تۆ شیری دایکیت خواردوە، یان تۆ وئەو شیری یەك ئافرەتتان خواردوە، یان شیری هاوسەرەکەی باوکیت خواردوە، یان ئەو شیری هاوسەرەکەی باوکتی خواردوە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ مِنَ الرَّضَاعَةِ﴾ [النساء:٢٣]. «ودایکانتان کە شیریان پێتان داوە، هەروەها خوشکانی شیریتان».

**ب- ئەوانەی فەرمودەی پیرۆز حەرامی کردون:**

١- کچی شیری کوڕ.

٢- کچی شیری خوشك.

٣- خوشکی شیری باوك، ئەوەی کە لەگەڵ باوکتدا شیری خواردوە.

٤- خوشکی شیری دایك، ئەوەی کە لەگەڵ دایکتدا شیری خواردوە.

٥- کچی شیری، ئەوەی کە شیری ژنەکەتی خواردوە، جا پیاوەکە ئەبێتە باوکی شیری ئەو.

بەڵگەی حەرام بونی ئەمانەش لە سوننەتدا، فەرمودەکەی عائیشەیە ﵂، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «إِنَّ الرَّضَاعَةَ تُحَرِّمُ مَا تُحَرِّمُ الْوِلَادَةُ» «شیر ئەوە حەرام دەکات کە لە دایکبون حەرامی دەکات»[1]. هەروەها فەرمودەکەی ئیبن عەبباس ﵄، کە پەیامبەری خوا ﷺ لە بارەی کچەکەی حەمزەوە ﵄ فەرمویەتی: «إِنَّهَا لَا تَحِلُّ لِي، إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، وَيَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ الرَّحِمِ» «ئەو بۆ من حەڵاڵ نیە، ئەو کچی برای شیریمە، بە شیریش ئەوە حەرام دەبێت کە بە پشت حەرام بوە»[2].

## پرسی دوەم: ئەوانەی مەحرەمن بۆ ماوەیەکی دیاری کراو، بە هۆی هۆکارێکەوە کە نامێنێت:

چەندین ئافرەت بۆ ماوەیەکی کاتی حەرام دەبن، ئەکرێ بکرێنە دو جۆرەوە:

جۆری یەکەم: ئەوەی حەرامە بە هۆی کۆکردنەوەوە.

جۆری دوەم: ئەوەی حەرامیەکەی بە هۆی پێشهاتێکەوەیە.

(١) أخرجه البخاري (٥٠٩٩)، ومسلم (١٤٤٤).

(٢) أخرجه البخاري (٥١٠٠)، ومسلم (١٤٤٧) واللفظ لمسلم.

## جۆری یەکەم: ئەوەی حەرامە بە هۆی کۆکردنەوەوە:

١ - کۆکردنەوەی نێوان دو خوشك، ئیتر لە پشتەوە یان لە شیریەوە، هاوسەرگیری لەگەڵ هەردوکیاندا پێکەوە کردبێت یا بە جیا، لە بەر فەرمایشتەکەی خوا: ﴿وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ﴾ [النساء:٢٣] «هەروەها حەرامە دو خوشك پێکەوە کۆ بکەنەوە».

٢ - کۆ کردنەوەی نێوان ئافرەتێك وخوشکی باوکی، وئافرەتێك وخوشکی دایکی، وئافرەتێك وکچی خوشکەکەی، وئافرتێك وکچی براکەی، وئافرەتێك وکچی کوڕەکەی، وئافرەتێك وکچی کچەکەی.

یاساکەش لێرەدا ئەوەیە: کۆکردنەوە حەرامە لە نێوان هەمو دو ئافرەتێکدا ئەگەر گریمانە یەکێکیان بکەیتە نێرینە ئەوا بۆی دروست نیە هاوسەرگیری لەگەڵ ئەوی تردا بکات. بەڵگەی ئەمەش فەرمودەکەی ئەبو هورەیرەیە ﷺ، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «لَا يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَلَا بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا» «ئافرەت وخوشکەکەی باوکی، وئافرەت وخوشکەکەی دایکی کۆ ناکرێتەوە»(١). هەروەها فەرمودەکەی ئەبو هورەیرەیە ﷺ، ئەڵێ: «پەیامبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتدا بکرێت بە سەر خوشکی باوکەکەی، هەروەها خوشکی باوك بە سەر کچی براکەیدا، هەروەها ئافرەت بە سەر خوشکی دایکیدا، وخوشکی دایکیش بە سەر کچی خوشکەکەیدا، هەروەها خوشکی گەورە ناهێنرێت بە سەر خوشکی بچوکدا، وبچوکیش ناهێنرێت بە سەر خوشکی گەورەدا»(٢). وەکو چۆن زانایانیش کۆکن لە سەر ئەم حەرام بونە.

---

(١) أخرجه البخاري (٥١٠٩)، ومسلم (١٤٠٨).

(٢) أخرجه أبو داود (٢٠٦٥)، والنسائي (٦/٩٦)، والترمذي (١١٢٦)، وقال: «حسن صحيح». وصححه الشيخ الألباني «الإرواء» (٦/٢٩٠).

## جۆری دوەم: ئەوەی بە هۆی پێشهاتێکەوە حەرامە:

١- حەرامە ئافرەتێك بخوازرێت کە لە عیددەی پیاوێکی ترە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَلَا تَعْزِمُوا عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ﴾ [البقرة:٢٣٥]. «وجەخت لە گرێ بەستی هاوسەرگیری مەکەنەوە لە کاتی عیددەدا تا ماوەکەی تەواو دەبێت».

٢- حەرامە ئافرەتێك مارە بکات کە سێ جار تەڵاقی داوە مەگەر مێردێکی تر لەگەڵیدا جوت ببێت بە گرێ بەستێکی دروست، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا: ﴿فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ﴾ [البقرة: ٢٣٠]. «جا ئەگەر پیاوەکە بۆ جاری سێ یەم ژنەکەی خۆی تەڵاقدا، ئەوا بۆی حەڵاڵ نابێتەوە مەگەر ئەو ئافرەتە شو بە پیاوێکی تر بکاتەوە بە گرێ بەستێکی دروست ولەگەڵیدا جوت ببێت، وهاوسەر گیریەکە بە حەزی هەر دو لا بێت نەك بە نیەتی حەڵاڵ کردنی ئافرەتەکە بۆ پیاوی یەکەمی».

٣- حەرامە ئافرەت لە ئیحرامدا مارە بکرێت تا خۆی لە ئیحرام دەکاتەوە، لەبەر فەرمودەکەی عوسمان ﷺ، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «لَا يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ، وَلَا يُنْكِحُ، وَلَا يَخْطُبُ» «لە ئیحرام ژن ناهێنێت، وئافرەتیش بە شو نادات، وداواشی ناکات»(١).

٤- حەرامە کافر ئافرەتی موسڵمانان بخوازێت، لە بەر فەرمایشتەکەی خوای دانا: ﴿وَلَا تُنْكِحُوا الْمُشْرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُوا﴾ [البقرة:٢٢١] «وئافرەتە باوەڕدارەکانتان ئازاد بون یان کەنیزەك مەدەن بە بێ باوەڕان تا بڕوا دەهێنن ودەبنە موسڵمان».

---

(١) أخرجه مسلم (١٤٠٩).

٥- حەرامە موسڵمان ئافرەتی کافر بهێنێت مەگەر لە خاوەن کتێبەکان، ئەوە بۆی دروستە بیخوازێت، لەبەر ئایەتی: ﴿وَلَا تَنْكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ﴾ [البقرة:٢٢١]، «وئافرەتی موسڵمان مەدەن بە هاوبەشدانەران تا باوەڕ دەهێنن»، وفەرمایشتی: ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ﴾ [المائدة: ٥] «وله تەواوکردنی نیعمەت وبەخششەکانی خوا بە سەرتانەوە ئەوەیە: ... ئەی باوەڕداران خواستنی ئافرەتانی خاوەن کتێبەکانی پێش خۆتانی بۆ حەڵاڵ کردون کە ئازاد وداوێن پاکن».

٦- حەرامە موسڵمانی ئازاد، کەنیزەکی موسڵمان بخوازێت مەگەر لە خۆی بترسێ زینا بکات، وتوانای مارەیی ئافرەتێکی ئازاد یان نرخی کڕینی کەنیزەکیشی نەبێت، ئەمەش لە بەر فەرمایشتەکەی خوا: ﴿وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ مِنْكُمْ طَوْلًا أَنْ يَنْكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِنْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ مِنْ فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ﴾ [النساء: ٢٥] «کامیشتان توانای مارەیی ئافرەتی ئازادی باوەڕداری نەبو ئەوا بۆی هەیە ئەوانی تر بخوازێت لە لە کەنیزەکەکان، خواش زانایە بە ڕاستی باوەڕەکەتان» تا ئەوەی ئەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنْكُمْ﴾ [النساء: ٢٥] «ئەمەی بۆتان حەڵاڵکرا لە خواستنی کەنیزەك ئەو کاتەیە بترسێ توشی زینا ببێت، وقورسە لە سەری خۆ گرتنەوە لە جوت بون».

٧- حەرامە لە سەر کۆیلەی موسڵمان خاوەنە ئافرەتەکەی خۆی بخوازێت، چونکە زانایان کۆکن لە سەر ئەمە، هەروەها ناکرێت هەم کۆیلەی بێت وهەم مێردی بێت.

٨- حەرامە لە سەر خاوەن کۆیلە، کەنیزەکەکەی بخوازێت، چونکە گرێ بەستی خاوەنداریەتی بە هێزترە لە گرێ بەستی هاوسەرگیری.

## پرسی هەشتەم: حوکمی خواستنی ئافرەتانی خاوەن کتێب:

ئیسلام خواستنی ئافرەتانی ئازادی خاوەن کتێبی حەڵاڵ کردوە، لەبەر فەرمایشتی: ﴿الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ [المائدة: ٥] «ولە تەواوکردنی نیعمەت وبەخششەکانی خوا بە سەرتانەوە ئەوەیە -ئەی باوەڕداران- ڕێگەی داوە بە حەڵاڵ وپاك بۆتان، هەروەها سەر بڕینەکانی جولەکە وگاورەکانی بۆ حەڵاڵ کردون -ئەگەر بە گوێرەی شەرعی خۆیان سەریان بڕی- وسەر بڕاوی ئێوەش حەڵاڵە بۆ ئەوان، هەروەها خواستنی ئافرەتانی باوەڕداری ئازادی داوێن پاکی بۆ حەڵاڵ کردون بە هەمان شێوە خواستنی ئافرەتانی خاوەن کتێبەکانی پێش خۆتان کە ئازاد وداوێن پاك بن».

زانایانیش کۆکن لە سەر دروستێتی هاوسەرگیری کردن لەگەڵ ئافرەتانی خاوەن کتێب.

مەبەستیش لە خاوەن کتێبەکان کە دروستە هاوسەرگیریان لەگەڵدا بکرێت: ئەوانەن خاوەنی تەورات یا ئینجیلن، ئەمەش لە بەر فەرمایشتەکەی خوا: ﴿أَنْ تَقُولُوا إِنَّمَا أُنْزِلَ الْكِتَابُ عَلَى طَائِفَتَيْنِ مِنْ قَبْلِنَا﴾ [الأنعام: ١٥٦] «وئەم قورئانەمان دابەزاندوە، بۆ ئەوەی -ئەی عەرەبە بێ باوەڕەکان- نەڵێن: کتێب لە ئاسمانەوە تەنها بۆ جولەکە وگاور دابەزیوە».

# دەروازەی دوەم

# مارەیی، وماف وواجبەکانی هاوسەرگیری، وخواردن دانی گواستنەوە

## «الصَّدَاقُ، وحُقُوقُ الزَّوَاجِ، وَوَاجِبَاتُه، وَوَلِيمَةُ العُرْسِ»

چەند مەسەلەیەکی تێدایە:

### پرسی یەکەم: پێناسەی مارەیی، شەرعی بونی، وحیکمەت لێی:

**أ- پێناسەی «الصداق»:**

لە زماندا: لە «صدق=ڕاست»ەوە وەرگیراوە، دژی درۆ.

لە شەرعیشدا: بریتیە لەو ماڵەی کە واجبە لە سەر مێرد بیدات بە هاوسەرەکەی، بە هۆی گرێ بەستی هاوسەرگیریەوە.

پێشی وتراوە «صَداق=ڕاست» لە بەر ڕاستێتی ڕەغبەت وحەزی بەخشەرەکەی بۆ هاوسەرگیری، هەروەها «الْمهر» و«النِّحلة» و«العُقْر»یشی پێ دەڵێن.

**ب- شەرعی بونی:**

بنەما لە بارەی شەرعی بونیەوە قورئان وفەرمودە وکۆ دەنگیە وەك ڕون دەکرێتەوە لە باسی حوکمی مارەیی.

ج- **حوکمەکەی:** پێویستە لە سەر مێرد ماڵێك ببەخشێت لەگەڵ تەواو بونی گرێبەستەکەدا، ودروستیش نیە ئەو مافە بخرێت، بە بەڵگەی فەرمایشتی: ﴿وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً﴾ [النساء:٤] «ومارەیی ئافرەتان بدەن، پێدانێك کە فەرز واجبە بە دڵێکی ڕازیەوە»، هەروەها فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ

مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً﴾ [النساء:٢٤] «ئەوانەی چێژیان لیٚ دەبینن بە هاوسەر گیریەکی دروست ئەوا مارەییەکانیان بدەن کە خوا فەرزی کردوە لە سەرتان»، هەروەها خوا ئەفەرموێ: ﴿لَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِنْ طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً﴾ [البقرة:٢٣٦] «ئەی مێردەکان تاوانتان ناگات ئەگەر ئافرەتان تەڵاق بدەن دوای گرێبەست لەگەڵ کردن وپێش جوت بون یان دیاری کردنی مارەیی». هەروەها لەبەر فەرمودەکەی سەهلی کوڕی سەعد ﵁، ئەڵیٚ: «ئافرەتێك هاتە خزمەتی پەیامبەر وتی: من خۆم بەخشیوەتە خوا وپەیامبەرەکەی، پەیامبەریش ﷺ فەرموی: هیچ پێویستیەکم بە ئافرەتان نیە، پیاوێك وتی: لە من مارەی بکە، فەرموی: کراسێکی پیٚ ببەخشە... تا کۆتایی فەرمودەکە»[1]. هەروەها فەرمودەکەی ئەنەسی کوڕی مالکە ﵁: «کە پەیامبەری خوا ﷺ شوێنەواری زەعفەرانی بە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە بینیوە، پێی فەرموە: چیەوە وچیت کردوە؟ وتی: ئەی پەیامبەری خوا! ژنم هێناوە، فەرموی: چیت کردە مارەییەکەی؟ وتی: کێشی ناوکێك لە زێڕ، فەرموی: سا خوا بەرەکەت وفەڕداری بکات بۆت، خواردن بدە ئەگەر بە شەکێکیش بوە»[2]. موسڵمانانیش کۆکن لە سەر شەرعی بونی مارەیی لە هاوسەرگیریدا.

## پرسی دوەم: ئەندازەکەی وحیکمەتەکەیی وناو لیٚ نانەکەی:

أ- **ئەندازەی مارەیی:** سنورێك نیە نە بۆ کەمترین نە بۆ زۆرترین مارەیی، جا هەر چی دروست بێت ببێتە نرخ یان کریٚ دروست ئەبێت ببێتە مارەیی، لەبەر

---

(١) أخرجه البخاري (٥١٤٩)، ومسلم (١٤٢٥).

(٢) أخرجه البخاري (٥١٥٣)، ومسلم (١٤٢٧).

فەرمایشتەکەی خوا: ﴿وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَلِكُمْ أَنْ تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُمْ﴾ [النساء: ٢٤] «وبۆتان حەلاَلە هاوسەرگیری بکەن لەگەڵ جگە لەوانەی باس کران، لەوانەی خوا بۆی حەلاَڵ کردون، کە بە ماڵەکانتان خواز بێنی بکەن ومەبەستتان داوێن پاکی بێت»، دەبینی بە ڕەهایی باسی ماڵی کرد وئەندازەیەکی بۆ دیاری نەکرد، هەروەها لەبەر فەرمودەی سەهلی کوڕی سەعدی ﷺ پێشو کە تێیدا هاتوە پەیامبەری خوا ﷺ لە بارەی ئافرەتە خۆ بەخشەکەوە فەرموی: «پێی ببەخشە ئەگەر کلوانکەیەکی ئاسنینیش بوە». ئەمەشە بەڵگەیە لە سەر دروستێتی کەمترین شتێك ماڵی پیٚ بوترێت. سەبارەت بە بەڵگەی ئەوەی دروستە ئەگەر زۆریش بێت، فەرمایشتەکەی خوایە: ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنْطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا﴾ [النساء:٢٠] «ئەگەریش ویستتان هاوسەرێك بخەنە شوێن یەکێکی تر، بەوەی: ئەتانەوێت تەلاَقی بدەن، وپێشتر مارەیی زۆرتان داوە، ئەوا بۆتان حەلاَڵ نیە هیچی لیٚ دا بشکێنن، ئەیبەن بە درۆ وبوهتانێکی ئاشکرا!؟».

## ب- حیکمەت لە شەرعی بونی مارەیی:

حیکمەت لە شەرعی بونی مارەیی بریتیە لە دەرخستنی ڕەغبەتی مێرد لە تێکەڵی کردنێکی شەریفانە لەگەڵ هاوسەرەکەی، وەکو چۆن سەربەرزی تێدایە بۆ ئافرەت وڕێزێکە بۆی، وای لیٚ دەکات بتوانێت ئامادەی هاوسەرگیری بێت بەو شتانەی پێویستی پێیەتی لە کەل وپەل وبژێوی.

## ج- حیکمەت لەوەی مارەیی لە دەست پیاوە:

ئیسلام مارەیی لە سەر پیاو داناوە چونکە ئەیەوێت ئافرەت بپارێزێت لەوەی کەرامەتی سوك ببێت بە کۆکردنەوەی پارە تا بیداتە مارەیی پیاو، هەروەها ئەمە

لەگەڵ ئەو بنەما تەشریعیەش یەك دەگرێتەوە کە پیاو تەکلیف لێکراوە بە واجبەکانی خەرجی کێشان وبژێوی دان، نەك ئافرەت.

د- **خاوەندارێتی مارەیی:** مارەیی موڵکی هاوسەرە بە تەنها، مافی کەس لە کار بە دەستەکانی وی تێدا نیە، ئەگەرچی مافی گرتنەوەیان هەیە ئەویش دەیگرنەوە بۆ ئەو وبۆ خاوەندارێتی ئەو، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَإِنْ طِبْنَ لَكُمْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيئًا مَرِيئًا﴾ [النساء:٤] «وئەگەر ئافرەتان بە دڵێکی ڕازیەوە خۆیان شتێکیان لە مارەیی پیٚ بەخشین ئەوە بیبەن وەهەڵس وکەوتی تەواوی پێوە بکەن، ئەوا حەلاڵ وپاکە»، هەروەها ئەفەرمویێت: ﴿فَلَا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا﴾ [النساء:٢٠].

ه- **دیاری کردنی مارەیی لە گرێبستەکەدا:** سوننەتە لە گریٚ بەستەکەدا مارەیی ناو بنرێت ودیاری بکرێت، چونکە پەیامبەری خوا هیچ گریٚ بەستێك نەبوە مارەیی تێدا دیاری نەکرابێت، هەروەها لە دیاری کردنیدا کێشە ودوبەرەکی لە نێوان ژن ومێرددا ناهێڵێت.

**و- مەرجەکانی مارەیی، وئەوەی ئەبێتە مارەیی وئەوەشی نابێت:**

١- ئەبێت ماڵێکی نرخدار وحەلاڵ بێت، لەوانەی دروست بێت خاوەندارێتی بکرێت وبفرۆشرێت وکەڵکی لیٚ وەر بگیرێت، جا دروست نیە بە مەی وبەراز وماڵی زەوتکراو هەر دو لاش پیٚی بزانن.

٢- ئەبێت فریودانی تێدا نەبێت، بەوەی زانراو ودیاری کراو بێت، جا دروست نیە بە نەزانراو وەك ماڵێکی دیاری نەکراو، یان ئاژەڵێك بە ڕەهایی، یان بەرهەمی دارەکانی، یان هی ئەم ساڵ وهاوشێوەی ئەمانە. لە سەر ئەمەش بێت مارەیی

دروست ئەبێت بە هەر شتێك بكرێت نرخ یان كرێ بێت، لە زات وخودی شتێك بێت یان قەرز یان سودێكی زانراو.

ز- **پێشخستنی مارەیی ودواخستنی:** دروستە مارەیی پێش بخرێت ودروستیشە دوا بخرێت، بە گوێرەی دابونەریتی خەڵك، بە مەرجێك دواخستنەكە نەزانراو نەبێت نەزانینێكی گەن، هەروەها ماوەكە زۆر دور نەبێت، چونكە ئەوە گومانی كەوتنی مارەییەكەی لێ دەكرێت.

## پرسی سێیەم: حوکمی مارەیی زۆر دانان:

سوننەتە مارەیی زۆر دانەنرێت لە بەر ئەمانەی خوارەوە:

١- فەرمودەكەی عائیشە ﵂، لە پەیامبەرەوە ﷺ فەرمویەتی: «مِنْ يُمْنِ الْمَرْأَةِ تَسْهِيلُ أَمْرِهَا وَقِلَّةُ صَدَاقِهَا» «لە بەركەت وفەرِداری ئافرەت: ئاسان بە شودانێتی، وكەمی مارەییەكەیەتی»[1].

٢- لە عومەرەوە ﵁ ئەڵێ: «وریا بن! مارەیی زۆر دامەنێن، ئەگەر رِێز بوایە لە دونیا یان تەقوا بوایە لە لای خوا، ئەوا پەیامبەر ﷺ لە پێشتر بو پێی؛ پەیامبەر ﷺ هیچ هاوسەرێكی وهیچ كام لە كچەكانیشی لە دوانزە وەقە زیاتری بۆ دانەناون، كابرا جاری وا هەیە مارەیی زیاتر دەدات، رِقی لە دڵ دروست دەكات بەرامبەر ژنەكەی، تا ئەڵێ: لەبەر تۆ زۆرم كێشا تەنانەت پەتی مەشكەشم تەحەمول كرد»[2].

---

(١) أخرجه ابن حبان (٤٠٩٥)، والحاكم (١٨١/٢)، وصححه على شرط مسلم، وحسنه الألباني (انظر. «الضعيفة» (٢٤٤/٣).

(٢) أخرجه أبو داود (٢١٠٦)، وأحمد (٤٠/١)، والترمذي (١١١٤)، وابن ماجه (١٨٨٧)، وقال الألباني: حسن صحيح. «صحيح الترمذي» (١٥٣٢). [«كَلِفْتُ فيك عَلَقَ القِرْبة»] و«عَلَق»ی مەشكە: بریتیە لەو پەتەی پێی هەڵدەواسرێ، مەبەستەكەش: لە پێناوی تۆ تەحەمولی هەمو شتێكم كردوە تەنانەت پەتی مەشكەش. بە رِائیش دەگێردرێتەوە «عَرَق».

٣- وله ئەبو سەلەمەوە، ئەڵێ: «پرسیارم کرد له عائیشه له بارەی مارەیی پەیامبەرەوە ﷺ؟ وتی: دوانزە وەقە ونەششێك بو. وتی: دەزانی نەش چیە؟ وتم: نازانم. وتی: نیو وەقەیە»[1].

## پرسی چوارەم: مافەکانی هاوسەر:

ئەگەر گرێ بەستی هاوسەرگیری دروست بێت زۆر مافی له نێوان ژن ومێردی لێ دەکەوێتەوە، که ئەمانەیە:

### یەکەم: مافەکانی هاوسەر:

هاوسەر بە سەر مێردەکەی خۆیەوە کۆمەڵێك مافی دارایی هەیە وەك مارەیی وبژێوی، وکۆمەڵێك مافی مەعنەوی نادارایی وەك دادگەریی وچاك تێکەڵی کردن، وخۆش مامەڵە کردن، وردەکاریەکەشی بەم شێوازەیەی خوارەوەیە:

١- مارەیی: ئەمەش مافی هاوسەرە بە سەر مێردەکەیەوە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً﴾ [النساء:٤] بەڵگەکانی تریش کە باس کرا.

٢- خەرجی وبەرگ ونیشتەجێ: جا پێویستە لە سەر مێرد بۆی فەراهەم بکات، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ [البقرة:٢٣٣] «وله سەر دایکانە شیر بدەن بە منداڵەکانیان بۆ ماوەی دو ساڵی تەواو بۆ ئەوانەی ئەیانەوێت بە تەواوی شیر بدەن، پێویستیشە لە سەر باوکان خەرجی شیردەرە تەلاقدراوەکان بکێشن لە خواردن وبەرگ بە شێوەیەك شەرع ونەریت پێی چاکە»، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى

(١) أخرجه مسلم (١٤٢٦).

بَعْضٍ وَبِمَا أَنْفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ﴾ [النساء:٣٤] «پیاوان بەڕێوەبەرن بە سەر ئاراستەكردنی ئافرەتان بە هۆی ئەو تایبەتمەندیانەی خوا تایبەتی كردون بە بەڕێوبەرێتی وفەزڵدان، هەروەها ئەو خەرجیەی دەیكێشن لە مارەیی وبژێویی دان». ولەبەر فەرمودەكەی حەكیمی كوڕی موعاویەی قوشەیری لە باوكیەوە ﷺ، ئەڵێ: «وتم ئەی پەیامبەری خوا! چی مافی هاوسەرە؟ فەرموی: «أَنْ تُطْعِمَهَا إِذَا طَعِمْتَ، وَتَكْسُوَهَا إِذَا اكْتَسَيْتَ» «كە پێویستی بو خواردنی بۆ دابین بكەیت، وكەل وپەلی بۆ بكەیت كەی داوای كرد»[1]. ولەبەر فەرمودەكەی جابر ﷺ لە بارەی وتارەكەی پەیامبەرەوە ﷺ تێیدا هاتوە: «وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ، وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ» «مافی ئەوانە بە سەرتانەوە بژێوی وبەرگیان بۆ دابین بكەن بە چاكی»[2].

٣- داوێن پاك ڕاگرتنی هاوسەر بە جوت بون لە گەڵیدا، وەكو ڕەچاو كردنی مافی ئەو وبەرژەوەندی وی لە شو كردن دا، لەبەر گشتێتی فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ﴾ [البقرة:٢٢٢] «جا ئەگەر پاك بونەوە ئەوا لەو شوێنەی خوا فەرمانی پێكردون بڕۆنە لایان». هەروەها فەرمایشتی: ﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾ [البقرة:٢٢٣] «ژنەكانتان شوێنی كێڵگەی ئێوەن، تۆوی خۆتان لە دامێنیان دادەنێن، كە بە ویستی خوا منداڵ بەرهەم دەهێنێت، جا لەو شوێنەی بەرهەم دارە چۆنتان ویست جوت بن لەگەڵیاندا». هەروەها لەبەر فەرمودەكەی پەیامبەری خوا ﷺ: «وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ» «ولە جوت بونتان لەگەڵ هاو سەرەكانتاندا صەدەقە هەیە»[3].

---

(١) أخرجه أبو داود (٢١٤٢)، وأحمد (٤٤٧/٤)، والحاكم (١٨٧/٢) وصححه، والألباني «الإرواء»
(٢) أخرجه مسلم (١٢١٨).
(٣) أخرجه مسلم (١٠٠٦).

٤- باش تێکەڵاوی کردن ومامەڵە لەگەڵ کردنی بە چاکی: لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ [النساء:١٩] «وبە چاکی تێکەڵاویان لەگەڵدا بکەن». جا ڕەوشت جوان دەبێت لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، نەرم وخۆڕاگر دەبێت لەوەی لێی دەوەشێتەوە، گومانی چاکی پێ ببات. پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «خَيْرُكم خَيْرُكم لِأَهْلِه» «باشترینتان باشترینتانە بۆ هاوسەرەکەی»[1].

٥- دادگەر بێت لە نێوان هاوسەرەکانی دا لە مانەوە وخەرجی دا، ئەگەر زیاتر لە هاو سەرێکی هەبو، لەبەر ئایەتی: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً...﴾ [النساء:٣] «جا ئەگەر ترسان دادگەر نەبن ئەوا تەنها یەك هاوسەر بهێنن». هەروەها لە ئەنەسەوە ئەڵێ: «پەیامبەری خوا ﷺ نۆ هاوسەری هەبو، جا کە دابەشی دەکرد نۆیەی ئافرەتی یەکەمە کە نەدەهاتەوە مەگەر دوای نۆ شەو»[2].

٦- [پاراستنی نهێنیەکانی وئاشکرا نەکردنی، وەك تۆزێکی تر باس دەکرێت].

**دوەم: مافی مێرد:**

مافی مێردیش بە سەر هاوسەرەکەیەوە گەورەترە لە مافی ئەو بەسەریەوە، لەبەر فەرمایشتی: ﴿وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ [البقرة:٢٢٨]، «وپیاوانیش پلەیەکیان هەیە بەسەر ئافرەتانەوە»»، هەروەها لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «لَوْ كُنْتُ آمِرًا أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ لِأَحَدٍ لَأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِهَا، وَلَا تُؤَدِّي الْمَرْأَةُ حَقَّ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ عَلَيْهَا كُلَّهُ حَتَّى تُؤَدِّيَ حَقَّ زَوْجِهَا عَلَيْهَا كُلَّهُ» «ئەگەر فەرمانم بە کەسێك بکردایە سوژدە بۆ کەسێك ببات، ئەوا فەرمانم دەکرد بە ئافرەت سوژدە بۆ

(١) أخرجه أحمد (٤٧٢/٢)، وأبو داود (٤٦٨٢)، وصححه الألباني «الضعيفة» (٢٤٢/٢).
(٢) أخرجه مسلم (١٤٦٢).

هاوسەرەکەی ببات، وئافرەت هەمو مافی خوا نادات بەسەریەوە هەتا هەمو مافی پیاوەکەی نەدات»[1].

**لە مافەکانی مێرد بە سەر هاوسەرەکەیەوە:**

١- پاراستنی نهێنیەکانی وئاشکرا نەکردنی بۆ کەس، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللَّهُ﴾ [النساء:٣٤] «جا ئەو ئافرەتانەی پابەندن بە شەرعەوە، گوێڕایەڵی خوا ومێردەکان، وپارێزەری نهێنیەکانن بە هۆی سپاردەی خوا بە پاراستنی».

٢- واجبێتی گویڕایەڵی کردنی لە چاکەدا، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ﴾ [النساء:٣٤].

٣- ڕێگەدان بە مێرد ئەگەر بانگی کرد بۆ سەر جێگەیی ئەگەر ڕێگرێکی شەرعی نەبو، لەبەر فەرمودەی: «إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ أَنْ تَجِيءَ، لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ» «ئەگەر پیاو هاوسەرەکەی بانگ کرد بۆ سەر جێگەیی وئەویش ڕازی نەبو، ئەوا فریشتە نەفرەتی لێ دەکەن تا بەیانی دەکاتەوە»[2].

٤- پارێزگاری کردن لە خانو ومالّ ومنداڵەکانی وياش پەروەردەکردنیان، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ... وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا، وَمَسْؤُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا» «هەموتان سەرپەرشتیارن وهەموشتان بەر پرسیارن لە بەرامبەر ژێر دەستەکانتان... وئافرەتیش سەر پەرشتیارە لە ماڵی مێردەکەی دا وبەر پرسیارە لەوەی ژێر دەستی»[3]. هەروەها

(١) أخرجه ابن ماجه (١٨٥٢)، والبيهقي (٢٩٢/٧)، وصحح الألباني إسناده على شرط مسلم «الصحيحة» (٢٠٢/٣).
(٢) أخرجه البخاري (٥١٩٣، ٥١٩٤)، ومسلم (١٤٣٦) -١٢٢
(٣) أخرجه البخاري (٨٩٣)، مسلم (١٨٢٩).

پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێت: «وَلَكُمْ عَلَيْهِنَّ أَنْ لَا يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَدًا تَكْرَهُونَهُ» «ومافی ئێوەش بەسەریانەوە ئەوەیە کەسێك نەهێننە ماڵتانەوە ولە ماڵتان دابنیشن کە ئێوە حەزی لێ نەکەن»[(١)].

٥- تێکەڵاوی کردن بە چاکە، ورەوشت جوانی، وئازار نەدانی، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەری خوا ﷺ: «لَا تُؤْذِي امْرَأَةٌ زَوْجَهَا فِي الدُّنْيَا إِلَّا قَالَتْ زَوْجَتُهُ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ: لَا تُؤْذِيهِ قَاتَلَكِ اللهُ، فَإِنَّمَا هُوَ عِنْدَكِ دَخِيلٌ يُوشِكُ أَنْ يُفَارِقَكِ إِلَيْنَا» «هیچ ئافرەتێك ئازاری مێردەکەی نادات لە دونیادا مەگەر هاوسەرەکەی لە حۆریە چاو ڕەشەکان ئەڵێ: ئازاری مەدەن خوا بتکوژێت، ئەوە لای تۆ میوانە ونزیکە جێت بهێڵێت»[(٢)].

## سێیەم: مافە هاوبەشەکانی نێوان ژن ومێرد:

زۆربەی ئەو مافانەی باس کران مافانێکی هاوبەشن لە نێوان هەردوکیاندا، بە تایبەت مافی چێژ وەرگرتن، وئەوانەی تری وەك ئەو، هەروەها چاککردنی ڕەوشتی خۆیان بەرامبەر یەکتر، وخۆڕاگری بەرامبەر ئازارەکانی وتێکەڵاوی کردنی بە چاکی، مافەکانی دواناخات وڕقی لێ هەڵناگرێت بە هۆی بەخشینەکانیەوە، ومنەتی بەسەردا ناکات وئازاری نادات، لەبەر ئایەتی: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ [النساء:١٩]، «وبە باشی تێکەڵاویان لەگەڵدا بکەن»، هەروەها خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ [البقرة:٢٢٨]، «وبۆ ئافرەتانیش ماف هەیە وەك ئەوەی ئەرکیان لە سەرە بە شێوەیەکی چاك»، هەروەها پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ [وەك باس

---

(١) أخرجه مسلم (١٢١٨).

(٢) أخرجه أحمد (٥/٢٤٢)، وابن ماجه رقم (٢٠١٤)، وصححه الألباني (الصحيحة ١٧٣).

کرا]: «باشترینتان باشترینتانە بۆ هاوسەرەکەی». هەر وەك چۆن سوننەتە مێرد ژنەکەی تەڵاق نەدات ئەگەر ڕقیشی لێ بو، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيرًا﴾ [النساء:١٩] «وبا تێکەڵاویتان لەگەڵ ئافرەتدا لە سەر بنەمای ڕێز لێ گرتن وخۆشەویستی ومافدان بێت، ئەگەریش ڕقتان لێیان بو بە هۆی شتێکی دونیاییەوە، ئەوا خۆ ڕاگر بن، چونکە لەوانەیە ڕقتان لە شتێك بێت وخێرێکی زۆری تێدا بێت».

## پرسی پێنجەم: ڕاگەیاندنی هاوسەرگیری:

سوننەتە هاوسەر گیری ئاشکرا بکرێت وڕابگەیەنرێت وبڵاو بکرێتەوە، ولە دەف بدرێت، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «فَصْلُ مَا بَيْنَ الْحَرَامِ وَالْحَلَالِ الدُّفُّ وَالصَّوْتُ» «جیاوازی نێوان حەڵاڵ وحەرام دەنگ ولە دەفدانە لە هاوسەرگیریدا»[1]. ولێدان بە دەف بۆ ئافرەتانە بە بێ پیاوان بە مەرجێك قسەی نەشیاو یان پێچەوانەی شەرعی تێدا نەبێت.

## پرسی شەشەم: خواردندان (الوليمة) لە هاوسەرگیریدا:

وەلیمە: خواردنی هاوسەرگیریە کە خەڵکی بۆ بانگ دەکرێت وبۆی کۆ دەکرێنەوە.

سوننەتیشە وەلیمە بکرێت بۆ هاوسەرگیری، لەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ، کە ئافرەتێکی خواستوە، پەیامبەری خوا ﷺ پێی فەرموە: «بە شەکێکیش بوە وەلیمە بکە»[2]، هەروەها: «وپەیامبەری خوا ﷺ

(١) أخرجه أحمد (٤١٨/٣)، والنسائي (٩١/٢)، والترمذي (١٠٨٨) وحسنه، والألباني في «الإرواء» (١٩٩٤).
(٢) أخرجه البخاري (٥١٥٤)، ومسلم (١٤٢٨).

نان وگۆشتی کردە وەلیمە بۆ زەینەب»»، و«پەیامبەری خوا ﷺ بۆ هەندێك لە خێزانەکانی دو مشت جۆی کردە وەلیمە بۆی»[1].

## پرسی حەوتەم: حوکمی وەڵام دانەوەی دەعوەتی هاوسەر گیری:

پێویستە لە سەر کەسێك دەعوەت کرا بۆ وەلیمەی هاوسەرگیری وەڵام بداتەوە، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر رضي الله عنهما، پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «إِذَا دُعِيَ أَحدُكم إِلى الوَلِيمة فَلْيَأتِها» «ئەگەر کەسێکتان دەعوەت کرا بۆ وەلیمە ئەوە با وەڵام بداتەوە»[2]، هەروەها فەرمودەکەی ئەبو هورەیرەیە رضي الله عنه، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «مَنْ لَمْ يُجِبِ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اللهَ وَرَسُولَهُ» «هەر کەس وەڵامی دەعوەتی نەداتەوە ئەوا سەرپێچی خوا وپەیامبەری کردوە»[3].

### مەرجەکانی وەڵام دانەوەی وەلیمەی هاوسەر گیری:

١- ئەبێت یەکەم وەلیمە بێت، ئەگەر زیاتر لە ڕۆژێك وەلیمەی کرد، لە ڕۆژی دوەم ئەبێتە سوننەت، ولە ڕۆژی سێیەم ئەبێتە مەکرِوه، لە بەر فەرمودەکەی ین مەسعود رضي الله عنه، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی[4]: «طَعَامُ أَوَّلِ يَوْمٍ حَقٌّ، وَطَعَامُ يَوْمِ الثَّانِي سُنَّةٌ، وَطَعَامُ يَوْمِ الثَّالِثِ سُمْعَةٌ، وَمَنْ سَمَّعَ سَمَّعَ اللهُ بِهِ» «خواردنی یەکەم ڕۆژ هەقە، وهی دوەم سوننەتە، وهی سێیەم ڕوپامایی وباسکردنە وکێش ڕوپامایی بکات خوا ئابڕوی دەبات».

٢- ئەبێت دەعوەتکار موسڵمان بێ، جا وەڵام دانەوەی دەعوەتی کافر واجب نیە.

---

(١) أخرجه البخاري (٥١٧٢).

(٢) أخرجه البخاري (٥١٧٣)، ومسلم (١٤٢٩).

(٣) أخرجه مسلم (١٤٣٢).

(٤) أخرجه الترمذي (١٠٩٧)، وبمعناه أحمد (٥/٢٨)، وضعفه الألباني «الإرواء» (١٩٥٠)، وذهب الحافظ إلى أن مجموع الأحاديث في هذا المعنى وإن كان في كل منها مقال يدل على أن له أصلًا. «الفتح» (٩/١٥١).

٣- ئەبێت دەعەت کارەکە لەوانە نەبێت سەر پێچی بە ئاشکرا دەکەن، هەروەها ئەبێت ستەم کار یان ماڵی حەرام نەبێت.

٤- ئەبێت بانگ کردنەکە بە تایبەت بێت، جا ئەگەر دەعوەتی کرد لەگەڵ کۆمەڵێك دا ئەوا وەڵام دانەوەی واجب نیە[(١)].

٥- ئەبێت مەبەست لە دەعوەتیەکە دۆستایەتی ونزیك بونەوە بێت، جا ئەگەر دەعوەتی کرد لە ترسی دا، یان بە تەمای پلە وپۆستێك بو، ئەوا واجب نیە.

٦- ئەبێت لە وەلیمەکە دا خراپە نەبێت، وەك مەی وگۆرانی ومۆسیقا وتێکەڵاوی پیاو وژن، جا ئەگەر شتێك لەمانەی بینی ئەوا دەعوەتی واجب نیە، لەبەر فەرمودەکەی جابر ﵁ کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يَقْعُدْ عَلَى مَائِدَةٍ يُدَارُ عَلَيْهَا الْخَمْرُ» «هەر کەس بڕوای بە خوا ورۆژی دوایی هەیە با لە سەر خوانێك دانەنیشێت مەی تێدا دەگێڕدرێت»[(٢)]. جا ئەگەر دەعوەت کراو بە ئامادە بونی دەیتوانی ئەو خراپەیە بگۆڕێت ئەوا پێویستە لە سەری وەڵام بداتەوە وئەو خراپە لا بدات، لەبەر فەرمودەکەی ئەبو سەعید خودری ﵁، لە پەیامبەرەوە ﷺ فەرمویەتی: «مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ» «کێ لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بە دەستی بیگۆڕێت، نەیتوانی با بە دەمی، ئەویشی نەتوانی ئەوا با بە دڵی، ئەمەش لاواز ترینی باوەڕە»[(٣)].

---

(١) [وەك ئەوەی لە ناو کۆمەڵێك خەڵك دا بڵێت: خەڵکینە هەموتان دەعوەتن، بێ دیاری کردن وناو هێنان].
(٢) أخرجه أحمد (١/٢٠)، وصححه الألباني في الإرواء (١٩٤٩).
(٣) أخرجه مسلم (٤٩).

# دەروازەی سێیەم

# لە خۆ داماڵین «الخُلْع»

**دو پرسی تێدایە:**

## پرسی یەکەم: واتای خولع، وبەڵگەکانی شەرعی بونی:

### أ- پێناسەی «الخلع»:

لە زماندا: لە «خلع الثوب=بەرگ داکەندن»ەوە وەرگیراوە، چونکە هەر یەك لە ژن ومێرد بەرگی ئەوی تریانن.

لە شەرعیشدا: جیابونەوەیەکە لە نێوان ژن ومێرد دا ڕو دەدات بە بەرامبەرێك کە ژنەکە بە مێردەکەی دەدات، بە لەفزێکی دیاری کراو.

### ب- شەرعی بونی خولع:

خولع شەرعیە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾ [البقرة:٢٢٩] «ئەگەریش کار بە دەستانی هەر دو لا ترسان لە نەپاراستنی سنوری خوا لە نێوانیاندا، ئەوا هیچ تاوانێك نیە لە سەر ژن ومێرد لەوماڵەی ژنەکە دەیدات بە پیاوەکەی بەرامبەر تەڵاق دانی»، ولەبەر فەرمودەکەی ئیبن عەبباس ﵄، ئەڵێ: «ژنەکەی سابتی کوڕی قەیس هاتە خزمەتی پەیامبەر ﷺ وتی: ئەی پەیامبەری خوا! گلەیی ڕەوشت ودینم لە سابتی کوڕی قەیس نیە، بەڵام حەزم لە سپڵەیی وماف شاردنەوە نیە لە ئیسلامدا (الكفر)[1]،

(١) یانی: پێی ناخۆشە توشی سپڵەیی بێت بەرامبەر مێردەکەی، وکەم تەرخەمی کردن دەرهەق بە مافەکانی وی بە سەریەوە، ئەمەش بە هۆی زۆری ڕقی لە سابت، نەك عەیبێك هەبێت لە دین وڕەوشتیدا.

پەیامبەریش ﷺ فەرموی: «أَتَرُدِّين عليه حديقتَه؟» «باخەكەی بۆ دەگێڕیتەوە؟» وتی: بەڵێ، فەرموی: «اِقْبَل الحَديقةَ، وَطَلِّقْهَا تَطْلِيقَةً» «باخەكە وەر بگرە ویەك تەلاقێكی بدە»[1].

## پرسی دووەم: ئەو حوكمانەی پەیوەستن بە خولعەوە، وحیكمەت لێی:

### أ- حوكمەكانی خولع:

حوكمەكانی خولع لەمانەی خوارەوە پوخت دەبێتەوە:

١- خولع دروستە ئەگەر بە هۆی خراپی تێكەڵاوی بو لە نێوان ژن ومێرددا، ڕوش نادات مەگەر لە سەر بەرامبەرێكی ماددی، كە بێ مێرد لە سەر هاوسەرەكەی دایدەنێت.

٢- لە جگە لە هاوسەرێكی سەر ڕاستەوە ڕو نادات، چونكە ناسەر ڕاست هەڵس وكەوتی نیە چونكە شیاو بونی تەواو نەبوە.

٣- ئەگەر پیاو خولعی لە ژنەكەی كرد، ئەوا ئیتر ژنەكە سڵای بە دەستی خۆی دەبێت، وهیچ سڵایەكی بە دەست مێردەكەی نابێت، وگێڕانەوەشی لە دەستی نیە.

٤- خولع كردن نادرێتە پاڵ تەڵاق وزیهار وسوێند خواردن لە كاتی عیددەگرتنی لەو مێردەی خولعی لێكردوە، چونكە ئەم ئەبێتە بێگانە لە مێردەكەی.

٥- خولع كردن دروستە لە كاتی عادە دا، هەروەها لە كاتی پەكیەك كە لە گەڵیدا جوت بوە، چونكە هیچ زیانێكی بەر ناكەوێت، خوای گەورەش بە ڕەهایی باسی كردوە وبەندی نەكردۆتەوە بە كاتێكەوە.

---

(١) أخرجه البخاري (٥٢٧٣).

٦- حەرامە لە سەر پیاو ئازاری هاوسەرەكەی بدات ولە مافەكانی بیگرێتەوە تا ناچاری بكات خولعی لیّ بكات، لەبەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿وَلا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ﴾ [النساء:١٩] «ئەی باوەڕداران... بۆشتان دروست نیە زیان بگەیەنن بە هاوسەرەكانتان كە حەزیان لیّ ناكەن، بۆ ئەوەی تەنازول بكەن لە هەندێكی مارەییەكە وهاوشێوەكانی مەگەر خراپەكاریەكی ئاشكرایان كردبێت».

٧- كەڕاهەتی هەیە وقەدەغەیە لە ئافرەت خولع لە مێردەكەی بكات لە كاتێكدا كەسێكی ڕێك بێت وهۆكارێك نەبێت خولع بخوازێت، وەك ئەوەی مێردەكە عەیبێكی جەستەیی هەبێت وئافرەتەكە توانای مانەوەی نیە لەگەڵیدا، یان ڕەوشتی ناشیرین بێت، یان بترسێت سنوری خوا نەپارێزێت.

**ب- حیكمەت لە شەرعی بونی خولع:**

زانراوە كە هاوسەرگیری پەیوەندی وپەیوەستیە لە نێوان ژن ومێرد دا وتێكەڵاوی كردنە بە باشی، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ [الروم:٢١]. جا ئەمە بەر وبومی هاوسەرگیریە، ئەگەر ئەم مانایە بەدی نەهات خۆشەویستی لە نێوان هەر دو لادا بە دی نایەت یان لە مێردەكەوە بەدی نەهات، ئەوسا تێكەڵاویەكە تێك دەچێت وچارەسەریشی قورس ئەبێت، جا مێرد فەرمانی پێكراوە بە چاكی دەستبەرداری هاوسەرەكەی بێت، لەبەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ [البقرة: ٢٢٩] «جا حوكمی خوا دوای هەر تەڵاق دانێك ئەوەیە: كە ئافرەتەكە بە چاكی بباتەوە، وباش پێكەوە بژین دوای گەڕانەوەی، یان دەستبەرداری بێت بە چاكی بەوەی مافەكانی وبدات، وبە خراپە باسی نەكات»، ئەگەریش

خۆشەویستی لەلایەن مێردەکەوە هەبو، بەڵام لە لایەن هاوسەرەکەوە نەبو بۆ نمونە حەز لە ڕەوشتی پیاوەکەی نەکات یان ڕقی دێتەوە لە کەمی دینی مێردەکەی، یان ترسا تاوان بار ببێت بە ماف نەدانی، ئەوا لەم کاتەدا بۆ ئافرەت حەڵاڵە داوای جیا بونەوە بکات لە مێردەکەی لە سەر بەرامبەرێك کە پێی دەیدات ولە بریتی ئەوەی سلای بکەوێتە دەست خۆی، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾ [البقرة:٢٢٩].

# دەروازەی چوارەم

# لە بارەی تەڵاق دانەوە «الطَّلَاق»

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: واتای تەڵاق، وبەڵگەکانی شەرعی بونی، وحیکمەتەکەی:

**أ- پێناسەی «الطلاق»:**

لە زماندا: وێڵ کردنە، ئەوترێ: «طلقت الناقة» ئەگەر بەرەڵای بکات بۆ هەر کوێ بۆ خۆی دەچێت.

لە شەرعیشدا: کردنەوەی هەمو یان هەندێکی گرێ بەستی هاوسەرگیریە.

**ب- کێ تەڵاقی دروست ئەبێت؟**

لە مێردێکی ژیری پێگەیشتوی جیاکار تەڵاق دروست ئەبێت ئەگەر بە ویستی خۆی بێت وهۆشی لای خۆی بێت، یان بریکارەکەی؛ جا نە تەڵاقی جگە لە مێرد، نە منداڵ، نە شێت، نە سەر خۆش، نە زۆر لێ کراو، ونە تورەیەکی زۆر کە نازانێت چی دەڵێت= ناکەوێت.

**ج- شەرعی بونی تەڵاق:**

بنەما لە هاوسەر گیریدا بەردەوام بونی ژیانی ژن ومێردایەتیە لە نێوانیان دا، خواش ﷻ لە هاوسەر گیریدا زۆر حوکم وفرە ئادابی داناوە تا بەردەوام بێت وزەمانەتی مانەوەی بکات. بەڵام لەوانەیە ئەم ئادابانە لەلایەن ژن ومێردەوە یان یەکێکیانەوە ڕەچاو نەکرێت، ئەوسا پشت لە یەکتر دەکەن بە ڕادەیەك بوارێك بۆ چاکسازی نامێنێتەوە، بۆیە ئەبێت کۆمەڵێك حوکم دابنرێت ببێتە مایەی کردنەوەی

گرێی هاوسەرێتی بە شێوەیەك مافی هیچ کام لە ژن ومێردی تێدا نەفەوتێت چونکە هیچ هۆکارێکی پێکەوە بون نەماوە.

تەلاقیش ڕێگەپێدراوە بە قورئان وسوننەت وکۆ دەنگی.

سەبارەت بە قورئان: خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ [البقرة:٢٢٩]. هەروەها خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ [الطلاق:١] «ئەی پەیامبەری خوا -ئێوەش ئەی باوەڕداران- ئەگەر ژنەکانی خۆتان تەلاقدا ئەوا لە عیددەی خۆیاندا تەلاقیان بدەن». لە سوننەتیشدا فەرمودەکەی ئیبن عومەرە رضي الله عنهما، کە ژنەکەی خۆی لە سوڕی مانگانەدا تەلاقداوە، پەیامبەریش ﷺ بە عومەری فەرموە: «لِيُرَاجِعْهَا، فَإِذَا طَهُرَتْ فَإِنْ شَاءَ فَلْيُطَلِّقْهَا» «با بیگێڕێتەوە، کە پاك بویەوە ئەگەر ویستی با تەلاقی بدات»[1]. زانایانیش کۆکن لە سەر دروستی تەلاق وشەرعی بونی.

د- دانایی لە شەرعی بونی:

ڕێگە بە تەلاق دراوە لە کاتی پێویستدا چونکە چارەسەر کردنی کێشە خێزانیەکانی تێدایە، بە تایبەت لە کاتی نەگونجان ورِق لەیەك بونێك کە ژن ومێردەکە ناتوانن سنوری خوا بپارێزن ودرێژە بە ژیانی خێزانیان بدەن، بەمەش تەلاق یەکێکە لە جوانیەکانی دینی ئیسلام.

## پرسی دوەم: حوکمی تەلاق، وبە دەستی کێ دەبێت؟

بنەما لە تەلاقدا ئەوەیە دروست وحەلاڵ بێت، کەی زەرور یان پێویست بو پیاو پێی هەڵدەستێت، وەك هەڵس وکەوت خراپی ئافرەت، وئەگەر پێویست نەبێت

(١) أخرجه البخاري (٥٢٥٢)، ومسلم (١٤٧١)-١٠.

کەڕاهەتی هەیە، چونکە ئەو هاوسەرگیریە ناهێڵێت کە کۆمەڵێك بەرژەوەندی تێدایە هانی بۆ لا دراوە: وەك داوێن پاکی وەچە خستنەوە وهی تریش. هەندێك جاریش حەرامە وەك لە باسی تەڵاقی بیدعەییدا دێت، هەندێك جاریش ئەبێتە واجب بە سەر کەسەکەوە، وەك بزانێت ژنەکەی داوێن پیسی کردوە، بۆ ئەوەی نەبێتە قەواد، هەروەها بۆ ئەوەی منداڵێکی پێوە نەلکێت لەو نیە، بە هەمان شێوە ئەگەر هاتو ژنەکە دینداریێکی ڕێك نەبو وەك: نوێژی واز لیّ دەهێنا، پیاوەکەش نەیدەتوانی چاکی بکات.

## پرسی سێیەم: لەفزەکانی تەڵاق:

لەفزەکانی تەڵاق ئەبێتە دو بەشەوە:

١. لەفزی ڕاشکاو: بریتیە لەو لەفزانەی بۆ تەڵاق دانراوە، کە جگە لە تەڵاق هەڵ ناگرێت، ئەویش بریتیە لە لەفزی تەڵاق وئەوەی لەو لەفزەوە دەردەچێت، فرمانی ڕابردو بێت وەك: (طلقتك= تەڵاقم دایت)، یان بکەر بێت وەك (أنت طالق= تۆ تەڵاق دراویت)، یان کار لەگەڵ کراو بێت، وەك (أنت مطلقة= تۆ تەڵاق دراویت)، هەمو ئەم لەفزانە [وهاو شێوەکانیان] بەڵگەن لە سەر کەوتنی تەڵاق، بەڵام بە فرمانی ڕانەبردو وداخوازی نا، وەك: تەڵاق دەدرێیت، وتەڵاق بدە.

٢. لەفزی مانادار (كناية): ئەو لەفزانەیە کە هەڵ ئەگرێت تەڵاق بێت وهەڵیش ئەگرێت وا نەبێت، وەك ئەوەی بە ژنەکەی بڵێت: تۆ وێڵ کراویت، یان من بەریم لە تۆ، یان تۆ جیا بویتەتەوە، یان پەتەکەت ها بەسەر پشتەوە، یان بچۆرەوە ماڵ باوکت وهاوشێوەکانی.

جیاوازی نێوان لەفزی ڕاشکاوانە ولەفزی بە ماناوە لە تەڵاقدا ئەوەیە: لەفزی ڕاشکاوانە ئەگەر مەبەستیشی نەبێت ئەکەوێت ئیتر بە ڕاستی بێت یان گاڵتە یان

ڕابواردن، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «ثَلَاثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ: النِّكَاحُ وَالطَّلَاقُ وَالرَّجْعَةُ» «سیان، جددیان ڕاستە وگەمەشیان هەر ڕاستە: هاوسەرگیری وتەڵاق وگێڕانەوەی هاوسەر»[1]. بەڵام ناڕاشکاو بێت تەڵاقی پێ ناکەوێت مەگەر لە کاتی وتنیدا نیەتی هەبێت، چونکە ئەم لەفزانە تەڵاق وهی تریش هەڵدەگرێت بۆیە ناکەوێت مەگەر نیەتی هەبێت، مەگەر شێوە بەڵگە (قَرِيْنَة)یەك هەبێت لە سەر ئەوەی نیەتی هەبوە ئەوسا بڕوا بە قسەی ناکرێت.

## پرسی چوارەم: تەڵاقی سوننەتی وحوکمەکەی:

أ- **تەڵاقی سوننەتی:** مەبەست لە تەڵاقی سوننەتی: ئەو تەڵاقەیە شەرع ڕێگەی پێداوە، کە بە گوێرەی ڕێنماییەکانی شەریعەتی ئیسلام خراوە، ئەمە بە دو شت ئەبێت:

١- ژمارەی تەڵاقەکان.

٢- لە کاتی خستنیدا.

جا سوننەت وایە ئەگەر مێرد ناچاری تەڵاق دان بو: یەك تەڵاقی بدات لە پاکێتیەك دا تێیدا جوت نەبو بێت لەگەڵی دا، وتەڵاقی تری بە دوا دا نادات تا عیددەکەی تەواو دەبێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ [الطلاق:١]، واتە: [تەڵاقیان بدەن] لەو کاتەی دەست دەکەن بە پێشوازی کردن لە عیددە کە بریتیە لە پاکبونەوە، چونکە کاتی سوڕی مانگانە

---

(١) أخرجه أبو داود (٢١٩٤)، والترمذي (١١٨٤)، وابن ماجه (٢٠٣٩)، وحسّنه الشيخ الألباني «صحيح سنن ابن ماجه» (١٦٧١).

لە عیددەوە هەژمار ناکرێت، ئیبن عومەر وئیبن عەبباس وکۆمەڵێك لە بارەی ئەم ئایەتەوە ئەڵێن: پاك بونەوە بە بێ جوت بون[1].

ب- **حوکمی تەڵاقی سوننەتی:** زانایان کۆکن لە سەر ئەوەی تەڵاقی سوننەتی دەکەوێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ [الطلاق:١] یانی: لە کاتی پاکێتیدا.

## پرسی پێنجەم: تەڵاقی بیدعەیی وحوکمەکەی:

### أ- تەڵاقی بیدعەیی:

ئەو تەڵاقەیە کە کابرا بە شێوەیەکی حەرام دەیخات کە شەرع نەهی لێکردوە، ئەمەش بە دو شت ئەبێت:

١- ژمارەی تەڵاقەکان.

٢- لە کاتی خستنیدا.

جا ئەگەر سێ تەڵاقەیدا بە یەك لەفز، یان بە جودا بەڵام لە یەك پاکێتیدا، یان تەڵاقیدا ولە سوڕی مانگانە دا یا لە زەیستانی دا بو وڕونیش نەبو بوە دو گیان بێت= ئەوا ئەم تەڵاقە بە بیدعەیی وحەرام هەژمار دەکرێت ونەهی لێکراوە لە شەرعدا، وبکەرەکەی تاوانبارە.

تەڵاقی بیدعەیی لە ژمارە دا لە سەری حەرامی دەکات تا شویەکی تر دەکاتەوە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ﴾ [البقرة:٢٣٠] «جا ئەگەر پیاو هاوسەرەکەی خۆی جاری سێیەم تەڵاقدا، ئەوا بۆی حەڵاڵ نیە مەگەر شو بکاتەوە بە پیاوێکی تر بە گرێ بەستێکی دروست ولەگەڵیدا

(١) انظر: «تفسير ابن كثير» (١٦٩/٨).

جوت ببێت وبە حەزی خۆی بێت وبۆ حەڵاڵکردنی ئافرەتەکەی نەبێت بۆ مێردی یەکەمی» یانی: سێیەم.

تەڵاقی بیدعەییش لە کاتدا؛ سوننەتە بیگێڕێتەوە، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر کە هاوسەری تەڵاق داوە ولە عادەدا بوە، پەیامبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە بیگێڕێتەوە[1]. کە گێڕایشیەوە واجبە لە سەری بیهێڵێتەوە تا پاك دەبێتەوە، ئینجا ئەگەر ویستی تەڵاقی دەدات وئەگەریش ویستی دەیهێڵێتەوە.

**ب- حوکمی تەڵاقی بیدعەیی:**

حەرامە لە سەر مێرد بە شێوەی بیدعەیی تەڵاق بدات ئیتر لە ژمارە بێت یان لە کات، لەبەر ئایەتی: ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ [البقرة:٢٢٩]، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ [الطلاق:١]، واتە: پاك بو بن ولەگەڵیان جوت نەبوبێتن. هەروەها چونکە ئیبن عومەر کە ژنەکەی تەڵاقدا ولە عادە بو، پەیامبەر ﷺ فەرمانی پێکرد بیگێڕێتەوە.

تەڵاقی بیدعەییش دەکەوێت وەك تەڵاقی سوننەتی، چونکە پەیامبەر فەرمانی کرد بە ئیبن عومەر ﷺ هاوسەرەکەی بگێڕێتەوە، گێڕانەوەش بە دی نایەت مەگەر دوای کەوتنی تەڵاق، جا ئەو کاتەش ئەو تەڵاقە لە تەڵاقەکانی هەژمار دەکرێت.

## پرسی شەشەم: گێڕانەوە:

### أ- پێناسەکەی:

لە زماندا: «الرَّجْعَة» جارە لە گێڕانەوەدا، لە شەرعیشدا: گێڕانەوەی هاوسەرە تەڵاقدراوەکەیە -بائن نەبێت- بۆ پێش حاڵی تەڵاقدانەکەی بە بێ گرێ بەست.

(١) أخرجه البخاري (٥٣٣٢)، ومسلم (١٤٧١).

ب- **شەرعی بونی:** قورئان وفەرمودە وكۆ دەنگی بەڵگەن لە سەر شەرعی بونی گێڕانەوە. سەبارەت بە قورئان خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُوا إِصْلاحًا﴾ [البقرة:٢٢٨] «ومێردی تەڵاق دراون لە پێشترن بە گێڕانەوەی هاوسەرەكانیان لە ماوەی عیددەدا، ئەشبێت ئەمە بە مەبەستی خێر وچاك سازی بێت نەك بۆ ئازار دانیان بە درێژ كردنەوەی ماوەی عیددەكە»، هەروەها خوا ﷻ ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾ [البقرة:٢٣١] «وئەگەر ئافرەتانتان تەڵاقدا ونزیكبونەوە لە كۆتایی هاتنی عیددەكانیان، ئەوا بیانگێڕنەوە، وبا -ئەی پیاوان- نیەتیشتان هەستان بێت بە مافدانیان بە شێوازێكی چاكی شەرعی ونەریتی»، یانی: گێڕانەوە. سەبارەت بە سوننەتیش: فەرمودەكەی ئیبن عومەری پێشوە، كە پەیامبەر ﷺ فەرموی: «فەرمانی پێ بكە با بیگێڕێتەوە». وزانایانیش كۆكن لە سەر ئەوەی هەر كەس كەمتر لە سێ جار تەڵاق بدات بۆی هەیە لە عیددە هاوسەرەكەی بگێڕێتەوە.

ج- **حیكمەت لێی:** دانایی لە ڕەجعەدا دەرفەتدانە بە مێرد ئەگەر پەشیمان بویەوە لە خستنی تەڵاقەكەی، ویستی دوبارە ژیانی خێزانی دەست پێ بكاتەوە، جا دەبینێت دەرگای بە ڕودا كراوەتەوە، ئەمەش لە بەزەیی ونەرمی خوایە ﷻ بە بەندەكانی.

د- **مەرجەكانی:** گێڕانەوە بە چەند مەرجێك دروست ئەبێت، كە ئەمانەیە:

١- ئەبێت تەڵاق دانەكانی كەم تر بێت لەو ژمارەی كە بە دەست پیاوە كە بریتیە لە سێ تەڵاق بۆ ئازاد ودو تەڵاق بۆ كۆیلە، جا ئەگەر هەمو ژمارەكە تەواو بو بو، ئەوا بۆی حەڵاڵ نابێتەوە، تا ئافرەتەكە شویەكی تر نەكاتەوە.

٢- ئەبێت چوبێتە لای تەڵاقدراوەکە، چونکە گێڕانەوە نابێت مەگەر لە عیددەدا ئەوەشی جوت بون لەگەڵیدا ڕوی نەدا بێت عیددەی بۆ نیە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا﴾ [الأحزاب:٤٩] «ئەی باوەڕداران ئەگەر گرێ بەستی هاوسەرگیریتان کرد نەچوبونە لایان ئینجا تەڵاقیانتاندا پێش جوتبون ئەوە هیچ عیددەیەکتان لە سەر نیە بیژمێرن».

٣- ئەبێت تەڵاقەکە بێ بەرامبەر بێت، چونکە بەرامبەر لە تەڵاقدا [کە خولعە] دانراوە بۆ ئەوەی ئافرەت لە سلای مێردەکەی بێتە دەرەوە، سا لەگەڵ گێڕانەوەدا ئەمە ڕو نادات، بۆیە حەڵاڵ نابێت مەگەر بە گرێ بەستێکی تازە وبە ڕەزامەندی خۆی.

٤- ئەبێت هاوسەرگیریەکی دروست بێت، بۆیە لە گرێ بەستێکی پوچدا گێڕانەوە نیە، جا ئەگەر هاوسەرگیریەکە دروست نەبێت تەڵاقەکەش دروست نابێت، چونکە لقێکە لەو، وئەگەر تەڵاقەکەی دروست نەبێت گێڕانەوەش دروست نابێت.

٥- ئەبێت ڕەجعەکەی لە عیددەدا بێت، لەبەر فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ﴾ [البقرة:٢٢٨]. یانی: لە عیددەدا.

٦- ئەبێت گێڕانەوە دەست بەجێ (مُنَجَّزة) بێت، نابێت هەڵ واسراو بێت، وەك بڵێ: ئەگەر ئەوە ڕو بدات ئەوا تۆم گێڕاوەتەوە.

**هـ- گێڕانەوە بە چی ڕو دەدات؟**

١- گێڕانەوە بە لەفز بە دی دێت، وەك بڵێ: هاوسەرەکەم گێڕایەوە، یان بردمەوە، یان هاوردمەوە، یان گرتمەوە، یان هێنامەوە.

٢- وبە چونە لای هاوسەر ڕو دەدات ئەگەر بەوە نیەتی گێڕانەوەی هەبێت.

**و- لە حوکمەکانی تەڵاقی ڕەجعی؟**

١- تەڵاق دراوی ڕەجعی هەر هاوسەرە مادام لە عیددەدایە، ئەوەی بۆ هاوسەرەکان هەیە لە بژێوی وبەرگ ونیشتەجێ بون، بۆ ئەمیش هەیە. هەروەها ئەمیش ئەوەی لە سەرە کە لە سەر هاو سەرەکان دایە لە پابەند بون بە شوێنی نیشتەجێ بون، هەروەها بۆی هەیە خۆی بۆ مێردەکەی بڕازێنێتەوە وتەنها بکەوێت لەگەڵی دا ئەویش جوت ببێت لەگەڵی دا، وهەر یەکەیان میرات لە بەرامبەرەکەی دەبات.

٢- لە گێڕانەوەدا ڕازی بونی هاوسەر یان کار بە دەستەکەی مەرج نیە، لەبەر فەرمایشتی خوا: ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُوا إِصْلَاحًا﴾ [البقرة:٢٢٨].

٣- کاتی گێڕانەوە کۆتایی دێت بە کۆتایی هاتنی عیددە، وبە سێ سوڕی مانگانە عیددە دەگرێت، جا ئەگەر ئافرەت لە ڕەجعیدا لە سێ عادە پاك بویەوە ومێردەکەی نەیگێڕایەوە، ئەوا جیابونەوەی بچوکە (بینونة صغری)، بۆیە بۆی حەڵاڵ نابێت مەگەر بە گرێ بەستێکی تازە بە مەرجەکانیەوە: لە بونی کار بە دەست ودو شایەتی دادگەر.

٤- ئافرەت لە ڕەجعیدا، ولە بائیندا کە مێردەکەی مارەی کردۆتەوە دەگەڕێتەوە سەر ئەو تەڵاقانەی ماویەتی.

٥- جا ئەگەر هەمو ئەو تەڵاقانەی هەیبو تەواوی کرد وهەر سێ جارەکە تەڵاقیدا، ئەوا لێی حەرام دەبێت وجیابونەوەی گەورە (بینونة کبری) دەکەوێتە نێوانیانەوە، جا بۆی حەڵاڵ نابێت مەگەر مێردێکی تر بچێتە لای، بە گرێ بەستێکی دروست.

# دەروازەی پێنجەم

# لە بارەی سوێند خواردنەوە «الإِيْلاَء»

[چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە]:

## [پرسی یەکەم: پێناسەکەی، وبەڵگەکانی]:

**أ- پێناسەی «الإيلاء»:**

لە زماندا: لە «الأَلِيَّة»ەوە وەرگیراوە، واتا: سوێند، ئەوترێ: «آلى فلانٌ يُولي إيلاءً وأَلِيَّة» یانی: سوێندی خوارد. لە شەرعیشدا: ئەوەیە مێرد سوێند بخوات بە خوا یان بە سیفەتێك لە سیفەتەکانی -توانای چونە لاشی هەبێت- لە سەر نەچونە لای هاوسەرەکەی لە پێشەوە بۆ هەمیشە یان زیاتر لە چوار مانگ.

**ب- بەڵگەکانی:**

فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ تَرَبُّص أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَاءُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ * وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ [البقرة: ٢٢٦، ٢٢٧] «بۆ ئەوانەی سوێند بە خوا دەخۆن کە نەچنە لای ژنەکانیان چوار مانگیان بۆ هەیە، جا ئەگەر وازی هێنا پێش تێپەڕ بونی چوار مانگەکە، ئەوا خوا لێ بوردەیە لەو سوێندەی خواردویەتی وبە بەزەییە بەرامبەری، ئەگەریش سورە لە سەر تەڵاق دانی بەوەی بەردەوام بێت لە سەر سوێندەکەی ونەچێتە لای، ئەوا خوا بیسەری وتەکانیانە، زانایە بە مەبەستەکانیان، ولە سەریشی پاداشتیان دەداتەوە».

## [پرسی دوەم: مەرجەکانی ئیلاء]:

١. ئەبێ لە مێردێکەوە بێ بتوانێ بچێتە لای، جا کەسێك توانای ئەوەی نەبێت بە هۆی نەخۆشیەکەوە چاك نابێتەوە یان ئیفلیجیەوە، یان هەر گونی نەبو دروست نابێت.

٢. ئەبێت سوێند بەخوا بخوات یان بە سیفەتێك لە سیفەتەکانی، نەك بە تەڵاق یان ئازادکردن یان نەزر.

٣. ئەبێت سوێند بخوات لە سەر جوت نەبون زیاتر لە چوار مانگ.

٤. ئەبێت هاوسەرەکە بکرێت بچێتە لای، بەڵام ئافرەتێك نەکرێت بچێتە لای، وەك: دامێنی پێکەوە نوسا بێت (الرَّتقاء)[1]، وشتێك لە دامێنی دروست بو بێت (القَرْنَاء)[2] ڕێگر بێت بچێتە لای، ئەوا ئیلائکردن لەمانە دروست نابێت.

## [پرسی سێیەم: حوکمەکەی]:

ئیلائکردن لە ئیسلامدا حەرامە، چونکە سوێند خواردنە لە سەر نەکردنی واجبێك جا ئەگەر مێرد سوێندی خوارد لە سەر جوت نەبون لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بۆ هەمیشە یان زیاتر لە چوار مانگ ئەوا ئیلائی کردوە، جا ئەگەر چوە لای وکەفارەتی سوێندەکەیدا پێش تەواو بونی چوار مانگەکە ئەوا گەڕاوەتەوە بۆ کردنی ئەوەی وازی لێهێناوە وخوای میهرەبانیش لێبوردەیە لەوەی لێی وەشاوەتەوە، ئەگەریش دوای تێپەڕبونی ئەو ماوەیە هەر ڕازی نەبێت بچێتە لای وئافرەتەکەش داوای ئەوە بکات، ئەوا دادوەر فەرمانی پێدەکات بە یەکێك لەم دو شتە:

١- گەڕانەوە لە سوێندەکەی وچونە لای هاوسەرەکەی، وکەفارەتدانی سوێندەکە.

٢- یان تەڵاقدانی، ئەگەر هەر سورە لە سەر سوێندەکەی.

---

(١) ئەو ئافرەتەیە کە دامێنی هاتۆتە یەك وپێکەوە نوساوە وناکرێت جیماعی لەگەڵدا بکرێت، لە «الرتق»ەوە هاتوە، دژی: «الفتق»ـە.

(٢) ئەو ئافرەتەیە کە لە دامێنیدا ڕێگرێکی تێدایە لە چونە ژورەوەی زەکەر، یان ڕژان (غدة)یەکی ئەستورە، یان گۆشتێکی تۆکمەیە، یان ئێسکێکە.

جا ئەگەر ئەم دوانەی ڕەدکردەوە ئەوا دادوەر تەڵاقی دەدات لەبری، یان هەڵی دەوەشێنێتەوە، چونکە ئەو ئەچێتە شوێن ئیلائکەرەکە ئەگەر ڕازی نەبێت، تەڵاقیش بریکاری دەیگرێتەوە، ئەگەریش ماوەی سوێندەکە تێپەڕ بو، ویەکێك لە ژن ومێردەکە بیانویەکی هەبو ڕێگر بو لە جوت بون، ئەوا فەرمان دەکرێت بە مێرد بە دەمی بیگێڕێتەوە وبڵێ: کەی توانام هەبو لەگەڵتدا جوت دەبم، چونکە مەبەست لە گەڕانەوەی وازهێنانە لەو زیان گەیاندنەی مەبەستی بوە.

زانایان حوکمی کەسێکیش وەکو ئیلائکەر لێ دەکەن کە زیاتر لە چوار مانگ وازی هێناوە لە چونەلای ژنەکەی بە بێ سوێند خواردنیش، وهیچ عوزرێکیشی نیە.

## [پرسی چوارەم: لە حوکمەکانی ئیلائکردن]:

- ئیلائکردن لە هەر مێردێکەوە دادەمەزرێت کە تەڵاقی دروست بێت، موسڵمان بێت یان ناموسڵمان، ئازاد بێت یان کۆیلە، توڕە ونەخۆشیش دەگرێتەوە، هەروەها لەو ئافرەتەی کە هێشتا نەچوەتە لای، ئەمەش لەبەر گشتێتی ئایەتەکە.

- ئەم شەرع دانانە پڕ دانایيە لە لایەن خواوە، کە فەرمان دەکرێت بە ئیلائکەر بچێتە لای ژنەکەی، یان تەڵاقی بدات، لادانی ستەم وزیانی تێدایە لە سەر ئافرەت، وپوچەڵکردنەوەی ئەو شتەیە کە لە سەردەمی نەفامیدا لە سەری بون لە درێژکردنەوەی ماوەی ئیلائکردن.

- ئیلائکردن لە شێت وبێهۆشەوە دانامەزرێت، چونکە نازانن چی ئەڵێن، ومەبەستیان نیە.

# دەروازەی شەشەم

# ژن بە دایك وخوشكی خۆكردن «الظِّهَار»

**[چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە]:**

**[پرسی یەکەم: پێناسەی زیهار، وحوکمەکەی]:**

**أ- پێناسەی «الظهار»:**

لە «الظَّهْر= پشت»ەوە وەرگیراوە، لە شەرعیشدا: ئەوەیە پیاو لە لێ حەرام بوندا هاوسەرەکەی بچوێنێت بە یەکێك لە مەحرەمەکانی، بە پشت، یا شیردان، یا ژن خوازی، یا بە هەندێکی، جا کابرا کە ئەیەوێت نەچێتە لای ژنەکەی ئەڵێ: وەك پشتی دایکم بیت لێم، یان خوشکم یان جگە لەوان، جا کەی ئەوەی کرد ئەوە زیهاری لە هاوسەرەکەی کردوە.

**ب- حوکمەکەی:**

ژن بە خوشك ودایکی خۆ کردن حەرامە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْكُمْ مِنْ نِسَائِهِمْ مَا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنْكَرًا مِنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾ [المجادلة:٢] «ئەوانەی زیهار دەکەن لە ژنەکانیان ئەوانە سەرپێچی فەرمانی خوایان کردوە، ژنەکانیان لە ڕاستیدا دایکیان نین، بەڵکو هاوسەریانن، تەنها ئەوانە دایکانیانن کە لێیان بون، ئەم زیهار کەرانە قسەیەکی درۆ وخراپ دەکەن، خوای مەزنیش لێ بوردە وداپۆشەری تاوانە». زیهاریش لە سەردەمی نەفامیدا تەڵاق بو، کە ئیسلام هات کردیە سوێندێکی کەفارەت بۆ دانراو، وەك بەزەیی وئاسان کاریەك بەرامبەر بەندەکان.

جا حەرامە لە سەر زیهارکەر وزیهار لێکراو پێش کەفارەتدان چێژ لە یەکتر ببینن بە جوت بون بێت یان پێشەکیەکانی وەك ماچ کردن وچێژ وەرگرتن بە دەر لە دامێنیش، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا﴾ [المجادلة:٣] [ئێستا واتاکەی دێت] پەیامبەریش ﷺ فەرموی: «لَا تَقْرَبْهَا حَتَّى تَفْعَلَ مَا أَمَرَكَ اللهُ بِهِ» «نزیکی مەبەوە تا ئەوە دەکەیت خوا فەرمانی پێکردوە»[(١)].

## [پرسی دوەم: سڕینەرەوە (کەفارەت)ی زیهار]:

کەفارەتی زیهار بەم شێوەیە ڕیز کراوە:

١. ئازادکردنی کۆیلەیەکی باوەڕ داری بێ عەیب.

٢. ئەگەر کۆیلە یان نزخەکەی دەست نەکەوت ئەوا دو مانگ بە دوای یەکتردا بە ڕۆژو دەبێت مەگەر ڕۆژویەکی واجب بکەوێتە بەینەوە وەك ڕۆژوی ڕەمەزان، یان نەگرتنێکی واجب وەك نەگرتنی ڕۆژی جەژن وڕۆژانی تەشریق، ونەگرتن بە هۆی نەخۆشی وسەفەرەوە.

٣. ئەگەریش ڕۆژوگرتنی نەتوانی ئەوا نانی شەست هەژار دەدات، بۆ هەر هەژارێك مشتێك گەنم یان نیو مەن دەدات لە خواردنەکانی تری خەڵکی شارەکەی، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا ذَلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ * فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا فَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ذَلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾

---

(١) أخرجه الترمذي (١١٩٩) وحسّنه، وابن ماجه (٢٠٩٥) وحسّنه الشيخ الألباني. «الإرواء» (٢٠٩٢).

[المجادلة:٣، ٤]. «وئەوانەی زیهار لە هاوسەرەکانیان دەکەن ئینجا پەشیمان دەبنەوە وئەیانەوێت بڕۆنە لای ژنەکانیان، ئەوا لە سەر کابرای زیهارکەرە کەفارەت بدات کە بریتیە لە ئازادکردنی کۆیلە یان کەنیزەکێکی باوەڕدار پێش چونە لای ئەو ژنەی زیهاری لێکردوە، ئەمە حوکمی خوایە لەبارەی زیهارەوە ئامۆژگاریتانی پێدەکات ئەی باوەڕداران، بۆ ئەوەی توشی زیهارکردن وقسەی ناڕاست وناڕەوا نەبنەوە وکەفارەتی بدەن ئەگەر وتتان وبۆ ئەوەی جارێکی تر کاری وا نەکەنەوە وخوای میهرەبانیش هیچی لێ ون نابێت لە کارەکانتان وپاداشتیشتان لە سەر دەداتەوە * کێش کۆیلەیەکی دەست نەکەوت ئازادی بکات، ئەوا واجبە لە سەری دو مانگ بە شوێن یەکتردا بە ڕۆژو بێت پێش چونە لای خێزانی، کێ ئەوەشی نەتوانی بە هۆی عوزرێکی شەرعیەوە ئەوە لە سەریەتی خواردنی شەست هەژار بدات وتێریان بکات، ئەمەی کە ڕونمان کردەوە لە حوکمەکانی زیهارکردن بۆ ئەوەیە خوا بە ڕاست بخەنەوە وشوێنی پەیامبەر بکەون وشوێنی شەرعەکەی بکەون واز لە نەریتی نەفامی بهێنن...»، ولەبەر فەرمودەکەی سەلەمەی کوڕی سەخری بەیازی کە ژنەکەی وەك پشتی دایکی لێکرد پەیامبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد کۆیلەیەك ئازاد بکات، ئەگەر نەیبو دو مانك بە شوێن یەکتر دا بە ڕۆژو بێت، ئەگەریش نەیبو ئەوا با خواردن بدات[1].

ئەگەریش زیهارکەر چوە لای پێش کەفارەتدان ئەوا سەرپێچیکارە وتەنها یەك کەفارەتی لە سەرە، کەفارەتەکەش بە هەڵواسراوی لە ئەستۆی دەمێنێتەوە تا کەفارەت دەدات، ولێ حەرامبونی ژنەکەشی درێژ دەکێشێت تا کەفارەتدان.

(١) أخرجه الترمذي (١٢٠٠) وحسّنه، وأبو داود (٢٢١٣) وابن ماجه (٢٠٩٢)، وصححه الألباني «الإرواء» (٢٠٩١).

# دەروازەی حەوتەم

# لە بارەی نەفرەت لە خۆکردنەوە «اللّعان»

**چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:**

## پرسی یەکەم: پێناسەی لیعان، وبەڵگەی شەرعی بونی، وحیکمەتەکەی:

**١. پێناسەی «اللعان»:**

لیعان لە زماندا چاوگی (لاَعَنَ)ەیە، لە (اللَّعْن= نەفرەت)ەوە وەرگیراوە کە بریتیەی لە دەرکردن ودورخستنەوە. لە شەرعیشدا چەند شایەتی دانێکی بە سوێند تەئکید کراوە، ئەوەی مێردەکە نەفرەتیشی لەگەڵدایە، وئەوەی ئافرەتەکەش تورەیی خوای لەگەڵدایە. جێگەی حەددی بوهتان کردن دەگرێتەوە دەرهەق بە مێردەکە، وشوێنی حەددی زیناکەر دەگرێتەوە دەرهەق بە هاوسەرەکە، لیعانیشی پێ وتراوە، لەبەر ئەوەی کابرا لە پێنجەم جاردا ئەڵێ: نەفرەتی خوای لێ بێت ئەگەر درۆ دەکات، جا یەکێکیشیان درۆ دەکات بێگومان، بۆیە نەفرەت لێکراو ئەبێت.

**٢. بەڵگەکانی شەرعی بونی لیعان:**

بەڵگە بۆ شەرعی بونی لیعان فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ * وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ * وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکان [النور:٦-١٠] «وئەوانەی هاوسەرەکانیان تۆمەتبار دەکەن بە زیناکردن وشایەتیشیان لە سەر ئەو تۆمەتبار کردنە نیە مەگەر خۆیان، ئەوا لە سەر هەر یەکێکیانە لە بەردەم دادوەردا چوار جار شایەتی بدات وبڵێت: شایەتی دەدەم من

ڕاستگۆم لەوەی کە ئەڵێم زینای کردوە، ولە پێنجەم جار دا نەفرەتی خوا ﷻ لە خۆی دەکات ئەگەر درۆ دەکات لە تۆمەتبارکردنەکەی * وبەو شایەتیدانەی مێرد، هاوسەرەکەی شایستەی سزای زیناکارە کە بریتیە لە ڕەجم کردن تا مردن، ئەم سزایەشی لێ دور ناخرێتەوە مەگەر بەرامبەر ئەو شایەتی دانە چوار جار شایەتی بدات کە مێردەکەی درۆ دەکات کە ئەڵێ: زینای کردوە، لە پێنجەم جاریشدا توڕەیی خوا لە خۆی حەڵاڵ دەکات ئەگەر مێردەکەی ڕاست بکات».

هەروەها بە بەڵگەی فەرمودەکەی سەهلی کوڕی سەعد ﷺ کە پیاوێك لە پشتیوانان هاتە خزمەتی پەیامبەر ﷺ وتی: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ! کابرا پیاوێك دەبینێت لەگەڵ ژنەکەی دا؛ ئەیکوژێت یان چی بکات؟ ئەوەبو خوای مەزن لە بارەیانەوە ئەوەی دابەزان لە مەڕ لیعانەوە. پەیامبەریش ﷺ فەرموی: «قَدْ قَضَى اللهُ فِيكَ وَفِي امْرَأَتَكَ» «خوا لە بارەی تۆ وخێزاکەتەوە بڕیاری فەرمو»، ئەڵێ: ئەوەبو لە مزگەوتدا نەفرەتیان لە یەکتر کرد ومنیش ئامادە بوم. لە ڕیوایەتێکدا: نەفرەتیان لە یەکتر کرد ومنیش وەتەك خەڵك لەگەڵ پەیامبەر بوین ﷺ[1].

### ٣. دانایی لە شەرعی بونی لیعان:

حیکمەت لە شەرعی بونی لیعان بۆ مێرد: بۆ ئەوەیە ئابڕوی نەچێت بە هۆی زیناکەی هاوسەرەکەیەوە، وجێگەی پیس نەکات، وهەروەها منداڵی خەڵك نەکەوێتە دوای، زۆر جاریش ناتوانێت بەڵگەی لە سەر بهێنێتەوە وئەویش دان بە تاوانەکەیدا نانێت، وقسەی ئەمیش لە دژی هاوسەرەکەی وەرناگیرێت، بۆیە هیچ ڕێگایەکی تر نیە مەگەر بە قورسترین سوێند سوێند بخۆن، بۆیە لە دانانی لیعاندا چارەسەری

(١) متفق علیه: أخرجه البخاري (٥٣٠٨)، ومسلم (١٤٩٢).

کێشەکەی ئەوی تێدایە لەگەڵ نەهێشتنی تەنگی ودورخستنەوەی حەددی تۆمەتکار لە سەر مێردەکە. ومادام هیچ شایەتێکی نیە جگە لە خۆی، ڕێگە بە ئافرەت درا کەوا دژی سوێندەکەی ئەو بوەستێتەوە بە چەند سوێندێکی هاوشێوە، کە حەددی لێ دور دەخاتەوە، وەگەرنا حەددی لە سەر مسۆگەر بوە. جا ئەگەر مێردەکە سوێندی نەخوارد ئەوا حەددی تۆمەتکاری لێ دەدرێت، ئەگەریش ئەم دوای سوێند خواردنی ئەو ئامادەی سوێند خواردن نەبو، ئەوسا سوێندەکەی ئەو وپاشەکشەی ئەم بەڵگەیەکی ڕون وبە هێزە ودژیشی نیە بۆیە ئەو کاتە حەددی لە سەر جێبەجێ دەکرێت.

## پرسی دووەم: مەرجەکانی وچۆنێتیەکەی:

### أ. مەرجەکانی ڕاست ودروستی لیعان:

١. ئەبێت لە نێوان دو هاوسەری تەکلیف لێکراو (پێگەیشتو وژیر) بێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ﴾ [النور:٦].

٢. مێرد هاوسەرەکەی تۆمەتبار بکات بە داوێن پیسی، وەك بڵێ: ئەی زیناکەر، یان بینیتم زینات دەکرد، یان زینات کرد.

٣. ئەبێت ئافرەتەکە مێردەکە بە درۆ بخاتەوە لەم تۆمەتبارکردنەی، وبەردەوام دەبێت لەمە تا تەواوبونی نەفرەت لە خۆ کردنەکە.

٤. ئەبێت نەفرەت لە خۆ کردنەکە بە بڕیاری دادوەر بەڕێوە بچێت.

### ب. چۆنێتی نەفرەت لە خۆ کردن وشێوازەکەی:

شێوازی نەفرەت لە خۆ کردنەکە ئەوەیە: مێردە لای دادوەر بە پێش چاوی کۆمەڵێك خەڵکەوە بڵێ: سوێند دەخۆم وشایەتی دەدەم بە خوا من ڕاست گۆم لەوەی داومەتە پاڵ هاوسەرەکەم کە زینای کردوە، ئەمە چوار جار ئەڵێتەوە، وئەگەر لە

بەرامبەری بێت ئاماژەشی بۆ دەكات، ئەگەریش بەرامبەری نەبو ناوی دەهێنێت بۆ ئەوەی جیا ببێتەوە ودیار بێت، ئینجا لە پێنجەم سوێند وشایەتی دا -دوای ئەوەی كە دادوەر ئامۆژگاری دەكات ولە درۆ وریای دەكاتەوە- ئەڵێ: نەفرەتی خواشم لێ بێت ئەگەر درۆ دەكەم. ئینجا ئافرەتەكە چوار جار ئەڵێت: سوێند دەخۆم وشایەتی دەدەم بەخوا، مێردەكەم درۆ دەكات لەوەی دەیداتە پاڵم لە زینا، ئینجا لە شایەتیدانی پێنجەمدا ئەڵێ: توڕەیی خوام لێ بێت ئەگەر مێردەكەم ڕاست دەكات. ئەمەش لە بەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ ... ﴾ [النور:٦-١٠].

## پرسی سێیەم: ئەو حوكمانەی لە لیعان دەكەوێتەوە:

ئەگەر لیعان تەواو بو، ئەوا ئەمانەی خوارەوەی لێ دەكەوێتەوە:

١- خستنی حەددی بوهتانچی لە سەر مێردەكە.

٢- جیابونەوەی نێوان ژن ومێردەكە ولە یەكتر حەرام بونیان بۆ هەمیشە، با دادوەریش لە یەكیان جیا نەكاتەوە.

٣- پشتی منداڵەكەی نادرێتە پاڵ مێردەكە وئەدرێتە پاڵ هاوسەرەكەوە، وبۆ دورخستنەوەی پشتی منداڵەكە دەخوازێت بە ڕاشكاوی لە لیعانەكە ناوی بهێنێت، وەك ئەوەی بڵێت: «سوێند دەخۆم وشایەتی دەدەم بە خوا من ڕاستگۆم لەوەی داومەتە پاڵ هاوسەرەكەم كە زینای كردوە، ئەوەش منداڵی من نیە». لەبەر فەرمودەكەی ئیبن عومەر ﵄، كە پەیامبەری خوا لیعانی كردوە لە نێوان پیاوێك وژنەكەی، وجیای كردونەتەوە، ومنداڵەكەشی داوەتە پاڵ ئافرەتەكە[1].

---

(١) أخرجه البخاري (٥٣١٥)، ومسلم (١٤٩٤).

٤- واجب بونی حەددی زینا لە سەر ئافرەتەكە مەگەر ئەویش نەفرەت بكات، چونكە سوێند نەخواردنی ئەم لەگەڵ سوێند خواردنی ئەودا بەڵگەیەكی ڕون وبەهێزە وئەبێتە مایەی جێبەجێكردنی حەدد بە سەریدا.

# دەروازەی هەشتەم

## لە بارەی عیددە گرتن وخۆ گرتنەوە «العِدَّة والإِحْدَاد»

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

### پرسی یەکەم: پێناسەی عیددە، وبەڵگەی شەرعی بونی، وحیکمەت لێی:

**١. پێناسەی «العِدَّة»:**

ناوی چاوگە لە (عَدَّ يَعُدَّ عَدًّا) کە لە (عَدَد= ژمارە) وهەژماردنەوە وەرگیراوە، لەبەر ئەوەی عیددە ژماردنی تێدایە لە سوڕی مانگانە ومانگەکان.

لە شەرعیشدا: ناوی ماوەیەکی دیاریکراوە ئافرەت تێیدا چاوەڕوان دەکات، وەکو پەرستن، یان لێ قەومان بەهۆی مردنی مێردەوە، یا بۆ دڵنیابونەوە لە پاکێتی ڕەحم.

عیددەگرتنیش لە شوێنەوارەکانی تەڵاق دان یان مردنە.

**٢. بەڵگەکانی شەرعی بونی عیددە:**

بنەما لە واجب بونی عیددە وشەرعی بونی: قورئان وفەرمودە وکۆ دەنگیە.

سەبارەت بە قورئان، ئەو فەرمایشتەی خوا ﷻ کە ئەفەرموێ: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ﴾ [البقرة:٢٢٨]. «وئافرەتانی تەڵاقدراو ئەوانەی دەکەونە سوڕی مانگانەوە پێویستە دوای تەڵاقەکە بۆ ماوەی سێ سوڕی مانگانە عیددە بگرن»، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ وَأُولَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ [الطلاق:٤]. «ئەو ئافرەتانەی تەڵاقدراون خوێنی عادەیان نیە بە هۆی تەمەنەوە، ئەگەر نەتانزانی حوکمی خوا چیە لە بارەیانەوە؟ ئەوا بزانن عیددەکەیان سێ مانگە، بە هەمان شێوە ئەو بچوکانەی کە هێشتا نەکەوتونەتە عادەوە

عیددەكەیان سێ مانگە، وئافرەتانی دو گیانیش عیددەكەیان ئەوەیە كۆرپەلەیان دابنێن»، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾ [البقرة: ٢٣٤]. «وئەوانەی لە ئێوە دەمرن وهاوسەر دوای خۆیان بە جێ دەهێڵن پێویستە لە سەریان بۆ ماوەی چوار مانگ ودە ڕۆژ چاوەڕێ بكەن، لە ماڵ دەر ناچن وخۆیان ناڕازێننەوە وشوش ناكەنەوە لەو ماوەیەدا». سەبارەت بە سوننەتیش: فەرمودەكەی میسوەری كوڕی مەخرەمەیە ﷺ: «كە سەبیعەی ئەسلەمیە دوای مردنی مێردەكەی بە چەند شەوێك منداڵی بو، ئەوەبو هاتە خزمەتی پەیامبەر وداوای هێڵانی لێكرد شو بكاتەوە، ئەویش ئیزنی دا وشوی كردەوە»[1]. وفەرمودەی تریش هاتوە.

### ٣. حیكمەت لە دانانی عیددە:

حیكمەت لەمەدا: پاكبونەوەی ڕەحمی ئافرەتە لە دو گیانی بۆ ئەوەی وەچەكان تێكەڵ نەبن. هەروەها دەرفەتدانە بە مێردی تەڵاقدەر ئەگەر تەڵاقەكەی ڕەجعی بو وپەشیمان بویەوە بە خۆیدا بچێتەوە، هەروەها بۆ پاراستنی مافی كۆرپەلەكەیە ئەگەر جیابونەوەكە لە دو گیانیدا بو.

## پرسی دوەم: جۆرەكانی عیددە:

عیددەی ئافرەت ئەبێتە دو بەشەوە:

١- عیددەی مردن.

٢- عیددەی جیابونەوە.

### یەكەم: عیددەی مردن:

---

(١) أخرجه البخاري (٥٣٢٠).

عیددەیەكە واجبە لە سەر ئەو ئافرەتەی مێردەكەی مردوە، ولە دو حاڵەتیش بە دەر نیە:

- یان دو گیانە
- یان دو گیان نیە

جا ئەگەر دو گیان بو: ئەوا عیددەكەی بە دانانی كۆرپەلەكە كۆتایی پێ دێت ئەگەر دوای كات ژمێرێكیش بێت دوای مردنی مێردەكەی، لەبەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿وَأُولَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ [الطلاق:٤]، ولەبەر فەرمودەكەی میسوەری كوڕی مەخرەمەی پێشو: سەبیعەی ئەسلەمی ﵂ دوای مردنی مێردەكەی بە چەند شەوێك منداڵی بو، ئەوەبو هاتە خزمەتی پەیامبەر وداوای ئیزنی كرد شو بكات، ئەویش ئیزنی پێ فەرمو.

ئەگەریش دو گیان نەبو: ئەوا عیددەكەی چوار مانگ ودە ڕۆژە بە ڕەهایی ئیتر مێردەكەی چو بێتە لای یان نەچوبێت، لەبەر گشتێتی فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنْفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ [البقرة: ٢٣٤] «ئەوانەتان دەمرن وهاوسەر دوای خۆیان بە جێ دەهێڵن، پێویستە لە سەریان بۆ ماوەی چوار مانگ ودە ڕۆژ چاوەڕێ بكەن، كە ئەو ماوەیە تەواو بو ئەوا تاوانتان ناگات ئەی كار بە دەستانی ئافرەت لەوەی ئافرەت دەیكات لە چونە دەرەوە وخۆ ڕازاندنەوە وشو كردنەوە بە شێوازێكی شەرعی، خواش شارەزا وزانایە بە كردەوەكانتان، بە ئاشكرا ونائاشكرایەوە، لە سەریشی پاداشتان دەداتەوە»، هیچ شتێكیش نەهاتوە ئەم ئایەتە تایبەت بكات.

**دوەم: عیددەی جیابونەوە:** ئەو عیددەیەیە ئەبێت ئافرەت بیگرێت بە هۆی جیابونەوە لە میردەکەی بە هەڵوەشاندنەوە یان تەڵاق، یان خولعی دوای چونە لا. ئەمەش لە چەند حاڵەتێك زیاتر بە دەر نیە:

- یان دو گیانە
- یان دو گیان نیە
- خوێنی عادەی نیە بە هۆی منداڵیەوە یان تەمەنەوە.

جا ئەگەر دو گیان بێت: ئەوە عیددەکەی بە دانانی کۆرپەلەکە کۆتایی دێت، لەبەر گشتێتی فەرمایشتی: ﴿وَأُولَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ [الطلاق:٤].

ئەگەریش دو گیان نەبو ولەوانەشبو ئەکەوتە عادەوە: ئەوە عیددەکەی بە تێپەڕبونی سێ پاکی ئەبێت دوای جیا بونەوە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَنْ يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللَّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِنْ كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ [البقرة:٢٢٨] «وئافرەتانی تەڵاقدراو کە دەکەونە عادەوە پێویستە لە سەریان سێ سوڕی مانگانە چاوەڕی بکەن، بۆشیان حەڵاڵ نیە ئەوە بشارنەوە کە خوا لە ڕەحمیاندا دروستی کردوە لە کۆرپەلە یان خوێنی عادە، ئەگەر بڕوایان بە خوا وبە ڕۆژی دوایی هەیە».

ئەگەریش خوێنی عادەی نەدەبینی بە هۆی بچوکی یان تەمەنی بێ ئومێدی: ئەوا بە تێ پەڕبونی سێ مانگ بەسەر جیاب ونەوەکەی عیددەکەی کۆتایی پێ دێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ﴾ [الطلاق:٤].

## حوكمی تەڵاقدراو پێش چونە لای:

ئەگەر مێرد لە ژنەكەی جیابویەوە بە هۆی هەڵوەشاندنەوەوە یان تەڵاق پێش چونە لای ئەوە عیددەی نیە، لەبەر فەرمیشتەكەی خوا ﷻ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا﴾ [الأحزاب:٤٩]. هیچ جیاوازیەكیش نیە لە نێوان هاوسەری باوەڕدار وهی خاوەن كتێب بە كۆ دەنگی زانایان، كە باسی باوەڕدارانیش دەكات لە ڕوانگەی زۆرینەوەیە.

**پرسی سێیەم: پابەند بون (التزامات)ەكانی عیددە، ئەوەی لێی دەكەوێتەوە:**

١- **عیددەی تەڵاق:** ئەگەر ئافرەت عیددەی تەڵاقی لە مێردەكەی گرت بو، ئەوە لە دو حاڵەت بە دەر نیە:

- یا تەڵاقێكی ڕەجعیە.
- یا تەڵاقێكی بائینە.

**یەكەم: ئافرەتی عیددەگر بە هۆی تەڵاقێكی ڕەجعیەوە:**

ئەو ئافرەتەی عیددەی گرتوە لە تەڵاق، ئەمانەی خوارەی لێ دەكەوێتەوە:

١- واجبە شوێنی نیشتەجێ بونی بۆ دابین بكرێت لەگەڵ مێردەكەیدا، ئەگەر ڕێگرێكی شەرعی نەبو.

٢- واجبە خەرجی بكێشرێت لە بژێوی وبەرگ وجگە لەمانەش.

٣- پێویستە لە سەری لە شوێنی نیشتەجێب ونی بمێنێتەوە وجێی نەهێڵێت مەگەر بۆ زەرورەت، لەبەر فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنْتُمْ مِنْ وُجْدِكُمْ...﴾ [الطلاق:٦]، «ئەی مێرد! تەڵاقدراوەكان لە كاتی عیددەدا لە شوێنی نیشتەجێبونی خۆتاندا بیانهێڵنەوە بە پێی دارایی وبون وتوانای خۆتان...»، هەروەها

ئەفەرموێ: ﴿لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ﴾ [الطلاق:١] «وتەڵاقدراوان لە ماڵەکانیان دەر مەکەن تا عیددەکەیان تەواو دەبێت، وخۆشیان بۆیان نیە بڕۆنە دەرەوە مەگەر کارێکی گەن ونەشیاو بکەن وەك زیناکردن».

٤- حەرامە لە سەر ئافرەتەکە خوازبێنی کردنی بخاتە بەر دەم پیاوان، چونکە ئەم هێشتا بەستراوەتەوە بە مێردەکەیەوە بۆیە حوکمی هاوسەری هەیە، لەبەر فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُوا إِصْلَاحًا﴾ [البقرة:٢٢٨].

**دوەم: ئەگەر عیددەی گرتبو بە تەڵاقێکی بائن:**

لێرەشدا لە دو حاڵەت بە دەر نیە:

- یا دو گیانە.
- یا دو گیان نیە.

**یەکەم: ئەگەر هاتو دو گیان بو ئەوا ئەمانەی خوارەوەی لێ دەکەوێتەوە:**

١- شوێنی نیشتەجێ بونی لە سەر مێرد واجبە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ﴾ [الطلاق:١]. «ئەی پەیامبەری خوا! ئەگەر تۆ وباوەڕداران ویستتان هاوسەرەکانتان تەڵاق بدەن ئەوا لە کاتی پێشوازی عیددەکانیاندا تەڵاقیان بدەن وعیددەکانیشیان بژمێرن ولە خوا بترسن، تەڵاق دراوانیش لە ماڵەکانیان دەر مەکەن تا عیددەکەیان تەواو دەبێ، وخۆشیان بۆیان نیە بڕۆنە دەرەوە مەگەر کارێکی گەن ونەشیاو بکەن وەك زیناکردن».

٢- خەرجی کێشان، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَإِنْ كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ [الطلاق:٦] «ئەگەر هاوسەرە تەڵاقدراوەکانتان دو گیان بون، ئەوا نەفەقەیان بکێشن لە ماوەی عیددەکەیاندا تا کۆرپەلەکە دادەنێن».

٣- پابەندبون ودەرنەچون لەو ماڵەی عیددەی تێدا دەکێشێت مەگەر بۆ پێویسی، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ﴾ [الطلاق:١]. بەڵگەی دەرچونیشی بۆ پێویستی: فەرمودەکەی جابرە ﵁، ئەڵێ: پورەکەم تەڵاق درا، ویستی خورماکان لە دارەکانی بکاتەوە، پیاوێك ڕێگری لێکرد بێتە دەرەوە، ئەوەبو چوە خزمەتی پەیامبەر ﷺ، وئەویش فەرموی: «بَلَى، فَجُدِّي نَخْلَكِ، فَإِنَّكِ عَسَى أَنْ تَصَدَّقِي أَوْ تَفْعَلِي مَعْرُوفًا» «بۆ نا، برۆ بەر وبومەکەی لێ بکەوە، لەوانەشە صەدەقەیەك بکەیت یان چاکەیەك بکەیت»[١].

دوەم: ئەگەر دو گیان نەبو: ئەوە هەمو ئەوەی بۆ هەیە کە بۆ دو گیان هەیە جگە لە خەرجی کێشان وهاو واتاکانی، وەك: جل وبەرگ، ئەمانەی بۆ نیە، لەبەر فەرمودەکەی فاتیمەی کچی قەیس ﵂ کاتێك مێردەکەی ئەو یەك تەڵاقەشیدا کە مابوی، پەیامبەر فەرموی ﷺ: «لَا نَفَقَةَ لَكِ إِلَّا أَنْ تَكُونِي حَامِلًا» «خەرجیت بۆ نیە مەگەر دو گیان بیت»[٢].

## ٢- عیددەی مێرد مردو:

ئافرەت کە لە عیددەی مردنی مێردەکەیەتی، ئەم حوکمانەی لە سەرە:

---

(١) أخرجه مسلم (١٤٨٣).

(٢) أخرجه أبو داود (٢٢٨٦)، والنسائي (٦/٢١٠)، ومسلم (١٤٨٠) بمعناه، وصححه الألباني «صحيح سنن النسائي» (٣٣٢٤).

**أ.** پێویستە لە سەری عیددەی بگرێت لەو ماڵەی مێردەکەی تێدا مردوە وئەوی تێدا بوە، ئەگەر کرێش بێت یان دەستیار، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «امْكُثِي فِي بَيْتِكِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ» «لە ماڵەکەت بمێنەوە تا ماوەکەت کۆتایی پێ دێت»(1). لە ڕیوایەتێکی تردا: «امْكُثِي فِي بَيْتِكِ الَّذِي جَاءَ فِيهِ نَعْيُ زَوْجِكِ» «لەو ماڵەت کە هەواڵی مردنی مێردەکەت پێگەیشت بمێنەوە تا ماوەکەت کۆتایی پێ دێت»(2). دروستیش نیە بچێتە شوێنێکی تر مەگەر بە هۆی عوزرێکەوە، وەك ئەوەی لە خۆی بترسێت تێیدا بمێنێتەوە، یان بە ناچاری تێیدا دەر بکرێت یان لەبەر جگە لەمانە ئەوا دروستە بۆی بڕوا بۆ ئەو شوێنەی ئەیەوێت لەبەر زەرورەت.

**ب.** مانەوە لەو ماڵەی عیددەی تێدا دەگرێت وتێیدا دەرنەچێت مەگەر بۆ پێویستی، بۆشی دروستە بە ڕۆژ نەك بە شەو لە ماڵەکەی بێتە دەرەوە بۆ پێویستیەکانی، چونکە شەوان جێی خراپەکاریە، بۆیە تێیدا نایەتە دەرەوە مەگەر زەرور بێت بە پێچەوانەی ڕۆژەوە کە شوێنی جێبەجێکردنی پێداویستیەکانی.

**ج.** پێویستە لە سەری لە ماوەی عیددەکەدا خۆگرتنەوە (الإحداد) بۆ مێردەکەی بکات، دواجاریش بە وردی باسی ئیحداد دێت.

**د.** خەرجی بۆ نیە چونکە بە مردنی ژن ومێردایەتی کۆتایی هاتوە.

## پرسی چوارەم: خۆگرتنەوە (الإحداد)

پێناسەی حیداد وبەڵگەی شەرعی بونی:

---

(١) أخرجه الترمذي (١٢٢٤) وصححه، وابن ماجه (٢٠٣١)، وصححه الألباني «صحيح ابن ماجه» (١٦٥١)
(٢) [أخرجه ابن ماجه في الموضع السابق].

**١- پێناسەی (الإحداد):**

لە زماندا: بریتیە لە خۆگرتنەوە، ئەوترێ: (حادٌّ ومُحِدٌّ) ئەگەر ئافرەت واز لە خۆڕازاندنەوە وبۆن لە خۆدان بهێنێت.

لە شەرعیشدا: بریتیە لە وازهێنان لە خۆڕازاندنەوە وبۆن لە خۆدان وئەو شتانەی تریش کە حەزی بۆ لا دەجولێنن وداخوازی چونە لای دەکەن.

**٢- بەڵگەکانی شەرعی بونی خۆگرتنەوە:**

خۆگرتنەوە پێویستە لە سەر ئافرەتی مێرد مردو، لەبەر فەرمودەکەی ئوم حەبیبە ﵂، ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا» «حەڵاڵ نیە بۆ ئافرەتێك بڕوای بە خوا وڕۆژی دوایی هەبێت سێ ڕۆژ زیاتر خۆی بگرێتەوە بۆ هیچ مردویەك مەگەر ئافرەت بۆ مێردەکەی چوار مانگ ودە ڕۆژ خۆی دەگرێتەوە»[1]. هەروەها فەرمودەکەی ئوم عەتیەی ئەنساری ﵂ ئەڵێ: «كُنَّا نُنْهَى أَنْ نُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، وَلَا نَكْتَحِلَ وَلَا نَتَطَيَّبَ، وَلَا نَلْبَسَ ثَوْبًا مَصْبُوغًا إِلَّا ثَوْبَ عَصْبٍ» «ڕێگریمان لێ دەکرا سێ ڕۆژ زیاتر خۆبگرینەوە بە هۆی مردوەوە مەگەر بۆ مێرد ئەوە چوار مانگ ودە ڕۆژە، وچاو نەڕەژین وبۆن لە خۆمان نەدەین وبەرگی ڕەنگاو ڕەنگ نەپۆشین مەگەر بەرگی عەصب... تا کۆتایی»[2].

(١) أخرجه البخاري (٥٣٣٤)، ومسلم (١٤٨٦).

(٢) أخرجه البخاري (٥٣٤١)، ومسلم (٩٣٨). العَصْبُ: بەرگێکە خوریەکەی بۆیە دەکرێت پاشان دەچێنرێت، وناچەمێنرێتەوە وکۆ ناکرێتەوە، ئەوەی بۆی زیاد دەکرێت کۆ دەکرێتەوە ودەچەمێنرێتەوە، ئەوترێ: بُرْدَا عَصْبٍ، وبُرُودُ عَصْبٍ.

**هەروەها دەرهەق ئافرەتی خۆگرەوە ئەمانەی خوارەوە پێویستە:**

١- ڕێگری کردن لە دیاردەکانی خۆڕازاندنەوە وبۆن لە خۆدان، جا ڕێگری لێدەکرێت لە پۆشینی بەرگی ڕەنگا ورەنگی جوان وسەرنج ڕاکێش، وچاو نارەژێت، وخشڵ ناپۆشێت زێڕ بێت یان زیو یان شتی تر، وهیچ جۆرێکی بۆیە بەکار ناهێنێت، لەبەر فەرمودەکەی ئوم سەلەمە دەیداتە پاڵ پەیامبەر ﷺ: «الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا لَا تَلْبَسُ الْمُعَصْفَرَ مِنَ الثِّيَابِ، وَلَا الْمُمَشَّقَةَ، وَلَا الْحُلِيَّ، وَلَا تَخْتَضِبُ، وَلَا تَكْتَحِلُ» «ئافرەتی مێرد مردو بەرگی زەرد (الْمُعَصفر)[1]، وسور (الْمُمَشَّقَةَ)[2]، وخشڵ وزێڕ ناپۆشێت، وخەنە ناکات، وچاو نارەژێت»[3]. هەروەها لەبەر فەرمودەکەی ئوم عەتیەی ئەنساری پێشتر.

٢- پێویستە پابەندی ئەو ماڵە بێت عیددەی تێدا دەگرێت ونەیەتە دەرەوە مەگەر بۆ پێویستی، لەبەر فەرمودەکەی فورەیعەی کچی مالکی پێشتر.

(١) واتە: بە عوسفور ڕەنگکراو، ڕوەکێکە ڕەنگی زەردی لێ دەردەهێنرێت. وەرگێڕ.

(٢) واتە: بە (المِشْقِ) ڕەنگکراو، کە ڕەنگێکی سورە.

(٣) أخرجه أبو داود (٢٣٠٤)، والنسائي (٣٥٣٥)، وصححه الألباني «الإرواء» (٢١٢٩).

# دەروازەی نۆیەم

## لە بارەی شیر خواردنەوە «الرَّضاع»

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

**پرسی یەکەم: پێناسی شیر خواردن، وبەلگەی شەرعی بونی، ودانایی لێی:**

١- **پێناسەی شیر خواردن:** «الرّضاع» بە فەتحەی ڕائەکە بە کەسرەش ئەبێت: مژینی شیری مەمکە، یان خواردنەکەیەتی. لە شەرعیشدا: بریتیە لە مژینی شیری دوای دو گیانی لەلایەن منداڵێکی خوار دو ساڵ، یان خواردنەوەی، یا هاوشێوەکانی.

٢- **بەڵگەکانی شەرعی بونی شیر خواردن:** شیر خواردن شەرعیە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَإِنْ تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَى﴾ [الطلاق:٦] «ئەگەریش لەگەڵ دایکەکە لە سەر شیر دان بە کۆرپەلەکە ڕێك نەکەوتن، ئەوە با باوکەکە شیر دەرەڕێکی تر بگرێت»، هەروەها فەرمایشتی: ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمْ أَنْ تَسْتَرْضِعُوا أَوْلَادَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ [البقرة:٢٣٣] «ئەگەریش دایك وباوکەکە ڕێککەوتن لە سەر شیردان لە ڕێی شیردەرێکی ترەوە ئەوا هیچ تاوانیان ناگات».

٣- **حوکمی شیر خواردن:** حوکمی شیر خواردن هەمان حوکمی پشتە لە حەرام کردنی هاوسەر گیری، وبون بە مەحرەم، وحەڵاڵ بونی تەنها کەوتن وتەماشا کردن. جا شیر خواردن ئەبێتە مایەی خزمایەتی ولابەری حەرامێتیە بە مەرجەکانیەوە.

بەڵگەش لە سەر حەرامکردن بە شیر خواردن: قورئان وسوننەت وکۆ دەنگیە؛ سەبارەت بە قورئان: فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ مِنَ الرَّضَاعَةِ﴾ [النساء:٢٣]. سەبارەت بە سوننەتیش: فەرمودەکەی

عائیشەیە ﵂ ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «إِنَّ الرَّضَاعَةَ تُحَرِّم مَا تُحَرِّمُ الوِلاَدَة» «شیرخواردن ئەوە حەرام دەکات کە لە دایك بون حەرامی دەکات»[1]. وفەرمودەکەی [پێشتری] ئیبن عەبباسە ﵄ ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «ئەو بۆ من حەڵاڵ نیە، ئەو کچی برای شیریمە، بە شیریش ئەوە حەرام دەبێت کە بە لە دایك بون حەرام دەبێت». سەبارەت بە کۆ دەنگیش: زانایانی ئوممەت کۆکن لە سەر حەرام کردن بە شیر خواردن.

## پرسی دوەم: مەرجەکانی شیر خواردنی حەرام کەر، وچی دەکەوێتەوە لە خزمی شیری:

١- **مەرجەکانی شیردانی حەرام کەر:** شیر خواردن نابێتە مایەی خزمایەتی[2] وحەرامیەتیش هەڵ ناگرێت، مەگەر بە دو مەرج:

أ. ئەبێت شیردانەکە لە ماوەی دو ساڵی سەرەتای تەمەنی شیرە خۆرەکە بێت، جا دوای دو ساڵەکە کاریگەری نابێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ﴾ [البقرة:٢٣٣]، لەگەڵ فەرمایشتی: ﴿وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ﴾ [لقمان:١٤] «هەڵگرتنی ولە شیر بڕینەوەی لە ماوەی دو ساڵ دایە»، ولەبەر فەرمودەکەی ئوم سەلەمە ﵂ ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «لَا يُحَرِّمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ إِلَّا مَا فَتَقَ الْأَمْعَاءَ فِي الثَّدْيِ وَكَانَ قَبْلَ الْفِطَامِ» «بە شیرخواردن هیچ حەرام نابێت مەگەر ئەو شیر خواردنەی لە مەمکەوە

---

(١) أخرجه البخاري (٢٦٤٦)، ومسلم (١٤٤٤).

(٢) [وەرگێڕانی «قرابة الرضاع» بە: «کەسی شیری» وردترە تا «خزمی شیری»، جا مرۆڤ بە برا ومامە و... ناڵێ: خزم، بەڵکو ئەڵێ: کەسمە، نزیکمە، بەڵام لە چوار چێوەکانی ئێرەدا «کەسی شیری» واتای تر دەبەخشێت ومێشکی خوێنەریش پەرتەوازە دەکات، بۆیە وتمان: «خزمی شیری»].

بێت وڕیخۆڵە بکاتەوە، وپێش لە شیر بڕانەوەش بێت»[1]. واتای کردنەوە وتەقاندنی ڕیخۆڵە: یانی بگا پێی وجێ بگرێ. جا شیر خواردنی حەرامکەر ئەوەیە لە تەمەنی منداڵیدا بێت، وجێی خواردنی بۆ بگرێتەوە، ئەمەش ئەو کاتە ئەبێت کۆرپەلەکە منداڵ بێت وشیرەکە برسیەتی پڕ بکاتەوە وگۆشت بڕوێنێت.

ب. ئەبێت پێنج جاری تێرکەر یان زیاتر بێت، لەبەر فەرمودەکەی عائیشە ﵂ ئەڵێ: «كَانَ فِيمَا أُنْزِلَ مِنَ الْقُرْآنِ: ﴿عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ﴾، ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ، فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَهُنَّ فِيمَا يُقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ» «لەو ئایەتانەی لە قورئاندا دابەزی: ﴿دە جار شیر خواردنی زانراو ودیار حەرام دەکەن﴾، ئینجا سڕایەوە بۆ پێنج جاری دیار، ئەوەبو ئەوەندە درەنگ نەسخ بویەوە کە پەیامبەر ﷺ وەفاتی کرد هێشتا کۆمەڵێك لە هاوەڵان هەر دەیانخوێند»[2]. ئەمەش لەو جۆرەیە کە خوێندنەوەکەی سڕاوەتەوە بەڵام حوکمەکەی ماوەتەوە. ئەگەریش شیرەکە بگاتە هەناوی منداڵەکە بە بێ لە مەمکەوە خواردن، وەك ئەوەی بیتکێنێتە دەمی، یان لە قاپ وئەو شتانەدا بیخواتەوە، ئەوا حوکمەکەی هەر حوکمی شیردانە، بە مەرجێك پێنج جار دو بارە ببێتەوە.

٢- **ئەوەی لە خزمی شیری دەبێتەوە:** ئەو خزمایەتیەی بە هۆی شیر خواردنەوە دروست ئەبێت دو حوکمی لێ دەبێتەوە، کە بریتیە لە:

- حوکمێك پەیوەستە بە حەرامیەتیەوە.
- حوکمێك پەیوەستە بە حەڵاڵێتیەوە.

---

(١) أخرجه الترمذي (١١٣١) وقال. حسن صحيح، وصححه الألباني في «الإرواء» (٢١٥٠).
(٢) أخرجه مسلم (١٤٥٢).

سەبارەت بەوەی پەیوەستە بە حەرامێتیەوە: ئەوە شیردان کاریگەری هەیە لە حەرامکردنی هاوسەرگیری وەك خزمایەتی پشت، بۆیە دایکی شیریت وبەرەو سەرەوە وکچکی شیریت وبەرەو خوارەوە، وخوشکی شیری دایك وباوکی بێت یا یەکێکیان لێت حەرامن بە هۆی ئەم نزیکایەتیەی شیر خواردن دروستی کردوە.

سەبارەت بەوەی پەیوەستە بە حەڵاڵکردنەوە: جا هەمو ئەوەی بۆت حەڵاڵە لە نێوان تۆ ونزیکێکی پشتیت وەك دایك وخوشك، هەمان ئەوەت بۆ حەڵاڵە لە نێوان تۆ وئەودا لە ڕێی شیر خواردنەوە، بۆیە تەماشاکردن وتەنها کەوتنی نێوانیان حەڵاڵە، لەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] عائیشە ﵂ ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «شیر خواردن ئەوە حەرام دەکات کە لە دایك بون حەرامی دەکات».

## پرسی سێیەم: سەلماندنی شیر خواردن:

شیر خواردن دەسەلمێت بە شایەتیدانی یەك ئافرەتی چاکی ناسراو بە ڕاستگۆیی، شایەتی لە سەر خۆی بدات یان بۆ جگە لە خۆی کە پێنج جار شیری داوە بە منداڵەکە لە ماوەی دو ساڵەکەدا، ئەمەش لەبەر فەرمودەکەی عوقبەی کوڕی حارس ﵁، ئەڵێ: ژنم هێنا، ئافرەتێك هات وتی: شیرم بە هەردوکتان داوە، ئەڵێ: ئەوەبو چومە خزمەتی پەیامبەر ﷺ ئەویش فەرموی: «وَكَيْفَ وَقَدْ قِيلَ؟ دَعْهَا عَنْكَ» «جا چۆن لەگەڵی دەژیت لە کاتێکدا وا ئەڵێن!؟ وازی لێ بهێنە، یان شتێکی وای وت»[1]. هەروەها لەبەر ئەوەی ئەمە شایەتی دانە لە سەر عەورەت [کە ئەبێت داپۆشراو بێت]، جا شایەتیدانی ئافرەتی تێدا وەردەگیرێت بە تەنها بە بێ پیاو وەك منداڵ بون، [چونکە تەنها ئافرەتان ئامادەی دەبن ودەیبینن زۆربەی جار].

---

(١) أخرجه البخاري (٢٦٦٠).

# دەروازەی دەیەم

## لە بارەی بە خێوکردن وحوکمەکانیەوە «الحَضَانَة وأَحْكَامُها»

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

### پرسی یەکەم: پێناسەی، وحوکمەکەی، وبۆ کێ دەبێت؟

**١- پێناسەی** «الحَضَانَة»:

لە زماندا بریتیە لە پەروەردەکردنی منداڵ چاودێریکردنی، لە «الحِضْن»ـەوە وەرگیراوە کە بریتیە لە کۆش، چونکە بەخێو کەر وپەروەردە کەر منداڵەکە دەخاتە کۆشی. وبەخێو کەری پیاو وژنیش (الحاضِن والحاضِنَة): ئەو کەسەن کە سپێردراون بە منداڵ تا بیپارێزن وبەخێوی بکەن.

بەخێوکردنیش لە شەرعدا: هەستانە بە خێوکردن وپاراستنی ئەوەی بە سەربەخۆیی کاروباری خۆی پێ بەڕێوە نابرێت، وپەروەردەکردنی لە ڕوی جەستەیی ومەعنەویەوە، وپاراستنی لەوەی ئازاری دەدات.

**٢- حوکمەکەی:**

ئەگەر کەسی تر دەست نەکەوێت ئەوا ئەبێتە فەرزی عەین دەرهەق بەخێو کەرەکە، یان دەست بکەوێت بەڵام بەخێو کراوەکە کەسی تر قەبوڵ نەکات، لەبەر ئەوەی تیا ئەچێت یان زیانی پێ دەگات بە نەپاراستنی، ئەو کاتە واجبە لە تیا چون بپارێزرێت، ئەگەریش زیاتر لە بەخێوکەرێك هەبو ئەوسا فەرزی کیفایەیە.

**٣- مافی بەخێوکردن بە کێ دەدرێت؟**

بەخێو کردن بۆ ژنان وپیاوانە لەوانەی شایستەین، ئەوەندە هەیە ئافرەتان دەخرێنە پێش پیاوانەوە لە بەخێو کردندا، چونکە ئەوان دڵسۆزتر ونەرم ترن بە منداڵ،

ئەگەریش ئەو مافەیان نەبو ئەوا دەگوازرێتە بۆ پیاوان چونکە ئەوان زیاتر توانای پاراستن وجێ بەجێ کردنی بەرژەوەندیەکانی منداڵیان هەیە.

وبەخێوکردنی منداڵیش لە ئەستۆی دایك وباوکیەتی ئەگەر هاوسەرگیری نێوانیان بەردەوام بو، بەڵام ئەگەر جیابونەوە ڕویدا بو ئەوە بەخێوکردن بۆ دایکە ئەگەر شوی نەکردبوە بێگانەیەك بۆ بەخێوکراوەکە، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ بۆ ئەو ئافرەتەی پیاوەکەی تەلاقی دابو وئەشی ویست منداڵەکەشی لێ بسێنێت: «أنتِ أحق به ما لم تنكحي» «تۆ لە پێشتری مەگەر شو بکەیتەوە»[1].

**ئەوەی بەخێوکردنیش دەیخوازێت:** پاراستنی بەخێو کراو، وگرتنەوەشی لە هەر شتێك زیانی بۆی هەبێت، وپەروەردە کردنیەتی تا گەورە دەبێت، هەروەها کردنی هەمو ئەو شتانەیە کە لە بەرژەوەندی ئەودایە: لە ئاگادار بون لە خواردن وخواردنەوەی وشۆردنی، وپاك وخاوێن کردنەوەی دەرون ودەرەوەی، وئاگا بون لە خەوتنی وهەستانی، وهەستان بە سەرجەم پێداویستی وداخوازیەکانی.

## پرسی دوەم: مەرجەکانی بەخێوکەر، وڕێگریەکانی بەخێوکردن:

١- ئیسلامەتی: جا کافر بۆی نیە موسڵمان بەخێو بکات، چونکە نابێت ببێتە کار بە دەستی موسڵمان، هەروەها لەبەر ئەوەی مەترسی هەیە لە سەر دینی بەخێوکراو ولە ئیسلام بیباتە دەرەوە بۆ بێ باوەڕی.

٢- پێگەیشتن وژیری: جا منداڵ وشێت وتێکچو بەخێوکردنیان بۆ نیە، چونکە ئەوان ناتوانن خۆیان بەڕێوە بەرن وپێویستیان بە کەسێکە خۆیان بەخێو بکات.

---

(١) أخرجه أحمد (٢/١٨٢)، وأبو داود (٢٢٧٦)، والحاكم (٢/٢٠٧) وصححه وافقه الذهبي، وحسَّنه الألباني «الإرواء» (٢١٨٧).

٣- دەست پاك وداوێن پاك بێت: جا خائین وفاسق بەخێوکردنیان بۆ نیە، چونکە جێی ئەمانەت نین، ومانەوەی بەخێو کراویش لە لایاندا زیانە بۆ خۆی ومالّیشی.

٤- بتوانێت لە ڕوی جەستەیی ودارابییەوە هەستێت بە کاروباری بەخێوکراو: جا بێ توانایەك بە هۆی تەمەنەوە، یان عەیبدارێك وەك لالّی وکەڕی بەخێوکردنی بۆ نیە، هەروەها هەژارێکی نەدار، یان ئەوەی سەرقالّە بە کاروبارێکی زۆرەوە وئەبێتە مایەی زایەبونی بەخێوکراو= بەخێوکردنیان بۆ نیە.

٥- ئەبێت بەخێوکراو هیچ نەخۆشیەکی گوازراوەی نەبێت، وەك گەڕی وهاوشێوەکانی.

٦- ئەبێت سەر ڕاست بێت: جا گەمژەیەکی دەست باد بەخێوکردنی بۆ نیە بۆ ئەوەی مالّی بەخێوکراوەکە لە ناو نەدات.

٧- ئەبێت بەخێوکەرەکە ئازاد بێت: جا کۆیلە بەخێوکردنی بۆ نیە، چونکە بەخێوکردن ویلایەت وکار بە دەستیە، وکۆیلەش شیاو نیە بۆ کار بە دەستی.

ئەمە ئەو مەرجانەیە کە گشتیە لە ژنان وپیاواندا. مەرجێکی تر هەیە بۆ ئافرەت زیاد دەکرێت، ئەویش ئەوەیە: ئەبێت شوی بە بێگانەیەك بۆ مندالّەکە نەکردبێت، چونکە ئەو کاتە سەرقالّە بە مافی مێردەوە، ولەبەر فەرمودەکەی [پێشو]: «تۆ لە پێشتری بە بەخێوکردنی مەگەر شو بکەیتەوە».

بەخێوکردن دەکەوێت بە بونی ڕێگرێکی لەو ڕێگریانەی باس کرا، یان نەمانی مەرجێك لە مەرجە شایستەییەکانی پێشو.

**پرسی سێیەم: لەو حوکمانەی پەیوەستن بە بەخێوکردنەوە:**

- ئەگەر یەکێك لە دایك وباوکی بەخێوکراو سەفەرێکی درێژی کرد ومەبەستیشی زیان گەیاندن نەبو وڕێگاکەش ئەمان بو، ئەوا باوك لە پێشترە بە بەخێوکردن، ئیتر

مێردەکە سەفەری کردبێت یان نیشتەجێ بێت، چونکە ئەو هەڵدەستێت بە پەروەردەکردنی منداڵ وپارێزگاری لێکردنی، کە دوریش بێت منداڵ زایە دەبێت.

- ئەگەر سەفەرەکەی بۆ شارێکی نزیك بو وکەمتر بو لە ماوەی نوێژ کورت کردنەوە، ئەوا بەخێوکردن لە ئەستۆی دایکە، ئیتر دایکەکە سەفەر بکات یان نیشتەجێ بێت، چونکە ئەم زیاتر دڵسۆزترە، وباوکیش دەتوانێت سەرپەرشتی بکات وئاگای لێ بێت.

بەڵام ئەگەر سەفەرەکە درێژ بو ولەبەر پێویستیەك بو، بەڵام ڕێگاکە ئەمان بو ئەوا بەخێوکردن لە ئەستۆی نیشتەجێیە.

- بەخێوکردن لە تەمەنی حەوت ساڵاندا کۆتایی دێت، دوای ئەوە نێرینە لە نێوان دایك وباوکیدا سەر پشك دەکرێت ولای ئەوەیان دەمێنێتەوە کە هەڵی دەبژێرێت، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «يَا غُلَامُ هَذَا أَبُوكَ وَهَذِهِ أُمُّكَ فَخُذْ بِيَدِ أَيِّهِمَا شِئْتَ» «ئەی ڕۆڵە! ئەمە باوکتە وئەمەش دایکت، دەستی کامیانت دەوێت بیگرە» ئەویش دەستی دایکی گرت وبردی[1]. هەروەها عومەر وعەلیش ﵄ بڕیاریان بە سەر پشك کردن بو.

سەر پشکیش ناکرێت مەگەر دوای عەقڵ گرتن، ودایك وباوکەکەش ئەهلی بەخێو کردن بن. سەر پشك کردنیش تایبەتکرا بە حەوت ساڵانەوە، چونکە سەرەتای تەمەنێکە کە شەرع تێیدا فەرمانی پێ کردوە بە نوێژ، جا ئەگەر منداڵەکە باوکی هەڵبژارد ئەوە شەو ورۆژ لای دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی پەروەردەی بکات وئەدەبی

(١) أخرجه أحمد (٢/٢٤٦)، وأبو داود (٢٢٧٧)، والترمذي (١٣٧٥) وقال: «حسن صحيح»، والحاكم (٤/٩٧) وصححه، وافقه الذهبي. وصححه الألباني «الإرواء» (٢١٩٢).

بدات، ورێگریشی نابێت لە سەردان كردنی دایكی، ئەگەریش دایكی هەڵبژارد ئەوا بە شەو لای دەبێت وبە ڕۆژیش لای باوكی بۆ ئەوەی ئەدەبی بدات وپەروەردەی بكات، هەروەها لەبەر ئەوەی ڕۆژ شوێنی كاتی جێ بەجێكردنی پێداویستیەكان وئیشی پیشەوەرانە.

مێینەش ئەگەر گەیشتە حەوت ساڵی ئەوە لای باوكی دەبێت، چونكە زیاتر دەیپارێزێت وشیاوترە لە كار بە دەست گرتنی تا جگە لە خۆی، هەروەها لەبەر ئەوەی نزیكە لە تەمەنی شو كردنەوە وباوكیش كار بە دەست (وَلِيُّ أَمْر)یەتی وخوازبێنی لای ئەو دەكرێت، وئەویش شارەزاترە كێ هاو شانیەتی لە داواكەران. ڕێگریش ناكات لە سەردان كردنی دایكی ئەگەر ترسی حەرامی نەبو وەك ئەوەی بترسێت خراپ ببێت وهتد. ئەگەریش باوك نەیتوانی بیپارێزێت، بە هۆی سەرقاڵی یا تەمەن یا نەخۆشی یا كەم دینیەوە، ودایكەكەش چاكتر وبە تواناتر بو ئەوا ئەو لە پێشترە.

هەروەها ئەگەر باوك ژنی هێنا وخستیە لای باوەژن وئەویش ئازاری دەدا وكەم تەرخەمی دەرهەق دەكرد، ئەوا دایك لە پێشترە بە بەخێوكردن.

- كرێی بەخێوكردن -ئیتر دایكی بەخێوكەری بێت یان نا- لە ماڵی بەخێو كراوەكە دەدرێت ئەگەر هەیبو، ئەگەریش نەیبو ئەوا لە ماڵی كار بە دەستەكەی، وئەوەی بژێوی ئەمی لە سەرە دەدرێت.

# دەروازەی یانزە

## لە بارەی بژێوی وخەرجی کێشان «النَّفَقَات»

دو پرسی لە خۆ گرتوە:

**پرسی یەکەم: پێناسەی بژێوی، وجۆرەکانی:**

أ. **پێناسەی «النَّفَقَة»:**

لە زماندا لە «الإِنْفَاق»ـەوە وەرگیراوە، کە لە بنەڕەتدا بریتیە لە دەکردن وتەواوکردن، وئینفاقیش بە کار ناهێنرێت مەگەر بۆ خێر وچاکە. لە شەرعیشدا: خەرجی کێشانە بە ئەندازەی بەس وکیفایەت بۆ ئەوانەی بژێویان دەکێشێت بە چاکە، لە خواردن وبەرگ وشوێنی نیشتەجێبون، وهاوماناکانیان.

ب. **جۆرەکانی خەرجی:**

١- خەرجی خۆ کێشان.

٢- خەرجی کێشانی لقەکان لە سەر بنەچەکان.

٣- خەرجی کێشانی بنەچەکان لە سەر لقەکان.

٤- خەرجی هاوسەر لە سەر مێرد.

**یەکەم: خەرجی خۆ کێشان:**

پێویستە لە سەر مرۆڤ لە خەرجی کێشانی خۆیەوە دەست پێ بکات ئەگەر توانای هەبو، لەبەر فەرمودەکەی جابر ﵁، ئەڵێ: پیاوێکی خێڵی عوزرە کۆیلەیەکی خۆی ئازاد کرد لە «دُبُر»ەوە[1] تا ئەوەی پەیامبەر ﷺ پێی فەرمو:

---

(١) تدبیر العبد: پەیوەستکردنی ئازادکردنی کۆیلەیە بە مردنی خاوەنەکەیەوە، ئەڵێ: کەی مردم تۆ ئازادیت.

«ابْدَأْ بِنَفْسِكَ، فَتَصَدَّقْ عَلَيْهَا فَإِنْ فَضَلَ شَيْءٌ، فَلِأَهْلِكَ فَإِنْ فَضَلَ عَنْ أَهْلِكَ شَيْءٌ فَلِذِي قَرَابَتِكَ» «لە خۆتەوە دەست پێ بکە وبژێوی خۆت بدە، ئەگەر شتێك مایەوە بۆ خێزانەکەت، ئەگەر شتێك لەوەیش مایەوە ئەوە بۆ نزیکەکانت لە خزمانت»[1].

**دوەم: بژێوی لقەکان:**

پێویستە لە سەر باوك وبەرەو سەرەوە بژێوی کوڕەکەی وبەرەو خوارەوە بکێشێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ [البقرة:٢٣٣]. جا لە سەر باوك پێویستی دەکات بژێوی شیردانی کۆرپەلەکەی بکێشێت. هەروەها لەبەر فەرمودەکەی عائیشە ﵂ کەوا هیندی کچی عوتبە وتی: ئەی پەیامبەری خوا! ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕژدە، ئەوەندەم پێ نادات بەشی خۆم ومنداڵەکانم بکات مەگەر خۆم شتێك ببەم وپێی نەزانێت، فەرموی: «خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدُكِ بِالمَعْرُوف» «ببە ئەوەندەی بۆ خۆت ومنداڵەکانت بەسە بە چاکی»[2].

**سێیەم: بژێوی بنەچەکان:**

بژێوی دایك وباوك پێویستە لە سەر منداڵەکانیان، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا﴾ [لقمان:١٥] «وله دونیادا بە چاکی لەگەڵیاندا بژی بەس نەگاتە تاوان»، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾ [الإسراء:٢٣] «خوا فەرمانتان پێ دەکات لەگەڵ دایك وباوکانتانیش باش بن». خەرجی کێشانیشیان بەشێکە لە چاك بون لەگەڵیان، بەڵکو ئەوە لە گەورەترین چاکەکردنە لەگەڵ دایك وباوك. هەروەها لەبەر فەرمودەکەی عائیشە ﵂، ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ

(١) أخرجه مسلم (٩٩٧).
(٢) أخرجه البخاري (٢٢١١)، ومسلم (١٧١٤).

فەرمویەتی: «إِنَّ مِنْ أَطْيَبِ مَا أَكَلَ الرَّجُلُ مِنْ كَسْبِهِ ولَدُهُ مِنْ كَسْبِهِ» «بەڕاستی پاکترین شتێك پیاو بیخوات ئەوەیە هی کەسابەتی خۆی بێت، منداڵەکەشی لە کەسبی خۆیەتی»[1]. هەروەها لەبەر فەرمودەکەی عەمری کوڕی عاص ﷺ، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «أَنْتَ وَمَالُكَ لِوَالِدِكَ، إِنَّ أَوْلَادَكُمْ مِنْ أَطْيَبِ كَسْبِكُمْ، فَكُلُوا مِنْ كَسْبِ أَوْلَادِكُمْ» «خۆت وماڵەکەتیش هی باوکتە، منداڵەکانتان لە پاکترینی کەسابەتەکانتانن، جا بخۆن لە کەسابەتی منداڵەکانتان»[2].

**چوارەم: بژێوی هاوسەر:**

بژێوی هاوسەر لە سەر مێرد واجبە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنْفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ﴾ [النساء:٣٤]، وفەرمودەکەی جابری کوڕی عەبدوڵا لە میانەی باسی حەجەکەی پەیامبەردا ﷺ وتێیدا هاتوە: «وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ، وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ» «ومافی ئافرەتانە بە سەرتانەوە بژێویان بدەن وجل وبەرگیان بۆ بکەن بە چاکی»[3]، هەروەها لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ لە حەدیسەکەی جابری پێشتردا: «ئەگەر شتێك مایەوە ئەوە بیدە خێزانەکەت». هەروەها فەرمودەکەی عائیشەی پێشتر کە تێیدا هاتبو پەیامبەر ﷺ بە هندی فەرمو: «ببە ئەوەندەی بۆ خۆت ومنداڵەکانت بەستانە بە چاکی». کەواتە پێویستە لە سەر مێرد خەرجی هاوسەرەکەی بکێشێت، لە ڕوی خواردن وشوێنی نیشتەجێ بون وجل وبەرگ کە بۆ هاوشێوەی ئەو بگونجێت.

---

(١) أخرجه الترمذي (١٣٥٨)، وأبو داود (٣٥٢٨) [واللفظ له]، والنسائي (٢٤١/٧)، وابن ماجه (٢١٣٧)، وصححه الشيخ الألباني «صحيح النسائي» (٤١٤٤).
(٢) أخرجه أبو داود (٣٥٣٠) [واللفظ له]، وصححه الألباني (الإرواء ٨٣٨).
(٣) أخرجه مسلم (١٢١٨).

ئەم بژێویەش پێویستە بۆ هاوسەرێك کە لایەتی ولە ئەستۆیەتی، هەروەها تەڵاقدراوی ڕەجعی تا لە ماوەی عیددەکەی بێت، بەڵام تەڵاقدراوی بائین ئەوە نە خەرجی بۆ هەیە نە شوێنی نیشتەجێ بون، مەگەر دو گیان بێت ئەوە خەرجی بۆ هەیە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَإِنْ كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ [الطلاق:٦].

## پرسی دوەم: خەرجی کۆیلە[١]:

أ- **حوکمی خەرجی کێشانی کۆیلەکان:** پێویستە لە سەر خاوەن کۆیلە خەرجیەکەی بکێشێت لە خواردن وجل وبەرگ وشوێنی نیشتەجێبون بە چاکە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِي أَزْوَاجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ﴾ [الأحزاب:٥٠]، هەروەها پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: «لِلْمَمْلُوكِ طَعَامُهُ وَكِسْوَتُهُ» «کۆیلە خواردن وجل وبەرگی لە سەر خاوەنەکەیەتی»[٢]. واجبە نەرم بێت لەگەڵیاندا، ولە سەروی توانای خۆیانەوە ئەرك بەسەریاندا نەدات، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «وَلَا تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ، فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ» «توانای شتێکیان نەبو مەیدەن بە سەریاندا، ئەگەریش داتان بەسەریاندا یارمەتیان بدەن»[٣].

ب- **ژن هێنان بۆ کۆیلە وبە شودانی کەنیزەك:** ئەگەر کۆیلە داوای هاوسەرگیری کرد ئەوا خاوەنەکەی ژنی بۆ دەهێنێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَأَنْكِحُوا الْأَيَامَى مِنْكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ﴾ [النور:٣٢] «ئەی باوەڕداران!

---

(١) [پرسەکەم دابەش کردوە]
(٢) أخرجه مسلم (١٦٦٢).
(٣) أخرجه مسلم (١٦٦١).

ئەوانەی هاوسەرگیریان نەکردوە لە ئازادەکانتان، وکۆیلە وکەنیزەکە چاکەکانتان هاوسەرگیریان بۆ دابین بکەن»، ولەبەر ئەوەی ئەگەر واز بهێنێت لە ژن هێنان مەترسی توشبونی خراپەی لێدەکرێت. ئەگەریش کەنیزەك داوای بە شودانی کرد، خاوەنەکەی سەر پشکە لە چونە لای، وبەشودانی، وفرۆشتنی، بۆ ئەوەی زیانی لێ دور بخاتەوە.

## پرسی سێیەم: خەرجی ئاژەڵان:

پێویستە لە سەر خاوەن ئاژەڵ خواردن وخواردنەوەی پێ بدات، وهەستێت بە کـار وبارەکانی وچاودێری کردنی، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «دَخَلَتِ امْرَأَةٌ النَّارَ فِي هِرَّةٍ رَبَطَتْهَا، فَلَا هِيَ أَطْعَمَتْهَا، وَلَا هِيَ أَرْسَلَتْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الْأَرْضِ حَتَّى مَاتَتْ هَزْلًا» «ئافرەتێك ڕۆیشتە ئاگرەوە بە هۆی پشیلەیەکەوە بەستیەوە، نـە ئەوەبو خۆی خواردنی پێ بدات، نە ئەوەش بو بەرەڵای بکات خۆی لە خاشاکی زەوی بخوات، تا لاواز بو وتۆپی»[1]. ئەمەش بەڵگەیە لە سەر واجبێتی بژێوی دابـین کـردن بۆ ئاژەڵی خاوەندار، چونکە ئافرەتەکە چوە ئاگرەوە بەهۆی بژێوی دابـین نـەکردن بـۆ پشیلەکە، بە هەمان شێوە ئاژەڵە خاوەندارەکانی تر.

ئەگەریش خاوەن ئاژەڵەکە نەیتوانی بژێوی بدات، ناچار دەکرێت بیفرۆشێت یان بە کرێی بدات، یان سەری ببڕێت ئەگەر ئەخورا، چونکە مانەوەی لە ژێر موڵکی ئـەودا وبژێوی بۆ دابین نەکات ستەمە، ستەمیش پێویستە لا ببرێت.

---

(١) أخرجه مسلم (٢٦١٩).

# دەیەم: بەشی تاوانەکان (الجِنَایَات)

لە سێ دەروازەش پێك هاتوە:

دەروازەی یەکەم: لە بارەی تاوانەکانەوە

دەروازەی دوەم: لە بارەی خوێن بایییەوە

دەروازەی سێیەم: لە بارەی قەسامەوە

# دەروازەی یەکەم

## لە بارەی تاوان ودەست درێژیەکانەوە[1] «الجِنَایَات»

چەند مەسەلەیەکی لە خۆ گرتوە:

**پرسی یەکەم: مانای «جِنَایَات»، وبەشەکانی:**

**أ- پێناسەی «الجِنَايَة»:**

کۆکەی «جنایات»ـە، کە لە زماندا: بریتیە لە دەست درێژی کردنە سەر جەستە یان ماڵ یان ناموس وکەسایەتی، بەڵام زاناکان بەشی تاوانەکانیان تایبەت کردوە بە دەست درێژی کردنە سەر جەستە، وبەشی حدودەکانیان تەرخان کردوە بە دەست درێژی کردنە سەر ماڵ وناموس وکەسایەتی.

جا جنایەت لە شەریعەتدا: بریتیە لە دەست درێژی کردنە سەر جەستە بە شێوەیەك کە تۆڵە کردنەوە، یان ماڵ، یان کەفارەت پێویست دەکات.

**ب- بەشەکانی جنایەت:**

دەست درێژی ئەبێتە دو بەشەوە:

- دەست درێژیکردنە سەر نەفس.
- دەست درێژیکردنە سەر جگە لە نەفس.

**پرسی دوەم: دەست درێژیکردنە سەر نەفس:**

ئەمەش هەمو کردەوەیەکە ئەبێتە مایەی دەرچونی ڕوح، کە بریتیە لە کوشتن. موسڵمانانیش کۆکن لە سەر حەرامێتی کوشتن بە نارەوا، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا

---

(١) [لە دو ڕوانگەی جیاوازە ئەکرێ هەم بە تاوانەکان، هەم بە دەست درێژی وەر بگێڕدرێت].

ﷻ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إِلَّا بِالْحَقِّ﴾ [الإسراء:٣٣]. «وئەو نەفسە مەکوژن کە خوا قەدەغەی کردوە مەگەر بە هەقێکی شەرعی وەکو تۆڵەکردنەوە...». ولەبەر فەرمودەکەی ئیبن مەسعود ﷺ، کە پەیامبەری خوا فەرموی: «لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ، إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالْمَارِقُ مِنَ الدِّينِ التَّارِكُ الْجَمَاعَةَ» «خوێنی هیچ موسڵمانێك حەلاڵ نیە کە شایەتی بدات بەوەی هیچ پەرستراوێکی هەق نیە مەگەر الله، ومن پەیامبەری خوام مەگەر بە سێ شت: نەفس بەرامبەر بە نەفس، نا سەڵتێکی زینا کەر، ودەرچو لە دین ووازهێنەر لە کۆمەڵی موسڵمانان»[1]. جا حەرام بونی کوشتن بە ناڕەوا سەلماوە بە قورئان وسوننەت وکۆ دەنگی.

## حوکمی بکوژ بە ناڕەوا:

ئەگەر کەسێك کەسێکی کوشت بە ئەنقەست وبە ناڕەوا ئەوە حوکمەکەی ئەوەیە فاسقە، چونکە تاوانێکی گەورەی کردوە، وخوای مەزنیش کوشتنی زۆر بە گەورە داناوە، وەك ئەفەرموێ: ﴿مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا﴾ [المائدة:٣٢] «هەر کەس کەسێك بکوژێت بە بێ هۆکارێك وەك تۆڵەکردنەوە یان خراپەکاریەك لە سەر زەوی بە هەر جۆرێك لە جۆرەکانی خراپەکاری کە ئەبێتە مایەی کوشتن وەك شیرك وجەردەیی، ئەوا وەکو ئەوە وایە هەمو خەڵکی کوشتبێت بە هۆی ئەوەی شایستەی سزایەکی گەورەی خوایە». پەیامبەریش ﷺ ئەفەرموێ: «لَنْ يَزَالَ الْمُؤْمِنُ فِي فُسْحَةٍ مِنْ دِينِهِ، مَا لَمْ يُصِبْ دَمًا حَرَامًا» «بەردەوام موسڵمان لە فراوانیدایە لە دینەکەیدا ئەگەر خوێنێکی حەرامی

---

(١) أخرجه البخاري (٣٣٣٥)، ومسلم (١٦٧٧).

نەرشتبێت»[1]، خوای مەزنیش هەڕەشە دەکات وئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا...﴾ [النساء:٩٣] «وهەرکەس دەست درێژی بکاتە سەر باوەڕدارێك وبیکوژێت بە ئەنقەست وبە ناهەق ئەوە سزاکەی دۆزەخە وتێیدا دەمێنێتەوە لەگەڵ توڕەیی خوا ودەرکردنی لە بەزەیی خۆی، وتوندترین سزای بۆ ئامادە کردوە»، بڕیاریشی لای خوایە ئەگەر ویستی سزای دەدات ویستیشی لێبو لێی خۆش دەبێت، بە بەڵگەی فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾ [النساء: ٤٨] «خوا خۆشنابێت هاوبەشی بۆ دابنرێت، وبۆ جگە لە شیرك وخوار لەو خۆش دەوێت بۆ تاوانێك ویستی لێ بێت»، جا لە ژێر ویستدایە، چونکە تاوانەکەی لە خوار هاوبەشدانانەوەیە، ئەمە ئەگەر تەوبە نەکات، بەڵام ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە تەوبەی لێ وەر دەگیرێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ [الزمر:٥٣] «ئەی پەیامبەری خوا بەو بەندانەم کە ڕۆچون لە تاواندا وستەمی زۆریان لە خۆیان کردوە بڵێ: بێ ئومێد مەبن لە بەزەیی خوا بە هۆی زۆری تاوانەکانتانەوە، خوا لە هەمو تاوانێك خۆش دەبێت بۆ کەسێك تەوبە بکات وپەشیمان ببێتەوە، خوا لێبوردەیە وتەوبەی تۆبەکاران وەردەگرێت».

بەڵام هەر بە تەنها تەوبەکردنی پیاو کوژەکە مافی کوژراوەکە ناکەوێت لە دوارۆژدا.

---

(١) أخرجه البخاري (٦٨٦٢).

## پرسی سێیەم: جۆرەکانی کوشتن:

کوشتن دەبێتە سێ بەشەوە: بە ئەنقەست، ونیمچە ئەنقەست، وبە هەڵە.

هەڵە وئەنقەست لە قورئاندا باسیان هاتوە لە فەرمایشتی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَأً وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلَّا أَنْ يَصَّدَّقُوا﴾ [النساء:٩٢] «بۆ هیچ موسڵمانێك نیە دەست درێژی بکاتە سەر برا موسڵمانەکەی وبە ناڕەوا بیکوژێت مەگەر بە هەڵە بیکات وبە ئەنقەست نەبێت، کێش بە هەڵە کوشتی ئەوا لە سەریەتی کۆیلەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات وخوێن بابیەکەش تەسلیمی کار بە دەستانی کوژراو دەکات، مەگەر بیکەنە صەدەقە پێی وبیبەخشن ولێی خۆش بن». هەروەها فەرمایشتی: ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾ [النساء:٩٣]. بەڵام نیمچە ئەنقەست: لە سوننەتی پاکدا سەلماوە کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «عَقْلُ شِبْهِ الْعَمْدِ مُغَلَّظٌ مِثْلُ عَقْلِ الْعَمْدِ» «خوێن بایی نیمچە ئەنقەست قورسە، وەك خوێنبایی ئەنقەست، وبکوژەکە ناکوژرێتەوە»[(١)].

فەرمو ئەمەش وردەکاری باسەکەیە لە خوارەوە:

### بەشی یەکەم: کوشتنی ئەنقەست:

هەقیقەتەکەی: ئەوەیە بکوژ بڕوا ئادەمیزادێکی خوێن پارێزراو بکوژێت بە شتێك زۆربەی گومان ئەوەیە دەمرێت پێی. کەواش بو ئەبێت سێ مەرج فەراهەم بێت، بۆ ئەوەی کوشتنەکە بە ئەنقەست بدرێتە قەڵەم:

١- بونی مەبەستی کوشتن لەلایەن بکوژەوە، واتە ویستی کوشتن بێت.

---

(١) أخرجه أبو داود (٤٥٦٥)، وأحمد في المسند (١٨٣/٢) وحسّنه الأرناؤوط في حاشية المسند (٣٢٨/١١).

٢- ئەبێت بزانێت ئەوەی ڕۆیشتوە کوشتویەتی ئادەمیزادێکی خوێن پارێزراو بوە.

٣- ئەبێت ئەو ئامێرەی پێی کوژراوە عادەتەن بۆ کوشتن بەکار بشێت، ئیتر تیژ بێت یان نا.

جا ئەگەر مەرجێك لەمانەی تێدا نەبو ئەوا کوشتنەکەی نابێتە ئەنقەست.

● **شێوەکانی کوشتنی ئەنقەست:**

١- بە تیژکراوێك لێی بدات، ئەمەش ئەوەیە کە دەبڕێت ودەڕواتە لاشەوە؛ وەك شمشێر وچەقۆ ورم وهاوشێوەکانیان.

٢- بە شتێکی قورسی گەورە بیکوژێت وەك بەردێکی گەورە وچەکوش وهاوشێوەکانی، لەبەر فەرمودەکەی ئەنەسی کوڕی مالك ئەڵێ: کەنیزەکێك دۆزرایەوە تەماشا دەکەن سەری لە نێوان دو بەردا شکێنراوە. پرسیاریان لێکرد کێ وای لێکردی؟ فلان؟ فلان؟ تا ناو جولەکەیەکیان هێنا، ئەویش سەری جولاند، جولەکەکەیان گرت، ودانی نا بە تاوانەکەیدا، پەیامبەریش ﷺ فەرمانی کرد بە بەرد سەری بشکێنری»[1].

٣- نەهێڵێت هەناسەی بێتە دەرەوە، وەك ئەوەی بیخنکێنێت بە پەتێك وهاوشێوەکانی، یان دەم ولوتی دابخات تا ئەمرێت.

٤- خواردنەوەیەکی ژەهراوی پێ بدات ئەو پێی نەزانێت، یان خواردنێکی بکوژی پێ بدات وبە هۆیەوە بمرێت.

٥- بیخاتە شوێنێکی تیاچونەوە کە دڕندەی تێدا زۆرە یان ئاوی تێدا نەبێت.

---

(١) أخرجه البخاري (٢٤١٣)، ومسلم (١٦٧٢) -١٧-.

٦- بیخاتە ئاوێکەوە بیخنکێنێت، یا ئاگرێکەوە بیسوتێنێت، ناشتوانێت خۆی لێیان ڕزگار بکات.

٧- بەندی بکات وخواردن وخواردنەوەی لێ بگرێتەوە بۆ ماوەیەك کە زۆر جار مرۆڤ تێیدا دەمرێت، ئەویش بە هۆیەوە لە برسێتی یان تینوێتی بمرێت.

٨- بیخاتە بەردەم ئاژەڵێکی دڕندەی وەك شێر، یا مارێکی کوشندە، ئەویش بە هۆیەوە بمرێت.

٩- ببێتە هۆی کوشتنی بە هۆیەك کە شتێك زۆرجار کوشتنی لێ دەبێتەوە، وەك ئەوەی شایەتیەکی لە دژ بدات ببێتە مایەی کوشتنی وەك زیناکردن یان هەڵگەڕانەوە یان کوشتن، ئەویش بکوژرێت، ئینجا شایەتەکان لە شایەتیەکەیان پەشیمان ببنەوە وبڵێن: بە ئەنقەست ویستمان بیکوژین، ئەوا دەکوژرێنەوە لە بری.

## • شێوەکانی کوشتنی ئەنقەست:

**کوشتنی بە ئەنقەست دو حوکمی هەیە:**

١- حوکمی دوا ڕۆژ: ئەویش بریتیە لە حەرامێتی کوشتن، وبکەرەکەشی تاوانێکی گەورە دەکات، وسزایەکی بە ئازاری بۆ هەیە ئەگەر تەوبە نەکات، یان خوا لێی دەبورێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾ [النساء:٩٣].

٢- حوکمی دونیایی: کوشتنی ئەنقەست تۆڵەکردنەوە پێویست دەکات ئەگەر کار بە دەستانی کوژراوەکە لێی خۆش نەبن، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنْثَى بِالْأُنْثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ﴾ [البقرة:١٧٨] «ئەی ئەوانەی باوەڕتان بە خوا وپەیامبەر هەیە وئیش بە شەرعەکەی دەکەن فەرز کراوە لە

سەرتان کە تۆڵە بکەنەوە لە بکوژی ئەنقەست بە مەرجی یەکسانی وهاوشانی: ئازاد بە ئازاد، وکۆیلە بە کۆیلە، ومێینە بە مێینە، جا کار بە دەستانی کوژراو لە کێ بوران وتۆڵەیان نەکردەوە وتەنها خوێن باییان وەرگرت، ئەوا با هەردولا پابەندی ڕەوشت بەرزی بن، داوای خوێن بایی لە کار بە دەستەکانی دەکرێت بە بێ توند وتیژی، ئەوانیش خوێن باییەکە دەدەن بە چاکە بە بێ دواخستن ولێ بڕین». هەروەها لەبەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ ئەڵێ: پەیامبەر ﷺ فەرموی: «وَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ؛ إِمَّا أَنْ يُفْدَى وَإِمَّا أَنْ يَقْتُلَ» «کێ کەسێکی کوژرا، دو ڕێگای لە بەردەمدایە: یان خوێن بایی دەبات، یان: دەیکوژێتەوە»(١). جا کار بە دەستانی کوژراو سەر پشکن لە نێوان تۆڵە سەندنەوە ولێ بوردنی بێ بەرامبەر، یان خوێن بایی وەرگرتن کە لە بری تۆڵە سەندنەوەیە وبۆشی هەیە سولح بکات لە سەر زیاتریش. موەفەق [ئیبن قودامە] ئەڵێ: جیاوازی شك نابەم لەم بارەوە، لەبەر فەرمودەکەی عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە ﷺ، بەرزی دەکاتەوە: «مَنْ قَتَلَ عَمْدًا، دُفِعَ إِلَى أَوْلِيَاءِ الْقَتِيلِ، فَإِنْ شَاؤُوا قَتَلُوا، وَإِنْ شَاؤُوا أَخَذُوا الدِّيَةَ، وَذَلِكَ ثَلَاثُونَ حِقَّةً، وَثَلَاثُونَ جَذَعَةً، وَأَرْبَعُونَ خَلِفَةً، وَذَلِكَ عَقْلُ الْعَمْدِ، [و]مَا صُولِحُوا عَلَيْهِ فَهُوَ لَهُمْ، وَذَلِكَ تَشْدِيدُ الْعَقْلِ» «هەر کەس بە ئەنقەست کەسێکی کوشت، ئەوە تەسلیمی کار بە دەستانی کوژراو دەکرێت، ئەگەر ویستیان لێ بو دەیکوژنەوە، ئەگەریش ویستیان لێ بو خوێن بایی وەردەگرن، ئەمەش بریتیە لە سی حیققە، وسی جەزەعە، وچل وشتری ئاوس، ئەمەش خوێن بایی ئەنقەستە، لە سەر چیش سولحیان کرد ئەوە بۆیان هەیە، ئەمەش توندکردن

---

(١) أخرجه البخاري (٤٢٩٥) [بل هو في (١١٢، ٢٤٣٤، ٦٨٨٠)]، ومسلم (١٣٥٤) واللفظ له.

وقورس کردنی خوێن بابیە»[1]. لێ بوردنی بێ بەرامبەریش باشترە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَأَنْ تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى﴾ [البقرة:٢٣٧] «ولیبوردنتان نزیکترە لە لەخواترسان وگوێڕایەڵیەوە».

## • مەرجەکانی تۆڵە سەندنەوە لە نەفسدا:

کار بە دەستی کوژراوەکە مافی خۆیەتی تۆڵە بکاتەوە، بە چوار مەرج:

١- ئەبێت کوژراوەکە تەکلیف کراو بێت، کە بریتیە لە پێگەیشتوی ژیر. جا تۆڵە سەندنەوە نیە لە منداڵ وشێت وتێکچو وخەوتو، لەبەر فەرمایشتەکەی [پێشتری] پەیامبەر ﷺ: «قەڵەمی نوسین هەڵگیراوە لە سەر سیان: خەوتو تا بێدار دەبێتەوە، ومنداڵ تا پێدەگات، وشێت تا هۆشی دێتەوە». چونکە ئەمانە مەبەستێکی دروستیان نیە، یان هەر مەبەستیان نیە.

٢- ئەبێت کوژراوەکە خوێن پارێزراو بێت، چونکە تۆڵە سەندنەوە دانراوە بۆ نەڕشتنی خوێن، جا کەسی خوێن بە فیڕۆ دراو پارێزراو نیە، جا ئەگەر موسڵمانێك بێ باوەڕێکی شەڕانی، یان هەڵگەڕاوەیەك پێش تەوبە کردنی، یان زینا کارێکی ناسەڵت بکوژێت ئەوە تۆڵە سەندنەوە وخوێن بایی لە سەر نیە، بەڵام تەمبێ دەکرێت چونکە دەست درێژی کردۆتە سەر حکومەت.

٣- بونی هاوشانی لە نێوان بکوژ وکوژراودا، جا ئەبێت یەکسان بن لە ئازادی ودین وکۆیلایەتیدا، بۆیە موسڵمان بە ناموسڵمان ناکوژرێتەوە، ئەگەر موسڵمانەکە

---

(١) أخرجه ابن ماجه (٢٦٢٦)، وغيره [كالترمذي (١٣٨٧) هو أولى بالعزو] بسند حسن، انظر: «الإرواء» (٢٥٩/٧)، وصحيح ابن ماجه (٢١٢٥). و«الحقة»: ئەوەیە سێ ساڵی تەواو کردبێت وچو بێتە چوارەمەوە، و«الجذعة»: ئەوەیە چوار ساڵی تەواو کردبێت وچو بێتە ناو پێنجەمەوە، و«الخلفة»: بریتیە لە وشتری ئاوس، کۆکەشی «خلفة»یە بەدەر لە لەفزەکەی خۆی.

کۆیلە بێت وناموسڵمانەکە ئازاد بێت، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «لا يُقتَل مسلمٌ بكافر» «موسڵمان بە ناموسڵمان ناکوژرێت»(١). هەروەها ئازاد بە کۆیلە ناکوژرێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ﴾ [البقرة:١٧٨]. جگە لەمانە جیاوازی لە هیچ شتێکی تردا دەور نابینێت، جا ناودار بە بێناو، نێر بە مێ، ساغ بە شێت وتێکچو= دەکوژرێتەوە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ﴾ [المائدة:٤٥] «ولە تەوراتدا نوسیمان لە سەریان کە نەفس بەرامبەر نەفس دەکوژرێتەوە».

٤- لێ نەبون (عدم الولادة): جا نابێت کوژراو کوڕی بکوژ بێت ولەو بو بێت، هەروەها بەرەو خوارەوە، بۆیە هیچ کام لە دایك وباوك وبەرەو سەرەوە بە هیچ کام لە منداڵەکان وبەرەو خوارەوە ناکوژرێنەوە، بە بەڵگەی فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «لا يقتل والد بولده» «باوك بە کوڕ ناکوژرێتەوە»(٢).

بەڵام منداڵ بە هەردو دایك وباوك دەکوژرێتەوە، لەبەر فەرمایشتی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى﴾ [البقرة:١٧٨].

● **حیکمەت لە دانانی تۆڵە سەندنەوە:** خوای میهرەبان تۆڵە سەندنەوەی داناوە، وەکو بەزەییەك بە خەڵکی، وپاراستنی خوێنیان، وگرتنەوەیان لە دەست درێژی، وبەخۆردانی ئەوەی بە خۆردی کەسی تری داوە، هەروەها نەهێشتنی تینی تورەیی ورقە لە دڵی کار بە دەستانی کوژراوەکەدا، هەروەها ژیانی تێدایە بۆ خەڵك، وهێشتنەوەی جۆری ورەگەزی مرۆڤە، وەك خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَلَكُمْ فِي

---

(١) أخرجه البخاري (٦٩١٥)..

(٢) أخرجه الترمذي (١٤٣٣، ١٤٣٤)، وابن ماجه (٢٦٦١، ٢٦٦٢) وصححه الألباني، «صحيح ابن ماجه» (٢١٥٦، ٢١٥٧).

الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ﴾ [البقرة:١٧٩] «ولە تەشریعکردن ودانانی تۆڵە سەندنەوە وجێ بە جێ کردنی دا ژیانێکی سەلامەتی هەیە -ئەی خاوەن عەقڵە ساغەکان-».

• **مەرجەکانی سەندنەوەی تۆڵە:** ئەگەر مەرجەکانی شایستەبونی تۆڵەکردنەوە فەراهەم بو وپێویست بو، ئەوا تۆڵە لە دەست درێژیکار ناکرێتەوە وسزای بەسەردا جێبەجێ ناکەیت مەگەر بە فەراهەم بونی ئەم سێ مەرجە:

١- ئەبێت ئەو کەسەی شایستەی تۆڵەلێکردنەوەیە تەکلیف کراو (بالّغ وژیر) بێت، جا ئەگەر کەسەکە یان هەندێکیان منداڵ یان شێت بو، کەسی تر ناخرێتە جێگایان بۆ تۆڵە کردنەوە، بەڵکو دەست درێژی کار بەند دەکرێت تا پێ دەگات، شێتیش تا عاقڵ دەبێت. موعاویەش ﵁ وای کردوە وهاوەڵانیش ﵃ بێ دەنگ بون لێی، جا وەك کۆ دەنگیان وایە.

٢- کۆ دەنگ بونی هەمو کار بە دەستانی کوژراوەکە لە سەر تۆڵە لێکردنەوەی، بۆ هەندێکیشیان نیە بە تەنها تۆڵە بکەنەوە، بۆ ئەوەی لە سەر مافی غەیرە خۆی تۆڵە نەکاتەوە ئیزنی خاوەن ماف، جا چاوەڕێی گەڕانەوەی ئامادەنەبو، وپێگەیشتنی منداڵ، وعاقڵ بونی شێت دەکرێت، کێش لە کار بە دەستانی کوژراو بمرێت میراتگرەکەی جێی دەگرێتەوە، ئەگەریش هەندێکیان بوران ئەوە تۆڵەکردنەوە دەکەوێت.

٣- ئەبێت دڵنیا ببنەوە لەوەی تۆڵە سەندنەوە سەر ناکێشێت بۆ جگە لە دەست درێژی کەر، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَلَا يُسْرِفْ فِي الْقَتْلِ﴾ [الإسراء:٣٣] «وبۆ کار بە دەستانی کوژراو نیە سنوری خوا ببەزێنن لە تۆڵەکردنەوەدا وەك ئەوەی دوان یان کۆمەڵێك بکوژرێتەوە بە یەك کەس، یان کوژراو بشێوێنرێت». ئەگەریش تۆڵە

کردنەوە پێویست بو لە سەر دو گیانێك، ئەوا ناکوژرێتەوە تا کۆرپەلەکەی دادەنێت چونکە کوشتنەوەی سەر دەکێشێت بۆ کوشتنی کۆرپەلەکەشی، کە کۆرپەلەکەشی دانا: ئەگەر کەس هەبو جێی بگرێتەوە لە شیر دان بە منداڵەکە ئەوا حەددی لە سەر جێ بەجێ دەکرێت، ئەگەریش نەبو وێڵ دەکرێت تا لە دو ساڵی، لە شیر دەبڕێتەوە، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ لە فەرمودەکەی غامدیەدا: «إِذَنْ لَا نَرْجُمَهَا وَنَدَعَ وَلَدَهَا صَغِيرًا لَيْسَ لَهُ مَنْ يُرْضِعُهُ» «کەوابو، ڕەجمی ناکەین ومنداڵەکەی بە بچوکی بهێڵینەوە وکەس نەبێت شیری پێ بدات!» پیاوێکی ئەنصاری هەستا وتی ئەی پەیامبەری خوا! شیردانی لە سەر من، ئەویش فەرمانی کرد ڕەجم بکرێت[1].

## ● لە حوکمەکانی تۆڵەکردنەوە:

١- تۆڵە سەندنەوە بە ئامادەبونی حکومەت -پێشەوا- یان جێگرەکەی جێبەجێ دەکرێت، ئەو ئیزن دەدات وبەرپای دەکات، بۆ ئەوەی ستەمی تێدا نەکرێت، وبە شێوەیەکی شەرعی بەڕێوە بڕوات وجێ بەجێ بکرێت، هەروەها ڕێگری بکات لە خراپەکاری وتێك دان وئاژاوە گێڕی.

٢- بنەما وایە: ئەوە بە دەست درێژی کەر بکرێت، کە بە دەست درێژی لێ کراوی کردوە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ﴾ [النحل:١٢٦] «-ئەی باوەڕداران- ئەگەر تۆڵەتان کردەوە لەوانەی دەست درێژی کرۆدتە سەرتان، ئەوا وەکو خۆی تۆڵەیان لێ بکەنەوە وزیاتر لەوە مەکەن کە بە ئێوەیان کردوە». هەروەها پەیامبەر ﷺ سەری جولەکەکەی لە نێوان بەرد شکاند

---

(١) أخرجه مسلم (١٦٩٥).

وەك بە کەنیزەکەکەی کردبو [وەك پێشتر باس کرا]، هەروەها ئەگەر دەستەکانی بڕی بو پاشان کوشتبوی، وای لێ دەکرێت.

٣- ئەبێت ئەو ئامێرەی تۆڵە سەندنەوەی پێ جێ بەجێ دەکرێت بڕەر بێت وئیش خۆی بکات، وەك شمشێر وچەقۆ وهاوشێوەکانی، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «إِذَا قَتَلْتُم فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَة» «ئەگەر کوشتتان بە شێوەیەکی جوان بکوژن»[١].

٤- ئەگەر کار بە دەستی کوژراوەکە دەیزانی بە شێوەیەکی شەرعی تۆڵە بکاتەوە، ئەوا حکومەت ڕێگەی دەدات بە دەستی خۆی بیکات، ئەگەرنا فەرمانی پێدەکات کەسێکی شارەزا دابنێت بۆ ئەوەی تۆڵەی بۆ بکاتەوە.

**بەشی دوەم: کوشتنی نیمچە ئەنقەست:**

حەقیقەکەی: ئەوەیە بڕوا دەست درێژی بکاتە سەر کەسێك بە شتێك زۆرجار ناکوژێت، بەڵام دەست درێژی لە سەر کراو دەمرێت، هەروەها پێی دەوترێت هەڵەی ئەنقەست، جا لە دیوێکەوە لە ئەنقەست ئەچێت کە چوە لێیداوە، لە لایەکی تریشەوە لە هەڵە دەچێت کە بە شتێك لێیداوە مەبەستی پێی کوشتن نەبوە، هەر بۆیە حوکمەکەی لە نێوان ئەنقەست وهەڵەدایە. ئیتر مەبەستی دەست درێژی کردن بو بێتە سەری یان تەمبێکردنی.

- **لە شێوەکانی کوشتنی نیمچە ئەنقەست ونمونەکانی:**

١- بدات لە شوێنێك هی کوشتن نەبێت بە قامچی یان بەردێکی بچوك یان گۆچانێکی بچوك، یان بۆکس بدات لە سەر سنگی یان شوێنێکی هی کوشتن نەبێت ومرێت.

---

(١) أخرجه مسلم (١٩٥٥).

٢- بیبەستێتەوە وبیخاتە کەنار ئاوێك لەوانەیە زیاد بکات ولەوانەشە زیاد نەکات، جا ئاوەکە زیاد بکات وبمرێت بەهۆیەوە، هەروەها بیخاتە ئاوێکی کەمەوە کە کەسی وەك ئەو ناخنکێت، بەڵام ئەو دەخنکێت.

٣- هاوار بکات بە سەر کەسێکی ژێردا لە کاتی بێئاگاییدا وبمرێت، یان هاوار بکات بە سەر منداڵ یان تێك چویەك لە سەر بانێکدا ئەویش بکەوێت وبمرێت.

**• حوکمی کوشتنی نیمچە ئەنقەست:**

کوشتنی نیمچە ئەنقەست دو حوکمی هەیە:

١ - حوکمی دوا ڕۆژ: ئەویش بریتیە لە حەرامێتی وتاوانباری وسزای داو ڕۆژ، چونکە بەم کارەی بوەتە مایەی کوشتنی خوێن پارێزراوێك، بەڵام سزاکەی کەمترە لە کوشتنی ئەنقەست.

٢- حوکمی دونیایی: جا خوێن بایی قورسی لێ دەکەوێتەوە، بەڵام تۆڵە سەندنەوەی لێ ناکەوێتەوە وەك ئەنقەست با کار بە دەستانی کوژراویش داوای بکەن، وکەفارەتدان واجبە لە ماڵی بکوژەکە بدرێت کە بریتیە لە ئازادکردنی کۆیلەیەك، ئەگەر نەیبو دو مانگ لە سەر یەك ڕۆژو دەگرێت. وکاربەدستانی کوژراو خوێن باییان بۆ هەیە، لەلایەن عاقیلەی[1] بکوژەکەوە دەدرێت لە ماوەی سێ ساڵدا، ئەمەش لەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «خوێن بایی نیمچە ئەنقەست قورسە، وەك خوێبایی ئەنقەست، وبکوژەکە ناکوژرێتەوە». هەروەها فەرمودەکەی موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ ئەڵێ: «ضَرَبَتِ امْرَأَةٌ ضَرَّتَهَا بِعَمُودِ فُسْطَاطٍ وَهِيَ حُبْلَى فَقَتَلَتْهَا... فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ

(١) العاقلة: عەصەبەکانن، کە نزیکەکانن لە دیوی باوەکەوە کە لە سەریانە خوێن بایی کوشتنی هەڵە بدەن.

دِيَةَ الْمَقْتُولَةِ عَلَى عَصَبَةِ الْقَاتِلَةِ» «ئافرەتێك بە عامودی چادرێك دای لە هەویە دو گیانەکەی وکوشتی... پەیامبەریش خوێن بابی کوژراەکەی خستە سەر عەصەبەی بکوژەکە»[1].

## بەشی سێیەم: کوشتنی هەڵە:

هەقیقەتەکەی: ئەوەیە کەسێك بکوژێت بێ ئەوەی مەبەستی کوشتنی هەبێت

### • جۆرەکانی کوشتنی هەڵە:

١ - هەڵە لە کردەوەدا: ئەویش ئەوەیە شتێك بکات کە بۆی دروستە بیکات بەڵام بەر ئادەمیزادێکی خوێن پارێزراو دەکەوێت بێ ئەوەی مەبەستی ئەو بێت، وەك ئەوەی ڕاو بکات بەر کەسێك بکەوێت وبیکوژێت، یان پل دەخوات لە ناو خەودا دەکەوێت بە سەر کەسێکدا ودەیکوژێت.

٢- هەڵە لە مەبەستدا: وەك ئەوەی شتێك بوەشێنێت بۆ شتێکی حەڵاڵ بەڵام دەر دەکەوێت ئادەمیزادە، بۆ نمونە: بوەشێنێت بۆ شتێك وا بزانێت نێچیرە، بەڵام دەردەکەوێت خوێنپارێزراوە.

٣- بکوژە ئەنقەستەکە بچوك یان شێت بێت، جا بە ئەنقەستی منداڵ وشێت مامەڵەی هەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، چونکە هەر دوکیان مەبەستیان نیە.

هەروەها **بونە هۆکاری کوشتنیش** دەدرێتە پاڵ کوشتنی ئەنقەست، وەك ئەوەی بیرێك یان چاڵێك لە ڕێگایەکدا هەڵبکەنێت بە هۆیەوە کەسێك بمرێت.

### • حوکمی کوشتنی هەڵە:

١ - حوکمی دوا ڕۆژ: ئەویش بریتیە لە تاوانباری وسزادان.

---

(١) أخرجه مسلم (١٦٨٢).

لەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] ئیبن عەبباس کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «خوای گەورە، تاوانی بە هەڵە وبە لە بیر چونەوە وبە زۆر لێکردنی لە سەر ئومەتەکەم لاداوە».

٢- حوکمی دونیایی: ئەویش بریتیە لە واجبێتی خوێن بایی لە سەر عاقیلەی بکوژ لە ماوەی سێ ساڵدا دەدرێتا، وسوککراوە لە پێنج جۆری وشتردا، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَأً وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلَّا أَنْ يَصَّدَّقُوا﴾ [النساء:٩٢]. ولەبەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ ئەڵێ: «پەیامبەری خوا ﷺ لە بارەی کۆرپەلەی ئافرەتێکەوە لە خێڵی لیحیان بڕیاریدا ویەکلای کردەوە بە بەنرخێك (غُرَّةٌ): بەندەیەك یان کەنیزەکێك، پاشان ئەو ئافرەتەی ئەم بڕیارانەی لە بەرژەوەندی درا وەفاتی کرد، پەیامبەریش بڕیاریدا میراتەکەی بۆ مێردەکەی ومنداڵەکانی بێت، وخوێن باییەکەش لە سەر عەصەبەکانی بکوژەکەیە»[(١)].

**ئەوەی کەسێك بە هەڵە دەکوژێت، سەرباری خوێن بایی ئەمانەشی لە سەر واجبە:**

١- ئازادکردنی کۆیلەیەکی بڕوادار: ئەمە ئەگەر ئەیتوانی، مەرجیشە کۆیلەکە باوەڕدار وبێ عەیب بێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَأً وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ﴾ [النساء:٩٢]، ئەگەریش نەیتوانی کۆیلە ئازاد بکات بە هۆی هەژاری یان نەبونەوە، ئەوا ئەڕوا:

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٦٧٤٠)، ومسلم (١٦٨١).

٢- دو مانگ بە شوێن یەکدا بە ڕۆژو دەبێت ئەگەر دەیتوانی، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِنَ اللَّهِ﴾ [النساء:٩٢] «کێ نەیتوانی کۆیلەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات، ئەوا ئەبێت دو مانگ بە دوای یەکدا بە ڕۆژو بێت بۆ ئەوەی خوا تەوبەی لێ وەر بگرێت». ئەگەریش ڕۆژوی نەتوانی بە هۆی نەخۆشی یان تەمەنەوە ئەوا کەفارەتدان هەر لە گەردنی دەمێنێتەوە وخواردندان لە سەری نایخات، چونکە خوای گەورە باسی نەکردوە، گۆڕانیش لە کەفارەتدا لە سەر دەق دەوەستێت نەك قیاس.

## پرسی چوارەم: دەست درێژی کردنە سەر جگە لە نەفس:

ئەمەش بریتیە لە هەمو زیانێك کە بە سەر مرۆڤدا دێت ونابێتە مایەی مردنی، لە برین وبڕینی ئەندامەکان، وهاوشێوەی ئەمانە، لەمەشدا تۆڵە سەندنەوە واجبە، وچونکە لە قورئان وفەرمودە وکۆ دەنگیدا چەسپاوە.

سەبارەت بە قورئان: فەرمایشتەکەی خوایە: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالْأَنْفَ بِالْأَنْفِ وَالْأُذُنَ بِالْأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ﴾ [المائدة: ٤٥] «ولە تەوراتدا لە سەریانمان فەرز کرد کە نەفس بە نەفس دەکوژرێتەوە، وچاو دەتەقێنرێت بە چاو، ولوت دەبڕدرێت بە لوت، وگوێ دەبڕدرێت بەرامبەر بە گوێ، ودان دەکێشرێت بەرامبەر ددان، ولە برینەکاندا تۆڵە کردنەوە هەیە». سەبارەت بە سوننەت: فەرمودەکەی پەیامبەرە ﷺ لە چیرۆکی شکاندنی دو دانەکەی پێشەوەی کەنیزەکێك لەلایەن ڕوبەییعەوە کە فەرموی: «كِتَابُ اللهِ الْقِصَاصُ» «لە قورئانەکەی خوا تۆڵە کردنەوەیە»[1].

(١) أخرجه البخاري (٦٨٩٤)، ومسلم (١٦٧٥).

زانایانیش کۆکن لە سەر واجبێتی تۆڵە سەندنەوە -ئەگەر بکرێ- لەوەی جگە لە نەفسە.

ئەمەش سێ جۆرە:

١- دەست درێژیکردن بە بریندار کردن.

٢- دەست درێژیکردن بە بڕینەوەی پەلەکان.

٣- دەست درێژیکردن بە پەك خستنی سودی ئەندامێك.

**جۆری یەکەم: دەست درێژی کردن بە بریندار کردن:**

ئەم دەست درێژی کردنەش ئەبێتە دو بەشەوە:

أ. ئەو برینەی بەسەر دەم وچاو وسەردا دێت، کە پێی دەوترێت: «شِجَاج» کۆی «شَجَّة»یە.

ب. برینەکانی باقی جەستە، وپێشی دەوترێت: «جَرْح» نەك «شَجَّة».

**بەشی یەکەم: ئەو برینانەی لە سەر ودەم وچاودا ڕو دەدات،** ئەمەش دە جۆرە:

١- «الْحَارِصَة»، ئەوەیە کە تۆزێك پێستە دەبڕێت وخوێنی لێ ناهێنێت وەك ڕوشان، پێشی دەوترێت: «القاشرة» و«الْمليطاء» لە «الحَرْص»دا بریتیە لە بڕین.

٢- «الدامية»، ئەوەیە کە شوێنی بڕینەکە (پێستەکە) خوێن لێ دێنێت، خوێنێکی کەم، پێشی دەوترێت: «البازلة» و«الدامعة» وەك شوبهاندنی بە دەرچونی فرمێسك بە چاودا.

٣- «البَاضِعَة»، ئەوەیە کە دوای پێستەکە گۆشتەکەش بە سوکی دەبڕێت، بەڵام ناگاتە ئێسەکەکە.

٤- «الْمتلاحمة»، ئەوەیە کە ئەڕواتە ناو گۆشتەکەوە وبەڵام ناگاتە ئەو پێستەیەی نێوان گۆشت وئێسکەکە.

٥- «السِّمْحَاق»، بریتیە لەو برینەی دەگاتە پێستە تەنکەکەی نێوان گۆشت وئێسکی کەللە سەر، برینەکەش هەر بەوەوە ناونراوە.

جا ئەم پێنجە هیچ تۆڵەکردنەوە وخوێن بابیەکی تێدا نیە، تەنها حکومەی تێدا واجبە، «حکومە»ش ئەوەیە دەست درێژی لە سەر کراو بخەملێنرێت بە پێش دەست درێژیەکە وەك ئەوەی کۆیلەیە، ئینجا دەخەملێنرێت دوای چاك بونەوە بزانرێت چەند لە نرخەکەی کەمی کردوە، ئەوا دەست درێژیکار ئەبێت ئەو ڕێژە خوێن بابی بدات[1].

٦- «الْمُوَضِّحَة»، ئەوەیە کە «السِّمْحَاق» دەبڕێت وئێسکەکە دەخاتە دەر، ئەمەش پێنج وشتری تێدایە، نیوەی دە یەکی خوێن بابیەك.

٧- «الهاشمة»، ئەوەیە کە ئێسکەکە دەر دەخات ودەیشکێنێت، ئەمەش دە وشتری تێدایە.

٨- «الْمُنَقِّلَة»، ئەوەیە کە ئێسکەکە لە جێ ئەبات، ئیتر بیخاتە دەر یان نا، ئەیشکێنێت یان نا، ئەمەش پانزە وشتری تێدایە.

٩- «الْمَأْمُومَة»، ئەوەیە کە ئەگاتە ئەو پێستەیەی کە دەوری مێشکی داوە، پێشی دەوترێت: «الآمَّة»، ئەمەش سێیەکی خوێن بابیەکی تێدایە.

١٠- «الدَّامِغَة»، ئەوەیە کە پێستەی دەوری مێشك دەبڕێت ودەگاتە دەماخ، ئەمەش دیسانەوە سێیەکی خوێن بابیەکی تێدایە.

---

(١) بەڵام لەم سەردەمەدا، ئەوەی کاری پێ دەکرێت: بۆ بابیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوانەی ئەندازەی برین دیاری دەکەن لە دادگاکاندا، ئەوان دیاری دەکەن لەو پێنج حاڵەتەدا بابی چەندە ئەمەش دوای بینینی ڕاپۆرتی پزیشکی، ئەوسا بابی هەر دانەیەکی دیاری دەکەن بە گوێرەی ڕێژەکەی لە خوێن بابیدا.

هەروەها «الْجَائِفَة» بۆ ئەمەش زیاد دەکرێت ئەویش ئەوەیە کە ئەگاتە ناوەوەی هەناو، لەوەی بۆ بینەر دەرناکەوێت، وەك ناو سك، وناو پشت، وسنگ، وقوڕگ، وگون، ئەمەش لە برینەکان (الشجاج) نیە، چونکە لە سەر یان دەم وچاودا نیە، بەڵام زانایان باسی دەکەن چونکە هەمان ئەندازەی تێدایە کە سێیەکی خوێن باییەکە.

**بەڵگەی ئەم برینانە:**

١- فەرمودەکەی ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی حەزمە، لە باوکیەوە لە باپیریەوە ﵁: کە پەیامبەری خوا ﷺ نوسراوێکی بۆ خەڵکی یەمەن نوسیوە وتێیدا فەرمویەتی: «وَفِي الْمَأْمُومَةِ ثُلُثُ الدِّيَةِ... وَفِي الْمُنَقِّلَةِ خَمْسَ عَشْرَةَ مِنَ الْإِبِلِ... وَفِي الْمُوضِحَةِ خَمْسٌ مِنَ الْإِبِلِ» «ولە مەئمومەدا یەك لە سەر سێی خوێن بایی هەیە... لە مونەقڤیلەشدا پانزە وشتر هەیە... لە موەززیحەشدا پێنج وشتر هەیە»[١].

٢- زانایان کۆکن لە سەر ئەوەی کەوا خوێن بایی مونەقڤیلە پانزە وشترە.

٣- زانایان کۆکن لە سەر ئەوەی لە جائیفەدا یەك لە سەر سێی خوێن بایی هەیە، لەبەر فەرمودەکەی عەمری کوڕی حەزم، ئەڵێ: «وَفِي الْجَائِفَةِ ثُلُثُ الدِّيَةِ» «ولە جائیفەدا یەك لە سەر سێی خوێن بایی هەیە».

٤- ئەسەرەکەی زەیدی کوڕی سابتە ﵁ کە لە بارەی هاشیمەوە بڕیاری بەوە بوە: دە وشتری تێدایە، نەزانراوە کەسیش پێچەوانەی کردبێت.

---

(١) صحيح: أخرجه النسائي (٢/٢٥٢)، والحاكم (١/٣٩٧)، والبيهقي (٨/٧٣). انظر: «الإرواء» (٧/٣٢٦).

٥- ولەبەر ئەوەی لە نوسراوەکەی عەمری کوڕی حەزمی پێشودا هاتبو: کە مەئمومە یەك لە سەر سێی خوێن بایی تێدایە، جا دامیغە لەو زیاتر وکاریگەرترە بۆیە ئەو لە پێشترە کە یەك لە سەر سێی خوێن بایی تێدا بێت.

ئەم برینانەش تۆڵە کردنەوەی تێدا پێویست نیە تەنها لە موەززیحە نەبێت، چونکە دەتوانرێ زەبت بکرێ وەك خۆی تۆڵەی تێدا بکرێتەوە بە پێچەوانەی ئەوانی ترەوە کە دڵنیایی نیە زیاد وکەمی نەکرێ لە درێژی وپانی برینەکەدا، وزەمان نیە لە تۆڵەکردنەوە وەك خۆی.

**بەشی دوەم: برینەکانی باقی لاشە:**

ئەم برینانە گۆڕانکاری بە سەردا دێت بە گوێرەی گۆڕانی جۆرەکەی، جا ئەوەی ئەگەر لە سەر یان دەم وچاو دا بێت وتۆڵە سەندنەوەی تێدا نیە، ئەوا ئەگەر لە باقی لاشەدا بێت تۆڵە سەندنەوەی هەر تێدا نیە، مەگەر موەززیحە کە بەشێك لە بەشەکانی لاشە دەبڕێت وەکو سنگ وملی.

**جۆری دوەم: بڕینی پەلەکان:** ئەم جۆری دەست درێژیەش ئەبێتە سێ بەشەوە:

١- ئەنقەست.

٢- نیمچە ئەنقەست.

٣- هەڵە.

تۆڵە سەندنەوەش لە هەڵە ونیمچە ئەنقەستدا پێویست نیە، بەڵکو تەنها لە ئەنقەستدا پێویستە وەك کوشتن، ئەویش بە سێ مەرج:

١- بکرێ تۆڵەی لێ بکرێتەوە بێ ستەمکردن، ئەمەش بەوەی کە بڕینەکە لە جومگەیەك بێت، یان لە سنورێك کۆتایی پێ بێت وەکو پەنجەکان ومەچەك وئەنیشك. جا تۆڵە سەندنەوە لە برینێکدا نیە سنورێکی نەبێت بۆ کۆتاییەکەی وەك

جائیفە، هەروەها تۆڵە سەندنەوە لە شکاندنی هیچ ئێسکێکدا نیە جگە لە دانەکان وەك ئێسکی ڕان وبالْ وهەر دو دەست.

٢- یەکسان بون لە نێوان هەر دو ئەندامی دەست درێژی کار ودەست درێژی لە سەر کراوەکە، هەم لە ناو وهەم لە شوێندا، جا تۆڵە لە ڕاست ناکرێتەوە بەرامبەر چەپ، وتۆڵە لە پەنجە توتە ناکرێتەوە بەرامبەر بە پەنجەکەی تەنیشتی، هەروەها تۆڵە لە ئەندامێکی بنەڕەتی ناکرێتەوە بەرامبەر بە ئەندامێکی نابنەڕەتی.

٣- یەکسان بونی هەردو ئەندامی دەست درێژی کەر ودەست درێژی لە سەر کراو لە ڕوی ساغی وتەواوێتیەوە، جا تۆڵە لە ئەندامێکی ساغ ناکرێتەوە بە ئەندامێکی ئیفلیج، هەروەها پەنجە تەواوێك بە پەنجە نوقسانێك، وئەوانی تریش بەهەمان شێوە.

**جۆری سێیەم: پوچەڵکردنەوەی کەڵکی ئەندامێك:**

ئەگەر دەست درێژی کار کەڵکی ئەندامێکی دەست درێژی لە سەر کراوی پەکخست، ئەوە تۆڵە سەندنەوەی لە سەر نیە، چونکە ناکرێ بێ ستەم کردن وەك خۆی تۆڵەی لێ بکرێتەوە، بۆیە لە سەریەتی خوێن باییەکی تەواو بدات. هەر کەسێکیش کەڵکی ئەندامێکی کەم کردەوە، ئەگەر ئەندازەی کەڵکەکە زانرا ئەوا بە گوێرەی ئەو کەڵکە کەمی کردوە خوێن بایی دەبات، بۆ نمونە وەك نیوەی خوێن باییەك، یا یەك لە چواری، ئەگەر کەڵکە ڕۆیشتوەکەش نیوە بو یا یەك لە چوار بو، وهەروەها. ئەگەریش نەکرا ئەندازەی ئەو کەڵکە ڕۆشتوەکە بزانرێت، ئەوە حکومە تێیدا پێویستە [کە پێشتر باس کرا]. دادوەر بە تێکۆشانی خۆی دیاری دەکات. لە کەڵکەکانیش، وەك: نەمانی عەقڵ وبیستن وبینین، وپەکخستنی بۆن کردن، ولە قسە ودەنگ وتام خستن، ونەمانی جاوین ونەمانی ئاو هاتنەوە، وپەکخستنی توانای دو گیان کردن، وجگە لەمانەش.

# دەروازەی دووەم

# لە بارەی خوێن بابیەوە «الدِّيَات»

**چەند مەسەلەیەکی لە خۆ گرتوە:**

**پرسی یەکەم: پێناسەی خوێن بایی:**

**پێناسەی** «**الدية**»: لە زماندا لەوەو هاتوە: «ودَيْتُ القَتِيل أَدِيه دِيَةً»، ئەگەر خوێن بابیەکەی بدەی، کۆکەشی: «الديات»ـە. لە شەرعیشدا: بریتیە لە ئەو ماڵەی بە هۆی دەست درێژی کردنەوە ئەدرێ بە دەست درێژی لێکراو یان بە کار بە دەستەکەی، پێشی دەوترێ: «العقل» چونکە بکوژەکە خوێن بابیەکەی لە وشتر کۆ ئەکردەوە، ولە بەردەم ماڵی کار بە دەستانی کوژراودا ئەیبەستەوە تا تەسلیمیان بکات.

**پرسی دوەم: شەرعی بونی، وبەڵگەکەی، ودانایی لێی:**

١- **بەڵگەکانی شەرعی بونی:** خوێن بایی واجبە بە قورئان وسوننەت وکۆ دەنگی، سەبارەت بە قورئان، فەرمایشتەکەی خوای میهرەبانە کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ﴾ [النساء:٩٢]. سەبارەت بە سوننەتیش، فەرمودەکەی ئەبو هورەیرەی پێشترە «هەر کەسێك کەسێکی بکوژرێ ئەوە لە نێوان دو شتدا سەر پشکە یان خوێن بایی دان یا کوشتنەوە»، هەروەها فەرمودەکەی عەمری کوڕی حەزم لەو نوسراوەی کە پەیامبەری خوا بۆی نوسی وئەندازەی خوێن بایەکانی تێدا ڕون کردەوە بەم نزیکانە باس کرا. هەروەها زانایانیش کۆکن لە سەر پێویستێتی خوێن بایی.

**٢- دانایی لە شەرعی بونی:** سەبارەت بە دانایی لە بونی، بریتیە لە پاراستنی گیانەکان ونەڕشتنی خوێنی بێ تاوانەکان وڕێگری کردن وبەربەست بون لە بەردەم سوکایەتی کردن بە نەفسەکان.

## پرسی سێیەم: لە سەر کێ خوێن بایی پێویستە؟ وەهەڵگرتنی لە سەر شانی کێیە؟

**٣- هەر کەسێك مرۆڤێك یا بەشێکی لە ناو بدات لە دو حاڵەت بە دەر نیە:**

- ئەگەر هاتو دەست درێژی کردنەکە کە بەهۆیەوە گیانەکە تیاچوە بە ئەنقەستێکی پەتی بو، ئەو کاتە خوێن باییەکە هەر هەموی لە ماڵی بکوژەکە ئەبێت، ئەمە ئەگەر لێی خۆشبون وتۆڵەکردنەوە کەوت، چونکە قەرەبوی لە ناوچون لە ئەستۆی لە ناوبەردایە، خوای دانا ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ [الأنعام:١٦٤] «هیچ کەسێکی تاوانبار تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێت».

- ئەگەریش دەست درێژی کردنەکە هەڵە یان نیمچە ئەنقەست بو، ئەوە خوێن باییەکە لە سەر عاقیلەی بکوژەکەیە لەبەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرەی [پێشتر] کە ئەفەرموێ: «پەیامبەری خوا ﷺ لە بارەی کۆرپەلەی ئافرەتێکەوە لە خێڵی لیحیان بڕیاریدا ویەکلای کردەوە بە بەنرخێك (غُرَّةٌ): بەندەیەك یان کەنیزەکێك، پاشان ئافرەتەکە ئەو ئافرەتەی ئەم بڕیارانەی لە بەرژەوەندی درا وەفاتی کرد، پەیامبەریش ﷺ بڕیاریدا میراتەکەی بۆ مێردەکەیی ومنداڵەکانی بێت، وخوێن باییەکەش لە سەر عەصەبەکانی بکوژەکەیە».

وخوێن بایەکەش پێویست لە سەر عاقیلەی بکوژەکە، چونکە دەست درێژی کردن بە هەڵە زۆر ڕو ئەدات کە دەست درێژی کار تێیدا عوزرداره، بۆیە پێویستی کرد بە دەم وتەنگیەوە بن، ولە سەری سوك بکەنەوە بە پێچەوانەی ئەنقەستەوە، هەروەها

لەبەر ئەوەی بە ئەنقەستەکە خوێن بایی لە بری خۆی ئەدات چونکە تۆڵە سەندنەوەی لە سەر پێویستە، جا کە لێی خۆش بون ئەوا خوێن بایی لە سەر شانی خۆیەتی وخۆی هەڵی ئەگرێ.

## پرسی چوارەم: جۆرەکانی خوێن بایی وئەندازەکانی:

١- **جۆرەکانی خوێن بایی:** بنەما لە خوێن بایدا بریتیە لە وشتر لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەری خوا: «وَفِي النَّفْسِ الْمُؤْمِنَةِ مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ...» «لە هەر نەفسێکی ئیمانداردا سەد وشتر دانراوە»[(١)]، هەروەها فەرمودەی: «أَلَا وَإِنَّ قَتِيلَ الْخَطَأِ شِبْهِ الْعَمْدِ، مَا كَانَ بِالسَّوْطِ وَالْعَصَا، مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ» «کوژراوی هەڵە؛ نیمچە ئەنقەست، ئەوەی کە بە قامچی وگۆچانە، سەد وشترە»[(٢)]. هەروەها لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە ئەڵێ: «نرخی خوێن بایی لە سەردەمی پەیامبەردا هەشت سەد دینار، یان هەشت هەزار درهەم بو... ئیتر هەر بەم شێوازە مایەوە تا سەردەمی عومەر، ئەوەبو چوە سەر مینبەر وتارێکی فەرمو: «ئاگادار بن! وشتر گران بوە، ئەڵێ: ئەوەبو عومەر ئاوا ئەندازەی دانا، لە ڕیوایەتێکی تردا ئاوهای خەملاند کە بۆ زێڕدارەکان هەزار دینارە وبۆ زیودارەکان دوانزە هەزار درهەمە، وبۆ خاوەن مانگاکان دو سەد مانگایە، وبۆ خاوەن مەڕ ومالاتەکان دو هەزار شەکە، وخاوەن کراس (الحُلَّة)ـەکان[(٣)] دو سەد کراسە»[(٤)]. کە وابێت بنەما لە خوێن باییدا وشترە. ئەم شتانەشی لێرەدا باس کراوە جگە لەمانەش

---

(١) أخرجه النسائي (٤٨٥٧). وصححه الألباني (صحيح النسائي رقم ٤٥١٣).

(٢) أخرجه النسائي (٤٧٩١). وصححه الألباني (صحيح النسائي رقم ٤٤٦٠).

(٣) [کۆی «حُلَّة»یە، کە بریتیە لە بان وخوار (إزار ورداء)ێکە ئەپۆشرێ].

(٤) أخرجه أبو داود (٤٥٤٢). وحسنه الألباني «الإرواء» (٢٢٤٧).

هەر بە مانە دەپێورێن لە ڕوی خەملاّندنەوە، ئەمەی عومەریش بە بەرچاوی هاوەڵانەوە بوە ونکوڵیان لێ نەکردوە، جا ئەبێتە کۆ دەنگی، بۆیە خوێن بایی بە وشتر یان بە نرخەکەی ئەدرێت لەم شتانەی باس کراوە لێرەدا.

**٢- ئەندازەکانی خوێن بایی:**

- **خوێن بایی موسڵمانێکی ئازاد:** سەد وشترە، ئەگەریش ئەنقەست یان نیمچە ئەنقەست بو ئەوە قورس ئەکرێتەوە (مُغَلَّظَة)، قورس کردنەوەی خوێن باییش ئەوەیە: چل وشتریان ئاوس بێت، وەك پێشتر لە فەرمودەکەی عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە باس کرا: «ئەبێت چل دانە وشتری ئاوس بێت».

- **خوێن بایی خاوەن کتێبێکی ئازاد:** ئەهلی زیمە بێت یان نا، نیوەی خوێن بایی موسڵمانە، لە بەر فەرمودەکەی عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە، پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «عَقْلُ أَهْلِ الذِّمَّةِ نِصْفُ عَقْلِ الْمُسْلِمِينَ» «خوێن بایی ئەهلی زیمە نیوەی خوێن بایی موسڵمانانە»[١]، لە لەفزێکدا: «دِيَةُ المُعَاهَدِ نِصْفُ دِيَةِ المُسْلِمِ» «خوێن بایی خاوەن پەیمان نیوەی خوێن بایی موسڵمانە»[٢].

- **خوێن بایی ئافرەت:** خوێن بایی ئافرەتێکی ئازادی موسڵمان نیوەی خوێن بایی پیاوێکی ئازادی موسڵمانە وەك لە نوسراوەکەی عەمری کوڕی حەزمدا هاتوە: «دِيَةُ المَرْأَةِ على النِّصْفِ مِنْ دِيَةِ الرَّجُل» «خوێن بایی ئافرەت نیوی خوێن بایی پیاوە». ئیبن عەبدولبەڕ وئیبن مونزیر کۆ دەنگی لەم بارەوە دەگوازنەوە.

(١) أخرجه النسائي (٨/٤٥)، والترمذي (١٤١٣) وحسنه، وحسنه الألباني «الإرواء» (٢٢٥١).
(٢) [أخرجه الطبراني في «المعجم الأوسط» (١٦/ ٣٧٣) (٧٧٩٧)].

- **خوێن بایی پیاوی ئاگر پەرست:** خوێن بایی ئاگر پەرستێكی ئازاد -زیمی بێت یا خاوەن پەیمان یان هی دی-، وبت پەرستیش هەشت سەد درهەمە، لە بەر فەرمودەكەی عوقبەی كوڕی عامر بەرزی دەكاتەوە: «دِيَةُ الْمَجُوسِيِّ ثَمَانِمِائَةِ دِرْهَمٍ» «خوێن بایی ئاگر پەرست هەشت سەد درهەمە»[1].

- **خوێن بایی ئافرەتی ئاگر پەرست وخاوەن كتێب وبت پەرست:** نیوەی خوێن بایی نێرینەكانیانە، وەكو چۆن خوێن بایی ئافرەتی موسڵمان نیوەی خوێن بایی پیاوێكی موسڵمانە، ئەمەش لەبەر گشتێتی فەرمودەكەی عەمری كوڕی شوعەیبی پێشو كە فەرموی: «خوێن بایی خاوەن كتێبەكان نیوەی خوێن بایی موسڵمانە».

- **خوێن بایی كۆرپەلە:** خوێن بایی كۆرپەلە ئەگەر بە مردویەتی لە بار بچێ بە هۆی دەست درێژی دایكیەوە ئەنقەست بێ یان هەڵە ئەوە بە نرخێكە: بەندەیەك یان كەنیزەكێك، لەبەر فەرمودەكەی [پێشتری] ئەبو هورەیرە ﷺ، ئەڵێ: «پەیامبەری خوا ﷺ لە بارەی كۆرپەلەی ئافرەتێكەوە لە خێڵی لیحیان بڕیاریدا ویەكلای كردەوە بە بەنرخێك (غُرَّةٌ): بەندەیەك یان كەنیزەكێك». وبە یەك لە دەی خوێن باییەكەی دایكی ئەندازەی خوێن باییەكەی بۆ دادەنرێت، كە بریتیە لە: پێنج وشتر، وبە نرخ (غرة)ـەكەش بە میراتی ئەبات وەك ئەوەی بە زیندویەتی لە دایك بو بێت.

(١) أخرجه البيهقي في «سننه» (١٠١/٨) وفيه ضعف، لكنه قول جماعة من الصحابة، ولا يعرف لهم مخالف. انظر: «التلخيص الحبير» (٣٤/٤).

# دەروازەی سێیەم

# لە بارەی سوێند دابەش کردنەوە «القَسَامَة»

**چەند مەسەلەیەکی لە خۆ گرتوە:**

**پرسی یەکەم: پێناسەی قەسامە، وحوکمەکەی، وحیکمەت لێی:**

١- **پێناسەکەی:** «القسامة» لە زماندا: چاوگی: «أَقْسَم يُقْسِم إقسَامًا وقَسَامَةً»ـە، یانی: سوێندی خوارد بە سوێند خواردن. لە شەرعیشدا: ئەو سوێندانەی چەند جارە دەکرێنەوە لە بانگەشەی کوژراوێکی خوێن پارێزراودا، بەوەوە ناونراوە چونکە سوێندەکان دابەش دەکرێن بە سەر کار بە دەستانی بکوژەکەدا، جا پەنجا سوێند ئەخۆن کەوا بانگەشە لە سەر کراو کەسەکەی ئەمانی کوشتوە. **شێوازەکەشی ئەوەیە:** کوژراوێك بدۆزرێتەوە وبکوژەکەشی ناناسرێت ئەوسا قەسامە تەنها لە ناو ئەو کەسانەدا ئەبێت کە ئەکرێت کوشتبێتیان، ئەمەش ئەگەر ئەو مەرجانەی تێدا بو وا باس دەکرێت.

٢- **شەرعی بونی:** کارێکی شەرعیە، وتۆڵە سەندنەوەی یان خوێن بایی پێ دەچەسپێت ئەگەر بانگەشەکە بەڵگە یان دانپێدانانی لەگەڵدا نەبو، هەروەها لەکەدار «لَوْث»یش هەبێت، ئەوەیە کە دوژمنایەتیەکی ئاشکرا لە نێوان کوژراوەکە وتۆمەت بۆ کراودا هەبێت، وەك ئەو خێڵانەی کەوا بە دوای تۆڵە سەندنەوەن لە یەکتر، وتراویشە: تایبەت نیە بەوەوە بەڵکو هەمو ئەوانە دەگرێتەوە کە زۆربەی گومان ئەڕوا بانگەشەکە ڕاست بێت. بەڵگەش لە سەر بونی ئەمە لە شەرعدا فەرمودەکەی سەعدی کوڕی ئەبو حەسمەیە: «أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةَ خَرَجَا إِلَى خَيْبَرَ مِنْ جَهْدٍ أَصَابَهُمْ، فَأَتَى مُحَيِّصَةُ فَأَخْبَرَ أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ سَهْلٍ قَدْ قُتِلَ وَطُرِحَ فِي عَيْنٍ أَوْ فَقِيرٍ، فَأَتَى يَهُودَ فَقَالَ: أَنْتُمْ وَاللهِ قَتَلْتُمُوهُ، قَالُوا: وَاللهِ مَا قَتَلْنَاهُ، ثُمَّ أَقْبَلَ حَتَّى قَدِمَ عَلَى قَوْمِهِ فَذَكَرَ لَهُمْ ذَلِكَ، ثُمَّ أَقْبَلَ هُوَ وَأَخُوهُ حُوَيِّصَةُ -وَهُوَ أَكْبَرُ مِنْهُ- وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ [...] فَقَالَ رَسُولُ اللهِ

ﷺ لِحُوَيِّصَةَ وَمُحَيِّصَةَ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَتَحْلِفُونَ وَتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ؟ قَالُوا: لَا. قَالَ: فَتَحْلِفُ لَكُمْ يَهُودُ؟ قَالُوا: لَيْسُوا بِمُسْلِمِينَ. فَوَدَاهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ عِنْدِهِ، فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِائَةَ نَاقَةٍ حَتَّى أُدْخِلَتْ عَلَيْهِمُ الدَّارَ، فَقَالَ سَهْلٌ: فَلَقَدْ رَكَضَتْنِي مِنْهَا نَاقَةٌ حَمْرَاءُ» «عەبدولای کوڕی سەهل وموحەیسەی کوڕی مەسعود بە هۆی وشکە ساڵی وهەژاری وتەنگیەکەوە دەرچون بۆ خەیبەر، موحەیسە دێتەوە ئەڵێ: عەبدولای کوڕی سەهل کوژراوە وخراوەتە ناو کانیاو یا بیرێکەوە (فَقِير)[١]، ئەمیش ڕۆیشت بۆ لای جولەکەکان، وتی: بە خوا ئێوە کوشتوتانە، ئەوانیش وتیان: بە خوا ئێمە نەمان کوشتوە، پاشان چو بۆ لای خزمەکانی خۆی بە سەر هاتەکەی بۆ گێڕانەوە، ئینجا خۆی وحوەیسەی برای -کە لەو گەورەتر بو- وعەبدولڕەحمانی کوڕی سەهل هاتن.... پەیامبەری خواش ﷺ بە حوەیسە وموحەیسە وعەبدولڕەحمانی فەرمو: ئایا سوێند دەخۆن وخوێنی کەسەکەتان مسۆگەر بکەن؟! -لە ڕیوایەتێکدا: بەڵگە ئەهێنن؟!- وتیان: هیچ بەڵگەیەکمان نیە، فەرموی: ئەی سوێند ئەخۆن؟! وتیان: ئەی چۆن سوێند بخۆین لە سەر شتێك نە بینیومانە ونە ئاگامان لێیەتی!؟ فەرموی: ئەی جولەکە سوێندتان بۆ ئەخۆن! وتیان: ئەی ئەوان موسڵمان نین! بۆیە پەیامبەری خوا ﷺ لەلایەن خۆیەوە لە خەزێنەی دەوڵەت خوێن بابیەکەی بۆ دان، وسەد وشتری بۆ ناردن، تا برایە ماڵەوە بۆیان، سەهل وتی: بە خوا وشترێ سوریان بە سمەکانی تێی ژەندم». ئەمەش بەڵگەیە لە سەر شەرعی بونی قەسامە، وکە بنەمایەکە لە بنەما سەربەخۆکانی شەرع[٢].

**٣- حیکمەت لێی:** قەسامە دانراوە بۆ پاراستنی خوێنەکان وبە فیڕۆ نەدانی، شەریعەتی ئیسلامیش ئەو پەڕی سورە لە سەر پاراستنی خوێنەکان، وپارێزگاری

---

(١) الفَقِير: بیری دەم فراوانی بن نزیکە، وتراویشە: ئەو چاڵەیە لە بن دار خورما دەکرێت.

(٢) أخرجه البخاري (٦٨٩٨، ٦٨٩٩)، ومسلم في القسامة (١٦٦٩)، واللفظ لمسلم.

لێکردنی ویە فیرۆ نەدانی، ولەبەر ئەوەی کوشتن زۆر ڕو ئەدات وکەمجار خەڵك دەیبینن، چونکە بکوژ بە دوای شوێنی چۆڵدا دەگەڕێت بۆیە قەسامە دانرا بۆ پاراستنی خوێنەکان.

## پرسی دووەم: مەرجەکانی قەسامە:

١- ئەبێت لەکەدار «لوث» بون هەبێت. پێشتریش واتاکەی ڕونکرایەوە.

٢- بانگەشە لە سەر کراو تەکلیف لێکراو بێت، جا بانگەشە کردن لە سەر منداڵ یان شێت دروست نابێت.

٣- ئەبێت بانگەشەکەر تەکلیف لێ کراو بێت، جا بانگەشەی منداڵ وشێت گوێی لێ ناگیرێت.

٤- ئەبێت بانگەشە لە سەر کراو دیاری کراو بێت، جا بانگەشەی سەر کەسێکی نادیار وەرناگیرێت.

٥- بکرێت بانگەشە لە سەر کراو کوشتبێتی، جا ئەگەر ڕێی تێ نەدەچو بە هۆی دوری لە شوێنی ڕوداوەکەوە لە کاتی ڕودانیدا وهاوشێوەی ئەمانە، ئەوە گوێ لەو بانگەشەیە ناگیرێت.

٦- ئەبێت بانگەشەی بانگەشە کەرەکە دژ بەیەك نەبێت.

٧- ئەبێت بانگەشەی قەسامە بە وردی بێت وڕونەوە بکرێت، بۆ نمونە ئەڵێ: من بانگەشەی ئەوە دەکەم، کە ئەو کەسە وەلیەکەی من فلانی کوڕی فلانی کوشتوە بە ئەنقەست یا نیمچە ئەنقەست یا بە هەڵە، وباسی شێوازی کوشتنەکەش ئەکات.

## پرسی سێیەم: شێوازی قەسامەکردن:

ئەگەر مەرجەکانی قەسامە فەراهم بو، ئەوا بە بانگەشەکاران دەست پێ دەکرێت، وپەنجا سوێند دەخۆن -کە بە سەریاندا دابەش دەکرێت بە گوێرەی میراتیەکەیان لە

کوژراوەکەدا- کە فلاّن کەس کوشتویەتی، ئەمەش بە ئامادەبونی بانگەشــە لــە ســەر کراو دەبێت، لە بەر فەرمودەکەی ئیبن ئەبی حەپـــمەی پێشــو: «ئایــا خــوێن بایەکــە مسۆگەر ئەکەن بە پەنجا سوێندا؟». جا ئەگەر میراتگرەکان ســوێندیان نــەخوارد، یــان پەنجا سوێندەکەیان تەواو نەکرد، ئەوا بانگەشە لە ســەر کــراو پــەنجا ســوێند ئــەخوات ئەگەر بانگەشەکاران بە سوێندەکانیان ڕازی بن، ئەمەش لەبەر فەرمایشتەکەی پێشوی پەیامبەر ﷺ کە فەرموی: «جولەکە سوێندتان بۆ ئەخۆن!»، ئەوانیش وتیان: جا ئەوان موسڵمان نین، وڕازی نەبون بە سوێندیان. جا کە سوێندیان خــوارد ئەســتۆ پــاك ئــەبن، ئەگەریش بانگەشەکاران بە سوێندیان ڕازی نەبون ئەوا کار بە دەستی موسڵمانان خوێن بایی کوژراوەکە لە خەزێنەی دەوڵەت دەدات، وەك پەیامبەری خوا ﷺ کــردی کاتێــك کە پشتیوانان ڕازی نەبون بە سوێندی جولەکــە، خــوێن بــایی کوژراوەکــەی لــە «بیــت المال»دا پێدان، چونکە هیچ ڕێگایەك نەما بۆ سەلماندنی خوێنەکە لە سەر بانگەشە لــە سەر کراو، بۆیە پێویستی کرد لە خەزێنەی دەوڵەت قەرەبو بکرێتەوە، بۆ ئەوەی خوێنی ئەو خوێن پارێزراوە بە فیڕۆ نەڕوات. هەر کەسێکیش لە قەرەباڵغیەکدا بکــوژرێ ئــەوە خوێن بابیەکەی لە خەزێنەی دەوڵەت ئەدرێت، بە بەڵگەی ئەوەی دەگێڕنــەوە[1] عــەلی لە بارەی پیاوێکەوە کە لە قــەرەباڵغی عەرەفــەدا کــوژراوە بــە عومــەری وتــوە: ئــەی پێشەوای باوەڕ داران! خــوێنی کەســی موســڵمان بــە فــیڕۆ (لا يُطَلُّ) نــادرێ، ئەگــەر بکوژەکەی بناسرێ لە بکوژەکەی وەردەگیرێ، ئەگەرنا لە «بيت المال» خــوێن بابیەکــەی بدە».

---

(١) أخرجه عبد الرزاق في المصنف (٥١/١٠)، وابن أبي شيبة (٣٩٥/٩). «لا يُطَلُّ»: یانی: فیڕۆدان، ئــەوترێ: طَلَّ السُّلْطَانُ الدَّمَ طَلًا -مِنْ بَابِ قَتَلَ-: دەسەڵات دارەکەی خوێنەکەی بە فیڕۆ دا.

# یانزەهەم: بەشی سنورەکان (الحدود)

له هەشت دەروازە پێك هاتوه:

دەروازەی یەکـــــەم: له بارەی پێناسەی حدود وشەرعی بونی ودانایی لێی.

دەروازەی دوەم: له بارەی حەددی داوێن پیسیەوە.

دەروازەی ســـێیەم: له بارەی حەددی تۆمەتەوە.

دەروازەی چـــوارەم: له بارەی حەددی مەیخۆرەوە.

دەروازەی پێنجـــەم: له بارەی حەددی دزیەوە.

دەروازەی شەشـــەم: له بارەی حەددی تەمیێ کردنەوە.

دەروازەی حەوتـــەم: له بارەی حەددی حیڕابەوە.

دەروازەی هەشـــتەم: له بارەی حەددی هەڵ گەڕانەوەوە.

# دەروازەی یەکەم

## لە بارەی پێناسەی سنورەکان و، شەرعی بونی و، دانایی لێی و، چەند پرسێکی تر

## «تَعْرِيفُ الحُدُودِ، وَمَشْرُوعِيَّتُهَا، والحِكْمَةُ مِنْهَا وَمَسَائِلُ أُخْرَى»

[چەند مەسەلەیەکی لە خۆ گرتوە]:

**[پرسی یەکەم: پێناسەی حدود، وبەڵگەکەی، ودانایی لێی]:**

١- **پێناسەکەی:** «الحد= سنور» لە زماندا: ڕێگریە، وسنورەکانی خواش: ئەو حەرام کراوەنەیەتی کە نەهی لە شکاندنی وکردنی کردوە، خوا دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا﴾ [البقرة:١٨٧] «ئەم حوکمانەی خوا بۆی داناون بریتیە لە سنورە جیا کەرەوەکانی خوا کە حەڵاڵ وحەرام لێك جیا دەکەنەوە، بۆیە نزیکی مەبنەوە بۆ ئەوەی نەکەونە ناو حەرامەوە»، بەمەش ناونراوە چونکە ڕێگرە لە تێکەوتنی. لە شەرعیشدا: سزایەکی دیاریکراوە لە پێناو مافی خوا. وتراویشە: سزایەکی دیاریکراوە لە ڕوی شەرعەوە بە هۆی تاوانێکەوە، بۆ ئەوەی ڕێگر بێت لە تێکەوتنی هاوشێوەکەی یان هاوشێوەی ئەو تاوانەی سزای لە سەر دانراوە.

٢- **بەڵگەکانی شەرعی بونی:** بنەما لە شەرعی بونی سنورەکان؛ قورئان وفەرمودە وکۆ دەنگیە، جا لە قورئان وفەرمودەدا چەندین سزای دیاریکراو هاتون بۆ چەندین تاوان وسەرپێچی دیاری کراو، وەك دامێن پیسی کردن، ودزی کردن، ومەی خواردنەوە، وجگە لەمانەش لەو تاوانانەی دواجار لە دەروازەکانی داهاتودا بە وردی باسی لێوە دەکرێت -بە ویستی خوا- لەگەڵ بەڵگەکانی هەمویان دا.

**٣- دانایی لە شەرعی بونی سنورەکان:** حەددەکان دانراون بۆ ڕێگریکردنی کەسەکان لە ئەنجامدانی سەرپێچیکردن ودەست درێژی کردنە سەر حەرامکراوەکانی خوا، ئەوسا ئۆقرەیی لە کۆمەڵگادا بڵاو دەبێتەوە وئاسایش تەشەنە دەکات لە نێوان تاکەکاندا، وئارامی باڵ دەکێشێت وژیان خۆش دەبێت. وەکو چۆن پاکبونەوەی بەندەی تێدایە لە دونیادا، لەبەر فەرمودەکەی عوبادەی کوڕی صامت بەرزی دەکاتەوە -لە بارەی گفتدانەوە- وتێیدا هاتوە: «وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَعُوقِبَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَتُهُ» «هەر کەسێکیش شتێك لەمانە بکات ولە سەری سزا بدرێت، ئەوا ئەبێتە کەفارەت (سڕینەرەوە) بۆی»[1]. هەروەها فەرمودەکەی خوزەیمەی کوڕی سابتە رضي الله عنه بەرزی دەکاتەوە: «مَنْ أَصَابَ حَدًّا أُقِيمَ عَلَيْهِ ذَلِكَ الْحَدُّ، فَهُوَ كَفَّارَةُ ذَنْبِهِ» «هەر کەس تاوانێك لەو تاوانانە بکات کە حەددی لە سەرە، ولە سەری جێبەجێ کرا، ئەوە سڕینەرەوەی تاوانەکەیەتی»[2].

ئەم سنورانەش سەرباری ئەوەی فەراهەمکەری بەرژەوەندی بەندەکانە، هەروەها هەموی دادگەری وئینسافە بەڵکو ها لە ئەو پەڕی دادگەریدا.

## [پرسی دووەم: واجبێتی بەرپاکردنی سنورەکان وحەرامێتی تکا کردن تێیدا]:

پێویستە سنورەکان لە نێوان خەڵکدا بەرپا بکرێت بۆ ڕێگری کردن لە سەرپێچی کردن وبەر بەست بون لە بەر دەم سەرپێچی کاران، پەیامبەریش ﷺ وەك هاندان بۆ جێبەجێکردنی فەرمویەتی[3]: «إِقَامَةُ حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللهِ، خَيْرٌ مِنْ مَطَرِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً

---

(١) أخرجه البخاري (٦٧٨٤)، ومسلم (١٧٠٩).

(٢) أخرجه أحمد في المسند (٥/٢١٤)، والدارقطني في سننه (٣٩٧). قال الحافظ ابن حجر: «سنده حسن». (الفتح ١٢/٨٦). وصححه الشيخ الألباني «صحيح الجامع» (٦٠٣٩).

(٣) أخرجه ابن ماجه (٢٥٣٧)، وأحمد (٢/٤٠٢) واللفظ لابن ماجه، وحسنه الألباني «صحيح ابن ماجه» (٢٠٥٦-٢٠٥٧)، وانظر: «السلسلة الصحيحة» (٢٣١).

فِي بِلَادِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ» «بەرپاکردنی حەددێك لە حدودەکانی خوا باشترە لە چل شەو باران بارین لە سەر زەوی». وتکاکردن واسیتەکردن لەمەڕ سنورێك بۆ ئەوەی بخرێت وجێ بەجێ نەکرێت، حەرامە ئەگەر گەیشتە دادوەر وسەلما لە لای، وەکو چۆن حەرامە لە سەر کار بە دەست تکای ئاوها قەبوڵ بکات، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «مَنْ حَالَتْ شَفَاعَتُهُ دُونَ حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللهِ، فَقَدْ ضَادَّ اللهَ فِي أَمْرِهِ» «تکای هەر کەس ببێتە ڕێگر لە بەردەم حەددێك لە حدودەکانی خوا، ئەوا دژایەتی فەرمان ودینی خوای کردوە»[(١)]، هەروەها لەبەر ئەوەی پەیامبەر ﷺ تکاکەی ئوسامەی کوڕی زەیدی ﷺ ڕەدکردنەوە دەرهەق ئافرەتە مەخزومیەکە کە دزی کردبو، وتوڕە بو بە هۆی ئەم تکاوە، تەنانەت فەرموی: «وَايْمُ اللهِ، لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعَ مُحَمَّدٌ يَدَهَا» «سوێند بە الله، ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکات، ئەوا موحەممەد دەستی دەبڕێت»[(٢)].

سەبارەت بە خۆش بون لە حەددەکان پێش گەیشتن بە دادوەر ئەوە دروستە، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ کاتێك کەسێك کراسەکەی دزرابو ویستی لە دزەکە ببورێت، فەرموی: «فهلاً قبل أن تأتيني به» «ئەی بۆ لێی خۆش نەبویت پێش ئەوەی بیهێنیت بۆ لای من!؟»[(٣)].

---

(١) أخرجه أبو داود (٣٥٩٧)، وأحمد (٢/٧٠)، والحاكم (٢/٢٧) وصحح إسناده، وافقه الذهبي، وصححه الألباني «الصحيحة» (٤٣٧).

(٢) أخرجه البخاري (٦٧٨٨)، ومسلم (١٦٨٨).

(٣) أخرجه أبو داود (٤٣٩٤)، والحاكم (٤/٣٨٠) وصححه، وافقه الذهبي، وصححه الألباني «الإرواء» (٢٣١٧).

[پرسی سێیەم: کێ حەدد جێ بەجێ دەکا، وشوێنی جێ بەجێ کردنەکەی؟]:

ئەوەی حەدد جێبەجێ دەکات بریتیە لە پێشەوا وجێگرەکەی، چونکە پەیامبەر ﷺ لە ژیانی خۆیدا خۆی سنورەکانی جێبەجێ دەکرد، پاشان خەلیفەکانی لەوەو دوا، پەیامبەریش ﷺ کەسێکی لە جێی خۆی ڕاسپارد بۆ جێبەجێکردنی حەدد، وفەرموی: «وَاغْدُ يَا أُنَيْسُ إِلَى امْرَأَةِ هَذَا، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا» «ئەی ئونەیس بڕۆ بۆ ئەو ئافرەتە، جا ئەگەر دانی نا بە تاوانەکەیدا ئەوا ڕەجمی بکە»[1].

واجبیش کراوە لە سەر پێشەوا، وەکو زەمانەتێك بۆ دادگەری، وڕێگریکردنێك لە حەیف وستەم.

وحەددیش لە هەمو شوێنێك جێبەجێ دەکرێت جگە لە مزگەوت، چونکە «نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يُسْتَقَادَ فِي الْمَسْجِدِ، وَأَنْ تُنْشَدَ فِيهِ الْأَشْعَارُ، وَأَنْ تُقَامَ فِيهِ الْحُدُودُ» «پەیامبەر ﷺ ڕێگری کردوە لە مزگەوتدا: داوای تۆڵەکردنەوە بکرێت، وشیعری تێدا بخوێنرێت، وحەددی تێدا جێ بەجێ بکرێت»[2]. ئەمەش بۆ پاراستنی مزگەوت لە پیس بون وهاو شێوەکانی، ولە هەندێك ڕیوایەتی چیرۆکی ڕەجم کردنی ماعزدا هاتوە: «فَأُخْرِجَ إِلَى الحَرَّةِ فَرُجِمَ» «ئەوەبو دەکرا بۆ ناوچەی حەڕرە لە ئەوێ دا ڕەجم کرا»[3].

---

(١) أخرجه البخاري (٦٨٣٥، ٦٨٣٦)، ومسلم (١٦٩٧، ١٦٩٨).

(٢) أخرجه أبو داود (٤٤٩٠)، وأحمد (٣/٤٣٤) وحسنه الألباني (الإرواء ٢٣٢٧).

(٣) أخرجه الترمذي (١٤٢٨)، وحسنه. وقال الألباني: «حسن صحيح». «صحيح الترمذي» (١١٥٤).

# دەروازەی دووەم

# لە بارەی حەددی داوێن پیسیەوە «حدُّ الزِّنَى»

چەند مەسەلەیەکی تێدایە:

## پرسی یەکەم: پێناسەی داوێن پیسی، وحوکمەکەی، ومەترسیەکەی:

### ١- پێناسەی داوێن پیسی:

زینا لە زماندا: بە جوت بون ئەوترێت لەگەڵ ئافرەت بە بێ گرێ بەستی شەرعی، وبە بەرکەوتن (مُبَاشَرَة)ی ئافرەتی بێ گانەش دەوترێت.

لە شەرعیشدا: بریتیە لە جوت بونی پیاو لەگەڵ ئافرەتدا لە دامێنەوە بە بێ موڵك وشوبهەکەی، یان: کردنی فاحیشەیە لە دامێنەوە یان لە پاشەوە.

### ٢- حوکمی داوێن پیسی:

داوێن پیسی حەرامکراوە، ولە تاوانە گەورەکانە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَا إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا﴾ [الإسراء:٣٢]، «ونزیکی داوێن پیسی وپێشەکیەکانی مەکەونەوە بۆ ئەوەی توشی زینا نەیەن، بەڕاستی کارێکی زۆر گەن وقیزەونە وخراپترین ڕێگا ئەو ڕێگایەیە». هەروەها لەبەر فەرمودەکەی ئیبن مەسعود رضي الله عنه ئەڵێ[1]: «سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ: أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللهِ؟ قَالَ: أَنْ تَجْعَلَ لِلهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ، قُلْتُ لَهُ: إِنَّ ذَلِكَ لَعَظِيمٌ. قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: ثُمَّ أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ مَخَافَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: ثُمَّ أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ» «پرسیارم کرد لە پەیامبەری خوا ﷺ: چی گەورەترین تاوانە لە لای خوا؟ فەرموی: ئەوەیە

(١) أخرجه البخاري (٦٨٦١)، ومسلم (٨٦).

هاوتا بۆ خوا دابنێیت لە کاتێکدا ئەو دروستی کردویت، پێم وت: ئەمە زۆر گەورەیە، وتم: پاشان چی؟ فەرموی: ئەوەیە منداڵەکەت بکوژیت لە ترسی ئەوەی لەگەڵتدا نان بخوات! وتم: پاشان چی؟ فەرموی: ئەوەیە زینا بکەیت لەگەڵ هاوسەری هاوسێکەت».

زانایانیش کۆکن لە سەر حەرامبونی.

**٣- مەترسی تاوانی داوێن پیسی، وقیزەونیەکەی، لەگەڵ خراپیەکانی:**

داوێن پیسی لە گەورەترین وقیزەونترین جەریمە وتاوانەکانە ولە هەموی زیاتر مەترسیدارترە لە سەر تاك وکۆمەڵگاکان لەبەر ئەو تێك دانەی لێی دەکەوێتەوە لە تێکەڵ بونی وەچە ورەچەڵەکەکان کە ئەمەش ئەبێتە مایەی زایەبونی مافەکان لە کاتی میرات بردندا، وفەوتانی یەکتر ناسین ویەکتر سەرخستن لە سەر هەق. ئەمەش هۆکارێکە بۆ هەڵوەشاندنەوەی خێزان وزایەبونی رۆڵەکان وخراپ پەروەردە بونیان ورەوشت تێکچونیان. هەروەها ئەمە فریودانی مێردی تێدایە چونکە لە داوێن پیسیەوە کۆرپەلە دروست دەبێت، ئەوساش مێرد منداڵی خەڵك پەروەردە دەکات. زیانەکانیشی زۆر زۆرە وکاریگەریەکانی شاراوە نیە چ لە تاك وچ لە کۆمەڵگادا: لە زایە بون وتێك چون وهەڵ وەشاندنەوە.

بۆیە ئیسلام ئەوپەری وریایی لێ کردوە، وتوندترین سزای داناوە بۆ ئەنجامدەرانی، وەك رون دەکرێتەوە.

**پرسی دوەم: حەددی داوێن پیس:**

حاڵی داوێن پیس لە دو حاڵەت بە دەر نیە:

١- یان هاوسەرگیری کردوە (أَنْ يَكونَ مُحْصَنًا).

٢- یان هاوسەرگیری نەکردوە.

**یەکەم: داوێن پیسی هاوسەردار:**

ئەو نا سەڵتیەی کە حەدد پێویست دەکا، ئەبێ ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدا بێ:

١- جوت بو بێت لە دامێنەوە، ئەمەش بەوەی زیناکەرە نێرینە یان مێینەکە پێشتر بە حەڵاڵی ولە دامێنەوە جوت بو بێت.

٢- ئەبێت جوت بونەکە لە هاوسەر گیریەکی دروست دا بێت.

٣- ئەبێت پیاوەکە یان ئافرەتەکە لە کاتی جوتبونەکەدا باڵغ وئازاد وژیر بو بێتن.

جا نا سەڵت (المُحْصَن) ئەوەیە: کەسەکە لە دامێنەوە جوت بو بێت لەگەڵ خێزانەکەیدا، لە هاوسەر گیریەکی دروست دا، وهەر دوکیشیان باڵغ وئازاد بن.

ئەمە پێنج مەرجە ئەبێت فەراهەم ببێت بۆ بە دیهاتنی ئەو ئیحصانەی ئەبێتە مایەی حەدد، ئەویش: پێگەیشتن وژیری وئازادی وجوت بون، لە دامێنەوە، وئەبێت جوت بونەکە لە هاوسەرگیریەکی دروستدا بێت.

**حەددەکەشی ئەمەیە:** ئەگەر هاوسەردار داوێن پیسی کرد ئەوا حەددەکەی بەرد باران کردنە تا مردن، پیاو بێت یان ژن. ڕەجم کردنیش بە تەواتری چەسپاوە لە پەیامبەرەوە ﷺ لە وتە وکردەوەیدا. ڕەجمیش لە قورئاندا باس کرابو پاشان لەفزەکەی نەسخەوە بو وحوکمەکەی مایەوە، ئەمەش لە فەرمودەکەی خوای میهرەباندا: ﴿الشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ إِذَا زَنَيَا فَارْجُمُوهُمَا الْبَتَّةَ نَكَالًا مِنَ اللهِ وَاللهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ ﴿پیاو وژنی گەورە ئەگەر داوێن پیسیان کرد ئەوا بەرد بارانیان بکەن تا مردن وەکو سزایەك لە لایەن خواوە، خواش بە دەسەڵات ودانایە﴾. وەك لە عومەری کوڕی خەتتابەوە هاتوە، لە وتاردا فەرمویەتی: «إِنَّ اللهَ قَدْ بَعَثَ مُحَمَّدًا بِالْحَقِّ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ، فَكَانَ مِمَّا أَنْزَلَ عَلَيْهِ آيَةُ الرَّجْمِ، قَرَأْنَاهَا وعَيْنَاهَا وَعَقَلْنَاهَا، فَرَجَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ، فَأَخْشَى إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ:

مَا نَجِدُ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللهِ، فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللهُ، وَإِنَّ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللهِ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى إِذَا أَحْصَنَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، إِذَا قَامَتِ الْبَيِّنَةُ أَوْ كَانَ الْحَبَلُ أَوِ الِاعْتِرَافُ» «خوا، موحەممەدی بە هەق ناردوە، وقورئانی بۆ دابەزاندوە، جا لەوانەی دایبەزاندوە ئایەتی ڕەجم کردن بو، ئەوەبو خوێندمان ولەبەرمان کرد ولێی تێگەیشتین، ئەوەبو پەیامبەر ﷺ ڕەجمی کرد وئێمەش ڕەجمان کرد دوای ئەو، جا دەترسم ڕۆژگارێك بە سەر خەڵکدا بێت، هەندێکیان بڵێن: ئێمە ڕەجم لە قورئان دا نابینینەوە، ئەوسا گومڕا بن بە هۆی وازهێنانیان لە فەرزێك لەوانەی خوا دایبەزاندوە، بەڕاستی ڕەجم کردن بۆ داوێن پیسی هاوسەردار ژن بێت یان پیاو هەقە ولە قورئانەکەی خوادا هەیە ئەگەر بەڵگە یان دو گیانی، یان دان پێدانان هەبێ»[1].

هەروەها لەبەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ئەڵێ: «پیاوێك لە موسڵمانان هاتە خزمەتی پەیامبەر لە مزگەوتدا، بانگی لێکرد وتی: ئەی پەیامبەری خوا! من داوێن پیسیم کردوە! ئەمیش پشتی لێکرد، ئەویش هاتە بەردەمی وتی: ئەی پەیامبەر خوا! زینام کردوە! دیسانەوە پشتی لێکردەوە، تا چوار جار ئەمەی دوبارە بویەوە، کە چوار جار شایەتی لە سەر خۆیدا، پەیامبەری خوا بانگی کرد وفەرموی: ئایە شێت بوی؟ وتی: نەخێر، فەرموی: ئەی خێزانداری؟! وتی: بەڵێ، فەرموی: بیبەن ڕەجمی بکەن»[2]. زانایانیش کۆکن لە سەر ئەوەی هەر کەس داوێن پیسی بکات وهاوسەردار بێت ئەوا حوکمەکەی ڕەجم کردنە بە بەرد هەتا مردن.

**دوەم: داوێن پیسی ڕەبەن:**

ئەو کەسەی مەرجەکانی پێشوی داوێن پیسی هاوسەرداری تێدا نەبێت.

---

(١) أخرجه البخاري (٣٨٧٢)، ومسلم (١٦٩١) [واللفظ له].

(٢) أخرجه البخاري (٦٨٢٥)، ومسلم (١٦٩١) - ١٦، واللفظ لمسلم.

**حەددەکەشی ئەمەیە:** ئەگەر سەڵت داوێن پیسی کرد ئەوا حەددەکەی سەد قامچیە، لەگەڵ نەفی کردنی بۆ ماوەی ساڵێك، بەڵام بۆ ئافرەت مەرجە لە نەفی کردنەکەدا مەحرەمی لەگەڵدا بێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ﴾ [النور:٢] «ئافرەتی داوێن پیس، وپیاوی داوێن پیس -کە پیشتر هاوسەرگیریان نەکردوە- سزای هەر یەکەیان سەد قامچیە»، ولەبەر فەرمودەکەی عوبادەی کوڕی صامت ﷺ ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «خُذُوا عَنِّي خُذُوا عَنِّي، قَدْ جَعَلَ اللهُ لَهُنَّ سَبِيلًا، الْبِكْرُ بِالْبِكْرِ، جَلْدُ مِائَةٍ وَنَفْيُ سَنَةٍ» «لە منەوە حەددی زیناکەر وەر بگرن، لە منەوە وەری بگرن، خوای گەورە دەروی لە ئافرەتانی داوێن پیس کردەوە[1]، حەددی داوێن پیسی سەڵت لەگەڵ سەڵتدا سەد قامچیە لەگەڵ نەفی ساڵێك»[2]. تەغریبیش: یانی نەفی کردنی ودورخستنەوەی لە نیشتمانەکەی.

ئەگەریش کۆیلە داوێن پیسی کرد -ڕەبەن بو یان نا بەندە یان کەنیزەك-، ئەوا حەددەکەی پەنجا قامچیە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ﴾ [النساء: ٢٥] «جا ئەگەر ئەو کەنیزەکانە شویان کرد ئینجا داوێن پیسیان کرد، ئەوا حەددەکەیان نیوەی حەددی ئافرتانی ئازادە». جا سزای باس کراو لە ئایەتەکەدا بریتیە لە سەد قامچی، ونیوەکردنەوەش هەر بۆ ئەوە دەڕوا، چونکە بەرد باران کردن ناکرێتە دو کوت (بەش)ەوە.

---

(١) ئاماژەیە بۆ فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: {فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا} [النساء:١٥]. کە باسی بەند کردنیان دەکات لەماڵەوە تا دەرویان لێ دەکرێتەوە. وەرگێڕ.

(٢) أخرجه مسلم (١٦٩٠).

کۆیلەش نەفی کردنی لە سەر نیە چونکە لە سوننەتدا نەفی کردنی کۆیلە نەهاتوە ئەگەر داوێن پیسی کرد، هەروەها نەفیکردنی زیانی تێدایە بۆ خاوەنەکەی، وئافرەتیش نەفی ناکرێت مەگەر لەگەڵ مەحرەم دا.

## پرسی سێیەم: داوێن پیسی بە چی دەسەلمێت؟

بۆ جێبەجێکردنی حەددی داوێن پیسی ئەبێت سەرەتا بسەلمێنرێت، وناشسەلمێنرێ مەگەر بە دو شت نەبێت:

**یەکەم:** زیناکەرەکە خۆی چوار جار دانی پێدا بنێت، با لە چەند دانیشتنێکی جیا جیا بێت، چونکە پەیامبەر ﷺ دانپێدانانی ماعز وغامدیەی وەرگرت. سەبارەت بە مەرج گرتنی چوار جار؛ لەبەر ئەوەی ماعز لەلای پەیامبەر ﷺ سێ جار ئیعترافی کرد بەڵام هەر ڕەددی کردەوە، کە چوارەم جار دانی پێدا نا حەددی لە سەر جێبەجێ کرد.

- وئەشبێت بە ڕاشکاوانە دان بنێت بە هەقیقەتی داوێن پیسی وجوت بون، چونکە لەوانەیە مەبەستی جگە لە داوێن پیسی بێت وەك چێژ وەرگرتنێك کە حەدد پێویست ناکات، لەبەر ئەوەی کاتێك ماعز ئیعترافی کرد، پەیامبەر ﷺ پێی فەرمو: «لَعَلَّكَ قَبَّلْتَ، أَوْ غَمَزْتَ؟» «لەوانەیە ماچت کردبێت، یان بە دەستت یان چاوت ئاماژەیەکت کردبێت؟» وتی: نەخێر. وچەندین جار داوای ڕونکردنەوەی لێ کرد تا هیچ ئیحتمالێکی تر نەمایەوە.

- هەروەها ئەبێت لە سەر دانپێدانانەکەی بمێنێتەوە تا کاتی جێبەجێکردنی حەددەکە، ولێی پەشیمان نەبێتەوە، چونکە پەیامبەر ﷺ چەندین جار داوای دانپێدانانی لە ماعز کرد، بەشکو پەشیمان ببێتەوە لە وتەکەی، هەروەها لەبەر

ئەوەی کاتێك ماعز ڕای کرد لە حاڵی ڕەجمکرنەکەدا، پەیامبەر فەرموی: ئەی بۆ وێڵتان نەکرد ؟![1]

**دوەم:** چوار کەس شایەتی داوێن پیسی لە سەر بدرێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿لَوْلَا جَاءُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ﴾ [النور: ١٣] «ئەی بۆ ئەو تۆمەت هاوێژانە چوار شایەتی دادگەر ناهێنن لە سەر قسەکەیان؟!»، وفەرمایشتی: ﴿فَاسْتَشْهِدُوا عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِنْكُمْ﴾ [النساء:١٥] «-ئەی دادوەران- چوار شایەتی دادگەر لە موسڵمانان داوا بکەن لە سەر ئەو ئافرەتانە». وبۆ ئەوەی شایەتیەکەیان بە داوێن پیسی دروست ببێت ئەبێت ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

١- ئەبێت شایەتەکان چوار کەس بن، لەبەر ئایەتەکانی پێشو، ئەگەریش لە چوار کەمتر بون وەر ناگیرێت.

٢- ئەبێت تەکلیف لێکراو (بالغ وعاقڵ) بن، جا شایەتیدانی منداڵ وشێت وەرناگیریت.

٣- ئەبێت پیاوی دادگەر بن، جا شایەتیدانی ئافرەت بۆ حەددی داوێن پیسی وەرناگیرێت، وەکو پاراستن ورێزێك بۆ ئافرەتان، چونکە داوێن پیسی، فاحیشە وخراپەکاریە. هەروەها شایەتیدانی فاسق (لە گوێڕایەڵی خوا دەرچو) وەرناگیرێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ [الطلاق:٢] «ودو پیاوی دادگەر بە شاهید بگرن»، ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا﴾

(١) أخرجه الترمذي (١٤٢٨) وحسنه، وابن ماجه (٢٥٥٤). وقال الألباني: «حسن صحيح» «صحيح الترمذي» (١١٥٤).

[الحجرات:٦] ((ئەی باوەڕداران ئەگەر فاسقێك هەواڵێکی بۆ هێنان، ئەوا لە هەواڵەکەی دڵنیا ببنەوە پێش بە ڕاست خستنەوەی وپاسکردنی)).

٤- ئەبێت شایەتەکان داوێن پیسیەکە بە چاوی خۆیان ببینن وبە ڕون وڕاشکاوی باس وەسفێکی بکەن، هەمو ئیحتمالێك دور بخاتەوە کە چێژ وەرگرتنی حەرام نەبوە، بۆیە ئەبێت بڵێن: کۆ ئەندامی نێرینەیمان بینی لە دامێنی ئافرەتەکەدا وەك چۆن میل لە ناو کلدانەکەیدایە، تەماشاکردنی شتی واش ڕێگە پێدراوە لەبەر زەرورەت.

٥- ئەبێت شایەتەکان موسڵمان بن، جا شایەتیدانی ناموسڵمان وەرناگیرێت لەبەر ئەوەی دادگەری لەودا بەدی نەهاتوە.

٦- ئەبێت لە یەك دانیشتندا شایەتی لە سەر بدەن، ئیتر پێکەوە یان جیا جیا بێن بۆ دانیشتنەکە.

جا هەر کام لەم مەرجانە نەبو ئەوا پێویستە حەددی تۆمەت هاوێژەر بەسەر هەمو شایەتەکاندا جێ بەجێ بکرێت، چونکە هەمویان تۆمەتی زینایان بەخشیوەتەوە.

# دەروازەی سێیەم

# حەددی تۆمەتی داوێن پیسی هاویشتن «حدُّ القَذْف»

چەند مەسەلەیەکی تێدایە:

## پرسی یەکەم: پێناسەی داوێن پیسی، وحوکمەکەی، ومەترسیەکەی:

**١- پێناسەی «القَذْف»:** لە زماندا: بریتیە لە هاویشتن، لەمەشەوە دەوترێ: «القذف بالحجارة= بەرد هاویشتن» وشتی تریش، پاشان بە کار هێنراوە بۆ خراپە هاویشتن بۆ خەڵك وەك داوێن پیسی ونێر بازی کردن وهاوشێوەکانیان، لەبەر بونی خاڵی لێك چون لە نێوانیاندا، ئەویش ئازارە.

**٢- حوکمی تۆمەتی زینا:** تۆمەتی داوێن پیسی لە بنەمادا حەرامە بە قورئان وفەرمودە وکۆ دەنگی، وتاوانێکی گەورەیە لە تاوانە گەورەکان، بۆیە حەرامە فاحیشە بدرێتە پاڵ کەس. ئەمەش لەبەر فەرمایشتەکەی خوای میهرەبان: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ [النور:٢٣] «ئەوانەی تۆمەتی داوێن پیسی دەدەنە پاڵ ئافرەتانی داوێن پاکی بێ ئاگا کە داوێن پیسی بە دڵیشیاندا نایەت، ئەوانە لە ڕەحمەت وبەزەیی خوا دورەوە خراون لە دونیا ودوا ڕۆژ دا، لە ناو دۆزەخیشدا سزایەکی بە ئێشیان بۆ هەیە». ولەبەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «اِجْتَنِبُوا السَّبْعَ المُوبِقَات» «خۆتان لە حەوت لە ناو بەرەکە بپارێزن»، جا لەوانەی باسی کرد: «قذف المحصنات المؤمنات الغافلات» «وتۆمەتبارکردنی ئافرەتانی

داوێن پاکی باوەڕداری بێ ئاگا»[1]. موسڵمانانیش کۆکن لە سەر حەرامێتی تۆمەتی زینا هاویشتن، هەروەها دانانی بە تاوانێکی گەورە.

وتۆمەتی زینا هاویشتن واجبە لە سەر کەسێك کە ژنەکەی دەبینێت داوێن پیسی دەکات، پاشان منداڵێکیشی دەبێت، زۆربەی گومانی وایە لە کابرای داوێن پیسە، ئەمەش بۆ ئەوەی منداڵەکە نەدرێتە پاڵی وبیباتە نێو خانەوادەکەی خۆیەوە ولەوانیش نەبێت. وتۆمەتی داوێن پیسی بەخشینەوەش حەلاڵە بۆ کەسێك ببینێت ژنەکەی داوێن پیسی دەکات بەلاّم منداڵی لەو داوێن پیسیە نەبێت.

**پرسی دوەم: حەددی تۆمەتی زینا، ودانایی لەو حەددە:**

١- **حەددی تۆمەتی زینا:** لە شەریعەت ئەوە چەسپاوە کە هەر کەس تۆمەتی زینا بداتە پاڵ موسڵمانێك وبەڵگە نەهێنێتەوە بۆ ڕاستگۆیی بانگەشەکەی ئەوا هەشتا قامچی لێ دەدرێت ئەگەر ئازاد بێت، وچلی لێ دەدرێت ئەگەر کۆیلە بێت، پیاو بێت یان ژن، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً﴾ [النور:٤] «وئەوانەی تۆمەتی داوێن پیسی دەدەنە پاڵ ئافرەتە داوێن پاکەکان، هەروەها پیاوانیش، بە بێ ئەوەی چوار شایەتی دادگەر بهێنن ئەوا هەشتا قامچیان لێ بدەن، وهەرگیز شایەتیان لێ وەر مەگرن». وپێویستە لە سەر تۆمەتباریش سەرباری حەدد لە سەر جێبەجێکردنی ئەبێت سزاش بدرێت ئەویش بریتیە لە وەرنەگرتنی شایەتیدانی وحوکمی فاسقدان بە سەریدا، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ [النور:٤] «وهەرگیز شایەتیان لێ وەرمەگرن، وئەوانەش لە گوێڕایەڵی خوا

(١) أخرجه البخاري (٢٧٦٦)، ومسلم (٨٩).

دەرچون». ئەگەریش تومەتکەرەکە تەوبەی کرد ئەوا شایەتیەکەی وەردەگیرێت، تەوبەکەشی ئەوەیە: خۆی بە درۆ بخاتەوە لەو تۆمەتی زینایەی بەخشیویەتیەوە وپەشیمان بێتەوە وداوای لێبوردن لە خوا بکات، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ [النور:٥] «بەلاّم کێ لەوەو دوا تەوبەی کرد وپەشیمان بویەوە لە تۆمەت بەخشینەوەکە وکردەوەکانی چاك کرد، ئەوا خوا لە تاوانەکانی دەبورێت وبەزەیی پێدا دێتەوە وتەوبەکەی وەردەگیرێ».

٢- **دانایی لێی:** ئامانجی ئیسلام لە جێبەجێکردنی حەددی تۆمەت هاویشتن: پاراستنی کۆمەڵگایە، وپارێزگاری کردنە لە ناموسی خەڵك، وبڕینی زمانی خراپە، وداخستنی دەرگای بڵاوکردنەوەی خراپەکاریە لە نێوان باوەڕداراندا.

## پرسی سێیەم: مەرجەکانی پێویست بونی حەددی تۆمەتی زینا:

حەددی تۆمەت هاویشتن پێویست نابێت مەگەر چەند مەرجێك فەراهەم بێت لە تۆمەت کەر ولە تۆمەت بۆ کراو، بۆ ئەوەی تاوان بارەکە شایستەی سزای قامچی لێ دان بێت:

**یەکەم: مەرجەکان لە تۆمەت کەردا، ئەویش پێنج دانەیە:**

١- ئەبێت بالّغ بێت، جا بچوك حەددی لە سەر نیە.

٢- ئەبێت ژیر بێت، جا حەدد لە سەر شێت وتێکچو نیە.

٣- نابێت تۆمەتکەر بنەچە بێت بۆ تۆمەت بۆ کراو، وەك باوك وباپیر ودایك وداپیرە، جا حەدد نیە لە سەر باوك ودایك ئەگەر تۆمەتیان کرد بۆ کوڕ وکچەکەیان وبەرەو خوارەوە.

٤- ئەبێت سەر پشك بێت، جا حەدد نیە لە سەر خەوتو وزۆر لێ کراو.

٥- ئەبێت زانا بێت بە حەرام کردن، جا حەدد نیە لە سەر نەزان.

**دوەم: مەرجەکان لە تۆمەت بۆ کراو دا، ئەمیش هەر پێنج دانەیە:**

١- ئەبێت تۆمەت بار کراو موسُڵمان بێت، جا حەدد نیە لە سەر کەسێك تۆمەتی زینا بداتە پاڵ ناموسُڵمان، چونکە حورمەتی نوقسانە.

٢- ئەبێت ژیر بێت، جا حەددی لە سەر نیە ئەگەر بۆ شێتێك بیکات.

٣- ئەبێت باڵغ بێت، یان بکرێ جوت ببێت یان جوت بێ لەگەڵیدا، ئەمەش بریتیە لە دە ساڵان ونۆ ساڵان وبەرەو سەرەوە.

٤- ئەبێت بە ڕوکەش لە زیناوە پاك بێت، جا حەددی لە سەر نیە ئەگەر بۆ خراپە کارێك بیکات.

٥- ئەبێت تۆمەت بۆ کراو ئازاد بێت، جا حەددی لە سەر نیە ئەگەر بۆ کۆیلەیەك بیکات، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ[1]: «مَنْ قَذَفَ مَمْلُوكَهُ بِالزِّنَا، يُقَامُ عَلَيْهِ الْحَدُّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ كَمَا قَالَ» «هەر کەس تۆمەتی زینا بداتە پاڵ کۆیلەکەی، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا حەددی لە سەر جێ بەجێ دەکرێت مەگەر بەو شێوازە بێت ئەو وتویەتی». پێشەوا نەوەوی رَحِمَهُ اللَّهُ ئەڵێ: «ئەم فەرمودە ئاماژەی بۆ ئەوە تێدایە کە تۆمەتکەر بۆ کۆیلە لە دونیادا حەددی لە سەر نیە، ئەمەش جێی کۆ دەنگیە، بەڵام تۆمەتکەرەکە تەمبێ دەکرێت، چونکە کۆیلە موحصەن نیە»[2].

لەمەوە ڕون بویەوە کە مەرجی جێبەجێکردنی حەدد لە سەر تۆمەتکەر ئەبێت تۆمەت بۆ کراو موحصەن بێت، ئەویش ئەوەیە کە: موسُڵمانێکی، ژیری، ئازادی،

---

(١) أخرجه مسلم (١٦٦٠).

(٢) شرح مسلم (١١/١٣١-١٣٢).

داوێن پاكی، پێگەیشتوی -یان شیاو بێت بۆ جوت بون-، ئەمەش لە فەرمایشتەكەی خوادا باس كراوە كە ئەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ﴾ [النور: ٤]. لەمە تێدەگەیت كە: قامچی نادرێت لە كەسێكی ناموحصەن.

## پرسی چوارەم: مەرجەكانی جیٚ بەجیٚ كردنی حەددی تۆمەتی زینا:

ئەگەر حەددی تۆمەتی زینا پێویست بو، ئەوا ئەبێت چوار مەرجی تێدا فەراهەم بێت، كە بریتیە لە:

١- تۆمەت بۆ كراو داوای هەبێت لە سەر تۆمەتكەر، وئەم داواكاریەش بەردەوام بێت تا كاتی حەدد جیٚ بەجیٚ كردنەكە. چونكە حەددی تۆمەتی زینا مافی تۆمەت بۆ كراوە، جا بیٚ داواكاری وی جیٚ بەجیٚ ناكرێت، بە لیٚ خۆشبونیشی دەكەوێت. جا ئەگەر لە تۆمەت كەرەكە خۆش بو ئەوا حەددەكەی لە سەر دەكەوێت، بەلاَم تەمبیٚ دەكرێت بە شێوازێك ڕێگری لیٚ بكات لە تۆمەت بەخشینەوەی حەرام.

٢- ئەبێت تۆمەتكەرەكە بەلْگەیەك نەهێنێت تۆمەتەكەی بچەسپێنێت ئەویش بریتیە لە چوار شایەت، لەبەر فەرمایشتەكەی خوا: ﴿ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ﴾ [النور:٤].

٣- ئەبێت تۆمەت بۆ كراوەكە تۆمەتەكە بە ڕاست نەخاتەوە ودانی پێدا نەنێت،، جا ئەگەر دانی پیٚ دا نا وبە ڕاستی خستەوە ئەوا حەددی لە سەر نیە، چونكە ئەمە لە بەلْگە هێنانەوە كاریگەر ترە.

٤- ئەبێت تۆمەت كەرەكە مولاعەنە نەكات لەگەلْ تۆمەت بۆ كراوەكەدا ئەگەر تۆمەت كەرەكە مێردەكە بو، جا ئەگەر مولاعەنەی لەگەلْ كرد ئەوا حەددەكەی لە سەر دەكەوێت، وەك پێشتر لە لیعاندا باس كرا.

# دەروازەی چوارەم

# لە بارەی حەددی مەی خۆرەوە «حدُّ شَارِبِ الخَمْر»

چەند مەسەلەیەکی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: پێناسەی مەی، وحوکمەکەی، ودانایی لە قەدەغە کردنی:

**١- پێناسەی «الْخَمْر»:**

لە زماندا هەر شتێکە عەقڵ داپۆشێت لە هەر ماددەیەك بێت.

**لە شەرعیشدا:** هەر شتێکە سەر خۆش بکات ئیتر شەربەت بێت لە مێوژ یان لە شتی تر، یان لێ نراو بێت، یان لێ نەنراو بێت. **سەر خۆشکردنیش:** بریتیە لە تێکەڵ بونی عەقڵ، **سەر خۆش کەریش:** بریتیە لەو خواردنەوەی بخۆرەکەی سەر خۆش دەکات، **سەر خۆشیش:** پێچەوانەی بێدار (الصَّاحِي)ـە.

**٢- حوکمەکەی:**

حوکمی مەی حەرامە، هەروەها سەرجەم سەر خۆش کەرەکانی تر، جا هەمو سەر خۆش کەرێك مەیە، جا دروست نیە مەی بخورێتەوە ئیتر کەم بێت یان زۆر، خواردنەوەشی تاوانێکە لە تاوانە گەورەکان، مەییش حەرامە بە قورئان وسوننەت وکۆ دەنگی، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ [المائدة:٩٠] «ئەی باوەڕداران مەی وقومار وئەو بتانەی هاوبەشدانەران ئاژەڵی لە لادا سەر دەبڕن، وتیر وپشکی نەفامەکان ئەمانە تاوانن ولە ڕازاندنەوەی شەیتانن، بۆیە لەم تاوانانە دور بکەونەوە بۆ ئەوەی بەهەشت ببەنەوە»، جا فەرمان کردن بە دور کەوتنەوە بەڵگەیە لە سەر حەرام کردن. ولەبەر فەرمودەکەی عائیشە ﵂، ئەڵێ:

پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ» «هەمو خواردنەوەیەکی سەر خۆشکەر حەرامە»(١)، ولە ئیبن عومەرەوە ﵁ بەرزی دەکاتەوە: «كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ، وَكُلُّ خَمْرٍ حَرَامٌ» «هەمو سەر خۆش کەرێك مەیە، وهەمو مەیەکیش حەرامە»(٢). وفەرمودەکان لە بارەی حەرام کردن ولێ ڕەتانی زۆر زۆرە ئەگاتە ڕادەی تەواتر، ئوممەتیش کۆکە لە سەر حەرام بونی.

**٣- دانایی لە بارەی حەرامێتی مەیەوە:**

خوای میهرەبان زۆر نیعمەتی بەخشیوە بە مرۆڤ، لەوانە: نیعمەتی عەقڵ کە پێی لە دروست کراوەکانی تری جیا کردۆتەوە، ولەبەر ئەوەی سەر خۆش کەرەکان وا لە مرۆڤ دەکەن نیعمەتی عەقڵ لە دەست بدەن، ورق وکینە لە نێوان باوەڕداران بڵاوە پێ دەکەن، ورێگری لە نوێژ دەکات، ولە یادی خوا دورت دەخاتەوە، شەرع حەرام کرد، بۆیە مەی مەترسیەکەی گەورەیە، وخراپیەکەی مەزنە، مەی ولاخی شەیتانە سواری ئەبێت بۆ زەرەردان لە موسڵمانان، خوای بەرز ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ﴾ [المائدة: ٩١] «شەیتان بە ڕازاندنەوەی تاوانەکان دەیەوێت هۆکارەکانی دوژمنایەتی ورق وکینە بخاتە نێوانتانەوە، بە هۆی مەی خواردن وقومارکردنەوە، ولە یادی خوا ونوێژ دورتان بخاتەوە».

---

(١) أخرجه البخاري (٥٥٨٥)، ومسلم (٢٠٠١).

(٢) أخرجه مسلم (٢٠٠٣)-٧٥.

## پرسی دوەم: حەددی مەی خۆر، ومەرجەکانی، وبە چی دەسەلمێت؟

**١- حەددی مەی خۆر:** حەددی مەی خۆر، قامچی لێدانە، ئەندازەکەشی: چل قامچیە. دروستیشە بگەیەنرێتە هەشتا، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تێکۆشانی پێشەوا، کە پێویستی کرد زیادی دەکات ئەگەر خەڵك خویان گرت بە مەی خواردنەوە وبە چل قامچی وازیان نەدەهێنا، لەبەر فەرمودەکەی عەلی کوڕی ئەبو تاڵب ﵁: «جَلَدَ النَّبِيُّ ﷺ أَرْبَعِينَ، وَأَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ، وَعُمَرُ ثَمَانِينَ، وَكُلٌّ سُنَّةٌ، وَهَذَا أَحَبُّ إِلَيَّ» «پەیامبەر ﷺ **چل قامچی لێدەدا**، ئەبوبەکریش هەروەها، وعومەر کردیە هەشتا، هەمویشی سوننەتە (ڕێگایەکە گیراوەتە بەر)، ئەمەش [واتە: چل]م پێ خۆش ترە»[١]. ولەبەر فەرمودەکەی ئەنەس ﵁ ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَضْرِبُ فِي الْخَمْرِ بِالنِّعَالِ وَالْجَرِيدِ أَرْبَعِينَ» «پەیامبەری خوا ﷺ لە سەر مەی خواردنەوە بە پیلاو وسەعەفی دار خورما چل جاری لە کابرای دەدا»[٢].

**٢- مەرجەکانی جێ بەجێ کردنی حەددی مەی خواردنەوە:**

چەند مەرجێك هەیە بۆ جێبەجێ کردنی حەدد لە سەر سەکران، ئەویش ئەوەیە:

- موسڵمان بێت، جا نا موسڵمان حەددی لە سەر نیە.
- بالغ بێت، جا حەدد نیە لە سەر منداڵ.
- ژیر بێت، جا حەدد نیە لە سەر شێت، وتێکچو.
- ئەبێت ویستدار بێت، جا حەدد نیە لە سەر زۆر لێکراو ولە بیرچو وهاوشێوەکانی. ئەم سێ مەرجەش فەرمودەکەی [پێشتر] بەڵگەیە لە سەری: «خوای

(١) أخرجه مسلم (١٧٠٧).
(٢) أخرجه مسلم (١٧٠٦).

میهرەبان لە: هەڵە ولە بیر چونەوە وزۆر لێ کردنی ئوممەتەکەم خۆش بوە». هەروەها فەرمودەی: «قەڵەم هەڵگیراوە لە سەر سێ جۆر خەڵك:... ». پێشتریش چەند جار باس کرا.

- ئەبێت بزانێت حەرامە، جا حەدد نیە لە سەر نەزان.

- ئەبێت بزانێت ئەو خواردەنەوەیە مەیە، جا ئەگەر خواردی وای زانی خواردنەوەیەکی ترە ئەوا حەددی لە سەر نیە.

**٣- ئەوەی حەددی مەی خواردنەوەی پێ دەسەلمێت؟**

حەددی مەی خواردنەوە بە یەکێك لەم دو شتە دەچەسپێت:

١- داننان بە خواردنەوەی: وەك ئەوەی ئیعتراف بکات بە ویستی خۆی مەی خواردۆتەوە.

٢- بەڵگە، ئەویش شایەتی دانی دو پیاوی دادگەری موسڵمان لە سەری.

## پرسی سێیەم: حوکمی مادده هۆش بەر (المخدرات)ەکان وبازرگانی پێوە کردنیان:

**١- حوکمی مادده هۆشبەرەکانی جگە لە مەی:** مەبەست لە موخەددەرات ئەوەیە هۆش وبیر دا دەپۆشێت، وبەکار هێنەرەکەی توشی تەمبەڵی وقورسی وتەوەزەلی وسارد بونەوە دەکات، وەك بەنج وئەفیون، وحەشیش وهاو شێوەکانی. مادده هۆش بەرەکانیش حەرامە هەر چۆنێك بە کاری بهێنێت، لەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] عائیشە ﵂، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «هەمو خواردنەوەیەك سەر خۆش بکات حەرامە». هەروەها فەرمودەکەی [پێشتری] ئیبن عومەر ﵄، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «هەمو سەر خۆش کەرێك مەیە، هەمو سەر خۆش کەرێکیش حەرامە... هتد». هەروەها لەبەر گەورەیی ترسناکی ئەم مادده

هۆشبەرانە، وزۆری خراپی، وتوندی لە ناو بردنی بۆ گەنج وپیاوانی ئوممەت، وسەرقاڵ کردنیان لە گوێڕایەڵی خوا وتێکۆشان لە دژی دوژمنانی وشتە بەرز وبە سودەکان ئیسلام حەرامی کردوە.

**٢- حوکمی بازرگانی کردن بە مادده هۆشبەرەکانەوە:** لە پەیامبەرەوە ﷺ، نەهی هاتوە لە حەرام کردنی فرۆشتنی مەی، جابر دەگێڕێتەوە لە پەیامبەرەوە ﷺ فەرمویەتی: «إِنَّ اللهَ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْر، وَالْمَيْتَةِ، وَالْخِنْزِيرِ، وَالْأَصْنَامِ» «خوای دانا فرۆشتنی مەی ومردارەوە بو وبەراز وبتی حەرام کردوە»[1]. هەروەها ﷺ ئەفەرموێ: «وَإِنَّ اللهَ إِذَا حَرَّمَ شَيْئًا حَرَّمَ ثَمَنَهُ» «خوای دانا ئەگەر شتێك حەرام بکات، نرخەکەشی حەرام دەکات»[2].

هەر بۆیە زانایان ئەڵێن: ئەوەی خوا حەرامی کردبو کەڵکی لێوەر بگیرێت، فرۆشتنیشی حەرام ئەبێت، ونرخ خواردنەکەشی هەروەها.

وله بەر ئەوەی مادده هۆشبەرەکان ناوی مەی دەیگرێتەوە، جا نەهی لەبارەی فرۆشتنی مەیەوە، لە ڕوی شەرعەوە ئەم مادده هۆشبەرانەش دەگرێتەوە، کەواتە حەرامە بفرۆشرێت، هەروەها ئەو پارەشی لەمەوە دەست دەکەوێت حەرام دەبێت.

---

(١) أخرجه مسلم (١٥٨١).

(٢) أخرجه أبو داود (٣٤٨٨)، وأحمد (٢٤٢/١)، وهو صحيح «مسند أحمد» (٩٥/٤) (٢٢٢١) ط الأرناؤوط.

# دەروازەی پێنجەم

# لە بارەی دزی کردنەوە «حدُّ السَّرِقَة»

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: پێناسەی دزی وحوکمەکەی حەددی بکەرەکەی ودانایی تێیدا:

**١- پێناسەی دزی:**

لە زماندا: بردنی شتە بە دزیەوە. لە شەرعیشدا[1]: بردنی ماڵی کەسی ترە بە ستەم، وبە شاراوەیی ودزیەوە، لە شوێنێکی قایم وتۆکمەی هاوشێوەدا بە چەند مەرجێکی دیاری کراو کە باس دەکرێت بە ویستی خوا.

**٢- حوکمی دزین:**

دزین حەرامە، چونکە دەست درێژی کردنە بۆ سەر مافی خەڵك، وبردنی ماڵیانە بە ناڕەوا. وقورئان وسوننەت وکۆ دەنگی بەڵگەن لە سەر حەرامیەکەی. ویەکێکیشە لە تاوانە گەورەکان، خوای گەورەش نەفرەتی لە خاوەنەکەی کردوە وەك لە فەرمودەکەی ئەبو هورەیرەدا ﷺ هاتوە، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «لَعَنَ اللهُ السَّارِقَ، يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ، وَيَسْرِقُ الْحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُه» «خوا نەفرەتی لە دز کردوە، هێلکەیەك دەدزێت ودەستی دەبڕدرێت، وپەتێك دەدزێت ودەستی دبڕدرێت»[2].

**٣- حەددی بکەرەکەی:** حەدد پێویستە لە سەر بکەرەکەی جێ بەجێ بکرێت.

(١) [هاو شێوە: یانی: شوێنی هەڵ گرتنەکە شیاوی ئەو شتە بێت تێیدا حەشار دەدرێت، بۆ نمونە: ئەڵماسێك لە تاقەکەی ژوری میوانیان دا نەنێت، کە لە بەر دەست دایە]

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٦٧٨٣)، ومسلم (١٦٨٧).

ئەویش بریتیە لە: بڕینی دەستی، پیاو بێت یان ژن، لەبەر فەرمایشتەکەی خوای باڵا: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالًا مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ [المائدة: ٣٨] «-ئەی کار بە دەستان!- دەستی دزی پیاو ودزی ئافرەت ببڕنەوە بە گوێرەی شەرع، وەکو سزایەك لە سەر خواردنی ماڵی خەڵك بە ناڕەوا، تا بشبێتە ڕێگر لە بەردەم کەسی تر دەست بۆ کاری وا نەبات، خواش بە دەسەڵاتە لە موڵکەکەیدا، ودانایە لە کارەکانیدا». ولەبەر فەرمودەکەی عائیشە ﵂، فەرموی: «كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَقْطَعُ السَّارِقَ فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا» «پەیامبەری خوا ﷺ دەستی دزی دەبڕی بەرامبەر ڕوبعە دینارێك وبەرەو سەرەوە»[1]. ولەبەر فەرمودەکەی عائیشە دیسانەوە، ئەڵێ: قوڕەیش خەمی ئافرەتە مەخزومیەکە دایگرتبون کە دزی کردبو، تێیدا هاتوە کە پەیامبەر ﷺ فەرمویەتی: «وَايْمُ اللهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا» «سوێند بە خوا ئەگەر فاتیمەی کچ موحەممەد دزی بکات ئەوە بێگومان دەستیم دەبڕی»[2]. زانایانیش کۆکن لە سەر حەرامێتی دزی کردن، واجبێتی بڕینی دەستی دز بە گشتی.

## ٤- دانایی لە جێبەجێکردنی حەددی دزی کردن:

ئیسلام حورمەتی بۆ پارە داناوە، وحورمەتیشی گرتوە لە مافی تاکەکان کە هەیانبێت، ودەست درێژی کردنیشی قەدەغە کردوە بۆ سەر ئەم مافە، ئیتر بە دزی بێت یان لە پڕدا بردن، یان غەش کردن یان خیانەت کردن یان بەرتیل یان شێوەکانی تری بە ناڕەوا خواردنی ماڵی خەڵك.

(١) أخرجه البخاري (٦٧٩٠)، ومسلم (١٦٨٤).
(٢) أخرجه البخاري (٣٤٧٥)، ومسلم (١٦٨٨).

جا لەبەر ئەوەی دز ئەندامێکی خراپی کۆمەڵگایە –چونکە ئەگەر وێڵ بکرێت خراپە وشەڕی تەشەنە دەکات ومەترسی وزەرەرەکەی بڵاو دەبێتەوە- بۆیە ئیسلام بڕینی ئەو ئەندامە خراپەی داناوە، وەك سزایەك بۆ ئەو دەستە لە سەر ستەم ودەست درێژیەکەی، هەروەها بۆ ئەوەی ببێتە ڕێگر کەسی تر دەست بۆ ئەم تاوانە نەبات، ومالّ ومافی خەڵکیش بپارێزراو بێت.

## پرسی دووەم: مەرجەکانی واجبێتی حەددی دزی کردن:

بۆ ئەوەی حەددی دزی کردن جێبەجێ بکرێت ودەستی دز ببڕدرێت، ئەبێت ئەم مەرجانە هەبێت:

١- ئەبێت پارە بردنەکە بە دزی وشاراوەییەوە بێت، ئەگەر وا نەبێت ئەوا نابڕدرێت، جا تالاّنکەر –بە زۆر–، وزەوتکەر، وفڕێنەر، وخیانەتکار ئەمانە دەست بڕینیان لە سەر نیە[1]، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ[2]: «لَيْسَ عَلَى خَائِنٍ وَلَا مُنْتَهِبٍ، وَلَا مُخْتَلِسٍ قَطْعٌ» «دەست بڕین نیە بۆ خیانەتکەر، وتالاّنکەر، وفڕێنەر».

٢- ئەبێت دزەکە تەکلیف لێکراو (بالغ وعاقلّ) بێت، جا دەستی منداڵ وشێت نابڕدرێ، چونکە قەڵەمیان لە سەر هەڵ گیراوە وەك باس کرا، منداڵیش تەمبێ دەکرێ.

٣- ئەبێت دزەکە ویستدار بێت، جا دەستی زۆر لێ کراو نابڕدرێت، چونکە عوزری هەیە، لەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] پەیامبەر ﷺ: «لە سەر ئوممەتەکەم هەڵە ولە بیر چونەوە وزۆر لێ کردن هەڵ گیراوە».

٤- ئەبێت بزانێت حەرامە، جا دەستی نەزان بە حەرامێتی دزی کردن نابڕدرێت.

---

(١) [دەست بڕینیان لە سەر نیە، نەك هیچ سزایەك! جا ئاگادار بە].

(٢) أخرجه الترمذي (١٤٨٨) واللفظ له، وقال: «حسن صحيح»، وابن ماجه (٢٥٩١)، وصححه الألباني «صحيح الترمذي» (١١٧٢).

٥- ئەبێت ماڵە دزراوەكە حورمەت دار بێت، جا ئەوەی ماڵ نیە وحورمەتی نیە وەك ئامێرەكانی مۆسیقا ومەی وبەراز ومردارەوە بو، هەروەها ئەوەی كە ماڵە بەلاّم حورمەت دار نیە وەك ماڵی ناموسڵمانی شەڕ كەر -چونكە ناموسڵمانی شەڕ كەر خوێن وماڵی حەلاڵە- ئەوە دەست بڕینی تێدا نیە.

٦- ئەبێت ماڵە دزراوەكە بگاتە ڕادە، كە بریتیە لە ڕوبعە دینارێكی زێڕ وبەرەو سەرەوە، یان سێ درهەم زیو، یان بەرامبەر ئەمانە لە دراوەكانی تر، جا كەمتر لەمە دەست بڕینی تێدا نیە، لەبەر فەرمایشتەكەی پەیامبەر ﷺ: «لَا تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ إِلَّا فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا» «دەستی دز نابڕدرێت مەگەر لە ڕوبعە دینارێك وبەرەو سەرەوە»[1].

٧- ئەبێت ماڵە دزراوەكە لە شوێنێكی قایم (حِرْز)ی هاوشێوەی خۆی بێت، ئەمەش ئەو شوێنەیە كە زۆرجار پارەی تێدا قایم دەكرێت، ئەمەش دەگۆڕێت بە گوێرەی ماڵ وشارەكان وهتد، ولەمەشدا دەگەڕێتەوە بۆ داب ونەریت، جا ئەگەر لە شوێنێكی قایم نەیبرد، وەك ببینێت دەرگاكە كراوەتەوە، یان شوێنەكە هەڵدراوەتەوە، ئەوە دەست بڕینی تێدا نیە.

٨- ئەبێت شوبهە لە سەر دزەكە نەمێنێت، جا ئەگەر شوبهە هەبو لەوەی دزیەتی ئەوا دەست بڕینی تێدا نیە، چونكە حەددەكان بە شوبهە دور دەخرێنەوە، سا دەستی كەسێك نابڕدرێت دزی لە ماڵی باوكی بكات، بە هەمان شێوە لە ماڵی كوڕەكەی بیكات، چونكە بژێوی هەر یەكەیان لە سەر ئەوی تریانە. هەروەها دەستی هاوبەش نابڕدرێت بە هۆی دزیەوە لە ماڵی هاوبەشەكەی لەوەی هاوبەشی هەیە، بە

(١) أخرجه مسلم (١٦٨٤) -٢.

هەمان شێوە هەر کەسێك شایستەییەکی لەماڵێکدا هەبێت ولێی ببات، ئەوا بڕینی تێدا نیە، بەڵام تەمبێ دەکرێت وئەوەی بردویەتی دەگێڕدرێتەوە.

٩- ئەبێت لە لای دادوەر دزیەکە بچەسپێت، ئەمەش یان بە شایەتی دانی دو کەسی دادگەر، یان بە دان پێدانانی دزەکە خۆی دەبێت، لەبەر گشتێتی فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ﴾ [البقرة:٢٨٢]، سەبارەت بە دان پێدانانیش، لەبەر ئەوەیە مرۆڤ تۆمەتبار ناکرێت لە سەر شایەتیدانی لە دژی خۆی وزیان پێگەیاندنی.

١٠- ئەبێت دزی لێ کراوەکە داوای ماڵەکەی بکات، چونکە ماڵ، بە بەخشین وبۆ حەڵاڵ کردن حەڵاڵ ئەبێت، یان بهێڵێت بڕواتە شوێنی هەڵ گرتنەکەوە، یان ئەو شتەکانی تریش کە حەدد لە سەر دەخەن.

## پرسی سێیەم: تکا کرن بۆ حەددی دزی کردن، وبەخشینی دزراوەکە بە دزەکە:

١- **تکا کردن بۆ حەددی دزی کردن:** دروست نیە تکا بکرێت نە بۆ حەددی دزی کردن، نە بۆ هیچ حەددێکی تر ئەگەر گەیشتە پێشەوا وپێی زانی، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ کاتێك ئوسامە تکای کرد بۆ ئافرەتە مەخزومیەکە کە دزی کرد، پێی فەرمو: «أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدودِ اللهِ؟!» «تکا دەکەیت بۆ حەددێك لە حەددەکانی خوا؟!». پێشتریش لە سەرەتای دەروازەی حەددەکان باسی لێوە کرا.

٢- **بەخشینی دزراو بە دز:** دروستە دزراو ببەخشرێت بە دز، ودزەکەی لێ ببەخشرێت، پێش بەرز کردنەوەی بۆ لای دادوەر. بەڵام کە گەیشتە دادوەر نەخێر، لەبەر فەرمودەکەی سەفوانی کوڕی ئومەییە ﷺ کە دزێك عاباکەی لە ژێر سەری دزیوە، کە بەرزی دەکاتەوە بۆ لای پەیامبەری خوا ﷺ وفەرمانی کرد دەستی

ببڕدرێت، سەفوان وتی: من خۆش دەبم وچاو پۆشی لێدەکەم، لە ڕیوایەتێکدا: وتی ئەی پەیامبەری خوا! بۆ خۆی، پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەی بۆ پێش ئەوەی بگاتە لای من وات نەکرد؟![1].

## پرسی چوارەم: چۆنێتی بڕینەوە وشوێنەکەی:

ئەگەر مەرجەکانی پێشو فەراهەم بو، وبڕین پێویست بو، ئەوا دەستی ڕاستی دز لە جومگەی لەپەوە دەبڕدرێت، دوای بڕینەوەش دەستەکەی بە ئاگر کەوی دەکرێت، یان دەژەنرێتە زەیتێکی کوڵاو یان هەر هۆکارێکی تر کە ئەبێتە مایەی وەستانی خوێن بەر بونەکە وساڕێژ کردنەوەی برینەکە، بۆ ئەوەی برینەکە توشی لەناو چون وتیاچون نەیەت.

ئەگەریش هەم دزی کردەوە، ئەمجارە پێی چەپی دەبڕدرێت.

(١) أخرجه النسائي (٢/٢٥٥)، وأحمد (٦/٤٦٦)، وهو صحيح، وصححه الألباني في الإرواء (٢٣١٧).

# دەروازەی شەشەم

# تازیر وئەدەب دان وتەمبیٚ کردن «التَّعْزِير»

چەند مەسەلەیەکی لە خۆ گرتوە:

## پرسی یەکەم: پێناسەی تەمبیٚ کردن، وحوکمەکەی، ودانایی تێیدا:

١- **پێناسەی تەمبیٚ**: «التعزير» لە زماندا: ڕێگریکردن وگەڕاندنەوەیە. وبە واتای سەرخستن لەگەڵ گەورەڕاگرتندا دێت، وەك لە فەرمایشتەکەی خوا ﷻ هاتوە: ﴿وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ﴾ [الفتح:٩] «بۆ ئەوەی بڕوا بە خوا وپەیامبەر بهێنن، وخوا سەر بخەن بە سەر خستنی دینەکەی وبە گەورەی ڕا بگرن، وتەسبیحاتی بکەن...»، واشی پیٚ وتراوە چونکە ڕێگری لە دەست درێژی کار دەکات زیان بگەیەنێت، هەروەها بە واتای سەر شۆڕکردن وسوکایەتیش دێت، ئەوترێت: «عَزَّرَه عَلَى ذَنْبٍ وَقَعَ مِنْه»، کەواتە لە دژ بە یەك (الأضداد)ـەکانە[1]. وەکو بنەڕەتیش بە واتای: ڕێگری کردن دێت. لە زاراوەشدا: تەمبێکردنە لە سەر هەر تاوانێك کە حەدد وکەفارەتی تێدا نیە.

٢- **حوکمی تەمبێکردن**: تەمبێکردن پێویستە لە هەمو تاوانێکدا کە حەدد وکەفارەتی نیە لە شەرعدا، لە کردنی حەرامێك، یان نەکردنی واجبێك ئەگەر پێشەوا پێی باش بو، لەبەر فەرمودەکەی ئەبو بوردەی کوڕی نیار کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «لَا يُجْلَدُ فَوْقَ عَشْرِ جَلَدَاتٍ إِلَّا فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللهِ» «سەروی دە قامچی لە هیچ کەسێك نادرێت مەگەر بۆ حەددێك بێت لە حەددەکانی خوا»[2].

---

(١) [ئەو وشانەیە، کە بە واتایەك وژەکەی دێت، وەك «بیع» بە کڕین وفرۆشتنیش دەوترێ]

(٢) متفق عليه: أخرجه البخاري (٦٨٤٨، ٦٨٤٩)، ومسلم (١٧٠٨).

هەروەها: «أَنَّه ﷺ حَبَسَ فِي تُهْمَةٍ» «پەیامبەری خوا ﷺ بە هۆی تۆمەتێکەوە کەسێکی بەند کرد»[1]. هەروەها عومەریش خەڵکی تەمبێ دەکرد وئەدەب دەدا بە نەفی کردن وسەر تاشین وجگە لە مانەش. تەمبێکردنیش دەگەڕێتەوە بۆ کار بە دەست یان جێگرەکەی، کە بەرژەوەندی لە کردنیدا بینی دەیکات، ولە نەکردنیشی بینی وازی لێ دەهێنێت.

**٣- دانایی لە بونی تەمبێکردن:** تەمبێکردن شەرع کراوە بۆ پاراستنی کۆمەڵگا لە ئاژاوە وخراپەکاری، ودور خستنەوەی ستەم، وڕێگری کردن لە سەرپێچی کاران وتەمبێ کردنیان.

## پرسی دووەم: ئەو جۆرانەی تاوان کە ئەبێتە مایەی تەمبێ لە سەرکردن:

ئەو تاوانانەی تەمبێکردن پێویست دەکەن دو جۆرن:

١- نەکردنی واجبەکان لەگەڵ توانینی جێبەجێکردنی، وەك قەرزدانەوە، وئەمانەت ومالی هەتیو دانەوە، ئەم شتانە وهاوشێوەکانی لە سەر بە جێ نەگەیاندنی تەمبێ دەکرێت تا دەیداتەوە، لەبەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ﵁، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ» «ماتەڵکردن لە لایەن داراوە ستەمە»[2]. لە ڕیوایەتێکی تردا: «لَيُّ الْوَاجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ» «دواخستنی دارا ناموس وسزادانی حەڵاڵ دەکات»[3].

---

(١) أخرجه الترمذي (١٤٥٠)، وأبو داود (٣٦٣٠) وحسنه الألباني «صحيح الترمذي» (١١٤٥).

(٢) أخرجه البخاري (٢٤٠٠)، ومسلم (١٥٦٤).

(٣) أخرجه أبو داود (٣٦٢٨)، والنسائي (٣١٦/٧)، وابن ماجه (٢٤٢٧)، وصححه غير واحد، وحسنه الألباني. انظر: «صحيح سنن النسائي» (٤٣٧٢، ٤٣٧٣). واللَّيُّ معناه: المطل.

٢- کردنی حەرامکراوەکان: وەك ئەوەی تەنها بکەوێت لەگەڵ ئافرەتێکی بێگانەدا یان بچێتە لای بە بێ جوت بون، یان ماچی بکات یان یاری لەگەڵ بکات، هەروەها وەك ئافرەت بچێتە لای ئافرەت، جا لەمانە وهاوشێوەکانیان دا تەمبێ کردن هەیە، ئەگەر سزایەکی دیاری کراوەی لە سەر نەهاتبو.

## پرسی سێیەم: ئەندازەی تەمبێ کردن:

شەرع ئەندازەیەکی دیاری کراوی دانەناوە بۆ سزادانی تەمبێ کردن، جا لەمەدا گەڕانەوە بۆ لای تێکۆشان وئەندازە گیری دادوەرە، بزان چی بە گونجاو دەزانێت بۆ کارەکە، تەنانەت هەندێك لە زانایان پێیان وایە: سزای تەمبێ کردن دەگاتە ڕادەی کوشتنیش ئەگەر بەرژەوەندی بیخوازێت، وەك کوشتنی موسڵمانی سیخوڕ، وپەرتەوازەکەری کۆمەڵی موسڵمانان، ئەوانی تریش کە خراپەیان تەنها بە کوشتن لا دەچێت.

## پرسی چوارەم: جۆری سزاکانی تەمبێکردن:

ئەو سزایانەی تەمبێی پێ دەکرێ، ئەکرێت بە گوێرەی پەیوەستیەکانی بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلێن بکرێت:

١- ئەوەی پەیوەستە بە جەستەوە، وەك قامچی وکوشتن.

٢- ئەوەی پەیوەستە بەماڵەوە، وەك لە ناو بردن وقەرەبوکردنەوە، بۆ نمونە: لە ناو بردنی بتەکان وشکاندنیان، ولە ناو بردنی ئامێرەکانی مۆسیقا وگۆرانی وقاپ وقاچاخی مەی خواردنەوە.

٣- ئەوەی لە هەردوکیان پێك هاتوە، وەك قامچی دان لە دز بە بێ ئەوەی لە شوێنێکی قایمی بردبێت لەگەڵ چەند قاتکردنەوەی قەرەبوەکەی سەری، چونکە بڕیاری پەیامبەر ﷺ لە بارەی، دزی کردنەوە لە بەر وبومی هەڵ واسراو بە

دارەکەیەوە پێش بردنی بۆ خەرمان وبێدەر (الجرين)= حەدد جێ بەجێ کردن ودو جار غەرامە کردنی بو[1]. «الجرين»یش بریتیە لە شوێنی وشکردنەوەی خورما.

٤- هەشیەتی پەیوەستە بە بەستنەوەی ویستەوە، وەك بەند کردن ودورخستنەوە.

٥- هەشیەتی پەیوەستە بە لایەنی مەعنەویەوە، وەك ئازاردانی بە سەرزەنشت کردنی وبە گژا چونەوەی.

(١) [انظر: «مستدرك الحاكم» (٨٢٤٣)، و«سنن النسائي» (٤٩٧٣، ٤٩٧٤)، و«سنن أبي داود» (٤٣٩٠)].

# دەروازەی حەوتەم

## لە بارەی حەددی جەردەیی وڕێگریەوە «الحِرَابَة»

چەند مەسەلەیەکی تێدایە:

### پرسی یەکەم: پێناسەی حیرابە، وحەددی بکەرەکانی:

١- **پێناسەی «الحِرَابة»**: لە زماندا وەرگیراوە لە: «حَرَبه» یانی: هەموماڵەکەی تالاّن کرد. لە شەرعیشدا: هەڵگرتنی چەکە لە سەر موسڵمانان -بێ هیچ دوژمنایەتیەکی پێش وەختە- بۆ بردنی ماڵیان، یان لە ناو بردنی خۆیان، یان ئەتکردنی ناموسیان، ئیتر لە شار بێت یان لە دەشت، لە لایەن کەسێکی تەکلیف لێ کراوەوە با ئەهلی زیمە یان هەڵگەڕاوەش بێت. هەروەها ڕێگریشی پێ دەوترێت.

٢- **حەددی جەردەیی وسزای جەردەکان**: بنەما لە بارەی جێبەجێکردنی حەدد لە سەر جەردە وڕێ بڕەکان وسزادانیان فەرمایشتەکەی پەروەردگارە ﷻ: ﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلَافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ﴾ [المائدة:٣٣] «سزای ئەوانەی دژایەتی خوا دەکەن وبە ئاشکرا دژی دەوەستنەوە، وحوکمەکانی خوا وپەیامبەر پێشێل دەکەن ولە سەر زەویدا خراپەکاری دەکەن بە کوشتنی خەڵك وتالاّن بردنی ماڵیان، سزاکەیان ئەوەیە: بکوژرێن، یا لە خاچ بدرێن لەگەڵ کوشتندا، یا دەستی ڕاستی لەگەڵ پێی چەپی ببڕدرێتەوە، ئەگەریش تەوبەی نەکرد دەستی چەپی وقاچی ڕاستی، یان دور دەخرێتەوە بۆ وڵاتێکی تر ولەوێدا بەند دەکرێت تا تەوبە دەکەن..».

حەددی جەردەکانیش دەگۆڕێ بە گوێرەی جۆراوجۆری ئەو تاوانانەی ئەنجامیان داوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

- ئەوانەیان دەکوژن ومالەکەش دەبەن: دەکوژرێن ولە خاچ دەدرێن تا بلاو ببێتەوە، دروستیش نیە چاوپۆشی لێ بکرێت بە کۆ دەنگی زانایان.

- ئەوانەیان دەکوژن بەلام مالەکە نابەن: دەکوژرێت، بەلام لە خاچ نادرێت.

- ئەوانەیان مالەکە دەبەن وناکوژن: لە یەك کاتدا دەستی ڕاست وقاچی چەپی دەبڕدرێت.

- ئەوانەیان تەنها خەلك دەتۆقێنن ورێگاکە ترساوی دەکەن وناکوژن ومال نابەن: لە زەوی دور دەخرێتەوە وشار بە دەر دەکرێت ودەر دەکرێت، ناهێلرێت لە هیچ شارێکدا ئۆقرە بگرێت.

ئەم وردەکاریەش لە بارەی سزادانیانەوە لە ﴿أَوْ﴾ی ئایەتەکەوە وەرگیراوە، لەوێ بۆ جۆرا وجۆریە لە سزادان، وڕیز بەندیە، نەك سەر پشك کردن، ئەمەش لە ئیبن عەبباسەوە رضي الله عنه گێردراوەتەوە[1].

## پرسی دوەم: مەرجەکانی پێویست بونی حەدد لە سەر جەردەکان:

بۆ جێبەجێ کردنی حەدد لە سەر جەردەکان ئەبێت چەند مەرجێك هەبێت، گرنگترینیان:

١- تەکلیف لێ کراو بێت: جا ئەبێت بالغ وعاقل بێت بۆ ئەوەی بە جەردە هەژمار بکرێت، وحەددی لە سەر جێبەجێ بکرێت، سا شێت ومندال بە جەردە هەژمار ناکرێن وحەددیشیان لێ نادرێت، وچونکە هیچ کامیان تەکلیف لێ کراو نین.

٢- بە ئاشکرا بیکەن، ومالەکە بە زۆر ببەن، جا ئەگەر بە شاراوەیی بیبەن ئەوە دزن، ئەگەریش بیرفێنن وڕا بکەن ئەوا ڕاوڕوت وتالانکاریە، ودەستیان نابڕدرێت.

---

(١) أخرجه الشافعي في «مسنده» (٢٨٢).

٣- بسەلمێت جەردەن، ئەمەش یان خۆیانی دان پێدا بنێن، یان دو شایەتی داد گەر شایەتی بدەن، وەك لە دزی دا هەیە.

٤- ئەبێت ئەو ماڵەی ئەبرێت لە شوێنێکی قایمدا بێت، وەك ئەوەی بە زۆر لە دەستی کابرای ببات، جا ئەگەر ماڵەکە وێڵ کرا بو، ولە دەستی کەسدا نەبو ئەوا بە بردنی نابێتە جەردە.

## پرسی سێیەم: کەوتنی حەدد لە سەر جەردەکان:

حەددی جەردە دەکەوێت ئەگەر جەردە تاوانبارەکە تەوبەی کرد پێش ئەوەی دادوەر دەسەڵاتی بشکێت بە سەریدا، وەك ئەوەی ڕا بکات، یان دیار نەمێنێت پاشان تەوبە بکات، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ [المائدة:٣٤] «بەلاّم هەر جەردەیەك پێش ئەوەی دەسەڵاتتان بشکێت بە سەریدا تەوبەی کرد ئەوا مافەکانی خوای لە سەر دەکەوێت، بشزانن ئەی باوەڕداران خوا لێخۆشبو وبە بەزەییە». جا کامەی مافی واجبی خوا بێت، دەکەوێت؛ وەك دور خستنەوە، ودەست وقاچ بڕین، وحەتمیەتی کوشتنی، بەلاّم مافی مرۆڤەکان ناکەوێت وەك نەفس وپەل وماڵ، چونکە مافێکی ئادەمیزادەکانە وکەوتۆتە سەری وەك قەرز، مەگەر خاوەن مافەکە لێی ببورێت.

بەلاّم دوای دەسەڵات بە سەر شکان وبەرزکردنەوەی بۆ لای کار بە دەست تەوبەی کرد، ئەوا حەددی لە سەر ناکەوێت، با ڕاستگۆش بێت لە تەوبەکردنەکەی.

# دەروازەی هەشتەم

## لە بارەی هەڵگەڕانەوەوە «الرِّدَّة»

چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:

**پرسی یەکەم: پێناسەی هەڵگەڕاوە، ومەرجەکانی، وحوکمەکەی:**

**١- پێناسەی «الرِّدَّة»:**

لە زماندا: گەڕانەوەیە لە شت، لەمەش: هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام. لە زاراوەشدا: کوفر کردنە دوای موسڵمان بون، بە ویستی خۆی، لە ڕێگەی زمان یان بیر وباوەڕ، یان گومان یان کردەوەوە.

**٢- مەرجەکانی:**

مەرجەکانی بریتیە لە: ژیری وجیاکاری سەر پشکی. جا حوکمی هەڵگەڕانەوە نادرێت بە سەر شێت یان منداڵێکی ناجیاکار، یان زۆر لێکراودا ئەگەر لێیان وەشایەوە.

**٣- حوکمی هەڵگەڕاوە:** حوکمی لە دونیادا: بریتیە لە کوشتن، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «مَنْ بَدَّل دِينَه فَاقْتُلوه» «کێ دینی خۆی گۆڕی بیکوژن»[١].

وئەبێت پێش کوشتن داوای تەوبەی لێ بکرێت، وبانگ بکرێت بۆ ئیسلام، وبەری لێ تەسك بکرێتەوە وبەند بکرێت بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، جا ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە باشە وەگەرنا دەکوژرێتەوە، بە بەڵگەی فەرمودەی ئەو جولەکەیەی موسڵمان بو

---

(١) أخرجه البخاري (٦٥٢٤).

پاشان هەڵگەڕایەوە، موعاز بە ئەبو موسای وت: لە سەر ئاژەڵەکە دانابەزم تا نەکوژرێت، ئەوەبو کوژرا[1]. لە ڕیوایەتێکی تردا[2]: «پێشتریش داوای تەوبەی لێکرا بو». هەروەها لەبەر وتەکەی عومەر کە پێی دەگات پیاوێك دوای موسڵمان بونی بێ باوەڕ بوە بۆیە کوژراوە پێش ئەوەی داوای تەوبەی لێ بکرێت، وتی: «ئەی بۆ سێ ڕۆژ بەندتان نەکرد، هەر ڕۆژ ونانێکتان پێ بدایە، وداوای تەوبەتان لێ بکردایە بەشکو تەوبەی بکردایە یان بە دوا ڕۆژی خۆیدا پێداچونەوەیەکی بکردایە، خوایە ئامادە نەبوم، وڕازیش نەبوم کە پێیان وتم»[3].

ئەوەشی کە هەڵدەستێت بە کوشتنی، پێشەوا یان جێ نشینەکەیەتی، چونکە مافی خوایە بۆیە دەدرێتە کار بە دەست، ومنداڵی جیاکار ناکوژرێت -با بشوترێت هەڵ گەڕانەوەکەی دروست ئەبێت- هەتا باڵغ دەبێت.

سەبارەت حوکمیشی لە دوا ڕۆژدا: خوا ﷻ ئەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَرْتَدِدْ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ [البقرة: ٢١٧] «بێ باوەڕان سورن لە سەر هەڵگەڕانەوەتان... جا هەر کامتان -ئەی موسڵمانان- گوێڕایەڵیان بکات وهەڵبگەڕێتەوە ولە سەریشی بمرێت، ئەوا کردەوەکانی لە دونیا ودوا ڕۆژدا پوچ دەبێتەوە، وئەبێتە پەیوەستی ئاگری دۆزەخ وهەرگیز تێیدا ناهێنرێتە دەرەوە».

---

(١) أخرجه أبو داود (٤٣٥٥). وقوّاه الحافظ ابن حجر «الفتح» (٢٨٧/١٢).
(٢) بەڵکو هەر هەمان ڕیوایەتەکەی ئەبو داودی پێشترە، تێیدا هاتوە ئەڵێ: «قَال أَحدُهما» واتە: «یەکێکیان وتی»، مەبەستیشی تەڵحەی کوڕی یەحیا وبوڕدەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەبو بوڕدەیە، کە هەواڵخوانی فەرمودەکەن. وەرگێڕ.
(٣) أخرجه مالك (٢/ ٧٣٧) (١٦).

## پرسی دوەم: ئەو شتانەی پێی هەڵ دەگەڕێتەوە:

هەڵگەڕانەوە بەدی دێت بە کردنی هەر شتێك ببێتە مایەی هەڵگەڕانەوە، ئیتر شتی جددی یان گاڵتە یان ڕابواردن بێت، وەك شیرك دانان بۆ خوا بە هەمو جۆرەکانیەوە، ونکوڵی کردن لە نوێژ وپایەکانی تری ئیسلامیش، هەروەها جوێن دان بە خوا وپەیامبەر ﷺ، ونکوڵی کردن لە قورئان یان هەندێکی، یان کەسێك پێی وابێت هەندێك کەس دەتوانن لە شەریعەتی موحەممەد ﷺ بڕۆنە دەرەوە وەك سۆفیە زیادەڕۆکان، هەروەها کەسێك پشتگیری هاوبەشدانەران بکات ویارمەتیان بدات، وەك خۆشویستتنی دینی بێ باوەڕان یان وەك سەرخستنیان بە سەر موسڵمانانداا، وجگە لەمانەش لە جۆرەکانی هەڵ گەڕانەوە کە بە دی دێت بە کردنی هەڵ وەشێنەرەوەیەك لە هەڵ وەشێنەرەوە زۆرەکانی ئیسلام. لەوانەش: حوکم کردن بە یاسا دەستکردەکان کە وا بزانێت باشترە لە شەریعەتی ئیسلام یان یەکسانە بەو.

کەواش بێت دەکرێت ئەو شتانەی هەڵگەڕانەوەی پێ بە دی دێت لە مانەی خوارەوە کورت هەڵبهێنین:

١- **قسە:** وەك جوێندان بە خوا ﷻ یان پەیامبەر ﷺ یان فریشتەکان، یان بانگەشەی پەیامبەرایەتی یان زانینی غەیب بکات، هەروەها شیرك دانان بۆ خوا.

٢- **کردەوە:** وەك سوژە بردن بۆ بت وگۆڕ وهاو شێوەکانی، یان قورئان بخرێتە زبڵ دانەوە، یان بە ئەنقەست سوکایەتی پێ بکات، یان پشتگیری ویارمەتی هاوبەش دانەران بکات لە دژ موسڵمانان وەك حەزێك لە دینی بێ باوەڕان، وهتد.

٣- **بیر وباوەڕ:** وەك باوەڕ بە بونی هاوبەش یان هاوسەر یان منداڵ بۆ خوا، یان بڕوا بون بە حەڵاڵێتی داوێن پیسی یان مەی، یان بڕوا بون بەوەی ڕێبازی غەیرە پەیامبەر ﷺ باشترە لە ڕێبازی ئەم [یا وەکو ئەمە وەك باس کرا].

٤- **گومان:** وەك گومان بون لە حەرامێتی شتێك كۆ دەنگی هەبێت بۆ حەلاڵ بونی، یان حەلاڵ بونی ئەوەی كۆ دەنگی هەیە بۆ حەرام بونی، وهاوشێوەی ئەو كەسەش لای شاراوە نابێت چونكە لە نێوان موسڵمانان گەورە بوە.

## پرسی سێیەم: ئەو حوكمانەی پەیوەستن بە هەڵگەڕانەوەوە:

١- زۆر لێ كراو لە سەر وتنی قسەیەك ببێتە مایەی هەڵگەڕانەوەی، ئەوە حوكم نادرێت بە هەڵگەڕانەوەی، لەبەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ﴾ [النحل: ١٠٦] «مەگەر كەسێك ناچار كرابێت بە دەمی كوفر بە خوا بكات وهەڵ بگەڕێتەوە دوای باوەڕ هێنانی، ئەمەشی كردوە لە ترسی تیا چون».

٢- هەڵگەڕاوە سێ ڕۆژ داوای تەوبەی لێ دەكرێت، تەوبەی كرد باشە، ئەگەرنا دەكوژرێت، كوشتنیشی لای پێشەوا یان جێ نشینەكەیەتی وەك باس كرا.

٣- هەڵگەڕاوە ڕێگری لێ دەكرێت هەڵس وكەوت بە ماڵەكەیەوە بكات، كە موسڵمان بو ئەوسا ڕێگەی هەڵس وكەوت كردنی پێ دەدرێت. ئەگەریش لە سەر هەڵ گەڕانەوەكەی بمرێت یان بە هەڵ گەڕاوەیی بكوژرێت، ئەوا ماڵەكەی دەستكەوتە بۆ خزێنەی دەوڵەت، لەبەر ئەوەی میراتگری نیە، چونكە موسڵمان میرات لە ناموسڵمان نابات، وهیچ ناموسڵمانێكیش میراتی لێ نابات، چونكە ئیقرار ناكرێت لە سەر هەڵ گەڕانەوەكەی.

٤- هەڵگەڕاوە نە دەشۆردرێت نە نوێژی لە سەر دەكرێت نە لەگەڵ موسڵمانان دەنێژرێت ئەگەر لە سەر هەڵگەڕانەوەكەی بكوژرێت؟

٥- تەوبەکردنی هەڵگەڕاوە بە دی دێت، بە هێنانی شایەتومان، لەبەر گشتێتی فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ[١]: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، فَإِذَا قَالُوهَا عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلَّا بِحَقِّهَا» «فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵکدا تا دەڵێن: «لا إله إلا الله»، کە وتیان، ئیتر خوێن وماڵیان لە من پارێزراو دەبێت مەگەر بە مافی ئەو ڕستەیە». هەر کەسێکیش هەڵگەڕانەوەکەی بە هۆی نکوڵی کردن بێت لە پرسێکی دینی ئەوا، تەوبەکەی ئەوەیە: لەگەڵ شایەتومانەکەی دا دان بنێت بەوەی نکوڵی لێکردوە وپەشیمان ببێتەوە لەوەی کوفری پێکردوە.

(١) أخرجه البخاري (٢٥)، ومسلم (٢١).

# دوانزەهەم: بەشی سوێندەکان ونەزرەکان

لە دو دەروازە پێك هاتوە:

دەروازەی یەکـــەم: سوێندەکان.

دەروازەی دوەم: نەزرەکان.

# دەروازەی یەکەم

## سوێندەکان «الأَیْمَان»

**چەند پرسێکی لە خۆ گرتوە:**

**پرسی یەکەم: لە بارەی پێناسەی سوێندەوە:**

**پێناسەکەی: «الأَیْمان»**: لە زماندا کۆی «یَمِین»ـە، کە سوێند وقەسەمە، واشی پێ وتراوە چونکە کاتێك سوێندیان خواردوە هەر یەکەیان دەستە ڕاستی دەخستە ناو دەستە ڕاستی هاوڕێکەی[1]. لە شەرعیشدا: تەئکیدکردنەوەی شتێکی سوێند لە سەر خوراوە بە ناو هێنانی خوا یان سیفەتێك لە سیفەتەکانی.

**پرسی دوەم: جۆرەکانی سوێند:**

سوێند لە ڕوانگەی دامەزراندنی ودانەمەزراندنیەوە ئەبێتە سێ بەشەوە:

١- **سوێندی حساب بۆ نەکراو (اللغو)**: ئەمەش سوێندێکە بێ ئەوەی مەبەستی سوێند بێت، وەك ئەوەی بڵێت: نە بە خوا، ئا بە خوا، مەبەستیشی سوێند نیە، ئەمە بە لەغو دادەنرێت، یان سوێند بخوات لە سەر شتێك وا بزانێت وایە ودەردەکەوێت وا نیە، ئەمەش لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ [وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا عَقَّدْتُمُ الْأَيْمَانَ]﴾ [المائدة:٨٩] «**خوا لێتان ناگرێت وسزاتان نادات بە هۆی ئەو سوێندانەی دەیخۆن بە بێ مەبەست، بەڵام لە سەر ئەو وسوێندانە سزاتان دەدات کە بە دڵ مەبەستتانە**». عائیشە ﵂ ئەڵێ: ئەم ئایەتە ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ﴾ سەبارەت بەم قسەیە دابەزی: نا بە

(١) [انظر: الصحاح للجوهري، «یمین»].

خوا، وئا بە خوا، نەخێر بە خوا. ئەم سوێندەش نە کەفارەت ونە لێگرتنی تێدا نیە، ونە تاوانباریش دەبێت(١).

٢- **سوێندی دامەزراو:** ئەو سوێندەیە سوێند خۆرەکە مەبەستێتی وسورە لە سەری، وبۆ کارێکی ئایندەیی دەیخوات، وبۆ شتێك ئەبێت بکرێت، ئا ئەمە سوێندی دامەزراو ومەبەست دار، هەر کەوتیش (الْحِنْث)(٢) کەفارەتی تێدا پێویستە، لەبەر فەرمایشتەکەی [پێشوی] خوا ﷻ: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا عَقَّدْتُمُ الأَيْمَانَ﴾ [المائدة: ٨٩].

٣- **سوێندی نقوم کەر** (الغَمُوس): ئەو سوێندی درۆیەیە کە مافی پێ دەخوات، یا مەبەست لێی غەشکردن وفێڵکردن وخیانەتکردنە، جا خاوەنەکەی سوێند لە سەر شتێك دەخوات ئەشزانێت درۆ دەکات، ئەم سوێندەش تاوانێکە لە تاوانە گەورەکان، وئەم سوێندەش دانامەزرێت وکەفارەتیشی تێدا نیە، چونکە لەوە گەورەترە کەفارەت بیسرێتەوە، ولەبەر ئەوەی دانەمەزراوە، جا کەفارەت واجب ناکات وەك لەغو. بەڵام تەوبە لێ کردن وماف گێڕانەوە بۆ خاوەنەکانی واجبە ئەگەر زایەکردنی مافی لە خۆ گرتبو، پێشی وتراوە نوقمکەر، چونکە خاوەنەکەی نوقمی تاوان دەکات، پاشان نوقمی ئاگری دۆزەخ پەنا بەخوا، بەڵگەی حەرامیەکەشی فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿وَلَا تَتَّخِذُوا أَيْمَانَكُمْ دَخَلًا بَيْنَكُمْ فَتَزِلَّ قَدَمٌ بَعْدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُوا السُّوءَ بِمَا صَدَدْتُمْ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَلَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ [النحل:٩٤] «وسوێندەکانتان بە کار مەهێنن بۆ فێڵ کردن لەو کەسانەی سوێندیان بۆ دەخۆن، ئەوسا بەو هۆیەوە لە ناو

---

(١) أخرجه البخاري (٤٦١٣).

(٢) بریتیە لە وەفا نەکردن بەوەی سوێندەکە دەیخوازێت.

دەچن دوای ئەوەی لە ئەماندا بون، وەك کەسێك پێی بخلیسکێت دوای جێگیر بونی، وسزای خراپ دەچەژن لە دونیادا بە هۆی ئەوەی بونەتە بەر بەستی بەردەم خەڵکی تر لە هاتنە ناو دینەوە بە هۆی بینینی غەدر وخیانەت لە ئێوە، ولە دوا ڕۆژیشدا سزای بە ئێشتان بۆ هەیە». ولەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر ﵄، ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «الْكَبَائِرُ: الْإِشْرَاكُ بِاللهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَالْيَمِينُ الْغَمُوسُ» «تاوانە گەورەکان ئەمانەیە: هاوبەش دانان بۆ خوا، وئازار دانی دایك وباوك، وکوشتنی نەفس، وسوێندی نوقم کەر»[1]. هەروەها فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ﵁، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «خَمْسٌ لَيْسَ لَهُنَّ كَفَّارَةٌ: الشِّرْكُ بِاللهِ ﷻ، وَقَتْلُ النَّفْسِ بِغَيْرِ حَقٍّ، أَوْ بَهْتُ مُؤْمِنٍ، أَوِ الْفِرَارُ يَوْمَ الزَّحْفِ، أَوْ يَمِينٌ صَابِرَةٌ[2] يَقْتَطِعُ بِهَا مَالًا بِغَيْرِ حَقٍّ» «پێنج شت کەفارەتیان نیە: هاوبەش دانان بۆ خوا ﷻ، وکوشتنی کەسێك بە ناهەق، یان بوهتان کردن بۆ باوەڕدار، یان ڕاکردن لە ڕۆژی ڕوبەڕوبونەوەدا، یان سوێندێکی بەندکەر کە ماڵێکی بە ناهەق پێ زەوت دەکات»[3].

## پرسی سێیەم: کەفارەتی سوێند ومەرجەکانی واجب بونی:

١- **کەفارەتی سوێند:** خوای مەزن کەفارەتی سوێندی داناوە بۆ بەندەکانی، کە ئەبێتە مایەی حەڵاڵ بونی سوێندەکە ولێ دەرچونی، ئەمەش وەك میهرەبانیەك بە بەندەکانی، خوا ﷻ ئەفەرموێت: ﴿قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ﴾ [التحريم:٢]

---

(١) رواه الجخاري (٦٢٩٨).

(٢) ئەمەش سوێندی نوقمکەرە، پێشی وتراوە «صابرة» لە «صبر»ەوە وەرگیراوە، کە بەندکردن وپەیوەستبونە، چونکە خاوەنەکەی بە هۆیەوە پەیوەست وبەند دەکرێت، هەروەها لە ڕوانگەی حوکمەکەشیەوە پەیوەستە.

(٣) أخرجه أحمد [(١٤/ ٣٥١) (٨٧٣٧) الرسالة، وانظر التعليق عليه]، وحسّنه الألباني «الإرواء» (٢٥٦٤).

«بێگومان -ئەی باوەڕداران- خوا حەڵاڵکردنی سوێندەکانتانی بۆ داناون ئەویش بە کەفارەتدانی». وپەیامبەریش ﷺ ئەفەرموێ: «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ؛ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا، فَلْيَأْتِهَا وَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ» «کێ سوێندی لە سەر شتێك خوارد، دوایی بینی جگە لەو شتە باشترە سوێندی لە سەر خواردوە، ئەوا با بیکات وکەفارەتی سوێندەکەی بدات»[1]. ئەم کەفارەتەش لە سەر کەسەکە واجب دەبێت ئەگەر سوێندەکەی شکاند وەفای نەکرد بەوەی سوێندەکە ئەیخوازێت.

کەفارەتی سوێندیش سەر پشکی وڕیزبەندیشی تێدایە؛ جا ئەو کەسەی کەفارەتی لە سەرە سەر پشك دەکرێت لە نێوان: ناندانی دە هەژار بۆ هەر هەژارێك نیو مەن خواردن، یان دابینکردنی کەلوپەلی دە هەژار بۆ هەر یەکێکیان بەرگێکی بۆ دەکات نوێژی لە سەر بخات[2]، یان ئازادکردنی کۆیلەیەکی باوەڕداری بێ عەیب، کێش هیچی لەم سیانە دەست نەکەوت سێ ڕۆژ بە ڕۆژو دەبێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا عَقَّدْتُمُ الْأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ﴾ [المائدة:٨٩] «خوا لێتان ناگرێت وسزاتان نادات بە هۆی ئەو سوێندانەی دەیخۆن بە بێ مەبەست، بەڵام لە سەر ئەو وسوێندانە سزاتان دەدات کە بە دڵ مەبەستتانە، جا ئەگەر وەفاتان نەکرد بە سوێندەکەوە، ئەوا خوای گەورە تاوانەکەیتان بۆ دەسڕێتەوە بە ناندانی دە هەژار، بۆ هەر هەژارێك نیو مەن لە خواردنی مامناوەندی خەڵکی شارەکە، یا کەلوپەل بۆ

(١) أخرجه البخاري (٦٧٢٢) ومسلم (١٦٥٠) واللفظ له.

(٢) یانی: ئەگەر بەو کەل وپەلەوە نوێژ بکات، ئەوەندەی دا بپۆشێت نوێژەکەی لە سەر بکەوێت. وەرگێڕ

دابین کردنیان، یان ئازادکردنی کۆیلەیەك، جا سەر پشکە لە نێوان ئەمانەدا، هیچ کام لەمانەشی پێ نەکرا ئەوا لە سەریەتی سێ ڕۆژ بە ڕۆژو بێت». جا کەفارەتی سوێند هەم سەر پشکی تێدایە هەم ڕیزبەندی؛ سەر پشکی لە نێوان خواردندان وجلو بەرگ وئازادکردن. وڕیزبەندیش لە نێوان ئەم سیانە ونێوان ڕۆژو.

**٢- مەرجەکانی واجب بونی کەفارەتی سوێند:** ئەگەر سوێند شکێنرا وەفا نەکرا بەوەی ئەیخوازێت کەفارەتەکەی واجب نابێت مەگەر بە سێ مەرج، کە بریتیە لە:

**مەرجی یەکەم:** ئەبێت سوێندەکە دابمەزرێت، وەك ئەوەی مەبەستی گرێدانی سوێندەکە بێت بۆ شتێکی ئایندە وەك پێشتر باس کرا، سوێندیش دانامەزرێت مەگەر بە خوا یان ناوێك لە ناوەکانی یان سیفەتێك لە سیفەتەکانی بخورێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا عَقَّدْتُمُ الْأَيْمَانَ﴾ [المائدة: ٨٩] ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کەفارەت واجب نابێت مەگەر سوێندی دامەزراو، بەڵام سوێند بێت بە سەر زمانیدا بە بێ مەبەست، ئەوە سوێندەکەی دانامەزرێت، وکەفارەتیشی لە سەر نیە.

**مەرجی دوەم:** بە ویستی خۆی سوێند بخوات، جا هەر کەس بە زۆر سوێند بخوات سوێندەکەی دانامەزرێت وکەفارەتیشی تێدا نیە، لەبەر فەرمایشتەکەی [پێشتری] پەیامبەری خوا ﷺ: «هەڵە ولە بیر چونەوە وزۆر لێ کردن لە سەر ئوممەتەکەم هەڵ گیراوە».

**مەرجی سێیەم:** سوێندەکەی بشکێنێت، بەوەی ئەوە بکات کە سوێندی خواردوە نەیکات، یان ئەوە نەکات کە سوێندی خواردوە بیکات، سوێندەکەشی لە بیر بێت،

بە ویستی خۆشی بیکات، بەڵام ئەگەر شکاندی بە لە بیر چونەوە یان زۆر لیّ کران، ئەوە کەفارەتی لە سەر نیە لەبەر فەرمودەی پێشو.

• «إن شاء الله= خوا ویستی لیّ بێت»[1] کردن لە سوێندا:

هەر کەس لە سوێند خواردنەکەیدا وتی: «إِنْ شاء الله» ئەوە ئەگەر سوێندەکەی بشکێنێت کەفارەتی لە سەر نیە، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «مَنْ حَلَفَ فَقَالَ: إِنْ شَاءَ اللهُ لَمْ يَحْنَثْ» «هەر کەس لە سوێندەکەیدا بڵێت: خوا ویستی لیّ بێت، سوێندەکەی نەشکاوە»[2].

• شکاندنی سوێند ووەفانەکردن بەوەی ئەیخوازێت:

بنەما ئەوەیە کەسەکە وەفا بکات بە سوێندەکەیەوە، بەڵام جاری وا هەیە بە هۆی بەرژەوەندیەك یان زەرورەتێك دەیشکێنێت، جا کەفارەتی بۆ دانراوە وەك باس کرا. ئەشکریّ سوێند شکاندن بە گوێرەی سوێند لە سەر خوراو بەم شێوازەی خوارەوە دابەش بکرێت:

١- سوێند شکاندنەکە واجب بێت: ئەمەش ئەگەر سوێند بخوات لە سەر نەکردنی واجبێك، وەك ئەوەی سوێند بخوات سەردانی خزمە نزیکەکانی نەکات، یان سوێند بخوات لە سەر کردنی حەرامێك، وەك ئەوەی سوێند بخوات مەی بخواتەوە، لێرەدا واجبە سوێندەکەی بشکێنێت، وکەفارەتیشی دەکەوێتە سەر، چونکە سوێندە لە سەر تاوان کردن.

(١) [بەڵام ئەگەر سوێندی خوار ووتی: خوا حەز بکا، دوا جار سوێندەکەی شکاند، ئەوە کەفارەتی لە سەرە].
(٢) أخرجه الترمذي (١٥٣٢)، وأحمد (٣٠٩/٢). وصححه الألباني «صحيح الترمذي» (١٢٣٧).

٢- سوێند شکاندنەکە حەرام بێت: وەك ئەوەی سوێند بخوات لە سەر کردنی واجبێك، یان نەکردنی حەرامێك، ئەوا واجبە لە سەری وەفای پێوە بکات، وحەرامە لە سەری سوێندەکەی بشکێنێت، چونکە سوێندەکەی لەم حاڵەتەدا تەئکید کردنەوەیە لە سەر ئەوەی خوا تەکلیفی کردوە لە بەندەکان.

٣- سوێند شکاندنەکە حەلاڵ بێت: ئەمەش ئەگەر سوێندی خوارد لە سەر کردن یان نەکردنی حەلاڵێك.

## پرسی چوارەم: شێوەی چەند سوێندێکی دروست وقەدەغەکراو:

سوێند خواردنی دروست ئەو سوێندەیە بە ناوی خوا یان سیفەتێك لە سیفەتەکانی دەیخوات، وەك ئەوەی بڵێت: ئەمەش سوێند بە خوا، یان: بە وەجهی خوا، یان: بە عەزەمەت (گەورەی) ومەزنیی خوا...، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر ﷺ، کە پەیامبەری خوا ﷺ گەیشتۆتە عومەر تەماشا دەکات لەگەڵ کاروانێکدا بە ڕێوەیە وسوێند بە باوکی دەخوات، پەیامبەر ﷺ فەرموی: «أَلَا إِنَّ اللهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللهِ، أَوْ لِيَصْمُتْ» «ئاگادار بن! خوا ڕێگریتان لێ دەکات سوێند بە باوکانتان بخۆن، کێ لە ئێوە سوێندی خوارد با سوێند بە خوا بخوات، یان با بێ دەنگ بێت»[1]. هەروەها لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر ﷺ: «كَانَتْ يَمِينُ النَّبِيِّ ﷺ: لَا، وَمُقَلِّبِ الْقُلُوبِ» «سوێندی پەیامبەر ﷺ ئەمە بو: نەخێر، بە هەڵگێڕەوەی دڵەکان»[2]. هەروەها ئەگەر وتی: سوێند بە خوا دەخۆم ئەبێت ئەو کارە بکەم، ئەگەر نیەتی سوێند بێت سوێندە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا

(١) أخرجه البخاري (٦٢٧٠)، ومسلم (١٦٤٦).
(٢) أخرجه البخاري (٦٦٢٨).

ﷺ: ﴿وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ﴾ [النحل: ٣٨] «وئەو هاوبەشدانەرانە سوێند بە خوا دەخۆن بە سوێندی قورس وتەئکید لە سەر کراو».

**وله سوێندە قەدەغەکراوەکانیش:**

١- سوێند خواردن بە جگە لە خوا ﷻ، وەك ئەوەی بڵێ: بە گیان تۆ، بە ئەمانەت قەسەم...، لەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] ئیبن عومەر ﵄ کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «هەر کەس سوێند دەخوات با سوێند بە خوا بخوات یان با بێ دەنگ بێت».

٢- سوێند بخوات کە ئەو جولەکە یان گاورە، یان ئەو بەریە لە خوا یان لە پەیامبەری خوا ﷺ ئەگەر فلان کار بکات، لەبەر فەرمودەکەی بورەیدە لە باوکیەوە کە پەیامبەری خوا فەرمویەتی: «مَنْ حَلَفَ فَقَالَ: إِنِّي بَرِيءٌ مِنَ الْإِسْلَامِ، فَإِنْ كَانَ كَاذِبًا فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَإِنْ كَانَ صَادِقًا فَلَنْ يَرْجِعَ إِلَى الْإِسْلَامِ سَالِمًا» «هەر کەس سوێندی خوارد وتی: من بەریم لە ئیسلام ئەگەر ئاوها وئاوها نەکەم یان بکەم، جا ئەگەر درۆ بکات لە سوێندەکەیدا ئەوە بەو شێوازەیە وتویەتی، ئەگەریش ڕاستگۆ بێت، ئەوا بە سەلامەتی ناگەڕێتەوە بۆ ئیسلامەتی»[1].

٣- سوێند خواردن بە باوکان [وماموان وخاڵوان وشەهیدان] وبە تاغوتەکان [...وهتد]، لەبەر فەرمودەکەی عەبدولڕەحمانی کوڕی سەمورە ﵁، ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «لَا تَحْلِفُوا بِالطَّوَاغِي وَلَا بِآبَائِكُمْ» «نە سوێند بە تاغوت ونە سوێند بە باوکانتان مەخۆن»[2].

---

(١) أخرجه أبو داود (٣٢٥٨)، والنسائي (٦/٧)، وصححه الألباني «صحيح سنن النسائي» (٣٥٣٢).
(٢) أخرجه مسلم (١٦٤٨).

# دەروازەی دوەم

# نەزرەکان «النُّذور»

چەند مەسەلەیەکی لە خۆ گرتوە:

**مەسەلەی یەکەم: پێناسەی نەزر، وشەرعی بونی، وحوکمەکەی:**

١- **پێناسەی** «النَّذْر»: لە زماندا پێویستکردنە، ئەڵێی: ئەوەم نەزر کردوە، ئەگەر واجبت کرد لە سەر خۆت. لە شەرعیشدا: پێویستکردنی شتێکە لە سەر خۆ لەبەر خوا ﷻ، لە لایەن تەکلیف لێکراوێکی سەر پشکەوە.

٢- **شەرعی بونی نەزر وحوکمەکەی:** نەزر شەرعیە بە قورئان وسوننەت وکۆ دەنگی زانایان، وەك دواجار بەڵگەکان لەو بارەوە باس دەکرێت. سەبارەت بە حوکمی نەزر کردن هەر لە سەرەتاوە، کەڕاهەتی هەیە وسوننەت نیە، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر رضي الله عنهما، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «إِنَّهُ لَا يَرُدُّ شَيْئًا، إِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الشَّحِيحِ» «نەزر هیچ ڕەد ناکاتەوە، بەڵکو تەنها بە هۆیەوە لە ڕەزیل وچروکەوە شتێك دەر دەهێنرێت»[1]. هەروەها لەبەر ئەوەی نەزر کەر خۆی پابەند دەکات بە شتێکەوە لە بنچینەدا لە شەرعدا واجب نیە، جا خۆی توشی تەنگی وئیحراجی وقورسی دەکات، ولەبەر ئەوەی موسڵمان داوای لێ کراوە خێر بکات بە بێ نەزر کردن. بەڵام ئەوەندە هەیە ئەگەر نەزری کردنی کارێکی چاکی کرد ئەوا پێویستە لە سەری وەفای پێوە بکات، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَمَا أَنْفَقْتُمْ مِنْ نَفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُمْ مِنْ نَذْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُهُ﴾ [البقرة:٢٧٠] «وهەر ماڵێك یان جگە

---

(١) أخرجه البخاري (٦٦٩٢)، ومسلم (١٦٣٩)، واللفظ له.

لەوەش ببەخشنەوە زۆر بێت یان كەم، دەیكەنە خێر بە مەبەستی بە دەستهێنانی ڕەزامەندی خوا، یان نەزرێك دەكەن وشتێك لە سەر خۆتان پێویست دەكەن، ئەوا خوا هەموی دەزانێت وئاگای لێیەتی، ونیەتتان دەزانێت ولە سەریشی پاداشتان دەداتەوە))، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا﴾ [الإنسان:٧] ((ئەو بەندانەی خوا لە دونیادا وەفایان دەكرد بە نەزرەوە، ولە سزای خوا لە ڕۆژی دواییدا دەترسان كە زیانی زۆر ومەترسیناكە))، ولەبەر فەرمودەكەی عائیشە ﵂، كە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: ((مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَهُ فَلَا يَعْصِهِ)) ((كێ نەزری كرد گوێ ڕایەڵی خوا بكات، با گوێڕایەڵی بكات، كێش نەزری كرد سەرپێچی بكات با سەرپێچی نەكات))[1]. هەروەها خوا ﷻ مەدح وستایشی ئەوانەی كردوە كە وەفا دەكەن بە نەزرەكانیانەوە، پەیامبەریش ﷺ هەروەها فەرمانی بە بردنە سەری كردوە، ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی نەهی پێشتری پەیامبەر ﷺ بۆ كەراهەت بوە نەك بۆ حەرامێتی، وحەرامەكەی ومەكرِوهەكەی ئەو كاتەیە لە سەرەتا ودەست پێكردن بێت، بەڵام بردنە سەری وبە جێ گەیاندنی بۆ كەسێك كەوتۆتە سەری واجبە وگوێڕایەڵی خوایە. نەزریش جۆرێكە لە جۆرەكانی پەرستن دروست نیە بۆ جگە لە خوا بكرێت، جا هەر كەس نەزری كرد بۆ گۆڕ یان وەلی وهاوشێوەكانی، ئەوە هاوبەشی گەورەی داناوە بۆ خوا ﷻ پەنا بەخوا.

## پرسی دوەم: مەرج ولەفزەكانی نەزر:

١- **مەرجەكانی نەزر:** نەزر دروست نابێت مەگەر لە كەسێكی باڵغی عاقڵی سەر پشكەوە، جا نەزری منداڵ وشێت وتێك چو وزۆر لێكراو دروست نابێت، لەبەر

(١) أخرجه البخاري (٦٦٩٦).

فەرمودەکەی پەیامبەری خوا ﷺ: «قەڵەم هەڵگیراوە لە سەر سیان:...». هەروەها لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەری خوا ﷺ: «خوا ﷻ لە هەڵە و...ی ئوممەتەکەم خۆشبوە»، پێشتریش چەندین جار باس کرا.

٢- **لەفزەکانی نەزر:** (صِيْغَة) ولەفزەکانی نەزر ئەوەیە بڵێت: لە سەرم بێت ئەبێت ئەوە بۆ خوا بکەم، یان: ئەوە نەزر بێت لە سەرم، وهاو شێوەی ئەم لەفزانەی کە بە ڕاشکاوانە باسی نەزر دەکات.

## پرسی سێیەم: بەشەکانی نەزر:

**١- نەزری دروست بو، ونەزری نادروست بو:**

نەزر بە گوێرەی دروست بونی ودروست نەبونی دابەش ئەبێت بۆ: صەحیح وناصەحیح، یان: دروست ونادروست، یان: دامەزراو دانەمەزراو.

جا نەزر صەحیح ودامەزراو ئەبێت وبردنە سەری واجب دەبێت: ئەگەر نەزری گوێ ڕایەڵی ونزیك بونەوە بو، نەزر کەرەکە پێی نزیك دەبوە لە خوا.

ونا صەحیح ودانەمەزراو ئەبێت وبردنە سەری واجب نابێت: ئەگەر نەزری سەرپێچی بێت، وەك نەزرکردن بۆ گۆڕ وەلیەکان یان پەیامبەران، یان نەزر بکات کەسێك بکوژێت، یان مەی بخواتەوە، وهاوشێوەی ئەم تاوانانە، ئەوا ئەو نەزرە دانامەزرێت وحەرامە ببرێتە سەر.

**٢- نەزری ڕەها وپەیوەست کراو.**

أ- **نەزری ڕەها:** ئەوەیە کە کەسەکە هەر لە سەرەتاوە لە سەر خۆی پێویستی دەکات، بێ ئەوەی ببیەستێتەوە بە مەرجێکەوە، ئەشکرێ وەکو شوکرانەبژێری بکرێت لە سەر نیعمەتێك یان بە بێ هۆکار، وەك ئەوەی بڵێت: لە سەرم بێت ئەبێت ئەوەندە نوێژ بکەم یان ئەوەندە ڕۆژو بگرم بۆ خوا، ئەوە پێویستە ببرێتە سەر.

ب- **نەزری پەیوەست:** ئەویش ئەوەیە کە پەیوەست دەکرێت بە مەرجێك یان ڕودانی شتێکەوە، وەك ئەوەی بڵێ: ئەگەر خوا نەخۆشیەکەم چاك بکاتەوە، یان فلان کەسی غائیب ونائامادە هاتەوە، ئەوا ئەوەم لە سەر بێت، ئەمەش پێویستە ببرێتە سەر ئەگەر مەرجەکەی هاتە دی، ومەبەستەکەی فەراهەم بو.

## پرسی چوارەم: جۆرەکانی نەزر وحوکمەکانی:

نەزر -بە گوێرەی ئەو حوکمانەی لێی دەبێتەوە، وپێویستی بردنە سەری ونەبردنە سەری- دابەش ئەبێت بۆ پێنج جۆر:

١- **نەزری ڕەها:** بۆ نمونە بڵێت: نەزرێکم بۆ خوا لە سەر بێت، وهیچ دیاری ناکات، ئەوا کەفارەتی سوێندی لە سەرە، ئیتر ڕەها بێت یان پەیوەست، لەبەر فەرمودەکەی عوقبەی کوڕی عامر ﵁، پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «كَفَّارَةُ النَّذْرِ إِذَا لَمْ يُسَمَّ كَفَّارَةُ يَمِينٍ» «کەفارەتی نەزری دیاری نەکراو [وەك ئەوەی بڵێ: نەزرێکم لە سەر بێت، ئیتر دیاری ناکات ڕۆژوە یان چی؟]، کەفارەتی سوێندە»[1].

٢- **نەزری دەمەقاڵێ وتوڕەبون:** ئەمەش بەستنەوەی نەزرەکەیە بە مەرجێکەوە مەبەستی پێی ڕێگری کردنە لە کردنی شتێك یان هاندانە بۆ کردنی کارێك، یان بەڕاست خستنەوە یان بە درۆ خستنەوە، وەك ئەوەی بڵێت: ئەگەر قسەم لەگەڵ کردی، یان: ئەگەر باسی تۆم بۆ نەکرا بێت، یان: ئەگەر ئەو هەواڵە ڕاست نەبێت، یان: ئەگەر درۆ بێت؛ ئەوا حەجێك یان ئازادکردنی کۆیلەیەکم لە سەرە...، ئەم نەزرە وەك سوێند وتراوە بۆ هاندان لە سەر کردنی کارێك یان ڕێگری لێکردنی،

---

(١) أخرجه الترمذي (١٥٢٨)، وقال: «حسن صحيح غريب»، وضعفه غيره، لكن يؤيده ما أخرجه أبو داود (٣٣٢٢) بنحوه من حديث ابن عباس، ورجح الأئمة وقفه عليه انظر: «سبل السلام» (٨/٤٢).

ومەبەستی نەزر ونزیك بونەوە نەبوە، لەم کاتەدا سەر پشك دەکرێت لە نێوان بردنە سەری نەزرەکەی یان کەفارەتی سوێنددان، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «كَفَّارَةُ النَّذْرِ، كَفَّارَةُ الْيَمِينِ» «کەفارەتی نەزر، کەفارەتی سوێندە»(١).

٣- **نەزری حەڵاڵ:** ئەوەیە نەزر بکات بۆ کردنی شتێکی حەڵاڵ، بۆ نمونە: نەزر بکات بەرگێك بپۆشێت، یان سەر بکەوێتە سەر ئاژەڵێك... وهاوشێوەکانی، شێخ [ئەحمەد عەبدولحەلیم] ئەوە هەڵ دەبژێرێت کە هیچی لە سەر نیە، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عەبباس ﵄، ئەڵێ: لەو کاتەی پەیامبەری خوا ﷺ وتاری دەفەرمو، تەماشا دەکات پیاوێك بە پێوە وەستاوە، پرسیاری لە بارەوە کرد، وتیان: ئەوە ئەبو ئیسرائیلە نەزری کردوە لە بەردەم خۆر ڕابوەستێت ونەچێتە بەر سێبەر وقسەش نەکات وهەر بە ڕۆژوش بێت، فەرموی: «مُرْهُ فَلْيَتَكَلَّمْ وَلْيَسْتَظِلَّ وَلْيَقْعُدْ، وَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ» «پێی بڵێ با قسە بکات وبڕواتە بەر سێبەر ودابنیشێت، بەڵام با ڕۆژوەکەی تەواو بکات»(٢).

٤- **نەزری سەرپێچی:** ئەوەیە نەزر بکات سەرپێچی بکات، وەك نەزرکردن بۆ مەی خواردنەوە، ونەزرکردن بۆ گۆڕ، یان بۆ مردوی ناو گۆڕەکان، وگرتنی ڕۆژو لە ڕۆژانی سوڕی مانگانەدا، وڕۆژی جەژندا، جا ئەم نەزرە دانامەزرێت واجبیش نیە ببرێتە سەر، لەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] عائیشە ﵂، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «هەر کەس نەزری کرد سەرپێچی خوا بکات با نەیکات» چونکە سەرپێچی خوا لە هیچ حاڵێکدا حەڵاڵ نابێت، وکەفارەتیشی بە هۆوە نایەتە سەر.

---

(١) أخرجه مسلم (١٦٤٥).

(٢) أخرجه البخاري (٦٧٠٤).

٥- **نەزری چاکە وخێر:** ئەمەش نەزری گوێڕایەڵیە، بۆ نمونە: نەزر بکات بۆ کردنی نوێژ وڕۆژو وحەج، ئیتر ڕەها بێت یان پەیوەست بێت بە بەدیهاتنی شتێکەوە؛ ئەوا پێویستە ببرێتە سەر ئەگەر ڕەها بێت، ئەگەریش پەیوەست بێت، کەی مەرجەکە بە دی هات دەیباتە سەر، ئەمەش لەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] عائیشە ﵂، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «کێ نەزری کرد گوێڕایەڵی خوا بکات با گوێڕایەڵی بکات».

## پرسی پێنجەم: نمونەی چەند نەزرێك کە دروست نیە ببرێتە سەر:

ئەو نەزرەی کە دروست نیە ببرێتە سەر بریتیە لە نەزری سەرپێچی، ئەمەش لە چەند نمونەیەك بەدی دێت:

١- نەزرکردنی مەی خواردنەوە یان گرتنی ڕۆژو لە ڕۆژانی عادەدا، لەبەر فەرمودەکەی [پێشوی] عائیشە ﵂، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «هەر کەس نەزری کرد سەرپێچی خوا بکات با نەیکات».

٢- ئەو نەزرەی بۆ مردوان دەکرێت، بۆ نمونە بڵێت: ئەی گەورەم فلان کەس! ئەگەر کەسە غائیبەکەم بگەڕێتەوە، یان نەخۆشیەکەم چاك ببێتەوە، یان پێویستیەکەم پڕ بکەیتەوە، ئەوە ئەوەندە پارە یان خواردن یان مۆم، یان زەیت، ئاوها وئاوها دەکەم، ئەمەش پوچ وباتڵە، وشیرکی گەورەیە پەنا بەخوا، چونکە نەزرکردنە بۆ دروستکراو، ئەوەش دروست نیە، چونکە نەزر پەرستنە، پەرستنیش بۆ خوا نەبێت بۆ کەس ناکرێت.

٣- ئەگەر نەزر بکات گۆڕێك یان دارێك ڕوناك بکاتەوە، ئەوە دروست نیە ببرێتە سەر، نرخەکەش بۆ بەرژەوەندیەکان خەج دەکرێت، چونکە سەرپێچیە، ونەزریش نیە لە سەرپێچی خوا، لەبەر فەرمودەی پێشتر.

# سیانزەهەم: بەشی خواردەمەنی وسەر بڕینەکان وڕاوکردن

لە سێ دەروازە پێك هاتوە:

دەروازەی یەکەم: لە بارەی خواردنەکانەوە.

دەروازەی دوەم: لە بارەی حوکمەکانی سەر بڕینەکانەوە.

دەروازەی سێیەم: لە بارەی حوکمەکانی ڕاوکردنەوە.

# دەروازەی یەکەم

# لە بارەی خواردەمەنیەکانەوە «الأطْعِمَة»

**چەند پرسێکی تێدایە:**

**پرسی یەکەم: پێناسەی خواردەمەنی، وبنەما تێیدا:**

١- **پێناسەکەی:** «الأَطْعِمَة»: کۆی «طَعَام»ە، ئەوەیە کە مرۆڤ دەیخوات ودەبێتە خۆراك بۆی لە خۆراك (قوت)ـەکان وجگە لەوانەش، یان خواردنەوەکان.

٢- **بنەما تێیدا:** ڕێسای شەرعی لە بارەی زانینی ئەوەی چی حەلاڵە وچی حەرامە لە خواردەمەنیەکان لەم ئایەتەوە وەرگیراوە: ﴿قُلْ لَا أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلَّا أَنْ يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنْزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ [الأنعام:١٤٥] «-ئەی پەیامبەر- بڵێ: من لەوەی وەحیم بۆ هاتوە نابینم شتێك حەرام بێت مرۆڤ بیخوات لەوەی ئێوە باسی دەکەن، مەگەر مردارەوە بو (مردار بو بێتەوە بە بێ سەر بڕینی شەرعی)، یان خوێنی ڕژاو، یان گۆشتی بەراز ئەوە پیسە، یان ئەوەی سەر بڕینەکەی دەرچون بێت لە گوێڕایەڵی خوا وەك ئەوەی ناوی جگە لە خوای لە سەر هێنرا بێت لە کاتی سەر بڕینیدا، جا کێ ناچار بو لەم حەرامکراوانە بخوات بە هۆی برسێتی زۆرەوە بە بێ ئەوەی مەبەستی لە خواردنی چێژ وەرگرتن بێت، وبە بێ بەزاندنی سنوری ناچاری ئەوا بێگومان خوا لێی دەبورێ، ومیهرەبانە بەرامبەری»، هەروەها لە فەرمایشتەکەی تری خواوە ﷻ کە ئەفەرموێت: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾ [الأعراف:١٥٧] «بەزەیی خۆم بۆ ئەوانە دەنوسم کە شوێنی ئەم پەیامبەرە نەخوێندەوارە دەکەون کە... وپاکەکانیان بۆ حەلاڵ دەکات

لە خواردن وخواردنەوە وهاوسەرگیری، وپیسەکانیان لە سەر حەرام دەکات وەك گۆشتی بەراز»، هەروەها لە فەرمایشتی: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾ [الأعراف:٣٢] «-ئەی پەیامبەر- بەو نەزانە هاویەشدانەرانە بڵێ: کێ کەلوپەلی جوانی لە سەر حەرام کردون کە خوا کردویەتی ڕازاوەیی بۆ ئێوە، وکێیە چێژ وەرگرتن لە خواردەمەنی حەڵاڵ وپاکی لێ حەرام کردون»، مەبەستیش لە پاکەکان: ئەوەیە نەفس پێی پاکە وحەزی لێ دەکات، چونکە خواردمەنی خۆراکی مرۆڤە، بۆیە شوێنەوارەکەشی لە سەر ڕەوشتەکەی ڕەنگ دەداتەوە، جا خواردەمەنی پاك شوێنەوارەکەشی پاك دەبێت، پیسیش پێچەوانەی ئەمەیە، هەر بۆیە خوا ﷻ خواردەمەنی پاکی حەڵاڵ کردوە، وپیسەکەی حەرام کردوە.

جا بنەما لە پرسی خواردەمەنیەکان حەڵاڵێتیە، مەگەر ئەوەی شەرعی دانا حەرامی کردبێت، بۆیە خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ﴾ [الأنعام:١١٩] «چی ڕێگرتانە -ئەی موسڵمانان- لە خواردنی ئەوەی ناوی خوای لە سەر هێنراوە، لە کاتێکدا خوا هەمو ئەوەی لە سەرتان حەرامە بۆی بەیان کردون، بەڵام ئەوەی ناچاری دەیخوازێت لە حەرامەکان بە هۆی برسێتیەوە ئەوا بۆتان حەڵاڵە».

ئەم بەیانەش، سێ شتی لە خۆ گرتوە:

١- باسکردنی حەڵاڵکراوەکان بە دەق.

٢- باسکردنی حەرامکراوەکان بە دەق.

٣- ئەوەی شەرع لێی بێ دەنگ بوە.

پەیامبەریش ﷺ ئەمەی ڕون کردۆتە لە فەرمودەکەی خۆیدا:

«إِنَّ اللهَ حَدَّ حُدُودًا فَلَا تَعْتَدُوهَا، وَفَرَضَ لَكُمْ فَرَائِضَ فَلَا تُضَيِّعُوهَا، وَحَرَّمَ أَشْيَاءَ فَلَا تَنْتَهِكُوهَا، وَتَرَكَ أَشْيَاءَ مِنْ غَيْرِ نِسْيَانٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَلَكِنْ رَحْمَةً مِنْهُ لَكُمْ فَاقْبَلُوهَا وَلَا تَبْحَثُوا فِيهَا» «خوا کۆمەڵێك سنوری داناوە مەیشکێنن، وکۆمەڵێك شتی فەرز کردوە زایەی مەکەن، وشتانێکی حەرام کردوە ئەنجامی مەدەن، وشتانێکیشی وێڵ کردوە بە بێ لە فەرامۆش کردن چونەوە، بەڵکو وەکو میهرەبانی لەوەوە بۆ ئێوە، جا وەری بگرن وبە دوایدا مەگەڕێن»[1].

## پرسی دووەم: ئەوەی شەرع بە دەق وتویەتی حەلاڵە:

بنەما وڕێسا لەمەدا ئەوەیە: هەمو خواردەمەنیەکی پاك زیانی تێدا نەبێت ئەوە حەلاڵە، خواردەمەنیە حەلاڵەکانیش ئەبنە دو جۆرەوە: ئاژەڵەکان وڕوەکەکان، وەك دانەوێڵە وبەر وبومەکان، وئاژەلانیش دو جۆرن: وشکانی وئاوی.

**یەکەم: ئاژەڵی دەریایی:** ئەمەش هەر ئاژەڵێکە تەنها لە دەریادا دەژیت، وەك ماسی بە جۆرەکانیەوە، هەروەها ئاژەڵە دەرياییەکانی تریش، مەگەر ژەهردار بێت ئەوە حەرامە چونکە زیانی هەیە. هەروەها ئەوانەش حەرامن کە بە پیس دادەنرێن وقیزەونن وەك قورباق (بۆق)، ونەهیش هاتوە لە کوشتنی، هەروەها وەك تیمساح چونکە بە پیس دادەنرێت، هەروەها کەڵبی هەیە ونێچیری پێ دەگرێت، ئەمانەش لە بەر گشتێتی فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾ [الأعراف:١٥٧].

ودروستیشە ئاژەڵی دەریایی بخورێت ئیتر موسڵمان ڕاوی بکات یان نا موسڵمان، یان هاوشێوەی هەبێت لە وشکانیدا دەخورێت یان نا، ئاژەڵی دەرياییش پێویستی بە

(١) أخرجه الدارقطني (١٨٤/٤)، والبيهقي (١٢/١٠) [ونقلت لفظ الحاكم لتمامه] وحسنه النوي كما في الحديث الثلاثين من كتاب الأربعين له.

سەر بڕینی شەرعی نیە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعًا لَكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ﴾ [المائدة:٩٦] «ئەی موسڵمانان! لە کاتی ئیحرامدا خوا ڕاوی لە دەریادا بۆ حەڵاڵ کردون، هەروەها خواردنەکەشی بۆ حەڵاڵ کردون کە مردارەوە بوەکانیەتی چونکە سودی لێ دەبینن لە نیشتەجێ ولە گەشتەکانتاندا»، عەبدوڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنهما ئەڵێ: «ئاگادار بن! ڕاوەکەی: ئەوەیە بە ڕاو دەگیرێت، خواردنەکەشی: ئەوەیە لە دەریا دێتە دەرەوە»[1]. هەروەها لەبەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە کە پیاوێك پرسیاری کرد لە پەیامبەری خوا ﷺ: ئەی پەیامبەری خوا! ئێمە بە دەریادا دەڕۆین وکەمێك ئاو لەگەڵ خۆماندا دەبەین، جا ئەگەر دەست نوێژی پێ بگرین تینومان دەبێت، ئایا بە ئاوی دەریا دەست نوێژ بگرین؟ فەرموی: «هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ الْحِلُّ مَيْتَتُهُ» «دەریا ئاوەکەی پاکە، ومردارەوە بوەکەشی حەڵاڵە»[2].

دووەم: **ئاژەڵی وشکانی:** ئەو ئاژەڵە وشکانیانەی بە دەق حەڵاڵن، دەکرێت لەمانەی خوارەوە پوخت بکرێتەوە:

أ- **مەڕ وبزن ومانگا وشتر** (الأَنْعَام): لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَالْأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ [النحل:٥] «وشتر ومانگا ومەڕ وبزن خوا بۆی دروست کردون -ئەی خەڵکینە- کە خوریەکەی ئەبێتە مایەی گەرم کردنەوە بۆتان، کەڵکی تریشی تێدایە لە شیر وپێستە وسەرکەوتن بە سەریدا، ولە گۆشتەکەشیان دەخۆن». هەروەها فەرمایشتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ

(١) أخرجه الدارقطني (٤/٢٧٠). وانظر: «تفسير ابن كثير» (١٨٩/٣) عند الآية المذكورة.
(٢) أخرجه أبو داود (٦٤/١)، والنسائي (٥٩)، وابن ماجه (٣٨٦)، والترمذي (٦٩) وقال: «حسن صحيح»، ومالك (ص ٢٠)، والحاكم (١٤٠/١) وغيرهم، وصححه الألباني «صحيح سنن النسائي» (٥٨).

أُحِلَّتْ لَكُمْ بَهِيمَةُ الْأَنْعَامِ إِلَّا مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ﴾ [المائدة:١] «ئەی ئەوانەی بڕواتان بە خوا وپەیامبەر هەیە وشەرعەکەیتان بە ڕاست خستۆتەوە، پەیمانە گرێدراوەکانتان ببنەنە سەر... خوا وشتر ومەڕ ومانگا وبزنی بۆحەڵاڵ کردون، مەگەر ئەوانەی بۆی ڕون کردونەتەوە کە حەرامە». مەبەست لە ئەنعامیش: وشتر ومانگا ومەڕ وبزنە.

ب- **ئەسپ:** لەبەر فەرمودەکەی جابری کوڕی عەبدولاّ ﷺ، ئەڵێ: «نَهَى النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ، وَرَخَّصَ فِي لُحُومِ الْخَيْلِ» «لە ڕۆژی خەیبەردا پەیامبەری خوا ﷺ نەهی کرد لە گۆشتی کەر، وڕێگەیدا بە گۆشتی ئەسپ»[١].

ج- **بزن مژە (الضَّبّ):** لەبەر فەرمودەکەی عەبدولاّی کوڕی عەبباس ﷺ، ئەڵێ: «أُكِلَ الضَّبُّ عَلَى مَائِدَةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ» «لە سەر خوانی پەیامبەر ﷺ بزن مژەك خوراوە»[٢]. هەروەها فەرمودەی: «كُلُوا فَإِنَّهُ حَلَالٌ، وَلَكِنَّهُ لَيْسَ مِنْ طَعَامِي» «ئێوە بیخۆن حەڵاڵە، بەڵام ئەوە خواردنی من نیە»[٣].

د- **گوێدرێژی دەشتی (الحِمَارُ الوَحْشِي):** کە ماڵی نیە، لەبەر فەرمودەکەی ئەبو قەتادە ﷺ کە گوێدرێژێکی دەشتەکی بینیوە وسەری بڕیوە، جا پەیامبەر فەرمویەتی: «هَلْ مَعَكُمْ مِنْ لحمه شيء» «هیچتان لە گۆشتەکەی پێیە؟»، وتیان: پێکەیمان لایە، ئەوەبو بردی ولێی خوارد[٤].

ه- **کەروێشك:** لەبەر فەرمودەکەی ئەنەس ﷺ کە وشترێکی گرتوە، ئەبو تەڵحەش سەری بڕیوە، وڕانەکەی نارد بۆ پەیامبەر ﷺ، ئەویش وەری گرت[٥].

---

(١) أخرجه البخاري (٥٥٢٠)، ومسلم (١٩٤١).
(٢) أخرجه البخاري (٥٢١٧)، ومسلم (١٩٤٥).
(٣) متفق عليه: أخرجه البخاري (٧٢٦٧)، ومسلم (١٩٤٤).
(٤) متفق عليه: أخرجه البخاري (٦/٢٢٢)، ومسلم (١١٩٦).
(٥) متفق عليه: أخرجه البخاري (٦/٢٣١)، ومسلم (١٩٥٣).

و- **کەمتیار:** لەبەر فەرمودەکەی جابر ﷺ، ئەڵێ: پرسیاری کەمتیارم لە پەیامبەری خوا ﷺ کرد، فەرموی: «هُوَ صَيْدٌ، وَيُجْعَلُ فِيهِ كَبْشٌ إِذَا صَادَهُ [الْمُحْرِمُ]» «ئەوا نێچری ڕاوە، ئەگەر کەسێك لە ئیحرامدا بێت ڕاوی بکات شەکێك سەر دەبڕێت (مادامیش کردی بە ڕاو وفیدیەی لە سەر دانا کەواتە حەڵاڵە)»[(١)].

حافز ئیبن حەجەر ئەڵێ: «لە بارەی حەڵاڵی کەمتیارەوە کۆمەڵێ فەرمودە هاتون خراپ نین»[(٢)].

ز- **مامر (مریشك):** لەبەر فەرمودەکەی ئەبو موسا ﷺ، ئەڵێ: «رأَيْتُ رسولَ الله ﷺ يأكلُ لحمَ دَجاجٍ» «پەیامبەرم ﷺ بینی گۆشتی مریشکی دەخوارد»[(٣)].

وقاز وسۆنەش دەدرێنە پاڵ مریشکەوە، چونکە لە پاکەکانن وئەڕۆنە ژێر فەرمایشتی: ﴿أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ﴾ [المائدة:٤].

ح- **کولە:** لەبەر فەرمودەکەی عەبدوڵای ئەبو ئەوفا ﷺ، ئەڵێ: «لەگەڵ پەیامبەری خوادا حەوت یان شەش غەزامان کرد، لەگەڵیدا کولەمان دەخوارد»[(٤)].

## پرسی سێیەم: ئەوەی شەرع بە دەق وتویەتی: حەرامە:

بنەما لەو خواردەمەنیانەی حەرام کراون ئەوەیە: هەر خواردەمەنیەکی پیسی قیزەون زیانی تێدا بێت، دروست نیە بخورێت، بەم شێوازەی خوارەوە:

١- خواردنە حەرامەکان لە قورئاندا کورت هەڵهاتوە لە دە شتدا، کە لەم فەرمایشتەی خوادا ﷻ هاتوە: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا

---

(١) أخرجه أبو داود (٣٨٠١) [واللفظ والزيادة له]، والترمذي (٢٢٢/٤) [(١٧٩١)] وقال: «حسن صحيح»، وابن ماجه (٣٠٨٥) والنسائي (٤٣٣٤)، وصححه الألباني «صحيح سنن ابن ماجه» (٢٥٢٢).

(٢) فتح الباري: (٥٧٤/٩).

(٣) متفق عليه: أخرجه البخاري (٥٥١٧)، ومسلم (١٦٤٩).

(٤) أخرجه البخاري (٥٤٩٥)، ومسلم (١٩٥٢).

أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ﴾ [المائدة:٣] «خوا ئەمانەی لە سەر حەرام کردون: [١] مردارەوەبو، [٢] وخوێنی ڕژاو، [٣] وگۆشتی بەراز، [٤] وئەوەی ناوی جگە لە خوای لە سەر هێنراوە لە کاتی سەر بڕیندا، [٥] وخنکاو، [٦] وئەوەی بە لێدان مردارەوە بو بێت، [٧] وبەرەوە بو، کەوتۆتە خوارەوە ومردار بۆتەوە، [٨] هەروەها قۆچ لێدراو، بە هۆیەوە مردار بۆتەوە، [٩] هەروەها ئەو ئاژەڵەی لە سەر حەرام کردون کە دڕندە خواردویەتی، مەگەر پێش مردار بونەوە پێ ڕا بگەن وبە شێوەیەکی شەرعی سەری ببڕن ئەوەیان حەڵاڵە بۆتان، ئەمەش هەڵاوێرە لە خنکاو وئەوانەی پاشی، [١٠] هەروەها خوا خواردنی ئەوانەشی لە سەر حەرام کردون کە لای بتەکان سەر دەبڕدرێت».

- **سەبارەت بە مردارەوە بو:** ئەوەیە کە لە خۆوە مردار بو بێتەوە وگیانی دەرچو بێت بێ ئەوەی شەرعیانە سەر بڕدرا بێت، حەرامیش کراوە لەبەر ئەو زیانەی تێیدایە بە هۆی قەتیس بونی خوێنەکەیەوە وپیسی خۆراك وخواردنیەوە. بۆ ناچاریش حەڵاڵ ئەبێت بە پێی پێویست، ولە مردارەوەبو: ماسی [ئەوانەی تریش کە بە تەنها لە دەریا دەژین] وکولە هەڵاوێر کراون، چونکە حەڵاڵن.

- **خوێنیش:** مەبەست پێی خوێنی ڕژاوە، ئەمەش حەرامە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ لە ئایەتێکی تردا: ﴿أَوْ دَمًا مَسْفُوحًا﴾ [الأنعام: ١٤٥] «یان خوێنێکی ڕژاو بێت». ئەو خوێنەشی کە لە دوای سەر بڕین لە بەین گۆشت ودەمارەکاندا دەمێنێتەوە، حەڵاڵە، هەروەها ئەو خوێنانەش حەڵاڵە کە شەرع حەڵاڵی کردوە، وەك جگەر وسپڵ.

- **گۆشتی بەراز:** چونکە قیزەونە، وخۆراکی پیس وگەن دەخوات، هەروەها لەبەر زیانە زۆرەکەی[1]، خوای گەورەش ئەم سیانەی لەم فەرمایشتەدا کۆ کردۆتەوە: ﴿إِلَّا أَنْ يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنْزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾ [الأنعام:١٤٥].

- **ئەوەی ناوی جگە لە خوای لە سەر هێنرا بێت:** یانی ئەوەی لە کاتی سەر بڕینیدا ناوی جگە لە خوای لە سەر هێنرا بێت، ئەمەش حەرامە لە بەر ئەوەی هاوبەشدانانی تێدایە کە دژی تەوحیدە، چونکە سەر بڕین وپەستنە دروست نیە بۆ جگە لە خوا بکرێت، وەك خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾ [الكوثر:٢] «سا نوێژەکانت هەر هەموی بە پاکی بۆ خوا بکە، وسەر بڕینەکانت هەر با بۆ ئەو بێت وتەنها ناوی وی لە سەر بهێنە».

- **خنکاو (الْمُنْخَنِقَةَ):** ئەوەیە کە دەخنکێت تا مردارەوە بون، بە ئەنقەست بێت یا نا.

- **لێدراو (الْمَوْقُوذَةَ):** ئەوەیە کە بە گۆچان یان شتێکی قورس لێی دەدرێت، مردار ئەبێتەوە.

- **بەرەوە بو (الْمُتَرَدِّيَةَ):** ئەوەیە کە لە شوێنێکی بەرزەوە کەوتۆتە خوارەوە، مردار ئەبێتەوە.

- **قۆچ لێدراو (النطيحة):** ئەوەیە کە ئاژەڵێك قۆچی لیٚ دەدات دەیکوژێت.

---

(١) [بۆ زانینی زیاتر لەسەر پیسی وقیزەونی بەراز، بڕوانە کتێبی: گۆشتی بەراز خۆشە یان وشتر؟! علی خان]

- **ئەوەی دڕندە خواردبێتی:** ئەوەیە کە شێر وپڵنگ (النمر والفهد[1]) وگورگ وسەگ هێرش دەکاتە سەری وهەندێکی دەخوات، بەو هۆیەوە مردار دەبێتەوە، جا کام لەم پێنجەی کۆتایی پێی گەیشتی وژیانی تێدا بو ئەوا شەرعیانە سەری دەبڕیت وحەڵاڵە بیخۆیت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ﴾ [المائدة:٣].

- **ئەوەی لای بتەکان سەر بڕدرا بێت:** بەردێك بو لە دەوری کەعبە دانرا بو، لە سەردەمی نەفامیدا سەر بڕینیان لەوێدا دەکرد، ئەمە دروست نیە بیخۆیت، چونکە لەو هاوبەش دانانەیە کە خوا حەرامی کردوە، وەك لە «أهل لغير الله به»دا باس کرا.

**لە خواردەمەنیەکان ئەمانەش دیسانەوە حەرامن:**

٢- ئەوەی زیانێکی تێدا بێت: وەك ژەهر، ومەی، وسەرجەم سەر خۆش کەر وخاوکەرەوەکانی تر، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ [البقرة:١٩٥] «وخۆتان توشی لە ناو چون مەکەن بە وازهێنان لە تێکۆشان لە پێناو خوا ونەبەخشین لەو پێناوەدا»، هەروەها فەرمایشتی: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ﴾ [النساء:٢٩] «وخۆتان ویەکتر مەکوژن».

٣- ئەوەی لە زیندو بڕا بێت: لەبەر فەرمودەکەی ئەبو واقدی لەیسی ﷺ، ئەڵێ[2]: پەیامبەری خوا فەرموی: «مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ فَهُوَ مَيْتَةٌ» «ئەوەی لە ئاژەڵ بڕا بێت بە زیندویی ئەوە مردارەوە بوە».

٤- ئاژەڵی دڕندە: لە ئاژەڵە وشکانیەکاندا ئەوەیە بە کەڵپەکانی نێچیر دەگرێ (قەپ دەگرێت) وەك شێر وگورگ وپڵنگ وسەگ، لەبەر فەرمودکەی ئەبو سەعلەبەی

(١) [الفهد: سبع من الفصيلة السنورية بَين الْكَلْب والنمر لكنه أَصْغَر مِنْهُ].
(٢) أخرجه أحمد (٥/٢١٨)، وأبو داود (٢٨٥٨)، والترمذي (١٤٨٠)، وحسَّنه، وصححه الألباني «صحيح الترمذي» (١١٩٧).

خوشەنی ﵁: «نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ [أَكْلِ] كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ» «پەیامبەر نەهی کردوە لە خواردنی هەمو کەڵپە دارێك لە دڕندەکان»[1]. ولەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر: «كُلُّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ فَأَكْلُهُ حَرَامٌ» «هەمو کەڵپەدارێك لە دڕندەکان خواردنی حەرامە»[2].

٥- باڵندەی دڕندە: ئەوەیە کە بە چڕنوکەکانی ڕاو دەکات، وەك داڵ، وباز وهەڵۆ، وکۆلارە، وکوندە پەپو، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عەبباس ﵄، ئەڵێ: «نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وَعَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ» «پەیامبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە هەمو کەڵپە دارێك لە دڕندەکان، ولە هەمو چڕنوك دارێك لە باڵندەکان»[3].

٦- ولە باڵندەکان ئەوانە حەرامە کە پاشەڕۆ وپیسی دەخۆن، وەك داڵ، وڕەخەم[4] وقەلە ڕەش، لەبەر پیسی ئەو خۆراکانەی دەیخوات.

٧- هەر ئاژەڵێك کوشتنی سوننەت بێت، خواردنی حەرامە: وەك مار وکولاژدوم (دو پشك) ومشك وکۆلارە، لەبەر فەرمودەکەی عائیشە ﵂، ئەڵێ: پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ، كُلُّهُنَّ فَاسِقٌ يَقْتُلُهُنَّ فِي الْحَرَمِ: الْغُرَابُ، وَالْحِدَأَةُ، وَالْعَقْرَبُ، وَالْفَأْرَةُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ» «پێنج ئاژەڵ هەمویان لە هاوتاکانیان ناچن ولە سنوریان دەرچون، جا لە سنوری حەرەم بێت یان لە دەرەوە

(١) أخرجه البخاري (٥٥٣٠)، ومسلم (١٩٣٢) [والزيادة لهما في الموضعين].
(٢) أخرجه مسلم (١٩٣٣).
(٣) أخرجه مسلم (١٩٣٤). و«المِخْلَب- چڕنوك» بۆ باڵندە ودڕندە وەك نینۆك وایە بۆ مرۆڤ؛ چونکە باڵندە بە چڕنوکەکانی پێسە دەبڕێنێت ودەدڕێنێت.
(٤) [باڵندەیەکی، سپیە وخاڵی ڕەشی پێوەیە، پەڕی زۆرە، دنوکەکانی درێژە وتۆزێك چەماوەتەوە. «المعجم الوسيط» (رخم)].

دەکوژرێن: قەلە بازەڵە، وکۆلارە، وکولاژدم، ومشك، وسەگی هار»[١]. ولەبەر ئەوەی بە پیس دانراو وقیزەونن.

٨- کەری ماڵی: لەبەر فەرمودەکەی جابر ﷺ: «أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ» «پەیامبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا نەهی کرد لە گۆشتی گوێدرێژی ماڵی»[٢].

٩- ئەو خواردەمەنیانەی بە پیس دادەنرێت: وەك مشك ومار ومێش وزەردەواڵە وهەنگ، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا: ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾ [الأعراف:١٥٧].

١٠- «الجَلَّالَة»: ئەو ئاژەڵەیە زۆربەی خواردنەکانی پیسە، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر ﷺ ئەڵێ: «نَهَى رسولُ اللهِ ﷺ عَنْ أَكْلِ الجَلَّالَة» «پەیامبەری خوا ﷺ نەهی کرد لە خواردنی ئاژەڵی خواردن پیس»[٣]. لەمەشدا وشتر ومانگا ومەڕ وبزن ومریشك وهاوشێوەکانیان هەمویان وەکو یەکن، ئەگەریش لە پیسی دور بخرێتەوە، وخواردنی پاکی پێ بدرێت حەڵاڵ ئەبێت. ئیبن عومەریش کەی بیویستایە ئەم جۆرە ئاژەڵە بخوات سێ ڕۆژ ئەیبەستەوە، وتراوە: زیاتر لەوەش.

## پرسی چوارەم: ئەوەی شەرع لێی بێدەنگ بوە:

ئەوەی کە شەرع لێی بێ دەنگ بوە، ودەقێك نەهاتوە حەرامی بکات، ئەوە حەڵاڵە، چونکە بنەما لە شتەکاندا حەڵاڵیە، ئەم ئایەتەش بەڵگەیە لە سەر ئەوە: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ [البقرة: ٢٩] «خوا بە تەنها، هەرچی لە سەر ئەرز هەیە لە نیعمەتەکان لە پێناوی ئێوە دروستی کردوە بۆ ئەوەی کەڵکی لێ

---

(١) أخرجه البخاري (١٨٢٩)، ومسلم (١١٩٨).

(٢) أخرجه البخاري (٥٢٠٤)، ومسلم (١٩٤١).

(٣) أخرجه أبو داود (٣٧٨٥)، وابن ماجه (٣١٨٩) وهو صحيح. انظر إرواء الغليل (١٤٩/٨).

وەر بگرن». هەروەها فەموودەکەی ئەبو دەردایش ﷺ [کە پێشتر بە لەفزێکی تر باس کرا]، پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «مَا أَحَلَّ اللهُ فِي كِتَابِهِ فَهُوَ حَلَالٌ، وَمَا حَرَّمَ فَهُوَ حَرَامٌ، وَمَا سَكَتَ عَنْهُ فَهُوَ عَافِيَةٌ، فَاقْبَلُوا مِنَ اللهِ الْعَافِيَةَ، فَإِنَّ اللهَ لَمْ يَكُنْ نَسِيًّا، ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾» «ئەوەی خوا حەلاڵی کرد ئەوە حەلاڵە، ئەوەشی حەرام کردبێت حەرامە، لە چیش بێ دەنگ بو بێت ئەوە عەفوی لێداوە وچاو پۆشی لێکراوە، جا بێوەیی خوا وەر بگرن، وەنەبێت خوا هیچی لە بیر چو بێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وەنەبێت خوا هیچ شتێکی لە شتەکان فەرامۆش کردبێت﴾»[1].

## پرسی پێنجەم: ئەوەی کەڕاهەتی هەیە بخورێت:

کەڕاهەتی هەیە پیاز وسیر وهاوشێوەکانیان لە بۆن ناخۆشەکان بخورێت، وەك کەوەر وتور، بە تایبەت لە کاتی هاتن بۆ مزگەوتەکان وشوێنی کۆبونەوەکان بۆ پەرستن ویادی خوا، لەبەر فەرمودەکەی جابر ﷺ، پەیامبەری خوا فەرمویەتی: «مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ الْمُنْتِنَةِ فَلَا يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا، فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ تَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ الْإِنْسُ» «هەر کەس لەم دارە بۆ گەنەی خوارد با نزیك مزگەوتەکەمان نەکەوێتەوە، چونکە فریشتەکان ئازاریان پێ دەگات بەوەی مرۆڤەکان ئازاریان پێ دەگات»[2]. یانی: داری سیر، لە ڕیوایەتێکدا: «تا بۆنەکەی دەچێت»[3]. ئەگەریش کۆڵاندی وبۆ نەکەی نەما ئەوە هیچی تێدا نیە بیخوات، لەبەر وتەکەی عومەری

(١) أخرجه الحاكم (٢/٣٧٥) وصحح [إسناد]ه [وهذا لفظه]، وافقه الذهبي.
(٢) أخرجه البخاري (٥٤٥٢)، ومسلم (٥٦٤).
(٣) [أخرجه مسلم (٥٦١)].

کوڕی خەتتاب ﷺ: «کێش خواردی با بە کوڵاندنی بۆنەکەی بمرێنێت»[١]. ولە ڕیوایەتێکی جابر دا ﷺ[٢]: «وا گومان ئەبەم مەبەستی بە کاڵی بێت»[٣].

## پرسی شەشەم: ئادابەکانی خواردن:

خواردن کۆمەڵێك ئادابی هەیە ئەبێت موسڵمان سور بێ لە سەری، کە ئەمانەیە:

١- «بسم الله» کردن لە سەرەتای خواردن: لەبەر فەرمودەکەی عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە ﷺ، ئەڵێ: مێرد منداڵێك بوم لە کۆشی پەیامبەردا ﷺ، جا لە کاتی چێشت خواردندا دەستم بە هەمو لایەکی قاپەکە دەسوڕاند ولە شوێنێکەوە نەمدەخوارد، ئەوەبو پەیامبەر ﷺ فەرموی: «يَا غُلَامُ، سَمِّ اللهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ» «ڕۆڵە گیان! بسم الله بکە، وبە دەستی ڕاست بخۆ، ولە پێشی خۆشتەوە بخۆ»، جا لەو ڕۆژەوە هەمیشە خواردنی من بەو شێوازەیە[٤].

٢- بە دەستی ڕاست خواردن: لەبەر فەرمودەی پێشو.

٣- لە پێش خۆوە خواردن: دیسانەوە لەبەر فەرمودەی پێشو، مەگەر بزانێت بەرامبەرەکانی بەوە ئازاریان پێ ناگات وپێی ناخۆش نیە، ئەوا هیچی تێدا نیە لەم سەر وئەو سەری قاپەکەوە بخوات، لەبەر فەرمودەکەی ئەنەس ﷺ کە باسی ئەو پیاوە بەرگ دورەمان بۆ دەکات پەیامبەری خوای ﷺ دەعوەت کردوە بۆ خواردنێك، ئەنەس ئەڵێت: «تەماشا دەکەم پەیامبەر ﷺ دەست بۆ کولەکە دەبات لە دەوربەری

---

(١) أخرجه مسلم (٥٦٧).

(٢) [واتە ڕیوایەتێکی حەدیسی پێشو نەك وتەکەی عومەر].

(٣) جامع الأصول (٢٨٠/٨) [!! بل هو عند البخاري (٨٥٤)].

(٤) أخرجه البخاري (١٩٦/٦) [(٥٣٧٦)]، ومسلم (٢٠٢٢). ومعنى تطيش: تتحرك في نواحي القصعة ولا تقتصر على موضع واحد.

قاپەکە»[1]. یان کەسەکە تەنها بێت وکەسی لەگەڵدا نەبێت، یان خواردنەکە جۆراوجۆر بێت، ئەو کاتە بۆی دروستە لە غەیرە پێشی خۆشیەوە بخوات ئەگەر ئازاری کەسی نەدەدا.

٤- ستایشی خوا کردن لە کۆتاییەکەی: لەبەر فەرمودەکەی ئەبو ئومامە ﵁، ئەڵێ: ئەگەر سفرە لە بەردەم پەیامبەر ﷺ هەڵبگیرایە، دەیفەرمو: «الْحَمْدُ لِلهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، غَيْرَ مُوَدَّعٍ وَلَا مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبَّنَا» «حەمد وستایش بۆ خوا، ستایشێکی زۆری پاك وبێ خەوشی پڕ فەر وپیرۆز، ستایشێکی واز لێ نەهێنراو (یان: خواردنێکی نەبڕاوە ودوا خواردن نەبێت)، بێ بێنیاز بون پێی (واتە: پێویستیمان پێیەتی) ئەی پەروەردگارەکەم»[2]. ولەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «إِنَّ اللهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الْأَكْلَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا، أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا» «خوا لە بەندە ڕازی دەبێت کە خواردنێکی خوارد ستایشی ئەوی لە سەر بکات یان خواردنەوەیەکی خوارد ستایشی ئەوی لە سەر بکات»[3].

٥- خواردن لە سەر سفرە: لەبەر فەرمودەکەی ئەنەسی کوڕی مالك ﵁، ئەڵێ: «مَا أَكَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى خِوَانٍ وَلَا فِي سُكُرُّجَةٍ وَلَا خُبِزَ لَهُ مُرَقَّقٌ [قَطُّ] [حَتَّى مَاتَ]، قُلْتُ لِقَتَادَةَ: عَلَى مَا يَأْكُلُونَ؟ قَالَ: عَلَى السُّفَرِ» «پەیامبەر هەرگیز نانی نەخواردوە نە لە سەر خوان ومێز، ونە لە ناو قاپی پێخۆر، ونانی نەرمی نەخواردوە. بە قەتادەم وت: ئەی لە سەر چی نانیان دەخوارد، وتی: لە سەر سفرە»[4].

---

(١) أخرجه البخاري (٥٣٧٩).

(٢) أخرجه البخاري (٥٤٥٩). ومعنى «غير مودع»: غير متروك الطاعة.

(٣) أخرجه مسلم (٢٧٣٤).

(٤) أخرجه البخاري (٥٣٨٦) [واللفظ أشبه (٥٤١٥) والزيادات للبخاري نفسه]. «الخوان»یش: ئەوەیە خواردنی لە سەر دەخورێت، بریتیە لە سفرە، کراوەتە عەرەبی. «السُّفرة»ش: هەر وایە، واشی پێ وتراوە

=

٦- خواردن بە ڕاکشانەوە کەڕاهەتی هەیە: لەبەر فەرمودەکەی عائیشە ﵂، ئەڵێ: «قُلْتُ: يَا رَسولَ اللهِ! كُلْ -جَعَلَنِي اللَّهُ فَدَاكَ- مُتَّكِئًا، فَإِنَّهُ أَهْوَنُ عَلَيْكَ، فَأَصْغَى بِرَأْسِه حَتَّى كَادَ أَنْ تُصِيبَ جَبْهَتَه الأَرْضَ، قَالَ: «لَا، بَلْ آكُلُ كَمَا يَأْكُلُ العَبْدُ، وَأَجْلِسُ كَمَا يَجْلِسُ العَبْدُ» «وتم: ئەی پەیامبەری خوا -خوا بمكات بە قوربانت- بە ڕاکشانەوە خوارد بخۆ، ئەوە ڕەحەتترە بۆت، ئەویش سەری کردە خوارەوە خەریك بو ناوچەوانی بەر زەویەکە بکەوێت، فەرموی: نەخێر، بەڵکو ئەخۆم وەکو کۆیلە، ودادەنیشم وەکو کۆیلە»[1]. ولەبەر فەرمودەکەی ئەبو جوحەیفە ﵁، پەیامبەر ﷺ فەرموی: «إِنِّي لَا آكُلُ مُتَّكِئًا» «من بە ڕاکشانەوە شت ناخۆم»[2].

٧- عەیبدار نەکردنی خواردنێك کە حەزی لێ ناکات: لەبەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ﵁ ئەڵێ[3]: «مَا عَابَ النَّبِيُّ ﷺ طَعَامًا قَطُّ إِنِ اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ وَإِلَّا تَرَكَهُ» «هەرگیز پەیامبەر هیچ خواردنێکی عەیبدار نەکروە، حەزی لێ ببوایە دەیخوارد، وەگەرنا وازی لێ دەهێنا».

٨- خواردن لە دەورو بەری قاپ وناوەڕاستی دەفرەوە کەڕاهیەتی هەیە: لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عەبباس ﵄، ئەڵێ: دەوریەك تریتیان هێناوە بۆ پەیامبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرموی: «كُلُوا مِنْ جَوَانِبِهَا، وَلَا تَأْكُلُوا مِنْ وَسَطِهَا، فَإِنَّ الْبَرَكَةَ تَنْزِلُ

---

چونکە ڕا دەخرێت لە کاتی خواردن لە سەری. «السكرجة»ش: پەرداخێکی بچوکە شتی تێدا دەخورێت لە پێخۆر، فارسیە، لەوانەیە بۆیە لە سەر خوان نانی نەخواردوە، چونکە عادەتی عەجەم شێوازێکی دیاری کراوی هەبوە، لەوانەیە «السكرجة»ش هەر لەبەر ئەمە بێت.

(١) أخرجه البغوي في «شرح السنة» (١١/٢٨٦-٢٨٧)، وأحمد في «الزهد» (ص ٥، ٦) وصححه الأرناؤوط بشاهد مُرْسَل «حاشية شرح السنة».

(٢) أخرجه البخاري (٥٣٩٨).

(٣) أخرجه البخاري (٥٤٠٩)، ومسلم (٢٠٦٤).

فِي وَسَطِهَا» «لە دەوربەرەکەی بخۆن، ولە ناوەڕاستەکەیەوە مەخۆن، چونکە فەڕ وبەرەکەت دا دەبەزێتە ناوەڕاستەکەی»(١).

٩- خواردن بە سێ پەنجە، ولێسانەوەیان دوای خواردنەکە، لەبەر فەرمودەکەی کەعبی کوڕی مالك ﷺ، ئەڵێ: «پەیامبەر بە سێ پەنجە خواردنی دەخوارد، ودەستیشی نەدەسڕی تا پەنجەکانی دەلێسایەوە»(٢).

١٠- خواردنی ئەوەی لە کاتی خواردنەکە دەکەوێت یان پەرش وبلاو بۆتەوە، لەبەر فەرمودەی: «إِذَا سَقَطَتْ لُقْمَةُ أَحَدِكُمْ فَلْيُمِطْ عَنْهَا الْأَذَى وَلْيَأْكُلْهَا، وَلَا يَدَعْهَا لِلشَّيْطَانِ» «ئەگەر پاروی کەسێکتان کەوت، با زیانەکەی لێ بکاتەوە وبیخوات، وێڵی نەکات بۆ شەیتان»(٣).

١١- سڕین ولێسانەوەی ئەو دەوریەی لێی دەخوات: لەبەر وتەکەی ئەنەس لە فەرمودەی پێشو: «پەیامبەر ﷺ بە لێسانەوەی دەوری فەرمانی پێکردین». یانی: بیسڕین وچی خواردنێکی تێدا ماوە بخورێت، ولە ڕیوایەتێکدا: «پەیامبەری فەرمانی کرد بە لێسانەوەی پەنجە ودەوریەکان، وفەرموی: «إِنَّكُمْ لَا تَدْرُونَ فِي أَيِّهِ الْبَرَكَةُ» «ئێوە نازانن لە کوێیدا بەرەکەت وفەڕ هەیە»(٤).

---

(١) أخرجه أحمد (١/٢٧٠)، والترمذي (١٨٠٥) وقال: حسن صحيح، وأبو داود (٣٧٧٢)، وابن ماجه (٣٢٧٧)، وصححه الألباني «صحيح سنن ابن ماجه» (٢٦٥٠).

(٢) أخرجه مسلم (٢٠٣٢).

(٣) أخرجه مسلم (٢٣٠٥).

(٤) أخرجه مسلم (٢٠٣٣).

# دەروازەی دووەم

# حوکمی سەر بڕینەکان «أَحْكَامُ الذَّبـائِحِ»

چەند پرسێکی تێدایە:

## پرسی یەکەم: واتای سەر بڕین، وجۆرەکانی، وحوکمەکەی:

١- **پێناسەی** «الذَّبَائِح»: کۆی «ذَبِيْحَة»یە، واتا: سەر بڕاو. لە شەرعیشدا: ئەو ئاژەڵەیە کە شەرعیانە سەر بڕاوە. و«تَذْكِيَة= سەر بڕین»یش: بریتیە لە سەر بڕین یان لە ملدانی ئاژەڵی وشکانی گۆشت خوراوی دەسەڵات بە سەر شکاو، بە بڕینی قوڕ قوڕاگە وبۆڕی خواردن، یان بریندار کردن (عَقْر)ی دەسەڵات بە سەر نەشکاو.

٢- **پێناسەی سەر بڕین:** ولەبەر ئەوەی مەبەست لە سەر بڕین (الذبح) ئەو ئاژەڵەیە کە بە شەرعیانە سەر بڕاوە، جا گونجاوە جۆرەکانی سەر بڕین کە خواردنی ئاژەڵ حەڵاڵ دەکەن ڕون بکرێتەوە، ئەمەش ئەبێتە سێ بەشەوە، وەك لە پێناسەکەی پێشتر ڕون دەبێتەوە.

**یەکەم: سەر بڕین** (الذَّبْح): ئەمەش بڕینی قوڕ قوڕاگەی ئاژەڵە بە کۆمەڵێك مەرجەوە.

**دووەم: لە گەردن دان** (النَّحْر): ئەمەش بڕینی گەردن (لَبَّة)ی ئاژەڵە، کە ئەکەوێتە خوار ملەوە، ئەمەش سەر بڕینی سوننەتانەیە بۆ وشتر، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾ [الكوثر:٢].

**سێیەم: بریندار کردن** (العَقْر): ئەمەش کوشتنی ئاژەڵی دەسەڵات بە سەر نەشکاوە لە نێچیر وشتر ومانگا ومەڕ وبزن، بە بریندار کردنی هەر شوێنێکی لاشەی جگە لە قوڕگ وگەردن، لەبەر فەرمودەکەی ڕافع رضي الله عنه ئەڵێ: «وشترێك هەڵهات وبۆی

دەرچو، کابرایەك تیرێکی تێگرت وەستانی، پەیامبەر ﷺ فەرموی(1): «فَمَا نَدَّ عَلَيْكُمْ، فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا» «هەر ئاژەڵێکتان لە یاخی بو، وەکو ئەمەی لێ بکەن».

٣- **حوکمی سەر بڕین:** سەر بڕینی ئاژەڵی دەسەڵات بە سەر شکاو حوکمەکەی ئەوەیە پەیوەست ولازمە، هیچ بەشێکی ئاژەڵی باس کراو حەڵاڵ نابێت بە بێ ئەمە، ئەمەش بێ جیاوازی لە نێوان زانایان، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ﴾ [المائدة:٣]. هەر ئاژەڵێکیش سەر نەبڕدرێت بەم شێوازە ئەوە مردارەوە بوە، جگە لە ماسی وکولە، وئەوەی لە ئاودا نەبێت ناژیت، ئەمانە بێ سەر بڕینیش حەڵاڵ دەبن، وەك باس کرا لە باسی خواردەمەنیەکان.

## پرسی دوەم: مەرجەکانی دروست بونی سەر بڕین:

ئەم مەرجانە ئەبێتە سێ بەشەوە:

١- ئەو مەرجانەی پەیوەستن بە سەربڕەوە.

٢- ئەو مەرجانەی پەیوەستن بە سەر براوەوە.

٣- ئەو مەرجانەی پەیوەستن بە ئامێری سەر بڕینەوە.

**یەکەم: ئەو مەرجانەی پەیوەستن بە سەر بڕەوە:**

١- **شیاوی سەر بڕ:** بەوەی سەر بڕەکە ژیر وجیاکار بێت، ئیتر نێر بێت یان مێ، موسڵمان بێت یان خاوەن کتێب. خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ﴾ [المائدة:٣] «مەگەر ئەوەی سەرتان بڕی بێت» ئەمەش بۆ موسڵمانە، وهەروەها ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ﴾ [المائدة:٥]، ئەمەش لە بارەی سەر براوی

(١) أخرجه البخاري (٥٥٠٩)، ومسلم (١٩٦٨). ونَد: نَفَرَ وذهب على وجهه شاردًا.

خاوەن كتێبەكانە، ئیبن عەبباس ﷺ ئەڵێ: «خواردنەكەیان: سەر بڕاوەكانیانە»[١].

بەڵام بێ باوەڕەكانی تری جگە لە خاوەن كتێبەكان، وەك شێت وسەر خۆش، ومنداڵی ناجیاكار، ئەوە سەر بڕاویان حەڵاڵ نیە.

٢- ئەبێت بۆ جگە لە خوا سەر نەبڕدرێت، یان ناوی جگە لە خوای لە سەر نەهێنرێت، جا ئەگەر بۆ بت یا موسڵمان یا پەیامبەرێك سەر بڕا ئەوە حەڵاڵ نابێت، لەبەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ لەباسی خواردەمەنیە حەرامەكان: ﴿وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِۦ﴾ [المائدة:٣].

جا ئەگەر ئەم دو مەرجە فەراهەم بو لە سەر بڕدا، ئەوا سەر بڕاوەكەی حەڵاڵ ئەبێت، جیاوازیش نیە لە نێوان پیاو وژن، وگەورە وگچكە، وئازاد وكۆیلە.

**دوەم: ئەو مەرجانەی پەیوەستن سەر بڕاوەوە:**

١- ئەبێت قوڕ قوڕاگە وبۆڕی خواردن ودو دەمارەكەی مل (الوَدَجَين)ی ئاژەڵەكە ببڕێت، قوڕقوڕاگەش بۆڕی هەناسەیە، وەدەجەكانیش دو دەماری بەرامبەرن دەوری قوڕ قوڕاگەیان داوە، ئەمەش لەبەر فەرمودەكەی ڕافعی كوڕی خەدیج ﷺ، پەیامبەری خوا فەرموی: «مَا أَنْهَرَ الدَّمَ، وَذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ فَكُلُوهُ، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ» «ئەوەی خوێنی چۆڕان، وناوی خوای لە سەر هێنرا، ئەوە لێی بخۆن، بەڵام بە ددان ونینۆك نا»[٢]. جا بە مەرجی گرت خوێن بچۆڕێنێت. وسەر بڕینەكە بە بڕینی ئەو شتانەی ئاژەڵەكە بێت كە ئاماژەی بۆ كرا، بە تایبەتیش لەو شوێنانەوە،

(١) أخرجه البخاري معلقاً، وصله البيهقي. انظر: «فتح الباري» (٩/٥٥٢-٥٥٣).
(٢) أخرجه البخاري (٥٥٠٣)، ومسلم (١٩٦٨).

چونکه وا دەکات خێرا تر خوێنی بڕێژێت وزوتر ڕوحی دەر بچێت، بۆیه گۆشتەکەی پاکتر ئەبێت، وسوکتر وساناتریش ئەبێت بۆ ئاژەڵەکە.

ئەوەشی که هۆکاری مردنی توش ئەبێت وەك خنکاو ولێدراو وبەرەوە بو وئەوەی به قۆچ لێی دراوە وئەوەی دڕندە خواردویەتی، هەروەها نەخۆش، وئەوەی ئەکەوێتە تۆڕەوە، یان له تیاچون ڕزگاری دەکات= ئەگەر پێی ڕاگەیشت وبینی به تەئکید ژیانی تێدا ماوە -وەك جولاندنی دەستی یان قاچی یان پێڵوی چاوەکانی- وسەری بڕی ئەوە حەلالە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ﴾ [المائدة:٣]، یانی: ئەوە حەرام نیه. بەلام ئەگەر نەیتوانی له شوێنی دیاری کراو سەری ببڕێت، به هۆی ئەوەی دەسەلاتی ناشکێت به سەریدا، وەك ڕاوکردن، وئاژەڵه دەشتەکیەکان، ویان کەوتۆتە ناو بیرێکەوە وهاوشێوەکانی، ئەو کاتە سەر بڕینی به بریندارکردنی دەبێت له هەر شوێنێکی لاشەی، ئەبێتە سەر بڕین بۆی، لەبەر فەرمودەکەی ڕافعی کوڕی خەدیج پێشو لەبارەی وشترە ڕاکردوەکەوە که کابرا به تیرێك تێی وەشاند وەستاندی، پەیامبەر ﷺ فەرموی: «چی هەڵهات ویاخی بو له دەستان ئاوهای لێ بکەن».

٢- له کاتی سەر بڕیندا ناوی خوای له سەر بهێنرێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ﴾ [الأنعام:١٢١] «ئەی موسڵمانان لەو سەر بڕاوانە مەخۆن که له کاتی سەر بڕیندا ناوی خوای له سەر نەهێنراوە، خواردن لەو سەر بڕوانە دەرچونە له گوێڕایەڵی خوا». سوننەتیشه لەگەڵ «بسم الله» کرندا، «الله أكبر»یش بکات، چونکه پەیامبەر ﷺ[1] له کاتی سەر

---

(١) صحيح مسلم (رقم ١٩٦٦).

بڕینی قوربانیەكەیدا ناوی خوای هێناوە، وتەكبیریشی كردوە. لە ڕیوایەتێكدا: دەیفەرمو: «بِسْم الله، اللّهُ أَكبر»[1].

**سێیەم: ئەو مەرجانەی پەیوەستن بە ئامێری سەر بڕینەوە:**

ئەبێت ئامێرەكە تیژاییەكەی بڕیندارکەر بێت لە ئاسن ومس وبەرد وئەو شتەكانی تریش كە قورگ دەبڕێت، وخوێن دەچۆڕێنێت، جگە لە ددان ونینۆك، لەبەر فەرمودەكەی [پێشتری] ڕافعی كوڕی خەدیج، كە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «ئەوەی خوێنی چۆڕان، وناوی خوای لە سەر هێنرا، ئەوە لێی بخۆن، بەڵام ددان ونینۆك نا». وسەرجەم جۆرەكانی ئێسك هی ئادەمیزاد بێت یان نا ئەڕواتە ژێر حوكمی ددان ونینۆكەوە.

هۆكاری ڕێگریەكەش ئەوەیە كە لە فەرمودەكەدا هاتوە: «وَسَأُحَدِّثُكُمْ عَنْ ذَلِكَ: أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ، وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ» «وباسی ئەوەشتان بۆ دەكەم: سەبارەت بە ددان، ئێسقانە، نینۆكیش چەقۆی حەبەشیەكانە»[2]. سەبارەت بە نەهی كردنیش لە سەر بڕین بە ئێسك: چونكە بە خوێن پیس دەبێت، پەیامبەریش نەهی كردوە لە پیس كردنی، چونكە توێشوی برا جنۆكەكانمانە. سەبارەت بە نینۆكیش: لەبەر ئەوەی چاو لێ كەری بێ باوەڕانی تێدایە[3].

## پرسی سێیەم: ئادابەكانی سەر بڕین:

سەر بڕین كۆمەڵێك ئادابی هەیە، ئەبێت سەر بڕ پێوەی پابەند بێت، ئەوانەش:

---

(١) صحيح مسلم (١٩٦٦)-١٨.
(٢) أخرجه مسلم (١٩٥٥).
(٣) انظر: فتح الباري (٩/٥٤٤).

١- سەر بڕ چەقۆکەی تیژ بکات، لەبەر فەرمودەکەی شەددای کوڕی ئەوس ﷺ، پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «إِنَّ اللهَ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ» «خوا چاکە کاری لە سەر هەمو شتێك نوسیوە، جا ئەگەر کوشتتان ئەوا بە شێوازێکی چاك بکوژن، ئەگەریش سەرتان بڕی بە شێوازێکی چاك سەری ببڕن، وبا چەقۆکەی تیژ بکات وسەر بڕاوەکەی ڕەحەت بکات».

٢- ئاژەڵەکە پاڵ بخات بە لای چەپدا، وقاچی ڕاستی دوای سەر بڕینی وێڵ بکات بجوڵێتەوە، بۆ ئەوەی بە جوڵانەوەی ڕەحەت بێت، لەبەر فەرمودەکەی پێشوی شەددادی کوڕی ئەوس ﷺ، هەروەها لەبەر فەرمودەکەی ئەبولخەیر: پیاوێکی ئەنساڕی بۆی گێڕایەوە لە پەیامبەری خواوە ﷺ، کە قوربانیەکەی پاڵ خستوە بۆ سەر بڕین، بە کابرای فەرموە: «أَعِنِّي عَلَى ضَحِيَّتِي» «یارمەتیم بدە لە قوربانیەکەمدا» ئەویش یارمەتیداوە»[1].

٣- لە گەردن دان (نَحْر)ی وشتر بە پێوە وبە دەست چەپ بەستراوی ئەبێت، نەحریش ئەوەیە بە تیژێك بدەیت لە گەردن (لَبَّة)، کە چاڵایی نێوان مل وسنگە، ئەمەش لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا صَوَافَّ﴾ [الحج:٣٦] «جا لە کاتی سەر بڕینیدا بڵێن: بسم الله، با وشترەکە بە پێوە بێت لە سەر سیان لە قاچەکانی وچوارەمیشی بەستراوەتەوە»، یانی[2]: لە سەر سیان لە قاچەکانی بە پێوە بێت.

---

(١) أخرجه أحمد (٣٧٣/٥)، قال الهيثمي: «ورجاله رجال الصحيح» «مجمع الزوائد» (٢٥/٤)، وقال الحافظ: «رجاله ثقات». «الفتح» (١٩/١٠).
(٢) «زاد المسير» (٤٣٢/٥).

وئیبن عومەر تێپەڕ بو بە لای پیاوێکدا یەخی وشترەکەی دابو تا سەری ببڕێت، پێی وت: هەڵی بسێنە بە پێوە وبە بەستراوی سوننەتی موحەممەد ﷺ(١).

٤- سەر بڕینی هەمو ئاژەڵەکان جگە لە وشتر، لەبەر فەرمایشتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُوا بَقَرَةً﴾ [البقرة: ٦٧] «خوا فەرمانتان پێ دەکات مانگایەك سەر ببڕن». ولەبەر فەرمودەکەی ئەنەس رضي الله عنه: «پەیامبەر خۆی ئەو دو شەکەی سەر بڕی کە کردی بە قوربانی»(٢).

## پرسی چوارەم: ئەو شتانەی کەڕاهەتی هەیە لە سەر بڕیندا:

١- کەڕاهەتی هەیە بە ئامێری کول سەر ببڕدرێت -یانی: نەبڕ-، چونکە ئەمە سزادانی ئاژەڵە، لەبەر فەرمودەکەی پێشتری شەدداد، کە تێیدا هاتبو: «با چەقۆکەی تیژ بکات وسەر بڕاوەکەی ڕەحەت بکات». ولەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر رضي الله عنه(٣): «أَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِحَدِّ الشِّفَارِ، وَأَنْ تُوَارَى عَنِ الْبَهَائِمِ» «پەیامبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە تیژکردنی تیغ، ولە بەرچاوی ئاژەڵانیش دور بخرێتەوە».

٢- کەڕاهەتی هەیە ملی ئاژەڵ بشکێنرێت یان پێستی بکەنرێت پێش گیان دەرچونی، لەبەر فەرمودەکەی پێشوی شەددادی کوڕی ئەوس رضي الله عنه: «ئەگەریش سەرتان بڕی بە شێوازێکی چاك سەر ببڕن». ولەبەر وتەکەی عومەر رضي الله عنه: «وَلَا تُعْجِلُوا الْأَنْفُسَ أَنْ تَزْهَقَ» «پەلە مەکەن؛ پێش دەرچونی گیانەکان مەکەون»(٤).

---

(١) أخرجه البخاري (١٧١٣)، ومسلم (١٣٢٠).
(٢) أخرجه البخاري (٥٥٥٤)، ومسلم (١٩٦٦).
(٣) أخرجه أحمد (١٠٨/٢)، وابن ماجه (٣١٧٢)، وضعّفه الألباني «ضعيف ابن ماجه» (٦٨١) لكن له ما يشهد
(٤) أخرجه البيهقي في سننه (٢٧٨/٩)، وقال الألباني: «هذا إسناد يحتمل التحسين» «إرواء الغليل» (١٧٦/٨).

٣- کەڕاهەتی هەیە چەقۆ تیژ بکرێت بە پێش چاوی ئاژەڵێکی ترەوە، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەری پێشو: «وله بەرچاوی ئاژەڵان دور بخرێتەوە».

## پرسی پێنجەم: حوکمی سەر بڕاوی خاوەن کتێبەکان:

سەر بڕاوی خاوەن کتێبەکان لە جولەکە وگاورەکان حەڵاڵە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ﴾ [المائدة: ٥]. یانی: ئەی موسڵمان سەر بڕاوی خاوەن کتێبەکان لە جولەکە وگاورەکان حەڵاڵە بۆتان. ئیبن عەبباس وتی [وەك باس کرا]: خواردنەکەیان، واتا: سەر بڕاوەکەیان. جا سەر بڕاوی خاوەن کتێبەکان لە جولەکە وگاورەکان حەڵاڵە بە کۆ دەنگی موسڵمانان، چونکە ئەوانیش بڕوایان هەیە بە حەرامێتی: سەر بڕین بۆ جگە لە خوا، ومردارەوە بو، بە پێچەوانەی بێ باوەڕانی ترەوە لە بت پەرستان وزندیقەکان وهەڵگەڕاوەکان وئاگر پەرستەکان، ئەمانە سەر بڕاویان حەڵاڵ نیە، بە هەمان شێوە هاوبەش دانەر -هاوبەشی گەورە- لە گۆڕ ومەزار پەرستان وهاوشێوەکانیان.

هەروەها خواردنی ئەوانە حەرامە کە بزانین سەر بڕدراوە بە خنکاندن، یان بە لە سەر دان، یان بە تەزوی کارەبا وەك عادەتی زۆربەی خاوەن کتێبەکانە لەم سەردەمەدا[1].

---

(١) انظر: «مجلة البحوث الإسلامية» (٢٤٧/٧).

# دەروازەی سێیەم

# حوکمی ڕاو کردن «أَحْكَامُ الصَّيْد»

چەند پرسێکی تێدایە:

**پرسی یەکەم: پێناسەی ڕاو کردن، وحوکمەکەی، وبەڵگەی شەرعی بونی:**

١- **پێناسەی «الصید»**: چاوگی «صادَ یصیدُ صیدًا»ە، یانی: ڕاوی کرد ولە پڕدا وبە فێڵ بردی، ئیتر بخورێت، یا نا، وبە «المصید= ڕاوکراو»ەکە ئەمە وتراوە، لە ڕوانگەی ناونانی «المفعول» بە ناوی «اسم المصدر»ەوە، جا بە ئاژەڵە «مصید= ڕاوکراو»ەکە ئەوترێ: «صید= ڕاو».

لە شەرعیشدا: ڕاوکردنی ئاژەڵێکی حەڵاڵی بە سروشت دەشتەکی (متوحش)ە، کە موڵکی کەس نیە، ودەسەڵاتیش ناشکێت بە سەریدا.

«الوحش»: یش هەمو ئاژەڵێکی ناماڵیە لە ئاژەڵانی وشکانی.

٢- **شەرعی بونی ڕاوکردن**: ڕاوکردن شەرعی وحەڵاڵە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ الْأَنْعَامِ إِلَّا مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّي الصَّيْدِ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ﴾ [المائدة:١] «خوا وشتر ومەڕ ومانگا ویزنی بۆ حەڵاڵ کردون، مەگەر ئەوەی خوا بۆی ڕون کردونەتەوە کە حەرامە، وەك: مردارەوە بو... هتد، وحەرامێتی ڕاو کردن لە کاتی ئیحرام دا»، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا﴾ [المائدة:٢] «ئەگەر لە ئیحرامەکەتان تەواو بون ئەوا ڕاوکردنتان بۆ حەڵاڵە». ولەبەر فەرمودەکەی عەدی کوڕی حاتیم رضي الله عنه، پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ الْمُعَلَّمَ، وَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ فَكُلْ» «ئەگەر سەگە فێرکراوەکەت نارد،

و«بسم الله»ت لێ کرد، ئەوا لە نێچیرەکە بخۆ»[1]. ئەمە ئەگەر ڕاوکردنەکە بۆ پێویستی مرۆڤ بو، بەڵام ئەگەر بۆ خۆشی وگەمەکردن بێت ئەوە مەکڕوهە، چونکە گاڵتەی بێ هودەیە، وپەیامبەریش ﷺ نەهی کردوە ئاژەڵ بکرێتە نیشان شکێن[2].

## پرسی دووەم: ڕاو کردنی حەڵاڵ وڕاو کردنی حەرام:

ڕاو هەموی حەڵاڵە دەریایی وشکانیەکەی مەگەر لە چەند حاڵەتێکدا:

**حاڵەتی یەکەم:** ڕاوکردن لە حەرەمدا حەرامە لە ئیحرامدا بێت یان نا، ئەمەش بە کۆ دەنگی، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا: «إِنَّ هَذَا الْبَلَدَ حَرَّمَهُ اللهُ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ، فَهُوَ حَرَامٌ بحُرْمَةِ اللهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ... لَا يُعْضَدُ شَوْكُهُ وَلَا يُنَفَّرُ صَيْدُهُ» «ئەم شارە لەو ڕۆژەوەی خوا ئاسمانەکان وزەوی دروست کردوە، حەرامی کردوە... دڕکەکەی نابڕدرێت، نێچیری ئیزعاج ناکرێت»[3]. حافز ئیبن حەجەر ئەڵێ: وتراوە: مانایە بۆ ڕاو کردن... زانایان ئەڵێن: کە نەهی دەکات لە ئیزعاج کردن سودی ئەوەی لێ دەکرێت لە ناو بردنی لە پێشترە حەرام بێت»[4].

**حاڵەتی دووەم:** حەرامە لە سەر کەسێك لە ئیحرامدا بێت لە نێچیری وشکانی بخوات، یان ڕاوی بکات، یان یارمەتیدەر بیت بۆ ڕاوکردنی لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ﴾ [المائدة: ٩٥] «ئەی باوەڕداران ڕاوی ئاژەڵی وشکانی مەکەن لە کاتێکدا لە ئیحرام دان ئیتر حەج بێت

(١) أخرجه البخاري (٥٤٨٣)، ومسلم (١٩٢٩).
(٢) أخرجه البخاري (٥٥١٣)، ومسلم (١٩٥٦).
(٣) أخرجه البخاري (١٨٣٣)، ومسلم (١٣٥٣).
(٤) «فتح الباري»: (٤/٥٥-٥٦).

یان عومرە، یان لە ناو سنوری حەرەم بون». هەروەها حەرامە لە سەری لەوە بخوات کە ڕاوی کردوە، یان لەبەر ئەم ڕاو کراوە، یان یارمەتی ڕاوکردنی داوە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا﴾ [المائدة:٩٦] «وخوا ڕاوی وشکانی لە سەرتان حەرام کردوە هەتا لە ئیحرامدا بن». وپەیامبەریش ﷺ، کە سەعبی کوری جەسسامە ﷺ بە دیاری گوێدرێژێکی دەشتەکی پێدا، ڕەدی کردنەوە وفەرموی: «إِنَّا لَمْ نَرُدَّهُ عَلَيْكَ إِلَّا أَنَّا حُرُمٌ» «تەنها لەبەر ئەوە وەرمان نەگرت کە لە ئیحرامداین»[1].

## پرسی سێیەم: مەرجەکانی حەڵاڵ بونی ڕاو کردن:

بۆ ئەوەی ڕاو کردن حەڵاڵ بێت، هەندێك شت بە مەرج گیراوە لە نێچیرەوان، وهەندێکیش لە ئامێرەکەی:

**یەکەم: مەرجەکانی ڕاو چی:** ئەوەی مەرجە بۆ کەسی سەربڕ، مەرجیشە بۆ ڕاو کەرەکە؛ کە ئەبێت موسڵمان یان خاوەن کتێب، وژیر بێت، جا ئەوەی شێت وسەر خۆش ڕاوی دەکەن حەڵاڵ نیە، چونکە شیاوی ئەوەیان نیە (عدم الأهلية)، هەروەها سەر براوی ئاگر پەرست وبت پەرست وهەڵ گەڕاوە دروست نیە، چونکە ڕاوکەر وەك سەر بڕ وایە. بەڵام ئەوەی پێویستی بە سەر بڕین نیە وەك ماسی وکولە، حەڵاڵە ئەگەر کەسی ڕاو کەریش سەر بڕینی دروست نەبێت. هەروەها ئەبێت ڕاوکەر مەبەستی ڕاو بێت، چونکە وەشاندن بە ئامێر وناردنی بریندار کەر وەك سەر بڕین وایە، بۆیە مەبەست مەرجە.

**دوەم: مەرجەکانی ئامێری ڕاو کردن:** ئامێریش دو جۆرە:

---

(١) أخرجه البخاري (١٨٢٥).

١- ئەوەی تیژیەکی هەیە بریندار دەکات، وەك شمشێر وچەقۆ وتیر: لەمەشدا ئەوە مەرجە کە لە ئامێری سەر بڕیندا مەرجە، کە ئەبێت خوێن بچۆڕێنێت، ونە ددان بێت نە نینۆك، وئەبێت بە تیژیەکەی نەك بە پانی وقورسیەکەی نێچیرەکە بریندار بکات. لەبەر فەرمودەکەی [پێشتری] ڕافعی کوڕی خەدیج ﷺ، کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «ئەوەی خوێنی چۆڕاند وناوی خوات لێ هێنا بو بیخۆ». وپرسیار لە پەیامبەری خوا ﷺ کرا لە بارەی شکار بە تیری بێ پەڕ ونێزە «المِعْرَاض»؟ فەرموی: «مَا خَزَقَ فَكُلْ، وَمَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَلَا تَأْكُلْ» «هەرچی ئەیدڕی وئەچوە ناوەوە بخۆ، هەرچیش بە پانیەکەی بەری کەوت مەیخۆ»(١). وبەرد وگۆچان وتەڵە وپارچە ئاسن وهاوشێوەکانیان کە تیژ نین هاوواتای «المِعْرَاض»ن، ئەو گولەیە نەبێت کە ئەمڕۆ لە تفەگەکاندا بە کار دێت، ئەمەیان ڕاوی حەڵاڵە، چونکە هێزێکی تێدایە توانای دڕین وخوێن چۆڕانی هەیە.

٢- بریندارکەرەکان لە ئاژەڵە دڕندەکان یان باڵندە بریندارەکان کە بە چڕنوکیان ڕاو دەکەن، جا دروستە ڕاو بکرێت بە ئاژەڵی دڕندە کە بە کەڵپەکانی ڕاو دەکات، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَمَا عَلَّمْتُمْ مِنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ فَكُلُوا مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ﴾ [المائدة: ٤] «بڵێ: پاکەکانتان بۆ حەڵاڵە، هەروەها ڕاوی ئەوانەی ڕاهێنانتان پێ کردون لە چڕنوکدار وکەڵپەدارەکان لە سەگ وباز وپڵنگەکان وئەوانی تریش، فێریان دەکەن ڕاوتان بۆ بکەن، کە خوا فێری کردون، سا لەوە بخۆن کە بۆ ئێوەی دەگرن، وناوی خوای لە سەر

---

(١) أخرجه البخاري (٥١٦٨)، ومسلم (١٩٢٩). و«المِعْرَاض»: تیرێکە بێ پەڕ ونێزە «بلا ريش ولا نصل»، جا بە پانایيەکەی بەر دەکەوێت نەك تیژیەکەی. وئەوترێ: «خزق السهم الرمية»: واتە لێیدا وچوە ناویەوەوە.

بهێنن لە کاتی ڕەوانە کردنی بۆ ڕاو کردن». ئاژەڵانی دڕندەیش وەکو: سەگ، وپڵنگ. باڵندەی بریندارکەریش وەکو: باز وداڵ، وشاهین.

**مەرجەکانی ڕاو کردن بە ئاژەڵی دڕندە وباڵندەی بریندار کەر:**

مەرجە بۆ ڕاوکردن بە ئاژەڵی دڕندە وباڵندەی ڕاوچی، کە فێرکراو بێت، یانی: فێری چۆنێتی گرتنی نێچیرەکە بو بێت، بەوەی ئەم سیفەتانەی تێدا بێت:

١- بڕوا بۆ ئاژەڵی مەبەست، نەك بڕوا بۆ شتێکی تر.

٢- کە خاوەنەکەی لێی خوڕی واز بهێنێت، کەی خاوەنەکەی ویستی بوەستێت بوەستێت، ئەم دو مەرجەش تایبەتن بە سەگەوە، چونکە پڵنگ وەختە وەڵامی کەس نەداتەوە، ئەگەرچی ئەشبێت فێرکراو بێت. بەڵام باڵندە: فێرکردنی بە دو شت حساب دەکرێت: کە نێردرا بڕوات، کە بانگ کرا بگەڕێتەوە.

٣- پێش ئەوەی بیهێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، ئەبێت هیچ نەخوات لەو نێچیرەی ڕاوی کردوە ئەگەر کوشتی.

بنەماش لە حیساب کردن بۆ ئەم مەرجانە فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ فَكُلُوا مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ﴾ [المائدة:٤]. هەروەها فەرمودەکەی عەدی کوڕی حاتیمە رضي الله عنه لە پەیامبەری خواوە ﷺ: «أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ [الْمُعَلَّم] وَسَمَّيْتَ، فَأَمْسَكَ وَقَتَلَ فَكُلْ، وَإِنْ أَكَلَ فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ» «ئەگەر سەگەکەت نارد و«بسم الله»ت کرد، وگرتی وکوشتی بیخۆ، ئەگەریش لێی خوارد مەیخۆ چونکە بۆ خۆی گرتویەتی»[1].

(١) أخرجه البخاري (٥٤٨٣)، ومسلم (١٩٢٩)-٣.

**❊ «بسم الله» کردن لە کاتی وەشاندن لە نێچیر:**

هەروەها لەو مەرجانە: بسم الله کردنە لە کاتی وەشاندن لە نێچیر یان ناردنی بریندارکەرەکە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَكُلُوا مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ﴾ [المائدة:٤]. هەروەها لەبەر فەرمودەکەی [پێشوی] عەدی کوڕی حاتیم ﷺ بەرزی دەکاتەوە: «ئەگەر سەگەکەت نارد «بسم الله»ی لە سەر بکە... ئەگەر تیرەکەت هاویشت «بسم الله»ی لە سەر بکە»، ولە لەفزێکدا: «ئەگەر سەگە فێرکراوەکەت نارد وناوی خوات لە سەر هێنا ئەوا بخۆ»[1]. ئەگەریش «بسم الله» نەکرد بە سەهوەوە ئەوا نێچیرەکە حەڵاڵ ئەبێت.

**حوکمی گەیشتن بە نێچیر هەر بە زیندویی:**

ئەگەر ڕاوچی گەیشتە نێچیرەکە وهێشتا ژیانێکی ئۆقرەی تێدا مابو، ئەوا واجبە شەرعیانە سەری ببڕێت، وبە بێ ئەوە حەڵاڵ نابێت، بەڵام ئەگەر پێی گەیشت وبینی شکارەکە ژیانێکی ئۆقرەی تێدا نەماوە، ئەوە بە بێ سەر بڕینیش دروستە بخورێت.

---

(١) أخرجه مسلم (١٩٢٩)-٦.

# چواردەهەم : بەشی قەزاوەت وشایەتیدان

**لە دو دەروازە پێك هاتوە:**

**دەروازەی یەکـــــەم: لە بارەی قەزاوەتەوە.**

**دەروازەی دوەم: لە بارەی شەیاتی دانەوە.**

# دەروازەی یەکەم

## لە بارەی قەزاوەتکردنەوە «القَضَاء»

**چەند پرسێکی تێدایە:**

**پرسی یەکەم: پێناسەی دادوەری، وحوکمەکەی، وبەڵگەکانی شەرعی بونی:**

١- **پێناسەکەی:** «القضاء»: لە زماندا: حوکمدان ویەکلاکردنەوە، وموحکەم کردنی شت، ولێ بونەوەیە، ئەوترێ: «قَضَى يقضِي قضاءً» ئەگەر حوکم بدات ویەکلای بکاتەوە. لە زاراوەشدا: ڕونکردنەوەی حوکمی شەرعە، لەگەڵ پابەندکردنە پێوەی، ویەکلاکردنەوەی ناکۆکیەکان، وبڕانەوەی کێشەکانە. «دادوەری»ش پێی وتراوە: حوکم، چونکە ڕێگری دەکات لە مافخواردن، لە حیکمەت=دانایيەوە وەرگیراوە کە ئەخوازێت شت لە جێی خۆی دابنێیت.

٢- **حوکمەکەی ودانایی تێیدا:** دادوەری فەرزی کیفایەتە، ئەگەر ئەوەندەی بەس بێت پێی هەستا، تاوان لە سەر ئەوانی تر دەکەوێت، ئەگەریش هەمو چاکان نەیانکرد ئەوا هەمویان تاوانبار دەبن. چونکە کاروباری خەڵك بە بێ ئەمە ڕێك ناڕوا، ئەمەش یەکێکە لە کارە چاکە گەورەکان؛ سەرخستنی ستەم لێکراو، وجێ بەجێکردنی سنوری خوا، ومافدانی خاوەن ماف، وسوڵح کردن لە نێوان خەڵك، ویەکلاکردنەوەی ناکۆکی وکێشە وشکاتەکانی تێدایە، بۆ ئەوەی ئاسایش بەرقەرار بێت وخراپەکاری کەم ببێتەوە.

بۆیە پێویستە لە سەر پێشەوا، دادوەر دیاری بکات بەو شێوازەی پێویستی وبەرژەوەندی دەیخوازێت، بۆ ئەوەی مافەکان زایە نەبێت وستەم تەشەنە نەکات، هەروەها فەزڵێکی مەزن، وپاداشتێکی گەورەی تێدایە بۆ کەسێك پێی هەستێت

ومافی بدات، وشیاوی ئەو شوێنە بێت، هەروەها تاوانێکی گەورەی تێدایە بۆ کەسێك بیکات ومافی نەدات وشیاوی ئەو شوێنە نەبێت.

٣- **بەڵگەکانی شەرعی بونی:** بنەما تێیدا قورئان وسوننەت وکۆ دەنگیە. بەڵگەی شەرعی بونی لە قورئاندا، فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿يَا دَاوودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ﴾ [ص:٢٦] «ئەی داود ئێمە تۆمان وەك جێنشین داناوە لە سەر زەویدا وتۆمان کردوە بە پادشا تێیدا، سا حوکم بکە لە نێوان خەڵکدا بە دادگەری وئینسافەوە». لە سوننەتیشدا فەرمودەکەی پەیامبەرە ﷺ: «إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ» «ئەگەر دادوەر دوای تێکۆشان حوکمی کرد وپێکای ئەوا دو پاداشتی بۆ هەیە، وئەگەریش تێکۆشا وحوکمی کرد بەڵام هەڵەی کرد یەك پاداشتی بۆ هەیە»(١).

پەیامبەری خواش ﷺ خۆی دادوەری کردوە، وداوەریشی داناوە، هاوەڵەکانیش ﷺ وپێشینانی چاکیش لەوەو دوا هەر وایان کردوە.

سەبارەت بە کۆ دەنگی؛ موسڵمانان کۆکن لە سەر شەرعی بونی دانانی دادوەر وحوکم کردن لە نێوان خەڵکدا.

## پرسی دوەم: مەرجەکانی دادوەر:

ئەمانەی خوارەوە مەرجن بۆ کەسێك ببێتە دادوەر:

١- ئەبێت موسڵمان بێت، چونکە ئیسلامەتی مەرجی دادگەر بونە، بێ باوەڕیش دادگەر نیە، هەروەها بە دادوەرکردنی بێباوەڕ بەرزیە بۆی...

---

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٧٣٥٢)، ومسلم (١٧١٦).

٢- ئەبێت تەکلیف لیٚ کراو (پێگەیشتو وژیر) بێت، چونکە منداڵ وشێت تەکلیف لێکراو نین، هەروەها لە ژێر ویلایەتی کەسی تریشن.

٣- ئازاد بێت، چونکە کۆیلە سەرقاڵی مافی خاوەنەکەیەتی وهیچ ویلایەتێکی نیە، جا شیاوی دادوەری نیە، وەك ئافرەت.

٤- نێر بێت، جا ئافرەت ناکرێتە دادوەر، چونکە ئەهلی ویلایەت نیە، پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: «لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمُ امْرَأَةً» «گەلێك سەر فراز نابێت ئافرەتێك ببێتە کار بە دەستیان»[1].

٥- دادگەر بێت، جا فاسق ناکرێتە دادوەر، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا﴾ [الحجرات:٦]. جا ئەگەر هەواڵی وەرنەگیرێت، حوکم وەر نەگرتنی لە پێشترە.

٦- دور بێت لە عەیب ودەردی بەردەوام وەك کەڕی وکوێری ولاڵی، چونکە لەگەڵ ئەم عەیبانەدا ناتوانێت ناکۆکیەکان یەکلا بکاتەوە، وبە مەرج گرتنی چاویش جێی زیاتر تێڕامانە.

٧- ئەبێت زانا بێت بە حوکمە شەرعیەکان کە بە هۆیەوە کراوە بە دادوەر، با لە مەزهەبەکەی خۆیشی بێت کە تەقلیدی پێشەوایەك دەکات لە پێشەواکان.

**پرسی سێیەم: ئادابی دادوەر ورەوشتەکانی، وچی بۆ شیاوە وچی بۆ نەگونجاوە:**

١- ئەبێت دادوەر بە هێز وسامدار بیٚ، بیٚ لوتبەرزی وتیژی، ونەرم بیٚ، بیٚ لاوازی، بۆ ئەوەی بەهێز تەمای ببڕیٚ لە ناهەق کردنی، ولاوازیش بێئومێد نەبیٚ لە دادگەریەکەی.

---

(١) أخرجه البخاري (٤٤٢٥).

٢- ئەبێت لە سەر خۆ وهێور بێت، بۆ ئەوەی لە قسەی ناکۆکەکان تورە نەبێت ببێتە رێگر لە بەردەم حوکمدانەکەی.

٣- ئەبێت زرنگ وهۆشیار بێت، لە بێ ئاگایی پەی پێ نەبرێت، ولە خۆش باوەڕی فێڵی لێ نەکرێت.

٤- ئەبێت پاك بێت، ولە خراپە وشتی نەشیاو وحەرامەوە دور بێت.

٥- ئەبێت قەناعەتدار وراستگۆ بێت، خاوەن را وبۆچون ومشور بێت. عەلی ﷺ ئەڵێت: «نابێت دادوەر داوەری بکات تا پێنج خەسڵەت لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە، لە شتی نەشیاوەوە دور بێت، لە سەر خۆ بێت، بزانێت پێشتر چی بوە، راوێژ بە ژیرەکان بکات، ولە لۆمەی لۆمەکار نەترسێت»[1].

٦- حەرامە دادوەر چپە بۆ هیچ کام لە لایەنە ناکۆکەکان بکات، یان موجامەلەی یەکێکیان بکات، یان بەڵگەکەی بخاتە سەر زوبانی، یان فێری بکات چۆن بانگەشە بکات.

٧- حەرامە دادوەر بە تورەییەکی زۆرەوە حوکم بدات، لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «لَا يَقْضِي الْحَاكِمُ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ» «دادوەر لە کاتی تورەییدا حوکم ناکات لە نێوان دو کەسدا»[2]. هەروەها هەر شتێك بیر پەرتەوازە بکات لە کێشە وغەم وبرسیەتی وتینیویەتی وماندویەتی ونەخۆشی وهاوشێوەکانی قیاس دەکرێتە سەر تورەیی.

(١) انظر: «المغني» لابن قدامة (١٤/١٧). وقال الألباني: «لم أره لعلي، وأخرج البيهقي (١٠/١١٠) نحوه عن عمر بن عبد العزيز»، انظر: «إرواء الغليل» (٨/٢٣٩).
(٢) أخرجه البخاري (٧١٥٨)، ومسلم (١٧١٧).

٨- حەرامە لە سەر دادوەر بەرتیل وەر بگرێت، لەبەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ، پەیامبەری خوا ﷺ فەرموی: «لَعَنَ اللهُ الرَّاشِيَ وَالْمُرْتَشِيَ فِي الْحُكْمِ» «خوا نەفرەتی کردوە لە بەرتیل دەر وبەرتیل وەرگر لە حوکمدان»[1]، جا بەرتیل دان ڕێگری دەکات لە حوکم کردن بە هەق بۆ خاوەنەکەی، یان وای لێ دەکات حوکم بە ناهەق بکات بۆ ناهەقەکە، هەر دوکیشیان شەڕێکی مەزنە.

٩- حەرامە لە سەر دادوەر دیاری لە لایەنە ناکۆکەکان یان یەکێکیان وەر بگرێت، کێش عادەتی هەیە بەردەوام دیاری پێ دەدات پێش دادوەری، ئەوە هیچی تێدا نیە بە مەرجێك دیاری بەخشەکە کێشەی نەبێت ودادوەرەکە لە بەرژەوەندی ئەو بڕیار بدات. ئەگەریش لە هەمو ئەمانە خۆی بگرێتەوە باشترە بۆی، جا دادوەر ئەبێت خۆی لە هەمو ئەو شتانە بە دور بگرێت کە کاریگەری ئەبێت لە سەر دادوەریەکەی وسومعەکەی، تەنانەت کڕین وفرۆشتنیش؛ نابێت خۆی بە خۆی کڕین وفرشتن بکات لەگەڵ کەسێکدا بیناسێت، لە بەر موجامەلە، چونکە موجامەلە لە کڕین وفرۆشتندا وەك دیاری وایە، بۆیە کڕین وفرۆشتن لە ڕێگەی بریکارێکەوە دەیکات کە نەزانرێت بۆ ئەوە.

١٠- دروست نیە دادوەر دادەوەری بکات بۆ خۆی وخزمانی لەوانەی کە شایەتیان بۆی وەرناگیرێت، ودادوەری ناکات لە سەر دوژمنەکەی، چونکە لەم حاڵەتانەدا مایەی تۆمەتە.

---

(١) أخرجه الترمذي (١٣٣٦) وقال: حسن صحيح، وابن ماجه (٢٣١٣)، وصححه الألباني «صحيح الترمذي» (١٠٧٣).

١١- دادوەر بە زانینی خۆی حوکم ناکات، چونکە سەر دەکێشێ بۆ تۆمەتبارکردنی.

١٢- سوننەتە دادوەر نوسەرێکی هەبێت ڕوداوەکان بنوسێت، وجگە لەوەش لەوانەی پێویستی پێ دەبێت بۆ یارمەتیدانی، وەك دەرگاوان، وتەزکیەچی[1]، وەرگێڕ، وجگە لەمانەش، لەبەر زۆری سەرقاڵی بە کاروباری خەڵکەوە پێویستی بە یارمەتیدەر دەبێت.

١٣- ئەبێت دادوەر حوکم بکات بەوەی لە قورئان وسوننەتدا هاتوە، ئەگەر نەیدۆزیەوە ئەڕوات بۆ کۆ دەنگی، لەوێش دەستی نەکەوت وشیاوی تێکۆشان بو ئەوا تێدەکۆشێت، ئەگەریش شیاوی ئەوە نەبو ئەوا لە سەریەتی پرسیار بکات لە موفتیەك وفەتواکەی وەربگرێت.

١٤- پێویستە لە سەر دادوەر دادگەر بێت لە نێوان لایەنە ناکۆکەکاندا لە هەمو شتێکدا، عومەر ﵁ نوسراوێکی نوسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری: «وَآسِ بَيْنَ النَّاسِ فِي وَجْهِكَ وَمَجْلِسِكَ وَعَدْلِكَ، حَتَّى لَا يَيْأَسَ الضَّعِيفُ مِنْ عَدْلِكَ، وَلَا يَطْمَعَ الشَّرِيفُ فِي حَيْفِكَ» «لە سەیرکردنت ودانیشتنت ودادگەریت یەکسانی بکە لە نێوان هەمویان (یان یەکسانی بکە هەر یەکەیان وەك بەرامبەرە ناکۆکەی تەماشا بکە)، بۆ ئەوەی لاواز بێئومێد نەبێت لە دادگەریت، وناوداریش بە تەما نەبێت ستەمی بۆ بکەیت»[2].

(١) [ئەو کەسەیە، دادوەر پشتی پێ دەبەستێت لە مەڕ دادگەری شاهیدەکان و...هتد]

(٢) أخرجه الدارقطني (٥١٢) وهو صحيح، انظر: إرواء الغليل (٨/٢٤١).

## پرسی چوارەم: ڕێگای حوکم دان وچۆنیەتیەکەی:

دادوەر لە هەر کێشەیەکدا دەگاتە بڕیاردان، بە گرتنە بەری ئەم هەنگاوانەی خوارەوە:

- ئەگەر هەر دو لایەنە ناکۆکە ئامادە بون، ئەیانهێنێت لە بەر دەستی خۆی دەیان وەستێنێت، وپرسیاریان لێدەکات: کامتان بانگەشەی هەیە؟ یان بێ دەنگ دەبێت تا بانگەشەکار خۆی قسە دەکات وگوێی لێ دەگرێت.

- جا ئەگەر بانگەشەکە بە شێوەیەکی دروست باس کرا، ئەوسا دادوەر پرسیار دەکات لە بانگەشە لە سەر کراو کە هەڵوێستی چیە لە سەر ئەوە، ئەگەر دانی پێدا نا ئەوا بڕیار دەدات لە دژی، ئەگەریش نکوڵی لێ کرد، داوای بەڵگە لە بانگەشە کار دەکات.

- ئەگەر بانگەشەکار بەڵگەی هەبو داوای هێنانی لێ دەکات، وگوێ شل دەکات بۆ شایەتەکە، وبە مەرجەکانیەوە حوکمی بۆ دەدات، وئیش بە زانینی خۆیشی ناکا.

- ئەگەریش بانگەشەکار بەڵگەی نەبو، ئەوا دادوەر پێی دەڵێت: بۆی هەیە سوێندی بانگەشە لە سەر کراو بدات، لەبەر ئەوەی کاتێك کابرای حەدرەمی بانگەشەی ئەوەی کرد کە زەویەکەی، کابرای کیندی زەوتی کردوە، پەیامبەر ﷺ فەرموی: بەڵگەت هەیە؟ وتی: نەخێر، فەرموی: سا بۆت هەیە سوێندی بدەیت[1].

هەروەها لەبەر فەرمایشتەکەی پەیامبەر ﷺ: «الْبَيِّنَةُ عَلَى الْمُدَّعِي، وَالْيَمِينُ عَلَى

(١) أخرجه مسلم (٢٢٣).

الْمُدَّعَى عَلَيْهِ» «بەڵگە لە سەر بانگەشەکەرە، سوێندیش لە سەر بانگەشە لە سەر کراو»[1].

- ئەگەر بانگەشەکار ڕازی بو بە سوێند خواردنی بانگەشە لە سەر کراو، ئەوا دادوەر سوێندی دەدات وڕێگەی دەدات بڕوات، چونکە بنەما ئەستۆ پاکیە.

- ئەگەر بانگەشە لە سەر کراو سوێندی نەخوارد وڕازی نەبو، ئەوسا دادەور بە نکوڵی کردن (النُكُول) بڕیار دەدات، نکوڵیش قەرینەیەکی ڕوکەشە لە سەر ڕاستگۆیی بانگەشەکەر، عوسمان ﷺ وکۆمەڵێك لە زانایان بە نکوڵی کردن بڕیاریان داوە.

کۆمەڵێکی تریش لە زانایان پێیان وایە ئەگەر بانگەشە لە سەر کراو نکوڵی کرد لە سوێند خواردن، ئەمجا سوێندی بانگەشەکەر دەدرێت، بە تایبەت ئەگەر لاکەی ئەو بەهێزتر بو.

- جا ئەگەر بانگەشە لە سەر کراو سوێندی خوارد ودادوەر ڕێگەی ڕۆیشتنی دا، ئەمجا بانگەشە لە سەر کراو دوای ئەوە بەڵگەی هێنا، ئەوە وەری دەگرێت وبڕیاری لە سەر دەدات، چونکە سوێندەکە هەقەکە ناسڕێتەوە، بەڵکو تەنها ناکۆکی ناهێڵێت.

---

(١) سيأتي تخريجه في الباب الذي بعد هذا.

# دەروازەی دووەم

# لە بارەی شایەتی دانەوە «الشَّهَادَات»

**چەند پرسێکی تێدایە:**

**پرسی یەکەم: پێناسەی شاهێدی، وحوکمەکەی، وبەڵگەکانی:**

١- **پێناسەکەی:** «الشَّهَادَة»: لە زماندا: هەواڵی یەکلایە، لە «المشاهدة= بینین»ەوە وەرگیراوە، چونکە شایەت باسی ئەوە دەکات کە بینیویەتی وسەیری کردوە. مەبەستیش پێی لەلای فەقیهەکان: هەواڵ دانە بە هەق بۆ کەسێکی تر لە سەر کەسێکی تر لە دانیشتنی دادوەریدا، یان: هەواڵدانی شایەتە بەوەی بینیویەتی بە لەفزێکی تایبەت، کە بریتیە لە: شایەتی ئەدەم، یان بینیم، یان جێگرەوەکانیان.

٢- **حوکمەکەی:** چونە ژێر باری شایەتیدانەوە بۆ جگە لە مافەکانی خوا -یانی: مافی ئادەمیزادەکان- فەرزی کیفایەیە، ئەگەر هەبو پێی هەستێت لە سەر ئەوانی تر دەکەوێت لەبەر بەدیهاتنی مەبەست، ئەگەریش نەبو دەبێتە فەرز لە سەری، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَلَا يَأْبَ الشُّهَدَاءُ إِذَا مَا دُعُوا﴾ [البقرة:٢٨٢] «ولە سەر شایەتەکانە ئەگەر وترا بێن بۆ شایەتیدان، لە سەریانە شایەتی بدەن».

بەڵام شایەتیدان وسەلماندنی لەلای دادوەر: فەرزی عەینە لە سەر ئەو کەسەی چۆتە ژێر باری کەی بانگکرا بۆ ئەداکردنی، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ وَمَنْ يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ﴾ [البقرة:٢٨٣] «جا ئەگەر قەرزار نکوڵی کرد لە مافەکە، شایەتیشی لە سەر هەیە، ئەوا لە سەریەتی گەواهیدانەکەی ئاشکرا بکات ونەیشارێتەوە، کێش بیشارێتەوە ئەو دڵێکی غەدرکەر وخراپی هەیە».

ئەمەش هەڕەشەیەکی توندە بۆ کەسێك بیشارێتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لە سەر فەرزبونی ئەداکردنی شایەتی بۆ شایەت کەی داوای لێکرا.

بۆ واجب بونی ئەداکردنی شایەتیش: ئەبێت شایەت توشی زەرەر وزیان نەبێت، ئەگەرنا توشی زەرەر دەهات لە ناموس وکەسایەتی یان ماڵی یان خۆی یان خێزانەکەی، ئەوا واجب نیە لە سەری، لەبەر فەرمودەکەی پەیامبەر ﷺ: «لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ» «نە زیان بگەیەنە، ونە زیان بە زیان وەڵام بدەرەوە»[1].

**٣- بەڵگەکانی شەرعی بونی:** بەڵگەی شەرعی بونی، قورئان وفەرمودە وکۆ دەنگیە، سەبارەت بە قورئان فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَأْبَ الشُّهَدَاءُ إِذَا مَا دُعُوا﴾ [البقرة:٢٨٢]. هەروەها ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ﴾ [الطلاق:٢] «وشایەتیەکانتان لە بەر خوا بدەن بە تەنها نەك لەبەر شتی تر»، هەروەها ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ وَمَنْ يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ﴾ [البقرة:٢٨٣]، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ [الطلاق:٢]، هەروەها ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ﴾ [البقرة:٢٨٢] «وشایەتی دو پیاو بخوازن، ئەگەر نەبو، ئەوا شایەتی پیاوێك ودو ئافرەت بخوازن کە بە شایەتیان ڕازین».

لە سوننەتیشدا: فەرمودەکەی ئیبن مەسعودە رضي الله عنه کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمویِ[2]: «شَاهِدَاكَ أَوْ يَمِينُهُ» «یان دو شاهید دەهێنیت، یان ئەو سوێند

(١) أخرجه الحاكم (٥٧/٢) وصححه وافقه الذهبي، والبيهقي (٦٩/٦) وصححه الألباني «الصحيحة» (٢٥٠).
(٢) أخرجه البخاري (٦٦٧٦)، ومسلم (١٣٨)-٢٢١، واللفظ لمسلم.

دەخوات»، وفەرمودەكەی [پێشتری] ئیبن عەبباسە: «بەڵگە لە سەر بانگەشەكەرە، سوێندیش لە سەر نكوڵی كەر».

زانایانیش كۆكن لە سەر شەرعی بونی، بۆ چەسپاندنی مافەكان، هەروەها چونكە پێویستی دەیخوازێت.

## پرسی دوەم: مەرجەكانی ئەو شایەتیەی وەر دەگیرێت:

ئەو كەسەی شایەتی وەر دەگیرێت دەبێت ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدا بێت:

١- ئیسلامەتی: جا شایەتیدانی بێ باوەڕ وەر ناگیرێت، لەبەر فەرمایشتەكەی خوا ﷻ: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ [الطلاق:٢]. هەروەها ﷻ ئەفەرموێ: ﴿مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ﴾ [البقرة:٢٨٢] هەروەها ﷻ ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنْتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَأَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةُ الْمَوْتِ﴾ [المائدة:١٠٦]، «ئەی باوەڕداران ئەگەر مردن لە كەسێكتان نزیك بویەوە ئەوا با دو كەسی ئەمین ودادگەری موسڵمان بە شایەت بگرێت بۆ وەسەت نامەكەی، یان دو كەسی ناموسڵمان لە كاتی پێویست ونەبونی موسڵماندا، جا دەیانكەن بە شایەت ئەگەر سەفەرتان كرد ومردن یەخەی پێگرتن»، ئیبن عەبباس وزۆرێكی تر لە بارەی: ﴿أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ﴾ ئەڵێن: لە نا موسڵمانەكان یانی: خاوەن كتێبەكان(١).

٢- پێگەیشتن وژیری: جا منداڵ با دادگەریش بێت شایەتی نیە، چونكە عەقڵی كامڵ نیە، بۆیە شیاوێتی نوقسانە. بەڵام شایەتی منداڵان لە سەر یەكتر لەبارەی برینەكانەوە -بە تایبەت- وەردەگیرێت، بە تایبەت پێش بڵاوە لێ كردن بێت، ئەگەر

---

(١) انظر: تفسير ابن كثير (٣/٢١١).

هەمویان یەك قسەیان دەکرد، هەروەها شایەتی شێت ونوقسان وسەر خۆش وەر ناگیرێت، چونکە شایەتیان دڵنیایی نادات بەو بڕیارەی لە سەر ئەوە درا بێت.

٣- قسەکردن: جا شایەتی لاڵ وەر ناگیرێت، با لە ئاماژەشی تێ بگەن، وئاماژەشی وەر دەگیرێت لە کۆمەڵێك حوکمی تایبەت بە خۆی لەبەر زەرورەت، بەڵام ئەگەر شایەتیەکەی بە نوسین پێشکەش کرد وەر دەگیرێت، چونکە نوسین دەلالەتە لە سەر لەفزەکان.

٤- لەبەر بون وزەبتکردن وبە ئاگا بون (الحِفْظُ والضَّبْطُ واليَقَظَةُ): جا شایەتی بێ ئاگا وناسراو بە زۆری هەڵە وسەهو وەرناگیرێت، چونکە متمانە بە وتەکەی بە دی نایەت؛ لەوانەیە غەڵەتی خۆی بێت، بەڵام کێ ئەمەی کەم بێت لێی وەردەگیرێت، چونکە کەس لێی سەلامەت نابێت.

٥- دادگەری: جا شایەتی فاسق وەرناگیریت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ [الطلاق:٢]. «داد گەر»یش ئەوەیە: لە دینداری دا ڕێك بێت، کە هیچ جێی گومان نیە، وخاوەن کەسایەتیە، واجب وسوننەتەکان بە جێ دەگەیەنێت، وخۆی لە حەرام ومەکرۆهەکان بە دور دەگرێت.

## پرسی سێیەم: ئەو حوکمانەی پەیوەستن بە گەواهی دانەوە:

١- پێویستە لە سەر شایەت، زانستی هەبێت بەوەی شایەتی لە سەر دەدات، جا بۆی دروست نیە شایەتی بدات لە سەر شتێك زانستی لە بارەوە نیە، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾ [الإسراء:٣٦] «ئەی مرۆڤ شوێن ئەوە مەکەوە کە زانستت پێی نیە بەڵکو تەئکید بکەوەوە ودڵنیابەرەوە»، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَنْ شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ [الزخرف:٨٦] «مەگەر یەکێك شایەتی هەق بدات، وزانستیشی هەبێت بە هەقیقەتی ئەوەی شایەتی لە سەر

دەدات» یانی: لە سەر بەر چاو ڕۆشنی زانست. زانستیش بە دی دێت بە بیستن یان بینین، یان بڵاو بونەوە وتەشەنە کردن ئەگەر زۆر جار بە دی نەدەهات مەگەر بەمە وەك ڕەچەڵەك ومردن.

٢- شایەتی باوك بۆ کوڕەکەی وبە پێچەوانەشەوە وەرناگیرێت، چونکە جێی تۆمەتە، هەروەها شایەتیدانی ژن ومێرد بۆ یەکتر. بەڵام شایەتیدانیان لە دژی یەکتر وەر دەگیرێت، جا ئەگەر شایەتیدا لە دژ باوکی یان کوڕی یان هاوژینەکەی یان ژن لە دژ پیاوەکەی ئەوە وەر دەگیرێت، چونکە جێی تۆمەت نیە، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ﴾ [النساء:١٣٥]. «ئەی بڕواداران بە خوا وپەیامبەرەکەی بە دادگەری هەستن، شایەتی لەبەر خوا بدەن، ئەگەر لە دژی خۆشتان یان باوك ودایکانتان یان خزم ونزیکەکانتان بێت، شایەتی لە سەر دراو هەر چۆنێك بێت؛ هەژارە یان دەوڵەمەندە».

٣- شایەتی دوژمندار لە دژ دوژمنەکەی وەرناگیرێت، هەروەها ئەوەی بە هۆیەوە سودێکی پێ دەگات، یان بە هۆیەوە زیانێکی لێ دور دەکەوێتەوە، بەڵام دوژمنی دینی ڕێگر نابێت لە وەرگرتنی شایەتی، بۆیە شایەتی موسڵمان لە دژ نا موسڵمان، وسوننەتی لە دژ بیدعەچی وەردەگیرێت.

٤- پێویستە گەواهیدەر بە هەق شایەتی بدات ئەگەر لە دژ نزیکترین کەسیشی بێت، موجامەلەکردنیش دروست نیە، خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ﴾ [النساء:١٣٥]. یانی: ئەگەر شایەتیەکە لە دژ دایك وباوکت وخزمەکانت بێت، ڕەچاویان مەکە لە شایەتیداندا، بەڵکو شایەتی هەق بدە، با بە هۆیەوە زیانیشیان بەر بکەوێ.

٥- شایەتی لە سەر شایەتی وەردەگیرێت، چونکە پێویستی دەیخوازێت، ئەمەش بە مەرجێك شایەتە سەرەکیەکان بەردەست نەبن بە هۆی نەخۆشی یان مردن یان شتی ترەوە، لەگەڵ دادگەر بونی شایەتە سەرەکی ولقەکان هەر دو لایان.

٦- شایەتی درۆ وەرناگیرێت، ئەمەش لە تاوانە گەورەکانە، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الْأَوْثَانِ وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ﴾ [الحج:٣٠] «جا دور بکەونەوە لە پیسیەکان کە بریتیە لە بتەکان، هەروەها دور بکەونەوە لە درۆش»، هەروەها پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێ: «أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ، ثَلَاثًا، قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: الْإِشْرَاكُ بِاللهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ وَجَلَسَ وَكَانَ مُتَّكِئًا، فَقَالَ أَلَا وَقَوْلُ الزُّورِ قَالَ: فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ» «ئایا هەواڵتان پێ بدەم بە گەورەترینی تاوانە گەوەرکان (سێ جار)، وتیان: بەڵێ ئەی پەیامبەری خوا، فەرموی: شیرك بۆ خوا بڕیار دان، وئازار دانی دایك وباوك، جا ڕاکشا بو دانیشت وفەرموی: ئاگادار بن! هەروەها شایەتی دانی درۆ، ئیتر هەر دوبارەی دەکردەوە، تا وتمان: خۆزگە بێ دەنگ بوایە»[1]، هەروەها لابەری دادگەری وبەرپاکەری ستەمە.

٧- دروست نیە شایەت کرێ وەر بگرێت لە سەر شایەتی دان، بەڵام ئەگەر نەیتوانی بڕوات بۆ شوێنی شایەتیدانەکە ئەوا بۆی هەیە کرێی ڕێگا وەربگرێت.

٨- ژمارەی شایەتەکان دەگۆڕێت بە گوێرەی گۆڕانکاری شایەت لە سەر دراوەکان: جا داوێن پیسی ونێربازی کەمتر لە چوار شایەتی پیاوی تێدا وەرناگیرێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿لَوْلَا جَاءُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ﴾ [النور:١٣]. بەڵام

---

(١) أخرجه البخاري (٢٦٥٣، ٢٦٥٤)، ومسلم (٨٧).

باقی سنورەکانی تر وەك دزین وتۆمەت بەخشینەوە، هەروەها هەر مەسەلەیەکی تر ماڵ نەبێت، ومەبەستیش لێی ماڵ نەبێت، هەروەها لەو شتانە بێت کە زۆر جار پیاو لێی دەڕوانێت، وەك هاوسەرگیری، وتەڵاق، وگێڕانەوە، وزیهارکردن، وڕەچەڵەك، وبریکاری، وەسیەت کردن، وهاوشێوەکانی، لەمانەدا دو شاهیدی پیاو وەردەگیرێت وشایەتی ئافرەت وەرناگیرێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ لەبارەی رەجعەوە: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ [الطلاق:٢]. جا سەرجەم ئەوانەی تر کە باس کران قیاس دەکرێتە سەری. چونکە نە ماڵە ونە مەبەست لێی ماڵە، بۆیە وەك سزاکان وایە.

سەبارەت بە ماڵ وئەوەی مەبەست لێی ماڵە وەك کڕین وفرۆشتن وبە کرێدان وقەرز وبارمتە وسپاردە، وهاوشێوەکانیان لە گرێ بەستە ماڵیەکان، ئەوە شایەتی دو پیاو، یان پیاو وئافرەتێکی تێدا وەر دەگیرێت، لەبەر فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ﴾ [البقرة:٢٨٢].

هەروەها لە ماڵ وئەوەی مەبەست لێی ماڵە شایەتی یەك پیاو وسوێندی بانگەشەکارەکەش وەردەگیرێت، چونکە پەیامبەر لە سەر ئەوە بڕیاری داوە ﷺ(١).

بەڵام ئەوەی کە -زۆر جار- پیاوان نایبینن وەك ئەو عەیبانەی ئافرەتان کە شاراوەن یا بێوەژنانە یا کچانەن، یا لە دایك بون یا شیردانن، یان لە دایك بونی کۆرپەلە وهاوشێوەکانیانن، ئەوا شایەتی ئافرەتان تێیدا بە تەنها وەردەگیرێت، یەك ئافرەتیش بەسە.

---

(١) [أخرجه أحمد (١٤٤٩٩)، والترمذي (١٣٤٤، ١٣٤٥)، وابن ماجه (٢٣٦٩)].

كێش بانگەشەی هەژاری بكات كە دەوڵەمەند بو بێت، ئەوا پێویستی بە سێ شایەتی پیاو هەیە [تا بە ڕاست بخرێتەوە وزەكاتی پێ بدرێت]، لەبەر فەرمایشتەكەی پەیامبەری خوا ﷺ: «رَجُلٌ أَصَابَتْهُ فَاقَةٌ حَتَّى يَقُومَ ثَلَاثَةٌ مِنْ ذَوِي الْحِجَا مِنْ قَوْمِهِ لَقَدْ أَصَابَتْ فُلَانًا فَاقَةٌ» «داواكردن ودەست پان كردنەوە لە خەڵك دروست نیە مەگەر لە سێ حاڵەت:... وپیاوێك توشی هەژاریەك هاتبێت بۆی دروست نیە داوا بكات مەگەر سێ پیاوی عاقڵی نێو خێڵەكەی خۆی شایەتی بۆ بدەن كە فلان كەس توشی هەژاری هاتوە»[1].

٩- لە ئەداكردنی شایەتیدا مەرج نیە بە لەفزی شایەتی بێت، وەك بڵێ: شایەتی دەدەم، یان بینیم، بەڵكو ئەوەندە بەسە بڵێت: ئەوە وئەوەم بینی یان بیستم، وهاوشێوەكانی، چونكە هیچ بەڵگەیەك نەهاتوە ئەمەی بە مەرج گرتبێت.

پاشان: ئەمە ئەوە بو كە خوا كۆكردنەوەی ئاسان كرد لەم پوختەیەدا، داوا لە خوا دەكەین بە تەنها بۆ خۆی بێت، وبە هۆیەوە سود بگەیەنێت بە بەندە باوەڕدارەكانی.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين، وصلّى الله وسلم وبارك على نبيّنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

(١) أخرجه مسلم (١٠٤٤). والحِجا: العقل.

# پێڕست